# ٥ ساڵ لەگەڵ

# عەبدوڵڵای موهتەدی

سکرتێری کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێران

وتووێژێکی تایبەت بەمێژووی (40)ساڵەی کۆمەڵە، کوردستانی ئێران،
حیزبی کۆمۆنیست ، بزووتنەوەی چەپ وداهاتووی ئێران



ب

# 5 ساڵ لەگەڵ

## عەبدوڵڵای موهتەدی

### سکرتێری کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێران

**وتووێژێکی تایبەت بە مێژووی (40) ساڵەی کۆمەڵە و کوردستانی ئێران و حزبی کۆمۆنیست و بزوتنەوەی چەپ و داهاتووی ئێران**

---

**بەهمەن سەعیدی**

2010- **چاپی یەکەم**



ناوی کتێب: پێنج ساڵ لەگەڵ عەبدوڵلای موهتەدی سکرتێری کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێران

ناوی نووسەر: بەهمەنی سەعیدی

دیزاین: بیژەن بهارمەست

چاپ و هەڵەچنی: پویا

ساڵی چاپ: 2010

چاپ: چاپی یەکەم

تیراژ: 3000

---



# ئەم هەوڵە و ئەم کتێبە پێشکەشە بە :

- بە شارەکەم سنە و خەڵکە قارەمانەکەی
- خانەوادەکەم
- بەخەڵکی شۆڕشگێڕ و ئازادیخوازی ئێران و کوردستانی ژێر چنگی کۆماری ئیسلامی ئێران
- بەهەموو ئەوانەی رەنجێکی زۆریان لەگەڵ ئەم کتێبە کێشاوە
- بەشەهیدەکانی کومەڵە و پێشمەرگە شۆڕشگێرەکان و خانەوادەکانیان
- بەهەموو ئەوانەی بۆ ئازادی کورد و ئینسان و خەڵکی ئێران تێدەکۆشن
- بۆ هەموو ئەوانەی لەزیندانەکاندا لەژێر ئازار و ئەشکەنجەدا دەناڵێنن و چاوەڕوانی هەلاتنی خۆری ئازادین

# پێـــڕســت

# پێشەکی/

هەروەك بەڵێنماندابوو، کە کتێبی دووهەمی تایبەت بە مێژووی کۆمەڵە، کوردستانی ئێران و بزوتنەوەی چەپ لەگەڵ بەرێز عەبدوڵای موهتەدی چاپ و بڵاوبکەینەوە. بێگومان ئەم کتێبەی بەردەستمان ئەو هەوڵ و بەڵێنانەیە.

کتێبی دووهەممان (پێنج ساڵ لەگەڵ عەبدوڵای موهتەدی-سکرتێری کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێران) دووهەمین پرۆژەی کارەکانمانە و پرۆژەی داهاتوشمان تایبەت دەبێت بەوتوێژ و مێژووی حزبی دیموکراتی کوردستان. تابێتە پرۆژەیەکی کامڵ و سەراپاگیر تا واقیعەتی ئەو مێژووە باشتر روون بکەینەوە.

(پێنج ساڵ لەگەڵ عەبدوڵای موهتەدی) دەرئەنجامی کاری پێنج ساڵ کارکردنە لەم کتێبەدا تا گەیشتۆتە ئاکام.

ئەم مێژووە ئەگەرچی مێژووی (چل) ساڵەی کۆمەڵەی شۆڕشگێڕ و بزوتنەوەی چەپ و ئێران و کوردستانی ئێرانە، بەڵام جیالەوانە لەم کتێبەدا دەیان بابەتی گرنگ و سەرنج راکێش کەرەنگە زۆر نهێنی و تایبەت بوون باسکراون و بەروونی قسەیان لەسەر کراوە، کەخوێنەر دەتوانێ زۆر بەواقیعی زانیاری راست و دروست لەسەر مێژوویەك بزانێ کە پێی ئاشنا نەبووە.

عەبدوڵای موهتەدی، بۆ خەڵکی کوردستان و بزوتنەوەی چەپ و شۆڕشگێڕانەی کوردستان و خوێنەرانی کتێبەکەش بێگومان ئاشنایە.

ئەو رۆڵی سەرەکی هەبوە لەمێژووی بزوتنەوەی خەڵکی کوردستاندا. یەکێکە لەبونیاد گوزارانی کۆمەڵە و حزبی کۆمۆنیستی ئێران، لەماوەی چل ساڵی رابردوودا بێ دابڕان لەمەیدانی خەبات و سیاسەت و تێکۆشاندا بووە و لەزۆر مەسائیلی گرنگ و سیاسیدا جێ پەنجەی ئەوی پێوە دیارە.

هەربۆیە موهتەدیمان لەپاش ئیبراهیم عەلیزادە و بڵاوکردنەوەی کتێبی (سێ ساڵ لەگەڵ ئیبراهیم عەلیزادە-سکرتێری کۆمەڵە) لەساڵی (2009)دا پێ باشترین کەسایەتی سیاسی بوو لەکوردستانی ئێران، تا لەمبارەیەوە وتووێژێکی وەها تولانی لەگەڵ دا ساز بکەین.

جیا لەوەی ئەم کتێبە لەوەی پێشوتری عەلیزادە تولانی ترە، بەڵام هەردوولا لەبیر و نەزەراتی جیاواز قسە لەسەر مێژووی کۆمەڵە و چەپ دروستبوونی حزبی کۆمۆنیست و شەڕی کۆمەڵە و دیموکرات و زۆر بابەتی تر کراوە، بەڵام دیارە بەدوو تێڕوانینی جیاواز بەلەبەرچاوگرتنی واقیعەتی سیاسی و مێژوویی بەئامانجەوە.

دیارە هەردوو عەلیزادە و موهتەدی هاوکاریان بۆ ئەم پرۆژەیە و دەستپێشکەریان دەلالەتە لەوەی کۆمەڵە هەمیشە پێشەنگی داهێنان و ئازادی سیاسی و ئیعرامیە لەکوردستانی ئێران و بەهەموو قەناعەت پشتیوانی لەئازادی سیاسی و راگەیاندن و شەفافیەت دەکات. هەربۆیە ئەم دوو کتێبە ئامادەیەکن کە تاچەند دوو سەرکردەی ئەم حزبەی کوردستانی ئێران ئامادەن بەروونی قسەوباسی کێشە و ململانێکان باسبکەن و رووداوە نهێنی و تەپ و تۆز لەسەر نیشتوەکان بۆ خەڵکی روون بکەنەوە.

ئەم کتێبە کەدابەشکراوە بۆ سەر چەند فەسڵێك، کە مێژووی ژیانی تایبەت و شەخسی عەبدوڵای موهتەدی دەستپێدەکات، تاکارکردن بەنهێنی بۆ دروستکردنی تەشکیلاتێکی نهێنی و چەپ و مارکسیست لەگەڵ چەند گەنجی مارکسیی و کورد و فارسی شۆڕشگێڕ بۆ سەرخستنی شۆڕشی خەڵکی کوردستان و بەدیهێنانی کۆمەڵگایەکی ئازادیخواز.

هەربۆیە ئەم کتێبە، جگە لەوەی لەمێژووی سیاسی کۆمەڵە و کوردستانی ئێراندا تاکەسەرچاوەیە کەبەروونی بەو هەموو زانیاریەوە بڵاودەکرێتەوە. کەئەمە بۆخۆی زۆر گرنگە بۆ ئەو کەس و لایەنانەی دەیانەوێت لەو مێژوو و سەردەمە تێبگەن و کەڵك وەرگرن، وەکو چۆن گرنگیشە و وەڵامێکە بۆ ئەوکەس و حزب و لایەنەی کە بەمەبەست دەیانەوێت مێژووەکە بشێوێنن.

ئەم دیدارە کەماوەی (پێنج) ساڵی خایاندوە لەسەرەتای (2006) دەستپێیکراوە بەئامانەت ئەوپەڕی بێلایەنی و راستگۆییەوە مامەڵەی لەگەڵ کراوە و ئامانجیش تەنها و تەنها خزمەتکردن بووە بە مێژووی ئێران و کوردستانی ئێران و خەڵکی کوردستان مێژوویەك کە بۆ داهاتوو گرنگ و پێویستە.

لەم کتێبەدا ژیانی تایبەتی خۆی و خانەوادەکەی و عاشقبوونی بەکچێکی فارس و بێ ئاکامی ئەو عشقە کە بۆ یەکەمجارە موهتەدی دەیدرکێنێ.



کاری نهێنی و تەشکیلاتی لەگەڵ بونیاد گوزرانی کۆمەڵە لە تاران و شارەکانی تر و کارکردن بەنهێنی بۆ دروستکردنی ڕێکخراوێکی چەپی-مارکسیست کەدواتر کۆمەڵەی لێپێکهات. کە لەئەسڵدا دروستبوونی کۆمەڵە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (1969) کە بەنهێنی لەتاران دروستدەبێت.

موهتەدی لەم کتێبەدا باس لەو هەموو نەهامەتی و ئازار و ئەشکەنجەی دەکات کەتوشی بوون.

باسی ڕۆڵ کاریگەری کرێکاران و جوتیاران دەکات لەپاڵپشتی کۆمەڵگادا تا ئەوکاتەی بەرەسمی کۆمەڵە خۆی ڕادەگەیەنێت.

باس لەمێژوویەك دەکات کە پڕە لەململانێ و تراژیدیا لەگەڵ حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێراندا، کەدواتر دەگاتە شەڕی ناوخۆ و کوژرانی سەدان پێشمەرگەی هەردوولا لەکاتێکدا یەکێتی نیشتیمانی کوردستان ئەوکات ناوبژیوانی کرد، بەڵام بێ ئاکام بوو.

موهتەدی وا دەگێڕێتەوە کە دیموکرات دەیویست کۆمەڵە لەناوبەرێ و قاسملۆش هۆکاری سەرەکی ئەو شەڕە بووە، بەڵام پاش چەندساڵ شەڕ. بێ ئاکام بوو، ئەنجامێکی نەبوو.

موهتەدی باس لەجیابونەوەی (حزبی دیموکرات- ڕێبەرایەتی شۆڕشگێڕ) دەکات. کە کۆمەڵە پشتیوانیان بووە.

لەبەشێکی تردا باس لەشەڕی عیراق و ئێران و کۆمەڵە کراوە لەپەیوەندی بەعس و کۆمەڵە و کیمیاباران کردنی مقەرەکانی کۆمەڵە لەسەردەستی بەعس و شەهیدکردنی خانە لەسەردەستی بەعس لەگەڵ پۆلێك پێشمەرگەی یەکێتی نیشتیمانی لەدڕی ناوچەی ماوەت.

موهتەدی پێیوایە بەعس دیکتاتۆربوە و پەیوەندی دیموکرات و موجاهیدینی خەلق و بەعس زۆر لەپێش کۆمەڵەوە بووە و هاوکاری زۆری ئەو دوولایەی کردوە و بەعس هەمیشە داوای تەقینەوە و کاری تەزویری لەهەموو لایەنەکان کردوە، بەڵام کۆمەڵە ئەو کارانەی نەکردوە.

موهتەدی هەر لەپەیوەندی بەبەعسەوە دەڵێ زۆر خۆشحاڵ بووم کە بەعس ڕووخا.

لەپەیوەنـدی کوردسـتانی عیراقـەوە موهتـەدی دەڵـێ" هـەرێمی کوردسـتانی عـێراق مـاڵی دووهــەمی ئێمەیــە و هەســت بــەدووره ولاتــی ناکــەین، دەڵــێ یــەکێتی و تاڵــەبانی دۆسـتی پلەیـەکی کۆمەڵــەن و باســی لەنـەبوونی پەیوەنـدی دەکـات لەگـەڵ پـارتی و پێیوایــە (31) ئــاب کــارێکی خراپبــوو پــارتی کــردی، بــەلام باســی نهێنیـەکانی ئـەو شـەڕە دەکـات و گلـەیش لـەهێنانی سـوپای پاسـداران دەکـات بـۆ سـەر حزبـی دیمـوکرات و دەڵی" دیموکراتیش خەتاکارن لەو مەسەلەدا.

لەگەڵ پەیوەندی لەگەڵ یەککگرتوو و بزوتنەوە و ئیسلامیەکان پەیوەندیان نیە.

موهتــەدی بــاس لــەوەدەکات کــە لەلایــەن حزبــەکانی کوردســتانی عیراقــەوە. بــەهاوکاری ئیتلاعـات و ئێـران پێشـمەرگەی ئـەوانیان شـەهید و تـیرۆر کـردون بـاس لـەو رووداوانـە دەکات و دەڵێ داهاتوو هەموویان دەدەین بەدادگا.

هــەروەها بــاس لــەوەدەکات دەبــێ کۆمەڵــە پەیوەندیــەکانی لەگــەڵ ئەمــەریکا گەشــە پێبکات و ئەمەریکا نەکاتە دوژمنی خۆی.

موهتــــەدی لەپەیوەســــت بەدروســــتبوونی حزبــــی کۆمۆنیســــتەوە لەســــاڵی (1983) کــەخۆی بونیادنــەر و ســکرتێری بــوە دەڵــێ" پەشــیمانم لەدروســتکرانی و هەربۆیەشــە جیابوینەوە و وازمان لەو حزبە هێنا.

لــەبارەی رەخنــە لــەئیبراهیمی عــەلیزادە دەڵــێ" کــە ئــەو هۆکــاری ئــەو ئینشــیقاق و جیابونەوەیــە بــوو، ئێســتاش تاکەکەســێك گــەر بتــوانێ حزبــی کۆمۆنیســت هەڵوەشـێنێتەوە هـەر عەلیزادەیـە و پێیوایـە حزبـی کۆمۆنیسـت تـەنها زیـانی هەیـە بـۆ کـورد و کۆمەڵــە و رەخنــەی تونــد لــە حیکمتیســت و مەنســوری حیکمــت دەگــرێ و بەمەترســی خائینیــان دەزانــێ لەســەر کــورد و کۆمەڵــە و کۆمــەڵگای ئێــران و بــاس لـەبوونی پەیوەنـدی ئیسـرائیل و حیکمتیسـت دەکـات و پێیوایـە تائێسـتاش عـەلیزادە حزبی کۆمۆنیست پەیوەندیان هەیە"

موهتــەدی لەپەیوەنــدی لەگــەڵ جیابونــەوەی کۆمەڵــەی زەحمەتکێشــانی عومــەری ئیلخـانیزادە پێیوایـە "ئـەوە دەسـت بـوو، جگـە لـەپارە و دەسـەلات هیچـی تـر نیـەو پێشیوایە ئیلخانیزادە گەورەترین زەربەی لەکۆمەڵە و گەشەکردنی داوە"

باس لەفراکسیۆنی دەکات کەلەحزبی کۆمۆنیست جیابونەتەوە.



باس لەجەلال تاڵەبانی سەرۆکی یەکێتی دەکات لەگەڵ کۆمەڵە و هەوڵەکانی بۆ ڕێگرتن لە جیابونەوە، بەڵام عەلیزادە نەیکردوە.

موهتەدی باس لەپەیوەندی کۆمەڵە و سازمانی خەبات و پاك و حزبی دیموکرات و دیموکرات- ئێران چریکەکانی ڕاەکارگەر و مجاهیدین دەکات.

لەپەیوەندی کوردستانی تورکیا دەڵێ (PKK) تیرۆرست نیە، بەڵام خۆی بەکوێخای هەمووڵایەك دەزانێ و باس لەگرتن و ئازادکردنی عەبدوڵا ئۆجەلان دەکات .

لەسەر پژاك پێیوایە ئەوان بەکرێگیراوی (PKK)ن و ئایندەیان نیە لەکوردستانی ئێران.

باسی تیرۆری قاسملۆ و شەرەفکندی بەوردی دەکات و بۆچونی تازەی هەیە و پێیوایە قاسملۆ خۆشی بەرپرسە لەو کارە.

لەباسی ئەمەریکا و کۆمەڵە، زانیاری تازە دەداتە ئەم کتێبە و پێیوایە دەبێ هاوکاری ئەمەریکا بکەین بۆ ڕوخانی ئێران.

لەپەیوەست بەتیرۆری ئۆپۆزسیۆنی کوردستانی ئێران و ئێران لە کوردستانی عیراق باس لەهەموو هەوڵەکان دەکات کە ئێران داویەتی و کردویەتی بەهاوکاری حزبەکانی عیراق کە بەرێگری ئێران بوە.

سەبارەت بەجیابونەوەیان لەحزبی کۆمۆنیست زۆر بەوردی قسە دەدرێن. پێیوایە هیچ ڕێگا چارە نەمابوو. جگە جیابونەوە و ئەوەش خەتای عەلیزادە بوو.

بۆیە بەوردی کۆنگرە بەکۆنگرە باس لەمێژووی کۆمەڵە و کوردستانی ئێران و عیراق و تورکیا و پەیوەندی و کێشە و گرفتەکان کراوە.

ڕیزبەندی کردنی کتێبەکەش بەپێی کۆنگرەکان بۆ ئەوەیە بەئاسانی خوێنەر لەڕووداوەکان تێبگات و ئاسانتربێ نەك ئەوەی بوترێ کۆمەڵە هەر خەریکی کۆنگرە بەستن بوە.

(پێنج ساڵ لەگەڵ عەبدوڵای موهتەدی ) مێژوویەکە دەکرێت وەکو سەرچاوە سەیری بکرێت کە لەماوەی سی، چل ساڵی ڕابردوو چی ڕوویداوە.

لەم کتێبەدا سەرەرای دیدارێکی تولانی. ناوی هەموو ئەو پێشمەرگانە بڵاوکراوەتەوە کە لەدوای ساڵی (1991) لەلایەن ئیتلاعات و ئێرانەوە

لەکوردستانی عێراق تیرۆرکراون لەگەڵ چەندین بەڵگە و دۆکۆمێنت و وێنەی شەهیدەکانی کۆمەڵە و ناوی شەهیدە ژنەکانی پێشمەرگەی کۆمەڵە.

بەو هیوایەی ئەم کتێبە ببێتە مایەی ڕەزامەندی خوێنەرانمان لەپاڵ هەردوو چاپی کتێبەکانی پێشوترمان لەگەڵ ئیبراهیم عەلیزادە، کەدیارە چاپی یەکەمی و چاپی دووهەمی لەسوید جێگەی ڕەزامەندی خوێنەران بووە واشبڕیارە لەداهاتوویەکی نزیکدا چاپی سێهەمی بکرێت و بخرێتە بەردەستی خوێنەران.

بەوهیوایەی ئەم کتێبەش بتوانین چاپی دووهەم و سێهەمی بکەین لەداهاتوویەکی نزیکیشدا بتوانین مێژووی حزبی دیموکراتی کوردستانیش بخەینە بەردەست، تا هەموو بۆچوونەکان بتوانن مێژوویەکی واقیعی بنوسنەوە.

بەهمەن



زۆر سوپاس بۆ بەڕێز عەبدوڵڵای موهتەدی- سکرتێری کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێران کە ئەم دەرفەتەی بۆ رەخساندین ئەم دیدارە تایبەتە سازبکەین، سەبارەت بەژیانی تایبەتی خۆی، دروستبوونی کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێران، بەو ئاڵوگۆڕانەی کە وایکرد کۆمەڵە وەکو هێزێکی شۆڕشگێڕی کوردستانیی بێتە کایەوە، دواتر سەبارەت بەو ئاڵوگۆڕانەی بەسەر ئێراندا هاتوو، وایکرد کۆمەڵە لەڕێکخراوێکی نهێنییەوە ببێت بە رێکخراوێکی عەلەنی، تاچەندکۆمەڵە رۆڵی هەبووە لەڕێکخستنی کۆمەڵگای کوردستانداو لەسەرکەوتنی پرۆسەی سیاسی خەڵکی کوردستانی ئێراندا، دواتر سەبارەت بە شەڕی ناوخۆی کوردستانی ئێران، سەبارەت بە دروستبوونی حیزبی کۆمۆنیستو دواتریش جیابوونەوەی حیزبی کۆمۆنیستی کرێکاری، سەبارەت بەهەموو ئەو ئاڵوگۆڕانەی (هۆکارانەی) کە تائێستا وایکردووە کۆمەڵەی زەحمەتکێشان چەندینجار ئاڵوگۆڕی بەسەردابێ، بەڵام بەردەوام بێ لەکارو خەباتی سیاسی خۆی. یەکێك لەوانەی کە بەردەوام لەگەڵ ئەم رێکخراوە سیاسییەدا هیلاك بووەو کاریکردووە لەپێناو سەرکەوتنی شۆڕشی خەڵکی کوردستان، لەپێناو خەباتی چینایەتی عەبدوڵڵای موهتەدییە.

***هاوڕێ عەبدوڵڵا زۆر سوپاست دەکەم بۆ ئەم دەرفەتە؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** سوپاس بۆ ئێوە کە ئەم فرسەتەتان بۆ من رەخساند.

ئەم دیدارە بەتەنها دیدارێکی رۆژنامەوانی، تەلەفزیۆنیو رادیۆیی نییە، بەڵکو ئەم دیدارە، دیدارێکی مێژوویی دەبێ، وەکو پێشتر باسمکردو ئامارەم بۆ کرد، لەبەرئەوە ئەم پرسیارانەی لێرەدا دێتە کایەوە رەنگە زۆر شەخسی بن، رەنگە زۆرجار پرسیارێك بن پێویستیان بە وەڵامی جیدیو وەڵامێکی واقعیانە هەبێت، لەبەرئەوە داوای لێبووردن دەکەم کە هەندێك لەپرسیارەکان زۆر تایبەتنو پێویستیان بەوەیە کە بەڕاستی بگەڕێینەوە بۆ دواوەو لە هەندێکیشیاندا قسە لەسەر داهاتوو بکەین، لەبەرئەوە دیدارەکەمان جیا لەوەی کە پەیوەستە بەکارو چالاکیو مێژووی کۆمەڵەوە، رەنگە بۆ داهاتوویەکی مێژوییش قسە هەڵگرێو جەنابیشت بەو پێیە لەشانە سەرەتاییەکانەوە کارتکردووە لەگەڵ ئەو رێکخراوە، رەنگە ئەهەمییەتێکی تایبەتی هەبێت، بۆیە من سەرەتای پرسیارەکەم ئەوەیە:



# هەر ســــەردەکەویـــن

***لەم بناری شاخەدا لە زرگوێزەڵە پاش (35)ساڵ خەبات و پێشمەرگایەتی (مەبەست ساڵی (2006)ە کەدیدارەکەی تێدا دەستپێکراوە)، کەچی هێشتا گەنج و بەتوانا دیاری و بەچاوانیشتدا دیارە کە ماندووی، بەڵام پێم ناڵێی بەنیازی چیت و دەتەوێت چی بکەیت؟**

عەبدوڵلای موهتەدی: پێموایە کە گۆڕان هەر دەبێ، گۆڕان لەئێران و لەکوردستانی ئێران، پێموایە، بۆ خۆشم جارێ زۆرم بە بەرەوە ماوە، ئەگەر تووشی موقەدەر نەبین، یا لەو کارەساتانەی کە زۆرێك لەهاوڕێیان و کەسایەتییەکانی ناو کۆمەڵە تووشی هاتوون و گیانیان لەدەستداوە بەدوور بین. کەسیش پێشبینی ئەوەی بۆ ناکرێت کەی و چۆن دەبێت، کەسێك کە دەچێتە نێو دنیای سیاسەت لەوڵاتانی جیهانی سێیەم و رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و بەتایبەت لەکوردستان بە ئێستاشەوە، سیاسەت لەگەڵ مەترسی دەربەدەری و ئاوارەیی و زیندان تێکەڵە و ئەگەری تیاچوونیشی تێدایە، ئەگەر شتی وا رووبدا ئەوا منیش وەك خەڵکی، بەڵام ئەگەر ئەوە نەبێ پێموایە جارێ زۆرم بە بەرەوە ماوە بۆ ئیشکردنی سیاسی و لەم چەند ساڵەی رابردوودا بەتایبەتی دوای بووژاندنەوەی سەرلەنوێی کۆمەڵەو دەستپێکردنەوەی دەورێکی تازەی چالاکی کۆمەڵە، لەڕۆحی خۆمدا، هەست بە نوێ بوونەوەیەك و گەنج بوونەوەیەك دەکەم. من ئاسۆ ئێستا بەگەشتر دەبینم لەچاو (10)ساڵ لەمەوپێش.

## لە (20) ساڵیدا یەکێک لەدامەزرێنەرانی ئەو رێکخراوە بووم ،کە دواتر بەنێوی کۆمەڵە ناوی دەرکرد لەکوردستانی ئێران

***شەڕو پێشمەرگایەتی، تەقوتۆق، تێرۆر، برسێتی، سەرماو گەرماو دووری لەمنداڵ و خێزانەکەتەوە، ئەو هەموو شتانە بەدرێژایی ئەوچەند ساڵە هیلاکیان نەکردوویت، ماندوو نەبوویت؟**

عەبدوڵلای موهتەدی: جار جار ئینسان بیردەکاتەوە، ئەگەر لەسەرەتاوە بزانێت هەموو ئەو شتانەی دێتەڕێ چییە، رەنگە زۆرکەس خەباتی سیاسی هەڵنەبژێرن، بەڵام تەنیا من نیم، من کەسێکی تاقانە نیم، نە لەتەحەمولی سەختییەکاندا نە لەبەسەرهاتی ناخۆشدا، زۆر کەس هەبوون و هەن لەکوردستاندا، لەدەرەوەی کۆمەڵەو لەناو کۆمەڵەش کە لەتەحەمولی سەختییەکاندا، لەتەحەمولی بەسەرهاتی ناخۆشدا زۆر لەمن بەسەرهاتیان زیاترەو زۆر لەمن خۆڕاگری زیاتریشیان هەبووەو هەشیانە، بەڵام منیش بەش بەحاڵی خۆم کەمم شت بەسەر نەهاتووە، لە (20) ساڵیدا یەکێك



لەدامەزرێنەرانی ئەو رێکخراوە بووم کە دواتر بەناوی کۆمەڵە ناوی دەرکرد لەکوردستانی ئێران و لەشوێنەکانی تریش.

لە (21) ساڵیدا بۆ یەکەمجار چوومە زیندان وەکو زیندانی سیاسی، زیندانی سیاسیم دیوە، خەباتی نهێنیم دیوە، لەدنیای پێشمەرگایەتی بووم، بەهەموو سەختی و ناخۆشییەکانەوە، بە برسێتییەوە، بەدوورییەوە، بەدووری کەس وکارەوە، لەهەمووی ناخۆشتر بە لەدەستدانی خۆشەویسترین ئازیزانتەوە، رەنگبێ توانای جسمیم بەقەد جاران نەمابێ، بۆ هەڵات و ئەو رێپێوانە دووروردرێژانە، بەڵام هەست ناکەم لەباری سیاسییەوە هێزی مەعنەویم کەم بووەتەوە بۆ تێکۆشان، من کەمتریش ناوی خۆم دەنێم سیاسەتمەدار، من تێکۆشەرێکی سیاسیم. ئەوە بووم و ئێستاش ئەوەم، نا، هەست بەماندوویی و وەرەزبوون ناکەم، بەڵام واشم دانەناوە هەتا پیرو پەککەوتە دەبم. پێم خۆشە چەند ساڵێکی ئاخری ژیانم بمێنێتەوە بۆ خۆم.

***ئەو هەموو ناخۆشییانەی کە تۆ باست کردن و هاتە رێگات، پێشبینیت نەکردبوون؟ ئەگەر بتزانیایە ئەو هەموو ناخۆشییانە و دەربەدەرییانەی تێدایە ئەو رێگایەت هەڵدەبژارد؟**

عەبدوڵای موهتەدی: ئێمە وەختێك دەستمان پێکرد.. من لەنەوەیەکی سیاسیم، لەکوردستانی ئێران و رەنگە لەدونیاشدا،کەلە شەستەکاندا فکری سیاسی خۆمم وەرگرتووەو لەو سەردەمەدا بەفکری سیاسی گۆشکراوم و ئەزموونەکانی ئەو سەردەمە تەئسیری گەورەیان لەسەر من داناوە. جا دیارە ئەوە لەباری جیهانییەوە، ئێرانییەوە، کوردستانییەوە هەمووی. یەکێك لەشتەکانیش بریتی بوو لەوەی کە ئێمە لەسەردەمی رژێمی پاشایەتییەوە دەستمان بەخەباتی سیاسی خۆمان کرد، دەمانزانی زیندان هەیە، ئەشکەنجە هەیە، لێدان هەیە، کوشتن و بڕین هەیە و قەتیش پێمان وانەبوو حەتمەن لەژیانی خۆماندا ئەوەندە بەختەوەر دەبین کە راپەڕین ببینین، هەستانی خەڵك و گۆڕانکاری سیاسی ببینین.

پێمانوابوو ئێمە وەکو سێللولێکی بچکۆلەین، دەبێت خشتێك زیاد بکەین لەسەر ئەو خشتانەی کە سەرئەنجام دەبێتە بینایەکی گەورەو هەرواش پەروەردە دەکراین لەناو خۆماندا. زۆرمان کار لەسەر ئەوە دەکرد کە خۆمان و هاورێکانمان بە فەرهەنگێکی خۆڕاگری و فیداکاری، قبوڵکەری، دیسیپلین، تەحەمولی سەختی و ژیانی سادە بارببێنین و پەروەردە بکەین. منیش یەکێك لەوانەم کەلە قوتابخانەیەکی شۆڕشگێڕیدا، جا بەتایبەتی لەقوتابخانەی کۆمەڵەی شۆڕشگێڕدا پەروەردە بووم، زانیومە ئەوانە لەرێگامدایە، بەڵام رەنگبێ ئەو شتەی کە پێم وانەبووە کە لەرێگە دایە هەڵسوکەوتەکان بێت یانی مەبەستم هەستان و کەوتنەکان بێت، ئەو هەستان و کەوتنانە، شکانەکان، تاڵییەك کە

زۆرجار لەدنیای خەباتی سیاسیدا رووت تێدەکات، جیابوونەوەکان لەگەڵ نزکیترین کەسەکانت، رەنگە ئەوانە ناخۆشتر بن تا برسێتی و شەونخونی و زیندان.

## شەوانە خەوم لێنەکەوتووە، نەشمهێشتووە زۆرکەس بزانێت

***ئەو شکستانەی هاتوونەتە رێت، نائومێدیان نەکردوویت؟**

**عەبدوڵلای موهتەدی:** جاری وابووە زۆر زۆر تاڵبوون، هەر من نیم، بەڵام ئێستا تۆ لەمن دەپرسی، دەنا ئەوە بەسەرهاتی زۆر کەسە، زۆرجار شەوانە خەوم لێنەکەوتووە، نەشمهێشتووە زۆرکەس بزانێت، من لەوانە نیم زۆر هاوار هاوار بکەم، بەڵام زۆرم تاڵی چەشتووە، بەڵام کۆڵم پێوە نەداوە، یانی نەگەیشتوومەتە ئەو قەناعەتەی یا دانیشم یا وازبهێنم، یا دەست هەڵبگرم، نەمتوانیوە قەت بەو قەناعەتە بگەم.

***بۆ؟**

**عەبدوڵلای موهتەدی:** نازانم بۆ، بەڵام لەسەرەتای نەوجەوانیمەوە هەستم بەوە کردووە من راسپاردەیەکم لەئەستۆیە، هەستم بە مەسئولییەت کردووە، پێموابووە دەبێ بیکەم، ناتوانم نەیکەم. ئەو هەستە کەمتر خەڵك پەنجەی بۆ راکێشاوەو خەڵکی لەچاوم کوتاوەو ئایا لەبەر تیرو توانجی خەڵکی بووە یان هەرچی بووە، بەهەرحاڵ سەرجەم هەموو شتێك وایکردووە دەستی داوەتە دەست کە من مەسئولیەتێك هەست پێبکەم، نەمتوانیوە خۆمی لێ لادەم. هەرکەسە پشکێکی هەیە لەژیانداو ئەوەش پشکی من بووە لەژیاندا. هەرکەسە لەمێژوویەکی دیاریکراوو سەردەمێکی دیاریکراودا دێتە دونیاوەو لەجوگرافیایەکی دیاریکراویشدا دەژی. بەشی منیش ئەوەیە لەژیاندا.

***تۆ پێمناڵێی لە پێناوی چیدا سیاسەت دەکەیت؟ عەبدوڵلا ئۆچ ئالان دەڵێ: "سیاسەت بەلای منەوە هونەرو بەدەستهێنانی جوانیەو منیش دەمەوێت لەرێگای جوانیدا، واتە لە پێناو جوانکردنی مرۆڤدا سیاسەت بکەم"، تۆ پێم ناڵێی لە پێناوی چیدا سیاسەت دەکەیت؟**

**عەبدوڵلای موهتەدی:** ئاخر وەڵامی ئەو پرسیارە بەستراوەتەوە بەوەی کە تۆ لەچ ئاستێکدا وەڵامی دەدەیتەوە، لەئینتیزاعیترین ئاستدا من بڕوام بە ئینسان هەیە، بڕوام بەعەقڵی ئینسانە، بەتێگەیشتنی ئینسانە، بەهەڵبژاردنی ئینسانە. پێموایە ئەو کەسەی کە ئامانجێکی گەورەی خزمەت بەمرۆڤایەتی نەبێت، ئەگەر سیاسەت بکات زۆرتر وەکو تەکنۆکراتێك سیاسەت دەکا. بۆیەش من وتم من خۆم

بەخەباتکارێکی سیاسی دەزانم. بۆ من سیاسەت یانی ئەوەی ئامانجێکی گەورەت هەبێ، ئەوەی ئامانجێکی گەورەی نییە، ئەوەی دنیایەکی گەورەی لەفکری خۆیدا ساز نەکردووە، خەونێکی گەورەی نییەو کارە بچووکەکانی ئەوڕۆ لەپێناو ئامانجێکی زۆر بەرزی گەورەو ئینسانیدا نابینێ، دەڵێم ئەگەر وایە تەکنۆکراتێکە دانراوە بۆ ئەوەی ئیشێکی پێبسپێردرێ.

## هەوڵدەدەم بۆ باشترکردنی ژیانی ئینسان

***واتە سیاسەت لای تۆ بەدیهێنانی خەونێکی زۆرگەورەیە؟**

عەبدوڵای موهتەدی: پێموایە، بەڵام مەبەستم ئەوە نییە کە ئەو خەونە لەگەڵ واقیع پەیوەندی نییە. ئەو خەونە دەبێ سەرچاوەیەکی لە واقیعیەتی دنیای ئەمڕۆدا هەبێت، بەڵام لەرەخنەگرتن لەم واقیعیەتەو هەوڵدان بۆ باشترکردنی ژیانی ئینسانەوە سەرچاوەی گرتبێت.

## گەورەترین قەڵا لەروحی میللەت دایە

***ئێستا تۆ جیا لەوەی کە سکرتێری حزبێکی، بەڵام دەسەڵاتێکی ناوچەیی و لۆکاڵی کەم و بچووکت هەیەو چەند سەد پێشمەرگەیەکت بەدەورەوەیە، من وەك پێشمەرگەیەك بەئاسانی گەیشتوومەتە لات، گەر لەداهاتوویەکی نزیك یان دووردا لەکوردستانی خۆرهەڵات بەرێزت لەکۆشکێکی ئە نجومەنی وەزیران یانی مەبەستم لەهەرێمی کوردستانی خۆرهەڵاتە، سەرۆکی حکومەت یان پەرلەمان بیت، بیهێنە پێش چاوی خۆت. یەکەم" پرسیارم هەست بەچیدەکەیت؟ دووەم" گەرمن بۆ دیدارێکی تر هاتمەلات، هەروا بە ئاسانی دەگەمە لات و ئەم دیدارەت لەیاد دەمێنێتەوە. پرسیاری سێیەمیان" ئەم قسانەی من خەیاڵە یان پێدەچێت وابێت، تۆ چۆن بیر دەکەیتەوە؟**

عەبدوڵای موهتەدی: من بڕوام وایە سەردەکەوین، کە دەڵێم سەردەکەوین وەکو خەڵکی کورد یانی ئەگەر تۆزێك بمەوێت بەحەماسەوە باسیبکەم، پێموایە سەردەم سەردەمی ڕێنسانسی کوردییە، سەردەمێکی هەستانەوەیە بۆ کورد، سەردەمێکی بووژانەوەیە بەتایبەتی من ئەوە لەکوردستانی رۆژهەڵات دەبینم. سایکۆلۆجی خەڵك و نەوەی نوێ خەریکە دەگۆڕێ، لەجیاتی ئەوەی خۆی خۆی بەچکۆڵە بزانێت بەو جۆرەی کە ستەمکاران و داگیرکەران ویستوویانە بیزانێت، خەریکە ئاشنا دەبێ

بەمافەکانی خۆی، بۆیە من گەورەترین قەڵا بە قەڵایەك دەزانم کە لەڕۆحی میللەتێکدا هەیە، ئەو قەڵایە بەهیچ کەس داگیر ناکرێت.

کورد گەیشتۆتە ئەو ئاستەو من بەختەوەرم یەکێك لەو تاکانە بووم بەخەباتی خۆم و بەخەباتم لەناو ریزەکانی کۆمەڵەدا رەنگبێ توانیبێتم خزمەتێك بکەم بەو مەبەستە. پێشموایە دنیا لەحاڵی گۆڕاندایە، هەمووی بۆ من پێشبینی ناکرێ و بڕیاریشی لەسەر نادرێ لەلایەن منەوە کە چۆن دەبێت، بەڵام لەو دنیا لەحاڵی ئاڵوگۆڕەدا کوردیش دەبێ بەشی خۆی بپچڕێ و لەو ناوەدا کۆمەڵەش وەکو حیزبێك کە بەرنامەیەکی هەیە بۆ داهاتووی کوردستان، خەونێکی هەیە کە ئازادی و سەربەرزییەکی زۆرتری کوردی تێدا بەدی دێ، ئەویش دەبێ هەوڵبدا لەو دنیایە زۆرتر مۆرکی خۆی لە ئاڵوگۆڕەکانی داهاتوو بدا و بەم مانایە بەشی خۆی زیاتر بکات.

من هیوام هەیە بەم ئاڵوگۆڕانە، هیوام هەیە کە سەرکەوتنێك هەر دەبێ ببێ و من زۆر زۆر بەنزیکتریشی دەبینم لەجاران. ئایا من چ پۆستێکم دەبێ، ئەسڵەن من دەمێنم یان نا تا ئەو وەختەو چ پۆستێکیشم دەبێ نازانم. حەتمەن هەر ئینسانێك پۆستێکی سەرەوەی هەبێت لەوانەیە تۆزێك ئیلتزاماتەکەی دووری بخاتەوە، بەڵام هیوادارم سەبارەت بە من وانەبێ کە تۆ مەترسی لێدەکەی. من خۆم پێم وایە زۆر خۆ بەزلزان نیم، هەمیشەش حەزم لە موناقەشەو دیالۆگ و قسەو بەحسی فکری و نەزەرییە، هیوادارم قەت وا نەیەتە پێشەوە دوور ببمەوەو لەبورجی عاجدا قەتیس بم، ئەوەم پێخۆش نییە، زۆرترین ئەو ساتانەی کەمن ئیلهامی لێوەردەگرم ئەو کاتانەیە کە جۆرێك حەرەکەت وەك بزووتنەوەو راپەڕین و هەستان لەخەڵکدایە، لەو کاتانە دایە کە ئینسانییەتی هەموو تاکێك بە ئەوپەڕی خۆی دەگات، شتە نزمەکانی کە لەکەسایەتی هەموو کەسدا هەیە، ئەو شتە نزمانە کەم دەبنەوە، ئینسانەکان یەکتریان خۆشدەوێ و ئامادەن بۆیەکتری فیداکاری بکەن، ئەوانەی تا دوێنێ لەسەر جۆگە ئاوێك، لەسەر مەترە عەرزێك، لەسەر شتێکی بچووك، لەسەر دوو منداڵ پێکەوە شەڕیان کردووە لەکۆڵان، لەسەر ئەوە عاجز دەبوون لەیەکتری، لەکاتی هەستاندا هەموو دەبن بەخوشك و برای یەکتری، لەم حاڵەتانەدایە کە حەدی ئەعلای ئینەرژی ئینسان بۆ چاکەو بۆ گۆڕان دێتە دی.

من خۆشم لەو وەختانەدا توانا و بەهرەکانی خۆشم، ئەگەر توانایەکەم هەبێت لەو وەختانەدا زۆرتر دەشکۆفێتەوەو کاریگەریی سیاسەت و تێکۆشەری سیاسیش لەو وەختانەدا زۆرترە. دیارە هەروەکو باسمکرد لەکاری نهێنیدا نابێ ماندوو بی، ساڵەهای ساڵ دەبێ تێبکۆشی بێ ئەوەی تەماعی ئەوەت هەبێ رۆژێك لەرۆژان سەردەکەوی. ئەوەش توانایەکی زۆری دەوێ و کارو تاقەتی زۆری دەوێ، بەڵام بۆ من خۆشترین کات و ساتەکان ئەو وەختەیە بزووتنەوەکان پەرە دەگرێ و هەمیشەش چاوەڕوانی ئەوەش دەکەم.

***لەبەر ئەوە قسەکەی من پێ ناچێ خەیاڵ بێ و تێڕوانینێکی واقعییەو لای تۆش هەمان هەست هەیە؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** بێگومان.



# دایکم دەیگوت بۆ بچینە کافرستانی
# باوکم ئەندامی (ژ.ک) و وەزیری کۆماری مهاباد بوو

***لێرە دەت وەستێنم، دەمەوێت تۆ خەیاڵێك بکەیتەوە بۆ سەردەمی منداڵی، لەگوندەکەتان چۆن ژیانت دەگوزەراند، چۆن لەگەڵ خێزانەکەتان و کەس وکارت دەژیان، هەستێکی وات هەبوو کە تۆ رۆژێك لەرۆژان دەبیتە پێشمەرگە یان دەبیتە سکرتێری حیزبێك؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** جارێ با بڵێم من قەد لەگوند نەژیاوم، بەچەند ساڵ پێش لەدایکبوونی من، باوکم مڵکی دێهاتی بووە، مالیك و خاوەن موڵك بووە، بەڵام مڵکی فرۆشتووەو هاتۆتە شار. من لەشاری بۆکان لەدایکبووم، دواتریش باوکم خۆی ئینسانێکی خوێندەوار بووەو فەرهەنگی خوێندن و خوێندەواری هەر لە باپیرمانەوە هاتۆتە خوارێ و باوکم پێی وابووە ئەولادەکەی دەبێت بخوێنن، بۆیە لەپێشدا هەستاوین چووین بۆ تەورێز، وابزانم دوو ساڵێك لەوێ ژیاوین، چوونەکەم لەبیر نییە، بەڵام لەبیرمە هێشتا من وەبەر خوێندن نەنرابووم و ماڵمان لەتەورێز بوو، دواتر هاتووینەوە بۆکان، ساڵێك لەوێ ژیاوین، باوکم تەحەمولی شاری چکۆڵەی نەبوو، پێی خۆشبوو لەدنیایەکی رۆشنبیریی گەورەتردا بژی، بۆیە ئەمجار تارانی هەڵبژارد. سەرەڕای ئەوەی کە ئەو وەختە دیارە ئێمە منداڵ بووین و هیچمان نەدەزانی، من هەر لە بۆ خوێندنی سەرەتاییش نەچووبووم، بەڵام لەبیرمە دایکم زۆری پێ عاجز بوو زۆر دەگریا دەیگوت: بۆ ئەو مڵك و ماڵەی خۆمان و ژیانمان بەجێبهێڵین لەبۆکان، بۆ بچینە نێو کافرستانی، بەڵام لەسەر ویست و بەرنامەی باوکم هەستاین و کەوتینەڕێ بەرەو تاران. کە چووینە تاران من هێشتا نەچووبوومە مەدرەسەی سەرەتایی، لەبەر ئەوە هەر لەسەرەتاییەوە من لەتاران خوێندوومەو گەورە بوونم لەوێیە، خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی و تا زانستگاو زانکۆشم تەواوکردووە هەر لەوێ بووم. لەبەر ئەوە من ژیانم زۆرتر لە تاران بووە، کە چەند جاریش زیندانی کراوم هەر لەوێ زیندانم کێشاوە. باوکم کە هاتۆتە تاران دوای ماوەیەك بۆتە مامۆستا لە کۆلێژی ئیلاهیات و دەرسی وتووەتەوە.

بنەماڵەی ئێمە هەر لەکۆنەوە دەپرسی چۆن بووین و چۆن نەبووین، بنەماڵەی ئێمە هەر لەباپیرمانەوە کەوتووینە سەر هێڵی کاری رۆشنبیری و کۆمەڵایەتی و سیاسی. باپیرم یانی حاجی بایزئاغا دەکرێ بڵێین رێفۆرمخوازێکی کۆمەڵایەتی بووە بۆ سەردەمی خۆی، هەوڵیداوە رێفۆرمێك یان ئیسلاحاتێك لەدنیای نەخوێندەواری و عەشایەری و کەللەڕەقی کۆنی ئەو سەردەمەدا پێك بهێنێ. من بەمنداڵی زۆرم شت لەو بارەیەوە بیستووە و خەڵکی موکریان بەتایبەت بەتەمەنەکان زۆر شت لەو بارەیەوە باس دەکەن کە من لێرەدا خۆ لە باسکردنیان دەبوێرم. یەك لەوانە پەرە دان بە خوێندن بووە، مەلا و



فەقێی زۆری راگرتووە و خەڵکی بۆ خوێندن هانداوە. بۆیە بە ئەولادی خۆیشی خوێندووە، باوکم خوێندنی مەلایەتی تەواو کردووە، کە خوێندنی باوی ئەو سەردەمە بووە، بەڵام مەلایەتی نەکردووە. دوای ئەوەش کە ماڵمان چۆتە تاران، وەکو پێشتر باسمکرد لەزانستگای تاران دامەزراوەو لەوێش دەرسی وتووەتەوە. سونەتی فەرهەنگو خوێندنو ئەدەبو شیعرو رۆشنگەریو ئەوانە لەماڵی ئێمە هەمیشە بووە، هەمیشەو دائیم موناقەشەی ئەدەبیو فکری هەبووە. سیاسەتیش لە باوك و باپیرمانەوە بەتایبەتی لەباوکمەوە هاتۆتەوە نێو ئەو بنەماڵەیەوە، باوکی من لەئەندامەکانی کۆمەڵەی (ژ.ك) بووەو ساڵەها بەنهێنی لەدوای رووخانی رەزا شا کاری کردووە، دوای ئەوەش کە کۆماری مهاباد دامەزراوە وەزیر بووە لەکابینەی قازی محەمەد دا، بۆیە سونەتو فەرهەنگی خەباتی سیاسی و کوردایەتی و ئۆپۆزسیۆن بوون بە بەدژی حکومەتی مەرکەزیش لەنێو بنەماڵەی ئێمەدا باو بووە. مەسئەلەی کورد، مەسئەلەی ئازادیخوازی، باسی سیاسەتی ئێران و ناوچە و دنیا و پشتگیری لە خەباتی ئازادیخوازی لە جیهان، ئەوانە زۆر باو بووە لەناوماندا یانی هەم سیاسەت و هەم رۆشنبیری، من لە ژینگەیەکی ئاوادا گەورە بووم. یەکێك لەو شتانەی لەماڵی ئێمە باوبووە، فەرهەنگی راگۆڕینەوە و رادەربڕین بووە. مەسەلەن کوڕی ئەو سەردەمە قەت نەیوێراوە قسە لەقسەی باوکیدا بکاتەوە، بەڵام لەماڵی ئێمە لەکاتی موناقەشەو بەحسی ئەدەبیو سیاسیدا هەرکەسە نەزەری خۆی وتووە، بەئاسانی بە باوکی یان بەمامی یان بەگەورەکانی وتووە: فڵانە جۆرە وانییەو راست نییە، بەڵکو فیسارە جۆرە راستە. لەبیرمە کاکم تەنانەت موناقەشەی مەزهەبی و ئایینی لەگەڵ باوکم دەکرد. بۆیە لەدنیایەکی پڕ لەدیالۆگو قسەو بێنەوبەرەی سیاسیو ئەدەبیو ئەوانەدا گەورە بووم.

خوێندنەوە و نووسینی کوردیش زۆر زووتر لە هاوتەمەنەکانی خۆم فێربووم. تازە خوێندنو نووسینی فارسی فێر بووبووم کە رۆژێکیان باوکم لێی پرسیم: عەبدوڵڵا، تۆ دەزانی بەکوردی بخوێنیەوەو بنووسی؟ مَن هەر نەمدەزانی کوردی خوێندنەوەو نووسینیشی هەیە، بۆیە بۆ خۆی سەرەتاکانی فێرکردمو دوای ئەوەش لەبەر دەستی کاك سەلاحی موهتەدیدا کە برای گەورەمانەو کاکمە، وتی: سەلاحودین، دەی تۆ باقییەکەی فێربکە. شیعری (لایە لایە)ی هەژار یەکەمین شیعر بووە کە من لەکوردیدا خوێندومەتەوەو لەبەرم کردووە، لەدوو و سێی سەرەتاییدا بووم. ئەو سەردەمە لە کوردستانی ئێران، غەیری جەماعەتێك نوخبەی کەم نەبێت،کەس کوردی نەدەزانی بخوێنێتەوە، بەڵام لەماڵی ئێمەدا باو بوو و پەرەشی پێدەدرا. ئەدەبیاتی فارسیش لە ماڵی ئێمە زۆر باو بوو. لە ئەدەبیاتی فارسیدا شانامەی فیردەوسی، سەعدی، حافز و نیزامی زۆر دەخوێندرانەوە و باسیان لێدەکرا و زۆر جار موشاعەرەیان لەسەر دەکرا. شیعر لێهێنانەوەو خوێندنەوەو باسو رەخنەی ئەدەبیو لێکدانەوەی شیعرەکان، بەتایبەتی باسکردن و لێکدانەوەی دەقی رەقو شیعری سەختو ئەوانە باوبوو. لەکوردیشدا کلاسیکەکانی وەکو خانی و نالیو مەحوی و حاجی قادری کۆییو

سەیفولقوزات و هێمن و هەژارو دواتریش گۆران، هاتوون و چوون لەماڵی ئێمەدا. ماڵی ئێمەش هەمیشە پڕ بوو، وەك خانەقا وابوو. ئەو وەختە لەتاران کوردی زۆر لێ نەبوو، جەژنان هەموو کوردێك دەهاتە ماڵی ئێمە بۆ جەژنە پیرۆزە، هەم جەژنی نەورۆز هەم جەژنە ئاینییەکان و ئیسلامییەکان. بەتایبەتی باوکیشم کە مامۆستای زانستگا بوو، شاگردی زۆری هەبوو، فێرکاری هەبوو، بەو حیسابە ئەوانیش هەموو دەهاتن. بۆیە هەر لە منداڵییەوە خەڵکی زۆرم دیوە، زۆرێك لەسیاسەتمەداران و تێکۆشەران لە هەموو شوێنەکانەوە، لەحیزبی دیکەدا بوون، تێکۆشەرانی زۆر ناوداری کوردستان، بەعزێك لەوانە گیانیان لەدەستداوە یان لە ژیاندا نەماون، شاعیرو ئەدیبان، من دیومن. دیارە سەرەتا من منداڵ بووم و تەنیا خزمەتم کردوون و چام بۆ بردوون، بەڵام لەهەرحاڵدا لە فەرهەنگەکەیان بەش بەحاڵی خۆم شتێکم هەڵکڕاندووە، دواتریش وردە وردە ڕێگەم بۆ مەجلیسیان کراوەتەوە. ئێستا نموونەیەکم بیر هاتەوە، با بۆت بگێڕمەوە ئەویش باسی هاتنی کەسایەتیی گەورەی کورد حاجی سید عەبدوڵلا ئەفەندی شەمزینی بوو. ماڵمان لە تاران بوو، من تازە دەگەیشتمێ کە باوکم لەگەڵ براچکۆڵەکەم بانگی کردین و پێی گوتین کە ئێستا کەسایەتییەکی گەورە دێتە ماڵمان کە باپیری سەرکردەیەکی گەورەی کورد بووە و هەندێك لە بارەی شێخ عوبەیدوڵڵای شەمزینان و ئەوەی ڕاپەڕینێکی گەورەی کردووە و ویستوویەتی دەوڵەوتی کوردی دامەزرێنێ قسەی بۆ کردین و ئامۆژگاری کردین کە ئەوپەڕی ڕێزی لێبگرین. ئێمەش دەستمان ماچ کردو و کەوشمان بۆ دانا. هەروەها کەسایەتییەکانی ئەو سەردەمەی ئێران، وەکوو مامۆستا بدیع‌الزمان فروزانفەر کە گەورەترین مامۆستای مەولەوی‌ناسی ئێران و بلیمەتیکی ئەدەبی فارسی و عەرەبی بوو، یان عبدالحسین زرین کوب کە گەورەترین ڕەخنەگری ئەدەبی و مێژوویی دەهەکانی پێشووی ئێران بوو یان دوکتور سنجابی کە کەسایەتیی گەورەی عێلی کوردی سنجاوی و لە ڕەهبەرانی جبهەی میللی ئێران و لە نزیکانی دوکتور مصدق بوو و دواتر بۆ ماوەیەکی زۆر کورت لە کابینەی بازرگاندا لە کۆماری ئیسلامی بوو بە وەزیری دەرەوە، بەڵام زۆر زوو خۆی کێشاوە. با هەر لێرەدا شتێکتان بۆ بگێڕمەوە. دوکتور سنجابی هاتبوو بۆ ماڵی ئێمە لە تاران، دیار بوو باوکم باسی شیعری هەڵۆی کوردی هەژاری بۆ کردبوو. جا بۆ ئاگاداریتان شیعری هەڵۆ کە لە کوردیدا هەم هەژار و هەم سوارە هەیانە، هەرتکیان بە ئیلهام لە شیعرێکی شاعیر و زمانەوان و ئەدیبی گەورەی ئێرانی پرویز ناتێل خانلەرییەوە بەنێوی عقاب داندراون کە ئەویش خۆی ئیلهامی لە شیعریکی پۆشکین شاعیری گەورەی سەدەی نۆزدەهەمی ڕووسیە وەرگرتووە. بەهەرحاڵ باوکم بانگی کردم و لێی پرسیم دەتوانی هەڵۆکەی هەژارم بۆ بکەی بە فارسی بۆ دوکتور سنجابی دەمەوێ. دوکتور کەریمی سنجابی بۆخۆی کوردی عەشیرەتی سنجاوی بوو لە کرماشان، بەڵام کوردی سۆرانی نەدەزانی. من ئەو کات لە ناوەندی دەمخوێند و کوردی و



فارسیم باش دەزانی. بۆیە هەوڵێکی چاکم لەگەڵ دا و وەرمگێڕاوە سەر فارسی و زۆریشیان تاریفی تەرجەمەکەم کرد. من لەدنیایەکی ئاوادا گەورە بووم.

# ماوەیەک هەوڵمدا ببم بەشاعیر

***یانی تۆ پێشبینیت دەکرد ببیتە پێشمەرگە یان ببیتە سکرتێری حیزبێك؟**

**عەبدوڵای موهتەدی:** من ماوەیەك هەوڵمدا ببم بەشاعیر، هەندێکیشم شیعر بەفارسی وت، دوایی لەخوێندنی ناوەندیدا بووم تەقریبەن (16-17) ساڵ بووم فکری سیاسی زاڵبوو بەسەر ئەدەبیات لە مێشکی مندا، من هەمیشە خوێنەرێکی ئەدەبیات بووم نەك وەکوو پیشە بەلکوو وەکوو ئاماتۆرێك، بەڵام وەکو پیشە بڕیارمدا شاعیری نەکەم، هەرچەندە نازانم دەبووم بەشاعیرێکی چۆن، بەڵام بڕیارمدا دەست لە شاعیری هەڵگرم، هەرچی شیعرم هەبوو لەدەفتەرێکدا نووسیبوومەوە هەموویم درانـدو سووتاندو لەو دەقەیەوە وتم من شاعیری ناکەم.

***بۆ سووتاندت؟**

**عەبدوڵای موهتەدی:** نەمدەویست بچمە ئەو موزوعەوە، خۆم هەڵگرتبوو بۆ شتێکی تر. من پێموابوو دەبێ لەسیاسەتدا کارێك بکەم، پێموابوو لەخەباتی سیاسیدا دەبێت کارێك بکەم.

# چیرۆکیشم نوسیوە

***ببوویتایە بەشاعیر باشتر نەبوو؟**

**عەبدوڵای موهتەدی:** پەشیمان نیم، نازانم خەڵك چۆن قەزاوەت دەکات، من پەشیمان نیم لەو کارەی خۆم. پەشیمان نیم کە لەژیانی خۆمدا خەباتی سیاسیم هەڵبژاردووە، رەنگە پەشیمان بم لەهەندێك بڕیار، حەز بکەم بریا وام نەوتبایەو وام بووتایەو ئەو بڕیارەم ئاوا نەدایە، بەڵام لەسەرجەمی رێگەیەك کەپێیدا هاتووم پەشیمان نیم. یەك چیرۆکیشم نووسیوە لەحەیاتمدا (14-15) ساڵ بووم، ئەو چیرۆکەم لەبارەی پێشمەرگەوە بوو، بەفارسی بوو لە بارەی پارتیزانێك و دایکی بوو. ئەم ماوە بەڵام پێم وایە چیرۆکێکی خراپیش نەبوو لە قەدەر خۆم. جا مەبەستم شتێك بوو، لەبەر ئەوە فکری پێشمەرگە هەبووە لەمێشکی ئێمەدا. من لەبیرمە لە سەرەتایی بووم، ئەو وەختە دیسان رۆژێکیان باوکم رۆژنامەیەکی هێناو وتی: با بزانم چاك فێربووی رۆژنامە بخوێنیتەوە، ئەو بەشەم بۆ بخوێنەوە. بەشێکی پێ خوێندمەوە بەفارسی لەبارەی شوڕو ژیانی شیمالی عیراق بوو، کە خوێندمەوە وتی دەزانی ئەوانە کێن؟ نەمدەزانی. وتی: رۆڵە ئەوانە شوڕو ژیان نین، ئەوانە پێشمەرگەن، ئەوە شیمالی



عێراق نییە ئەوە کوردستانی عێراق و بۆی شەرحکردم کە چۆنە، یانی من زۆر لەمنداڵییەوە شۆڕشی ئەیلوولم ناسیووە. برای خۆم، کاکمان، سەلاحی موهتەدی لەشۆڕشی ئەیلوولدا بەشداری کردووە، باسی پێشمەرگە کراوە، باسی پێشمەرگەی زەمانی قازی محەمەدو کۆماری مهاباد کراوە، پێشمەرگە هەمیشە خۆشەویست بووە لای ئێمەو بۆ منیش شتێکی جوان و پیرۆز بووە.

## باوکم پیاوێکی دیندار بوو

***ئەو یاخیبوونەی کە لەناو بنەماڵەکەی ئێوە هەبووە، تۆ قسەت لەقسەی باوکتدا دەکردو کاك سەلاح قسەیدەکرد، پێتوانییە ئەوە سەرەتای یاخیبوونێك بوو لەناو بنەماڵەی ئێوە، بەرامبەر بەهەموو ئەو شتانەی کە قابیلی ئەوەیە فەرز بکرێت و بسەپێنرێت بەسەرتاندا وەکو ئەو سیاسەتەی کە سەپێنراوە بەسەر گەلی کورد دا، ئەوە سەرەتای یاخی بوونی تۆ نەبوو؟**

عەبدوڵای موهتەدی: با ئەوە زۆر تەئسیری کردۆتە سەر من، من خۆم زۆر بەسەربەست زانیوە، هەمیشە ئێمە لەقسەکردندا سەرکوت نەدەکراین ، بۆ نموونە باوکم پیاوێکی زۆر دیندار بوو، هەموو پێویستییەکانی دینداریی بەئەنجام دەگەیاند، قسەشی لەگەڵ ئێمە دەکرد، بەڵام بەحەیاتی رۆژێك لەڕۆژان ئێمەی مەجبوور نەکردووە بەوەی کە باوەڕە دینییەکانی ئەو حەتمەن قبوڵ بکەین، موناقەشەی لەگەڵ دەکردین، بەڵام قەت زۆری لێنەدەکردین. دەیزانی من کە گەورە ببووم بەڕۆژو نابم رۆژووەکانم دەخۆم. لەسیاسەتیشدا هەروا، لەشیعرو ئەدەبدا هەروا، لەهەموو ئەو شتانەدا ڕێگە هەبوو بۆ ئێمە قسە بکەین. من کەسێکی ... (باقی براکانی تریشم هەروا بوون) رەنگبێ بۆ من زۆرتریش، چونکە باوکم تەمەنێکی لێکوزەرابوو لەتاران دەژیاو لەگەڵ شارستانیەتی تاران و زانستگای تاران و ئەوانەش نزیك بووەوە، رەنگبێ لەتوڕەیی و یان لەخووە عەشایەرییەکەی کەمتریش بووبێتەوە تا سەرەی من گەیشتووە لەنێو براکانمدا، بەهەرحاڵ ئەوەی من دیوومە ئێمە لەدونیایەکی ئاوادا ژیاوین.

***هیچ کاتێ کەوتوویتە ژێر تەئسیری باوکتەوە سەبارەت بە مەسائیلی مەزهەبی و دینی؟ یان هیچ لەو فەرزانەی تایبەتە بەئایین هیچ کامت لەوانە جێبەجێکردووە؟**

عەبدوڵای موهتەدی: بەڵێ زۆرم جێبەجێکردووە، بەڵام خۆم کە وردە وردە گەورە بووم دەتوانم بڵێم لەسەردەمی ئەوجەوانی خۆمدا بەفکری خۆم هەڵمبژاردووە، دەنا ... بەڵێ ئەوانەشم کردووە وەختی خۆی.

# ساڵی (1969) (کۆمەڵە)مان دروستکرد

***باسی ئەوانەت کرد کە لەسەردەمی زانکۆدا چوویتە زیندان، چۆن و کەی بوو؟**

**عەبدوڵای موهتەدی:** دامەزراندنی کۆمەڵە لەپاییزی (1969) بوو، من لەپاییزی (1970) بۆ یەکەمجار چوومە زیندان، ئەو زیندانەی من چووم ناوی (قزل قەلعە) بوو یانی (قەڵای سوور) کە سوارەی ئێلخانیزادەی شاعیر کە خۆشی کاتێك من منداڵ بووم لەوێ زیندانی بوو بەناوی سوورە قەڵا ناوی دەبا (سوورە قەڵا دایکی بەڵا). من یەکێك لە ئاخرین کەسانێك بووم کە لە ئێران لە زەمانی (شا)دا چوومە ئەو زیندانە، چونکە دوایی رووخاندییان کە لەزەمانی قاجارییەکانەوە دروستکرابوو شتی تریان لێ دروست کرد، پارکیان لێ دروستکرد.

ئەوجارە کە گیرام لەسەر کۆمەڵە نەگیرام، منیش هیچ راستییەکەم لەبارەی کۆمەڵەوە نەدرکاند، ئێمە کە ساڵی( 1969) کاری خۆمان دەستپێکردو بڕیارماندا ئەو رێکخراوە دروستبکەین، یەکێك لەکارەکانمان ئەوەبوو ئەو پەیوەندییە زیادیی و ئاپۆرەو ماپۆرەی کە لەو سەردەمەدا خوێندکاران هەیانەو نارێك‌وپێکەو نا مونەزەمە ئەوانە بپسێنین، ئێمە خۆمانمان زۆر بەجیدی دەزانی لەکاری سیاسیدا، زۆر خوێندکار هەبوو لەدنیای سیاسەتدا هاموشۆی ئەوێیان دەکرد، قسەیەکی سیاسییان لێرە دەکرد، بەحسێکی سیاسییان لەوێ دەکرد، شتێکیان لەتۆ وەردەگرت دەیاندا بە یەکێکی دیکە، پەیوەندییەکی بەربڵاویان هەبوو، دیسپلین نەبوو، چونکە خۆ کاری حزبیان نەدەکرد. بەعام بزووتنەوەیەکی سیاسی لەناو خوێندکاری ئێرانیدا هەبوو، ئێمە بڕیارماندا کارەکەی ئێمە جیدی بێت.

***ئێوە کێن؟**

**عەبدوڵای موهتەدی:** ئێمەی ئەو وەختە لەو رێکخراوەدابووین رێکخراوی کۆمەڵە، رێکخراوێك کە دواتر ناومان لێنا کۆمەڵە، ئێمە لەناوەندی ئەو کۆمەڵەیەدا ئەو بڕیارەمان دا.



# فوئاد- حەمە حوسێن- موسڵیح- موهتەدی لەدامەزرێنەرانی کۆمەڵەن

*کێ و کێ بوون؟

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** ناوەندەکە لە سەرەتاوە چوار کەس بووین، بۆ ماوەیەك کە بریتی بوون لە(فوئادی موستەفا سوڵتانی، حەمە حوسێنی کەریمی، موسڵیحی شێخ ئەلئیسلامی و من)، دواتر موسڵیحی شێخ ئەلئیسلامی لەو ناوەندەدا نەما بەهەندێك هۆ، ئەو سیانەمان ساڵەهای ساڵ کاك حەمە حسێن و کاك فوئادو من لەناوەندی کۆمەڵەدا بووین، بڕیارماندا کە ئەوجۆرە پەیوەندییە بەربڵاوە بێ سەرەوبەرەیەی کە لەزانکۆکانی ئەو وەختەو لەنێو ئەڵقە سیاسی و کۆڕو کۆمەڵە سیاسییەکاندا هەبوو ئەوانە بخەینە ژێر ئەزمێکەوە، ئەوی زیادە بێ بیقرتێنین، ئەوی بەکارنایەت بیقرتێنین، قسەی زیادی نەکەین لەخۆڕا لەملاو ئەولاو بکەوینە سەر باری کارێکی جیدی. بەم حیسابە من هەندێك لەو پەیوەندییانەم قرتاند، بۆیە کە منیان گرت، بەڕاستی ئەو خەڵکانەی تر ئەوانەشیان وت کە فلانە کەسە ماوەیەکە لەگەڵمان نەماوە، ئەوەبوو بەهۆی ئەوەی من تۆزێك نەجاتم بوو، کە دواتر لە ساواکی ئەو وەختە لێیان پرسیم بۆ لەگەڵیان نەماوویت، وتم: وەڵا من سەردەمێك بوو ویستم دەرچم و خوێندنی خۆم بکەم و ئیشم پێیان نەماوە.

*یانی لەترساندا وات وت؟

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** من ئەو وەختە ئەندامی چالاکی کۆمەڵە بووم، خەریکی فەعالییەت بووم.

### *ئەترسایت کە ئەو هەڕەشانەیان لێکردیت و بردیانیتە زیندان، ویستت ئەوە پاساوێك بێت یان لەژێر تەئسیری ترسدا بوو؟

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** پاساوێك بوو، هەر خەریکبووم کارم دەکرد، هەر کە هاتمە دەرێ لەزیندان، هەفتەیەك چەند رۆژێك لەماڵێ مامەوەو وتم ئەوەك کەس ئاگای لێم بێ، دواتر چوومەوە سەر بارودۆخەکەی خۆمان. ئێمە زۆر سەرسەخت بووین، کەسێك تۆزێك لایبدایە، ئەوها بە ئاسانی لەکۆڵی نەدەبووینەوە.



# کاک فوئادمان کردە سکرتێری کۆمەڵە

***لەگەڵ هاوڕێکانت پەیوەندیت چۆن بوو؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** زۆر خۆش بوو.

***بەتایبەتی لەگەڵ کامیان؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** لەگەڵ زۆرکەس، بەڵام کاک فوئاد هەم هاوڕێو هاوکارێکی زۆر چاک بوو، هەم پاڵپشتێکی زۆر چاک بوو، لەهەموو نارەحەتی سیاسیو گیروگرفتی ژیانمدا .. ئینسانێکی زۆر بەئینساف بوو، ئینسانێکی قایم بوو هەموو کەس پێی خۆش بووقسەی خۆی لای ئەو بکات، کە کاتێکیش سەردەم هاتو ڕۆیو دوای نزیکەی نۆ ساڵو نیوێك لەکاری خەباتی نهێنیو ژێر زەمینی کۆمەڵەدا بوو کە ڕاپەڕینی شۆڕشی گەلانی ئێران ڕوویدا، دوایی کاك فوئاد بوو بە شەخسیەتێك، بەبێ ئەوەی ئەو پۆستەی بۆ ببینینەوە وەکو پۆستی سکرتێر، بەڵام ڕەهبەری کۆمەڵە بوو بەقسەمان دەکرد، ئەو کەسێکی ئاوا بوو. حەمە حسێنی کەریمی زۆر ئینسانێکی ڕاستو دروستو پاكو بێ غەلو غەش بوو، ئینسانێکی ڕاستگۆ بوو لەقسەکانیدا. خەڵکی چاك زۆر بوون لەناوماندا، زۆریان بەداخەوە لەناوماندا نەمان، بەڵام مەبەستم لەوانەی کە لەدامەزرێنەرانی کۆمەڵە بوون بۆت باس دەکەم.

***قەت واتلێهاتووە، وەکو پێشتریش پێموتی، پەشیمان ببیتەوە لە سیاسەتو کۆمەڵەو خەباتی چەکداری، یان قەت واتلێهاتووە ڕۆژێك لەڕۆژان بیری بۆکانو سنە بکەیتو بتەوێت بگەڕێیتەوەو وەکو خەڵکی ئاسایی بژیت، کەیو چ کاتێك تۆ پەشیمان دەبیتەوە؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** هیوادارم پەشیمان نەبمەوە، بەڵام وەختێك سەرکەوتنێکمان بەدەستهێنا، نامەوێت تا پیرو لەرزۆك دەبم هەر لەکاری حزبیدا بمێنمەوە، پێمخۆشە جێیەك هەبێت، ئێمە بە سەرکەوتنێك بگەینو خەڵك بە سەرکەوتنێك بگات، منیش ئەو وەختە دابنیشم بخوێنمەوەو هاتووچۆی خەڵکی بکەم، بەڵام بۆ پەشیمان بوونەوە پەشیمان بوونەوەیەکی قووڵ نا.



*ببوورە لێرەدا هاوڕێ عەبدوڵڵا دەتوەستێنم، لەناو سەرکردایەتی سیاسی کورد دا نابینرێت ئەو کاتانەی کە شۆڕش دەگاتە دەسەڵاتو سەرکەوتن بەدەستدەهێنێ و ئەوکاتانەی کە شۆڕش لە شاخداو خەباتی چەکداری بەردەوامە واز لەدەسەڵاتو پۆستە سیادیو سەرکردایەتییەکان بێنێ، چۆن تۆ دەڵێی من پێمخۆشە دانیشم، ئەو کاتەی کە شۆڕش دەگاتە سەرکەوتن، تۆ کە پۆستێکی گەورەت بەدەستەوەبێ قەناعەتت وایە کۆڵ لە پۆستو سکرتێری دەدەیت، کە تا ئێستا هەرگیز نابینرێت لەناو سەرکردایەتی سیاسی شۆڕشی کورد دا؟

عەبدوڵڵای موهتەدی: با دەقیقتر بیڵێم باشترە، مەبەستم ئەوە نییە هەر کە سەرکەوتین من حەز دەکەم دانیشم، مەبەستم ئەوە بوو حەز ناکەم، ئەگەر بژیم تا پیری، زۆر پیر بمو لەو ئیشەدا بمێنم، پێم خۆشە توانام مابێ، تاقەتم مابێ کە زۆر شت هەیە پێم خۆشە لەژیانمدا بیخوێنمەوە هەر لەکلاسیکەکانەوە تا شتی نوێ، زۆرشت هەیە حەز دەکەم بیزانمو بیخوێنمەوە، بەلەزەتێکی گەورە لەژیانی خۆمیدا دەزانم چێژی زۆری لێدەبینم، بەڵام سەرقاڵی سیاسی ناهێڵێ بیکەم، پێمخۆشە ئەولادەکانم، ئەوەکانم ببینمو لەدەوری یەکتری بین، بەڵام با لەسەرم نەبێ بەماڵ، ناڵێم هەر کە سەرکەوتین دەچمەوە ماڵی خۆمان دادەنیشم، رەنگە هەر ئیلتزاماتیش نەهێڵێ، ویژدانیش نەهێڵێ و خەڵکیش لێت قبوول نەکات، رەنگە بۆ خۆشت پێت خۆش نەبێت.

# چل ساڵە، هیچ شەوێک بەئارامی نەخەوتوم

---

*ئێستا شەوانە بەئارامی دەخەویت یان بەترسەوە؟

عەبدوڵڵای موهتەدی: زۆر کەمن ئەو شەوانەی لەچل ساڵ لەمەوپێش بەئارامی تێیدا خەوتووم، ناڵێم هەر نییە، بەڵام کەمن، بێ خەتەراتو بێ دڵە راوکێ، بێ ترس، جارێ تا دەورەی کاری نهێنی و ساڵەهای دوای ئەوەش بوو چ لەزیندان چ لەدەرەوەی ...زۆرجار کابووس، خەونی ناخۆش بەری نەداوم، ئێستا ئەوانەم نەماون، بەڵام .. با خۆشیش هەیە، بۆچی خۆشیش لەژیانمدا هەیە، بەڵام بڵێی بێ خەم لەهەموو شتێك بخەویت قورسە، زەحمەتە.

*خۆشترین شت، خۆشترین کات لەژیانی تۆدا دەتوانی بەکورتی پێم بڵێی چییە؟

عەبدوڵڵای موهتەدی: لەژیانی شەخسیمدا؟!

*بەڵێ.

عەبدوڵڵای موهتەدی: رابواردنی خۆمە.



***کوردیش لەبیر دەکەیت ئەو کاتە؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** لەبیرکردن، ئاخر چی بڵێم، ئەوە سەردەمێکە لەژیانی تایبەتیم.

## قەت دایکم یەک زللەی لێ نەداوم

***ئاخر ئەو لەحزەیە تەنها لەگەڵ کچەکان دەژیت؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** وایە. ئەوە وایە.

***تۆ ئینسانێکی شەرمنی، ئەو شەرمە لەترسنۆکی بووە یان کاریگەریی سایکۆلۆجی و خێزانیت لەسەر بووە یان تاکتیکە؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** وەڵڵا رەنگە تاکتیك نەبێ نازانم، بەڵام من پێموایە بەشێکی زۆری لە ئەخلاقیاتی دایکم وەرگرتووە، دایکم زۆر ژنێکی لەسەرخۆو نەرمو نیان و بەتەحەموول بوو، قەت قەت من لەبیرم نایە بەحەیاتم، دایکم یەك زللەی لێدابم یان یەك وشەی ناخۆشی پێ‌ووتبم. بۆ خۆی دەڵێ (من زۆر منداڵ بووم، بەبیرم نییە) جارێکیان جنێوم داوە، زللەیەکی لەپشتە دەستم داوە، دڵی نەهاتووە لەرووەمتم بدات، لەوە زیاتر قەت هیچ شتێکی ناخۆشم لە ئەو نایەتەوە بەبیر. بۆ هەموو منداڵەکانی ئاوابوو، نەرمو نیانی و لەسەرخۆییەکی تێدابوو رەنگە تەئسیری ئەوە بێ، بێجگە لەوەش لەکاری سیاسیدا، بەتایبەتی لەو مەوقعییەتەدا کە من هەمە تووڕەبوونیش بەکەڵك نایە، تەمرینیش هەیە (من ناوی نانێم تاکتیك)، تەمرین هەیە تەحەموولت بێ بەرامبەرقسەی ناخۆش، تەحەموولت بێت لەبەرامبەر ئەو کارەی بەدڵت نییە. رەنگبێ هەرواش بێ خۆ ئینسانەکان تەبیعەت و میزاجیان جیاوازە لەیەکتری، من خۆشم دەزانم تۆزێك شەرمنم لەهەندێك شتدا، دیارە لە موناقەشەی سیاسیداو لەنووسینەکانمدا وانیم، لەدیالۆگو جەدەلی حزبی و دەرەوەی حزبیدا وانیم، بەڵام رەنگبێ لەهەڵس و کەوتی شەخسیدا وابم، هەر بەتەبیعەت ئینسانێکی شەرانی نیم.

***یانی دایکت لەماڵی ئێوە بەهێزتر بوو یان باوکت، کامیان زیاتر تۆیان خۆشدەویست؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** دایکم.



***هەم بەهێزتر بوو هەم خۆشەویست...؟**

عەبدوڵڵای موهتەدی: نا ناڵێم بەهێزتر بوو، بەڵام جۆرێك دابەشكردنی كار لەماڵی ئێمە هەبوو، كە ماڵ بەدەست دایکم بوو، چوارچێوەی ماڵ، لەتەمەنی مندا هیچ نەبێ دایکم ئیحترام و ڕێزی زۆر هەبوو لای باوکم.

***ئەو دابەشكردنی كارە لەماڵی ئێوە بەوەی كە ژن لەماڵی ئێوە، شت بووە، لەڕووی نەزەرییەوە ناچێتەوە سەر ئەوەی كە دواتر تۆ ببیتە كەسێكی ماركسی و چەپ كە لەنەزمی ماركسیزمدا هەر ئەوەیە كارەكان دابەش دەكرێ، ژن لەماڵەوە شتەو هەركەس قسەی خۆی دەكات و ئەمانە بەشێكن لەنەزمی ماركسیزم؟**

عەبدوڵڵای موهتەدی: بێگومان ئەوەش تەئسیری خۆی بووە، هەرچەندە من دەڵێم باوكم هەم كەسێكی كوردپەروەر بوو، هەم كەسێكی ئایینی و خاوەنی بڕوایەكی قووڵ بەدیانەتی ئیسلام بوو، بەڵام هەر ئەو فكری ئازادی و ئەوەی كە دیالۆگ هەبێ و موناقەشە هەبێت، ڕێی بۆ من كردەوە كە دوایی بەئاسانتر ئەو شتەی كە خۆم پێموابووكە دروستە لەژیانی سیاسی فكریی خۆمدا هەڵبژێرم.

## ئەهلی خوێندنەوە بووم

---

***لەتەمەنی گەنجێتیدا، زۆرجار كۆمەڵێك فاكتەر واتلێدەكەن هەڵچی یان حەماسەت بتگرێت و ڕێبازی جۆراوجۆر بگرێ، ئەوەی تۆ، ئەو حەماسەتی گەنجیە بوو یان زەروورەتی مێژوویی و نەتەوەیی و عەقڵی و مەنتقی خۆت بوو كە بڕیارتدا ببیتە پێشمەرگەو شۆڕشگێڕو خەبات بكەی یان هەڵوێستی بنەماڵەكەت بوو، كام لەم فاكتەرانە ڕۆڵی سەرەكی هەبوو لەوەی كە تۆ بەو شكڵە ئیش بكەی؟**

عەبدوڵڵای موهتەدی: چارەنووسی من، دیارە هەركەسە فاكتەری فەردی و بنەماڵەیی تایبەت بەخۆشی هەیەو منیش هەروا بووم، بەڵام هۆكاری گشتی هەبوون لە ئێرانی ئەو سەردەمە، لەجیهانی ئەو سەردەمە، لەكوردستانی ئەو سەردەمە، كە خەڵكی ڕاكێشاوە، دیارە خەڵكێكی زۆر نا، بەڵام نوخبەیەكی سیاسی بەرەو تێكۆشان ڕاكێشاوە، ئەو وەزعەی كە كورد تێیدا دەژیاو ئەو دیكتاتۆرەی كە ڕژێمی شا هەیبوو، ئەو فكری ئازادیخوازی و شۆڕشگێڕییەش كە لەدەهەكانی شەست و حەفتای زاینییدا لەدنیادا هەبوو، ئەو پێشینە مێژووییەی كە كورد هەیبووە، جا ئەوانە وەكو چوارچێوەو باكگراوندێكی گشتی لەناو ئەوەشدا ئیتر فەرهەنگ و وەزعی بنەماڵەی ئێمەو مێژووی بنەماڵەمان و باوكمان و برای گەورەمان و هەموو ئەمانە پێكەوە سیاسەت و فەرهەنگیشی لێ هەڵدەقووڵا، بۆیە من هەر ئاوا فێر بووم، هەر لەسەرەتاوە ئاوا بووم، بەڵام بۆ ئەوەی چ جۆر خەباتێكی سیاسی هەڵبژێرم



هەر ئەوە نەبوو بڵێین پێشینە چی بوو منیش ئەوەم هەڵبژارد، من بۆ خۆم زۆر ئەهلی خوێندنەوە بووم، زۆر ئەهلی موناقەشەو پرسین و سەرەدەرهێنان لەکاری سیاسی و ئەوانە بووم. من هێشتا نەچووبوومە زانستگاو هەر لەناوەندییەوە دەمخوێند، زۆربەی رەفیق و دۆست و ئاشناکانم خوێندکار بوون یان لەپزیشکی بوون یان لە هەندەسەو پۆلی تەکنیکی تاران بوون، بەدەمو چاوو قیافەت لەهەموویان کەم تەمەنتر بووم ، لەهەموویان منداڵتر دیاربووم، بەڵام بەڕاستی لەهەموویان جیدی تر دیاربووم. من لەناویان زۆر جیدی بووم، ئەوان سیاسەتیشیان دەکردو راشیاندەبوارد، بۆیان گرنگ نەبوو ئەمڕۆ کارێکی سیاسی بکەن و سبەی دوای شتێکی دیکە بکەون، بەڵام من جیدی بووم، پێموابوو دەبێ هەست و نەست لەسەر کاری سیاسی بێت.

*تۆ بەس خەریکی سیاسەت بوویت؟
عەبدوڵای موهتەدی: سیاسەت و خوێندنەوە، بەڵێ.

# کچێکم خۆشدەویست، بێ ئاگام بوو

*ئەی خەریکی عیشق و خۆشەویستی نەبوویت؟
عەبدوڵای موهتەدی: زۆر کەم بووە لەژیانی مندا. حەز ناکەم ئەوەی تازە وابێ، حەز ناکەم ئەولادەکانی خۆشم ئاوابن.

*کەی یەکەم عیشق و خۆشەویستیت کرد، کەلەتاران بووی؟
عەبدوڵای موهتەدی: لەتاران شتی زۆرکەمخایەن و قووڵ نەبووەو ئەنجامی نەبوو، زۆرتر دەتوانم بڵێم، بۆچی، کچێك هەبوو لەدەورەی خوێندکاریدا، ئەو زۆر بەدوای منەوە بوو، زۆرم لەسەر راوەستا، ئەو وەختە من پێموابوو دوورم دەخاتەوە لەهەدەفە سیاسییەکەم، پێموابوو لامەدەبا لەو دونیا سیاسییەی کە من خۆم بۆ تەرخانکردبوو، بۆ وەقف کردبوو. بۆیە ساڵەهاش لەسەرم راوەستا، هەموو دنیا بەشوێنمدا گەڕا، سێ ساڵ زیندانی لەسەرم وەستا، هاتە دنیای پێشمەرگایەتیش، بەڵام ... دواتر لەکاتی خەبات کاتێك کە کۆمەڵە ئاشکرا بوو، دنیای پێشمەرگایەتی و بزووتنەوەی کوردی لەکوردستانی ئێران بەفراوانی سەریهەڵدا، لەوێدا لەگەڵ هاوسەریدا هاتبوو بۆ باشماخ.
*ئەو کچە فارس بوو یا کورد؟
عەبدوڵای موهتەدی: ئەو فارس بوو، من ئەوانەم بۆ ژنەکەی خۆم نەگێڕاوەتەوە.



***تۆ فارسییەکەت باش بوو؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** ئێستاش باشە، من فارسی ئەگەر لەکوردی باشتری نەزانم، وەك کوردی دەزانم.

## پارەم بۆ کتێب و سینەمایە

***بارودۆخی ماددیت چۆن بوو کە گەنج بوویت، ئەوکاتە کە دەتخوێند لەتاران لەگەڵ برادەرەکانتدا، پارەت پێبوو، تۆ کوڕی پیاوێکی دەوڵەمەند بووی؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** ئێمە زۆر دەوڵەمەند نەبووین، زۆر ناودار بووین بەبنەماڵە، بەڵام ئەوەندە دەوڵەمەند نەبووین، بەڵام خۆم وەکو شەخسی خۆم لەوپەڕی ژیانی سادەو ساکاریدا ژیاوم، کەم خوێندکاری هەژار وەکو من ژیابێت. من هەرچی بوومو نەبوو لەپێناو کارە سیاسییەکەمدا دامنا، ئەوەی کە رەنگبێ پارەم بۆ خەرج کردبێ بریتی بوو لەکتێبو سینەما، کە تا ئێستاش دوو خۆشەویستی منن، لەوانە بەدەر بۆ هیچ خۆشییەکی خۆم پارەم خەرج نەکردووە.

## ژنەکەم بەرپرسی یەکەم دەستەی ژنانی پێشمەرگەی کۆمەڵە بووە

***چۆن ژنت هێنا کە خۆشەویتسییەکەت فەشەل بوو، یان شکستت هێنا لەو خۆشەویستییە، چۆن ژنت هێنا دواتر؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** نەکەوتمە شوێن ئەوەیان، ئەوەی کە باسم کرد، بەڵام ئەوەی دووەمیان ژنەکەم بۆ خۆی یەکێك لەو کچانە بوو کە لەپێش دەستپێکردنی شۆڕشی گەلانی ئێرانەوە بەماوەیەکی کەم فکری سیاسی لەمێشکیدا چەکەرەی دابوو، مەریوانییە، یەکێك لەوانە بوو کە کاك فوئاد دەیناسیی، لەهەرحاڵدا واریدی دنیای سیاسی بوو، مامۆستا بوو، مامۆستای سەرەتایی، هاتە نێو کۆمەڵەوە، لەپێشدا لەڕێکخستنی نهێنیدا بوو لەکۆمیتەی شارە جۆر بەجۆرەکان، دوایی هاتە نێو پێشمەرگایەتییەوە، کە کۆمەڵە پێشمەرگەی ژنی چەکدار کرد مەسئولی سیاسی یەکەم دەستەی ژنان بوو ...

***تۆ هێناتە ناو کۆمەڵەوە یان خۆی هات؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** خۆی هات، مەدیونی من نییە لەکۆمەڵە بوونەکەی، بۆ خۆی ببوو، بەڵام دوایی بڕیارماندا پێکەوە بژین.

*عاشق نەبوون، یانی عەشقێك نەبوو لەنێوانتاندا؟
عەبدوڵڵای موهتەدی: هەبوو.. هەبوو.

*کەم و زۆر؟
عەبدوڵڵای موهتەدی: ئاخر هی ئەو نازانم، هی من زۆر بوو.

## لەگەڵ برا بچوکەکەم زۆر شەرمان دەکرد

*بەگەنجی توووند بووی یان وەك ئێستا هێمن بووی، ئایا هیچ جارێك لەشەڕو هەرادا سەرت شکاوە، زۆرجار دەڵێن ئەو کەسەی بە منداڵی شەڕانیی و ئەگبەت و هاروهاج بێت، کە گەورە بوو هێمن و زیرەك و باش دەبێت، ئەمەی تۆ لەوەوە سەرچاوە دەگرێ؟

عەبدوڵڵای موهتەدی: نا بەمنداڵی هاروهاج نەبووم، بەمنداڵیش هەر لەسەرخۆ بووم، سەرم شکاوە، بەڵام لەشەڕو کەوتن و هەڵات و لەتافی منداڵیدا سەرم شکاوە، ئەوانە هەر هەن، بەڵام بڵێین منداڵێکی شەڕانی بووبم، نەخێر وانەبووم. برایەکی لەخۆم بچکۆلە ترم هەیە بەچوار ساڵ لەمن بچکۆلە ترە، دیارە لەگەڵ ئەو زۆر شەڕمان دەکرد، ئەوە شتێکی ئاساییە لەنێو منداڵاندا تا گەورە دەبن، دیارە کە گەورە بووین بێجگە لەوەی برا بووین، زۆر بووین بەرەفیقی نزیکی یەکتری و تا ئێستاش هەروا ماوینەتەوە. دایکم هەمیشە لەبیرمە (یادی بەخێربێت) بانگی دەکردم کوڕە سەنگین و گرانەکەم، هەمیشە منی ئەوها بانگ دەکرد.

*بۆچی وا بانگی دەکردی؟
عەبدوڵڵای موهتەدی: هەر بەو دەلیلەی لەسەرخۆبووم، شەڕانی نەبووم، زۆر منداڵ داوای شتیان دەکردو داوای پووڵ و پارەو ئەوەم دەوێ و ئەوەم ناوێ، من وا نەبووم داوای خواردنم زۆر نەدەکرد، داوای شتم زۆر نەدەکرد، جاری وابوو دایکم دەیگێڕایەوە هەمووجار بەمنداڵی زۆرجار کاتی خواردن و ژەمەکانم لەبیر دەچوو لەبەر کتێب خوێندنەوە، من هەر زۆر لەمنداڵییەوە سەرم لەنێو کتێبدا بووەو خوێندوومەتەوە.

***هەر زوو دەتوویست جیاواز بیت لەبراکانی ترت و وەکو چۆن هەمیشە ئێستاش دەتەوێت لەناو هاورێکانت جیاوازتر بیت و دەوری سەرکردەو لەناو ماڵەکەشدا دەتوویست دەوری کەسێکی جیاوازت هەبێت، عەبدوڵڵا جیاوازتر بێت لە سەلاح و فلان و ئەوانە؟**

عەبدوڵڵای موهتەدی: بۆ ئەوە نەبوو خۆم بمەوێت جیاواز بم، هەر خۆی ئینسان تەبیعەتێکەو وردە وردە پەیدای دەکات لەناو ماڵ و لەچوارچێوەی، بەشێکی تەبیعەت و سروشتی ئینسانەکانە، بەشێکی پەروەردەیانەو فێربوونیانە لەکۆمەڵگای خۆیان و لە بنەماڵەیان، بێجگە لەوە ئەسڵەن خوێندنەوە شتێکی زۆر ئاسایی بوو، ئێمە بەقەد کتێبخانەیەکی گەورە کتێب لەماڵمان هەبووە، هەر لەکتێبی عەرەبی باپیرمەوە هەتا...

***بەس وەختێك ئەو هێدی و هێمنەیەی تۆ وا دەکات تۆ سەرنجی دایکت زیاتر راکێشیت، دایکت هەمیشە بەمنداڵە جوان و باشەکە بانگت دەکات، ئەمە وا دەکات تۆ زیاتر بەو شکڵە بیت و زیاتر بچیتە سەر ئەوەو لەدواییدا تەئسیر دەکاتە سەر گەنجێتی و داهاتووش ئەم شکڵە دەمێنێتەوە تا ئێستا؟**

عەبدوڵڵای موهتەدی: بەڵێ رەنگە وابێ، چونکە برا بچکۆلەکەم زۆر هاروهاج و شەڕوشۆڕ و هەمیشە دوگمەی کراس کەوتوو هەمووی تەپووتۆزاوی و ئەوانە بوو، بەلام من وانەبووم.

***تۆ ژیانت خۆشدەوێت؟**

عەبدوڵڵای موهتەدی: پێموایە.

***ئەی بۆ چەندین ساڵە خەریکی دەکوژی و دەکوژرێی و لێت دەکوژرێ و لێیان دەکوژی، بۆچی چوویتە ئەو ململانێیەوە؟**

عەبدوڵڵای موهتەدی: من بەحسابی شەخسی خۆم، قەد خۆم بە ئینسانێکی، دیارە ئەوە قەزاوەتەکەی بەخۆت نییەو لەسەرخۆت نییە دەبێت خەڵکی دەوروبەرت و دوای ئەوەش ئەگەر ئەهمیەتی هەبێت بۆ مێژوو، مێژوو قسەت لەسەر بکات، بەلام بەبڕوای خۆم من ئینسانێکی زاڵم و توندوتیژو مافی خەڵك خۆرو خەڵك پێشێلکەر بۆ کاری خۆو ئاوا نیم، من بڕوام هەیە بە ئەرزش و بەها ئینسانییەکان، بەلام بۆ من کارێکی شۆڕشگێڕانەو کارێکی ئینسانی زۆر گەورەیە.



# ئینسانێکی دڵڕەق نیم

***بە کووشتنیشەوە بێت؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** کوشتن داسەپاوی دوژمنە، کوشتن و تێکەڵاوبوون لەگەڵ خەباتی پێشمەرگانەو خۆ بەکوشتدان و فیداکاری، راستییەکەی بەشی ئەسڵیەتی تا کوشتنەکە، بەڵام ئەوە داسەپاوی ژیان لەکۆمەڵگایەکی ئیستبدادی، دیکتاتۆری بەتایبەتی ئەوعی وڵاتانی جیهانی سێهەمە، خۆتان دەزانن وڵاتانی رۆژهەڵات چۆن بوون و بەشی زۆریان ئێستاش چۆنن، بەتایبەتی کورد چۆن بوون، یانی ماڵوێرانی و دەربەدەری و ئاوارەیی و ئەشکەنجەو زیندان و ئەوانە بەشێکییەتی، من منداڵ بووم چوومە ملاقاتی زیندانی کە مامم و کەس و کارم لەزیندان بوون، مەسەلەن دوای ئەوە هەر بۆ خۆم چوومە زیندان، خەڵك هاتۆتە ملاقاتم بۆ زیندان، یانی دیارە زیندانیش جەزرەبەو ئەزیەت و ناڕەحەتی و ناخۆشی پێوەیە، هەموو ئەو تاڵی و سوێرییانەی پێوەیە کە لەژیانی تێکۆشانی سیاسی لەمجۆرە وڵاتانەدا هەیە، بۆیە ئینسان پێی رادێ نەك بەو مانایەی دڵڕەق بێت، شەرت نییە ئینسان تووشی دڵڕەقی بێت، من خۆم بە ئینسانێکی دڵڕەق نازانم.

***جەنگیزخان لەو بارەیەوە قسەیەکی هەیە دەڵێ: "تاماوی بۆ ئەوەی نەکوژرێیت، دەبێت بکوژیت". تۆ ئێستا ماوی و خۆشت دەڵێی کەسم نەکوشتووە، چۆن چۆنیە ئەی، ئەم قسەیەی جەنگیزخان تا کوێ راستە یان ئەمە تەنها شمولی دیکتاتۆرەکان دەکات؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** ئاخر زۆر جیاوازە، چونکە هەم سەردەم جیاوازە، جەنگیزخان ژیانی خۆی و هەموو میللەتەکەی لەسەر ئەساسی داگیرکردنی وڵاتان و شەڕوشۆڕ دامەزرابوو، شەڕ بۆ ئەوان بەشێك لەشێوەی بەرهەمهێنان بوو. بەشێك لەژیانی میللەتی مەغۆل بووە، ئەوان چوون و شارستانیەتە گەورەکانیان داگیر کردووەو لەو نیعمەتانە کەڵکیان وەرگرتووەو هەموو ئەو شتانە کە دەزانین لەمێژوودا هەیە.. ئەگەر بەو حیسابە بڵێین کە ژیان تێکۆشانە شەرت نییە خوێناوی بێت ئەو تێکۆشانە، کوشتنی تێدا بێت، بەڵکو ژیان تێکۆشانە گەر سەرنەکەوی دەشکێی یانی ئاوا لێکیبدەیتەوە، بەڵام شەرت نییە ئەو تێکۆشانە خوێناوی بێت.



## لەچالاکیەکدا (11) تفەنگمان دەستکەوت

*یەکەمجار کە تفەنگت بەدەستەوە گرت کەی بوو؟

عەبدوڵڵای موهتەدی: تفەنگم دیوە زۆر پێش پێشمەرگایەتی، بەڵام ئەوەڵی جار کە لەپێشمەرگایەتیدا تفەنگمان بەدەستەوە گرتووە، من خۆم یەکێکیان بووم، لەڕاستیدا کاتێك بوو ئێستا پێشمەرگایەتی کۆمەڵە دەستی پێنەکردبوو، سەردەمی شا بوو، بەڵام خۆپیشاندانەکان لەئێران سەریان هەڵدابوو، وابزانم ساڵی (1978) بوو لەو کاتەدا ئێمە زۆر بەدوای ئەوەوە بووین کە چەك و چۆڵمان هەبێت بۆ کاری ڕێکخراوەیی خۆمان وەکو حزبێکی سیاسی کە ئەو وەختە هێشتا ئاشکرا نەبوو بوو، خەباتەکەمان هەر ژێرزەمینی بوو، لەوەدا هەتا سنووری سۆما و برادۆست و گەنگەچین و ئەوانە و سەر سنووری تورکی دەچووین بەنهێنی بۆ ئەوەی چەکمان دەست کەوێت، لەبیرمە کارێکمان راپەڕاندووە لەو کارەدا یازدە چەکمان دەستکەوت، یەکێك لەوانەش بەر من کەوت کلاشینکۆفێکی رەقەم (10)بوو هەتا ساڵەهای ساڵ دڵم نەدەهات کە هیچی لێبکەم، دوایی تفەنگی جوانتر زۆر بوو، بەڵام ئەوە یادگارێکی زۆر خۆشەویست بوو بۆ من، لەو ساڵانەی دوایدا ئیتر نازانم چی لێهات.

*چی لێهات ئەو تفەنگە؟

عەبدوڵڵای موهتەدی: بەڕاستی نازانم چی لێهات ئەو تفەنگە، لەناو کۆمەڵەدا بوو نازانم چی لێهات.

## کەسم نەکوشتوە

*یەکەم کەس کە کوشتت کێ بوو؟

عەبدوڵڵای موهتەدی: کەسم نەکوشتووە.

*تا ئێستا؟

عەبدوڵڵای موهتەدی: بەڵێ.

*پێشمەرگەیەکی ئازا بووی لەدەورانی پێشمەرگایەتیدا؟

عەبدوڵڵای موهتەدی: من زۆر لەشەڕەکاندا بەو جۆرە بەشداری نزیکم نەبووە، بووم لە پێشمەرگایەتیدا، بەڵام ئاوا لەشەڕی نزیکدا نەبووم.



***یەکەم شەڕ کامە بوو کە تۆ بەشداریت تێدا کرد؟**

**عەبدوڵای موهتەدی:** شەڕێك بوو لە ساڵحناوای سەقز، ئەو کاتە ساڵی (1979)بوو فەرمانی هێرشەکەی خومەینی بۆ سەر کوردستان درابوو، ئاخرییەکانی هاوین بوو، کە لەسنەوە هاتن، سنەو کامیاران و ئەو بەشانە گیرانەوە، هاتن بۆ ئەوەی سەقزیش بگرن، جا وابزانم هی ئەو سەردەمە بوو ئەگەر بەهەڵە نەچووبم یان رەنگبێ پێش ئەوە بێ بەڕاستی ئەلعان نازانم.

***شەڕێکی گەورە بوو؟**

**عەبدوڵای موهتەدی:** ئەو وەختە پێشمەرگە راهێنانێکی زۆری نەبوو، شتێکی زۆرمان نەدەزانی، کەس شتێکی زۆری نەدەزانی، هەموو کەس بەشداریی دەکرد، زۆرتر وەکو شتێکی جەماوەری وابوو، بەمەودایەکی زۆر کەم تاکەکان هاتن، دیارە ئێمە هەر ئەوەندەمان پێکرا لەدەستیان دەربازبین، هاورێیەکی نزیکی خۆمان کە ناوی ئەبوبەکر بوو هەر خەڵکی شارەکەی منیشەو بەخزمایەتیش هەر دەگاتەوە من، بەدوو قۆڵدا رۆیشتین، ئەو بەشاخەکەدا سەرکەوت و من ملەیەکی بچکۆلە بوو بەملەکەدا چووم و لەودیو دۆڵێك بوو، ئیتر شاخەکە زۆر بوو بڕی نەکردو زۆر کەس بەشاخەکەدا هەڵگەڕان، وەختێك تانکەکان هاتن تەقەی لەزۆر کەس کرد، دیارە هێلیکۆپتەریش بەسەرمانەوە بوو، بۆخۆی پیاوەتی کرد تەقەی لێنەکردین، ئەگینا هیچمان دەرنەدەچووین. لەو شەڕەدا هاورێکمان بەناوی کاك ئەبوبەکری حەمیدی کە لەگەڵ من هاتبو شەهید بو و خەڵکەکەی دیکە هەر یەکەی بەلایەکدا دەرچوون، من و چەند کەسێکی کە بەحیسابی ئەوەی کە خۆمان خستە شیوو دۆڵێکی زۆر بچکۆلە، بەڵام هەر ئەوەندەی نەدیوبووین لەتانکەکان و بەوجۆرە دەربازبووین.

نموونەیەکی تر ئێستا دەکەوێتەوە بیرم پێش ئەوە، لەنەورۆزی خوێناوی سنە، (نەورۆزی خوێناوی سنە لەمانگی رەشەمەی ساڵی (1357) بەدوو مانگێك دوای سەرکەوتنی شۆڕشی گەلانی ئێران و هاتنە سەرکاری حکومەتی تازە رووید)، بۆ خۆی شتێکی دوورودرێژە، بەڵام من کارم بەلایەنی تەقەو شەڕەکەی داوە، من لەوانە بووم کە چووم بۆ پادەگانی سنە، دیارە کە تەقەی پادەگان و خەڵك دەست پێکرا کە لەپێشدا جەماعەتی موفتی زادەو جەماعەتی سەفدەری ئەو شەڕەیان سازکرد، بەڕاستی شەڕی خەڵك نەبوو لەئەوەڵەوە، بەڵام بەهەرحاڵ پادەگان تەقەی لەخەڵك کردو خەڵکیش مەجبوور بوون جوابی بدەنەوە، تا لەوەدا من چووم بۆ ناو پادگان، دیارە ئەو وەختە کاك فوئاد مابوو، کاك فوئادی موستەفا سوڵتانی و ئەوان چوون بەرەو شوێنێك لەناو شار بەناوی (باشگای ئەفسەران کە فەرماندەی پادەگان لەوێ بەدیل گیرابوو، زۆری بەجەماعەتی هاورێیانی خۆمانی وت: نەیەڵن عەبدوڵا بڕوات، هەتا ئەو لەوێ بوو نەڕۆیشتم، بەڵام کە ئەویش رۆیشت جوابی خەڵکەکەی ترم نەدایەوەو چووم بەرەو پادەگان، ئەو شەوە کە دەچووین بەڕاستی وەکو شارە مێروولە وابوو، دیوتە مەسەلەن

مێرووله‌كان له‌سه‌رێكه‌وه‌ ڕێچكه‌ ده‌به‌ستن و له‌وسه‌ره‌وه‌ یه‌كی ده‌نكه‌ گه‌نمێك، شتێكیان پێیه‌، ئاوا ئێمه‌ ده‌ڕۆیشتین له‌وسه‌ره‌وه‌ خه‌ڵك هه‌بوو كوشته‌و برینداری ده‌هێنایه‌وه‌، به‌و حاڵه‌ش ئه‌وه‌نده‌ حه‌ماسێكی گه‌رم بوو كه‌س فكری نه‌كرد بگه‌ڕێته‌وه‌، ئه‌سڵه‌ن نه‌گه‌ڕاینه‌وه‌، چووینه‌ ئه‌وێ، دیاره‌ له‌وێ ناتوانم بڵێم شه‌ڕ بوو به‌و مانایه‌، به‌ڵام به‌هه‌رحاڵ تێكه‌وتین، له‌ناو ژوورێكی چكۆڵانه‌، زۆر كه‌سیش هاتن پێیان گوتین: كاكه‌ بڕۆن ئێمه‌ ئێستا ئاگادارین، جا ئه‌و به‌شه‌ی كه‌ ئێمه‌ چووبووین به‌ڕاستی ئه‌سڵی پادگان و سه‌ربازخانه‌ی سنه‌ نه‌بوو، ئه‌وه‌ به‌شێكی بچكۆله‌ بوو له‌ پادگان كه‌ هه‌ر تێكه‌ڵاو پاده‌گان بوو، شوێنی ژاندار میری بوو له‌وێ دامه‌زرابوو، ئێمه‌ له‌و ژاندار میرییه‌دا بووین له‌وێ زۆریان داوا لێكردین كه‌ چۆڵی بكه‌ین و بڕۆین، به‌ڵام به‌قسه‌مان نه‌كردن، ئیتر پاسداره‌كان و ئه‌رته‌ش و ئه‌وانه‌ هاتن، له‌نێو ژوورێكی بچكۆله‌دا بوو، له‌ناو ژووره‌كه‌ ده‌مانچه‌یه‌كی خۆمم پێ بوو ده‌مانچه‌ كۆنه‌كان بوو، قه‌دیمی بوو ، كه‌ پاسداره‌كان هاتن ده‌مانچه‌كه‌م ده‌رهێناو ویستم ته‌قه‌یان لێبكه‌م، به‌ڵام گیری كرد. دوو سێ جار رامكێشاو ده‌مانچه‌كه‌م گیری كرد له‌تاریكاییدا، ئه‌وانیش ته‌قه‌یان لێكردین ئیتر نه‌یان پێكاین، له‌په‌نا من یه‌كێك بوو ئه‌و پێكراو بریندار بوو له‌ڕانییان دا، ئیتر تازه‌ هیچ چارمان نه‌ماو پاسداره‌كان هاتنه‌ ژووره‌وه‌، كه‌سیش غه‌یری من چه‌كی خۆی پێنه‌بوو ته‌قه‌ بكات، من ئه‌وه‌ چه‌كی خۆمان بوو پێم، ئیتر تا ئه‌وان هاتنه‌ ژووره‌وه‌ من ده‌مانچه‌كه‌م فڕێدا، ده‌مانچه‌و چه‌ك و شتی تریشم پێبوو هه‌ر له‌وێ، له‌هه‌رحاڵدا كه‌ هاتن وتیان: كێ بوو ویستی ته‌قه‌ بكات؟ زۆریان به‌من وت تۆ ده‌تویست ته‌قه‌ بكه‌ی؟ وتم: نه‌خێر من نه‌بووم. به‌هه‌رحاڵ دایاننایین له‌په‌نا دیوار، ڕوو به‌دیوار بۆ ئه‌وه‌ی تیره‌بارانمان بكه‌ن، له‌دووره‌وه‌ بانگیان كردن وتیان مه‌یانكوژن، مه‌یانكوژن خومه‌ینی ده‌ستووری داوه‌ مه‌یانكوژن، ده‌ستیان ڕاگرت و نه‌یانكوشتین، یانی به‌موو به‌سترابووه‌وه‌، زۆر سه‌یره‌ ئه‌و وه‌خته‌ له‌دڵی خۆمدا فكرم ده‌كرده‌وه‌و ده‌موت: هه‌ر كه‌سه‌ به‌شێكی هه‌یه‌ له‌ژیاندا، به‌شی منیش ئه‌وه‌نده‌ بوو، تا ئێره‌.

# خۆم بەقەرزداری خومەینی نازانم

*هەستت نەکرد قەرزاری خومەینت کە ئەو بڕیارەی داوە نەتانکوژن؟

عەبدوڵای موهتەدی: ناوەڵا، هیچ. ئیتر نازانم بڕیاری خومەینی بوو یان سەربازو پاسدارو ئەوانە، چونکە ئەو قسانە نەبوایە بەقسەی کەسیان نەدەکرد.

*ئەو قسەیە گرنگ بوو بۆ ئەوەی تۆ نەکوژرێیت؟

عەبدوڵای موهتەدی: بەڵێ، ئەو قسەیە گرنگە، منو چەند کەسی دی کە روومان، پەنجەمانیان بەدیوارەوە نابوو.

*یەکە مجار کەی برینداربوویت؟

عەبدوڵای موهتەدی: بریندار نەبووم.

*تا ئێستا؟

عەبدوڵای موهتەدی: نەخێر.

*دەتوانی بەکورتی پێمبڵێت لەو شەڕانەی کە بووە لەناو کۆمەڵەدا گەورەترین شەڕ کە تۆ زۆر بەشەڕێکی قورست زانیبێ ئەو شەڕە کامەبوو؟

عەبدوڵای موهتەدی: بەبڕوای من گەورەترین شەڕی کۆمەڵە ئەو زنجیرە شەڕەیە کە لەبەهاری (1980) کرا لەسنە، من پێمواییە شەڕێکی بێ وێنەیە نەك هەر بۆ کۆمەڵە، رەنگە لەمێژووی گەلی کورددا کرابێت.

*ئەی نازاترین پێشمەرگە تۆ لەژیانی پێشمەرگایەتیدا لەناو کۆمەڵە بینیبێتتو زۆر پێی موعجیب بوویێت، لەناو یەکێتی نیشتمانیدا خەڵك باسی مامە ریشە دەکات، پێشمەرگەیەکی وا ئازا لەناو کۆمەڵەدا کە تۆ زۆر پێی موعجیب بوویت کێ بوو؟

عەبدوڵای موهتەدی: زۆر کەسی ئاوامان هەبوو.



# عەبدوڵلای مەولەوی ئازاترین پێشمەرگەی کۆمەڵە بوو

***یەك كەس كە تۆ زۆر پێی موعجیب بوویت، بەئازایەتی و قارەمانێتییەكەی؟**

عەبدوڵلای موهتەدی: ئاخر فەرق دەكات، مەسەلەن خەڵك دەگێڕنەوە...

***نا، تۆ خۆت بینیبێتت، خۆت ئاگات لەشەڕو هەڵسوكەوت و ئازایەتی بوویێت؟**

عەبدوڵلای موهتەدی: مەگەر بیری لێبكەمەوە، دەنا ئێستا زۆر كەس هەن كە هەمیشە ئاواتم پێیان خواستووەو پێیان موعجیب بووم بەئازایەتیان و بەخوێن ساردیان، بەلەسەرخۆیی و كۆنترۆڵیان بەسەر نەفسی خۆیاندا لەكاتی شەڕ كردندا، خەڵكی ئاوامان زۆر بوو بەڕاستی ئێستا بۆم ئاسان نییە بڵێم كێ، بڵێم كاك شوان مەسەلەن ئەوە یەكێك لەوانەبوو، كەسێكی زۆر زۆر ئاودار بوو لەكۆمەڵەدا، بەداخەوە گیانی لەدەستدا، رەنگبێ ئێستا بتوانم كەسێك بڵێم، كەسێكی تر ئێستا دەكەوێتەوە بیرم عەبدوڵلای مەولەوی یەكێك لەوانە بوو لەوپەڕی ئازایەتی و بێباكی و هەروەها لەوپەڕی ژیرییدا بوو.

***تۆ دەرچووی كۆلێژی بازرگانیت لەكۆلێژەكانی تاران ساڵی (1974)، واتە تۆ تەمەنت (17) ساڵ بوو، رێك ئەو كاتەیە كە شۆڕشی خەڵكی كوردستان لەكوردستانی عێراق هەرەس دێنێ، ئەوكاتە تۆ هیچت لەبیرە یان هیچ هەستێكی لەتۆدا دروستكرد؟**

عەبدوڵلای موهتەدی: زۆر، ئەوە كێشەیەكی زۆر گەورە بوو بۆ هەموو كوردی ئێران و بۆ ئێمەش، ئێمە لەگەڵ زۆرێك لەوانەی ئاوارەی كوردی عێراق بوون، جا چ وەكو پێشمەرگە وەكو بنەماڵە، دۆستایەتیمان هەبوو، نزیكایەتیمان هەبوو، قسەمان لەگەڵ دەكردن، قسەمان لێدەپرسین، زۆر پێمان گرنگ بوو ئەزموونی هەموو كوردستانی عێراق بزانین، لەوردەكارییەكانی تێبگەین، بەردەوام شۆڕشی كوردستانی عێراق و چارەنووسەكەی تەئسیرێكی زۆر گەورەیان بوو، بەڵێ دوای ئەوەش هەرەس هێنانەكەی.



# دەگریم، بەڵام دوور لەخەڵک

***هیتلەر جاروبار لەوپەڕی عەزمەتدا بۆ خۆشەویستەکەی دەگریا. عەبدوڵڵا ئۆچەلانیش لە حەساسترین کاتدا کە پێشمەرگەکانی راهێنانیان دەکرد دەستی دەخستە قورۆچکەوەو خەریکی خانووی منداڵان بوو، تۆ هیچ سیفاتێکی لەم شتانەت هەیە؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** گریان، نامەوێت گریانەکەم لەبەرچاوی خەڵکی بێت، بەڵام بۆ بەعزێکیان .. دیارە ئینسان بۆ هەموویان هەر زۆر داخدارە، بەڵام بۆ بەعزێکیان برینێکی زۆر قووڵە کە هەرگیز لەژیانمدا چاك نابێتەوە، زۆریان بۆ گریاوم، جاری وایە ئێستاش لەبیرەوەری کەسێکدا شیعرێك دەخوێنمەوە دڵم پێی پڕ دەبێ، بەڵام زۆرم پێخۆش نییە لای خەڵکی بێت، یانی نازانم ئەوە رەسمی کوردەوارییە یان چۆنە، بەڵام ئەگەر مەبەستت ئەو جۆرە شتانە بێت من خۆم بە ئینسانێکی عاتیفی دەزانم، نەك ئینسانێك زوو هەڵچمو بەو مانایە، بەڵام خۆم بە ئینسانێکی ساردو سڕ نازانم، خۆم بە ئینسانێکی عاتفی دەزانم، لەبەرئەوە خۆشەویستی، خەم، ئەوانە تەئسیری خۆیان هەیە لەسەرم.

# (7) کەس کۆمەڵەمان دروستکرد

***ئێستا پێم بڵێ کێ و کێ سیاسەتتان دەکردو گرووپەکەتان پێکهێنا، بەنهێنی کارتانـدەکردو لـەماڵی کێ کۆ دەبوونەوەو باسی چیتان دەکـرد، ئەگـەر بگەڕێینـەوە بـۆ سـەرەتای دەورانـی ئـەو ڕۆژانـەی کـە لەماڵێکدا بەنهێنی کۆدەبوونەوەو باسـی گـرووپ و کـاری سیاسـیتان دەکـرد، کـێ بـوون و چـۆن چـۆنی دادەنیشتن و باسی چیتان دەکرد؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** هەر دەستپێکردنی ئەوەی ئێمە بەرەسمی خۆمان بەڕێکخراوێك دامەزراندبێ و یانی بڵێین ئاوا لـەو سـەعاتەوە ئێمـە ڕێکخراوێکـی نهێنـی پێکدەهێنین کـە حیسـاب و کتـابی هەیـەو ئەنـدامی هەیـەو بەرنامـەی هەیـەو دیسـپلینی تێدایـەو مەرکـەزو ناوەنـدێکی هەیـە، بەهـەموو ئـەو حیسابانەوە دەبێـت کـە تـۆ ژیـانتی لەسـەر دابنێـی و ئەمـە بریتییـە لـەڕێکخراوی کۆمەڵـە کـە لـەپاییزی (1969)بوو.

ئەوەڵێن کەسەکانی ئەگـەر بەهەڵـە نەچووبم و هـەموویانم لـەبیر مابێتـەوە بریتـی بوون لـە (کاك فوئـادی موسـتەفا سـوڵتانی، سـدیقی کەمانگـەر، حەمـە حسـێنی کـەریمی، ئیرەجـی فـەرزاد، موسـڵحی شـێخ ئەلئیسـلامی- ڕێبـوار کـە شـاعیر بـوو، یـەدوڵای بیگلـەری ، خـۆم، سـاعیدی وەتەندۆسـت کـە دوایـی لەکاری پێشمەرگایەتییدا زیاتر بەناوی مامۆستا برایم دەمانناسی و شوعەیبی زەکەریایی)

دیـارە پێمخۆشـە شـتێك جیابکەمـەوە هەڵسـوڕاوان و پێشـەنگانی دروسـتکردنی ڕێکخراوێـك یـان حەرەکەتێك شتێکەو ئەو کەسانەی لە ئەوەڵەوە لەگەڵی کەوتوون شتێکە، یانی زۆرکەس لە ئەوەڵەوە لەگـەڵت دەکـەون و ڕەنگـە لـەڕۆژانی ئەوەڵـەوە لەگـەڵت بـن، بـەڵام هـەموو کـەس بەیـەك ئاسـت و بەیـەك ئەنـدازە نـاکرێ بەهەڵسـوڕاو یـان پێشـەنگی کارەکـەو مۆتـۆری کارەکـە نـاوی بـەرین، ئەوانـەی وتم لـەو نەوعـە بـوون، بـەڵام خـەڵکی تـرم هاتـەوە بیر کـاك یـەدوڵڵای بیگلـەری ئـەومان لەگـەڵ بـوو، لـەتاران دوو شـانەمان دامەزرانـد، ئـەوەڵ شـتێکی کـە دامـەزرا دوو شـانەی تێـدابوو، لەگـەڵ کـاك فوئـاد قسـەمان کـرد وتـی تـۆ پێـت خۆشـە لەکامیانـدا بیـت، شـانەیەکیان چـوار کـەس بـوو فوئـاد، حەمـە حسـێنی کـەریمی، موسـڵحی شـێخ ئەلئیسـلامی ومـن، کـە مـن چـوومە ئەمەیانـەوە، شـانەکەی تریشـیان فوئـاد، سـدیقی کەمانگەر لەگەڵ ئیرەجی فەرزاد کە دوایـی ئـەو شـانەیەی کـە ئێمـەی تێدابووین بـوو بەمەرکـەزی یـان ناوەندێك بۆ بەڕێوەبردنی کارەکانی کۆمەڵە، کاك موسڵیح دوای ماوەیەك لـەوەدا نـەما، ئـەو سێ کەسـە بـووین لەڕاسـتیدا بـۆ سـاڵەهای سـاڵە کـە .. ئێمـە باسـی هـەموو شـتی سیاسـیمان دەکـرد، جـارێ لێکدانـەوەو تـەحلیلی ئێـران، سیاسـەتی، ئیقتیسـادی، دەوڵـەتی، چینەکان، لەسـەر ئـەوە زۆر قسـە هەبوو، لەسەر چۆنێتی شێوەی خەبات، چۆنێتی کاری ژێرزەمینی، لەسەر ئەخلاقی شۆڕشگێڕانە کە



ئێمە دەبێ چی بێن و چۆن بێن و چی بکەین، خوێندنەوەی ئەو کتێب و نووسراوانەی کە ئەو وەختە لەو سەردەمەدا کتێبی قاچاغ بوو، کتێبە سیاسییەکان، جا کتێبی چەپ بوون، کتێبی مارکسیزمی بوون، نووسراوەکانی مائو بوون، نووسراوەی ئێرانی بوون یان هەر بەگشتی ئەو کتێبە سیاسییانە بوون کە سیاسییەکانی ئەو سەردەمەی ئێران دەیانخوێندەوە، خوێندنەوەی ئەوانە، باس لێکردنی ئەوانە، ئێمە زۆر بەووردی دەتوانم بڵێم چەند مانگ شەوو رۆژ پێکەوە بووین هەتا وایلێهات کە هەموو قسەیەکمان وەکو یەك دەچوو، جۆرێك یەکێتییەیەکی فیکری و سیاسی زۆر نزیك لەناوماندا پێکهات، هاوبیرییەکی زۆر نزیك لەناوماندا پێکهات، لێکدانەوەی ئەزموونی شۆڕشەکانی دونیا، شۆڕشەکانی ئێران، شۆڕشەکانی کورد، کۆماری مهاباد، شۆڕشی ئەیلول، هەموو بزووتنەوەکانی پێشوو هەوڵماندا بەشێوەیەکی رەخنەگرانە لێکیبدەینەوە، بزووتنەوەی چەکدارانەی ساڵی (1968)– (1969)یان (1967– 1968) ئەو بزووتنەوەیەی کە کاك سمایلی شەرەف زادەو مەلا ئاوارەو ئەوانی تێدا بوو، لێکدانەوەی هەموو ئەوانە کە کاریگەریی زۆری هەبوو لەسەرمان، لێکدانەوەی حزبی دیموکرات و مێژووەکەی، کەمووکورتییەکانی، لێکدانەوەیەکی رەخنەگرانەی حزبی (تودە)، لێکدانەوەی رەخنەگرانەی جەبهەی میللی ئێران، نازانم بڵێم چی یانی هیچ کەلێن و قوژبنێکی سیاسەت و هیچ کێشەیەك نەدەما کە ئێمە لەسەری نەڕۆین و لەسەری نەدوێین و زۆر بەووردی لێی نەکۆڵینەوەو دیراسەی نەکەین، ئەوانە هەموو ئەو شتانە بوون، چۆن نفوز بکەینە نێو خەڵکی، چۆن بچینە نێو خەڵکی، چۆن ئەندام وەرگرین، چۆن پەرە بدەین بەکاری خۆمان، داهاتووی کاری ئێمە چییە، زۆر شت لەوانە، رەخنەگرتن لە کەمووکورتییەکانی خۆمان، گوزارشتدان و راپۆرتدان لەهەموو شتێکی کە دەمانکرد بەووردی بەوپەڕی سەداقەتەوە، بەبێ شاردنەوەی یەك نوقتەی بچووکیش.

ئێمە دەبوو هەموو شتێك بتوانین بڵێین لەو گوزارشتانەو راپۆرتانەدا کە دەماندا لەچالاکییەکان، دیارە بۆ ئەوەی کە چۆن لەگەڵ خەڵکی کارمانکردووە، دەورووبەرمان کێن، ئەوانە دەبوو هەموو بڵێین، لەوەدا بیر دەکرایەوە لەوەی چ پەیوەندییەك پێویستەو چی پێویست نییەو دەبێت بیپچڕێنین و لێی گەڕێین، کام پەیوەندییە درێژە پێبدەین، رێنوێنیمان دەدا یان لەناوخۆمان رێنوێنیمان بەخۆمان دەدا، خۆمان لەنزیکەوە بەیەکتری دەناساند یانی بیۆگرافییەکی خۆمان بۆ یەکتری باسدەکرد، لەپێشینەو خانەوادەو جیران و هەموو شتێکی یەکتری دەبوایە ئاگاداربین. تۆ ئەوانە حیساب بکە دەبینی ئێمە هەم زۆر دەبین بەهاوفیکرو هاوخەت، زۆریش دەبووین بەرەفیق لەگەڵ یەکتر، دەبووین بەرەفیقی گیانی گیانی یەکتری، هەروابووین بەحەقیقەت، دیارە ئێمە کە ساڵی (1969) دەستمانپێکرد ئەوە پێشینەیەکی هەبوو لەدوو سێ ساڵی لەوەوپێشەوە ئەو قسانە هەر هەبووە، بەڵام من ئێستا مەبەستم لەوکاتە ئەوەیە وەکو رێکخراوێکی ژێرزەمینی کە سەرەوبەرەی هەیە، ئیتر دەتوانین ناوی بنێین رێکخراو، ئەڵقەیەکی رووناکبیری نییە.



## هەمووومان چەپ و مارکسی بووین

***هەمووتان چەپ و مارکسی بوون؟**

**عەبدوڵلای موهتەدی:** بەڵێ.

***بۆچی؟**

**عەبدوڵلای موهتەدی:** هەڵبەت دەگەڕێتەوە بۆ سەر زۆر هۆکار، جارێ یەکەم لەئاستی جیهانیدا دەهەی شەست و دەهەی حەفتای سەدەی بیست، دەهەی فکری چەپ و ئازادیخوازی بوو، چەپ و پێشکەوتنخوازی، هەروەها دەهەی بزووتنەوەی رزگاریخوازانەی نەتەوە ژێر دەستەکانە بەدژی ئیستعمار لەدونیادا، دەهەی سەرهەڵدان و گەشەسەندنی فێمینیزم و ئازادی ژنە لەدونیادا، دەهەی هاتنە ناوەوەی نەوەی لاو و گەنجە بۆ یەکەمجار و نەوەی کە ئەوان کەسایەتی خۆیان پەیداکردو دەهەی ئاڵوگۆڕی زۆر گەورەیە لەدونیادا، دەهەی بزووتنەوەی مانگی مەی پاریسە لە (1968)ەوە بۆ (1970) ی ئیتاڵیا، دەهەی ڤێتنامە، هەموو دونیا.

## حزبی (تودە) بووە پاشکۆی کۆماری ئیسلامی

***شۆڕشی خوێندکارانی پاریس؟**

**عەبدوڵلای موهتەدی:** شۆڕشی خوێندکارانی پاریس ئاخر مەبەستم ئەوەبوو، لەبەرئەوە دونیا ئاوابوو ئینجا ئەوجا ئێرانیش وابوو، ئەمانە بۆخۆی بەبێ لێکدانەوەی ئەم بەستێنە گشتییە جا نێو نەتەوەیی و جیهانییەکەی، ئێرانییەکەی و کوردستانییەکەی، تۆ ناتوانی بزانی کۆمەڵە بۆ سەریهەڵداو گەشەی کرد لەکوردستانی ئێران، ئەمە جیهانییەکەی بوو.. سەردەمی گیڤاراو کوبایە، لەئێرانیشدا حیسابی دیکەی هەبوو بەدوای کودەتای (1953) کە دکتۆر موسەدیق لاچوو، ئەمریکاو ئینگلیز هەمدیسان (شا)یان هێنایەوە سەرکار، حزبی ((تودە)) شکستی خواردو دەتوانین بڵێین (12) ساڵی زێڕینی دیموکراسی لەئێران لە (1941)ەوەو رووخانی رەزا شاوە هەتا (1953) ئەو کودەتایە کرا، ئەم (12) ساڵە مەبەستم نییە حکومەتێکی ئازادیخواز لەسەر کاربوو، هەر حکومەتی رژێمێکی پاشایەتی بوو، بەڵام ئەوە مێژوویەکی ترە خۆی کە حەمە رەزا شا هاتبووە سەرکار هێشتا نەیتوانیبوو ئەو ئیستبدادەی زەمانی باوکی بکوژێنێتەوە، بۆیە ئەو (12) ساڵە ئازادییەکی دیفاکتۆ بوو، جا بەهەرحاڵ کە ئەم رۆژی و کودەتا کراو حزبی ((تودە)) شکستی هێنا، شکستێکی گەورەی



خواردو جەبهەی میللی لەئێران شکستی خوارد، جەبهەی میللی دکتۆر موسەدیق، جەبهەی میللی ئێرانیان پێ دەگووت، ئیئتلافێکی گەورە بوو لەبەرەیەکی لیبرال و دیموکراتی نیشتمانپەروەری ناسیۆنالیستی ئێران بەسەرۆکایەتی دکتۆر محەمەدی موسەدیق، میللی کردنی نەوت کاری ئەو بوو، خەباتکارێك و ئینسانێکی ئازادیخوازو دژی ئیستعمار بوو.

جا مەبەستم ئەوەیە ئەم دوو لە ئۆپۆسیزیۆنی ئێرانیدا، لەڕاستییەکەی گەر تەماشای کەی لەسەدەی بیست بەبڕوای من ململانێی سێ خەتی فیکری و سیاسی هەیە لەئێران، من بەگشتی دەیڵێم کارم بەڕێکخراوەکان یان هەڵس وکەوتەکان و وردەکارییەکانی نییە، یەکەمیان خەتێکی چەپ و عەدالەتخوازە ئەوە هەمیشە لەئێران لەسەدەی بیستەمەوە هەبووە، لەشۆڕشی (1905)ی رووسیاوەو لەئێرانیش لەسەر ئەساسی مۆدێلی رووسی و ئەو وڵاتانەی رۆژئاوای ئەو وەختە، کە حزبی سۆسیال دیموکرات هەبوو لەئێرانیش حزبی سۆسیال دیموکرات هەبووەو بەزمانی ئەو وەختە پێیان وتووە حزبی ئیجتماعیونی عامیون کە ئەوە هەمان سۆسیال دیموکراتەکانە، لەو وەختەوەو تەنانەت لەپێش ئەو وەختەشەوە ئەم حەرەکەتە جۆرێك فیکری عەدالەتی کۆمەڵایەتی، فیکری چەپ و ئازادی عەدالەتی کۆمەڵایەتی ئەمە خەتێك بووە، خەتێکی لیبرال ناسیۆنالیزمی ئێران و خەتی سێهەمیان خەتی ئیسلامی، جا ئەو خەتە ئیسلامییە لەشۆڕشی مەشرووتیەتی ئێراندا جۆرێك بووەو لەسەردەمی رەزا شادا جۆرێك بووە کە عاقیبەت دەبینین لەسەردەمی (شا)دا وەکو ئیسلامی سیاسی بەشێوەیەکی نوێ سەرهەڵدەدا، مەبەستم ئەوەیە ئەم خەتە بەکودەتای (1953) زۆرێك لەو خەتانە، خەتە سوونەتیانە شکستیان هێنا، هەرەسیان هێنا لەبەرچاوی خەڵکی، هەر ئەوە نەبوو کودەتا شکاندن بێت، شکان و هەڵنەستانەوە.

حزبی ((تودە)) ئەو وەختە حزبی ئەسڵی بوو لەناو چەپدا، ئەم حزبە لە (1953)ەوە کە شکاو شکستی هێنا، بەڕاستی هەرگیز جێگەی خۆی نەگرتەوە، قەت نەبووەوە بەو حزبە، دیارە لەسەردەمی شۆڕشی ئێران (1978-1979) ئەو وەختە تۆزێك ژیایەوە، بەڵام جێگەو پێگەی خۆی لەکۆمەڵگای ئێرانی قەت وەرنەگرتەوە. لەڕاستیشدا بەبڕوای من چیدی نەدەکرا پێی بڵێن حزبێکی چەپ، چونکە بوو بەپاشکۆی کۆماری ئیسلامی و بوو بەپشتیوانی ئیسلامی سیاسی، بۆ وای لێهات؟ ئەمە خۆی مێژوویەکی هەیە، سەرچاوەکەو هۆیەکەی ئەوەبوو کە ئەوان لەو بڕوایەدا بوون بەحیسابی ئەوەی پاشکۆو گرێدراوی سیاسی یەکێتی سۆڤیەت بوون، پێیان وابوو لەسەر ئەساسی سیاسەتی خارجی شورەوی هەرچی بەقازانجی شورەوی بێت ئەوە شۆڕشگێڕانەو راستە، قازانجی شورەویش ئەوەبوو دژی ئەمریکا بوو لەبەرئەوە بەحیسابی دژایەتی ئەمریکا ئەوان خۆیانیان بەهاوتەریب زانیەوە لەگەڵ کۆماری ئیسلامی ئێران و ئیتر بۆچ کەوتنە ئەوەو عاقیبەتیش جمهوری ئیسلامی خۆ رەحمی ئەوەشی پێنەکردن و بەزەیی پێیاندا نەهات، خۆشیانی داپڵۆسی و دوای ئەوە خەڵکی تری داپڵۆسی.

لەهەرحاڵدا حزبی ((تودە)) لە (1953)ەوە شکا، جەبهەی میللیش شکا، ئەویش لە شۆڕشی گەلانی ئێران تۆزێك سەریهەڵدایەوە، بەڵام ئەویش هەرگیز جێگەی خۆی نەگرت، ئەی چی جێگای ئەوانی گرتەوە؟ ئەو ئۆپۆسزیۆنە ناودارانەی کەلە چلەکان و پەنجاکان کە هەموو فەزای سیاسی ئێران بەدەستی ئەوان بوو، چییان لێهات لەدوای شکستی ئەوانەو حەرەکەتی ئۆپۆسزیۆنی یان بڵێین حەرەکەی شۆڕشگێڕانەو سیاسی بەدژی حکومەتی شا چ شکڵێکی بەخۆوە گرت؟

وەڵامەکەی ئەوەیە لە(1960) شەستەکاندا حەرەکەتی نوێی چەپی ئێران لەناو زانستگاکان و لەناو خوێندکاراندا سەریهەڵدا، بەڵام ئەم حەرەکەتی تازەی ئۆپۆسیزیۆنی چەپی رووناکبیری ئێرانی کۆمەڵێك تایبەتمەندی هەبوو، یەکیان ئەوەیە زۆر رەخنەگر بوون لەحزبی ((تودە))، پێیان وابوو حزبی (تودە) هەڵەی زۆری سیاسی کردووە کە حەقیقەتیش وابوو.

جا هەڵەکانی زۆرن، یەك پێی وابوو زۆر گرێدراوی یەکێتی سۆڤیەتن و لەجیاتی ئەوەی بەرژەوەندی خەڵکی ئێران و شۆڕشەکەی ببیننەوە، کە هەر وابوو حەقیقەتێکی تێدایە، پێیانوابوو رەهبەرانی حزبی ((تودە)) خائن و سازشکار دەرچوون و زۆرێکیان رەفیقەکانی خۆیان بەگرتداو بۆ خۆیان لەناو زیندان خیانەتیانکرد، پێیان وابوو لەکاتی کودەتادا ئەوان رێکخراوێکی گەورەیان بوو بەناوی سازمانی ئەفسەرانی حزبی (تودە)ی ئێران، گەورەترین رێکخراوێك بوو کە لەنێو ئەفسەرانی ئێرانی و لەنێو هەموو رۆژهەڵاتی ناوەڕاست رێکخراوێکی ئاوا نەبوو. لە خەلەبانی تەیارەوە بوویان هەتا کۆمەڵێکی زۆر سەرهەنگ و هەموو پلەکانی ئەرتەشی ئێران خەڵکیان لەگەڵ بوو، لەتۆپخانە خەڵکیان لەگەڵ بوو، لەبەشی زرێپۆش خەڵکیان لەگەڵ بوو، زۆرێکیان مامۆستا و ئەفسەرەکان بوون لەگەڵیان بوون، رێکخراوێکی تۆکمەی فێرکراو بەڕاستی، هەربۆیە دەبوو لەکودەتای (1953)دا بووەستنەوە بەرامبەر بەکودەتا، ئەگەر ئیرادەکەی بوایە، ئەگەر سیاسەتی سەحیح زاڵبوایە سیاسەتی دروست هەر نەیاندەهێشت، کودەتای (1953) لات و لوت کردیان هیچ کەس نەبوو، بەڵام زۆر خاو وخلیچك بوون، سیاسەتی بەسەریاندا زاڵبوو، رەهبەری حزبی ((تودە))ی ئێران دەستەوەستان مایەوە، لەکاتی پێویستدا نەیتوانی بێتە مەیدان، نەیتوانی خەڵك بێنێتە مەیدان، ئەو هەموو خەڵکەی لەگەڵ بوو جەماوەریترین حزبی سیاسی ئێران بوون، بەڵام دەستەوەستان و پەککەوتەو سازشکار مایەوەو رەهبەرانیشی کە چوونە زیندان زۆرێکیان هیچ و پووچ دەرچوون.

ئەمانە وایکرد نەسلی نوێی خەباتکارانی ئێران حزبی (تودە)یان قبوڵ نەبێت، زۆرێکیان پێیان وابوو دەیانگووت، ئەوەشیان راستدەکرد، کە سیاسەتی حزبی (تودە) بۆ لەجیاتی ئەوەی زۆر دژی شا بێت نیوەی زیاتری دژی موسەدیق بوو، تۆ دەبێت تەشخیسی بدەی ئیستبدادی زاڵ کێیە لەئێران، ئیستبدادی زاڵ شا بوو کەی موسەدیق بوو، خۆ موسەدیق ئازادیخوازتر بوو، دەبوو عەقڵی ئەوەیان بێ ئیئتلافێکی سیاسی بکەن لەگەڵ موسەدیق، ئەوەشیان نەکرد.

لەبەرئەوە هەم گرێدراوییان بەشورەوی هەم سیاسەتی ناسەحیحیان و هەم ناشۆڕشگێڕبوون و دەستەوەستانیان وایکرد رووی تیژی رەخنەی نەوەی نوێی سیاسیونی ئێران لە شەستەکاندا رووەو حزبی (تودە) بێت، جا ئەمە نەسلێکی تازەو نوێی چەپی لە ئێران خوڵقاند، جا رووبەکی تریشیان لەجەبهەی میللی دکتۆر موسەدیق بوو، ئەویش ئەوەبوو دکتۆر موسەدیق قاتیع نەبوو، لێبڕاو نەبوو لەبەرامبەر مەسەلەی پادشایەتیدا، راستیش بوو هەر بەحەقیقەت وابوو دکتۆر موسەدیق دەیگووت: " شا دەبێت سەڵتەنەتی خۆی بکات، پادشایەتی بکات، حەقی نییە لەکاروباری حکومەتدا دەخالەت بکات، یانی موسەدیق دژی نیزامی سەڵتەنەتی نەبوو، راستە خۆی پیاوێکی ئازادیخواز بوو لەزۆر بواردا، بەڵام بەشێوەی پەرلەمانی و قانوونی دەیویست کار بکات و هەر ئەوەش پەکی خست، ئەوەش بوو بەجێی رەخنە، نەسلی نوێ و نەوەی نوێی شەستەکانی ئێران وردە وردە کەوتنە سەر ئەو فیکرە کەنە سیاسەتی حزبی (تودە) ونە جەبهەی میللی بەکارنەهات، ئەوانە نەیانتوانی ئێران نەجات بدەن، جا چونکە کودەتاش کرابوو، چونکە ئەو (12) ساڵەی کە باسمکرد ئازادییەکی دیفاکتۆ بوو ئەوەش نەمابوو، رژێمێکی دیکتاتۆری رۆژ بەڕۆژ توندووتیژتر بەسەر ئێراندا بوو، ئەمە رای گشتی سیاسی لەئێران رادیکاڵیزە کرد یانی بردی بەرەو سیاسەتێکی رادیکاڵترو توندترو لێبڕاوانەتر.

بۆیە دەبینی لەئاخری شەستەکانداو حەفتاو یەك و ئەوانە بزووتنەوەی چەکداری سازمانی چریکەهای فیدائی خەڵکی ئێران پێکدێ، زۆر بەکەمیش باسکرا لێکۆڵینەوەیەکی وردتری دەوێ و رەنگە قسەکانی من زۆر مرەتەب و رێکوپێکیش نەبن، بەڵام ویستم شەرحێکی کورت بدەم لەو زەمینەی کە لەشەستەکاندا لەئێران هاتە ئاراوە، ئەویش فیکرێکی رادیکاڵترو شۆڕشگێڕترو قاتیعترو لێبڕاوتر لەناو ئۆپۆسزیۆنی ئێرانداو چەپتر، چەپێك کە ئیتر حزبی (تودە)ی قبوول نەبوو، زۆرێکیان شورەویشیان قبوڵ نەبوو، یەکێتی سۆڤێتیشیان قبوڵ نەبوو. جا دیارە پێکهاتنی کۆمەڵە هۆکاری کوردستانیشی هەیە، چونکە ئەوەیە تایبەتمەندی دەدا بەکۆمەڵە، بەڵام لەو زەمینە جیهانییەو لەزەمینە ئێرانییەکەیدا کۆمەڵەش تەغزییەی دەکردو لەوانە تەئسیری وەردەگرت، بۆیە هەر رێکخراوێك ئەو سەردەمە بیویستایە بەراستی شۆڕشگێڕ بێت، کارێك بکات و کاریگەرییەکی هەبێت، کەم تا زۆر دەبوایە لەهەڵسوکەتیدا شۆڕشگێڕ بێ و بەرەو فیکری چەپ دەڕۆی بەهەموو حیسابی ئەو شتانەی کەوا باسمکرد.



# کۆمەڵە زوو چووە ناو خەڵک

***دەمەوێت لێرەوە دیسان لەو مێژووەی کە ئێستا وەستای پاش سەردەمی موسەدیق و حزبی (تودە)و هاتنی چریکەکانی فیدائی خەلکی ئێران لەم مێژووەوە تاوەکو ساڵی (1980)یان تا دەورانی شۆڕشی خەلکی ئێران و راپەڕین، باسی مێژووی کۆمەڵەم بۆ بکەی، ئەو ئاڵوگۆڕانەی بەسەر کۆمەڵەدا هات، ئێوە چیتان کردو چۆن چۆنی کۆمەڵە گەشەی کرد تا شۆڕشی خەلکی ئێران؟**

**عەبدوڵلای موهتەدی:** ئێمە کارێکی کە کردمان، یەکەم ئەوەیە کە رێکخراوەکەمان کرد بە رێکخراوێکی زۆر زۆر جیدی و زۆر بەدیسپلین، بۆیە دەتوانم بڵێم وەك لەفارسیدا دەڵێن بوون بە ئەندامی کۆمەڵە ئەوکات بەراستی وەك حەوت خانی رۆستەم وابوو، حەوت خانی رۆستەم مەشهورە کە لەئەفسانەی شانامەدا دەڵێن رۆستەم بەحەوت خان تێپەڕیوە، حەوت تاقیکردنەوەی گەورەی تێپەڕکردووە تا بووە بەو رۆستەمە، بەڵام لەهەرحاڵدا ئەوەش وابوو.

لەبارەی هەموو هەڵسوکەوتێکەوە زۆر سەختگیر بووین، لەبارەی هەموو چالاکییەکەوە کە هەر کەس بووی، ئێمە یەکێك لەکارەکانمان ئەوەبوو کە هەوڵماندەدا زۆر فێربین یانی ئەو وەختە ناومان نابوو تەجروبەی نێو زیندان، تەجروبەی زیندان زۆر فێربین، بزانین هەڵسوکەوتی چۆنە، بزانین چۆن خۆمان فێری خۆراگری بکەین، چۆن خۆمان فێری ئەوە بکەین کە لەزیندان چاك جواب بدەینەوە، نهێنییەکان بپارێزین، وردە وردە ئێمە ئەندامەکانمان پەرەپێدا لەتاران و تەورێز و لەنێو خوێندکارانی کوردی تەورێز، لەسنە، لەمەریوان، لەمهاباد، لەبۆکان و لەهەموو شارەکانی ناو کوردەواری، هەروەها لەنێو ئەو کوردانەی کە خوێندکار بوون لەتاران و لە شارە گەورەکان دەیانخوێند.

شتێکی دیکە کە دوای ماوەیەك هاتە ناو کۆمەڵەوە بریتی بوو لەچوونە ناو خەڵك، ئێمە لێکدانەوەیەکمان هەبوو، پێمانوابوو نوقتەیەکی لاوازی ئۆپۆسزیۆنی ئەو وەختەی ئێران بریتییە لەدووری لەخەڵك و لەجەماوەر، حەرەکەتە سیاسییەکان زۆری لەنێو رووناکبیراندایە، زۆری لەنێو خوێندکاراندایە لەوێ سەرهەڵدەدات، بەڵام ئەی چۆن لەو ئەڵقە تەسکە بێتە دەرەوە، چۆن دەچێتە نێو کرێکاران و زەحمەتکێشان و جەماوەری فراوانی خەڵك، چونکە ئێمە لەو بڕوایەدابووین کە پێکهێنانی ئاڵوگۆڕی گەورە لەمێژووی کۆمەڵگایەکدا بەبێ جەماوەری فراوان و بەبێ کۆمەڵانی بەرینی خەڵك، بەبێ هەستانی ئەوان، بەبێ کاریگەریی ئەوان و بەبێ دەستی ئەوان و مێشکی ئەوان مومکین نییە، لەبەرئەوە دەبوایە ئێمە رێگەیەك بدۆزینەوە بۆ ئەوەی چۆن ئێمە بیروباوەڕی ئازادیبەخش و روونکەرەوەی خۆمان دەبەین بۆ ناو خەڵك و چۆن وردە وردە خەڵك رادەکێشین بۆ ئەوانە، مەوزوعێکی دائیمی و هەمیشەیی ناو کۆمەڵە بوو چۆن بتوانێت بچێتە ناو خەڵك.



یانی هەم بۆ روونکردنەوەو وشیارکردنەوەی سیاسی خەڵك کاریکات و هەم ئەوەش چۆن خەڵك لەخەباتی خۆیدا، چونکە خەڵك خەباتی رۆژانەشی هەیە، کرێکاران، جوتیاران، ژنان، خوێندکاران ئەو جۆرە خەباتی سیاسیش هەیە، ئەم خەباتەی خەڵك چۆن بەرینە ئاستێکی سەرتر تا لەحاڵەتی خەباتێکی سینفی یان بچووك و بەرتەسك بیهێنینە دەرێ و بیکەینە خەباتێکی جەماوەری، ئەوە کارێکی دائیمی و گەورەی ئێمە بوو، هەر لەدرێژەی ئەوەشدا بوو، زۆرتر دەتوانم بڵێم ئەمە پێشنیارو دەستپێشخەری کاك فوئاد بوو، بەو نەتەیجە گەیشتین کە ئێمە دەبێ بۆ ئەوەی لەو دونیای تەسکی رووناکبیری و ناو رێکخراوەکەی خۆمان و ناو خوێندکارو رۆشنبیران بچینەدەرەوەو پەیوەندییەکی راستەقینە لەگەڵ خەڵکی پەیدا بکەین، لازمە بچین وەکو ئەوان کاربکەین، وەکو ئەوان بپۆشین، وەکو ئەوان بخۆین و بنۆشین، بۆیە تەقریبەن دەتوانم بڵێم هەموو ئەندامانی ئەو وەختەی کۆمەڵە کەم تا زۆر چووین بەرەو کارکردن یانی لەنێو کێڵگەو مەزراو دێهات و چووینە نێو کارکردنێکی پان و بەرینەوە، هەروەها لەکارگەو کارخانە سەنعەتییەکان و شەریکەو کۆمپانیاکان، زۆرێکمان هەوڵماندا وەکو کارگەر بچین وەکو ئەوان کاربکەین، وەکو ئەوان بژین و لەدوای ئەوکارە کە دەهاتینەوە ئەزموونی خۆمان باس دەکرد، شێوەی هەڵسوکەتمان باسدەکرد، لێی دەکۆڵرایەوە کە ئێمە چۆن بکەین کە بتوانین وەکو یەکێك لەخەڵکی هەڵسوکەوت بکەین، چۆن نەچین لەنێویان قسەی زل زل رووناکبیرانە بکەین، چۆن دەتوانین وردە وردە متمانەی خەڵکی بەدەست بهێنین و دۆستایەتی و خۆشەویستی ئەوان بەدەست بهێنین، چۆن نفوزیان تێبگەین.

ئەوە خاسیەتی زۆری بوو بۆ کۆمەڵە، جارێ یەکەم ئێمەی لەگەڵ توێژێکی کرێکاران و زەحمەتکێشان، ناڵێم توێژێکی زۆر پان و بەرین لەدەرەوەی کاری نهێنیدا، بەڵام بەهەرحاڵ لەگەڵ توێژێکی کرێکاران و زەحمەتکێشانی کوردستان لەنزیکەوە کرد بەئاشناو ئێمەی تۆزێك لەچوارچێوەی سینفە رووناکبیرییەکە هێنایەدەرو هەربۆیەشە دەبینین کە لەدەرەوەی کاری نهێنیدا ئێمە زۆرمان رەفیقی کرێکارو زەحمەتکێش و کاسب کە غەیری رووناکبیر بوو، غەیری خوێندکار بوو، زۆرێکمان پەیدا کردوو زۆرێکیشیان بوون بە ئەندامی کۆمەڵەو لەداهاتووش بوون بەکادری کۆمەڵە. خاسیەتێکی تری ئەوەبوو کە لەو حاڵەتەی کە رەنگبێ کە رووناکبیرێکی سیاسی ئەوەی کە لەدەورەی دیکتاتۆریدا کە رێگەی نییە، وابوو لەنێو ئێران ئەو وەختە رێگەت نەبوو بچیتە نێو خەڵکی، تۆ زۆر جیاواز بوویت، رەنگبێ تەسەوراتێکی زۆر ناواقعی و رۆمانتیکی لەبارەی خەڵکەوە هەبێت، ئەوەش تۆزێك ئێمەی گۆڕی یانی تێگەیشتین روانینێکی واقیعی تری دا بە ئێمە.



# زۆربەی مامۆستایان و روناکبیران و ژنان لەگەڵ کۆمەڵە کەوتن

***ببورە لەم هەموو کارو چالاکی و فەعالیەتانەی کۆمەڵەدا، هەر ئەو چوار پێنج کەسەی شانەکان بوون، یان کێی تر زۆر فەعال بوو کێ خەریکی چالاکی بوو؟**

**عەبدوڵلای موهتەدی:** ئەزانی چۆنە، ئێمە وردە وردە ژمارەی ئەندامانمان زۆر بوو، یانی هەر شانەمان پێکدەهێنا، خۆ رانەدەوەستاین، راستە وتم بوون بەئەندام ئاسان نەبوو، رەنگە ساڵەها درێژەی کێشابایە، بەلام لەڕاستیدا ئێمە تۆڕێکمان لەکوردستان تەنی، لەساڵەکانی پێش شۆڕشی گەلانی ئێران، پێش (1979) تۆڕێکمان لەشارەکانی کوردستان تەنی.

***خەڵکی رووناکبیر، گەنج؟**

**عەبدوڵلای موهتەدی:** بەڵێ، خەڵکی رووناکبیر، کرێکارانیش، زەحمەتکێشانیش، ژنانیشمان لەگەڵ کەوتن، بەڵێ ژمارەیەك ژنانیشمان لەگەڵ کەوتن، مامۆستایان، موعەلیمان، موعەلیمانێکی زۆرمان لەگەڵ کەوتن، ئاخر بۆیە مەسەلەن بەهەڵکەوت نییە دوایی کە شۆڕشەکە روویدا تەقریبەن موعەلیم نەبوو لەکوردستان لەگەڵ ئێمە نەبێت، بۆیە کەم رووناکبیر هەبوو لەگەڵ ئێمە نەبێت.

# کۆمەڵە بوو بەحزبی یەکەم و پێش دیموکرات کەوت

***لەگەڵ ئێوە یانی کێ؟**

**عەبدوڵلای موهتەدی:** یانی لەگەڵ ئەو کۆمەڵەیە، لەنێو شەبەکەی ئێمەدا بوون، ئێمە ئەندامەمان هەبوو.

# حزبی دیموکرات لەتاراوگەوە هاتەوە

***هێشتا ناوتان نابوو کۆمەڵەی زەحمەتکێشان؟**

**عەبدوڵلای موهتەدی:** نەخێر نێومان نەنابوو کۆمەڵە، بەلام لەگەڵ ئەو رێکخراوە، شەبەکەیەك بوو ئەندامەکەی دیاربوو، بەرئەندامی دیاربوو، ئەو کەسانەی کە لایەنگربوون و لایەنگری تەشکیلات بوون و ئەوە یانی بەقەد خۆمان هەڵدەسوڕاین.



***کادری باشتان هەبوو، کادری دەرەجە دووی باش؟**

عەبدوڵڵای موهتەدی: یەکجار زۆر، خوێندکاران، مامۆستایان، رووناکبیران، بەشێکی خەڵکی پێشکەوتوو لەنێو کرێکاران و زەحمەتکێشان، کۆمەڵێك لەژنانی تێکۆشەر کە ئاگاهیان زۆرتر بوو، هەموو ئەوانەمان لەگەڵ بوو، بەڵام ئەو تۆڕە هەر دەهات و بەرینتر دەبوو بۆیەشە کە خۆپیشاندانەکان لە (1978)– (1979) دەستپێکرا لەشارەکانی کوردستان زۆربەی خۆپیشاندانەکان هەر ئێمە بووین، ئێمە لەپێشەوە بووین، ئێمە رێکمان دەخست، ئێمە بەمەعنای ئەو تۆڕە فراوانەی کە باسمکرد، ناڵێم خەڵکی دیکەی تێدا نەبوو، خەڵك فرە چەشن بوو هەموو کەسی تێدابوو.

بەڵام ئێمە دەورێکی زۆر باڵامان هەبوو لەرێکخستنی خۆپیشاندانەکان، لەرێکخستنیان و لەهەموو ئەو کارانەدا، بۆیە هیچ سەیر نییە کە وەختێك کۆمەڵە خۆی ئاشکرا کردو حزبی دیموکرات بوو بەنزیك راپەرین و حزبی دیموکرات لەتەبعیدو تاراوگەوە هاتەوە دوای ماوەیەکی کەم کۆمەڵە زۆر بەئاسانی یەکێك لەدوو حزبی سەرەکی کوردستان بوو، باوەڕم پێبکە سەرتۆپی رووناکبیری کورد وەك چۆن توێی شیر ئاوا توێیەکەی دەگریت وەك قەیماغ، تەقریبەن قەیماغی سەرتوێژەکەی ئێمەی رووناکبیرو سیاسیونی ئەو سەردەمەی کوردمان گرت، یانی چاکترین دکتۆرەکان و موهەندیسەکان و باشترین زیندانیانی سیاسی، ئەو مامۆستایانەی دێهات و لادێکان کە خۆشەویسترین کەس بوون، ئەو مامۆستایانەی ناوەندی کە ئەگەر هەر ئینتخاباتێك دەکرا، خەڵکی ئەوانیان هەڵدەبژارد، لەگەڵ ئێمە بوون. بۆیە ئێمە یەکجار کادرمان زۆربوو، یانی هیچ حزبێك ئەو وەختە بەقەد ئێمەی خەڵکی کادرو خوێندەوارو رووناکبیر لەگەڵی نەبوو، ئەو شەبەکەو تۆڕە فراوانە لەشارەکانی کوردستان و لەتاران خەڵکمان بوو لەتەورێز خەڵکمان بوو.

# تورك و فارسمان لەگەڵ بوون

---

***تورك و فارس؟**

عەبدوڵڵای موهتەدی: تورك و فارسمان تێدا بوو، بەڵام زۆر نا، بەڵام ئێمە دوای هاتنە سەرکاری جمهوری ئیسلامی دیسان بەنهێنی رێکخستنی تارانمان هەبوو، کۆمەڵە رێکخستنی خۆی هەبوو لەتاران، زۆری کورد بوون، بەڵام غەیری کوردیشی تێدا بوو. رێکخستنی تارانی ئێمە لەزۆرێك لەرێکخراوەکانی دیکە کە سەرانسەری بوون و لەئاستی هەموو ئێران چالاکیان دەکرد، لەهی زۆریان گەورەتر بووین لەبەشی هەر زۆریان بەس رێکخستنی تارانی ئێمە، تەشکیلاتی تارانی ئێمە گەورەتر بوو لەهی زۆرێکیان لەهی هەموویان.



# ئیبراهیم عەلیزادە درەنگ هات

* تۆ پێت نەگووتم کێ بوون ئەو هەموو خەڵکەی بەڕێوەدەبرد، تۆ، دکتۆر جەعفەر..؟

عەبدوڵڵای موهتەدی: دکتۆر جەعفەری شەفیعی، عومەری ئیلخانی زادە، برایمی عەلی زادە، ئەیوبی نەبەوی، یوسفی ئەردەڵان، عەبدوڵڵای بابان، فارووقی بابە میری کە تۆزێک دواتر هات، برایمی عەلیزادە لەنەوەڵەکان نەبوو، بەڵام دوو ساڵ سێ ساڵێک ئەگەر بەهەڵە نەچووبم ئەویش لەگەڵ ئێمە کەوت، خەڵکی ئاوامان هەبوو کە نزیکی و عەتفێکیان هەبوو.

*سدیقی کەمانگەر؟

عەبدوڵڵای موهتەدی: سدیقی کەمانگر هەر لە ئەوەڵەوە بوو، لەدامەزرێنەرانی کۆمەڵە بوو، عەتای رۆستەمی یانی نازانی خەڵك چەندە زۆر بوون.

# کاك فوئاد پێشەنگ بوو

*کێ لەناو ئەوانەدا زۆر فەعال بوو، زۆر چالاك بوو، تۆ بووی؟

عەبدوڵڵای موهتەدی: من ناتوانم بڵێم من بەتەنها بووم.

*دکتۆر فوئاد، تۆ، دکتۆر جەعفەر بوو؟

عەبدوڵڵای موهتەدی: نازانم بڵێم چی، من خۆم بەفەعالتر دانانێم لەخەڵکی تر، نازانم بڵێم چی، خۆ ئێمە شەو و رۆژمان نەبوو، خەو و خۆراکمان نەبوو، چالاکێکی هەمیشەیی و دائیمی بووین، ئەگەر بڵێین موئەسیر بوون و کاریگەر بوون بێت لەسەرەتادا کۆمەڵە خۆی ئاشکرا کرد، تەقریبەن دەتوانم بڵێم کاك فوئاد بوو، ئەو حاڵەتەی لەنێو ئێمە بوو، وەکو گەورەیەك و سەرکردەیەك لەچاو باقیەکەمان.

# (ژ.ک) و کۆمەڵەی رەنجدەرانی عیراق هۆکاربوون بۆ کۆمەڵەبوونی ئێمە

# (26) رێبەندان دوو مانای هەبوو، دانرا بەرۆژی کۆمەڵە

***دوای کاك فوئاد؟**

**عەبدوڵلای موهتەدی:** کەسمان رەنگبێ ئاوا نەبووبێ بەو ئەهەمیەتەو بەو ئیجماعەی لەسەربێ، بەڵام ئیتر لەدوایدا من هەڵبژێردرام، دوای ماوەیەك من هەڵبژێردرام، منیش یەکێك لە چالاکەکان بووم، دواتر کە وەکو بڕیارماندا سکرتێرێك هەڵبژێرین، منیان هەڵبژارد.

***ئیتر ئێوە خۆتان وردە وردە خەریکن خۆتان ئیعلان دەکەن، ناوێکتان داناوە، بۆچی کۆمەڵەی زەحمەتکێشان بوو؟**

**عەبدوڵلای موهتەدی:** جارێ یەکەم کۆمەڵە خۆی مەعنایەکی هەیە یانی حزب و کۆمەڵ و ئەسۆشیەشن و سازمانی رێکخراوێکە، دووەم ئەوەیە کۆمەڵەی (ژ.ك) زۆر خۆشەویست بوو لای ئێمە ئەمەش هۆیەك بوو، رەنگبێ ئەوەی کە پەیوەندیمان لەگەڵ کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستانی عیراق بێت ئەو ناوەشمان هەڵبژارد، شۆڕشگێڕ چونکە خۆمان بەشۆڕشگێڕ دەزانی، زەحمەتکێشان، چونکە خۆمان بەحزبی زەحمەتکێشانی کوردستان دەزانی، کوردستانی ئێرانەکەشی پێوە بوو تەبیعییە پێگەی جوگرافیای چالاکی سیاسیمان کوردستانی ئێران بوو، جا ئەم کۆبوونەوەیەی کە ئەم ناوەی تێدا دانرا، کۆبوونەوەیەکە ئێستاش لەبیرمە، دەزانم کاك فوئادی تێدا بوو، دکتۆر جەعفەری شەفیعی تێدابوو، من و کاك ساعیدی وەتەندۆست، بەڕاستی لەبیرم نەماوە کێی تر، بەڵام دەزانم ئەوانەی تێدا بوو لەوێ رۆژی (26)ی رێبەندانی کە مانگی بەهمەنە بەحیسابی فارسی دەکاتە (16)ی فێبریواری (1979)، 26ی رێبەندانی (1357) کۆمەڵە خۆی بەعەلەنی رادەگەیەنێت.

بۆچی جا ئەو رۆژە؟ چونکە ئێمە یەکێك لەخۆشەویسترین و چالاکترین کەسایەتیەکانمان کە حەمە حسێنی کەریمی بوو کە موهەندیسی کشتوکاڵ بوو، یەکێك لەوانە بوو زۆر سیمایەکی شەعبی و خەڵکی بوو، زۆر لەناو خەڵکدا بوو، دەچووە هەر جێیەك خۆشەویستی خەڵکی بۆ خۆی دەستەبەر دەکرد، لەمەهاباد مامۆستابوو لەمەدرەسەی کشتوکاڵدا، لەوێ شاگردەکانی زۆریان بوون بەپێشمەرگەی کۆمەڵەو کادری کۆمەڵە، لەوێ چالاکی دەکرد، بۆ خۆی خەڵکی سەقز بوو هەروەها دیاربوو یەك تۆز سەرگەردنی لەخەڵکی دیکە بالاتر بوو، زۆر موحتەرەم و جێگەی رێز بوو لەنێو رووناکبیران و سیاسییەکانی ئەوێدا، ئەو کاك حەمە حسێنە ناردبوومان لەبەینی سەردەشت و پیران

شار لەمیراویێ لەوێ وەکو بەنایەك کاری دەکرد، زۆر دەست رەنگین بوو، یەکجار لەدەستو پەنجەی خۆیدا قابیل بوو، هەموو کارێکی دەزانی، یەکێك لەوانەی لە دەورەی کاری نهێنیدا جێی بۆ دروست دەکردین، جێی دروست دەکرد کە شتی قاچاغی لێبشارینەوە حەمە حسێنی کەریمی بوو، ئەوەی ئەو دروستی دەکرد، هەرچی ساواك بهاتایەو لەوماڵە گەڕابایە بۆی نەدەدۆزرایەوە، ئەوەندە بەووردی شتی دروستدەکرد، خشتی لادەبردو دیواری لادەبرد، جا لەهەرحاڵدا ئەو بەناوی وەستا ساڵح لەمیراوێی سەردەشت خەریکی کاربوو، وردە وردە لەو کارەی خۆیدا، لەکاری بەنایی کردنیدا خەریکی کاری رێکخستنو کاری سیاسی بوو لەنێو خەڵکی ئەو ناوچەیەدا، بەلاّم بۆ رووداوێ گەڕایەوە، ئەگەر بەهەڵە نەچووبم رەنگە ئەوە زۆر دەقیق نەبێ، بەلاّم وام لەبیرە برایەکی شەهید بوو، بەو حیسابە هاتەوە سەقز، ئەو رۆژانەی کە هاتەوە سەقز رێك رۆژی (21و 22)ی رێبەندان بوو کە رۆژانی راپەڕینی ئێران بوو کە سەرەنجام حکومەتی (شا) رووخا لەتاران و لەهەموو شارەکان، ئەو بەشداری کرد لەو راپەڕینەدا رۆژی (22) بەداخەوە بریندار بوو لەکاتی گرتنی پۆلیسی شاری سەقز، دەزگای پۆلیسی شاری سەقز لەهێچو خوڕایی تەقەیان لێکردو بریندار بوو، چەند رۆژێك بە برینداریی مایەوەو دیارە مانەوەی و دەستوپەنجە نەرمکردنی ئەو لەگەڵ مەرگ لەو چەند رۆژەدا بەڕاستی یەکێك لە ئەفسانەکان بوو، زۆر ئینسانێکی بەتاقەتو بەجەرگ بوو، رۆژی (26) بەداخەوە گیانی لەدەستدا، ئێمە ، وێڕای راگەیاندنی مەرگی کاك حەمە حسێنی کەریمی ئەو رۆژەمان بە رۆژی دەست بەکارکردنو چالاکی کردنی عەلەنی و ئاشکرای کۆمەڵەمان دانا لەنێو کوردستاندا.

## خانەی موعینی بووە یەکەم شەهیدی کۆمەڵە و باوکی وەزیری کۆمارەکەی قازی محەمەد بوو

*هەر بەردەوام بوون دوای ئەوە؟

عەبدوڵلای موهتەدی: بەڵێ تەبعەن هەر بەردەوام بووین دوای ئەوە..

*دوای شەهید کردنی حەمە حسێنی کەریمی ئەوە زیاتر حەماسەتی بۆ ئێوە خوڵقاند کە بەردەوام بن، زیاتر کۆمەڵەتان بەهێز کرد، چونکە شەهیدتان داومو خەڵك چاوڕێی هەڵس و کەوتو داهێنانو شۆڕشێکی گەورەترە لەئێوە دەکەن، ئێوە ئەوە زیاتر وایلێکردن حەماسەت زیاتر بخوڵقێنن، زیاتر بچنە ناو خەڵکەوە، زیاتر دژی دوژمن بجەنگن، زیاتر چالاکی و رێکخستنو شانەکانتان فراوانتر بکەن؟

عەبدوڵڵای موهتەدی: بەڵام دوایی چووە دەستی لەهەموو ئەوانە هەڵگرتووەو خەریکی کاری بەنایی بووە بۆ ئەوەی کاری ڕێکخستن چاك بکات و بۆ ئەوەی پەل بهاوێژێتە نێو خەڵکی کرێکارو زەحمەتکێش، ئەوەندەی دیکە خۆشەویستی کرد لەبەرچاوی خەڵکی و کۆمەڵەشی پێوە خۆشەویست بوو، بەڵام دیارە حەمە حسێنی کەریمی ئەوەڵین شەهیدی کۆمەڵە نەبوو، ئەوەڵین شەهیدی کۆمەڵە سەعیدی موعینی بوو، (خانەی موعینی)، لەبەر خۆشەویستی لەماڵی خۆیان پێیان دەگووت خانە، ئەو ناوە جارجار لەبەعزێك ماڵ لەمهابادا هەیە، سەعیدی موعینی برا بچکۆلەی کاك سولەیمانی موعینی یان کاك فایەق و کاك عەبدوڵڵای موعینی بوو کە هەردووکیان لەپرۆسەی بزووتنەوەی شۆڕشگێڕانەو چەکدارانەی ساڵی (1967 – 1968) گیانیان لەدەستداو دوو قارەمانی گەورەی خەباتی ڕزگاریخوازانەو پێشکەوتنخوازانەی خەڵکی کوردستان بوون، دیارە بنەماڵەی موعینییەکان بنەماڵەیەکی سیاسی بوون، باوکیان وەزیر بوو لەکابینەی قازی محەمەددا، کاك خانە خوێندکار بوو ئاماری دەخوێند لەتاران کە بەبنەماڵە شۆڕشگێڕو سیاسی بوون، بەڵام وردە وردە لەئێمە نزیك بووەوەو دیمانەوە وەکو لە دروستکردنی شەبەکەکەدا وەکو باسمکرد بۆیە خانەی موعینیش یەکێك لەوانە بوو کە لەگەڵ ئێمە بوو، ئەگەر تۆ قارەمانت دەوێ، خانەی موعینییە.

## زۆر یارمەتی (ی. ن.ك) ماندا تا شۆڕشەکەیان سەرکەوێ

*** لەناو یەکێتی نیشتمانی لەناوچەی دڕی شینکایەتی، لەماوەت شەهید دەبێت و تا ئێستاش گۆڕەکەی لەوێیە؟**

عەبدوڵڵای موهتەدی: بەڵێ گۆڕەکەی لەماوەتە، لەدڕی شەهید دەبێت، خانە ئەگەر لەدەورەی دیکتاتۆری حەمە ڕەزا شادا ئەو هەموو زیندانییە سیاسییە هەبوو، ئەو هەموو ئەشکەنجەی خەڵك کرا، خەڵك لەژێر ئەشکەنجەدا لەت و پەت کرا، لەناو هەموویانداو لەهەموو ئەو ساڵانە بەبڕوای من (10)کەس هەڵبژێریت، خانەی موعینی لەناویانە، خانە ئەفسانەی زیندان بوو، سیمایەکی ئەفسانەییە لەمقاوەمەتی زینداندا، خۆی زۆر جێگەی باسە. لەزیندان لەگەڵ خانە زۆر پێکەوە بووین، لەدەرەوە زۆر پێکەوە بووین، یەکێك لەوانەی کە پەیوەندی ڕاستەوخۆی هەبوو لەگەڵ خانە من بووم، من و سەید برایمی عەلیزادە، خانەی موعینیمان کردووە بە ئەندام، بۆ خانە بڕوا ئەوەبوو ئەو وەختە کە شۆڕشی نوێ لەکوردستانی عیراق هەڵگیرسابووەوە، ئێمە زۆرمان ئەهەمیەت پێداوەو پێمانوابوو دەبێت یارمەتی بکرێ و هەرچی لەتوانامان بوو کردمان کە لێرە باسی ناکەم، چونکە ئەوە جێی خۆی

هەیە. ئێمە بەڕاستی دەتوانم بڵێم سەردەمێك داروونەداری خۆمان هەراج كردووە، هەموو ڕێکخراوەکەمان خستە خزمەتی ئەوەی کە نەمێڵین ئەو شۆڕشەی دوای هەرەس سەریهەڵداوەتەوە تێکبشکێ، پێمانوابوو...

*لەکوردستانی عیراق؟

عەبدوڵلای موهتەدی: بەڵێ لەدیوی کوردستانی عیراق .

# شەهیدبوونی خانە (31) جۆزەردان لەدڕی ناووچەی شینکایەتی لە ماوەت ڕۆژی (پ.م) کۆمەڵەیە

*مەبەستتان کۆمەڵەی ڕەنجدەرانە؟

عەبدوڵلای موهتەدی: بەڵێ، چونکە ئەو وەختە ئەوان هەبوون، لەوەشدا پێمانوابوو دەبێت ئەزموونی لێوە فێربین، چونکە ئێمە پێمان وابوو درەنگ یان زوو نۆبەی شۆڕش لەکوردستانی ئێرانیش دێ، دەبێت دەرسی لێ فێربین، بۆیە خانەی موعینیمان نارد بۆ پەیوەندی گرتن و هەروەها بۆ ژیان لەناویاندا و بۆ فێربوونی ئەزموونەکانیان. جۆری ناردنەکەی وابوو کە بەداخەوە نەمانتوانی ڕێك بینێرینە سەرکردایەتی ئەو وەختە، بۆیە لەڕێگای ناوچەی ئالانی سەردەشتی ئێرانەوە ناردمان بەدیوی کوردستانی عیراق دا، ئیتر لەگەڵ مەفرەزەیەکی ئەو وەختەی پێشمەرگەکان کەوت و ماوەیەك لەگەڵیان بوو، نامەکانی لای من نەماوە، بەڵام لەبیرمە نامەی ناردبوو، ئەوەڵین نامەکانی ناردبوو، ئەوەڵین ئەزموونەکانی خۆی لەژیانی پێشمەرگەی بۆ ئێمە باسکردبوو، ئەو یەکەم پێشمەرگەی شەهیدی کۆمەڵەیە، بۆیە (31)ی جۆزەردانی (1357) ناسراوە بەڕۆژی پێشمەرگایەتی کۆمەڵە، بۆیە ئەو ڕۆژەمان بەڕۆژی پێشمەرگەی کۆمەڵە داناوە، زۆر حەیفێکی گەورە بوو، من لەو بڕوایەدام خانە بلیمەتێك دەبوو، یانی خانە کەسێکی وەك کاك فوئادو ئەو کەسانە دادەنێم، دیارە ئەو وەختە لەئاستی تەشکیلاتدا لەو حەددەدا نەبوو، بەڵام زۆر لەحاڵی گەشەکردندا بوو، ئیرادەیەکی کە بەوەوە هەبوو من بە کەم کەسەوە دیومە، ئەو ئیرادانە کەم هەڵدەکەون لەکۆمەڵگایەك، ئینسانێك تا ئەو رادیە بەئیرادەو جەسوور و خۆنەویست بێ، هەموو کارێکی بۆ دەکرا، لەبارەی سیاسیشەوە تێگەیشتوو بوو، ژیر بوو، خوێندەوار بوو.



# ئەحمەد فەتحوڵلا بەرپرسی یەکێتی و خانە پێکەوە لەدژی بەعس شەهید بوون

***چۆن شەهید بوو؟**

عەبدوڵڵای موهتەدی: هاتنە سەریان لەدڕی، جەیش و جاشی سەردەمی بەعس و سەردەمی سەدام هاتنە سەریان و شەهیدیان کرد، لەمەفرەزەیەکدا بوو وابزانم فەرماندەی مەفرەزەکە ناوی ئەحمەد فەتحوڵلا بوو ئەویش شەهیدبوو لەگەڵیاندا.

# لەترسی بەعس ناوتریٚ بەعس خانەی شەهیدکردوە

***بەڵام ئێوە لەڕاگەیاندنەکانی پێش ڕووخانی بەعس هەرگیز باسی ئەوەتان نەکردووە کە لەو شەڕانەدا، ئەو پێشمەرگە قارمانە بەعس شەهیدی کردووەو یەکێکە لەدامەزرێنەران و بنیادنەرانی کۆمەڵە، هەرگیز باستان نەکردووە، یان لەترسی بەعس بوو؟**

عەبدوڵڵای موهتەدی: با من ڕاستکردنەوەیەك بکەم، لەدامەزرێنەران نەبووە، بەڵام لەو کەسانە بوو کە دوای چوار پێنج ساڵێك هاتە ریزەکانی ئێمەوە، ئێستا نایەتەوە بیرم باسنەکراوە .. بۆ پێت وایە ئێمە گوێمان دەدا بە بەعس؟

*** پێموایە.**

عەبدوڵڵای موهتەدی: وانییە، ئەگەر بووبێتیش رەنگبێ هۆکاری تری بووبێ، نەك لەبەر بەعس، ئەسڵەن پەیوەندییەکمان لەگەڵ حکومەتی بەعس نەبوو، مەسەلەن تۆزێك قسەی خۆمان بخوێنەوە لەبەر بەعس یان باسی هەندێك شت نەکەین لەبەر پەیوەندیمان لەگەڵ حکومەتی عیراق، ئەو سەردەمە ئێمە پەیوەندییەکمان نەبوو لەگەڵ حکومەتی عیراق و بەتووندترین شێوە هێرشمانکردۆتە سەریان، لە بەیاننامەو راگەیاندنەکانی ئەو کاتی کۆمەڵەدا...

***نەك ئەوکات، مەبەستم ئەوەیە چەندین ساڵ دوای شەهید بوونی، لەیادەکاندا؟**

عەبدوڵڵای موهتەدی: ئاخر لەیادەکاندا ئەوە جیاوازە، ئێمە ئەو وەختە وەکو هێزی پێشمەرگەی کۆمەڵە دوای چەندین ساڵ خەباتی چڕوپڕو سەرسەختانەی پێشمەرگانە بۆ خۆت دەزانی کە ئێمەش و حزبی دیموکرات و خەڵکی تریش نەیانتوانی، لەپێشدا ناوچە ئازادکراوەکانیان



لێسەندینەوەو وردە وردە دوایی پێشمەرگە هات بەدیوی عێراقدا، مەجبوور بوو، ئێمە بەتایبەتی مەجبور بووین کە پەیوەندی بکەین، تۆزێك پێش ئەوەی بێینە دیوی عێراق ، پەیوەندی بکەین بەحکومەتی عیراقەوە بۆ مانەوەی خۆمان، ئەگەر زۆر ناوی بەعسمان نەبردبێ و لەو پەیوەند لەگەڵ شەهیدبوونی خانەدا دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ساڵانەو ئەو ناعیلاجیانەی ئەو سەردەمە.

## مام جەلال هەمیشە باسی هاوکاری و چاکەی ئێمە دەکات

***وتت ئێمە یارمەتی کۆمەڵەی رەنجدەرا نمان زۆر دەدا، ئەو یارمەتیانە چی بوون کە ئێوە هەموو شتێکی خۆتان فرۆشت لە پێناوی کۆمەڵەی رەنجدەران و بۆچی؟**

عەبدوڵلای موهتەدی: شۆڕش کە تازە دەست پێکرابووەوە لەکوردستانی عیراق بەهەموو یەکێتی نیشتمانییەوە، دیارە هەست بەنزیکییەکی زۆرمان دەکرد لەگەڵ کۆمەڵەی رەنجدەران بەحیسابی ئەوەی کە رێکخراوێکی چەپ بوون و پێموابێ لەداهاتوودا شۆڕشی ئێمەش دەبێت مەسەلەن کڵاو بۆ ئەو شۆڕشە بێیتەوەو هەمووومان بەیەك دەزانی، بەڵام ئێمە بەگشتی پێمانوابوو ئەوە شۆڕشێکە لەکوردستان سەری هەڵداوەتەوە دوای هەرەس هێنان، حەقی خۆیەتی پشتیوانی لێبکرێت، یەکێتی نیشتمانی کوردستان ئەو وەختە زۆر لەمەزیقەو نارەحەتی و کوێرەوەریدا بوون، ئێمە پەیوەندیمان پێوە گرتن و کە زانیمان شتی ئاوا هەیە، هەر سەردەمی شایەتی بوو هێشتا نەڕووخابوو، بڕیارماندا کە یارمەتیان بکەین، جارێ ماڵمان بۆ فرۆشت، ماشێن و سەیارەمان هەبوو بۆمان فرۆشت، زۆر کەس هەرچی پاشەکەوتی خۆی هەبوو هەمووی لەبانك دەرهێنا، کەسمان هەبوو دکتۆر، موهەندیس بوو، هەموو ئەوانەمان دەرهێنا بێ دریغی ئەوانەمان نارد، ئەو سەفەرە ئێمە وامان رێکخست، چونکە خەڵکمان هەبوو، ئاشنامان هەبوو، بەتایبەتی وەکو بۆمباسکردی تازە ئێمە رێکخراوێکی سینف و روناکبیری نەمابووینەوە لەنێو خەڵکدا بووین، لەشوێنەکان بووین، لەسەردەشت، لەمهاباد، لەملاوئەولا خەڵکمان بوو، ئاشنامان بوو، دۆستانمان زۆر بوو، خەڵکی رێکخستنی خۆمان بوون یاخود دۆست و ئاشنا بوون، بەهۆی ئەوانەوە وامان رێکخست شەکرو رۆن و برنج و ئاردو قوماش و ئیتر...



## چەکمان نەداوە بەیەکێتی

*چەکیشتان بۆ ناردن؟

عەبدوڵلای موهتەدی: چەکمان نەدانێ، نەخێر، بەڕاستییەکەی ئێمە چەکمان نەبوو بیاندەینێ، بەڵام ئەو شتانەی ترمان زۆر بۆ ناردن و زۆرجاریش وەنەبێ پێیان نەزانیبێ، زۆرجار باسیان کردووە، مەسەلەن مام جەلال ئەگەر دیقەتتان کردبێ لەزۆر مەجال و موناسەبەتدا دەتوانم بڵێم بەزیاد لەوەی کە ئێمەش کردوومانە هەمیشە ئەو چاکەیەی لەچاویدا بووە.

*تۆ دەڵێیت مام جەلال زیاد لەوەی ئێمە کردوومانە باسی دەکات، ئایا زیاد لەوەش یارمەتی داونەتەوە، لەو چەند ساڵانەی ئەخیردا کە ئەوان حکومەت بوون و دەسەڵاتیان بەدەستەوە تا ئێستاش سەرۆك کۆماری عیراقە؟

عەبدوڵلای موهتەدی: بەڵێ دیارە ئەو یارمەتییە دوو لایەنە بووە، ئەوە نەبووە بڵێم هەر ئێمە یارمەتیمانداون، ئەوانیش زۆریان یارمەتی ئێمەدا، دەستی ئێمەیان گرتووە، ئێمەش ئەو پێزانینەمان هەیە بۆ ئەوان، من ئەوە بە نموونەیەکی چاك دەزانم، دیارە نابێت تەنها بەدوو حزبەوە ببەسترێتەوە، بەڵام پێموایە ئەو پەیوەندییە دەبێ بەینی بزووتنەوەی رزگاریخوازانەی هەموو پارچەکانی کوردستان بێت، ئێمە لەکۆنەوە عەقیدەمان بەوە هەیە بەم لەسەرپێی خۆڕاوەستانە، بەوەی کە دەبێت خەڵکی پارچەکانی کوردستان و بزووتنەوەکیان و شۆڕشەکەیان و حزبەکانیان نزیکییان هەبێت، دۆستایەتی و برادەرایەتیان هەبێت، یارمەتییان هەبێت.

## یەکێتی کۆمەڵەی دروستنەکردوە، راست نییە

*ئێوە لەسەر ئەو بناغەیە یارمەتی کۆمەڵەی رەنجدەرانتان دەدا کە ئێوە هەردووکتان دوو رێکخراوی مارکسین، لەڕووی ئایدۆلۆجیەوە زۆر لەیەکتر نزیکن، یان لەسەر مەسەلەی نەتەوەیی و کورد بوو؟

عەبدوڵلای موهتەدی: نەخێر، لەسەر مەسەلەی کوردیش بوو، پێش هەموو شتێك لەسەر ئەوەبوو، جا خۆ یەکێتی نیشتمانی هەموویان کۆمەڵەی رەنجدەران نەبوون، بەڵام پێمانوابوو ئێمە هەر لەکۆنەوە بزووتنەوەکانی کوردی لێکدانەوەیان و خوێندنەوەو تێگەیشتنیان و روانینێکی رەخنەگرانە لەئەزموونی بزووتنەوەی کوردی هەمیشە یەکێك لەخاڵەکانی باس و لێکۆڵینەوەی ئێمە بوو، لەبەرئەوە



هەوڵماندداوە کە زانیومانە دوای هەرەس هێنان بزووتنەوەی کوردیو حەرەکەتی شۆڕشگێڕانە لەکوردستانی عیراق سەری هەڵداوەتەوە ویستوومانە یارمەتی بکەینو یارمەتیشمان کردووە.

جا لەو ناوەدا دیارە نزیکییەکی زۆرترمان هەست کردووەو دڵمان پێخۆش بووە بەوەی کە ئەم حەرەکەتە حەرەکەتێکی چەپیشی تێدا هەیە، جا لێرەدا پێمخۆشە ئاماژە بەشتێك بکەم، خەڵکانێك باسی ئەوە دەکەن کە گوایا یەکێتی نیشتمانی کوردستان کۆمەڵەی ئێمەی دروست کردبێ، یاخود کۆمەڵەی رەنجدەران ئەو کارەی کردبێت، ئەوە ئەسڵەن لەگەڵ واقعیاتو راستییە تاریخییەکان نایەتەوە، یەکەم جارێ ئێمە پاییزی (1969)دروستکراوین، کۆمەڵەی رەنجدەران (1970) بووە یانی ساڵێك دواتر بووە، ئەگەر یەکێتی نیشتمانی حیساب بکەین (1976) بووە، کە ئەوە دەکاتە پێنج شەش ساڵ دوای ئێمە، نا وانەبووە، بەڵام فەرقەکەی ئەوەبووە ئێمە رێکخراوێك بووین لەسەردەمی دیکتاتۆریدا دەژیاینو کاری پێشمەرگانەمان نەبوو، ئێمە رێکخراوێکی ژێرزەمینیو نهێنی بووینو لەتۆڕێکی فراواندا روو لەفراوانیو گەشەکردندا لەکوردستانو لەهەندێك لەشارە گەورەکانی ئێران خەریکی چالاکی بووین، ئەوان دەستیان بەشۆڕش کردەوەو دیارە وەکو کەسایەتی زۆرێك لەوان لەئێمە بەتەمەنتر بوون بەئەزموونتریش بوون وەکو کاری پێشمەرگانە، ئەوە جاری ئەوەڵ ئەبوو ئەوان دەیانکرد، بۆیە کە ئەوان شۆڕشەکەیان دەست پێکردەوە، ئێمە هەستمان بەوەکرد دەبێ یارمەتیان بکەین، لەبەرئەوە ئەوەڵ شتێکی ئەگەر قەرار وابێ یارمەتییەك یان تەئسیرێك دابنێین، ئێمە یارمەتی ئەوانمان کردووە تا ئەوان یارمەتی ئێمە بکەن، پێکهێنانی ئێمەش هیچ پەیوەندی بە ئەوانەوە نییە.

## دیموکرات دەیوت کۆمەڵە بۆ دژایەتی ئێمە دروستبووە

*کە کۆمەڵەی مارکسی- لینینی لەکوردستانی عیراق پێکدێت دواتریش دەبێت بەیەکێتی نیشتمانی بەهەرسێ باڵەکەیەوە، مەبەست لەم پێکهاتنە ئەوەبوو تا وەلام بەخواستی خەڵکی بداتەوە دوای هەرەسی ساڵی ( 1975 ) و رێکخراوێکی مۆدێرنو چەپو گە نجانەو نوێخواز دروست ببێو ببێتە بەدیلی پارتی دیموکراتی کوردستان، ئایا کۆمەڵەی زەحمەتکێشان لەکوردستانی ئێران بەهەمان شێوە بوو، وەلام بوو بە شکستی حزبی دیموکرات کە تێکشکابوو بەدوای ئەوە و وەلام بوو بەحزبی فیودالو عەشایەری، دروستبوونی حزبی چەپو مۆدێرنو نوێخواز، یان ململانێ بوو لەگەڵ حزبی دیموکرات، یانی بەهەمان شێوە یەك ئاراستە بوو، چۆن کۆمەڵەی رە نجدەران لەکوردستانی عیراق ببووە بەدیلی پارتی دیموکراتی کوردستان دوای هەرەسی ( 75 )، کۆمەڵەش بەهەمان شێوە بەدوای تێکشکاندنی



**ڕژێمی ( شا ) وەکو حزبێکی مۆدێرن تاوەکو ببێتە بەدیلی دیموکرات کە چەندین ساڵ گەورەترین حزبی کوردی بوو لەکوردستانی ئێران ؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** زۆرجار لە ئەدەبیاتی، بەتایبەتی جاران زۆر ئەوە هەبوو، لە ئەدەبیاتی حزبی دیموکرات و سەرکردایەتی حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێراندا ئەوەت دەبینی کە دەیانگووت کۆمەڵە بۆ دژایەتی ئێمە دروست بووە.

***خۆیان؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** بەڵێ ئەوە ڕاست نەبوو، قەد شتی وانییە، بەڵام بەشێك لەڕاستی لەمەدا هەیە، نەك ئێمە بۆ دژایەتی حزبی دیموکرات پێکهاتبین، من لەباسەکانی پێشوودا ئەوەم باسکرد کە زەمینەو بەستێنی سەرهەڵدانی کۆمەڵە کامانە بوون، بەکورتی ئاماژەم بە ئەو بارودۆخە جیهانییە کرد لەدەهەی شەستی سەدەی بیستەمدا هەبوو لەدونیاداو هەروەها بە بارودۆخە ئێرانییەکەشی کە لەدەهەی شەستدا چۆن چەپێکی نوێ و باوەڕێکی نوێ لەئێراندا هاتەئاراوە کە نە حزبی (تودە)ی قبوڵ بوو، نە جەبهەی میللی قبوڵ بوو ئەو حەرەکەتانەی قبوڵ نەبو.

باسی ئەوەم کرد چەپێکی شۆڕشگێڕتر، تێکۆشەرتر، ڕادیکاڵتر، لەئێران سەریهەڵدا، ئەمانە هەمووی کاریگەرییان لەسەر کۆمەڵەش هەبوو وەکو حەرەکەتێکی سیاسی، بەڵام من ئاماژەم بەزەمینە کوردستانییەکانی سەرهەڵدان و پێکهاتنی کۆمەڵە نەکرد ئەمە خۆی زۆرە، کۆمەڵە جارێ وەکو حزبێك کە ئەسڵی چالاکییەکەی لەکوردستانی ئێران بوو لەژێر کاریگەریی ئەوەدا بوو، هەموو بزووتنەوە کوردییەکان تەئسیریان بووە لەسەری، ئەوەشم باسکرد کە خوێندنەوەو لێکدانەوەی ئەو بزووتنەوانە کارێکی گەورەی ئێمە بوو.

ڕووانینێکی ڕەخنەگرانە لەو ئەزموونانە، لەکۆماری مهاباد، لەهەموو شۆڕشەکانی پێشوو ئەوانە هەمووی یەکێك لەکارەکانی ئێمە بوو، شتێکی تر کە پێموایە زۆر تەئسیری ڕاستەوخۆتری لەسەر ئێمە دانا، بزووتنەوەی (1967- 1968) بوو کە لەئێران کرا، لەکوردستانی ئێران کرا، دیارە ئەوەش بۆخۆی مێژوویەکی خۆی هەیە، من نامەوێت بچمە ناو وردەکارییەکانیەوە، بەڵام هەر ئەوەندە دەڵێم کە ئەو ساڵانە لەناو حزبی دیموکراتی کوردستاندا، حەرەکەتێك پێکهات بەناوی کۆمیتەی شۆڕشگێری- حزبی دیموکراتی کوردستان کە کەسانی وەك کاك سمایلی شەریف زادە، مەلا ئاوارە، دواتر عەبدوڵڵای موعینی و سولەیمانی موعینی یان کاك فایەق و خەڵکانی تر لەگەڵی کەوتن، ئەمانە بەهەر هۆیەك بوو یان ناکۆکی و ساردییەك لەنێوانیاندا هەبوو لەگەڵ سەرکردایەتی شۆڕشی ئەیلول ئەو وەختە دەیانویست چالاکی خۆیان لەئێران پەرە پێبدەن، لەهەرحاڵدا هاتنەوە ناو کوردستانی ئێران و دەورەیەکی کەمتر لەیەك ساڵ ئەوان بەخەباتی سیاسی و پێشمەرگانەی خۆیان تەکان و

جوڵەیەکی زۆریان خستە ناو کۆمەڵگای کوردستانی ئێران، بەتایبەت بەشی موکریانەکەی، راستییەکەی لەو بەشە فەعالییەتیان دەکردو تەئسیری زۆریشیان لەسەر روناکبیری ئەو سەردەمەی کورد بوو، یەکێك لە تەئسیرەکانیان ئەوە بوو کە شکڵی خەباتی پێشمەرگانەیان بردە ناو سیاسییەکانی ئەو سەردەمە، یانی تۆوی ئەوەشیان لەکوردستانی ئێران چاند.

ئێمە بۆ خۆمان ئەو وەختە راستە هێشتا کۆمەڵە پێکنەهاتبوو وەکو رێکخراوێك دروست نەکرابوو، بەڵام لەو دوو سێ ساڵی پێش دروستکردنی کۆمەڵە زۆر قسەو باسێکی چڕوپڕ لەنێو سیاسییەکان و رۆشنبیران و خوێندکارانی کورد ئەو وەختە وجودی هەبوو، یەکیان لەو قسەوباسانەدا لێکدانەوەی ئەم ئەزموونە جێگەیەکی زۆر بەرچاوی هەبوو، ئێمەمانان کە دیارە من ئەو وەختە تەمەنیشم ئەوەندە زۆر نەبوو کە خۆم سەربەخۆ زۆر کار بکەم، هێشتا کەمتر لە (20) ساڵم تەمەن هەبوو، بەڵام بەهەرحاڵ تەئسیرێکی زۆر قووڵی لەسەر دانابین.

دواتر هەوڵماندا کەڵك لەئەزموونەکان و دەرسەکانی ئەم بزووتنەوەیە وەربگرین، بۆ داهاتووی خۆمان، یەکیان ئەوەبوو کە راستە خەباتی چەکداری بۆ رووخاندنی رژێم ئەهەمیەتی هەیە، بەڵام تۆ ناتوانیت بەبێ حزب ئەو کارە بکەیت، لەبەرئەوە ئەهەمیەتی کاری حزبی و رێکخستنی لەنێو خەڵکدا زۆر لەلامان گەورە بوو، چونکە بیریان کردەوە ئەوان پێشمەرگە بوون ، کاری پێشمەرگایەتیان کرد، چیان کەم بوو، بۆ نەیانتوانی سەرکەون، ئەوان حزبی سیاسییان نەبوو، نەیانتوانی رێکخستن لەنێو جەماوەری خەڵکدا دروستبکەن، ئەوە ئەزموونێکی زۆر گەورە بوو، بۆیە دەڵێم وەختێك کۆمەڵە دروست بوو هەوڵماندا لەو دەرسە کەڵك وەرگرین، رێکخستن لەنێو جەماوەردا دروست بکەین، دوو بەو نەتیجەیە گەیشتین خەباتی چەکداری بەهەموو ئەهەمیەتەکەیەوە وەختێك سەردەکەوێ کە بەشداری و پشتیوانی گەرم و گوڕی جەماوەری لەگەڵ بێ، تەنها ئەوەش نییە بڵێی جەماوەر بەگشتی پێشمەرگەیان خۆشبوێت، دەبێت بەشێوەیەکی چڕوپڕو نزیك و بەشێوەیەکی عەمەلی جەماوەر بەشداری ئەو خەباتە بن هەتا ئەو خەباتە سەربکەوێ، ئەمەش لەدواییدا زۆر بەکەڵکمان هات ئەو دەرسەی وەرمانگرتبوو، چونکە چەپی ئێرانی و روناکبیرو سیاسی ئەو کاتەی ئێران ئەو دەرسەیان نەبوو کە ئێمە لەکوردستان بوومان، بۆیە زۆرێك لەوان کەوتنە شوێن حەرەکەتی چریکەهای فیدائی خەڵکی ئێران، ئێمە خەتی کۆمەڵە هەر لەسەرەتای دروستبوونی سازمانی چریکەهای فیدائی خەڵکەوە کە ئەوان دوو ساڵێك دوای ئێمە دروست بوون، سنووربەندی سیاسی خۆمان لەگەڵیان هەبوو، بێجگە لەسنووربەندی تیئۆریك و لەجیهانبینیدا، بەڵام سنووربەندی سیاسیمان لەگەڵیان هەبوو، چونکە چریکەهای فیدائی خەڵکی ئێران لەروانگەی ئێمەوە وێڕای ئەوەی شۆڕشگێڕ بوون، ئینسانی پاك بوون، ئینسانی تێکۆشەر بوون و کاریگەریی زۆریشیان لەسەر کۆمەڵگای سیاسی ئێران و حەرەکەتی سیاسی لەساڵانی حەفتاکاندا دانا.



بەڵام دوو عەیبی گەورە لەکاری ئەواندا هەبوو کە هەمیشە خەتی کۆمەڵەی لەخەتی ئەوان جیادەکردەوە، یەکیان ئەوە بوو ئەوان ئەهەمیەتیان بەحزب، بەکاری سیاسی، بەکاری ڕێکخستن، بەکاری وشیاری بەخش نەدەدا. دووەمیان ئەهەمیەتیان بەکاری جەماوەری و بەهەستانی خەڵك نەدەدا، بۆیە حەرەکەتەکەی ئەوان حەرەکەتێکی تەنیا بەشێکی بچکۆلە بوو، خەباتی چەکداری ئەوان حاڵەتێکی ئەوەی لەئێران پێی دەڵێن چریکی جیا لەخەڵکی هەبوو، کۆمەڵە هەرگیز لەگەڵ خەتەکەی ئەوان نەبوو. جا مەبەستم ئەوەیە کەلە ئەم تەجرەبانەو ئەزموونانەی کوردستانی ئێرانمان دەکۆڵییەوە یەکێك لە لێکۆڵینەوەکانی ئێمە ئەوەبوو ئێمە بەو نەتیجەیە گەیشتین حزبی دیموکراتی کوردستان تازە ناتوانێت ئەو شکڵە بێت، ئەو حزبە بێ یان ئەو وەسیلەیە بێ کە جوابی خەباتی خەڵکی لەکوردستانی ئێران دەداتەوە.

***دەقیقەن کۆمەڵەی زەحمەتکێشان ڕێکخراوێکی مارکسی بوو؟**

**عەبدوڵای موهتەدی:** بەڵێ.

## باسی فەلسەفیمان بۆ خەڵک نەدەکردو چەپی سەربەخۆ بووین

---

***ئێوە سەر بەبلۆکی شورەوی بوون یاخود ماوی بوون و بۆچی و چۆن دەتانوویست ئەوانە لەناو خەڵکدا تەعمیم بکەن و بیبەنە ناو خەڵکەوە لەکاتێکدا خەڵك یاخود کۆمەڵگای کوردستان بەڕاستی کۆمەڵگایەکی دواکەوتوو بوو بەشێکی زۆری خەڵك لە لادێکان نیشتەجێبوون و ئایدیاو بیروباوەڕی حزبی دیموکراتیش وەکو حزبێکی ناسیۆنالیستی لەناو خەڵکدا بڵاو بوو، ئێوە چۆن ئەوەتان کرد یان چۆن ئەو ئایدیایانەتان هێنا بۆ ناو خەڵکی کوردستان و چۆن تەعمیمتان کردو خەڵکتان لێ نزیك کردەوە لەکاتێکدا مەسەلەی مارکسیزم بۆ خەڵکی کوردستان شتێکی نامۆ بوو؟**

**عەبدوڵای موهتەدی:** ڕاستە، یەکەم، جارێ دەبێ ئەوە ڕوون بکەمەوە کە ئێمە سەر بەشورەوی و ئەو دیدگاو ئەو سیستەمە فیکرییە نەبووین، دووەم ئێمە بۆ ماوەیەك لەنووسراوەکانی ماوتسیتۆنگ و ئەفکارو بیروڕاکانی ماوتسیتۆنگ بێ تەئسیر نەبوو لەسەر ئێمەو زۆریشمان کە ڕەنگبێ زۆر ڕێکخراوی دیکە بەو شێوەیە هەبوون، من زۆرتر خۆمان بە چەپێکی موستەقیل و سەربەخۆ دەزانی لەو کاتەدا، ڕاستە ئێمە نزیك بووین لە ئەفکاری ماوی، بەڵام توانیمان ئەو جێیەی کە کەموکورتییەکان، بەبڕوای خۆمان و تێگەیشتنی خۆمان سنووری خۆمان و جیاوازیی خۆمانمان هەبوو لەگەڵ ئەو



هەڵانەی کە لەچین دەکراو زۆرێکی ئەو شتانەمان قبوڵ نەبوو. جا لەهەرحاڵدا چۆن چووینە نێو خەڵکی و ئەو شتانەمان بردە نێو خەڵکی و چۆن ئەوانە لەنێو کۆمەڵگای کوردستان جێیان بووەوە، یەکەم جارێ پێمخۆشە بڵێم ئێمە نەدەچووینە نێو خەڵکی باسی مارکسیزم و فەلسەفەو ئەوشتانە بکەین، یەکێك لە تەعلیمات و ئەو شتانەی کۆمەڵە فێری هەموو تێکۆشەرانی خۆی دەکرد ئەو چوونە نێو خەڵکە، ئەو کارکردنە، ئێمەی راهێنابوو بەوەی کە تۆ دەبێ بتوانی بچیتە نێو خەڵك، جێگەی خۆت بکەیتەوە، پەیوەندی دۆستانەو هاوڕێیانەیان لەگەڵ دابمەزرێنی، بتوانی بەزمانی خەڵك قسە بکەیت ئەمە یەك، دووەمیان تۆ دەبێ لەئاستی خەباتێکەوە کەخەڵك هەیانە دەست پێبکەیت و ببەیتە سەر، ناتوانی هەر بۆخۆت چیت پێ خۆشە لەناو خەڵك بڵاوی بکەیتەوە، تۆ دەبێ لەئاستی خەباتی ئەوانەوە دەست پێبکەیت، خەڵك ئەو ساڵانە، دیارە تۆزێك لەخەڵك، زۆریان نا، بەڵام تۆزێك لەخەڵك کە پێشرەوترو تێکۆشەتر بوون وردە وردە بەفیکری سیاسی زیاتر ئاشنادەبوون، ئەوانە دەهاتنە نێو خەباتی سیاسییەوە، ئێمە پەنجەمان رادەکێشا بۆ واقیعیاتی ناو کۆمەڵگای ئێران و کۆمەڵگای کوردەواری بۆ ئەوەی شتیان پێبڵێین و تا ئەوە دەست پێبکەین کە شتی رەق و قەبەی فەلسەفی، دوای ئەوەی ماوەیەکی زۆر بەسەرچوو تا کەسێك وردە وردە بەشتی سیاسی ئاشنا دەبوو، دوای ئەوە لەحەددی خۆیدا ئێمە شتی نەزەری و تیۆریمان بۆ باسدەکردن، بۆیە ئێمە ئەهەمیەتێکی زۆرمان بەخەباتی جەماوەری دەدا، بەخەباتی عەمەلی دەدا، بەئاستی تێگەیشتنی خەڵك دەدا، نەدەچووینقسەی زلیان بۆ هەڵڕێژین، ئەوەی ئەو کارەی بکردبایە حەتمەن رەخنەی لێدەگیراو پێیان راست دەکردەوە.

## ئێمە پەروەردەی کۆمەڵەین

***من لێت دەپرسم ئەگەر کۆمەڵە نەبوایە، تۆ خاوەنی ئەو کەسایەتیە دەبووی، دەمەوێت بڵێم کۆمەڵە کەسایەتی ئێوەی دروست کرد یان ئێوە کۆمەڵەتان دروست کرد؟**

عەبدوڵلای موهتەدی: ئاخر ئەوە بەشتێکی دوو لایەنە دەبینم، بێگومان ئەگەر من لە کۆمەڵەدا نەبوومایەو ئەو هەموو دەرس و ئەزموون و راهێنان و فێرکردن و بەشداری کردن لە هەزارویەك شتی جۆراوجۆر، لەخەباتی نهێنی و پێشمەرگایەتی و لێدان و هەڵاتن و سیاسەت و گفتوگۆو مزاکەرە لەگەڵ حکومەت و کۆبوونەوەی نێوخۆیی و ئینسان لەهەر هەمووی ئەوانە شت دەکات، لە هەمووان گرنگتر لە ئەزموونی خەباتی سیاسی و جەماوەری، بەشداریکردن لەشۆڕش و راپەڕین، لەچوارچێوەی کۆمەڵەدا ئێمە ئەو کارانەمان دەکرد، ئەگەر ئەوە نەبوایە بێگومان من ئەمە نەدەبووم.

نازانم چی دەبووم چاکتر دەبووم، خراپتر دەبووم، یان لە چ بوارێکی دیکەدا، ئایا لەبوارێکی دیکەدا مـن گەشـەم دەکـرد، ئاسـان نییـە ئـەوە سـیناریۆیەکی دیکەیـە فەرەزییەیـە نـاتوانم بیڵـێم، بـەڵام لەهەمانکاتدا منیش و خەڵکی تریش وێڕای کە پەروەردەی کۆمەڵەین و لەو مەدرەسەیەدا فێر بووین و لەهەموو ئەزموونەکانی کەڵکمان وەرگرتووە، بەڵام تەئسیری خۆشمان بووە لەسەری، من ئەو تەئسیرە بەدوو لایەنە دەبینم، کارو کاردانەوەی تێدایە، بێگومان هەرکەسە لە کەسایەتییەکی ناو کۆمەڵە یەك لەوانەش من، ئێمە بەنۆبەی خۆمان تەئسیرمان لەسەر کۆمەڵە، لەسەر رەوتەکەی، لەسەر خەباتەکەی بووە.

***سەرکردەیەکی کورد دەڵێ: "تەنها لەبەرئەوەی کوردم تێناکۆشم، بەڵکو خەبات دەکەم لە پێناوی سۆسیالیزم"، تۆ لەبەر کورد یان کۆمەڵە، لەبەر سۆسیالیزم خەبات دەکەی، کامیان؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** من ئینسان بە بوونەوەرێکی تاك کێشەیی و تاك بوعدی نابینم، مەسەلەن تۆ حسابی بکە وەکو ئینسان تۆ بوونت هەیە، لەبەرئەوە کاریگەریت لەسەر کۆمەڵگاکەی خۆت هەیە، وەکـو ئینسـانێك لـەژێر تەئسـیری هـەموو خـەباتی ئـەو، لـەژێر تەئسـیری ئـەوەدای لـە چ قۆناغێـك لەکۆمـەڵگادا هاتوویتـە دونیایـەوە، لـە چ کۆمـەڵگاو لـە چ جوگرافیایەکدایت، چیت خوێندووەتەوە هـەموو ئـەو شـتانە، یـانی هـەموو ئـەزموونی مرۆڤایـەتی تەئسـیری هەیـە لەسـەر تـۆ وەك بەشـێك لەمرۆڤایەتی، بێگومان وەکو باسیشمکرد پێموایە خەباتی سیاسی لەڕوانگەی منەوە پەیوەندییەکی زۆر نزیکـی هەیـە دەبێـت ببـێ، ئەگـەر کەرامـەتی ئینسـانی، لەگـەڵ زاڵکردنـی ئینسـان بەسـەر چارەنووسی خۆیدا، ئەمە یەك، لەلایەکی دیکەوە تۆ کوردیشی، لەسەردەمێکی دیاریکراودا دەژی و لەکۆمەڵگایەکدا دەژی کە وەکو کورد دەچەوسێیتەوەو ستەمت لێدەکرێ و هەموو ئەو مەسەلانەی کە هەموومان دەزانین وەکو کورد چیت لێبەسەر دێ، ناتوانێ ئەوە بێ تەئسیر بێ، چونکە ناتوانێ ئێمە کوردبوونەکـەمان و ئـەوەی کـە وەکـو تـاکێکی کـورد لـەو کۆمەڵگایـەدا هاتوویتـە دونیـاوەو لـەو کۆمەڵگایـەدا هەڵسـوکەوتمان کـردووەو کاریگـەریی ئـەو کۆمەڵگایـەمان بەسـەرەوەیە بەهـەموو نەهامەتییـەکانی و چـارە رەشـیەکانی و سـتەمەکانی لەلایەکـەوەو خـەبات و تێکۆشـانیش لەلایـەکی دیکەوە، ئەوەی لێ لابەین بەچی مەعلومە ئێمە ئاوا دەبووین، کێ دەڵێ ئەو فیکرەمان دەبوو، لەبەر ئەوە بێگومان ئەوەش تەئسیری هەبووە، جا بۆیە دەڵێم ئەوانە تەئسیری هەیە، لەوانەیە مەسەلەن بنەماڵەو وەزعی فەرهەنگی و تەربیەتی خانەوادە دەتوانێ تەئسیری لەسەر ئەوانە هەبێت، بۆیە من ئینسان ئاوا بە تاك کێشەیی نازانم، پێموایە ئەگەر تۆ لەمن دەپرسی هەموو ئەوانە هەریەك لەوانە تەئسیری خۆیان هەیە، بۆیە من هەوڵمدا لەو گفتووگۆیانەشدا کە پێکەوە ئەمانە بڵێم کە هەرکامە لەوانە لە شکڵپێدانی کەسایەتی و بیروباوەڕی مندا تەئسیرێکیان بووە، هەر لەبنەماڵەوەو گەورە

بوونەوەو باوك‌و كەس‌وكارەوەو براكانمەوەو خوێندكار بوونمەوەو لەتاران ژیانەوەو وەزعی سیاسی ئێران‌و وەزعی جیهانی‌و كوردو هەموو ئەوانە.



# پێکهاتنی حزبی کۆمۆنیست لەساڵی (1983) بەهەڵە دەزانم

# مەنسورو عەلیزادە بایەخیان بۆ کێشەی نەتەوەیی لەناو کۆمەڵە نەهێشتەوە

*** پێموایە سەردەمانێك مەسەلەی قەومی، مەسەلەی کوردو ناسیۆنالیزم لای تۆ نەهەمیەتێکی نەبوو، بەتایبەتی لەدەورانی دروستکردنی حزبی کۆمۆنیستو ساڵەکانی هەشتاکاندا تاوەکو ئەو کاتەی کە ئیدی وابزانم تۆ خۆشت دانت بەوەدا نا کە تۆ هەڵەبووی، کە تۆ تاوەکو ئەوکاتە لەسەر مەسەلە قەومیو مەسەلەی ناسیۆنالیزمی کوردو ئەوانە قسەیەکی جیدیتان نەبووەو کوردبوون عەیب بووەو زۆر بابەتی تر، بەڵام دواتر بەدوای ئەوەی کە ئێوە وەکو خۆتان دەڵێن کۆمەڵە دەبێت بەدوو باڵی جیاوە ئێوە لەگەڵ حزبی کۆمۆنیستی ئێران- سازمانی کوردستانو کۆمەڵە نامێنن، دیسانەوە ئێوە دێنەوە مەسەلەی ناسیۆنالیزم زیندوو دەکەنەوە، بەڵام مەبەستەکەم ئەوەیە لەدوای ئەوەی کە حزبی کۆمۆنیست دروست بوو، مەسەلەی قەومی، مەسەلەی کورد، مەسەلەی ناسیۆنالیزم بۆ جەنابتو بۆ سەرکردایەتی کۆمەڵە نەهەمیەتێکی نامێنێو پێموایە هەر ئەوەش بوو زەربەیەکی گەورەی لەکۆمەڵە دا کە نفوزێکی جەماوەری بەرفراوانی خەڵکی کوردستانی لێببێتەوە؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** ئاخر من پێموایە دیسان ئەمەش راستکردنەوەیەکی دەوێ، کۆمەڵە لەکاتی پێکهاتنیداو بەتایبەتی کۆمەڵە لە (1978- 1979)ەوە کە بزووتنەوەی جەماوەری گەلانی ئێران کە (شا)ی رووخاند، دواتریش تا چەند ساڵ نەك بڵێین هەر مەسەلەی کوردی نەناسیوە، گوێی نەداوەتێ یان بایەخی نەداوەتێ، بەڵکو دەوری سەرەکی بووە لەوەدا بزووتنەوەی رزگاریخوازانەی لەکوردستانی ئێراندا لەهەموو بوارەکانی خەباتیدا ئەوە لەهەموو شتەکاندا دیارە، بەنووسراو دیارە، بەسیاسەت دیارە، بەکرداری سیاسی ئێمە دیارە.

واتا کارنامەی سیاسی کۆمەڵە تا (1983) کە ساڵی پێکهاتنی حزبی کۆمۆنیستی ئێرانە، سەرتاپا پڕە لەتێکۆشان لەپێناو رزگاری خەڵکی کوردستان لەستەمی نەتەوەییو پڕپڕە لەخەباتی پێشەنگایەتی کردنی خەباتی رزگاریخوازانەی خەڵکی کوردستان لەئێرانو رەنگبێ ئەوە بیهێڵینەوە بۆ وەختێکی دیکە، بەڵام کۆمەڵە زۆر دیاردەی تازەی خوڵقاندووەو هێناویەتییە ناو بزووتنەوەی رزگاریخوازانە، زۆر دیاردەی پێشکەتنخوازانە کە پێش ئەوە نەبوون، لەبەر ئەوە من لەبزووتنەوەی کوردیدا بەداهێنەری دەزانم، بەڵام مەرج نییە کە تۆ حەتمەن ناسیۆنالیست بیت بۆ ئەوەی تێکۆشەری



ڕزگاریی نەتەوەیی بیت. تۆ دەتوانیت سۆسیالیستیش بیت، تۆ بە سۆسیالیست بوونی خۆت چاکتر دەتوانی خزمەت بەڕزگاریی نەتەوەیی کوردیش بکەیت، من ناتەباییەك نابینم لەوەدا، ئەم ناتەباییە لەدەزگای فیکری پێشووی کۆمەڵەدا نەبوو پێش پێکهاتنی حزبی کۆمۆنیستی ئێران. کە حزبی کۆمۆنیستی ئێرانیش پێکهات، بۆیە من دەڵێم هەڵەیە ئەمە، دەنا ئێمە جاران بایەخێکمان نەداوە بەکێشەی کورد ئەوە وانییە، بەڵام خۆی پێکهاتنی حزبی کۆمۆنیست من بەهەڵەیەکی دەزانم، ڕەنگە دواتر باسی بکەین، بەڵام لەسەرەتای حزبی کۆمۆنیستیشدا تەنانەت ئاوا نەبووە کە بڵێی کێشەی نەتەوەیی بۆ کۆمەڵە کەم ڕەنگ بووەو کاڵ بووەتەوە، ئەوە چەند ساڵی پێچوو تا وردە وردە لەنێو حزبی کۆمۆنیستیشدا هات چەند ساڵێك کۆمەڵە هەر لەسەر خەتی پێشووی خۆی دەڕۆیی و خەتی پێنەگۆڕابوو.

ڕاستە کۆمەڵە وەکو ڕێکخراوێکی سەربەخۆ نەمابوو، بوو بوو بەسازمانی کوردستانی حزبی کۆمۆنیستی ئێران، بەڵام لەوێشدا هەموو دەقەکانی کە کاری پێدەکرا ئەو دەقانە بوون کە ئێمەمانان نووسیبوومان و لەدەورەی پێش پێکهاتنی حزبی کۆمۆنیست نووسراون، ئەو سووننەتە، ئەو خەباتە، ئەو فەرهەنگە تاڕادەیەکی زۆر تاچەند ساڵیش کاریگەریی خۆی هەر مابوو.

ئەگەر لەمن بپرسی لەکۆنگرەی (6)ی کۆمەڵەوە کە وابزانم (1987) ئەگەر بەهەڵەدا نەچووبم، لەوێدا بوو کۆمەڵە لەناو حزبی کۆمۆنیستی ئێران خەتی پێگۆڕدرا، یانی لەوێدا بوو کە کێشەی نەتەوەیی تازە تیئۆرییەکی تازە بۆ کۆمەڵە دامەزرا، دەنا تا ئەوکاتەش.. جا وردە وردە دیارە کاڵتر دەبووەوە، بەڵام لە ئەساسی خۆیدا کۆمەڵە تیئۆرییەکانی خۆی هەبوو، ڕاستە لەناو حزبی کۆمۆنیستی ئێراندا بەشداری کردبوو، بەڵام بە تیئۆری خۆی کاریدەکرد، بە فەرهەنگی خۆی، بە سیاسەتەکانی خۆی کە پێشوو بۆی دامەزرابوو، بەڵام لەوکاتەوە بەڵێ من لەو بڕوایەدام لەوێوە دابڕانێك هەیە، کۆمەڵە بایەخی بەکێشەی نەتەوەیی نەداو تێی نەگەیی، لەڕاستیدا من دەڵێم ئەوە کۆمەڵە نەبوو، ئەوە مەنسووری حیکمەت بوو بەهاوکاری لەگەڵ کاك برایمی عەلیزادە ئەو خەتەیان هێنایە ناو حزبی کۆمۆنیستی ئێران و ناو کۆمەڵەوە، یەك بایەخی بەکێشەی نەتەوەیی نەدا، ئەو جۆرەی کە جاران کۆمەڵە دەیدا، بەڵکو ڕەخنەی لەوە گرت و سنووری خۆی لەگەڵ ئەوە جیاکردەوە.

دووەم بزووتنەوەی کوردستان ئەو بزووتنەوەو ئەو شۆڕشەی لەکوردستانی ئێران خوێندنەوەیەکی خراپ و چەوت بۆ ئەوە هەبوو و ئەمەش هەڵەیەکی دیکەبوو، دەورو نەخشی کۆمەڵە لەبزووتنەوەی سیاسی و نەتەوەیی کورستاندا چییە، ئەمە لێکدانەوەیەکی هەڵەو تیئۆرییەکی هەڵەی بۆ دامەزرا کە هەر ئەوەندە دەڵێم لەیەك دوو دێڕدا جاران کۆمەڵە خۆی بەرەهبەری بزووتنەوەی کوردی دەزانی، ئێمە هەمیشە وامانزانیوە، کێشەمان لەگەڵ حزبی دیموکرات و ئەحزابی تەقلیدی بۆ ئەوە نەبووە ئەوان کوردن، خۆمانمان پێ ساڵحتر بووە، پێمانوابووە ئێمە دەبێ ڕەهبەریی بزووتنەوەی کوردی



بکەین، ئێمە بیکەین بەرەو لایەنی پێشکەوتنخوازانە دەیبەین، خەتی ئێمە خەتێکی چاکترە، بەلام لەکۆنگرەی شەشەوە بەجۆرێکی دیکە قسە دەکرێ، باسی ئەوە دەکرێ بزووتنەوەی کوردی ئەوە بۆ ئەحزابی ناسیۆنالیست، بزووتنەوەی سۆسیالیستی بۆ ئێمە، یانی دابڕانێك دروست دەكەن، ناتەباییەك لەنێو ئەوانەدا تیۆریزە دەکرێت لەناو کۆمەڵەداو من ئەوە بەهەڵەیەکی کوشندە دەزانم، من هەر ئەو وەختی رەئی خۆمم باسکردووە.

# لەکۆنگرەی شەشدا بەشداریم نەکرد

عەلیزادە ناسیۆنالیست بۆ دیموکراتو سۆسیالیزم بۆ کۆمەڵە جێدەهێلی‌و من لەگەڵیدا نەبووم کۆمۆنیزمی کارگەری، وەك ڤایرۆس هاتو کۆمەڵەی تەنییەوە

*کام وەخت؟

*عەبدوڵلای موهتەدی: ئەوە سالی (1988)، کۆنگرەی شەشەمی کۆمەڵە بوو، هەر بەو دەلیلە من لەکۆنگرەی شەشەمدا بەشداریم نەکردووە، وتم من لەگەلٌ ئەو رەئیانە نیم، ئەوانەشم پێ هەڵەیە، هەتا لەبیرمە بە کاك سەید برایم وت ئەو جۆرە بەشکردنە، جا هەر ئەمە بوو بەهۆی جیابوونەوەی داهاتووشمان، هەر ئەمە یەکێك لەهۆکارە گەورەکانی جیابوونەوەی ئێمە لەحزبی کۆمۆنیستی ئێران بوو، ئەم فیکرە کە کاك برایم تیۆریزەی دەکات، کە دیارە ئەوە قسەی تیۆریزە نییە دووپاتی دەکاتەوە، تیۆرەکەی مەنسووری حیکمەتە، لەکۆنگرەی شەشەوە هات، بەلام دوای جیابوونەوەمان لەکۆمۆنیزمی کاریگەریی جارێکی تر سەید برایم لەکۆنگرەی هەشت دووپاتی کردەوە، وتم تازە بۆ وابکەین، من لەرۆژی ئەوەڵیشەوە عەقیدەم پێنەبوو، ئەویش ئەوەیە دەڵێ بزووتنەوەی جەماوەری ئەوەی بەفارسی پێی دەڵێن (هەمەگانی) یانی بزووتنەوەی هەمووانی جەماوەر، بزووتنەوەی سیاسی لەدژی ئیستبدادو دیکتاتۆری‌و هەروەها بزووتنەوەی نەتەوەیی گەلی کورد ئەو دووانە هی ئێمە نین، رەهبەرییەکەی بۆ ئێمە نابێ، ئەمانە ئەحزابی بۆرژوایی چاکتر دەتوانن بەڕێوەی بەرن، سەرکردایەتی ئەو کارەیان هەیە، فەرهەنگی ئەو کارەیان هەیە، کادری ئەو کارەیان هەیە، ئێمە وەکو کۆمەڵە کێشەیەکمان لەسەر رەهبەری ئەو بزووتنەوانە نییە، ئێمە دەبێ بزووتنەوەیەکی خالیصی سۆسیالیستی رەهبەری بکەین‌و بۆ ئەوە تێبکۆشین.

من هەر لەبیرمە بەشێوەیەکی گاڵتەیی لەگەلٌ کاك برایم ئەوەشم باسکرد وتم: ئەو بەشکردنەی کە تۆ دەیکەیت لەگەلٌ حزبی دیموکراتو لەگەلٌ ئەو ئەحزابە سوونەتیە وەکو مالٌ بەشکردنی شێتۆکەو



ژیرۆکە وایە، کە گووتی لەتەختی ئەرزەکەوە هەتا سەریان بۆ من، لەسەریانەوە هەتا ئەستێرەی سورەیا بۆ تۆ، تۆ ئەوەی لەم دونیایەدا هەیەو بەکاردێت داوتە بەحزبی دیموکرات و بە ئەحزابی ناسیۆنالیستی و تەقلیدی، قیامەتت داوە بەمن ئەی کەی دەگەین بە سۆسیالیزمو کام شت جارێ هەیە لەئارادا، ئەسڵەن ئەگەر قەرار وابێ مرۆڤایەتی بە سۆسیالیزم بگات من تێی ناگەم چۆن لەڕێگایەکی تر غەیری ئازادی نەتەوەکان، غەیری ئازادی ژنان، غەیری دیموکراسی دێتەدی؟ یانی دەبێ سۆسیالیزم بەرهەمی ئەوەیە کە مرۆڤایەتی قۆناغ بەقۆناغ ئەوانەی تێپەڕ کردووەو گەیشتۆتە ئاستێکی باڵاتر، میللەتێکی بەزیوی لێدراوی، سەرکوتکراوی لەژێر چەکمەی دوژمنی خۆیدا، من نازانم چۆن دەتوانێت بگات بە سۆسیالیزم، تامی لەدیموکراسی نەچەشتبێ، ژن تێیدا لەسیستمی ئاپارتایدا بەسەربەرێ، رووحانیەت تێیدا زاڵ بێ، یانی هەموو ئەم کۆنەپەرستیانە، هەموو ئەم ستەمانە، ئەم بێ عەدالەتیانە تێیدابن، من تێی ناگەم چۆن مرۆڤایەتی بەبێ ئەوەی ئەم کێشانەی خۆی حەل بکات دەگاتە ئاستێك کە بتوانێت کێشەی گەورەی سۆسیالیزمی تێدا چارەسەر بکات؟.

لەبەر ئەوە مرۆڤایەتی بەو قۆناغانەدا دەڕوا، ئێمەش پێیدا دەڕۆین، من سۆسیالیست بەکەسێك دەزانم لەهەموو فێمنیستێك زیاتر لایەنگری ئازادی ژنە، لەهەموو ناسیۆنالیستێك پتر لایەنگری ئازادی نەتەوەییە، بۆ هەموو دونیا، جا لەکوردستاندا بۆ کورد.

هیچ لیبراڵێك نابێت بگاتە منی سۆسیال لە ئازادی و لەپێشەنگی کردنێکی راستەقینە بۆ خەڵکی، من ئەوانە بە دەستکەوتی هەموو مرۆڤایەتی دەزانم، سۆسیالیزم تاجێکە کە لەسەر سەری ئێمە دادەنرێ، تۆ جارێ لەحاڵەتی سەپانیدای، فیکر لەتاجی شا مەکەرەوە، تۆ جارێ مافی خۆت بەدەست بهێنەو وردە وردە بگە ئەو قۆناغەی تر، ئینجا قەیناکە حەتمەن ئەویش بەدوایدا دێ، ئەو وەختیش ئەوەکانی دوای منو تۆ پەیدا دەبن حەتمەن بۆ عەدالەتی کۆمەڵایەتی تێدەکۆشن، دیارە ئێمە ئێستاش هەرچی پێماندەکرێ دەبێت لەو بوارەدا بیکەین.

من مەبەستم ئەوە نییە، جابچینەوە سەر ئەو قسەیە، ئەم دیدەی بێبایەخکردنی کێشەی کورد، بێبایەخکردنی بزووتنەوەی رزگاریخوازانەی کوردی، بەهەڵە لێکدانەوەی دەورونەخشی کۆمەڵە لە بزووتنەوەی رزگاریخوازیی نەتەوەیدا، ئەمە نە هی کۆمەڵەی پێش حزبی کۆمۆنیست و نە حەتا تا سێ چوار ساڵ دوای حزبی کۆمۆنیستیش نەبوو، ئەمە لەکۆنگرەی شەشەمەوە مەنسووری حیکمەت نووسیوویەتییەوەو کاك برایم هێناویەتیە ناو کۆمەڵەو چەسپاندوویەتی، هەربۆیەشە هەتا کۆنگرەی شەشەم مەنسووری حیکمەت رەش لەسەر سپی قەڵەمی لەسەر کاغەز دانەناوە، یەك بڕیارنامەی کۆمەڵە بەختی ئەوو بە ئینشای ئەو نییە، ئەوەی کە لەکۆنگرەی شەشەم نووسراوە نە نووسراوی سەید برایمە نە هی منە، نە هی عومەری ئێلخانیزادەیە نە هی دکتۆر جەعفەرو خەڵکی دیکەیە، هی مەنسووری حیکمەتە دیارە ئەو بەختی خۆی نووسیوویەتی، بەڵێ لەوکاتەوە زەمینە خۆشکرا بۆ

سەرهەڵدانی کۆمۆنیزمی کارگەریی، بۆیە موقاوەمەت نەمابوو، دوو ساڵ دواتر وەختێ کۆمۆنیزمی کاریگەریی هات و وەکو ڤایرۆسێك نێو حزبی کۆمۆنیستی ئێران و کۆمەڵەی تەنییەوە، بۆیە موقاوەمەت کەم بوو، سەنگەربەندی تیئۆریك لەموقابیلی ئەو قسانەدا نەمابوو، بزووتنەوەی کوردی بێبایەخ کرابوو، بەشداری خۆمان بێبایەخ کرابوو، هەموو کەس حەواڵەی ئەم دونیایەی لێ سەندرابووەوەو حەواڵەی بەهەشتی ئەو دونیا کرابوو، ئەم دونیا وەك ئیمانداران دەڵێن قەیناکە بۆ کافران بێ، ئێمە لەو دونیا بەخێروخۆشی خۆمان دەگەین، ئەوجۆرە تەقسیم بەندییە کرا، خۆ مەعلومە کەدەستیان پێ لەدونیای واقیع هەڵگرتین لەکۆمۆنیزمی کاریگەرییدا بۆیە برەوی هەبوو، بۆیە دەڵێم سەنگەربەندییەکی نەزەری و سەنگەربەندییەکی سیاسی نەمابووەوە لەبەرامبەر ئەو قسانەدا.

# سەردەمێک هاوفکربووم لەگەڵ مەنسوری حیکمەت

***تۆ دەڵێی مەنسوری حیکمەت و برایمی عەلیزادە ئەم تیۆرو چەمکانەیان هێنایە ناو کۆمەڵەوە، مەبەستت کۆمەڵەی کۆمۆنیست، بەڵام لە سەروبەندی پێکهێنانی حزبی کۆمۆنیست، پێش ئەوەی حزبی کۆمۆنیست پێکبێت سیمینارێکتان سازکردووە بەناوی (سیمیناری شیمال) ناسراو دوایی کە لەساڵی (1361) لەوێدا مەنسوری حیکمەت (10) تێزی تەرحکردووە، لەهەموو تێزەکاندا جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە "پێویستە حزبی کۆمۆنیست لە پێویستییەکی تاکتیکی و قۆناغێکی خەباتەوە سەرچاوە بگرێ، دەڵێ حزبی کۆمۆنیست نوێنەری و پارێزەری سەربەخۆیی چینایەتی و پرۆلیتارییە و دیسان دەڵێ "سەرکەوتنی حزبی لەتەشکیلاتدان و پەرەگرتنی نفوزو خۆشەویستی لەنێو خەڵکدایە وپێبوایە" خەبات دژی ریزۆنیزم و جەخت کردنەوەیەتی لەسەر مارکسیزم، پاشان هەموو ئەم تەرحانەی کە مەنسوری حیکمەت دەیکاو دواتریش حەمیدی تەقوایی هەمان شت دووبارە دەکاتەوە، جەخت لەسەر هەمان ئەم تێزانە دەکاتەوە، دیارە ئەمانە هەمووی کوتلەیەك بوون بەرێزان مەنسوری حیکمەت و حەمیدی تەقوایی و رەزاو کۆرش و ئەمانە هەموو لەسەر ئەمە رازین، دوابەدوای ئەمانە کە حزبی کۆمۆنیستیش پێکدێت تاوەکو کۆنگرەی هەشتەم، جەنابت سکرتێری ئەم حزبەیت، ئەگەر وایە ئەگەر مەنسوری حیکمەت ئەم تێزو چەمکانەی هێنا، کاك ئیبراهیم پشتیوانی لێکرد، جەنابت بۆ بووی بە سکرتێر، بۆچی دیفاعت لەم مەسەلانە کرد؟**

عەبدوڵای موهتەدی: ئەمە شتێکی دیکەیە، یەکەم ناڵێم من هاوفیکریم نەبووە لەسەردەمێکی دیاریکراو لەگەڵ مەنسوری حیکمەت.

# پێکهێنانی حزبی کۆمۆنیست هەڵەبوو، زەرەری لەکوردو چەپی ئێرانیشدا

*لەسەر تێزەکانیش؟

**عەبدوڵای موهتەدی:** هەر عەینەن لەسەر ئەوانەش ناڵێم نەمبووە، من شتێکی دیکە دەڵێم، ئەمانە هیچی ئەوەی تێدانییە کە بزووتنەوەی کوردی هەڵەیە، ئەمانە هیچی بێبایەخکردنی راستەوخۆ ئەوەی تێدانییە، کەی ئەوەی تێدایە، من قسەکەم ئەوەیە دەڵێم دوای چوونە ناو حزبی کۆمۆنیستی ئێران، ئاخر ناڵێن حزبی کۆمۆنیستی ئێران، من ئەوە بەهەڵە دەزانم لەجێیەکی دیکە بە تەفسیل باسیدەکەم، پێکهێنانی حزبی کۆمۆنیستی ئێران هەڵەیەك بوو، زەربەیەکی زۆر خراپ بوو لەکۆمەڵە درا، لەبزووتنەوە درا، بەبڕوای من لەچەپی ئێرانیش درا، خۆ نەبێ هەر لەکورد درابێ، ئاوێکی خراپی بۆ چەپی ئێرانیش رشت، ئەوکارە تەواو خراپ بوو، خۆی مێژوویەکی هەیە دەبێت باسی بکەیت، بەڵام دەڵێم بەهەموو ئەو عەیبەشەوە کە کۆمەڵە چوو بەشداری کرد لەناو حزبی کۆمۆنیستی ئێراندا تیئۆری ئێمە لەسەر کێشەی نەتەوەیی، تیئۆری ئێمە لەسەر پێویستی حزوورمان و بوونمان و پشتگیریکردمان و سەرکردایەتیکردنمان لەو بزووتنەوە نەچووبووە ژێر پرسیارەوە تاکۆنگرەی شەش.

من ئەمە دەڵێم، یانی تا ئەو وەختەش ئەو خەتەی کە پێشتر لەکۆمەڵەدا دامەزرابوو بەهەندێك ئاڵوگۆڕەوە، بەڵام لە ئەساسی خۆیدا هەر ئەو خەتە دەچووە پێشەوە لەناو حزبی کۆمۆنیستدا تا سێ ساڵ و چوار ساڵیش، جا راستە هەم ئەو قسانەی جەنابت خوێندتەوەو زۆرشتی تر وردە وردە زۆرتر تەشەنەیان دەکردو دەچوونە نێو نسوجی حزبی کۆمۆنیستی ئێران و فیکری دروستدەکرد، بەڵام ئەو جێیەی کە لەسەر تیئۆری ئێمە لەسەر کێشەی نەتەوەیی و بزووتنەوەی نەتەوەیی و نەخشی کۆمەڵە لەو بزووتنەوەیەدا گۆڕا، ئەم جێیە سەرەتای دروستبوونی حزبی کۆمۆنیست نەبوو، کۆنگرەی شەشەم بوو، من مەبەستم ئەوە بوو.

# کۆمەڵەیان گۆڕی بۆ حزبی کۆمۆنیست

***بەلام هەر لە پێش کۆنگرەی شەشەمیش، (ئازادی، حکومەتی کرێکار) ئەمە لەزەقترین دروشمەکانی ئێوە بووەو هەمدیسان من ئەوە دەڵێم بۆ بەڕێزت سکرتێری ئەم حزبە بوویت، بۆ کارتان لەسەر ئەم مەسەلەیە کرد، یانی بەڕاستی جێگایەك بۆ مەسەلەی قەومی و مەنتقێك بۆ مەسەلەی قەومی**



**نەمابووەوە هەرگیز بە بۆچوونی من کۆمەڵە لەو دەمانەدا وەکو حزبێکی کوردی نەدەناسرایەوە، ئەوەندەی کە وەکو حزبێکی چەپو مارکسی دەناسرایەوە لەناو ئێراندا؟**

عەبدوڵلای موهتەدی: من نامەوێت ئەوانەی تۆ بەتەواوەتی رەت بکەمەوە، دەڵێم نا دەقیقن، مەبەستم ئەوە نییە، دەباشە تۆ بڵێ حکومەتی کرێکاری، قەیچێکا بۆ کرێکار ناتوانێت کورد بێت، یانی دەڵێم تۆ هەر روانگەیەکت هەبێ هەڵە یان دروست لەسەر سۆسیالیزم کە لەحزبی کۆمۆنیستی ئێران، دیارە قابیلی لێکدانەوەیە ئایا روانگەکانی دروستبوون یان نا، تەبعەن هەڵەی زۆر تێدابوو، بەلام مەبەستم چییە، مەبەستم ئەوەیە بڵێم تۆ لەحزبێکدا بۆ ئێمە بەتایبەت کە لەکۆمەڵەدا بووین تیئۆری ئێمەو تەحلیلی ئێمە لەسەر مەسەلەی کوردو بزووتنەوەکەی و دەورونەخشی کۆمەڵەو جێگەی ئەوە لەخەباتی ئێمەدا ئەمە بۆخۆشی نەزەرییەیەکە، ئەم نەزەرییەیە هەزار شتی خراپی هەبوو، بەلام ئەم نەزەرییەیە لە ئەساس و بنەماکانی خۆیدا وەکو خۆی مابووەوە، رۆژی ئەوەڵ ئەمە نەڕووخا بەچوونی ئێمە بۆ ناو حزبی کۆمۆنیستی ئێرانەوە، زۆرێك فەرهەنگەکەی ماوە، سوننەتەکانی ماون، شانازی پێوەکردنەکەی ماوە، خەڵك خۆی بەخەباتکاری ئەو رێگەیە دەزانێت، خۆشی بەچەپ دەزانی، وردە وردە وایلێهات کۆمۆنیزمی کاریگەریی و خەتی کۆمۆنیزمی کاریگەریی هەموو بوارەکانی تەنی، ئاخر بوار نەوە بوو، هات تیئۆری ئێمەی لەسەر کێشەی نەتەوەیش گۆڕی، من ئەمەیان دەڵێم لەکۆنگرەی شەشەم، خۆ ناڵێم هەڵەیەکی تر پێش ئەوە نەکراوە.

***کێ گۆڕی؟**

عەبدوڵلای موهتەدی: ئەوەی مەربووتە بەکۆنگرەی شەشەمو بەدیدگای ئێمە لەسەر مەسەلەی نەتەوەیی مەنسوری حیکمەت، بەدەسکیسی ئیبراهیمی عەلیزادە لەکۆنگرەی شەشەمدا گۆڕییان و ئەمە بەڵگەی لەسەرە، حاشاهەڵنەگرە، بەلام لەزەمینەی تردا، لەبواری تردا بووە من لەگەڵی بووم، لەکێشەی نەتەوەییدا من قەت لەگەڵ مەنسوری حیکمەت نەبووم، قەت ئەو رەئیەم نەبووە لەڕۆژی ئەوەڵەوە تا ئەخیر و هیچ کات و ساتێك.

***قەناعەتت ئەوەبوو کە تۆ هیچ کاتێك لەگەڵ ئەو رەئی و بۆچوونانەی تێزەکانی مەنسوری حیکمەت نەبووی سەبارەت بەمەسەلەی قەومی؟**

عەبدوڵلای موهتەدی: نەخێر، خۆم وایبردەکەمەوە.



# حزبی کۆمۆنیست دەستکەوتی کۆمەڵە بوو، بەڵام دروستبوونی زوو بوو

***ئەی چۆن کرا بەیەکەوە ئیدامە بەکاری سیاسی بدەن؟**

**عەبدوڵای موهتەدی:** چونکە زۆر خاڵی هاوبەشی دیکە هەبوو لەنێوانماندا، لەپێکهێنانی حزبی کۆمۆنیستی ئێراندا زۆر خاڵی هاوبەش هەبوو، زۆر باوەڕی هاوبەش هەبوو، بۆ خۆم بڕوام بەزۆرێك لەوانە هەبوو، کارم بۆکردووە، زەحمەتم بۆ کێشاوە، هەوڵم بۆ داوە، لەسەرم نووسیوە لەبوارەکانی تردا، من بڕواموابوو کە دەبێت حزبێکی کۆمۆنیستی ئێران دروست ببێت، نە من دەمەوێت و نە ئەگەر بشمەوێت دەتوانم بیشارمەوە، من لەو بڕوایەدابووم کە دەبێ حزبی کۆمۆنیستی ئێران پێکبێت، دەبێت هەوڵی بۆ بدەین و یەکێك لەو کەسانە بووم هەوڵم بۆ داوەو قەناعەتم بەخەڵك کردووە بە تێکۆشەرانی خۆمانم کردووە لەوبوارەدا، تەبعەن من بەتەنها نەبووم، ئەمە تێگەیشتنێکی گشتی و عمومی بووە لەناو ریزەکانی کۆمەڵەدا، تەنانەت من هیچ نەبێت تێبینیەکم هەبوو، من پێموابووزووە هیچ نەبێت چەند مانگێك، ساڵێك زووە، زۆرتری لێراوەستین، زۆرتری بیر لیبکەینەوە، زۆرتری کار لەسەر بکەین، من ئەو تێبینیەشم بووە، خەڵکی دیکە هەبووە مەسەلەن کاك بـرایم و بەعزێك لەهاوڕێیانی تر ئەو تێبینییەشیان نەبووە، پێیان وابووە هەرچی زووترە دەبێت دایبمەزرێنن، ئەمە تێگەیشتنێکی عمومی بووە لەناو ئێمەدا، فەرهەنگی ئێمە ئاوابوو، پێمان وابوو ئەوکارە دەبێت بکەین، لەبەرئەوە کردووشمانەو باوەڕمان پێی هەبووەو بۆی تێکۆشاوین، خۆ من ئەوانە ناشارمەوە، من حزبی کۆمۆنیستی ئێرانم کاتی خۆی بەدەسکەوتێکی گەورەی خەباتی شۆڕشگێرانە زانیوە، هەتا بەدەستکەوتێکی کۆمەڵەم زانیوە، وتوومە ئەمە خزمەتی کۆمەڵەیە بە بزووتنەوەی چەپ لەئێران و ناوچەکەدا.

# خومەینی درۆینەی سیاسیەکانی کردوە

***وابوو، ئایا دروستکردنی حزبی کۆمۆنیست خزمەت بوو بە مەسەلەی چەپ، بەمەسەلەی کورد، یان پێچەوانەکەی راستە؟**

**عەبدوڵای موهتەدی:** نەخێر، پێچەوانەکەی راستە.



# واماندەزانی حزبی کۆمۆنیست دەتوانێ یارمەتی چەپی ئێران بدات

---

***کەواتە ئەهەمیەتی دروستکردنی چی بوو لەوکاتەدا؟**

**عەبدوڵلای موهتەدی:** ئاخر تێگەیشتنی ئەو وەختە جیاواز بوو، دەبێت لێکیبدەیتەوە کە بۆ وات بیر دەکردەوە، بۆ وابوو، جارێ یەکەمیان هەر لەسەرەتای دروستبوونی کۆمەڵەوە لە شەستەکانەوە، فیکری زۆر کەس و فیکری ئێمە لەناو کۆمەڵە ئەوەبوو کە دەبێت حزبێکی کۆمۆنیستی لەئێران دروست ببێت، بەڵام با ئەوەت لێنەشارمەوە ئێمە چونکە کێشەی نەتەوەیی تێگەیشتبووین و درکمان بەوە کردبوو، ئەوەشمان نادیدە نەدەگرت. یانی دەمانووت ئەمە تاوەختێکە کە کوردستان بەشێکە لە ئێران، ئەگەر خەباتی سیاسی واچووە پێشەوەو کوردستان پێویستی پێی بوو یان بۆ حاڵەتێکی تایبەتی هاتە پێشەوە، لەوانەیە حزبی کۆمۆنیستی کوردستانیش دروستبکەین.

یانی ئەم فیکرە هەبوو، ئێمە دۆگمیش نەبووین لەسەرئەوە، ئەمە یەك لەبەر ئەوەی فیکرەکەی هەبوو، دووەمین شت ئەوەیە بەهاتنە سەرکاری کۆماری ئیسلامی ئێران دەورەیەکی تازە لەدیکتاتۆری لەئێران دەستپێکرا کە زۆر زیاتر لە حکومەتی (شا) رەشتر، خوێناویتر بوو، ئەو تەقریبەن دەتوانم بڵێم چۆن جینۆساید کرا، چۆن باسی جینۆساید دەکەن، رژێمی خومەینی جینۆسایدی سیاسییەکانی لەئێران کرد، شا ئەو کارەی نەکردو بۆی نەکرا، شا لەنێو سیاسییەکانیش ئەوەڵەن هەمووی لەناونەبردن، نوخبەیەکی دەگرتن، خومەینی وەك بەداس درووێنەی بکەی سیاسییەکانی ئێرانی درووێنە کرد، خەباتکارانی کرێکاری، خەباتکارانی ژنان، خەباتکارانی چەپ، خەباتکارانی کورد، هەزاران کەسی کوشت و لەناوبرد، رێکخراوی سیاسی لەئێران نەمێشت، هەمووی تێکشکاندن.

دەزانین دوای ئەو کودەتایەی کە بەنی سەدریشیان لابرد لەسەرکار لەمانگی شەشی (1981)دا، ئیتر یەکسەر ئێران بوو بە قەسابخانەیەکی گەورەی هەموو ئۆپۆزسیۆنی ئێرانی، هەموو چەپەکان، هەموو رووناکبیران، هەموو رۆژنامەنووسان، حاڵەتێکی ئاوابوو، لەنێو هەموو ئەم ئۆقیانووسی دیکتاتۆری رەشدا تەنیا سەنگەری کوردستان مقاوەمەتی دەکرد، ئێمە ئەو وەختە لەو بڕوایەدا بووین، پێمانوانەبووشۆڕشی ئێران بەتەواوی فەوتاوە، پێمانوابوو هەستانەوەیەك مومکینە، بەرەنگاری و بەرپەچدانەوەیەکی کۆماری ئیسلامی مومکینە هێشتا، دیارە تاریخ سابتی کرد، تازە جمهوری ئیسلامی هاتە سەرکارو رۆی، ئینقلاب لەئێران تەواو بوو، شۆڕش تەواو بوو، بۆ ئەو سەردەمە، مەگەر شۆڕشێکی دیکە بژێتەوە، بەڵام ئەو وەختە بەحەقیقەت هەلومەرجەکەو بارودۆخەکە وابوو لەوانەش بوو بەجۆرێکی دیکە بێت.

خۆ شەرت نەبوو حەتمەن جمهوری ئیسلامیش لەسەرکار بمێنێتەوە، بەڵام بەهەرحاڵ تا لەم حاڵەدا ئێمە پێمانوابوو کوردستان دەبێت بکەین بە سەنگەرێك بۆ ئەوەی جارێکی تر شۆڕش لەهەموو ئێران هەڵبگیرسێت. کوردستان تەنیا سەنگەری زیندوو بوو کە بە ململانێی خۆی درێژەی دەدا بەرامبەر کۆماری ئیسلامی ئێران و رژێمە دیکتاتۆرییەکەیدا، لەحاڵێکدا ئێران کرابوو بەگۆمی خوێن و دیکتاتۆریی باڵی رەشی بەسەر هەموو جێگەیەکدا کێشابوو، کوردستان مقاوەمەتی دەکرد، ئێمە پێمانوابوو ئەم سەنگەرە دەبێت کەڵکی لێوەرگرین بۆ جارێکی تر بووژاندنەوەی شۆڕش لەئێران، بووژاندنەوەی بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکان، بووژاندنەوەی بزووتنەوەی شۆڕشگێڕانە، ئۆپۆزسیۆن دژی رژێمی جمهوری ئیسلامی و لەم پێناوەدا کە خۆمان چەپ بووین پێمانوابوو دروستکردنی حزبی کۆمۆنیستی ئێران یارمەتی دەکات بۆ ئەوە لەو پەراکەندەیی و ئاوارەیی و ماڵوێرانییەی کە چەپی ئێران لەسایەی دیکتاتۆری جمهوری ئیسلامیدا تووشی هاتبوو پێمان وابوو رزگاریان دەکات، یانی سەنگەرێکیان بۆ دەکاتەوە، شوێن و ماڵ و حاڵێکیان دەداتێ بە چەپی ئێران، بەشکو ئەوانیش هەستنەوە، پێمانوانەبووتازە ئەو سەردەمە تەواو بووە، وتمان خۆ لەکوردستان ماوین، هەوڵبدەین کە لەو سەنگەرەی خۆمان کەڵك وەربگرین بۆ ئەوەی ئینقلاب و بزووتنەوەی شۆڕشگێڕانە لە ئێرانیشدا سەرهەڵبداتەوە، ئەمە کاریگەرییەکی زۆر گەورەی هەبوو لەئێمەدا کە موافەقەتمان کرد لەدروست کردنی حزبی کۆمۆنیستی ئێران.

***بەڵام دواتر کە جەماعەتی سەهەند دێنە ناو کۆمەڵەوەو گەرایش و مەسەلەی کۆمۆنیزمی کرێکاری لەسەر دەستی مەنسوری حیکمەت و رەزاو ئیرەج و ئەوانە بەهێز دەبێت، ئەمە ئەم گەرایشەی ئەمان نییە وادەکات ...؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** حزبی کاریگەریی چەند ساڵ دوای حزبی کۆمۆنیستی ئێران هات، لە ئەوەڵەوە لەسەر کار نەبوو.



# یەکەم کەس بووم دژی مەنسور و کۆمۆنیزمی کارگەری بووم

***کۆمۆنیزم کە ئەوان زۆر جەختیان لەسەر دەکردەوە، ئەوە وای نەکرد کە ئێوە هەمووتان بکەونە ژێر ، تەئسیری ئەوەوە وەکو لە پلۆنیۆمی بیستەمدا ئەوان زۆرترین دەنگەکانیان هێناوە ئەم کوتلەیە، هەر لە مەنسوری حیکمەت، رەزا، کۆرش و ئیرەج ئەمانە بەم مەیل و بۆچوونانەوەو لەوکاتەشدا کە تەرحی کۆمۆنیزمی کرێکاریی دەکەن لە پلۆنیۆمی بیستەمدا، یانی باڵ بەسەر تەواوی دەسەلاتی کۆمەڵەو حزبی کۆمۆنیستدا دەکێشن و هەر ئەو سیراع و ململانێییەش دەبێت بەوەی ئەوان دەرچوون لەو مەسەلەیە، یانی بۆچوونەکەم ئەوەیە ئێوە نەکەوتنە ژێر تەئسیرو نفوزی گەورەی ئەوانەوە؟**

عەبدوڵای موهتەدی: بەڵێ، ئەوە وابوو، ئەگەر وانەبوایە چۆن دەیانتوانی ئەو بەشە گەورەیە لەنێو ئێمە بەرنە دەرەوە، خۆ ئەوەی بەناوی کۆمۆنیستی کاریگەریی و چی و چی هاتنە مەیدان لە(90٪) هەمووی تێکۆشەرانی قەدیمی کۆن بوون، هەمووکادرەکانی خۆمان بوون، بەڵام ئەوەی تۆ باسی دەکەیت راستە، ئەم تەئسیرەی یان نەبوونی بەربەرەکانێ و نەبوونی سنووربەندییەکی تیئۆری سیاسی لەبەرامبەریاندا تۆی بێ چەك کرد، بێ دیفاع هێشتنەوە لەبەرامبەریاندا، بۆیە وەختێك کۆمۆنیزمی کاریگەریی جیابووەتەوە ئەوان بەسەرکەوتوو رۆیشتن، تەبعەن من پێموایە ئەگەر ساڵێك دوو ساڵ مابانەوە وانەدەمان، چونکە وردە وردە پێداچوونەوە دەست پێکرا، سنووربەندی سیاسی و نەزەری دەست پێکرا، ناڵێم تاکە کەس بووم، بەڵام یەکێك لەو کەسانە من بووم کە دەستم کردەوە بەوەی کە لەموقابیل و بەرامبەر حەرەکەتی کۆمۆنیستی کاریگەریی و سیاسەتەکانی و فیکرەکەی رابوەستم و دەستگایەکی فیکری، سیستمێکی نەزەری و فیکری و سیاسی تر، ئەوەندەی من عەقڵم پێی دەشکا، هەوڵ بدەم بێتە ئاراوەو من پێموایە مەنسوری حیکمەت و ئەوان بەفێڵی خۆیان زانی، دەیانزانی شەپۆلی دژی ئەوان خەریك بوو دەکەوتە رێ و ئەو بەربەرەکانییە دەکراو من پێموایە درەنگ یان زوو ئەوان نەیاندەتوانی، بۆیە جیابوونەوە دەنا بۆچی خەڵك چۆن جیادەبێتەوە ئەگەر بزانێت سەردەکەوێت، چۆن جیادەبێتەوە.

***باشە ئەوان زیاتر لە (20) ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی لە پلۆنیۆمی بیستەمدا لەگەڵ بوو، هەموو مەکتەبی سیاسیشیان کۆنترۆڵ کردبوو جگە لەتۆو کاك ئیبراهیمی عەلیزاد، بۆچی ئەگەر وایە ئەوان کاریان دەکرد لەسەر سەپاندنی ئەو مەیل و گەرایشە، بۆچی چوونە دەرەوە لەکاتێکدا ئەوان زۆرینە بوون دەیانتوانی بمێننەوە، ئێوە بچنە دەرەوە؟**

**عەبدوڵلای موهتەدی:** ئاخر پرسیارەکەی منیش هەر ئەوەیە، ئەوە دوو هۆکاری هەبوو بەبڕوای من یەکەمین هۆکاری ئەوەبوو مەنسوری حیکمەت خۆی بەو نەتیجەیە گەیشت کە حزبی کۆمۆنیستی ئێران بنبەستە، بەڵام دەیویست تاوانەکەی لەئەستۆی خەڵکی بدات.

## دوای ڕۆیشتنی مەنسور دەبوو کۆمەڵە دروستبکەینەوە

---

***ئەستۆی تۆ، بیخاتە ئەستۆی تۆو کاك برایم؟**

**عەبدوڵلای موهتەدی:** بەڵێ، تەبعەن ئەستۆی ئێمە، وە عەیبی کاری ئێمە ئەوە بوو وەختێك کۆمۆنیزمی کاریگەریی ڕۆیی باشترین وەخت بوو بۆ ئەوەی ئێمە بچینەوە سەر بارودۆخەکەی کۆمەڵە، هەر ئەوەی کە ساڵی (2000) کردمان، ئەم ڕاوەستانە هەڵەبوو، ساڵی (1991- 1992) کە ڕۆیشتین، بۆچی حزبی کۆمۆنیستی ئێران دادەنێمەوە، دەبا کۆمەڵە دانێمەوە ئەو وەختە.

## وتیان هەڵەیە کۆمەڵە دروست بکەینەوەو دەست لەحزبی کۆمۆنیست هەڵگرین

---

***ئەی ئەوکاتە داتنەنایەوە بەڵام (2000) دیسان دەست پێدەکەیتەوەو کۆمەڵە دادەنێیتەوە؟**

**عەبدوڵلای موهتەدی:** ئاخر ئەو وەختە قسەمان لێکرد، بەڵام بڵێم چی ئەفکاری عمومی ئاوابوو، ڕای گشتی ئاوابوو ئەو کارە بکەین، من خۆم لەنێوان ئەو دووانەدا بووم، کۆنفرانسێکمان بەست دوای ڕۆیشتنی مەنسوری حیکمەت و ئەوان، باقی شریتەکانیشی لای کاك برایم و ئەوانە، ئەگەر ڕۆژێك شریتەکان لێدەن ئەوەی تێدایە، من ئەو وەختیش دەڵێم هاوڕێیان من ئەوە بەشتێکی نا چەپانەو نا سۆسیالیستیشی نازانم، چونکە تۆ دەتوانی لەکوردستان چەپ بی یان لەئێران چەپ بی، یان لەهەموو پارچەیەکی دونیا چەپ بی ئەوە حەقی بەسەر ئەوەوە نییە کە سنووری جوگرافیایەکەت کوێیە.

دووەم وتیشم من ئامادەم ئەگەر دەڵێن با کۆمەڵە دروست بکەینەوە، ئەگەر دەڵێن با حزبی کۆمۆنیستی ئێران بین، برایمی عەلیزادە لەو وەختەدا ڕەئی ئەوەبوو وتی: من بە هەڵەیەکی گەورەی



دەزانم ئێمە بچین کۆمەڵە دروستبکەینەوە، ئێمە دەبێت هەر لەسەر حزبی کۆمۆنیستی ئێران بڕۆین، ئەوە دەستکەوتێکی ئێمەیە دەبێت بیپارێزین، مەنسوری حیکمەت و ئەوان نەیانپاراستووە کەیفی خۆیانە، ئێمە دەبێ بیپارێزین، چۆن دەبێت کەسێکی وەکو عەبدوڵڵای موهتەدی قسەیەکی ئاوا بکات، ئێمە نابێت لەحزبی کۆمۆنیستی ئێران پاشگەز ببینەوە. بەهەرحاڵ زۆرتری خەڵکەکەش وای بیر دەکردەوە، بۆیە ئەو ڕێگایەمان هەڵبژارد، بەڵام لەهەرحاڵدا پێموایە وەختی چاك دەبوو ئەگەر ئەو وەخت بمانکردبایە ڕەنگبێ دوایی تووشی ئەو کێشەو جیاوازییانەش نەبوایەین کە دواتر تووشی بووین.

***باشە براییمی عەلیزادە وەکو تۆ وتت لەگەڵ ئەو بۆچوونانەو تیۆریانەی مەنسوری حیکمەت بوو، باشە لە پلۆنیۆمی بیستەمدا مەنسوری حیکمەت و ڕەزا، ئیرەج، کۆرش، شەهلاو زۆربەیان داوایەك دەدەنە جەنابت کە تۆ ئەوکاتە سکرتێر بوویت کە ئێمە واز لەکاردێنین و تەنها ئەوکاتەدا کە ئەوەی دەمێنێتەوە تۆو براییمی عەلیزادەو محەمەدی شافیعی و فارووق بابە میری و یەك دوانێکیش لەوانە بێدەنگ دەمێننەوەو دەنگ نادەن کە دواتر گوایا خۆیان ساغ دەکەنەوە، بۆچی کاك براییم ئەگەر پێشتر لەگەڵ ئەو مەیل و گرایشانە بوو زیاتر دیفاعی لەو بۆچوونانەی مەنسوری حیکمەت دەکرد، بۆچی دوایی کە مەنسوری حیکمەت جیابووەوە یان ڕۆیشتە دەرەوە لەکۆمەڵە، عەلیزادە نەچوو؟**

عەبدوڵڵای موهتەدی: نا، ئاخر کاك براییم خۆ نەیدەویست کۆمەڵە تێك بچێ و پەیوەندی و نزیکی و باوەڕی بەکۆمەڵە زۆر لەوانە زیاتر بوو، بەڵام ئەوەی کە من مەبەستمە لەقسەکانمدا ئەوەیە، کاك براییم سیستمی فیکری مەنسوری حیکمەتی لە ئەساس و بنەماکانی خۆیدا قبوڵ بوو، بەڵام پێیوابوو ئەوان توندڕەوی دەکەن، زێدەڕۆیی دەکەن، زمانیان ناخۆشە، ئاوێتەی جنێوفرۆشی دەکەن، دەنا نەقدێکی تێئوریك و بنەمایی لەدیدگاو ڕووانەگەکانی مەنسوری حیکمەت نەبو. ئەو بیست نەفەرەی کە تۆ دەڵێی لە پلۆنیۆمەکەدا ئەوە هی کۆمیتەی ناوەندی حزبی کۆمۆنیستی ئێران بوو، دەنا کۆمیتەی ناوەندی کۆمەڵە وانەبوو، کۆمیتەی ناوەندی سازمانی کوردستانی حزبی کۆمۆنیستی ئێران، زۆربەی هەر لەگەڵ خۆمان مایەوە نەچوون لەگەڵ مەنسوری حیکمەت.

# مەنسوری حیکمەت دەیوت تەنیا دڵم بەکۆمەڵە خۆشە

***ئەگەر وایە بنەما تیئۆرییەکانی رێکخراوێك گرنگترە لەو مەسەلانەی تۆ باسی دەکەیت، جنێوفرۆشی و توندڕەویی و ئەوانە، مادام لەمەسەلە تیۆری و سیاسییەکان و ئەهجەکاندا بۆچوونیان یەك بووە، کەواتە قابیلی ئەوە نەبوو بمێنێتەوە؟**

عەبدوڵلای موهتەدی: ناوانییە، پەیوەندی برایم لەگەڵ مێژووی کۆمەڵەو خەباتی و هەتا حزبی کۆمۆنیستی ئێرانیش، کاك برایم حزبی کۆمۆنیستی ئێرانی خۆشدەویست، عەقیدەی پێ هەبوو، پێی وابوو چوونە دەرەوە مانایەکی نییە، بۆ دەربچینە دەرەوە، هەزار جاری بە مەنسوری حیکمەت دەگووت: بۆ دەچیتە دەرەوە تا ئەوسەری دونیاش برۆی من لەگەڵتم، مەنسور دەیگووت: من لەگەڵ تۆ جیاوازم، کاك برایم دەیگوت: ئاخر من لەگەڵ تۆ جیاواز نیم، بەڵام ئیتر مەنسوری حیکمەت بڕیاریدا بڕوات، جا یەکێك لەهۆکارەکانی ئەوەبوو کە مەنسوری حیکمەت بەدروستو عاقڵانە بەو نەتەیجەیە گەیشت کە حزبی کۆمۆنیستی ئێران بنبەستە، بۆ بنبەست بوو؟.

جا با ئەوەت پێ بڵێم، حزبی کۆمۆنیستی ئێران لەدوو بەش پێك هاتبوون، یەکێکیان بەشی کۆمەڵەکە بوو کە لەکوردستان بوو، دووەمیان ئەو بەشەی تر کە دەبوایە کاری سەرانسەری بکات لەتاران و ئەسفەهان و شیرازو کەرەج و مەشهەدو ئەوانە، ئاخر ساڵێك دوو ساڵ، پێنج ساڵ حەوت ساڵ کار کرا، بەشی کوردستانەکەی ئیشی خۆی دەکرد، بەشی تارانەکە وردە وردە هیچی دیار نەبوو، ئەی روو دەکەنە کوێ بۆ بەشی تارانەکەی، خۆ لەمن و سەید برایمیان نەدەپرسی، روویاندەکردە مەنسوری حیکمەت، مەنسوری حیکمەت وردە وردە هەستی بەوەکرد کەناتوانێ درێژەی بێ، ناتوانی لەحزبێکدا بێت بەشەکەی تۆ کە گوایا بەتۆ سپێردراوە بەشە ئێرانییەکەی، بەشە سەرتاسەرییەکەی هیچی تێدا بەسەر نەبێت، وردە وردە جا ئەوەی رۆژی ئەوەڵیش دەمانکرد کەمبووەوە، بەڕاستی خۆ لەئەوەڵەوە حزبی کۆمۆنیستی ئێران فەعالیەتی کەم نەبوو، بەڵام بەشە ئێرانییەکەی هەر وردە وردە وەکو داچۆڕێ وەکو وشك بێ و هیچی تێدا نەما، ئاخر درەنگ یان زوو روویاندەکردە مەنسوری حیکمەت و هاوکارانی و لێیان دەپرسی بۆ بەشەکەی خۆت هیچی نەکرد؟ بۆیە مەنسوری حیکمەت رۆیی، مەنسوری حیکمەت خۆ لە ئەوەڵەوە نەهات بڵێ حزبی کۆمۆنیستی ئێران، نەقدی حزبی کۆمۆنیستی ئێرانی نەکرد بەجێی بێڵێ، یان بڵێین نەقدی کۆمەڵەی نەکرد بەجێی بێڵێ.

مەنسوری حیکمەت هات لەپێشدا لە ساڵانی ئەوەڵی دوای دامەزراندنی حزبی کۆمۆنیست و هەر لەکۆنگرەی پێنجەوە، لەکۆنگرەی پێنجەمی کۆمەڵەو لەکۆنگرەی دووەمی حزبی کۆمۆنیستی ئێران، لە نووسراوەکانی شتێکی هەیە بەنێوی جەمعبەندی، لەوێش بە تەفصیل باسی ئەوە دەکات دەڵێ:



"تەنیا بەشێکی حزبی کۆمۆنیستی ئێران کە من دڵم پێی خۆشە کۆمەڵەیە"، دەڵێن باقیەکەی هیچ ناکەن، دەڵێ باقیەکەی جەماوەری نین، لەگەڵ خەڵك نین، شەعبی نین، پێگەیەکی کۆمەلآیەتیان نییە، دەڵێ:."ئەگەر دەمانەوێت حزبی کۆمۆنیست ئیسلاح بکەین دەبێ باقیەکەشی چاو لەکۆمەڵە بکەن، ئەوانیش وەك کۆمەڵە بن، لەبەرئەوە کۆمەڵە نموونەو مۆدێلە بۆ چاولێکەریی"، لەدەورەی یەکەمی فیکری مەنسوری حیکمەت ئاوایە، تۆ کە ماوەیەك چوویتە پێشەوە ئاخر جارێك دووجار ساڵێك دوو ساڵ ئەو قسە خۆشە دەڵێن، ئەی بەشەکەی تۆش، قەرار وانەبوو تۆش چاو لەکۆمەڵە بکەیت و جەماوەری ببیتەوەو لەنێو خەڵکدا بیت؟ کوا، مەنسووری حیکمەت دەیزانی درەنگ یان زوو پرسیارێکی ئاراستە دەکرێ، ئەو خۆی لەو پرسیارانە دزیەوە، ئەگینا مەعلومە ئەی بەشەکەی سەرانسەرییەکە بۆ هەر هیچ نەبوو بەهیچ، خۆ لەو دەپرسنەوەو لەمن و یەکێکی دیکە ناپرسنەوە، ئەمە یەك، من بەعامیلێکی گەورەی دەزانم.

دووەمین شت ئەوەیە کە ئەو قسانە کران و ئەو تیئۆریانە هاتن هەروەکو باسمکرد لە ئەوەڵەوە سنووربەندییەکی تیئۆریك نەبوو، وەلآم دانەوەیەك نەبوو، هەستانەوەیەك نەبوو بەرامبەریان، بەلآم وردە وردە وەستانەوە دەست پێکرا لەنێو حزبی کۆمۆنیستی ئێراندا. جا بەعزێك سەرەتای پەیدا بوو، لەکوێ تەقییەوە ئەم وەستانەوەیە بەرامبەر بە ڕوانگەکانی مەنسووری حیکمەت، لەمەسەلەی ڕاپەڕینەکانی عیراق دا، لەوێدا بوو، من یەکێك لەوانە بووم کە وەستامەوە بەرامبەری، ئیتر مەنسوری حیکمەت هەستی بەوە کرد خەڵکانێك نەك هەر من خەڵکی تریش وردە وردە دەوەستنەوە، ئەگەر بەستاباپان و ئەگەر ئەو زاڵبوونەی ئەو لەنێو حزبی کۆمۆنیستی ئێراندا دەچووە ژێر پرسیارەوە، ئیتر بۆیە مەنسووری حیکمەت بەم دوو هۆکارە یەکیان دەیزانی حزبی کۆمۆنیست بنبەستە، دووەمیان دەیزانی ئەوەی ئەویش دێ لێی بپرسنەوەو ئەو حاڵی زاڵبوونەی نامێنێ، مونافیسی بۆ پەیدابوو،قسەی بەرامبەری بۆ پەیدابوو، ململانێی نەزەری و سیاسی لەبەرامبەریدا سەریهەڵدا، بەو دوو هۆکارە حزبی کۆمۆنیستی ئێرانی بەجێهێشت، دەنا دەیتوانی بەجێی نەهێڵێ، خەڵکی لەکاتی وادا هەموو شتێکی بەدەست بێ بۆ بەجێی دەهێڵێ.



# کۆمەڵە هەمیشە لەحزبی کۆمۆنیست گەورەتر بوو

*** تۆباسی ئەوەت کرد کە کۆمەڵە جێگاو نفوزی هەبوو، لەڕووی ناوەوە حزبی کۆمۆنیستی ئێرانی گەورەتر بوو لەو سازمانە، هەربۆیەش بچووکرابووەوەو کرابووە سازمانی کوردستان، کۆمەڵە کرابووە سازمانێك لەناو حزبی کۆمۆنیستدا، بچوککرابووەوە، لەڕووی ناوەوە من دەمەوێت بڵێم کۆمەڵە بچووك کرابووەوە بەقەدەر ئەوەی کە حزبی کۆمۆنیست گەورەکرابوو لە فەزایەکی گەورەتردا، لەڕووی فەعالیەت و کاروچالاکییەوە لەکاتێکدا وتت کۆمەڵە چالاکی و فەعالیەتێکی زۆری هەبوو لەبەشی کوردستانەکەی، بەلام لەڕووی نەزەری و تیۆریشەوە دیسان مەسەلەی کۆمۆنیست و دواتریش تەرحەکانی کۆمۆنیزمی کرێکاریی مەنسوری حیکمەت جێگەو پێگەیەکی گەورەی دانابوو لەناو کۆمەڵەدا، باشە بۆ دەبوو ئێوە ئەو واقیعەتان قبولْ کرد کە لەکاتێکدا کۆمەڵە ئەو هەموو نفوزو ئیمکاناتانەی هەیە، ناوەکەشی هەم بچوك کرابووەوەو هەم جێگەو پێگەشی خەریك بوو ون ببێت؟**

عەبدوڵڵای موهتەدی: حزبی کۆمۆنیستی ئێران لەو حزبە سەیرانە بوو کە یەکێك لەڕێکخراوە مەحەلییەکانی لەهەموو حزبەکەی گەورەتر بوو، ئەوە نەیدەتوانی درێژە بکێشێ، نەیدەتوانی وابێ، ئەمە خۆی نیشاندەری ئەوە بوو پرۆژەی حزبی کۆمۆنیستی ئێران سەرینەگرت، سەرکەوتوو نەبوو، جاری وا هەیە حزبی کۆمۆنیستی ئێران یان هەر حزبێکی سەرتاسەری پەرە دەگرێ و لقی لەکوردستان و لەکوێ و کوێ هەیەو لەوانەیە حزبە سەرانسەرییەکە زۆریش گەورە بێتەوە، زۆر جەماوەری هەبێت، بەملیۆنەها کەس، حزبی کۆمۆنیستی ئێران وانەبوو، حزبی کۆمۆنیستی ئێران وەختێك دەستی بەکار کرد رێکخستنی لەتاران زۆرتر بوو، دوای ساڵێك کەمتر بوو، دوای دوو ساڵ کەمتر بوو، دوای چوار ساڵ هیچی نەما.

***بۆچی؟**

عەبدوڵڵای موهتەدی: یەکەم خەڵك گیران، دووەم خەفەقان زۆر زیاتر بوو، دیکتاتۆری لەئێران زۆر زیاتر بوو، نەیتوانی پەرە بدا بەکاری خۆی، سەرچاوە سەرەکییەکەی من بەوە دەزانم ئەم تۆوە لەزێنگەی گونجاوی خۆیدا نەبوو، یانی فەرقی کۆمەڵە لەگەڵ باقیەکانی تردا ئەوەبوو لەپێکهێنانی حزبی کۆمۆنیستدا، کۆمەڵە وەختێك مەسەلەن چۆن شەریکایەتییەك دەکەیت، یەکێك سەرمایەیەکی بڵێین یەك ملیۆن دۆلاری دێنێ، زەمین و موڵك و ماڵێکی زۆر دێنێ، موهەندیس و پسپۆڕو کارناسێکی



زۆر دێنێ، ئەوی تریشیان بەحاڵ شتێکی چکۆڵەی پێیە دەیهێنێ، شەریکایەتییەکە ئاوابوو، یانی کۆمەڵە وەختێك هاتە نێو حزبی کۆمۆنیستی ئێرانەوەو بەشداری کرد لە دروستکردنی ئەو حزبەدا کە بۆ خۆی حزبێکی گەورە بوو، هەزاران پێشمەرگەی هەبوو، بزووتنەوەی جەماوەری بەڕێوەدەبرد، پێگەو جێگەیەکی گەورەی لەکوردستانی ئێران هەبوو.

# حزبی کۆمۆنیست پەیوەندی کۆمەڵەی لەگەڵ چەپی ئێراندا تێکدا
# کادرەکانی تارانی حزبی کۆمۆنیستیش هەر کۆمەڵە بوون

*چ پێویستتان بەوە هەبوو؟

**عەبدوڵای موهتەدی:** ئەوە زۆرتر دەگەڕێتەوە سەر ئەو باسانەی کردمان، سەر ئەو ڕووانگانە، بەڵام لەغەیری کۆمەڵە ئەوەی کە هێنای نە بزووتنەوەی کرێکاریی لەگەڵ بوو، نە بزووتنەوەی خوێندکاری لەگەڵ بوو، نە بزووتنەوەی ڕۆشنبیرو نە جەماوەری فارسی لەگەڵ بوو، نە تارانی لەگەڵ بوو، نە مامۆستای زانکۆی لەگەڵ بوو، نە کرێکاری کارخانەکانی لەگەڵ بوو، نە تێکۆشەرانی قەدیمی چەپی لەگەڵ بوو.

ئەوە سەیرە با ئەوەت پێ بڵێم، بۆیە دەڵێم حزبی کۆمۆنیستی ئێران بەرهەمی ئەوە نەبوو، کە حزبی کۆمۆنیستییەکی گەورە دەبوایە وابوایە، بەرهەمی ئەوە بوایە، هەرکەسە لەشوێنی خۆی جەماوەری بوایە، هەرکەسە لەشوێنی خۆی بزووتنەوەی ببوایە، خەڵکی ببوایە، ئەوانەت لێکبدایەتەوەو ئینتلافێکت سازبکردایەو یەککرتنێکت لەنێوانیاندا پێك بهێنابایە، بەڵام وانەبوو، پێگە جەماوەرییەکە بەس لەکوردستان بوو، ئەوی تر هیچ نەبوو، ئەو تەشکیلاتەی کە لەتارانیش دروستکرا هەموویمان بەدەست چند کوڕی چاك و کچی چاکی ڕێکخراوی نهێنی خۆمان لەکوردستان زۆربەی هەرە زۆریان هەر ئەوەبوون، ئەوانەمان دەرهێنا بردمانە تاران، بردمانە هەندێ جێگاو تا ڕێکخستن دروست بکەین بەحزبی کۆمۆنیست، خۆ بەکادریش ڕێکخستنی تارانەکشی هەر کۆمەڵە بوون، بۆیە دەڵێم حزبی کۆمۆنیستی ئێران لە تێکەڵبوونەوەی چەندین بزووتنەوەی گەورەی سەرانسەری و مەحەلی پێکنەهات، یەك بزووتنەوە بوو ئەویش هی کوردستان بوو کۆمەڵەی تێدابوو بەدەست ئەوەوە بوو، باقیەکەی بزووتنەوەیەك لەئارادا نەبوو.

قەت قەت نەبوون بەخاوەن پێگە لەو وەختەوە تا ئێستا، من پێموایە تا ئینقرازی عالەمیش نابن بە خاوەنی هیچ بزووتنەوەیەکی جەماوەری. بۆ مەسەلەی نێوانی چەپ، بۆیە دەڵێم حەتا تێکۆشەرانی



چەپیش لەگەڵ ئەم حزبە کۆمۆنیستە نەهاتن، پێش پێکهێنانی حزبی کۆمۆنیستی ئێران نفوزی کۆمەڵە لەنێو چەپی ئێراندا بە مەراتیپ زیاتر بووە تا دوای پێکهێنانی حزبی کۆمۆنیستی ئێران، کۆمەڵە رێکخراوێکی یەکجار خۆشەویست و بەرێز بوو لەنێو چەپی ئێراندا، پاڵەپەستۆ بوو لەسەر ئەوەی کێ بێ سلاو لەکۆمەڵە بکات، هەموو کەس رێکخراوەکانی چەپی ئێران کە لەنێوخۆدا هەزار قسەیان بەیەکتری دەوت هەر پێیان عەیب بوو زمان لەکۆمەڵە بکەنەوە، رەخنەشیان ببوایە بەوپەڕی ئیحترامەوە باسیان دەکرد، ئێمە بەدروستکردنی حزبی کۆمۆنیستی ئێران نێوانی خۆمان لەگەڵ هەموو چەپی ئێران تێکدا، لەگەڵ ئیتحادی موباریزانی کۆمۆنیست بووین بەیەك ئەو حزبەمان پێکهێنا کە ئەوان شەڕی هەموو چەپی دیکەی ئێرانیان دەکرد، ئێمە شەڕی ئەوانمان کرد بەشەڕی خۆمان. نێوانمان لەگەڵ هەموو چەپی ئێرانیش تێکچوو، لەدوای جیابوونەوەمان نێوانمان دیسان خۆشتر بووەتەوە لەگەڵ ئۆپۆسزیۆنی ئێرانی و چەپی ئێرانی وەکو حزبێکی کوردستانی و وەکو کۆمەڵە.

## مەنسور دژی راپەڕینی (1991) عیراق بوو، کۆمەڵە لەگەڵیدا بوو

***ئەمانەی کە تۆ ئێستا باستکرد، کە دروست بوونی حزبی کۆمۆنیستیش وایکرد ئێوە جیابکاتەوە لەهەموو چە پەکانی ئێران، وایکرد وەکو خۆت وتت بەڕاستی ناشیرینتر ببن لەناو جامعەی کوردستان و لەناوئێراندا، وایکرد کە کۆمەڵە پاشەکشە بکات، ئەم هەموو شتانە ئێوە پاش (8) ساڵ باستان کرد، یانی پاش ئەوەی کە مەنسوری حیکمەت و ئەوانە دەچنە دەرەوە لەحزبی کۆمۆنیست، دوای پلۆنیۆمی بیستەم، باشە لەماوەی ئەو (8) ساڵەدا هەستان نەکرد کە رۆژ بەرۆژ کۆمەڵە و حزبی کۆمۆنیست زەعیف دەبێت، هەستان نەکرد کە رۆژ بەرۆژ نفوزتان کەمتر دەبێتەوە، رۆژ بەرۆژ ناشیرین دەبن لەناو جامیعەدا، بۆچی ئەوکاتانە قسەتان لەسەر ئەوە نەکردووە، ئەو کاتە بەرتان پێبگرتایە بەو هەموو قەیرانانەی بۆ ئێوەی خوڵقاند، هەستتان پێنەکرد، قسەتان نەکرد، وەلامێکی واقعیتان بە جەماعەتی سەهەند نەدایەوە؟**

عەبدوڵلای موهتەدی: هەستمان بەوە نەدەکرد، من لانی کەم خۆم دەڵێم هەستمان بەوە نەدەکرد، پێم وانییە لەبەرچاوی خەڵکی کوردستان ناشیرین دەبووین، راستییەکەی زۆر ئاوا نەبوو، دەزانی بۆ وانەبوو، چونکە خەڵك کۆمەڵەیان خۆشدەویست و گوێیان بەوە نەدەدا، هەر بەناوی کۆمەڵەشەوە لەکوردستان ئیشمان دەکرد، گوێیان نەدەدایە ئەوەی ئێمە لەجێگەیەکی دیکە چ دەکەین و چۆنەو

ناوەکە چۆنە، لەبەر ئەوە ناڵێم بێ تەئسیر بوو، بەڵام تەئسیرەکەی ئەوەندە گەورە نەبوو کە تۆ هەستێکی وا زۆری پێبکەیت.

دووەم، وردە وردە بەڵێ، دوای دوو ساڵ سێ ساڵ، زۆرچاك ئێمە هەستمان بەوە دەکرد کە لەبەشی سەرانسەرییەکەی حزبی کۆمۆنیستی ئێراندا ئێمە روو لەمەرکزبوونین، پەیوەندییەکانمان روو لەکزبوونە، رێکخستنەکانمان نەماوە، نامەمان بۆ نەدەهات، تەلەفۆن کەمتر بوو، وردە وردە مەعلوم بوو ئەو لایە چۆڵ دەبێ وەکو عەرزم کردی.

ئەمە بمایەتەوە بیرێکی ژیرانەی لێکرابایە بەهەست کردن بە مەسئولیەتەوە، جۆرێکی کە دەبوو، چا من خۆم رەئم وایە کۆمۆنیزمی کاریگەریی تیئۆری پاساوکردنی ئەم شکستەی حزبی کۆمۆنیستی ئێرانە، ئەسڵەن بۆیە سەری هەڵدا، ئەسڵەن کۆمۆنیزنی کاریگەریی تیئۆرییەك بوو هەڵقوڵاوی ئەم بنبەستییەی حزبی کۆمۆنیستی ئێران بوو، بۆ چەواشەکردنی ئەم واقیعە، لەجیاتی راستییەکانت پێبناسێنێت بڵێن ئێمە حزبی کۆمۆنیستمان بەنیەتێکی زۆرچاك پێکهێنا، بەنیازپاکی پێکمان هێنا، دەمانویست خزمەتێك بە چەپی ئێران بکەین، دەمانویست خزمەتێك بە ئۆپۆسزیۆنی ئێران بکەین، دەمانویست ئەو سەنگەرەی کوردستان پەرە پێبدەین بۆ جێگەی دیکەی ئێرانیش، نەمانتوانی ئەوە بکەین و لێکۆڵینەوەی لەسەر بکەین بزانین بۆ وایە.

من پێموایە مەنسوری حیکمەت بەفیتی خۆی زانی و ئەم تیئۆرییەی بۆیە هێنا پاساوی ئەم شکستە بکات و چەواشەکاری بکات و تەوزیحێکی تری بۆ بدۆزێتەوە، بۆیەش دەڵێم لەقۆناغی یەکەمدا زۆر ستایشی کۆمەڵە دەکا و دەڵێ دەبێ هەموومان وەکو ئەو بکەین و ئەمە نموونەی حزبی جەماوەرییە و من دڵم هەر بەو خۆشە، بەڵام وردە وردە پێچەوانە کۆمەڵە دەبێتە هەدەف بۆ لێدان و کوتان، ئەوە کۆمەڵە نامێڵێ، دەنا ملیۆنەها کارگەر ئاخرقسەی مەنسوری حیکمەت ئەوەبوو بەهەزاران و دەیان هەزار کرێکار مەحتەلن لەبەر دەرکی حزب، وەزعی کۆمەڵە نامێڵێ ئەوانە بێنە ناو حزب، دەی ئەوە لەکۆمەڵە جیابوونەوە، کوا ئەو هەزاران کارگەرو دەیان هەزار کرێکارە؟ لەبەر ئەوە من دەڵێم ئەسڵەن ئەو تیئۆرییە بۆ وەڵامدانەوەو پاساو کردنی ئەو شکستە پێکهاتبوو.

با من یەك شتی ترت پێبڵێم، ئەسڵەن عەقیدەم وایە کۆمۆنیزمی کاریگەریی تیئۆری شکستە، چا تۆ تەماشا بکە لەنێو چەپی عیراق کەس سەرکەوت؟ راستە نفوزی .. دوای کۆڕەو، یانی دەبوو شکست بێت تا ئەوان سەرکەون، ناڵێم پێشتر هیچ نفوزیان نەبوو، بەڵام ئەگەر کۆڕەونەبوایە و شکستی بزووتنەوەی ئەو وەختە نەبوایە، ئەمان کۆمۆنیزمی کارگەریی ئاوا سەری هەڵنەدەدا، ئەو وەختە ئەگەر لەگەڵ چالاکانی کۆمۆنیزمی من بۆخۆم قسەم لەگەڵ دەکردن لەگەڵ چەپی عیراق لەگەڵ زۆریان، زۆرم هەوڵدەدا کە بڵێم ئەو رێگایە هەڵەیە، ئەوەڵەن ئێوە دەبێت کێشەی نەتەوەیی ببینن، پێشەنگی ئەوە بن، دڵسۆزی دیموکراسی بن، دڵسۆزی چی و چی بن جا چەپایەتی خۆشتان لەو چوارچێوەیەدا

تەرح کەن، بەتایبەتی دەزانی هەموو ئێمەمانانیش لەراپەرینەکە بەگەرمی پشتیوانیمان کردن، ئەسڵەن هەموو شتێك کە جیایی ئێمەو کۆمۆنیستی کاریگەریی تەقاندەوە هەر مەسەلەی راپەرینەکە بوو، ئەوان دژی راپەرین بوون و ئێمە لەگەڵ راپەرین بووین سالی (1991)، جا مەبەستم ئەوەیە کە لەوکاتە قسەت لەگەڵ دەکردن ئەوان دژی راپەرین بوون.

# کۆمۆنیزمی کارگەری تەنها رێگا چارەیان ئەوەیە ببنە بەکرێگیراو

*بەهەڵچوونێکی کاتی بۆ بەرنامەیان دادەنا؟

عەبدوڵڵای موهتەدی: ئەوان زۆرتر هێزیان نەك لەراپەرین، بەڵکو لەشکستی راپەرین هێزی خۆیان وەرگرت، ئەوان لە کۆڕەوەکەو لە تراژیدی کورد هێزیان وەرگرت نەك لەسەرکەوتنی کورد، لەنێو ئێمەشدا وابوو، بنبەستی حزبی کۆمۆنیست مەعلوم بوو ئیتر کەوتبوونە جموجۆڵی فیکرییەوە، بۆ وای لێهات خۆ قەرار نەبوو حزبی کۆمۆنیست ئاوا بێ، ئاخر دەبوو گەشە بکات دەبوو لەئێران شتێك بکات، لەو شەش و بێشەدا بووین کە کۆمۆنیزمی کاریگەریی بەبڕوای من تیئۆری پاساوکردنی شکستە، من لەهەموو جێیەك کۆمۆنیزمی کاریگەریی بە تیئۆری شکست دەزانم، بۆیەشە پێم وانییە یانی ئەگەر لەئێران ئاڵوگۆڕی سیاسی بێت، لەکوردستان ئاڵوگۆڕی سیاسی بێت ئەگەر بە حەقیقەت پێشکەوتن هەبێت پێم وانییە ئەوان قەت قەت پێگەو جێگەیەك پەیدا بکەن، تەنها لەیەك حاڵدا من پێموایە کۆمۆنیزمی کاریگەریی دەتوانێ جێگەیەکی هەبێت ئەویش نەك جێگەیەکی زۆر ئەویش بەکرێگراوی هێزێك بن، یانی کەسێك کاریان پێبکات.

*مەبەستت ئەمریکای یان ئیسرائیلە؟

عەبدوڵڵای موهتەدی: نازانم ئەوان یان هەر کەس، بەهەرحاڵ دەبێت هێزێك بیانهێنێت و کاریان پێبکات، چونکە ئەوان نە هەڵقوڵاوی بزووتنەوەن، نە لەگەڵ هیچ بزووتنەوەیەکی ئازادیخوازانەو رزگاریخوازانەو پێشکەوتنخوازانەی ئەو سەردەمەدان، ئەوان دژی هەموو شتێکن.

# دانانی کۆمۆنیزمی کارگەری بەچەپ هەڵەیە

***کەواتە ئەوان لە چەمکە تیئۆرییەکان دەردەچن ئەگەر لەگەڵ دەوڵەتێك پشتیوانی بکەن؟**

عەبدوڵڵای موهتەدی: لەمێژە دەرچوون، من زۆر لەمێژە کۆمۆنیزمی کاریگەریی و دانانی ئەوان بەچەپ بەهەڵەیەکی گەورە دەزانم.

*** پێتوانییە هەر ئەوەش وایکرد، دوای ئەوەی مەنسوری حیکمەت جیادەبێتەوەو یەکێتی کۆمۆنیزمی کرێکاریی پێکدێنێ لەڕانیەو لەدوای ئەوەش حزبی کۆمۆنیزمی کرێکاریی پێکدێنێ و دواتریش حزبی کرێکارانی کۆمۆنیستیان لێ جیادەبێتەوەو دوو سێ جار ئینشقاق، پێت وانییە هەموو ئەم سیراعانەیە کە بێ بەرنامەییەکی دروستکردووە لەناویانداو نازانن بگەنە کام نەتیجە، ئەو هەموو ئاڵوگۆڕانە؟**

عەبدوڵڵای موهتەدی: بێگومان وایە، من پێموایە ئەگەر خەڵك زۆر برسی بن، ئەگەر زۆر رەشبین بن، ئەگەر شکست بخۆن، بێ هیوابن، لەوحاڵەدا کۆمۆنیزمی کاریگەریی شانسێکی هەیە، کە ئەویش هەرگیز پێم وانییە شانسێکی گەورەی هەبێت، بەڵام بەهەرحاڵ جموجوڵێکیان مومکینە بێت لەو حاڵەتەدا.

# ئێستاش حیزبی کۆمۆنیست هەر شتەکانی مەنسوری حیکمەتیان لەمێشکدایە

***پاش ئەوەی کە مەنسوری حیکمەت و جەماعەتێکی زۆر لەحزبی کۆمۆنیستی ئێران و کۆمەڵە دەچنە دەرەوە ساڵی ( 1991 )، تۆ لەناو ئەو ململانێیانەدا دەمێنیتەوە کە قەناعەتت پێی نەماوە کەحزبی کۆمۆنیست جێگەو پێگەیەکی نەبووە لە کوردستانداو پێویستە کۆمەڵە دیسان ببوژێندرێتەوە، دیارە مەبەستت کۆمەڵەی زەحمەتکێشان بووە، بەڵام ماوەی ئەو( 10 ) ساڵە بۆ لەو ململانێیەدا بوویت، گوایا تۆ کە چەندین جاریش لەو دەمانەدا چوویتەتە دەرەوەو دانیشتوویت یان وازت هێناوە یان عاجز بوویت، بۆ لەو دەمانەدا دیسانەوە مەسەلەی کۆمەڵەت نەبووژاندەوە، یانی هەر درێژەی هەبوو حزبی کۆمۆنیست بەو هەموو خەڵەلەوە وایکرد کە کۆمەڵە رۆژ بەڕۆژ بێ هێز بکات؟**

عەبدوڵڵای موهتەدی: جارێ با بڵێم من دانەنیشتووم، دیارە چوونە دەرەوەی ئێمە زۆرکەسی تریش چوونەتە دەرەوە، بەڵام نا من لەهیچ سات و کاتێکدا دانەنیشتووم، کارم هەر کردووە، بەڵام من بەیەك



نەتیجە گەیشتم زۆر زۆریشم هەوڵدا لەگەڵ هاوڕێیانی ئەو سەردەمەو یەك لەوان بەتایبەت کاك برایم کە خۆمم زۆر بەنزیك دەزانی لە ئەوو هاوڕێیەکی کۆن و دێرین بووین و بڕوامان زۆر بەیەکتری بوو، زۆرم هەوڵ لەگەڵ دا بۆ ئەوەی کاك برایم بەشداریم بکات لە داڕشتنەوەی سەرلەنوێی خەتی فیکری و سیاسیمان، چونکە من پێموابوودروستکردنەوەی بزووتنەوەیەکی نوێ، حزبێکی نوێ، حەرەکەتێکی نوێ ناتوانێ بنەمای تیئۆری نەبێ، ناتوانێ هەروا لەخۆڕا دەست پێبکات، من لەو کەسانە نیم، من دەبێ سیستمێکی فکریم بۆ خۆم ساغ بکەمەوە تا بتوانم کاری تێدا بکەم، من لەوانە نیم گوێ نادەمە تیئۆری، لەوانە نیم گوێ نادەمە تەحلیل، هیچ نەبێ خۆم دەبێ ساغ کردبێتەوە یان لەپرۆسەی ... ناڵێم ئینسان دەبێت هەموو شتێك ساغ بکاتەوە جا دەست بەکاربکات، نا لەپرۆسەی کارەکەدا جاری واهەیە ساغ دەبیتەوە بەتەواوی، بەڵام بەهەرحاڵ بۆمن ئەهەمیەتی زۆر بوو.

من پێموابووکۆمۆنیزمی کاریگەریی بەو فیکرەی هێناویەتی، بەو سیستەمەی هێناویەتی، ناتوانی تۆ تەنها رەخنەی عەمەلی و بچووکیان لێبگریت، ناتوانیت لەهەڵسوکەوتیان رەخنە بگریت، لەتوندووتیژییان رەخنە بگریت، لەجنێوفرۆشیان، لەزێدەڕۆییان رەخنە بگریت، تۆ دەبێ لەبنەما فکرییەکەیان ئەو جێیەی هیچ تووڕەبوونی تێدا نییە، هیچ جنێوفرۆشی تێدا نییە، لە لووتکەی خۆیدایە، مارکس هەمیشە دەڵێ: "ئەگەر دەتەوێ لەگەڵ فکرێك تێکەویت و رەخنەی لێبگریت، رەخنە لە لووتکەکەی بگرە، ئەو جێیەی کەمووکورتییەکەی ئاشکرایەو هەموو کەس دەیزانێ، تۆ بەوە سەرناکەوی، لە لووتکەی خۆیدا رەخنە لە مونافیسەکەی خۆت بگرە". من پێموابوودەبێت لەبنەماکانی رەخنە بگری و بۆ ئەو مەبەستە زۆرم هەوڵدا کە لەگەڵم کەون لەدیراسەکردن و لەخەباتێکی نەزەریی و تیئۆریدا نەیکرد.

برایم، موشکیلەیەکی گەورەی ئەو بەمە دەزانم، ئەویش ئەوەیە سەید برایم هەرگیز پێداچوونەوەیەکی رەخنەگرانەی نەزەری بەسەر دیدگاو روونگەکانی کۆمۆنیزمی کاریگەرییدا نەگرت، هەرگیز بەتەواوی فڕێی نەدا وەکو یەك روانگە لەرەخنەیەکی نەزەریدا، لەرەخنەیەکی زانستیانەدا، بنەماکانی هیچ وەخت فڕێ نەدا، بەڵکو هەروەکو دەڵێم لەسەر دیاردەکانی، لەسەر زێدەڕۆییەکانیان، لەسەر هەڵسوکەوتیان رەخنەی گرت. کە ئەو نەیکردو من زۆرم هەوڵ لەگەڵدا، من کاری خۆمم بەوە زانی کە هەوڵ بدەم بەگوێرەی توانای خۆم، خۆم بەتیئۆرییەکی بەتوانا نازانم خۆم بە کەسێکی متەوازیع دەزانم، هەوڵمدا ئەو بنەما نەزەرییانە جارێکی دیکە داڕێژمەوە، کاری من لەسێ چوار ساڵدا ئەوەبوو، من یەك پێداچوونەوەی تەقریبەن دەتوانم بڵێم سەرتاپای خواری دیدگاکانی حزبی کۆمۆنیزمی کرێکاریم کردەوە، دیدگاکانی پێشووی حزبی کۆمۆنیستم کردووەو هەوڵمداوە سەرلەنوێ روانگەیەکی تازەو سیستمێکی فیکری سیاسی تازە داڕێژمەوە، بەبێ ئەوە مومکین نەبوو ئێمە ساڵی( 1998– 1999) تووشی کێشەو مووناقەشە ناوخۆییەکان بین و لە (2000)دا جیاببینەوە،



بنەماکانی ئەوانە بوون، لەوەدا من تەنیا نەبووم هەڵبەتە، ئەو کەسانەی، ئەو هاوڕێیانەی، ئەو کادرانەی کە دواتر بوونە هەڵسوڕاوانی ساغکردنەوەی کۆمەڵە ئێمە پێکەوە بووین.

ئێمە ئەو کەسانە بووین کە لەداڕشتنەوەی سەرلەنوێی ئەو بنەما فیکرییانەدا پێکەوە هاوکاریمان کرد، زۆرمان سیمینار دانا، زۆرمان بەحس و موناقەشەو کۆبوونەوە دانا، زۆر لەوباسانە دواین، ڕەنگبێ من نووسەرەکەی بووبم، بەڵام تەنهاقسەی من نییەقسەی زۆر کەسانە ئەوانە،قسەی زۆرکەس، بۆیە مەسەلەن تۆ دیقەت بکە من پێداچوونەوەیەکی ڕەخنەگرانەم بەسەر بەرنامەی حزبی کۆمۆنیستی ئێران و هەموو بنەماکانی کرد، ئەوە من نووسیم، پێداچوونەوەیەکی ڕەخنەگرانەم بەسەر دیدگای کۆمۆنیزمی کاریگەریی و حزبی کۆمۆنیست کرد لە مەسەلەی ڕێکخراوە کرێکارییەکان، سەندیکاکان، یەکێتییە کرێکارییەکان و بەتایبەتی شوراکان و پێموابووئەوانە هەموو هەڵەیە، ئەو پێداچوونەوەیەم کە بەسەر ئەوانە کرد، زۆرشت کە ئەو وەختە وەکو قورئان وابوو بۆ ئێمە، وەکو ئەحکامی قورئان وابوو ، ئەوانەم هەموو داوەتە بەر لێکدانەوەیەکی ڕەخنەگرانە، دەهەی ئەوەد یەکێك بووە لەو دەهانەی کە زۆر زۆرم شت تێدا خوێندۆتەوەو زۆرتری سەرچاوەکانیشم ئەمجارە ئینگلیزی بوون نەك فارسی، زۆرم چەپی ئەوروپا خوێندۆتەوە، زۆرم بەحسەکانیان خوێندۆتەوە، زۆرم جۆرێکی تر لەڕووانگەی چەپ و سۆسیالیستی خوێندۆتەوە کە تا ئەو وەختە پێی ئاشنا نەبووین، بۆ خۆم چوومە سەرچاوەکان، بۆ خۆم هەم سەرچاوە کلاسیکییەکان هەم شتی تازەو نوێ، چەپ و غەیری چەپیش، زۆرم شت خوێندەوە لەبارەی ئابووری جیهان و سیاسەتی جیهانیەوە، پۆست مۆدێرنیزمەوە، گلۆبازسیۆنەوە، ئەوانە هەموو یارمەتی منیان کرد لەو پێداچوونەوەیە، لەو پێداچوونەوەیەدا بەسەر دیدگاکانی کۆمۆنیزمی کاریگەریی دا ( ئەم بڵقە کەی دەتەقێ؟) ئەوە بەشێك لەوەیە، لەسەر ڕووانگەی ئێمە لەسەر کێشەی میللی، کێشەی نەتەوایەتی، وردە وردە هاتمە سەر ڕەخنەگرتن لە ئەزموونی خودی حزبی کۆمۆنیستی ئێران، ئیتر لێرەدابوو تا ئێرە هاتم کاك سەید برایم و ئەوان زۆریشیان پێخۆش نەبوو، بەڵام تەحەمولیان دەکرد، هاوکارییان لەگەڵ نەکردم، بڵاویان نەکردەوەو کاریان بۆ نەکرد، گوێیان نەدایە، خۆیان لێ بێخاوەنکردو زۆرجار کە دەمگووت بۆ ئەوانە بڵاوناکەنەوە ئەو نووسراوانە پێیان دەگووتم: ئێمە پێمان وایە ئەوە کێشەی شەخسی تۆو مەنسوری حیکمەتە، ئێمە خۆمان تووشی ئەو کێشەیە ناکەین، وای تێدەڕوانی، هەرگیز سەید برایم ئەهەمیەتی پێداچوونەوەیەکی فیکریی و ئەزەری ڕەخنەگرانەی تێنەگەیشتووە، ئەمە مووشکیلەیەکی گەورەمان بوو لەگەڵی، بۆیە لێمانجیابووەوە، جا کە هەمووی ئەو پێداوچونەوە ڕەخنەگرانە کرا ئاخرین قۆناغی بۆ کێشەی نەتەوەییەکەش بۆ مەسەلە نەتەوەییەکەش هەموو ئەو شتانەی کە زووتر وتبووم و جێی نەگرتبوو ئەمجارە نووسیم تا هاتینە سەر ئەوەی کە خودی حزبی کۆمۆنیستی ئێران هەر حزبەکە پێداچوونەوەی دەوێ، ئیتر پێداچوونەوەیەکی ڕەخنەگرانەم لەسەر ئەوە نووسی و ئەمە ئاخرین

بزماری لەتابووتی حزبی کۆمۆنیستی ئێراندا، تازە مەعلوم بوو ئێمە ئەو حزبەمان قبوڵ نەبوو، کاك سەید برایم لەهیچ بەحسێکی نەزەری لەم (15) ساڵە بەشداری نەکرد، (مەبەست تاساڵی 2006) ئێستاش ئەو شتانەی مەنسوری حیکمەت هەر ئەو شتانەی لەمێشکدایەو تێگەیشتنی لە سۆسیالیزم هەر ئەو شتانەیە، نە شتی تازەی دونیای خوێندەوە، نە ئەو بەحسو ئاڵوگۆڕە فیکرییە (15- 20) ساڵەی تەعقیب کرد، نە چەپێکی تازەی ئەورووپایی و غەربی خوێندەوە نە حەتا چووە سەر کلاسیکەکان جارێکی دیکە پێیاندا بچێتەوە، هەر بەشی شایەتمانەکەی بوو، رەنگە ئەویش ئاسوودەتر بێت تا ئینسان خۆی تووشی سەرئێشە نەکات باشترە.



# کەراپەڕین بوو دیموکرات بەپەلە هاتنەوە کوردستان حزبی دیموکرات یارمەتیان لەبەعس وەردەگرت

*** لەخۆتو لەبرادەرانتم بیست کە لەساڵی (1978- 1979) کە دوو ساڵ بوو کۆمەڵە بەعەلەنی دامەزرابوو، زۆر گەشەیکردووە، لەبەرامبەر حزبی دیموکرات . ئەوە بەشێکی دیارە پەیوەستە بە مەسەلەی مەعریفی کۆمەڵەوەو خەڵکی رۆشنبیر، ئێوە بوونە یەکەم حزبو لەخۆپیشاندانەکاندا دەورێکی کاریگەرتان هەبوو، ئەوە وەکو شتێکی موفاجەئە بۆ حزبی دیموکرات وابوو کە حزبێك لێی قوت بۆتەوەو بۆتە رکەبەری، دیارە هەزمکردنی ئەمە لەناو حزبی کوردیدا تۆزێك قورس بوو، ئێوە چۆن وا زوو گەشەتانکرد؟ چۆن وەڵامی حزبی دیموکراتتان دایەوە؟ هەر ئەوانە بوو وایکرد ئێوە بکەونە ململانێوە لەگەڵ حزبی دیموکرات؟**

عەبدوڵلای موهتەدی: رەنگبێ بۆ حزبی دیموکرات موفاجەئە بووبێت، بەڵام لەڕاستیدا وانەبوو، چونکە ئێمە لەکاتێکدا کە راگەیاندنی ئاشکرای چالاکی کۆمەڵەمان کرد لە (26)ی رێبەندانی (1978) ئەوکاتە نزیك (10) ساڵ چالاکی نهێنیمان تێپەڕ کردبوو، کۆمەڵێکی باش لەخوێندکاران و رۆشنبیران و مامۆستایان و کرێکاران و زەحمەتکێشانی وشیارمان لەدەوری خۆمان کۆکردبووەوە، شەبەکەیەکی چاکی سیاسی و رێکخستنمان لەشارەکانی کوردستانی ئێران بڵاوکردبووەوەو دامەزراندبوو، بەدەوری ئەو شەبەکەیە، کۆمەڵەیەکی لەوان زۆرتر خەڵکی سەمپات و لایەنگرو ئەوانەی بەقسەی تەشکیلاتیان دەکرد، لەدەور بوو، ئەمە یەك.

دووەمیش: ئەوەیە لەتەواوی ئەو ساڵانەدا حزبی دیموکرات بەدەلیلی ئەوەی لەژێر فشاری دیکتاتۆری حکومەتی پادشایەتیدا بوو، خەڵکی لێ گیرابوو، خەڵکی لێکوژرابوو، راونرابوو، لەلایەکی تریشەوە بەهۆی ناکۆکییەکانی ناوخۆیی کە لەکوردستانی عێراق بۆی پێش هاتبوو، ئەو سەردەمە لەناو سەرکردایەتیدا لەڕاستیدا ئەو چالاکییەی نەبوو کە ئێمە هەمانە، ئەوان لەنێو کۆمەڵگای کوردی ئێراندا ئاوا لەنزیك و چڕوپڕی نەبووە، جار جار هاتنێك، چوونێك بوو، ئێمە لەناوخۆوە سەرمان هەڵدابوو، دیموکرات لەدوورەوە سەیری کۆمەڵگاکەیان دەکرد، یان جار جار کادرێك، کەسێکمان دەناردەوە، لەبەرئەوە ئەمە هۆکارێکی گەورە بوو، بێجگە لەوە پێموایە کە ئێمە لەگەڵ زەمان و سەردەم گونجاوتر بووین، لەگەڵ ئاڵوگۆڕەکان گوونجاوتر بووین، من پێشتر باسی ئەوەم کرد، کە چۆن شارنشینی لەکوردستان پەرەی سەندبوو، چۆن خوێندەواری لەکوردستان پەرەی سەندبوو، چۆن سیستمی دەرەبەگایەتی زەربەیەکی قورسی خواردبوو لەئیسلاحاتی ئەرزی زەمانی (شا)و ریفۆرمانەدا، وە چۆن فیکری باوك سالاری کز بوو بوو، زەربەیەکی خواردبوو، ئەمانە هەمووی رێگەی



کردەوە بۆ ئەوەی هێزێکی مۆدێرنترو نوێخوازترو سەردەم بێتە ئاراوە، بێجگە لەوانە ئێمە حزبێکی چەپ بووین، باوترین فیکری سەردەم بوو ئەو وەختە.
ئەوجار ئێمە لەکێشە کۆمەڵایەتییەکان زۆر لەنزیکتر تێکەڵاو بووین، لەکێشەی جوتیاران، لەکێشەی بێ کاران، لەکێشەی ژنان، لەکێشەی خوێندکاران و نەوجەوانان، لەوانەش لەهەموویدا ئێمە چالاکتر بووین و قسەمان زۆرتر پێ بوو، لەخۆپیشاندانەکاندا کۆمەڵەو هەڵسوڕاوانی کۆمەڵە بەبێ، ئەوەی ئەو ناوەیان بەسەرەوە بێ یان بەسەرەوە نەبێ دەورێکی هەرە چالاکیان بوو لەشارەکانی کوردستانی ئێران.
سەرکردایەتی حزبی دیموکرات ئەو وەختە بەشی زۆری هەر نەهاتبووەوە، هێشتا لەدەرەوەی وڵات بوو، نزیکەی راپەڕین بوو کە ئەوان وردە وردە ئیتر خۆیان گەیاندەوە کوردستان، بەڵام ئەوانیش چەند خاڵی بەهێزیان بەسەر ئێمەدا هەبوو، ئەوانیش نوقتەی قوەتیان هەبوو کە زیاد لەئێمە بوو، مەسەلەن ئەوان ئەزموون و تەجرەبەی جۆرێك لەسیاسەتیان زۆرتربوو، ئەوان سیاسەتی ناوچەکەو هی کوردی زۆرتر تێکەڵاو بوون لەگەڵ شۆڕشی ئەیلول، لەگەڵ پارتی، زۆرتر تێکەوتبوون لە ئەزموونی سیاسی، ئێمە رەنگە کەمتر بەو حیسابە تێکەوتبووبێتین، بێجگە لەوە بەشێك لەسەرکردایەتی ئەوان لەئێمە ناسراوتر بوون، ئەوان کەسی ناسراوترو کە پێشینەی خەباتی سیاسی زۆرتر بوو ئەوانەیان لەگەڵ خۆیاندا هەبوو، بێجگە لەوە ئەوانیش ناوی حزبی دیموکراتیان هەبوو کە ناوێکی ناسراوتر بوو بۆ کۆمەڵگای کوردستان، ئەوان لەگەڵ کۆماری کوردستان لەمهابادو لەگەڵ قازی محەمەدو لەگەڵ ئەو ئەزموونە تێکەڵاو بوون و بەوەوە دەناسرانەوە، ئەمە شتێکی گەورەتر بوو، وەختێکیش هاتنەوە ئێران، شانە کۆنەکانیان، رێکخستنە کۆنەکانیان، لایەنگرانی قەدیمیان هەمووی ئەوانە بووژانەوەو زیندوو بوونەوە، دوو شتی تر نوقتەی بەرزتری ئەوان بوو بەسەر ئێمەدا، یەکیان ئەوەبوو کە ئەوان دەستیان بەسەر پادەگانی مهاباددا گرت، ئێمەش دیارە هەندێك شوێنی چکۆڵەترو ئەوانەمان گرتبوو، بەڵام ئەو پادەگانە دەورێکی زۆر کاریگەریی بۆ سەر حزبی دیموکرات بوو، بۆ سەر بەهێزکردنی حزبی دیموکرات و توانی لەو رێگایەوە هەزاران پێشمەرگەی خۆی و هێزی بەرگری و خەڵك و ئەوانە زیاد بکات، ببێتە هێزێکی گەورە لەکوردستاندا.
دووەم: لەباری ماددییەوە ئەوان ئەو سەردەمە پەیوەندییان هەبوو لەگەڵ حکومەتی عیراق و زوو زوو توانیان یارمەتی ماددییان لێوەرگرن و لەرابردووشدا ئەوان پەیوەندییان بووە، شوناسیان بووە، ئێمە هیچ پەیوەندییەکمان نەبوو، شوناسێکمان نەبووەو پێمان وابوو هەرگیز نابێت ئەو کارە بکەین، لەبەر ئەوە لەباری ماددیش و ماڵیشەوە ئەوان زۆر لەئێمە بەهێزتر بوون، بێجگە لەوە دەستیان بەسەر هەندێك بانك و شتی مهابادو ئەوانەدا گرت کە ئەمەش ئەوەندەی دیکە بەهێزی کردن، لەبەر ئەوە لەرووی ماددییەوە لەرووی سەربازییەوە ئەوان زۆر لەئێمە لەماوەی چەند مانگێکدا توانیان لەئێمە



بەهێزتر بن، وە لەبارەی پەیوەندییەکانیان لەگەڵ بەشەکانی تری کوردستان و لەگەڵ سیاسەتی ناوچەکە، لەبارەی پشتیوانی کە حکومەتی ئەوکاتەی عیراق ی دەیکردن.

لەبارەی ناسیاوبوونی شەخسیەتی کەسایەتییەکانەوە، لەبارەی ئەزموونی رابردوویانەوە، ئەوانیش نوقتەی بەهێزی خۆیانیان بوو، بەڵام لەهەرحاڵدا لەو ماوەدا یانی لە(1978 -1979 )لەماوەی تەقریبەن نزیک بەساڵ و نیوێك، دووساڵ، بەڕاستی کۆمەڵە لەرێکخراوێکی ژێرزەمینی کە راستە شەبەکەی بوو، خەڵکی بوو، ئەندامی بوو، ئەزموونی خەباتی بوو، بەڵام بەهەرحاڵ حزبێکی ژێرزەمینی بوو، دەزانی حزبی ژێر زەمینی چۆنە، لەوەوە بوو بەحزبێکی جەماوەری کە هەموو خەڵکی کوردستان دەیانناسی، بۆیە لەبەرچاوی زۆرکەس وەکو تەقینەوەیەك، وەکو شتێك لەپڕو ناکاو دەهاتە پیش چاو، بەڵام لەڕاستیدا وانەبوو، زەمینەی کۆمەڵایەتی، سیاسی، فیکری زۆر کۆنکرێتی لای کۆمەڵگای ئەوسای ئێراندا هەبوو.

# حزبی دیموکرات ئەم شێوە لەخەباتی نەدەزانی وەک کۆمەڵە

---

***با ناوی بنێم ئێوە فێڵێکی سیاسیتان کرد یان تاکتیکێکتان کرد، ئێوە سەرەتا بەناوی حزبێکەوە نەهاتن، بەناوی یەکێتی جوتیاران و کۆمەڵگای مەدەنی و کرێکاران و ژنان و ئەوانە، زوو گەشەتانکرد، بە پێچەوانەی دیموکرات، پێشتریش وەکو باسکرد دیموکرات هەمیشە لەسەر رابردووی دەژی و وەکو هێزێکی ناسیۆنالیست، پێتوایە ئەوانە فێڵ بوو، یان تاکتیکی سیاسی و واقعیی بوو، ئێوە خزابوونە ناو هەموو پنتەکانی کۆمەڵگاوە، کە ئەوانە بۆ پێکهێنانی حزبێکی مۆدێرن لەهەموو دنیادا پێویستە، ئێوە هەستتان بەوەکرد؟**

عەبدوڵای موهتەدی: ئەوە ئەسڵەن هیچ فێڵێکی تێدانەبوو، ئەوە پەیوەندییەکی راستەوخۆ بوو لەگەڵ باوەڕو روانگەکانی ئێمە هەبوو، کۆمەڵە هەر لەرۆژی ئەوەڵەوە حەتا لەدەورەی کاری نهێنییەوە، یەکێك لەپێناسەکانی کە ئێمەی لەلایەنە سیاسییەکانی تر، جا چەپ بن یان دیموکرات یان هەرچی بن لەناو ئۆپۆزسیۆنی ئێرانیش و کوردیشدا جودا دەکردەوە.

بڕوای ئێمە بەجەماوەرو خەباتی جەماوەری بوو، من پێشتر باسمکرد کە تەنانەت کادرەکانی ئەو وەختی کۆمەڵە و ئەندامە سەرەتاییەکانی کۆمەڵە دەبوایە بتوانن بچنە نێو کرێکارانەوە، بتوانن بچنە نێو جوتیارانەوە، دەبوایە بتوانن لەنێو مەسەلەن موعەلیمان و مامۆستایان، لەنێو خوێندکاران، بۆ ئێمە کادر ئەوە نەبوو هەر لەرێکخستنی نهێنی خۆماندا چ قسەیەکی زل یان چ دەکات و ناکات، دەبوو

لەکۆمەڵێك ئەزموون تێپەڕ بێت، ئیمتیحانی خۆی بدات، دەزانێ لەگەڵ خەڵك بێتەوە یان نا، لەبەر ئەوە لەڕۆژی ئەوەڵەوە، لەسەرەتاوە کە لەگەڵ کەسێك کارمان دەکرد، خۆشویستنی خەڵك، خزمەت بەخەڵك، تێکەڵبوون بەخەڵك، ئەهمیەتی جەماوەر لەگۆڕانکارییەکاندا، ئەهمیەتی وشیارکردنەوەو ئاگاهی بەخشین بەجەماوەر، ئەوانە بەشێك لەئامۆزشەکانی ئێمە بوو، بەشێك لەو شتانە بوو کە ئێمە فێری خۆمان و فێری کەسانی خۆمانمان دەکرد، لەگەڵ بزووتنەوەش دەستی پێکرد، باسی ئەوەشم کرد ئێمە زۆر لەڕیزی پێشەوەی بزووتنەوەکاندا بووین، بەڵام زۆر زوو کەوتینە فکری ئەوە کە دەبێ لەنێو ژناندا کاربکەین.

بۆیە مەسەلەن ئێمە ئەندامە ژنەکانمان چوون و بەفراوانی لەبزووتنەوەی ژنانی ئێراندا کاریانکرد، لەنێو کرێکاراندا کارمان کرد، لەزۆرێك لەشارەکان کە نوێنەری کرێکار هەڵدەبژێردرا بەبێ ئەوەی بزانن لەڕاستیدا ئەندامەکانی ئێمەیان هەڵبژارد، من خۆم مەسەلەن کەسی ئاوام لەنزیکەوە پێ شك دێ، ئەوجار پشتیوانی ئێمە لەبزووتنەوەی جوتیاران ریشەیەکی هەبوو لەهەموو ئەو بیروباوەڕەی ئێمەدا کە ئێمە بڕوامان بەهێزی جەماوەرو هێزی کرێکاران و زەحمەتکێشان هەبوو، وە بڕوامان بەوە هەبوو ئێمە نوێتر لەو بارەیەوە بیرمان دەکردەوە، ئەسڵەن دیدی ئێمە لەحزبایەتی شتێکی داخراو نەبوو، هەمیشە بەتوڵی حەیاتی کۆمەڵە لەدانوستاندنێکی زۆر نزیکدا لەگەڵ بزووتنەوە جەماوەرییەکان بوو، ئەو وەختیش قسەمان ئەوە بوو دەمانووت کە کادری چاك ئەوەیە بۆن بکات، بزانێ چی هەیە لەناو خەڵکدا، چی تازەو باش هەیە دەبێ بیقۆزییەوە، حەرەکەتێکی جوتیاران بوو زوو رێکمانخست و پەرەمان پێداو بوو بەو یەکێتی جوتیارانەو لەهەموو کوردستان و شتەکانی تریش، کۆچی مەریوان، کام حزبی کوردی کۆچێکی ئاوا مێژوویی خستۆتەڕێ کە تەواوی خەڵکی شارێك چۆڵی کەن وەکو ئیعترازێك کە بەم هۆیەش بوو توانیمان بەشێوەیەکی هێمنانە ئەرتەشی جمهوری ئیسلامی پاشەکشە پێبکەین، یان زۆرێك لەشتەکانی تر ئەو رێپێوانە لەسنەو لە بانەو لەسەقزو لەهەموو جێیەکی کوردستانەوە هەزاران بەپێیان بۆ پشتیوانی چوون بۆ مەریوان و ئەم حەرەکەتە شتێکی نوێ بوو، حزبە تەقلیدی و سوونەتییەکان ئەسڵەن ئەم شێوە لەخەباتیان نەدەناسی، ئەوان حەدی ئەکسەر یاخود لانی زۆر پێشمەرگایەتی و کاری چەکدارانە دوایش وتوویژ بکەیت لەگەڵ حکومەت، ئەگەر شتێکی پێ دایت، شتێکی تر لەو بارەیەوە نەبوو، بۆیە من بەتاریف لەخۆ نابێ ئەگەر بڵێم بەڕاستی کۆمەڵە هەندێك شکڵی نوێی خەباتی جەماوەری هێنایە نێو بزووتنەوەی کوردی وەکو داهێنانی ئێمە وان، بەڵام داهێنانێك نەك لەمێشکی خۆمانەوە هەڵمانهێنجابن، لەواقعیەتی کۆمەڵگای کوردستان، لەو گۆڕانکاریی و تەتەورانەی بەسەری هاتبوو ئێمە ئەوانەمان وەرگرتبوو.

لەبەر ئەوە شتێکی زۆر رەسەن بوو لەبڕوای ئێمەدا، وەختێك مەسەلەن لەسنە بنکەکان دەیان بنکە لەسنە کرانەوە، لەهەموو گەڕەکەکان گەنجەکان و لاوەکان و خەڵکێك کە تێکۆشەرێك بوون دەیانویست



شتێك بكەن بۆ گەڕەكەكەی خۆیان، شتێك بكەن بۆ شارەكەی خۆیان لەدەورەی دوای شۆڕشدا ئەوە پێكهات، مەسەلەن پێشی دزی بگرن، پێشی راووڕووت بگرن، پێشی خراپە بگرن، خوێندەواری پەرە پێبدەن، هەموو یەكی كتێبخانەیەكمان بوو، مەشقی چەك و ئەوانە بكەن، زۆرێك لەحزبەكان توخنیان نەكەوتن یان لێیان دەترسان، ئێمە بەبێ ترس چەكمان دانێ، بەبێ ترس كتێبمان دانێ، بەبێ ترس لەگەڵیان كەوتین، ئامۆزشی سیاسیمان دانێ، وابلێهات بنكەكان (90٪)ی زیاتر لەگەڵ كۆمەڵە كەوتبوون.

یاخود شتێكی تر هەبوو دوو مەفهوم، دوو چەمكی هەم زەحمەتكێشانی تێدابوو، هەم گەلی كورد، مەسەلەن بڵێین ئازادی شتی ئاوای تێدابوو، لەهەموو شارەكان رێكخراوگەلێك هەبوو بەناوی ئەم جەمعیەتانە پێكهاتبوون، بەڕاستی تەنیا كۆمەڵە نەبوون، ئەمە چ بوو حەرەكەتی گەنج و رۆشنبیرو بەتایبەتی بەمەیلێكی نزیكەو چەپ و بوو لەسەرتاسەری كوردستاندا ئەوە پێكهاتبوو، ئێمە نەمانووت ئێمە كۆمەڵەمان هەیە ئیتر ئەوەمان بۆچییە، نەكەوتینە دژایەتی، كەوتینە تەعامول لەگەڵی، كەوتینە دانوستاندن لەگەڵی، كارمان لەگەڵ كردن، وابلێهات لەڕاستیدا ئەوانە ئەو وەختی كە ئێمە رێكخراوەكەمان ئەوەندە بەهێز نەبوو، توانایی جەزب و هەزمی ئەو هەموو خەڵكەمان نەبوو كە لەشۆڕشێكی جەماوەریدا رووی دەكردە كۆمەڵە، بۆیە زۆرێك لەوانە لەیەكێتی جوتیاران كۆبوونەوە، لە جەمعیەتەكان كۆبوونەوە لەبنكەكان كۆبوونەوە، لەڕێكخراوی ژنان، كرێكاران، بێ كاران، مامۆستایان و موعەلیماندا كۆبوونەوەو كۆمەڵە لەنێو هەموویاندا شەبەكەی بوو، بەڵام وەختێك هێرش كرا، هێرشی چەكدارانە كرا لەلایەن حكومەتی مەركەزییەوە ئیتر بەداخەوە ئەو رێكخراوە جەماوەرییانە نەیانتوانی بێن.



# زۆربەی هونەرمەندان و مامۆستایان و خوێندکاران لەگەڵ کۆمەڵە بوون

***ئێوە چۆن توانیتان ئەو دوالیزمە بەیەکەوە بگونجێنن لەکۆمەڵگای بگەیێنن، حزبێکی چەپو مارکسی، کە چەند ساڵ لەلایەن حزبی دیموکراتەوە گۆشکرابوو بەمەسەلەی حزبێکی قەومیو تاك حزبیو ئەو کۆمەڵە شتانە، یانی ئەوانە ئێوە چۆن توانیتان ئەوە لەخەڵك بگەیەنن، خۆ ئەو خەڵکەی لەگەڵ ئێوە کەوتبوو وەکو ئایدۆلۆژیا لەگەڵتان نەکەوتبوو، رەنگە بەشێکی زۆری لە مەسەلە ئایدۆلۆجییەکە حاڵی نەبوو بوون، مارکسیزمیشی قبوڵ نەبوو، ئێوە چۆن توانیتان ئەو هێزە جەماوەرییە ناوا بخزێننە ناو کۆمەڵەوە؟**

**عەبدوڵلای موهتەدی:** دەزانی چۆنە، زۆرجار باسی ئایدۆلۆجی دەکرێت، بەڵام ئێمە حزبێکی زۆر زۆر کراوەتر بووین لەئایدۆلۆجیدا لەوەی خەڵك پێی وایە، مەبەستم ئەوەیە ئێمە پەنجەمان دەخستە سەر کێشە کۆمەڵایەتییەکان، ئەوە نەبوو کە بڵێین فلانە دەقێك هەیە ئەو دەقە لەمارکسیزمدا دەبێت ئاوابێت و ئاوانەبێت، دیارە خوێندنەوە هەبوو، بەڵام ئێمە زۆر ئینعیتافو نەرمیمان هەبوو لەدانوستاندنمان لەگەڵ ئەوانە، ئێمە پەنجەمان دەخستە سەر ئەو کێشە کۆمەڵایەتییانەو بڕوامان هەبوو کە حزبی چەپی راستەقینە ئەوە نییە لەبوورجی عاجی خۆیدا دانیشێ و تەنیا لەدنیای ئایدیۆلۆجی خۆیدا بێت.

ئێمە بڕوامان بەچەپێکی کۆمەڵایەتی بوو، چەپێکی خەڵکی بوو، چەپێك کە لەگەڵ خەڵك بێ و لەکێشە کۆمەڵایەتییەکاندا لەگەڵ خەڵکی بێت، بۆیە تۆ دەبینی لەمەسەلەی جوتیاران، لەمەسەلەی کرێکاران، لەمەسەلەی ژنان، لەمەسەلەی موعەلیمان و مامۆستایان، لەو بزووتنەوە جەماوەرییانەدا، لەهەموویاندا کۆمەڵە پێشەنگ بوو، لەمەسەلەی هونەرو شانۆدا ئەو وەختەی تازە بەحاڵ خەریك بوو سەرەتای شانۆی کوردی سەریهەڵدەدا، لەهەمووی پشتیوانیمان کردووە، یانی گوڵی سەرتۆپی هونەرمەندانی کوردستان لەگەڵ ئێمە بەرێ کەوتبوو، من دەڵێم ئێمە راستە ئایدۆلۆجیەك هەبوو کە ئەلعان پێویستی بە پێداچوونەوەو ئاڵوگۆڕ هەیە هی ئەو وەخت، بەڵام ئەو وەختیش ئێمە سێکتاریست نەبووین، یانی لەبورجی عاجی خۆماندا دانیشتبووین و گوێ نەدەینە خەڵك، ئێمە زۆر زۆر تێکەڵاو بەخەڵك بووین، بەخەڵك موتەئەسیر بووین و لەهەمانکاتیشدا کارمان دەکرد بۆ تەئسیردانان لەسەر خەڵکی و بۆ بزووتنەوەکەی.



# ئێستا لەموکریان و مهاباد لەپێش دیموکراتین

*هەر ئەوانە وایکرد کە حزبی دیموکرات قەڵس بێت لەئێوەو دوا بەدوای ئەوەش بکەونە شەڕێکی ناوخۆوە، دواتر وایلێهات جنوبی کوردستانی ئێران بووە نفوزی ئێوە، بە پێچەوانەی مەنتیقەکانی مهابادو نەغەدەموکریان، بە پێچەوانەوە سنەو کامیاران و هەورامان و ئەوانە زیاتر نفوزی ئێوەی تیا گەشەکرد، پرسیاری دووەم پێتوایە ئەوە پەیوەندی بەئاستی رۆشنبیری خەڵکەوە هەیە، ئەو مەنتیقەی جنوب خەڵکێکی رۆشنبیرترن، تەقریبەن لەهەموو دنیاشدا ئەم دابەشکردنە هەیە ئەوە بوو وایکرد یان فاکتەرەکانی چی بوون؟

عەبدوڵلای موهتەدی: جارێ من ناڵێم هیچ جۆرە دابەشبوونێك نەبوو، لەڕاستیدا جۆرێك دابەش بوون هەبوو، بەڵام بەو بێ ئەملاو ئەولاییە نەبوو کە رەنگبێ هەندێ کەس لێی تێبگەن، دووەمیش دەمەوێت بڵێم ئەوە گۆڕاوە، بەتەواوی گۆڕاوە...

*ئێستا؟

عەبدوڵلای موهتەدی: بەڵێ، لەساڵانی رابردوو بەتایبەت دوای جیابوونەوەی ئێمە لەحزبی کۆمۆنیستی ئێران و دەورەی نوێی چالاکی کۆمەڵە نفوزو چالاکی ئێمە لە موکریان و ئەو بەشەی کوردستان کە بێشکەی سەرهەڵدان و گەشەکردنی حزبی دیموکراتەو دەتوانم بڵێم زۆر زۆر بەهێزین، من خۆمان بەچالاکترین و بەهێزترین حزبی کوردی دەزانم لەموکریانیش بە مهابادیشەوە.

*بە بەڵگەوە؟

عەبدوڵلای موهتەدی: بەڵێ.

*ئەمە لەم ساڵانەی دواییدا؟

عەبدوڵلای موهتەدی: بەڵێ لەم ساڵانەی دواییدا.



## مهابادییەکان لەکۆنزەرڤاتیزم دورکەوتنەوە

*چۆن ئەوەتان کرد؟

عەبدوڵڵای موهتەدی: باسمکرد، زۆر هۆکار هەیە کە رەنگبێ هەر خۆی مەبەستێکە یانی بڵێم فەرعێك دەکاتەوە بۆمان لەقسەکردنەکەدا ئەگەر بەو کوڵانەدا برۆین، یەکەم: ئێمە لەڕاستیدا جاران لەمهاباد بێ نفوز نەبووین، لە بۆکان کە هەر زۆر زۆر بەنفوز بووین ئەگەر لەخەڵکی زیاتر نەبوبین کەمتر نەبووین، لەسەقز بەهەمان شێوە، لەبانە وەزعمان خراپ نەبوو، بەلام لەجێیەکی وەکو مهابادو ئەوانە لەوێش تەنانەت بێ نفوز نەبووین، بێ خەڵك نەبووین، بەلام ئەو چەند گۆڕانانە من پێموایە یارمەتی ئێمەیان کرد، یەکەمیان: من وا دەزانم سەرجەمی خەڵکی کوردستان لەبیرکردنەوەیەکی، بەشێوەیەکی رێژەیی قسە دەکەم خۆ ناڵێم موتلەق وابوون و موتلەق گۆڕاون، بەشێوەیەکی رێژەیی و نیسبی قسە دەکەم، پێموایە بەشێوەیەکی نیسبی هەموو خەڵکی کوردستان وە لەوانە خەڵکی مهابادیش لەبیرکردنەوەیەکی سوونەتی ترو تەقلیدی ترو گەر ناوی بنێین کۆنسێرڤاتیڤتر دوورتر کەوتوونەتەوە، پێموایە زۆرتر ئێستا خوازیارو تالیبی شتێکی نوێترن لەچاو جارانی خۆیان.

## مهاباد لە دیموکرات دورکەوتنەوە

*دەتەوێت بڵێیت لەحزبی دیموکرات دوور کەوتوونەتەوە؟

عەبدوڵڵای موهتەدی: بە تەئکید پێموایە وابێ، وایە، بەلام ئەوە تەنها بۆ حزبی دیموکرات نییە، خەیاڵم هەیە بڵێم بیروبۆچوونی خەڵك لەزۆر رووەوە گۆڕاوە، لەزۆر رووەوە ئەمڕۆ مەدەنیترن و کراوەترن.

*حزبی مەدەنیترو نوێخوازو مۆدێرنتریان دەوێت؟

عەبدوڵڵای موهتەدی: پێموایە.



# دیموکرات دە ساڵە تووشی رکود بووەو کۆمەڵە باش پێشکەوتووە

*ئەوەش خۆی لەکۆمەڵەدا دەبینێتەوە؟

عەبدوڵلای موهتەدی: ئێستا وایە، من حزبی تر نابینم، ئێستا وایە، من ناڵێم گارانتییەکە بۆ بیست ساڵی تریش، بەڵام لەکاتو سەردەمی ئێستادا وایە، دووەمین شت ئەوەیە: ئێستا زیاتر لە دە ساڵ دەبێت کە حزبی دیموکرات لەحاڵەتێکی رکودو وەستانو کەم چالاکیدایە، بەپێچەوانە لە پێنج شەش ساڵی رابردوودا ئێمە لەوپەڕی چالاکی خۆماندایین، ئەوەش تەئسیری زۆری هەیە، ئێمە بەو نوێ کردنەوەیەی خۆمانو هاتنە دەرمان لەحزبی کۆمۆنیستی ئێرانو ئەوانە جەماوەرێکی زۆر زیاترمان لەهەموو کوردستان وە لەوانە مەسەلەن بڵێین لەموکریانو لەمهابادو ئەوانە لەگەڵ کەوتووە، بۆچی، چونکە خەڵك پێیانوایە جوابی مەسەلە نەتەوەییەکە دەدەینەوەو هیچ کەمو کوورتییەکمان نییە ئەگەر لەم بارەیەوە لەخەڵکی باشتر نەبین، وێڕای شتەکانی تریش..

# هەڵبژاردن دەریدەخات کۆمەڵە یان دیموکرات یەکەمە لەکوردستان

*ئەوەی تۆ دەیڵێیت، کە گوایا لەچەند ساڵی رابردوودا حزبی دیموکرات لە رکوددا بووە، حزبی دیموکرات پێیوایە ئەوە رەتدەکاتەوە، بەو دەلیلەش هێشتا خۆی بەتاکە حزبی بێ رکەبەرو مونافیس دەزانێت لەکوردستانی ئێران؟

عەبدوڵلای موهتەدی: لەڕاستیدا نە قسەکەی من سابت دەبێت نەهی ئەوان، ئەوە دەمێنێتەوە بۆ کوردستانی سبەی رۆژ کە لە شەرایتێکی ئازادانەو بۆ هەڵبژاردنی ئازادانەی خەڵك ببینیت چۆنە، ئەو هەڵبژاردنە هەر چۆنێك بێ ئێمە نەتیجەکەیمان قبوڵەو پێمانوایە دەبێت حزبی دیموکراتو هەموو لایەنێکی تریش قبوڵی بکەن، کوردستان بە ئینتیخابات دەبێ نیشانی بدات چی دەوێتو کێی دەوێت، ئەوە دەبێ لەئیرادەی ئازادانەی خۆیدا، لەڕۆژنامەکاندا، لەڕێکخستنەکاندا، لەهەڵبژاردنەکاندا، لەڕێکخراوە مەدەنییەکاندا، لەوانەدا بتوانێ خۆی ببینێ، لەوەدا گوتاری زاڵ بەسەر کۆمەڵگادا لەچی نزیکەو چۆنە، لەوانەدا خۆی دەبینێتەوە، ئێستا هەرچی من بیڵێمو هەرچی لەلایەن برادەرانی حزبی دیموکراتەوە باس بکرێت هیچیان ناتوانێت بەدیقەت ئیسپات بکەیت، بەڵام ئێمە هەموو راپۆرتێکمان کە بۆ دێتەوە ئاوایە.

# دیموکرات، دەیەویێت وەک
# حزبی قائید بناسرێت و قبوڵناکرێت

*** پێیموایە یەکێك لەو خاڵانەی قسەو گفتووگۆو دیالۆگەکانی نێوان ئێوەو حزبی دیموکرات لەم چەند مانگەی رابردوودا لەساڵی (2006) هەر وابوو کە حزبی دیموکرات یەکێك لەخاڵەکانی ئەوەبوو کە ئێوە وەکو حزبی قائید بیناسن، بەڵام ئێوە ئەوەتان قبوڵ نەکردو ئەوەشتان بۆ ئەوە دەگەڕاندەوە کە ناکرێ کەس بەحزبی قائید ناوبرێ تاوەکو لەهەڵبژاردنێکی ئازاددا خەڵکی زۆرینەی دەنگەکانی پێ دەدات؟**

عەبدوڵڵای موهتەدی: بەڵێ تەبعەن وایە، هەر ئەو پێنج، شەش مانگە نا، ئەوا سێ، چوار ساڵی رابردوو کە ئێمە زۆرمان هەوڵداوە بۆ پێکهێنانی بەرەی کوردستانی و بۆ نزیکبوونەوەی ئەحزابی کوردی لەیەکتری و لەوانە، ئێمەو حزبی دیموکرات یەکێك لە کۆسپەکانی کە لەگەڵی بەرەو روو بووینەوەو رێگر بووین لە پێکهێنانی ئەو بەرەیە رێك هەر ئەو تەوەقعەو ئەو داخوازییەیە کە ئێمە بە نامەنتیقی دەزانین لەحزبی دیموکراتداو پێمان وایە هیچ پشتیوانییەکی لەدنیای واقیعدا نییە لەکۆمەڵگای کوردیداو پێویستیش ناکات، ئێمە پێچەوانەکەی ناڵێین ئێستا تۆ لەمن دەپرسی، ئێمە ناچین پێچەوانەکەی بکەین بەمەرجێك بۆ خۆمان بڵێین ئیلاو بیلا ئێمە گەورەترین و نفوزمان زۆرترەو خەڵکمان زۆرترە، دەبێ خەڵك ئەوەمان بۆ بەڕەسمی بناسن، ئەوە لێکدانەوەی ئێمەیە، بەڵام بەسەر کەسیشدا فەرزی ناکەین.

# فیدراڵی، بەرەی کوردستانی، ئاڵای کوردستان، تەلەفزیۆن و رادیۆی ئەمانی کۆمەڵە خاوەنیەتی و دیموکرات دوای ئێمە بووە

***لەکەسیشی قبوڵ ناکەن ئەوە بڵێ، لەخۆیەوە خۆی بە حزبی قائید بناسێ؟**

عەبدوڵڵای موهتەدی: کەیفی خۆیەتی بۆخۆی دەیڵێ، بەڵام ئامادە نین بیکات بەمەرجێك و بەسەر ئێمەو خەڵکی تریشدا بیسەپێنێ، هەروەکو ئێمەش ئەوە ناکەین و بەسەر خەڵکیدا نایسەپێنین ئەگەر لێمان بپرسن، چونکە ئێمە بۆ خۆمان حزبێکی واقعین و پێویستمان بەوە هەیە بزانین لەکوێ بەهێزین و لەکوێ بێ هێزین، خاڵە بێ هێزەکانمان کامانەن و چۆنی چارەسەری بکەین، ئێمە هەمیشەو دائیم ئەم پێنج شەش ساڵە لەپەیوەندییەکی زۆر نزیکدابین، راستە سەرکردایەتیمان لەناو ئێران نین، بەڵام زۆر



فەرقی هەیە لەگەڵ دە ساڵو پازدە ساڵی لەوەوپێش، ئێمە ڕۆژانە خەڵك دەبینین، ڕۆژانە پڕ پڕە، ئەنواعو ئەقسامی وان لەهەموو شارو ناوچەکانی کوردستانی ڕۆژهەلاتەوە خەڵك دەبینین، ئێمە چەندین گۆڕانکاری گەورەمانکردووە.

بڕوانە هەر ئەم چەند ساڵە ئەگەر هیچ خزمەتێکمان نەکردبێت، من پێموایە یەکێك لەخزمەتەکانی کۆمەڵە لەدوای بووژاندنەوە ئەوەبوو کە ڕۆشنبیری ڕەسەنی لەگەڵ سیاسەتی پێشکەوتنخوازو سیاسی ڕەسەن ئاشت کردۆتەوە، ئیستیبدادو دیکتاتۆرییەتی دە پازدە ساڵە کە زاڵ بوو بەسەر ئێرانداو بەسەر کوردستانی ئێرانیشداو ڕاونانی حزبەکانو دوورکەوتنەوەی ئەو حزبانە لەژیانی ڕۆژانەی خەڵك وایکرد کە کەلێنێکی گەورە بکەوێتە ناو ڕۆشنبیریو حزبی سیاسییەوەو ڕۆشنبیر بەتەنیا کەوتەوە لەکوردستانی ئێران، دیارە ڕۆشنبیر ئەرکی قورستر بوو، ئەرکی چاکیشی بەجێگەیاندو زۆرێك لەو بۆشاییەی کە حزبە سیاسییەکان بەجێیان هێشتبوو ڕۆشنبیری کورد لەپانزە ساڵی ڕابردوودا پڕی کردۆتەوەو ئەوە بۆخۆی جێی پێزانینە.

یانی چۆن بڵێم وجودی خۆی، هەبوونی خۆی، خەباتی خۆی، پێناسەی خۆی لەدنیای ڕۆشنبیرییدا کردۆتەوە، زۆرجار گەلی کورد لەکوردستانی ئێران، چونکە حزبە سیاسییەکان نەبوون تەمسیلی بکەن، ئەوە بزووتنەوەی ڕۆشنبیری ئەوەی بەعۆدە گرتووە، ئەو خزمەتە، بەلاّم لەپاڵ ئەوەشدا ئەمە وایکرد بزووتنەوەی ڕۆشنبیری لە دە پازدە ساڵی ڕابردوو زۆر ئەهەمیەتی پەیداکردوە لەکۆمەڵگادا، ڕەنگبێ هەموو کەس بەباشی تێی نەگەیشتبێ، بۆیە جۆرێك دوورکەوتنەوە، دوور بوونەوە لەسیاسەت لەنێو ڕۆشنبیراندا هەبوو، جۆرێك دوورەپەرێزی لەسیاسەت هەبوو، تەنانەت بەجۆرێکی وابوو پێیان وابوو کە پێویستییەکەیان هەست پێنەدەکرد، گۆڕانکارییەکانیان یارمەتی ئێمەیان کرد، ئێمەش ئەوەڵ حزب بووین لەکوردستاندا ئەوە وەختە بۆ ماوەی دووسێ ساڵ تەنیا حزب بووین کە ئێمە پشتیوانیمان کرد لەبزووتنەوەی نوێی ڕۆشنبیری لەکوردستانی ئێران، ئەوەڵ حزب بووین کە ئەسڵەن ئەم زاراوە، ئەم دەستەواژەمان بەکاربرد، بزووتنەوەی نوێی ڕۆشنبیری لەکوردستانی ئێران لەکۆنگرەدا پشتیوانیمان کرد، هەر لەسەرمان نووسی، هەر دەستمان بۆ درێژ کردن.

ئێستا پردێکی گەورەمان لەبەینی سیاسەتو ڕۆشنبیری هەڵبەستووە، ئەو دووانە تەواوکەری یەکترن، من ئەوە بەخزمەتێکی کەم نازانم، چونکە وا دەزانم بزووتنەوەی کوردی، کۆمەڵگای مەدەنی، پێشکەوتنی کوردستان پێویستی بە ڕێککەوتنی ئەوانە هەیە، نالێم دەبێ عەینی یەك شت بنو عەینی یەك کاربکەن، بەلاّم ئەوە زۆر موهیمە. یەکێکی تر لەشتەکان ئەوەڵ حزبێك بووین لەکوردستانی ئێران کە باسی فیدرالیمان کردووە، ئەو وەختی خەڵك هەتا زەمیشیان دەکردوو لەوانە حزبی دیموکرات تا دوو سێ ساڵیش ئامادە نەبوو قبوڵی بکات، سەرەنجام قبوڵیانکردووە، ئێمە ئەوەڵ حزب بووین کە لەکوردستانی ئێران باسی بەرەی کوردستانیمان کردووەو لەسەری ڕۆیشتووینو کارمان بۆ کردووە،

هەتا حزبی دیموکرات ئیستیلاحەکەی، ئەم دەستەواژەیەی قبوڵ نەبووەو وردە وردە خەریکە قبوڵی دەکات، هیچ نەبێ مەفهومەکەی قبوڵ دەکات تا بزانین بەکردەوە چی لێدێت، ئەوەڵ حزب بووین کە لە کوردستانی ئێراندا ئالآی کوردستانمان بەرەسمی ناسیوەو خستوومانەتە پێشەوە، لەوەشدا حزبی دیموکرات کەوتۆتە دوای ئێمە، لەفیدراڵی هەر وابووین، یانی تۆ شتەکان هەمووی بێنە پێش چاوی خۆت، من وا دەبینم ئەوەی پێیدەڵێن دەستپێشخەری، بەفارسی پێی دەڵێن (ئیبتکاری عەمەل)، لەپێنج شەش ساڵی رابردوودا، لەدانانی یەکەم تەلەفزیۆنی کوردیو پێشەنگایەتی لەبواری راگەیاندندا، مەفهوومەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی، مەفهوومەکانی دیموکراسی لەم سەردەمەدا، من پێموایە کۆمەڵە زۆر زیاترقسەی پێ بووەو قسەیکردووەو دەخوێنێتەوە لەگەڵ پێویستییەکانی ئەم سەردەمەی ئێستاماندا.

## شتی یەکێتی شۆڕشگێرانم نەخوێندۆتەوە

***بەڵام یەکێتی شۆڕشگێڕانی کوردستان، یان پارتی ئازادی کوردستان( پاك )ی ئێستا مەبەستی 2010 ی، یەزدان پەنا ئەوە رەت دەکاتەوە کە ئێوە یان حزبی دیموکرات پێشتر بەرەی کوردستانیو سەربەخۆیی کوردستانتان راگەیاندبێ، ئەوان گوایە دەڵێن؛ لەراگەیاندنەکانی ئێمە یەکەمجارە ئەم موستەلەحو چەمکانە بڵاوبۆتەوە؟**

عەبدوڵای موهتەدی: بەڕاستی من نەمخوێندووەتەوە، ئەگەر بووبێتیش ئێمە بەبێ ئاگای ئەوان وتوومانە.

## کوردستان ناگەڕێتەوە سەد ساڵ پێش ئێستا

***یانی ئێوە قبووڵ ناکەن ئەوان شتێکی ئاوایان وتبێ، ئاخر دەبێت ساغ بکرێتەوە، چونکە ئەمانە شتی جەوهەریو مێژوویین لەمێژووی شۆڕشگێڕانی خەڵکی کوردستانی ئێران، کێ یەکەم بووە لەمانە، ئەمانە بە چ بەرنامەیەك کراوە، ئایا هەر قسە بووە یان بەفیعلی کاری بۆ کراوە؟**

عەبدوڵای موهتەدی: زۆر لەو بڕوایەدا نیم ئەوان توانیبێتیان، یان ئەگەریش کە من لێم نەدیون نازانم، بەڵام ئەگەر ئەوە راست بێت کە هەندێك لەو شتانە ئەوان پێشتر وتوویانەو باسیان کردووە، لەهەرحاڵدا توانای ئەوەیان نەبووە کە بیکەن بەگووتاری زاڵ لەکوردستانداو بیخەنە بەر رای گشتی جەماوەرو ئەو تەئسیرو کاریگەرییە دابنێن.



***هەر ئەو جموجۆڵ و تازەگەرییەی ئێوە بوو لەبواری فیدراڵی و بەرەی کوردستانی و ئاڵای کوردستان وایکرد حزبی دیموکراتیش خێرا بکەوێتە خۆی و فیدراڵی قبوڵ بکا، ئاڵای کوردستان قبوڵ بکا، بۆبەرەی کوردستانی بێتە پێشەوە، تەلەفزیۆن دانێ؟**

عەبدوڵڵای موهتەدی: من پێموایە ئەوانە پێویستییەکی سەردەم بوون، بەڵام ئێمە زۆرتر هەستمان پێکرد، پێموایە تەلەفزیۆن دانانی ئێمە تەئسیری زۆربووە لەسەر خەڵکی تر کە ئەوە بکەن، بیرم چوو بڵێم یەکەم رادیۆی سەتەلایتیش هەر ئێمە دامانناوە لەکوردستانی ئێران.

***کەواتە ئێوە ملمالنێ کێکراوەکانتان هەر ماوە، ئەمە دیارە بەدیوێکیدا خزمەت بەکۆمەڵگاو وەکو تۆ وتت پێویستییەکەو، بەڵام داغێك هەبووە، دیارە ئەمانە دەچنە خاڵی ملمالنێوە، بەڵام ملمالنێیەکی شەریفانەتر لەشەڕی چەکداری؟**

عەبدوڵڵای موهتەدی: بێگومان، ئەسڵەن من پێموایە کوردستان قازانج دەکات ئەگەر ملمالنێیەکی سیاسی سالم و مەدەنی و ئەوڕۆیی تێدا بێت، موهیم دوو شتە، یەکەم: هەرگیز ئەو ملمالنێیە نەبێتە شەڕی ناوخۆیی و لەچوارچێوەی مەوازینێکی دیموکراتیکی قبوڵکراوی دونیای ئەمڕۆدا بمێنێتەوە. دووەمیش: ئەو ملمالنێیە نەبێتە هۆی پەککخستنی هاوکاری و نزیکایەتی و پێکهێنانی بەرەیەکی کوردستانی، چونکە ئەوەش پێویستییەکە.

من پێموایە سنورێکی چاك یان بڵێین چوارچێوەیەکی چاك دابنرێت کە تێیدا هاوکاری و نزیکایەتی و هەموو ئەو پێکهێنانی بەرەو هەمووی ئەوانەی تێدا رەچاوکرابێت، لەهەمانکاتدا ئازادی چالاکی سیاسی و ئازادی ملمالنێیەکی مەعقول، مەسئولانەو بە دەربەست، ئەوە لەکوردستاندا ناتوانێت رێی لێبگرێت، ئەسڵەن ئەمە خۆی یەکێك لەدیاردەکانی کوردستانە، من و تۆش نەمانەوێت، چوار کەسی دیکە هەر دەیکەن، تاکی کورد ئێستا هەموو شتێك قبوڵ ناکات، قسەی دەوێ، فکری دەوێ، دەبێت رێگەی رەخنە بەخەڵك بدرێ، دەبێت رێگەی دەربڕینی بیروباوەڕ بەخەڵك بدرێ، هەر ئەوە نییە حزبەکان دەبێت ئازادی هەڵسوڕان و چالاکیان هەبێت، تاك دەبێت حەقی رەخنەگرتنی هەبێت، رۆژنامەکان دەبێت هەیانبێ، کوردستان تازە ناتوانێ بگەڕێتەوە دۆخی سەد ساڵ لەمەوپێش.

# کۆنگرەی شەشی کۆمەڵەم قبوڵ نییە و من دیموکرات بەوشێوەیە ناناسم

***دەتگەڕێنمەوە بۆ ساڵی (1988) کۆمەڵە لەبڕیارنامەیەکیدا هاتووە، سەبارەت بەحزبی دیموکرات، واباس دەکات دەڵێ: "حزبی دیموکرات بەدرێژایی چەندین ساڵ نوێنەری سەرەکی جەرەیانی ناسیۆنالیستی لەکوردستانی ئێران بووەو تۆمەتبارکراوە بەناسیۆنالیستو وردە بۆرژوازو خودموختارخوازو بەرگری لەسەرمایە دەکات، دوای چەندین ساڵ هێشتا خۆیان هاتنەسەر ئەو قەناعەتەی وەکو حزبێکی قەومی ناسیۆنالیست بەرگری لەمەسەلەی نەتەوەیی بکەن، ئێستا هەندێ لایەنی بۆرژوا ناو دەبەنو پەیوەندییەکانتان لەگەڵ ئەمریکا چووەتە پێش، ئایا ئەمە لەڕووی مێژووییەوە پەیوەندییەکی هەیە بەوەی زورووف گۆڕاوەو پێویستە ئاڵوگۆڕ بەسەر سیاسەتی حزبدا بێتو ئەوانە تا چەند واقیعیبوون ئەوکاتەی ئێوە ئەوانەتان خستە پاڵ حزبی دیموکرات؟**

**عەبدوڵلای موهتەدی:** ئەگەر لەبیرت مابێ جارێك هەر لەپرۆسەی ئەم موقابەلەیەدا من باسی ئەوەم بۆ کردی، من کۆنگرەی شەشو پەسەندکراوەکانی کۆنگرەی شەشم قبوڵ نییە، لەوێوەیە کۆمەڵە وەکو سازمانی کوردستانی حزبی کۆمۆنیستی ئێران ئیتر جیابووەوە، لەڕابردووی خۆی، لەدیدگاو باوەڕەکانیدا، ئەو شتانەی لەوێ نووسراون لەڕاستیدا ئەو دەقەش دەقی مەنسوری حیکمەتە لەگەڵ سەید برایم نووسیویانە، یان کاك مەنسور نووسیویەتیو سەید برایم تەئیدی کردووە، قبوڵم نەبووە ئەو دەقانە، ئەوانە خۆ ناگەڕێتەوە بۆ ئێستا، دەگەڕێتەوە بۆ کۆن.

زۆرێك لەوانە من پێموابوو چ ئەو شتەی لەسەر حزبی دیموکرات نووسراوە، چ ئەو شتەی لەسەر ستراتیجی کۆمەڵە نووسراوە، کۆمەڵێك بەڵگەنامەکانی کۆنگرەی شەشەمو ئەو وتارەی کە کاك سەید برایم لە تەوزیحی بەڵگەنامەکاندا دەیڵێ، ئەوانە بەبڕوای من لەوێوە کە عونسورێکی تازە، شتێکی تازە جیاواز لەفیکری کۆمەڵە دێتەوە ناوەوەو جێی خۆی دەکاتەوە، لەوێوەیە کە بەبڕوای من کۆمۆنیزمی کاریگەریی جێدەکاتەوە لەکۆمەڵەدا، بەمەعنای لەبیروباوەڕەکانو سیاسەتەکانی کۆمەڵەدا، لەبەر ئەوە بەڕاستی ئەو دەقە بۆ من دەقێکی موعتەبەرو جێی باوەڕ نییە کە ئێستا لەسەری بڵێم، من زووتریش قبوڵم نەبوو، لەکۆنگرەی شەشەوە ئەو دەقانەم قبوڵ نییە.

ئەمە لەلایەك، خۆ ئەوەش ئینکار ناکرێت دونیا گۆڕاوە، ناوچە گۆڕاوە، ئێران گۆڕاوە، کوردستان گۆڕاوە، ئێمەش خۆمان لەگەڵ ئەو گۆڕانانە هێناوەتەوەو لەگەڵ گونجاندوون، بەڵام نەك بەو نرخەی کە هەندێك پرەنسیپی سەرەکی تیادا نادیدە بگرین، بۆ نموونە بڵێین پرەنسیپی نزیکی ئێمە لەگەڵ کرێکارانو زەحمەتکێشانو پشتیوانیمان لەچینی چەوساوەو جەماوەری کوردستان، پشتیوانیمان



لەئازادی سیاسی، لەمەسەلەی مافی چارەنووس، لەمەسەلەی دیموکراسی، لەیەکسانی مافی ژن و پیاو لەجیایی دین و دەوڵەت و کۆمەڵگای سێکیولارو زۆرشتی لەوانە، ئازادی، عەدالەتی کۆمەڵایەتی، دیموکراسی، سیاسی، خەباتی جەماوەری و ئەوانی تر، ئەوانە جێی خۆیان هەیە، بەڵام لەڕاستیدا تۆ ناتوانی بیست و پێنج ساڵ لەوەپێش و تەنانەت پازدە ساڵ لەوەپێشیش، یان ناتوانی عەینی زمان بەکاربێنی،هەتا چەمك و مەفهومەکانت دەبێ، ئەگەر هەشە بەزمانێکی دیکە بێ.

*باشە پێناسەیەکی حزبی دیموکراتم بۆ بکە، یان حزبی دیموکرات چۆن دەناسێنی ئێستا؟

عەبدوڵلای موهتەدی: بۆچی دەبێ من ئەو ئەرکە هەڵبگرم؟

## دیموکرات حزبێکی چالاکە و هەزاران شەهیدی داوە

*وەکو حزبێکی ناسیۆنالیست وردە بۆرژواو یان وەکو حزبێکی واقعی کۆمەڵگای کوردستان دەیناسی ئێستا ؟

عەبدوڵلای موهتەدی: جا حزبە ناسیۆنالیستەکانیش خۆ حزبی واقعین، حزبی دیموکرات بە تەئکید حزبێکی واقیعی کۆمەڵگای کوردستانە، ریشەیەکی لەمێژینەی هەیە لەو سەردەمەوە کە پێکهاتووە، تێکەڵاو و ئاوێتە بووە لەگەڵ ئەزموونی کۆماری مهاباد، کە بۆ هەموو کەس جێگای رێزە، حزبی دیموکرات هەزاران شەهیدی داوە، حزبی دیموکرات حزبێکی چالاکی خەباتی سیاسیی بووە لەکوردستانی ئێران بۆ ساڵەهاو لەسەردەمێکدا تەنها حزبێك بووە، تەنها چوارچێوەیەك بووە بۆ هەموو خەباتکارانی سیاسی.

*ئەی کێشەو ململانێکانی نێوە لەچیدایە؟

عەبدوڵلای موهتەدی: ئاخر ئەوە هی سەردەمێکی دیاریکراو بوو.

## ململانێمان لەگەڵ دیموکرات هەیە

---

***ئێستا نەماوە، هیچ کێشەو ململانێیەکی سیاسیتان بەردەوامە؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** بەڵێ هەیە، کێشەو ململانێی هەیە، من ئەوە بە دیاردەیەکی زۆر سەحیی و سالم دەناسم، بەشتێکی ساغ دەناسم، بەنیشانەیەکی مەدەنی بوون و دیموکراتیک بوونی کۆمەڵگای خۆمانی دەناسم، کە حزبە سیاسییەکان بتوانن بین و بەرنامەی جیاوازیشیان هەبێ و ململانێش بکەن لەگەڵ یەکتری.

***وەکو ململانێکانی پێشووتان کەکۆمەڵە بە پێی بەیاننامەیەکی کۆن دەڵێ: حزبی دیموکرات لە (25ی خەزەڵوەری 1363) پەلاماری چەکدارانەی بەرنامە داڕێژراوی بۆ سەر واحیدی پێشمەرگەکانی کۆمەڵە دەستپێکرد؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** ئەوەی هەورامان.

## من هەمیشە دژی شەڕی کۆمەڵە و دیموکرات بووم

**دیموکرات شەڕی کۆمەڵەی دەستپێکردو دەیەوێت هەموو کەس عەبدی ئەوان بێت**

**دیموکرات لەپلینۆمی خۆیدا بڕیاریدابوو شەڕی سەرتاسەری کۆمەڵە بکات**

---

***بەڵێ، یەکەم دەپرسم ئایا وایە حزبی دیموکرات دەیویست پاوانخوازی بکات وەکو حزبی خاوەن نفوز تاوەکو کۆمەڵە لەناوببات، یان ئەویش هەمان دیعایەی دەکرد کە کۆمەڵە دەستی بەشەڕ کردووە؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** ئا ئێمە شەڕمان دەست پێنەکردووە، ئەوە شتێکە ڕەنگبێ خۆش نەبێ کولاندنەوەی ئەو برینانەو هەڵدانەوەی مێژووی ئەو وەختی خۆش نەبێ، ئێستا زۆر حەز ناکەم باسی بکەم و ئەو کارە بکەم، بەڵام بەهەرحاڵ بۆ ئەوەی ڕاستیەکان نەشێوێ، لەڕاستیدا حزبی دیموکرات دەستپێکەری شەڕە لەگەڵ کۆمەڵە، یەکەم بەوەی ئەوان هێرشیان کردبوو بەشێوەیەکی زۆر خراپیش، زۆر کەسیان لەئێمە کوشت وابزانم (13) کەس بوون ئەگەر لەبیرم مابێت، بێجگە لەوە ئەمە یەکەمجار نەبوو لەوانەیە بڵێم دەیەمین جاریش زیاتر بوو لەسەر تاسەری کوردستان، مەگەر بەدەگمەن ئێمە شتێکمان خولقاندبێ و خەتای ئێمە بووبێت، بووە شتی ئاوا ناڵێم نەبووە، بەڵام ئەوانە زۆر کەم بوون، ژمارەی ئەوانە زۆرکەم بوون کە خەتای هەڵگیرسانی ئەو تێک هەڵچوونانە لەم یان ئەو ناوچەی

کوردستان لە ئەستۆی ئێمە بوویێت، بەڵام لەزۆربەی هەرە زۆریاندا بەدەستی حزبی دیموکرات بووە، بەهانەی پێکرتووین، شەڕی لەگەڵ کردووین، لەپشتەوە تەقەی لێکردووین، هاتۆتە سەرمان.

تۆ بۆ بەردە سووری سەردەشت دەڵێی چی، هەر تۆزێك پێش ئەوە بوو. لە بەردە سووری سەردەشت لەنێو مزگەوت چەك و رەختیان داناوە، گۆرەویان داناوە شتوویانە، پاڵیان داوەتەوە، پێشمەرگەی حزبی دیموکرات چوون لەبەر دەرکی مزگەوتەوە تەقەیان لێکردوون و لەناو مزگەوت کوشتوویانن و لەنێو خۆیان لەبیرەوەری بەعزێکیاندا ئەو راستیەیان باسکردووە، کەچی ئەو وەختی دەیانووت وەڵلاوبیلا ئێمە نەبووین، قابیلە خۆ کوشتەکە دیاربوو کێ کوژراوەو کێ لەبەر دەرگا بووەو کێ بەچەکەوە چووەو کێ بێ چەك بووە، یانی ئەمە یەك نەبوو، دە نەبوو، بیست نەبوو، حزبی دیموکرات زۆر پێی وابوو دەبێ بەچەك ئێمە لەناو ببات، پێشتریش ئەوەم باسکرد کە حزبی دیموکرات تێگەیشتنێکی واقیعیانەی نەبووە، واقیعبینانەی نەبوو لەسەر ئەوەی بۆچی ئێمە هەین، زەمینەمان چییەو چۆن دەبێ هەڵسوکەوتمان لەگەڵ بکەن، رێیەکی دروستی نەدیەوە بۆئەوە، دەنا هەمیشە بۆ دانووستاندن و گفتوگۆ حازر بووین لەگەڵ حزبی دیموکرات.

بێجگە لەوە ئەوان لەبیرم نییە لەپلۆنیۆمی چەندەمیان بوو، بەڵام لەپلۆنیۆمێکیاندا، ماوەی دوو مانگ پێش ئەوە، بەئاشکرا بڕیاریانداوە، بڕیاری پلۆنیۆم ئەوەیە کە شەڕی سەرتاسەری بکەن لەگەڵ کۆمەڵە، ئەو بڕیارەیانداوە، دەڵێن هەر تێکهەڵچوونێك ببێ لەوە بەولاوە ئێمە دەیکەین بەشەڕی سەرتاسەری لەگەڵ کۆمەڵە، بەداخەوە ئەم فیکرە پاوانخوازەی حزبی دیموکرات و ئەوەی حزبی دیموکرات بەپێچەوانەی شیعارەکانی ئامادە نەبوو پلۆرالیزم لەکوردستان قبوڵ بکات، ئامادە نەبوو فرە چەشنی قبوڵ بکات، ئامادە نەبوو غەیری خۆی قبوڵ بکات.

پێیوابوو یان دەبێ هەموو کەس عەبدو نۆکەر بن، یان دەنا نابێ بن، ئەمە ئەم بیرۆکەیە، ئەم شێوە بیرکردنەوەیە رەنگبێ چل پەنجا ساڵ لەوەوپێش بگوونجابایە، شەڕی لێنەکەوتبایەتەوە، بەڵام پێشکەوتنی خودی کۆمەڵگای کوردستان، پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی، سیاسی فەرهەنگی و سەرهەڵدانی حزبی تری وەکو کۆمەڵە و لایەنەکانی تر وای کردبوو تازە ئەم بردنە پێش و بەئەنجام گەیاندنی ئەم بیرە بەبێ چەپاندنی شەڕ مومکین نەبوو، هەربۆیەش شەڕی لێکەوتەوە، ئێستاش وایە ، ئێستاش نە حزبی دیموکرات، ئێمەش بیڵێین، هەر لایەنێکی تر بیەوێ خەڵکەکەی تر حەزف بکات نادیدەیان گرێ و بیەوێ پاوانخوازی دابسەپێنێ غەیری شەڕی ناوخۆی لێ ناکەوێتەوە، بۆیە دەرمانی ئەو دەردە ئەوە نییە بەهەردووکیان بڵێی بەقوربانتان دەبمو هیچ کەس هیچ نەکات، ئەوەیە تۆ ئەسڵی فرە چەشنی قبوڵ بکەیت و بیکەیت بەفەرهەنگی زاڵ، ئەسڵی قبوڵی غەیرە، غەیری خۆت، حزبی تر، فکری تر، ئەوە لەکۆمەڵگای کوردستاندا بچەسپێت، ئەمانە قبوڵ بکرێ ببێتە فەرهەنگی خەڵکی، ببێتە شێوەی بیرکردنەوەی خەڵکی، لەم حاڵەدایە بەبڕوای من هیچ کەس ناتوانێ شەڕی ناوخۆیی



بەسەر لایەنێکی تردا بسەپێنن، من زۆرم پێ ناخۆشە ئەو شەڕە ناوخۆییە روویدا وە هیچ وەختێش لەناو کۆمەڵەدا لایەنگری ئەوە نەبووم کە ئەوە ببێ.

## ئامانجی دیموکرات پاکردنەوەی ئێمە بوو لەکوردستاندا

***بەلام دیموکرات ئیتر تێگەیشت کە ناتوانێت کۆمەڵە لەناوببات و وردە وردە وازی هێنا؟**

**عەبدوڵلای موهتەدی:** بەڵێ، ئەوە زۆر دروستە ئەو قسەیەی تۆ بۆچی، چونکە بیر بکەرەوە هەدەفی دیموکرات پاککردنەوەی ئێمە لەکوردستان بوو، بەلام خۆ هەدەفی ئێمە پاککردنەوەی دیموکرات نەبوو، هەدەفی ئێمە ئەوەبوو کە نەهێڵین کە ئەم ویستەی حزبی دیموکرات بەدی بێت، دیموکراسی لەکوردستاندا بپارێزین، ئازادی فەعالیەتی سیاسی بپارێزین، هەر ئەو کارەشمان کرد. شەڕەکە زەرەربوو، شەڕەکە کوشتەی لەهەردوولا دا، کە جێگای داخە، من ناڵێم هەر بۆ کۆمەڵە، بۆ هەموو ئەوانەی حزبی دیموکراتیش جێی داخە جێی نارەحەتییە، نابێ نەهێڵین دووپات بێتەوە، بەلام ئەگەر لەمێژوو دەپرسی بەڕاستی مێژووەکە لەڕابردوودا ئاواهی بوو.

## دیموکرات نەیهێشت بەرەیەکی کوردی پێکبێت

***زیانەکانی چی بوون؟**

**عەبدوڵلای موهتەدی:** زۆری زیان لێکەوتەوە، زۆر، تەنها یەکیان بوو بەشەڕێکی سەرتاسەری فراوان، دەنا زۆر تێکهەڵچوون بوو کە هەمووی زەرەربوو، خۆ یەک و دووان نەبوو، ئەوەڵین زەرەری ئەوە بوو ئەم سیاسەت و بۆچوونەی حزبی دیموکرات هەرگیز نەیهێشت جەبهەیەکی کوردیی راستەقینە لەکوردستانی ئێران پێکبێ، هەماهەنگییەکی پێویست پێکبێت، نەتیجەکەی ئەوەبوو کە جمهوری ئیسلامی زۆر زووتر لەوەو زۆر ئاسانتر توانی کوردستان بگرێتەوە، ئەگەر ئێمە یەکبواین و لەهەمکاری نزیکدابواین، هی سیاسی و نیزامی، بەبروای من دەمانتوانی بەرگرییەکی چاکتر لەکوردستان بکەین، لەبەر ئەوە دوژمنانی کورد قازانجیان کرد.

دووەم: شەڕە ناوخۆییەکان خەڵکی کوردی پێ دڵ سارد بووەوە، تەئسیری لەسەر بزووتنەوەو لەسەر کزکردن و دامرکاندنی بزووتنەوەی کوردی دانا، ئەوەش زەرەرێکی زۆر گەورەیە.

سێهەم: لەهەردوولا کادری چاک و ئینسانی چاک و تێکۆشەر گیانیان لەدەست دا کە ئەوانە هەق نەبوو لەو شەڕەدا گیانیان لەدەست بدایە، ئەوانە دەبوو لەخەبات لەدژی جمهوری ئیسلامی و دژی دوژمنانی



ئازادیو دوژمنانی خەڵکی کوردستاندا، لەو مەیدانەدا بتوانن دەوری خۆیان هەبێت، دوژمنایەتییەکی خستە نێومان، ئاکۆکییەکی زۆری خستە نێومان، خۆشبەختانە لەم ساڵانەی ئاخری ئەمانە بەتەواوی کۆتایی هاتووە، لەمێژ ساڵە کە ئەو رووحیەو ئەو فیکرە، یانی فیکری شەڕی ناوخۆیی من پێم وانییە مابێتەوەو پێم وانییە لەداهاتوودا جێگەیەکی بێ، بەڵام من مەرجەکەی بەوە دەزانم ...

# شەڕی ناوخۆ یەکێکە لە ئەگەرەکان

---

*ئەگەری دووبارەبوونەوەی سبەینێ بە گەیشتنی دەسەڵاتی ئێوە، یان ئەو ئاڵوگۆڕانەی کە لەداهاتوودا روو دەدەن پێتوانییە شەڕی ناوخۆ دیسان یەکێك بێ لە ئەگەرەکان؟

عەبدوڵڵای موهتەدی: ئەگەرێکی زۆر بەهێز نییە، بەڵام بەڵێ یەکێك لەئەگەرەکانە.

*چۆن دەتوانن رێی پێبگرن؟

عەبدوڵڵای موهتەدی: من پێموایە، چەند رێگا هەیە رێی پێبگرن، گەورەترین گارانتیو زەمانەت بۆ دووپاتنەبوونەوەی شەڕی ناوخۆو یان ئەگەر دنیا بوو تەقەیەك، تێکهەڵچوونێك کرا، بۆ تەشەنە نەسەندنو پەرەنەسەندنی شەڕی ناوخۆ لەگۆڕانی فەرهەنگی خەڵکی کوردستاندا دەبینمەوە، یانی لەوەدا دەبینم خەڵك، فەزای سیاسی خەڵك، فەرهەنگی خەڵك، گووتاری زاڵ بەسەر خەڵکدا نەهێڵێ هیچ کەسو لایەنێك خۆی دابسەپێنێ، ئەسڵی فرە چەشنی، ئەسڵی ئازادی بیروباوەڕ، ئەسڵی چالاکی سیاسی، ئەسڵی رەخنەگرتن ئەوانە زاڵ بن، یانی ببن بە بەشێك لەفەرهەنگ کە ئیتر هیچ کەس نەتوانێ لێیان لابدات، زۆر عەیب بێ، ئەوە زۆر کاری ئەکراو بێت.

دووەم: ئەوەیە دەگەڕێتەوە سەر خۆمان، سەر ئەم دوو حزبە ئەویش ئەوەیە ...، دیارە رامانگەیاندووە، بەڵام لەبەڵگەنامەی هاوبەشدا بەبڕوای من ئەم فرە چەشنییە، ئەم ئازادی سیاسییە، ئەم ئیلتیزام بەوەی کە هەرگیز بۆ چارەسەرکردنی کێشەی نێوان خۆمان دەست بۆ چەك نابەین ئەوە ئیمزاکەین لەنێوان خۆماندا.

سێیەم ئەوەیە: بەرەیەکی کوردستانی پێکبێ نەك هەر بەو دوو حزبە، بەڵکو بەهەموو حزبو لایەنەکانی ترو بەشەخسیاتی سیاسیو رۆشنبیری تێکۆشەرانی دێرینی کوردستانی ئێرانەوە کە فەزای هاوکاریو دۆستایەتی بەوجود بێنێو لەئێستاوە ئەم بەرەیە فکر بکاتەوە بۆ ئەوە مەزاینێك، زەوابتێك دانێ بۆ سبەی رۆژی کوردستان، مەسەلەن بڵێ سبەی رۆژ ئینتیخابات چۆن دەبێ، ئیدارەکردن چۆن دەبێ، گومرگ چۆن دەبێ، رادیۆو تەلەفزیۆنەکان چی لێ دێ، پادەگانەکان چی لێ



دێت، ئیدارەی خەڵك چۆن دەبێت، چی لەجاش و هەمکارانی ئێستای رژێم دەکەین، چونکە ئەوانەیە شەڕی لێدەکەوێتەوە، هەرکەسە جۆرێك رەفتار دەکات.

## جاشەکان دەبێ دادگایی بکرێن

*لێرەدا پرسیارێکی گرنگت وروژاند، چی لەو جاشانە دەکەن کە تا ئێستا لەبەرەی دوژمندان؟

عەبدوڵای موهتەدی: من پێموایە یەکەم کارێك کە دەبێ بیکەین ئەوەیە ئەوانە تەسلیمی دادگایەکی عادیلانە بکەین، ئەوەی تاوانی کردووە بە بەڵگەو بەدەلیل و بەشێوەی دادگایەکی ئەوڕۆیی دادگایی بکرێت.

*وەك یەکێتی و پارتی دوایی ئێوە هەندێکیان ناگرنە خۆتان و دیموکرات و سازمانی- حزبی کۆمۆنیستی ئێران- کۆمەڵە هەندێکی تریان بگرنە خۆیان و وەکو ئەوانەی بەشدارییان لە ئەنفالدا کرد زیاتر لە پێنج سەد، موستەشارو جاش و هەبوو لەکوردستاندا، ئێستا نەك دادگایی نەکراون لەسەر ئەنفالکردنی خەڵك، بەڵکو زۆر لە پۆستە سیاسییەکانی هەردوو حزبە سیاسییەکەدا بەشدارن؟

عەبدوڵای موهتەدی: ئاخر بۆ ئەوانەیە دەڵێم دەبێ لەئێستاوە تەوافقێك، پێکهاتنێك هەبێت لەنێو حزبە کوردییەکاندا، لەئێستاوە بڵێین چی لەجاشەکان دەکەین، لەئێستاوە بڵێین چی لە ئیداراتی دەوڵەتی دەکەین، چی لەبانکەکان دەکەین، چۆن کوردستان بەشێوەیەکی کاتی ئیدارە دەکەین تا هەڵبژاردن، هەڵبژاردن لەسەر چ ئەساسێك دەکەین، من بە تەئکید پێموایە ساغبوونەوەمان و رێککەوتنمان لەسەر ئەوانە زۆر زۆر رێگرێکی گەورەیە لەپێناو هەر جۆرە توندووتیژییەك و گرژییەکی داهاتوو لەنێوانماندا.

## کۆمەڵە، جاشەکان وەرناگری لەداهاتوودا

*تۆ بۆ خۆت ئەگەر سبەینێ ئەو دۆکیۆمێنت و بەڵگانەی ئێستا لەسەری رێکدەکەون، سبەینێ حزبی دیموکرات هەڵیوەشاندنەوە، یان هەر یەکێ لەلایەنە سیاسییەکان هەڵیان وەشاندەوە، تۆ بۆ خۆت جاشەکان وەردەگریت بێنە ناو کۆمەڵەی شۆڕشگێڕانەوە؟

عەبدوڵای موهتەدی: نا، ئەوەی بەڕاستی جاشی تاوانبار بێت، نەخێر نابێ ئەو کارە بکەین.

***جاش هەر جاشە، جا تاوانبار بێت یان بێ تاوان، خزمەتی دوژمنی کردووەو دژی خەڵکی کوردستان بووە؟**

عەبدوڵای موهتەدی: نابێ، قەتعەن نابێ بێنە ناو ریزی کۆمەڵە، ئەوە هەر نییە شتی وا، بەڵام مەبەستم لەوەیە بەعزێك لەوانە رەنگبێ موجریم بن، تاوانباری گەورەبن، ئاخر تاوانیش کەمو زۆری هەیە، تۆ دەتوانی مەسەلەن پرتەقاڵێك بدزیو دەتوانی بانکێك بدزی، دەتوانی زللەیەك لەکەسێك بدەیو دەتوانی کەسێك بکوژیت، بەگوێرەی تاوانی خۆیان سزا بدرێن، رەنگبێ هەندێك لەوانەش کۆمەڵگا لێیان خۆش بێ، کارەکان لەوە بچووکتر بووبێت، بەشتێکی کەم لێیان خۆش بێ، بەڵام هاتنیان بۆ ناو ریزی کۆمەڵە شتێکی دوورە.

# جاشەکان کەمن و دیموکرات خراپ دەکات وەریانگرێت

***بەڵام دیموکرات، یان لایەنی تر وەریان دەگرێتو نفوزی ئێوە کەم دەکات؟**

عەبدوڵای موهتەدی: خراپ دەکات.

***خۆشت دەزانی خەڵکێکی زۆر جاشەو پیاوی رژێمن؟**

عەبدوڵای موهتەدی: خۆشبەختانە لەئێران زۆر نین، وەك کوردستانی عیراقو تورکیا نییە، ئێران جاشی زۆر کەمە، هەروابوو لەو پانزە بیست ساڵە، ئێستا کەمتریشە.

***هێشتا لەکوردستانی عیراق جاشو ئەنفال چییەکان لافو گزاف لێدەدەن بەسەر خێزانی شەهیدانەوە کە خەڵك زۆر نیگەرانە؟**

عەبدوڵای موهتەدی: منیش نیگەرانمو زۆر دڵم بەم دیاردەیە ژان دەکات، زۆرم پێ دیاردەیەکی ناحەزە، ناحەقە، خەڵك دڵسارد دەکاتەوە لەشۆڕش، خەڵك دڵسارد دەکاتەوە لەو هەموو خەباتو قوربانییەی کە دراوە، من ئەوە بە سوکایەتییەك بەخانەوادەی شەهیدو بەخانەوادەی هەموو ئەو تێکۆشەرانە دەزانم کە رۆژێکی وەك ئەمڕۆیان بەدی هێناوە، منیش پێم ناخۆشە، بەڵام من قسەکەم ئەوەیە دەڵێم بۆ ئەوەی دووپات نەبێتەوە ئەم دیاردەیە لەکوردستانی ئێران با لەئێستاوە هەنگاوی بۆ هەڵگرین، با دادگایەکی تایبەت دانێین نەك تەنیا لەم دوو حزبە، لەلایەنێك کە بەڕاستی پسپۆڕانی ئەوکارە بن، سیاسەتەکەیان سیاسەتێکی هاوبەش بێت، پێیان بڵێن هیچ کەس هیچ جاشێك وەرنەگرێت، هیچ پیاو خراپێك وەرنەگرێت، ئەو مەحکەمە تایبەتییە رەسیدەگی بەکاریان دەکات،



دەتوانین شتی وابکەین بۆ ناتوانین، دەتوانین کۆمەڵگای کوردستان بەشێوەیەکی چاکتر ئیدارە بکەین، مەجبوور نین، من قسەکەم ئەوەیە وەختێك من باسی رەوابوونی ململانێم کرد مەبەستم ململانێی سیاسییە نە لەڕاوو رووتدا نە لەدزیدا، نە لە قواستنەوەی جاشەکاندا، ئاخر ئەو ململانێیە ئەسڵەن کۆمەڵە نابێ هەر بەشداری تێدا بکات، هیوادارم هیچ کەسی تریش نەیکات، بەڵام ئەگەر خەڵکی تریش کردی بڵێین تۆ لەئێستاوە دۆڕاوی.

***هیچ شتێکی واتانکردووە لەگەڵ دیموکراتو لایەنە سیاسییەکانی تردا؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** هەوڵمان زۆر داوە، تا ئێستا نەخێر مەسەلەی بەرەی کوردستانی هەروا ماوەتەوە.

***ئەوەش یەکێکە لەخۆدزینەوە لەو مەسەلەیە؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** پێموایە.

***چارەسەری چییە؟ دەمەوێت بڵێم کە لەئێستادا ئەگەیشتبنە رێککەوتنێك بەتەئکید لەسبەینێی دەسەلاتدا زەحمەتە؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** بەڵێ منیش پێموایە، زۆر بەزەحمەتی دەزانم، زەحمەتتر دەبێتەوە، دیارە غەیرە مومکینی نابینم سبەی رۆژیش هەر مومکین نییە بیکەین، بەڵام ئەورۆ بیکەین جێی خۆیەتی، ئەورۆ کەس تەماعی هیچ دەستکەوتێکی تایبەتی نییە، ئەورۆ کەس ناوچەیەکی بەدەست نییە، ئەوی تر مەسەلەن شتێکی تری بەدەست بێت، ئەورۆ فەزاکەی فەزایەکی ئارامو دیالۆگە لەنێوان ئێمەو حزبی دیموکراتدا، من ئەم سەردەمە بەسەردەمێکی زۆر بە گونجاوتر دەزانم بۆ پێکهاتن لەسەر هەموو ئەوانە.

# کۆمەڵە یارمەتی دیموکرات-ڕێبەرایەتی شۆڕشگێڕی داوە

*** پاش جیابوونەوەی (حزبی دیموکراتی کوردستان- ڕێبەرایەتی شۆڕشگێڕ) لەدەیەی هەشتاکاندا شەڕ لەنێوان کۆمەڵەو ڕێبەرایەتی شۆڕشگێڕ بەڕەسمی رادەگیرێتو وەکو ئەو کاتە دەوترێت، حزبی دیموکرات دەڵێ: کۆمەڵە دەستی لە پشت ئەم ئینشقاقەی ڕێبەرایەتی شۆڕشگێڕەوە هەبووەو چەكو یارمەتیو تفاقی جەنگی داونەتێ تا دژایەتی حزبی دیموکراتی پێبکەنو نفوزی دیموکراتی پێ کەم کەن، سەرەتا لێت دەپرسم هۆکارو فاکتەرەکانی جیابوونەوەی ڕێبەرایەتی شۆڕشگێڕ چی بوو ئایا کۆمەڵە دەستی تێدابوو؟**

عەبدوڵای موهتەدی: نەخێر کۆمەڵە هیچ دەستێکی لەجیابوونەوەیاندا نەبوو، نەشیدەتوانی ببێ، ئەو کەسانەی جیابوونەوە هەمووی بەتەمەن لەئێمە بەعومرتر بوون، پێشینەی خەباتی سیاسییان لەئێمە زۆرتر بوو، زۆرێکیان ساڵەها لەسەرکردایەتی حزبی دیموکراتدابوون، خاوەنی بیروباوەڕی خۆیان بوون، کێشەی حزبی دیموکرات یانی جیابوونەوەی ڕێبەرایەتی شۆڕشگێڕ لەبەدەنەی حزبی دیموکراتو لەسەرکردایەتییە رەسمییەکەی دەگەڕێتەوە بۆ هۆکاری ناوخۆی خۆیان، دەگەڕێتەوە بۆ ئەو کێشانەی کە بەتوڵی زەمان حزبی دیموکرات لەنێو خۆیدا بوویەتیو ئەوە مەسەلەیەکی خۆیانەو هیچ ناگەڕێتەوە سەر ئێمە، بەڵام کە ئەوان جیابوونەوەو ڕێبەرایەتی شۆڕشگێڕییان ڕاگەیاندو پەیوەندییان بەئێمەوە گرت، ئێمە بەعزێك یارمەتی ئینسانیمان داونێ ئەوانە ئەو وەختی دەستیان زۆر کەم دەڕۆیو بۆیە ئێمە کۆمەڵێك یارمەتیمان کردوونو دەست گرۆییمان کردوونو ئەوەشمان نەشاردۆتەوە، ئەوانەمان کردووە، بێجگە لەوە ئەوان ڕووی دۆستایەتیان لەئێمەکرد لایەنێکی تر ئەو وەختی لەحاڵەتێکی توندیو ناخۆشیدا بوون، تەبیعییە گەر کەسێك دۆستایەتیت بکات تۆش زۆرتر دۆستایەتی دەکەیت، ئەوە شتێکی ئاساییە، بەڵام نە بەگژ حزبی دیموکراتماندا کردن، نە شەڕمان پێکردوون، نە ئەوان لەو کەسانە بوون بەقسەی ئێمە بێنو کارێکی ئاوا بکەن، ئەوە هۆکارەکانی هەمووی دەگەڕێتەوە بۆ ناوخۆیان.

***یانی قەت ڕۆژێك لەڕۆژان هاوکاریتان نەکردوون دژی حزبی دیموکرات، هەر هاوکارییەکی ئێوە چۆتە قاڵبی دژایەتیکردنی حزبی دیموکراتەوە؟**

عەبدوڵای موهتەدی: جا ئەوە خەتای ئێمە نییە، خەتای کێشەی ناوخۆیانە، مەسەلەن تۆ برایەکت هەبێتو تۆ ئامادە بیت بەهەموو جۆرێك دژایەتیم بکەیتو برایەکت هەبێت مەرحەبابیم بکات، منیش سڵاوی لێدەکەم بۆ نا، بەڵام من هانی براکەتم نەداوە دوژمنایەتی تۆ بکات، من داوام لێنەکردووەو



سەرچاوەو هۆکاری دوژمنایەتییەکەش من نەبووم، ئێوە خۆتان کێشەی ناوخۆییتان هەبووە، ئەوانیش ئاوابوون کێشەکەیان ناوخۆیی بوو، هۆکاری ناوخۆیی هەبووە.

*بەڵام ئێوەش پێخۆشحاڵ بوون کەیەکێك لەهێزە رکەبەرەکانتان کە لەشەڕەدا بووە لەگەڵتاندا، بەشێکی زۆری لەکادیرە ئەساسییەکانی جێی دێڵن و جیادەبنەوە؟

عەبدوڵڵای موهتەدی: ئەوەی باری دەروونی ئێمە چۆن بووە: هیچ کاریگەرییەکی لەسەر ناکۆکی ئەوان نەبووە.

# شەرەفکەندی کراوەتر بوو، بۆ کۆمەڵەش باشتربوو

*جیابوونەوەی رێبەرایەتی شۆڕشگێڕ مەوقعیەتی کۆمەڵەی بەهێزکرد؟

عەبدوڵڵای موهتەدی: ئاسان نییە وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارە، چونکە لەوانەیە کە ئەگەر رێبەرایەتی شۆڕشگێڕ یان هەر حەرەکەتێك من نالێم رێبەرایەتی شۆڕشگێڕ، لەوانەیە ئەگەر حەرەکەتێك بیتوانیبایە نوێگەرییەك لەناو حزبی دیموکراتدا بکات، ئاڵوگۆڕێکی چاك بەوجود بێنێ، دەیتوانی لەقازانجیشیان تەواو بێت، بۆ نموونە ئەو وەختی دکتۆر سادقی شەرەفکەندی کە دوای مەرگی قاسملۆ بوو بەسکرتێری حزبی دیموکراتی کوردستان، ئەو بۆ خۆی کەسێکی نوێخواز بوو، زۆریش نەیار بوو، یانی زۆر توونند بوو، توندوتیژ بوو لەگەڵ ئەوانەی بەناوی رێبەرایەتی شۆڕشگێڕەوە جیابووبوونەوە، ئەوە واقعیەتێکە، بەڵام ئێمە هەستمان پێکرد کە ئەو فیکری ئازادترە، فیکرێکی کراوەتری هەیە، ئامادەیی بۆ هاوکاری زۆرترە، لەبەر ئەوە مەبەستم ئەوەیە لەناو ئەو بەشەی حزبی دیموکرات، بەشەکەی تری حزبی دیموکراتیش رەنگبێ ئەگەر دکتۆر سادقی شەرەفکەندی بمایە ئاڵوگۆڕێکی باش لەنێوانی کۆمەڵەو حزبی دیموکراتدا ببوایە.

*ئەسادقی دمکرد کۆمەڵەو رێبەرایەتی شۆڕشگێڕ بەیەکەوە جەبهەیەکیان کردبێتەوە لەشەڕی ناوخۆدا لەدژایەتی حزبی دیموکرات؟

عەبدوڵڵای موهتەدی: نەخێر، قەت شتی وانەبووە.



***ئێوە قبووڵتان نەکرد یان ئەوان داوایان نەکرد؟**

عەبدوڵلای موهتەدی: نەخێر نە ئەوان داوایانکردووەو نە قەت ئێمە قبوڵمان دەکرد، بێجگە لەوە وەختێك ڕێبەرایەتی پێکهات، ئێمە خۆمان کۆتاییەکانی شەڕی ناوخۆ بوو، ئێمە ئاگربەستی یەکلایەنەمان ڕاگەیاندووە لەگەڵ حزبی دیموکرات.

***بەڵام شەڕی ڕێبەرایەتی شۆڕشگێڕو حزبی دیموکرات هەر بەردەوام بوو؟**

عەبدوڵلای موهتەدی: شەڕەکەی ئەوان چەند تێکهەڵچوونێك بوو، بەداخەوە نەدەبوایە ئەوەش ببێ، بەڵام شەڕێکی تولانی و بەردەوام نەبوو، چەند تێکهەڵچوونێك بوو.

## قاسملۆیان قبوڵ نەبوو

***بۆچی جیابوونەوەو بۆچی دوایش یەکیان گرتەوە بەقەناعەتی تۆ؟**

عەبدوڵلای موهتەدی: ئەوە بۆ خۆیان باشتر دەزانن و دەبێ ئەوان تەوزیحی بدەن بۆچی جیابوونەوە، ئەوان کێشەکانیان ناڵێم لەکۆنگرەی هەشتەوە دەستپێکرا، بەڵام لەکۆنگرەی هەشتدا تەقییەوە، ئەوان لەسەر شێوەی ڕەهبەری قاسملۆ قسەیان بوو وهاتنە دەرەوە، دوای ئەو کۆنگرەیە بڕیاریاندا کە بێنە دەرەوە. لەڕاستیدا لەدوو سێ کۆنگرە لەپێش ئەوەوە حزبی دیموکرات هەر خەڵکی لێ جیادەبووەوە، خەڵك زۆر دادەنیشت، خەڵك زۆر جیادەبووەوە، ئەم حاڵەتە زۆر بوو لەحزبی دیموکراتدا، بەڵام دیارە ئەمەیان لەهەموویان بەرچاوتر بوو ئەگینا دوای کۆنگرەی شەش زۆر کەس جیابووەوە.

***ئێستاش قسە لەسەر ئەوە دەکرێت کە زۆرجار دیموکراتیەکان پێیان دەڵێن جەماعەتی لادەر یان ڕێبەرایەتییەکان و بە ئیزافەی چەند کادری تر دیسان دەیانەوێت جیابوونەوەیەکی تر ڕوویداتو پێموایە لەئەخیر کۆنفرانسدا، کۆنفرانسی حزبی دیموکراتدا گەیشت بەو قەناعەتەی کە جیابوونەوەیەکی تر ڕوویدات، بەڵام بەهۆی هەندێ هێزی ترەوە وابزانم ئەوە کپ کرایەوە ئەو ئینشیعاب و جیابوونەوەیە ڕووینەدا ئەم پرسیارە پێشینە بوو، بەڵام دواتر دەرکەوت ساڵی (2007) حزبی دیموکراتی کوردستان جیابوونەوە؟**

عەبدوڵلای موهتەدی: ئێمەش هەر ئەوەندەمان بیستووە، بەڵێ: ئێمەش بیستوومانە کەناکۆکی هەیە لەناویاندا، نازانم ئایا حەتمەن دەگاتە جیابوونەوە یان پێکدێنەوە یان چی لێ بەسەر دێ، بەڕاستی پێشبینییەکەی ئاسان نییە.



# (ی.ن.ک) نەیتوانی دیموکرات مەحکوم بکات بەشەڕی ناوخۆ دژی کۆمەڵە

***لەشەڕی نێوان ئێوەو حزبی دیموکراتدا پێموایە هەر لەشەڕەکانی هەورامانەوە یەکێتی نیشتمانی رۆڵی بینی، شەوکەتی حاجی موشیرو چەند کەسی تر هاتن وەکو لایەنی سێیەم بۆ ئەوەی رۆڵ ببینن، بەڵام نەیانتوانی هیچ کامتان بگەیەننە قەناعەت، رۆڵی یەکێتی چی بوو لەناوبژیوانی ئێوەو بۆچی نەیتوانی سەرکەوتوو بێت، کە ئەوکاتە هێزێکی سەرەکی بوو لەکوردستانی عیراق ؟**

**عەبدوڵلای موهتەدی:** ئێمە خوازیاری ئەوەبووین کە ئەو کوشتارەی کەلە ئێمە کرا بێ تاوان، بێ دەلیل، بێ هیچ ناکۆکییەك، بێ قسەیەك لەهەورامان ئەوان هاتنە سەر ئێمە، سیانزە کەسیان لێ کوشتین، تەنانەت چادرو خێوەتەکەیان ئاگر تێبەردابن، خەڵك سووتا لەناویدا، پێشمەرگەی ژنمان کوژرا، بەبێ هیچ تاوانێك و بەبێ هیچ دەلیل و هۆکارێك هاتنە سەرمان، ئێمە ئەوە بەجینایەتێکی بێ پاساومان دەزانی.

بۆیە پێمانوابوو ئەمە دەبێ مەحکوم بکرێ، ئەگەر ئەوە مەحکوم کرابایەو حزبی دیموکرات ئامادەبوایە شتێك لەگەڵ تاوانبارەکەی بکات، پێموابوو قەت قەت شەڕی ناوخۆ لەکوردستان رووی نەدەدا، چونکە ئێمە خۆ نەماندەگووت ئەو خەڵکانە دەبێ هەموو بکوژرێنەوەو یان پێمانوانەبووحەتمەن دەبێت شەڕێك دەست پێبکات، بەڵام حزبی دیموکرات ئامادەنەبوو خراپەی کەسەکانی خۆی مەحکوم بکات، ئامادەنەبوو لێپرسینەوەیەکی جیدیان لێبکات.

ئەمە یەك، یەکێتی نیشتمانیش دیارە کارەکەی پێناخۆش بوو، زۆریشی هەوڵدا کە ئەو دوو لایەنە یەکبگرنەوە، بەڵام یەکێتی نیشتمانی بۆخۆی مولاحەزاتی سیاسی خۆی، ئەو وەختە نەهات بەراشکاوی حزبی دیموکرات مەحکوم بکات و بڵێت ئەشهەدومابیلا ئەوان تاوانبارن و ئێمە ئاوای دەبینین، کە پێموایە ئەگەر ئەوانیش بیانکردایە دەوری چاکی دەبوو لەوەدا شەڕی ناوخۆیی هەڵنەگیرسێ، بەڵام ئێمە ناتوانین تاوانەکەی بخەینە سەر لایەنی سێیەم، بەهەرحاڵ ئەوان پێیان خۆش نەبوو جۆرێکی وا بنوێنن کە لایەنێك بەدژی لایەنەکی تر پشتیوانی دەکەن.

***تا ئەو شەڕانەی کە بەشەڕی (25)ی خەزەڵوەری هەورامان و (6)ی رێبەندان ناسراوە، ئەو کاتە جەنابت سکرتێر بوویت، تۆ لەوێدا راتگەیاندووە "دیموکرات هێرشی کردۆتە سەر کۆمەڵەو دەڵێی: دیموکرات ئامادە نەبوو هاوکاری ئەو کۆمسیۆنە بکات کە لەنێوان کۆمەڵەو دیموکرات پێکهاتووە دیارە**

**یەکێتی بووە، راستگۆیانە پێم بڵێ کێ فاکتەری سەرەکی ئەم شەڕانە بووەو کێ نەدەچوو بەدەم داخوازییەکانی کۆمسیۆنەوە؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** یانی کەسەکان وەکو ئەفراد ئەوە ئەلعان لەبیرم نەماوە، بەلام بۆ نموونە کەسێکی کە لەلایەن ئێمەوە نوێنەر بوو کاک فارووقی بابە میری بوو، بۆیە ئەگەر لەو بپرسی حەتمەن بەوردەکارییەوە پێت دەڵێ، من نازانم کەسەکان کێ بوون لەناو حزبی دیموکرات، بۆ ئاگاداریت من ئەو وەختی سکرتێری کۆمەڵە نەبووم کە بڵێن لەسازمانی کوردستانی- حزبی کۆمۆنیستی ئێران- کۆمەڵە، من سکرتێر نەبووم ئەو وەختە برایمی عەلیزادە بوو.

# دیموکرات، دەیویست سەر بەکۆمەڵە دانەوێنێ و هاوکاری ئاشتیان نەکرد

***تۆ سکرتێری حزبی کۆمۆنیست بوویت؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** بەڵێ من سکرتێری حزبی کۆمۆنیست بووم، راستە، لەبەر ئەوە من وردەکارییەکەم لەبیر نەماوە چ کەسێك بوو کە ئەیکرد، بەلام دەزانم کەسەکانی حزبی دیموکرات ئامادەی هاوکارییەکی جیدی نەبوون، ئامادەی لێکۆڵینەوەی جیدی نەبوون، پاساویان بۆ ئەو تاوانە هێنایەوە، لەجیاتی ئەوەی دانی پێدابنێن یان داوای لێبوردنێك بکەن یان سزای ئەو کەسانە بکەن، کە ئەو کارەیانکردووە، یان بەڵێن بدەن جارێکی دیکە دووپات نەبێتەوە، دڵنیام ئەوان ئەوەندەشیان کردبایە ئاوێك بەو ئاگرەدا دەکراو دەکوژایەوە، بەلام ئەوان پێیانوابوو دەبێ سەر بەکۆمەڵە دانەوێنن و قەیناکا لێرە لێیان داوە، یانی لەجۆرێك بیرکردنەوەدابوون کە ئەسڵەن ئامادە نەبوون هیچ خراپەیەکی ئەفرادی خۆیان لەوێ دان پێدابنێن.



# دیموکرات بۆ بەرەی کوردستانی حزبی کۆمۆنیستی کردە بیانوو

***بەو پێیەی ئێوە کاتی خۆی دژایەتی حزبی دیموکراتتان کردووەو یارمەتی ڕێبەرایەتی شۆڕشگێڕتانداوە، بەهەمانشێوە دواتر حزبی دیموکرات دەست دەخاتە ناو کۆمەڵەوەو دوولەتی دەکات و ئینشعابی تێدەخات دواتر بەجۆرێك لەجۆرەکان جارێك یارمەتی ئێوە دەدات و وەکو کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشان و جارێکی تر یارمەتی سازمانی کوردستانی حزبی کۆمۆنیستی ئێران کۆمەڵە نەدات بەدەلیلێك؟**

**عەبدوڵلای موهتەدی:** نا، جاری یەکەم: جیابوونەوەکانی ناو حزبی کۆمۆنیستی ئێران و هاتنەدەرەوەی کۆمەڵە لەحزبی کۆمۆنیستی ئێران بەڕاستی هیچ پەیوەندییەکی بەحزبی دیموکرات، بەپارتی، بە یەکێتی، بەهیچ حزبێکی تری کوردستان یان ئێران نەداوە، ئەمە زادەی ئاڵوگۆڕەکانی ناوخۆی کۆمەڵە بوو کە خۆی ڕەنگدانەوەیەکی ئاڵوگۆڕەکانی کۆمەڵگای دەرەوە بوو، ئێمە وەکو بۆم باسکردی خۆ شتێکی کت و پڕو یەك ڕۆژە نەبوو، چەندین ساڵ بوو ئەو کێشەیە هەبوو هەر لەکۆنگرەی شەشەوە دوای ئەوە لەکۆنگرەی هەشتەوەو زۆرێك لەو باسانە پێشتریش لەناو خۆماندا کرابوو، دوای ئەوە ئێمەمانان و من خۆم یەکێیان پێداچوونەوەیەکی تێروتەسەلی فیکریمان بەسەر کۆمۆنیزمی کاریگەریی، بەسەر ئەزموونی حزبی کۆمۆنیستی ئێران، بەسەر باوەڕەکانی، بەسەر هەموویاندا کردو پێداچوونەوەیەکی سەرلەنوێمان کردو گۆڕانکاریمان لەفیکری خۆمان یانی گۆڕانکاریمان لەفیکرماندا تێدا پێکهاتبوو، سەرچاوەکەی هەر ئەوە بوو هیچ شتێکی تر نەبوو.

دووەم: ئێمە هیچ داوایەکی ماددیمان لەکاتی جیابوونەوە لەحزبی دیموکراتی ئێران نەکردووەو ئەوان هیچ یارمەتییەکی ئێمەیان نەکردووەو بۆ حزبی کۆمۆنیستی ئێران نازانم هیچم نەبیستووە، خۆیان دەبێت جواب بدەنەوە، بەڵام یەك شت هەبوو سەرکردایەتی حزبی دیموکرات بۆ ئەوەی پێی خۆش نەبوو مەسەلەی بەرەی کوردستانی پێك بێ، مەسەلەی سازمانی کوردستانی حزبی کۆمۆنیستی ئێرانی کردبووە بەهانە، بەڵێ یانی جۆرێك گەمەی سیاسی لەو بەینەدا حزبی دیموکرات دەیکرد، کە شتێکی بێ کەڵك بوو، شتێك بووغەیری زەرەر بۆ بزووتنەوەی کوردستان و درەنگی خستن و یەك خستنی بەرەی کوردستانی هیچ کەڵکێکی نەبوو، خۆ ئاخرییەکەشی مەعلوم بوو سازمانی کوردستانی و حزبی کۆمۆنیستی ئێران داهاتوویەکیان نەبوو لەکوردستاندا.

# سەرەتا عەلیزادە داوای ناوبژیوانی لەمام جەلال دەکات، نەک من

***بەلام لەجیابوونەوەی ئێوە، قسەیەك هەیە گوایا یەکێتی رۆڵێکی فەعالی هەبوو لەجیابوونەوەی ئێوەو سازمانی کوردستانی حزبی کۆمۆنیستی ئێران- کۆمەڵەدا؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** من تەحەدای ئەو کەسە دەکەم کە ئەوە دەڵێ، جارێ ئێمە حزبێك بووین زۆر خاوەنی دیسپلین بووین لەنێو خۆماندا، ئێمە قەت قەت کێشەکانمان نەخستۆتە دەرەوە، مەگەر ئەو جارەی کە خۆمان بڕیارمان دابێ لەسەر شتەکان بنووسین، بەڵێ من شتم لەسەر نووسیوەو پێداچوونەوەیەکی تێرو تەسەل و تەواوم لەهەموو ئەزموونی خۆمان کردووە، ئەوە راستە، بەلام کێشە ناوخۆییەکانمان هیچ کەس لێی نەبیستووین و یەك لەوانە یەکێتی نیشتمانی کوردستان و شەخسی مام جەلال هیچ شتێکی لێ نەبیستووین.

کاتێکیش کە بیستوویەتی ئەوە بەویژدانم ئەوە دەڵێم، بڕۆ لەبرایمی عەلیزادە بپرسە، لەوی بیستووە، لەمنی نەبیستووە. من لەدەرەوەی ولات بووم، مام جەلال لەگەڵ من بەتەلەفۆن قسەیکردووە، لەو تەلەفۆنەدا مام جەلال پێی گووتم کە کاك سەید برایمەکەی خۆمان هاتووە بۆ لام داوای لێکردووم و وتویەتی ئێمە کۆمەڵێك ناکۆکیمان هەیە لەگەڵ عەبدوڵلا و ئەوان، پێمانخۆشە تۆ لەنێوانماندا بیت، هەتا لەبیرمە گوتی جوابمداوەتەوەو وتومە جا ئێوە بۆخۆتان کێشەی خەڵکی حەل دەکەن و ئێوە ژیرن و سیاسین و منتان بۆچییە، بەلام کاك سەید برایم وتوویەتی: نا من داوا دەکەم و ....، زۆر ئیلحاحی کردووە، ئینجا مام جەلال وتوویەتی: باشە من لەعەبدوڵلا و ئەوانیش دەپرسم بزانم ئەوانیش پێی رازین یان نا، ئێستا لێتدەپرسم، کاکە ئەتۆ رازیت من نێوبژی لەنیوانتاندا بکەم، منیش وتم: بەڵێ منیش رازیم و تۆم بەحەکەم قەبوولە. سەدلەسەد یانی من وەعدی شەرەفت پێدەدەم و غەیری ئەوە نییە و لەکاك سەید برایم بپرسە غەیری ئەوە ناتوانێ بڵێ، ئەو قسە یانی درکاندنی کێشەی نێوخۆمان کە من پێم خراپ نییە، چونکە پێموایە مام جەلال دۆستی دێرینی هەمووومان بووەو ئینسانێکی ژیرەو دڵسۆزە، لەبەر ئەوە گەر داوای ناوبژیوانی لێبکەیت هیچ ئیرادێکی تێدا نییە، عەیب نییە، کارێکی چاکە.

بەلام ئەو کردوویەتی و من نەمکردووە، بەلام لەناو ریزەکانی خۆیان و لەرێگەی ئەوانەوە لەناو کۆمۆنیزمی کاریگەریی وایان بلاوکردەوە کە گوایا من پای مام جەلالم راکێشاوەتە ناو کێشەکەی خۆمان، ئەسڵ و ئەساسی نییە، دوای ئەوەش بلاویانکردەوە کە گوایا من داوام لەمام جەلال کردووە، ئەوەڵەن نە یەك پێشمەرگە هاتووە، نە یەك ئاسایش هاتووە، نە یەك نەفەر هاتووە لەیەکێتییەوە

چکۆڵەترین تەدەخولێك بکات لەکاروباری ئێمەدا، بەڵام دوای ئەو قسانە خۆمان سەید برایم و ئەوان مام جەلالمان دەعوەت کردووە، دووجار سێ جار وەختی خۆی داناوە بۆ کارەکەی ئێمەو هاتووە، ئیتر ئەوە شتێکی ئاشکرابووە،قسەی لەگەڵ کردووین، نە هێزی ناردووە نە هیچ شتێکی ناردووە، لەسەر داوای خۆمان بەو شێوەیەی کە باسمکرد هاتووەو قسەیکردووە، گەلاڵەیەکی پێ پێشنیار کردووین، گەلاڵەکەی مام جەلال ئێستاش ماوەمە بەئیمزای خۆیەوە، ئەلف و بێیەك بوو، شاملی دوو بەش بوو، یانی گەلاڵەی (ا) بکەن گەر نەکرا (ب) بکەن، ئێمە قبوڵمان کرد، چونکە پێمان وابوو قازانجی تێدایە بۆ مەسلەحەتی کۆمەڵەو ئێمە هەریەکمان قبوڵ کرد، گەر گەلاڵەی (ا)نەکرا ئەوا گەلاڵەی (ب)ەیەکە، کاك سەید برایم و ئەوانیش بەسەراحەت لەکۆبوونەوەکەدا هەم (ا)ەکەیان رەتکردەوە هەم (ب)یەکە.

# مام جەلال دوو گەلاڵەی دانا و سەری نەگرت

*چی بوون ئەو گەلالانەی (أ)و (ب)؟

عەبدوڵای موهتەدی: رەنگبێ خاڵەکانم بەوردی لەبیر نەمابێ، بەڵام ئەسڵی گەلاڵەی (ا) ئەوەبوو: کۆمیتەی ناوەندییەك هەڵبژێرن کە ئەملاو ئەولا بەیەك ئەندازە خەڵکیان بێ، چەند کەسێکیش کە لەو نێوەدان باوەڕ پێکراوی هەردوولاتان هەڵبژێرن، یەك ساڵ دانێن ئێوە جیامەبنەوە، ماوەی یەك ساڵ موناقەشەکان بکەن، لەفەزایەکی دۆستانەدا قسەکان بکەن، ئەگەر هەر نەسازان پێکەوە، ئەوە حەقی خۆتانەو جیاببنەوە، بەڵام یەك ساڵ مۆڵەت دانێن زووە جارێ، پەلە مەکەن، ئەوە گەلاڵەی یەك.
گەلاڵەی دووەم ئەوەبوو: ئەگەر هەر نەتانتوانی کۆمیتەیەکی ناوەندی هاوبەش دابنێن، هەرکەس کۆمیتەی ناوەندی خۆی دابنێ، بەڵام بێن کۆمیتەیەکی هەماهەنگی یان کۆمیتەیەکی تەنسیق پێکبهێنن، ئەو کۆمیتەیە هاوبەش بێت لەنێوان هەردووکتاندا بەجۆرێکی وابێ کە بوودجەی بەشی ئەم بدات و بەشی ئەویش بدات و راستە دەبن بەدوو لایەن، هەرکەسە کۆمیتەی ناوەندی خۆی و نیشی خۆی دەکات، بەڵام بەتەواوەتی دەستتان لێ نەبراوە، هیچ نەبێ کۆمیتەیەکی هەماهەنگی لەنێوانتاندا ماوەتەوە، ئێمە بۆ ئەوەشیان ئامادەبووین، بەڵام کاك سەید برایم و سەرکردایەتی حزبی کۆمۆنیستی ئێران بەوەش ئامادە نەبوون و بۆیە نەسازاین، وەختێکیش کە جیابوونەوەکە بوو لەهەرحاڵدا هیچ پارمەتییەکیان لەحزبی کۆمۆنیستی ئێران نەبریوەو لەم چەند ساڵەدا زیادیشیانکردووە، خراپەیەکیان لەگەڵ ئەوان نەبوو، ئەوە شتێکی جیاوازە تۆ بڵێی رەنگبێ لەفیکرو باوەڕی یەکێتیدا، خۆیان بەئێوە نزیکتر دەزانن، هەموو حزبێکی کوردستان، هەر یەکێتی نییە، هەموو حزبە



کوردستانییەکان ئێمە بەخۆیان نزیکتر دەزانن، بەلاّم ئەوە مانای ئەوە نییە تەدەخولێکیان بەقازانجی ئێمەو بەزیانی ئەوان کردبێت.

من پێموانییە هیچ کەسێکی دی ناو سازمانی کوردستانی حزبی کۆمۆنیستی ئێران بتوانێ ئیدعایەی ئاوا بەئاشکرا بکات، رەنگبێ لەپەناو پەسیوان بۆ لایەنگرانی خۆیان دەزانم قسەی ئاوایان زۆر کردووەو زۆریان مادەی تەبلیغاتیو پڕووپاگەندە بەدەست حزبی کۆمۆنیستی کاریگەریی دا، دەیان ئیتلاعیەی لەکۆمۆنیزمی کاریگەریی، بەقسەی خۆیان دەلّێن چەکدارەکانی جەلال تالّەبانی هاتوون، ئەوان بەزۆر گوایا کۆمەلّەیان لەحزبی کۆمۆنیستی ئێران جیاکردوەتەوە، ئەو هەموو داوایەمان لەسەید برایم کرد وتمان: تۆ بۆ خۆت دەزانی درۆیە، بۆ خۆت داوای ناوبژێت کردووە لەمام جەلال، یەك راگەیاندن بدە بلّێ ئەو شتەی کۆمۆنیستی کاریگەریی درۆیە، بەلاّم هەتا ئێستاش رەتی نەکردۆتەوە. دەیەوێ کەلّك وەرگرێ، دەنا بۆ خۆی دەزانێ، من نەبووم داوای ئەو ناوبژیوانیەم کردبوو، خۆی کردبووی.

***وەلحاسلْ دواجار مام جەلال نەیتوانی کێشەکانی ئێوە چارەسەر بکات؟**

عەبدوللاّی موهتەدی: نەیتوانی، هەولّی خۆیدا بەدلّسۆزانە هات، چەندجار لەگەلّمان دانیشت، ئێمەی دی، ئەوانی دی، پێکەوە دیتنی، حەتا لەکۆبوونەوەیەکی فراواندا سی چل کەس لەکادرەکانی هەردوولا دانیشتبوون، مام جەلال عەینی ئەم شتانەی.. خۆشبەختانە وا هەلّکەوت، مام جەلال عەینی ئەو قسەیەی منی گێڕایەوە کە کاك سەید برایم هاتووەو دوایی من تەلەفۆنم لەگەلْ عەبدوللاّ کردووەو جا ئەویش قبولّی کردووەو منیش لەسەر داوای هەردوو برا هاتووم، داواتان لێدەکەم رێگەیەك بدۆزنەوەو دیالۆگ لەنێوان خۆتاندا هەبێت، بەلاّم کاك سەید برایمو ئەوان تەسمیمی خۆیان گرتبوو.

## حزبی کۆمۆنیست زۆر غەدری لەکادرەکانی ئێمە کرد

***بەلاّم دەلّێ هەر لەکۆنگرەی نۆ، هێزەکانی ئاسایش دێن دەوروبەری کۆنگرە دەگرنو دوای ئەوەش کە جیادەبنەوە یەکسەر بەماوەیەکی کورت رادیۆ دروست دەکەنو بارەگاکانتان رێکدەخەن، ئەمە چۆن وا بە پەلە کرا؟**

عەبدوللاّی موهتەدی: جارێ یەکەم نە یەك ئاسایش، نە یەك پێشمەرگە، نە یەك کادر، نە یەك موسئولی یەکێتی مەعازەلاّ بەدەورووبەری کۆنگرەدا نەهاتووەو ئەوە ئەسلْو ئەساسی نییە، ئەوە درۆی کۆمۆنیستی کاریگەرییە کە ماددەکەیان لەکاك سەید برایمو ئەوان وەرگرتبوو.



دووەم: ئێمە بۆ رادیۆمان داناوە، حزبەکانی کوردستانی ئێران، ئێمەش، یەکیان لەلایەن کوردستانی عیراقەوە یارمەتی دەکرێن، وەك خەڵکی، بێجگە لەوە ماڵمان فرۆشتووە، ژیانمان فرۆشتووە، یارمەتیمان کۆکردۆتەوە، زۆر فەقیرانەو هەژارانە ژیاوین، رادیۆیەکی دەستسازی شەپۆلی کورتیش چەندی تێدەچێت، بەڵام دەبوو لێرە بیو بزانی پەتووی کافیمان نییە بۆ پێخەفی خۆمان لەکاتی زستانو ساردو سڕی زستان، دەبوو بزانی چرای گەرم کردنەوەمان نییە، دەبوو بزانی سەرەتا کە جیابووینەوە تا سێ مانگیش زیاتر تا چوار مانگیش منو کاك عومەری ئێلخانی زادەو هەموو چاپخانەی کۆمەڵە لەژوورێکی دوونیو بەسێدا بووین، ئاوا هەڵمانکردووە، ئێمە زۆر شۆڕشگێڕانە هەڵمانکرد، جەماعەتەکەی کە لەگەڵ ئێمە بوون ئەوا فشاریان دا دەیانگووت: کاکە ناچینەوە ناو حزبی کۆمۆنیستی ئێران، بەگیاخواردن بەرێدەچین، بەگیای ئەو شاخانە خۆمان بەرێدەخەین، لەبەر بەفروبارانـدا دەمێنینەوە، دەچینە چادر ماڵمان ناوێ، بەڵام مەحاڵە تازە لەگەڵیان کاربکەین، ئەوەندەیان زوڵم لەخەڵك کردبوو، ئەوەندەیان خراپە بۆ ئەو هاورێیانەی ئێمە هەبوو.

***قسەکە ئەوەیە یەکێتی بۆیە دیفاعی لەئێوە دەکرد، ئێوەی وەکو گەرایشێکی ناسیۆنالیستیو هاوشێوەی خۆیان دەبینیو بەهەمان شێوە دەیویست ئەم گەرایشە هاوکاری بکاو تەقویەی بکا، بەرامبەر ئەوەی کە تۆ ناوی دەنێی حزبی کۆمۆنیستو دیارە بەدڵی یەکێتی نیشتمانیو ئەحزابە قەومییەکان نەبوون؟**

**عەبدوڵای موهتەدی:** یەکێتی نیشتمانی یارمەتی ئێمەی دەکرد ماوەی (15) ساڵ بوو، ئێمە حزبی کۆمۆنیستمان پێکهێنابوو.

***مەبەستم لەکاتی جیابوونەوەدا؟**

**عەبدوڵای موهتەدی:** قەیناکا، خۆ (15) ساڵەکەی پێشتر هەر یارمەتی ئێمەی دەکرد، خۆ ناومان هەر حزبی کۆمۆنیستی ئێران بوو، دواتریش ئێمە جیابووینەوە، یارمەتی ئێمەی کردووە، چونکە ناسیۆنالیست بووین، خۆ یارمەتی سەید برایمو ئاوانیشی دەکردو هەر دەیکاو زیادیشی کردووە.

# خۆ ئێمە لەژنە دۆمەکەنین ئایەکێتی یارمەتیمان نەدات

***هی ئێوەشی زیاد کردووە؟**

**عەبدوڵلای موهتەدی:** قەیناکا، خۆ ئێمە لەژنە دۆمەکە نین. بەهەرحاڵ مەبەستم ئەوەیە وانەبووە، زوڵمێك لەوان بکات، هیچ زوڵمێکی لەوان نەکردووە چاکەی زیاتریشی لەگەڵ کردوون.

# حزبی کۆمۆنیست ماڵی تازەیان بۆ چییە؟

***یەك نموونەت بۆ بهێنمەوە، یەکێك لەبرادەرانی ئەوان وتی: ئێمە دوو ساڵ داوای بیرێکی ئیرتیوازیمان کردووە لەدەزگاکانی حکومەتی هەرێم بۆیان نەکردووین، بەڵام بە یەك تەلەفۆنی ئێوە ئەوەیان بۆ کردوون، چەند بینامان داواکردووە بۆمان بکرێ، بەڵام دەبینی چەند بینا ئێستا بۆ ئێوە کراوە، ئەوان دەڵێن ئەگەر ئەوە هاوکاری نییە، دەست لە پشتدان نییە، بۆچی ئێمە داوا دەکەین شتەکانی ئێمە دوادەخرێت، یان چەندین جار داوامان کردووە لە عەبدوڵلای موهتەدی با بارەگاکانیان لەڕزگاری لەسلێمانی جیابکەنەوە، یەکێتی ناوبژیمان بووە، ئێمە وتومانە بارەگا بۆ ئێوە دەگرین و لێمان دوور بکەونەوە، یان ئێوە بارەگا بۆ ئێمە بگرن و دووردەکەوینەوە، هیچیان نەکردووە؟**

**عەبدوڵلای موهتەدی:** دەتۆ وەکیل بە، بارەگاکانمان لەڕزگاری دوورکەوە لەیەکتری، ئامادەین ئەوکارە بکەین، خۆ ئەوە چ خۆشییەکی تێدایە هەموو ڕۆژێ چاومان بەچاوی یەکەوەبێت، کەسێك قسەیەکی تاڵ بکات، کەسێك قسەیەکی ناخۆش بکات، ئەوە هیچ قازانجێکی تێدانییە بۆ ئێمەو ئامادەین کە لەوێ زوو جیاببینەوەو هەرکەسە بچێتە گەڕەکێك، جا ئەمە چ موشکیلەیەکی تێدایە، هیچ موشکیلەیەك لەوانەدا نییە، ئەوانیش شتیان بۆ کراوەو ئێمەش شتمان بۆ کراوە، من نەچوومە ناو ئۆردووگاکەیان بزانم ئەوان چیان بۆ کراوەو نەکراوە، بەڵام ئەوان پێویستیان بەماڵی زیادی نییە، وردە وردە ماڵەکانیان چۆڵ دەبن، پێویستی چیان پێیەتی لەخۆڕا ماڵی زیادی بۆ دروستکەن.

# یەکدەگرینەوە بەبێ حزبی کۆمۆنیست

*ئەی لە ئەگەرەکانی سبەینێی یەکگرتنەوەی هەردوو کۆمەڵە، چۆن دەکرێ تەعامول لەگەڵ ئەو سەرکردایەتییە بکەیت کە تۆ بە سەرکردایەتییەکیان دادەنێیت کە ناسراو نین، کە تیۆریستی و شارەزا نین؟

عەبدوڵای موهتەدی: قەیناکا ئەوە هیچ مانعێك نییە بۆ یەکگرتنەوە، ئەسڵەن دژی یەکگرتنەوە نیم، ئێمە وەك ئەوان نین، بەڵام یەکگرتنەوە دووسێ مەرجی هەیە، یەکەم: تۆ دەبێ بەمن بڵێی لەژێر چ ناوو قاڵبێکدا یەك دەگریتەوە، خۆ ناکرێ بەدوو ناو یەکتر بگرینەوە، شتی وا دەکرێ.

*یەك ناو کە هەردووکتان لەسەری رێکدەکەون؟

عەبدوڵای موهتەدی: بەڵێ، وە ئەو ناوە ناتوانێ حزبی کۆمۆنیستی ئێران بێت، تەواو.

*دەکرێ کۆمەڵەی زەحمەتکێشانی ئێران بێ؟

عەبدوڵای موهتەدی: نەخێر.

*ناکرێ؟

عەبدوڵای موهتەدی: ئەوە بوونەوەرێکی مێژووییە کە درێژە بەژیانی خۆی دەدات، تاریخی سیاسی ئەم وڵاتە عومری حزبی کۆمۆنیستی ئێرانی بەکۆتایی گەیاندووە، ئەلعان بە تەنەفووسی مەسنوعی راوەستاوە، ئۆکسجینی دەدەنێ، ناتوانێ بوونەوەرێکی ئاوا درێژە بەژیانی بدا، ئەسڵەن کێشەکەی ئێمە لەگەڵیان ئەوەیە، حزبی کۆمۆنیستی ئێران تازە موستەلزەماتی تەواوی ژیانێکی سیاسی سەرکەوتووی نییەو تێدا نەماوە ئەگەر بووبێتیش ئێستا تێیدا نەماوە، ئەگەر ببوایە قەدیم سەردەکەوت، ئەو هەموو بەڵایەی بەسەر نەدەهات، زۆرێك لەو بەڵایانەی بەسەر کۆمەڵەش هاتوون هەر سەرچاوەکەی لەوەدایە، لەبەر ئەوە ئەگەر یەکگرتنەوەیەك و تێکەڵ بوونەوەیەك ببێ دەبێ لەژێر ناوی کۆمەڵەدا بێت، ئەوە مەرجی سەرەکیەتی، ئێمە کۆمەڵە دەمانەوێت ئەگەر خەڵکانێك هەن ...



# تا ڕۆژی قیامەت لەگەڵ حزبی کۆمۆنیست یەکناگرینەوە

***وەکو کۆمەڵە یان وەکو کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانی ئێران؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** نا نا، وەکو کۆمەڵە، خۆ ناوی کۆمەڵەش دەتوانی سازمانی زەحمەتکێشانەکەی بگۆڕی خۆ ئایەی قورئان نییە.

***باشە خۆ ئێستا هەردووکتان هەر ئەو ناوەتان وەرگرتووە؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** ئەو لەحزبی کۆمۆنیستی ئێراندایە، ئێمە ناچینەوە ناو حزبی کۆمۆنیستی ئێران.

***ئاخر ئێوە وادەڵێن، ئەوان دەڵێن ئێستا ئێمە کۆمەڵەین و عەبدوڵڵای موهتەدی زۆر ئیستفادەی لەناوی کۆمەڵە کردووە؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** قەیناکا، ئەوان لەحزبی کۆمۆنیستی ئێراندا هەن یان نین؟ ئەوە جوابە تێستییە، وەڵامی ئەو پرسیارە چییە؟ ئەوان لەحزبی کۆمۆنیستی ئێراندا هەن یان نین، ئاخر هەن خۆ ناتوانی بڵێیت نا، ئەوان ڕێکخراوێك، فەرعێکی حزبی کۆمۆنیستی ئێرانن، بەگوێرەی ئەساسنامەو پەیڕەوی ناوخۆیان وایە، بەگوێرەی ساختاری حزبییەکەیان وایە، خۆ ناوی ئەفرادەکە مەعلومە، کۆنگرەی حزبی کۆمۆنیستی ئێران دەگرن، قابیلە کاك سەید برایم ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی حزبی کۆمۆنیستی ئێران نییە، خۆ ناتوانن ئەوە بشارنەوە، ئەم شاردنەوەیە من بەریاکاری دەزانم.
جا ئەمە چ حزبێکە تۆ تێیدایی و لەڕووت هەڵنەیە باسی بکەیت، حزبی ئاوام بۆ چییە کە پێم عەیب بێت لای خەڵکی، دایمەن بڵێم نە بەقوربان لەوێدا نیم، باوەڕم پێبکەن لەحزبێکی وەهادا نیم، ئاخر جا بەکاری چیم دێ حزبێکی ئاوا ئەگەر شانازی پێوە نەکەم و خۆمی لەلای خەڵکی پێوە رانەنێم، دایم مەجبور بم لەبەر قسەو لەبەر عەیبەو شەرمەزارییەکەی بیشارمەوە، لەبەر ئەوە بەشتێکی ریاکاری دەزانم، ئەوان لەحزبی کۆمۆنیستی ئێراندان، ئەگەر دەیانەوێت لەحزبی کۆمۆنیستی ئێراندا بمێننەوە تاڕۆژی قیامەت ئێمە یەکناگرینەوە، خەلاس، ئەگەر لەحزبی کۆمۆنیستی ئێران دێنەدەرێ و وەکو کۆمەڵە ئەوە یەکێك لەمەرجە گەورەکانی یەککگرتن بەدی هاتووە، بەڵام ئەمە تەنها مەرجیش نییە، لەعەینی حاڵدا دەبێ لەسەر مەسەلەی سیاسەت و بیروباوەڕەکانیش قسەبکرێت، بەڵام بۆیە من دەڵێم مەرجی سەرەکییە، نەك بڵێم بیروباوەڕی جیاوازو سیاسەتی جیاواز نییە، بەڵێ لەڕاستیدا لەزۆرشتدا جیاواز بووینەتەوە، بەڵام ئەگەر تۆ حزبی کۆمۆنیستی ئێرانت لادا، یانی ئەوان دەڵێم، بەناوی کۆمەڵە



هاتنە مەیدان و ئامادەی دیالۆگ لەگەڵ ئێمە بوون، ئەوە سەرەتایەکی زۆر باشە بۆدیالۆگ، لەبەر ئەوە دەتوانین ئەو وەختە کێشە سیاسی و فیکرییەکان لەگەڵ یەکتر باس بکەین، بەڵام تا حزبی کۆمۆنیستی ئێران بمێنێتەوەو ئەوان پێداگری بکەن لەسەر هێشتنەوەی، هیچ رێککەوتنێك مانای نییە.

# ئەوان دەترسن وناوێرن مونازەرەی (TV) بکەن

*ئەو هەولانەی دراوە بۆ یەکگرتنەوەی ئێوە پێموانییە کەم بن، گەیشتووە بەچی؟

عەبدوڵلای موهتەدی: ئاگات بەهیچ، ئەوان لەدانیشتن لەگەڵ ئێمە دەترسن، حەتا یەك جار بۆ دانیشتن لەگەڵ ئێمە لەئاستی سەرکردایەتیدا ئامادە نەبوون، ئامادەنین دیالۆگێکمان لەگەڵ بکەن، ئامادەنین مونازەرەو بەحسێك بکەن، ئامادەنین سیمنارێك پێکەوە بگرین، سەرچاوەکەشی لەمێژ هێزییاندا نییە، لەترسیاندایە، ئاخر دانیشن بڵێن چی، قسەیەکیان پێ نییە، بەحسێکیان پێ نییە، پێشتریش پێیان نەبوو.

*ترس لەچی؟

عەبدوڵلای موهتەدی: ترس لەوەی جوابی قسەکانی ئێمەیان نییە، لەهیچ تەلەفزیۆنێکدا ناتوانن مونازەرەو دیالۆگێك لەگەڵ ئێمە بەرێوەبەرن.

*تۆ ئامادەیت، من و تۆو کاك برایمی عەلیزادە لەمونازەرەیەکی تەلەفزیۆنی دانیشین سێ بەسێ، قسە لەسەر کێشە ئایدیۆلۆژی و سیاسی و فەیرانەکانی خۆتان بکەن؟

عەبدوڵلای موهتەدی: بەڵێ زۆر چاك، بۆ نا ئاخر...

# سرودی ئەنتەرناسیۆنال، سرودی رەسمی کۆمەڵە نییە

*سەید برایم ئامادە نییە؟

عەبدوڵڵای موهتەدی: نەبووە تا ئێستا.

*ئەگەر کارێکی وا بکەم من، هەردووکتان لەدیدارێکدا سەبارەت ناکۆکییەکانتان و ئاڵوگۆڕەکانتان و فاکتەرو هۆکارەکان، هەردووکتان ئامادە دەبن؟

عەبدوڵڵای موهتەدی: من ئامادە دەبم لەلایەن خۆمەوە.

*من دەمەوێت سەرنجت بۆ ئەوە راکێشم لەکۆنگرەی (9)ی کۆمەڵە لە پوشپەڕی(1380)دا دوای ئەوەی کە فیدراڵیتان پەسەنکردو هەر لەو کۆنگرەیەو لە پەیڕەوی ناوخۆدا هاتووە یەکەم: کۆمەڵە واتە کۆمەڵەی شۆڕشگێڕانی زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێران، حزبێکی سۆسیالیستی کرێکارانە لەکوردستان، دووەم: تا ئێستا مارشی ئەنتەرناسیۆنال مارشی رادیۆی کۆمەڵەی زەحمەتکێشانەو لەزۆربەی مەسائیلە مارکسییەکان لاتان نەداوە، بەهەمان شێوە ئەوانیش لەسەر هەمان ئەم چەمکانە کاردەکەن و ئەوان دەڵێن: ئەگەر عەبدوڵڵای موهتەدی خۆی بەناسیۆنالیست دەزانێ با خۆی ساغ بکاتەوە، ئیتر بۆچی سروودی ئەنتەرناسیۆنال سروودی رادیۆکەی بێت، بۆچی کۆمەڵەی زەحمەتکێشان حزبێکی سۆسیالیستی کرێکاران بێ، بۆ بەئاشکرا عەبدوڵڵای موهتەدی ناڵێ من حزبێکی قەومیم و خەریکی کوردایەتیم، دواتر مارسی رادیۆ( tv ) کەگۆڕا؟

عەبدوڵڵای موهتەدی: یەکەم: سروودی ئەنتەرناسیۆنال جێگای رێزە، پێموابێ سروودێکی زۆر چاکیشە وەکو ناوەڕۆک و پێشینەیەکی مێژوویی زۆر جوانیشی هەیە، بەڵام سروودی ئەنتەرناسیۆنال سروودی رەسمی رادیۆکەی ئێمە نییە، نازانم کێ دەڵێ وایە.

*مارشی رۆژانەی رادیۆکەتان؟

عەبدوڵڵای موهتەدی: نەخێر وانییە.

*چیتان هەیە؟

عەبدوڵڵای موهتەدی: مارشی خۆی هەیە، سروودی ئەنتەرناسیۆنال مارشی رادیۆکەی ئێمە نییە.



***توانیوتانە سروودی ئەی ڕەقیب بەکاربهێنن؟**

**عەبدوڵای موهتەدی:** خۆ شەرت نییە ئەی ڕەقیب بێ، بەڵام ئەنتەرناسیۆنال نییە، ئێمە خۆمان سروودمان هەیە، سروودەکانی خۆمان بەکاردەهێنین، ڕێزم هەیە بۆ ئەو سروودە، بەڵام سروودی ئەنتەرناسیۆنال سروودی ئێمە نییە، سروودی ڕەسمی کردنەوەی رادیۆکەمان نییە.

# گەر کۆمەڵە، سۆسیالیستی بێ عەیبی نییە

***ئەی لەسەر ئەوەی کە کۆمەڵە حزبێکی سۆسیالیستی کرێکارانە؟**

**عەبدوڵای موهتەدی:** بەڵێ، بەڵێ کۆمەڵە حزبێکی سۆسیالیستییە، یانی کۆمەڵە خۆی بەحزبی سۆسیالیستی دەزانێ، بەڵام فەرقەکە لەوەدایە یانی تۆ خۆت دابنێ بە سۆسیالیستی، سۆسیالیستێکی ئەم سەردەمە لەکۆمەڵگایەکی وەکو کوردستان مەقدووراتی چییە، مەحدودییەتەکانی چییە، یانی سنووری تواناییەکانی و نەتوانینیەکانی کامەیە، یانی تۆ ئەگەر ئیدارەی دەوڵەتت بدەنێ بەڕاستی و بەواقیع بینانە تاکوێ دەتوانی بچیتە پێش، تۆ ناتوانی کۆمەڵگایەکی سۆسیالیستی بەمانای نەهێشتنی سەرمایەداری لەکۆمەڵگای کوردستان پیادە بکەی، شتێکی وا ناکرێ، لەئێران ناکرێ.

# خۆمان بەپێشەنگی خەباتی نەتەوایەتی دەزانین

***تا کوێ فەلسەفەی سۆسیالیزم و فەلسەفەی کوردایەتی یەک دەگرنەوە؟**

**عەبدوڵای موهتەدی:** من پێموایەو واشمان هەوڵداوە، ئێمە خۆمان بەچەپێکی کۆمەڵایەتی دەزانین، نەک چەپێکی وەکو فارس دەڵێ (مەکتەبی) یانی چەپێکی وشکی دۆگیۆماتیکی لەچوارچێوەی ئایدیۆلۆژی، بەو نەوعەی مەسەلەن بڵێین چەپە سوننەتییەکانی ئێران، وە نە بەو نەوعەش کە خۆمان (15) ساڵ لەوەوپێش لەحزبی کۆمۆنیستی ئێران باسماندەکرد، ئێمە خۆمان بەچەپێکی کۆمەڵایەتی دەزانین، بەو مانایە لەچوارچێوەی تواناکان و مەقدووراتی ئەم کۆمەڵگایەو ئەم سەردەمەی کە ئێمەی تێدا دەژین هەوڵ دەدەین بۆئەوەی چینی چەوساوە وەک کرێکاران وەک زەحمەتکێشان بتوانن چەندی دەکرێت خۆیان ڕێکبخەن، وشیاربنەوەو داوای مافەکانیان بکەن و دەورێکی باشتریان لەکۆمەڵگادا هەبێ، ژنان بتوانن ئازادییەکی زۆرتر بەدەستبهێنن، کۆمەڵگا ئازادتر بێت، مەدەنی تر بێت،

دیموکراسی تێیدا بەڕێوەبچێ، ئازادی مانگرتن هەبێت، قانوونی کارێکی چاکترو عادیلانەتر لەئارادا بێت.

ئەوە ئەو شتانەیە ئێمە هەوڵی بۆ دەدەین و دەیکەین، بیمەی کۆمەلأیەتی هەبێت، خەڵك لەبرساندا نەمرێت، ئەوە ئەلعان ئەوپەڕی ئەو شتانەیە کەلەم سەردەمەدا تۆ دەتوانی کاری بۆ بکەیت، ئەوە حزبێکی چەپی کۆمەلأیەتی واقعییە، بەم مانایە بەڵێ ئێمە خۆمان بەچەپ دەزانین، هەین و باوەڕمان پێیەتی، هیچ ناکۆکییەك و ناتەباییەکی تێدا نییە لەگەڵ مەسەلەی رزگاریی نەتەوەیی کوردو ئەوەی ئێمە خۆمان بە پێشەنگ و بەخەباتکارو بەحزبی راستەقینەی خەبات بۆ رزگاری نەتەوەیی کوردستان و گەیشتنی گەلی کورد بە ئامانجە نەتەوەییەکانی خۆی دەزانێ نەك هەر ناتەباییان نییە، ئەسڵەن ئێمە پێمانوایە ئێمە قاتیعترین، ئێمە رۆشنترین، لەمەسەلەی نەتەوەییدا ئێمە سەریحترین، حزبە سوونەتییەکان وەکو ئێمە روون نین.

کەی ئێمە بەخودموختاری کۆتاییمان هێناوە؟ ئاخر ئەوە نییە پێشەنگی مەسەلەی فیدرالّین، چوزانی سبەینێ لەمەسەلەی سەربەخۆیشدا ئێمە پێش خەڵکی ناکەوین، ئەوەندەی کە دەستت دەڕوا، لەبەر ئەوە خەبات بۆ رزگاری نەتەوەیی لەگەڵ خەبات بۆ ئازادی سیاسی و دیموکراسی، لەگەڵ خەبات بۆ عەدالەتی کۆمەلأیەتی ئێمە هەرسێکیان پێمان وایە سێ خەباتی رەوان، ئێمە حزبی تاك کێشەیی نین، تەنها یەك کێشەمان ببێ، تەنها کێشەی ژنمان هەبێ، تەنها کێشەی کرێکارمان بێ، تەنها کێشەی نەتەوەییمان بێ، ئێمە حزبێکی فرە کێشەیین، یانی هەموو کێشەکانی کۆمەڵگا مەربووت دەزانین بە خۆمان.

ئەلعان مەسەلەی رزگاریی نەتەوەیی کورد مەسەلەی ئەساسییە، هەموو کۆمەڵگای کوردستان گیرۆدەی ئەوەیە، ئێمە خۆمان بەحزبی پێشەنگی ئەو خەباتە دەزانین.

## زۆربەی شەهیدان و خانەوادەی زیندانیان و (پ.م) لەگەڵ ئێمەدان

---

***بەلأم موشکیلەکە ئەوەیە خەڵکی کوردستانی ئێران، هەموو لایەنەکان و دۆستەکانتان، هەردوولاتان بە کۆمەڵە دەناسن تا ئێستا؟**

عەبدوڵلأی موهتەدی: وا نامێنێت، هەر ئێستاش وەکو جاران نەماوە، بەقەد جاران، بەقەد پێنج سالّ و پێنج سالّ و نیو لەوەوپێش کە ئێمە جیابووینەوە، وا نەماوە ئەوانە خەریکن کالّ دەبنەوە، کەم رەنگ دەبنەوە، من پێموایە ئەو قەزاوەتە دەمێنێتەوە بۆ کۆمەڵگای کوردستان، بۆ سبەی رۆژ بزانین چۆن دەبێت.



***دواجار ئەوان دەڵێن ئێوە، عەبدوڵلای موهتەدی کە رۆیشتوونەتە دەرەوە لەکۆمەڵەدا، لەحزبی کۆمۆنیست کەمینە بوون و ناوی کۆمەڵەتان بردووەو سوو ئیستفادەتان لێکردووە؟**

عەبدوڵلای موهتەدی: ئاخر قەیناکا ئەو قسەیە دەکەن، بەلام دەڵێم قەزاوەتەکە کۆمەڵگا دەیکات، ئەگەر لەنێو هەموو کادرو ئەندامان و لایەنگران و خانەوادەی پێشمەرگەو خانەوادەی شەهیدو خانەوادەی زیندانی سیاسی هەموو تەیفی کۆمەڵەو ئەڵقەی کۆمەڵە زۆربەی لەگەڵ ئێمە بوو، تازە ئەو قسە جێی نامێنێ، بایەخی نامێنێ، ئەمە یەکەم.

دووەم: ئەگەر لەسەرجەمی کۆمەڵگای کوردستاندا ئێمە زۆرترین نفوزمان بوو، دەنگمان بوو، خەڵکمان بوو، ئەوانیش جاڵجاڵۆکە لەدەرگایماڵەکەیانیدا کەس دەرکەی ماڵی نەکردنەوە، قسەیەکیان ناخوات، تازە کەس باوەڕی پێناکات.

# هێشتا خەڵکی نارازی لەناو حزبی کۆمۆنیستدا هەن

***ئاساییە ئیستفادە لەناوی کۆمەڵە بکەن، وەکو تۆ جارێك وتت: من خۆم ئەو ناوەم داناوە، یان خۆم مونەسیسی بووم، یان قوربانیم لە پێناویدا داوە، چۆن وا بەئاسانی دەست بەرداری دەبم؟**

عەبدوڵلای موهتەدی: تەبعەن، سەرکردایەتی کۆمەڵەی پێشی پێکهێنانی حزبی کۆمۆنیستی ئێران زۆربەی لەگەڵ ئێمەیە، سەید برایم بەمن بڵێ کێی دیکە غەیری خۆی لەسەرکردایەتی پێش پێکهێنانی حزبی کۆمۆنیستی ئێران لەگەڵ ئەوان بوون؟ کەسیان لەگەڵ نییە، بەشێك کادری چاکیان لەگەڵ بوو، بەلام ئەوانیش ئێستا لەگەڵ نارازیان و حزبی کۆمۆنیستی ئێرانیان ناوێ و ژمارەیەك کەسن و کەسی قەدیمی باشیان تێدایە، بەلام ئەوان لەنارازییان و لەئۆپۆسزیۆنن، بێ دەست کراون، بێ دەنگ کراون.

***لەدوای ساغکردنەوەی کۆمەڵە رۆژی (19)ی رەزبەری (1379) لەمەراسیمی چەکداربوونی کۆمەڵێك لەکچان و کوڕان تۆ لەگووتارێکتدا وتت: "ئەو راوەستانەی چەند ساڵە داوێنی کۆمەڵەی گرتووە کۆتایی پێدێت"، خۆ پێشتر رۆژانە کچ و کوڕ دەهاتن بۆ ئاموزشگای پێشمەرگایەتی کۆمەڵە، ئەوەستابوو؟**

عەبدوڵلای موهتەدی: نا مەبەستم هاتنی پێشمەرگە نەبوو، ئەوە هەمیشە بووەو ئێستاش هەیە، بۆ ئەوانیش هەیە خۆ هەر بۆ ئێمە نییە، بۆ سەید برایم و حزبی کۆمۆنیستی ئێرانیش هەیە، مەبەستم ئەو وەستانە، وەستان لەخەباتی سیاسی و ناو کۆمەڵگای کوردستانی ئێراندایە، یانی حاڵەتێکی



رکود، حاڵەتێکی بێ دەنگی، بێ بەرنامەیی، بێ هیچ دەست پێشخەرییەك، حاڵەتی کرپوونی سیاسی، مەبەستم ئەوەیە، ئێمە ئەو کرپوونە سیاسییەمان شکاند، ئەو بێ دەنگییەمان شکاند، بەڕاستی ئەو گۆمە مەندەمان شڵەقاند.

***ئێوە دوای هاتنە دەرتان وەکو خۆت ناوی دەنێی لەحزبی کۆمۆنیستی ئێران، دیسان ئارمی سووری کۆمەڵەتان کردەوە بەیداخی کۆمەڵە یاخود ئارمی تایبەتی کۆمەڵە؟**

**عەبدوڵلای موهتەدی:** ئەو ئارمە پێش حزبی کۆمۆنیستی ئێران، ئارمی کۆمەڵە بوو، تەنها ئەستێرەکە لاچووە.

## باسی مارکسیزم، ماو و دیکتاتۆری پرۆلیتاریا لە بەرنامەی ئێمەدا نەماوە

---

***ئەو ئەستێرەیە دەلالەت نییە کە ئێوە هێشتا حزبێکی چەپ، مارکسی و ماوین؟**

**عەبدوڵلای موهتەدی:** نا هیچ پەیوەندی بەماوی نییە، و مارکسیش مەرج نییە، بەڵام حزبێکی چەپین بەڵێ خۆ ئەوە ناشارینەوە. لەهیچ جێیەکی ئەساسنامەی ئێمەدا ئەوەی تێدا نییە، تۆ ئەندامی ئێمەی پێویست دەبێ ماکسیزم بی، ئەوە مەسەلەیەکی بیروباوەڕییە، بەڵام پێویستە بەرنامەی سیاسی ئێمەی قبوڵ بێ، هەموو بەرنامەیەکی سیاسی هەموو حزبێك وایە، بەرنامە سیاسییەکەمان باسی مارکسیزمی تێدا نییە، باسی ماوی تێدا نییە، باسی دیکتاتۆریی پرولیتاری و ئەوانە نین، ئەوانەی تێدا نییە، بەڵام حزبێکی چەپین بەو مانایەی ئێستا بۆم باسکردی.

## کۆمەڵەو کۆمۆنیزمی کارگەری تەنها خوامان یەکە

---

***لەدوایین ڕاگەیاندنەکانی ئەوکاتەی کە خۆتان ساغکردەوە، وتتان" دەبێ ئێمە خۆمان لەگەڵ خەت و میراتی خەتی مەنسوری حیکمەت و کۆمۆنیزمی کرێکاری جیابکەینەوە، لەهەموو خەتێکتان" هیچ شتێکتان نەماوە، پەیوەندییەك، یانی هیچ شتێك نەماوە؟**

**عەبدوڵلای موهتەدی:** خودامان یەکە، فەقەت، بەڵام بەداخەوە کاك سەید برایم و حزبی کۆمۆنیستی ئێران هێشتا لەو میراتە تەغزییە دەکەن، نەیانتوانیوە خۆیان لەباری فیکری و نەزەرییەوە لەو



روانگانەوە رزگار کەن، گرفتی ئەسڵیان لەباری فیکرییەوە، ئەوان ئەو خۆ جیاکردنەوە، ئەو سنووربەندییە، ئەو پێداچوونەوە رەخنەگرانەی ئێمە کردمان هەرگیز ئەوان نەیانکردو بەشدارییان تێدا نەکردو بەوکارە خۆیان کۆڵەوار کرد. ئەگەر وایان کردبایە، ئەوان هەر هاورێی ئێمە بوون هەر لەگەڵ ئێمە بوون، وەنەبێ ئێمە خۆمان لەوان بەزیاتر بزانین و پێمان وابێ ئێمە بلیمەت بووین و ئەوان هیچ و پووچ بوون، وانییە قەتمان وانەوتووە، ئەوان بەرێگەیەکی خراپدا رۆیشتون، ئەگینا ئینسانی چاکن.

***لەدوای ساغکردنەوەی کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانی کوردستان، وەك تۆ وتت: "ئێمە هێزێکی بچووك بووین و تەنانەت چەند کەس لەسەرکردایەتیمان لەژوورێکدا خەوتووین، بەڵام ئێستا دەبینین ئەوەی کە ئێمە لێرە دانیشتووین، کۆمەڵێ بینای تازەو.. ئەمە دەلالەتە بۆ ئەوەی کۆمەڵە گەشەی کردووە، ئەو گەشەیە چاوەڕوانکراو بوو بە نیسبەت تۆومو ئەو گەشەیە خێرایییەکی بەرچاوی بەخۆیەوە بینیوە؟**

عەبدوڵلای موهتەدی: بەڵێ ئەو گەشەیە زۆر خێرایی بەرچاوی بەخۆیەوە بینیوە، بەڵام پێمخۆشە وەکو دەڵێن ئەمە نووکی کێوە سەهۆڵەکەیە، یانی گەشەی هەرە هەرە زۆری ئێمە لەناو کۆمەڵگای کوردستانی ئێرانە، بەڕاستی دەتوانم ئەوە بڵێم، لەنێو جەماوەری خەڵکدایە، لەنێو گەنجاندا، لەنێو خوێندەوارانـدا، لەنێو رۆشنبیراندا، لەبەشە جۆربەجۆرەکانی کوردستان، لەبەشی کرماشان و ئیلام، لەمهاباد کەپێشتر باسمکرد، لەهەموو جێیەك گەشەیەکی زۆر بەرچاوی کۆمەڵە، بەڕاستی گەشەیەکی بەرچاوی کۆمەڵەو رووتێکردنێکی بەرچاوی کۆمەڵە دەبینین، بەڵام ئایا چاوەڕوان دەکرا یان نا، چاوەڕوان دەکراو بەزیاتریشەوە.

هەر ئێستاش وادەبێ، یانی من پێموایە رۆژ بەڕۆژ زۆرجار گیروگرفتەکانی ئێمە بەپێچەوانەی دە ساڵ لەوەوپێش، گیروگرفتی ئێمە گیروگرفتی رکودو وەستان و دووری لەخەڵك و ئەوەبوو، بێ پەیوەندی بوون بوو، پەراوێز کەوتن بوو، ئەوانە یەکێك لەو هۆکارانە بوو هانی ئێمەی دا کە تەکانێك لەخۆمان بدەین و وەزعەکە چاك بکەین، گیروگرفتی ئێستامان ئەوەیە کە دەرەقەت نایەین، دەرەقەتی ئەو هەموو پەیوەندییەی دەرەوەو دەرەقەتی ئەو هەموو کارە نایەین، پێموایە رەهبەرییەکی بەتواناتری دەوێ، رەهبەرییەکی فراوانتری دەوێ، کاری چاکتری دەوێ، یانی خەڵکەکە ئێستا زۆر زیاترە لەوەی بەقەوارەی ئێستامان بتوانین هەمووی هەزم بکەین و بەباشی بەڕێوەی بەرین، بۆیە دەبێ ئێمە کاربکەین بۆ چاکسازی ناوخۆمان، یانی هۆیەکی بەحسی چاکسازی کە لەدوو ساڵ لەوەوپێش و بەنێو ئێمەدا هەیە بەبڕوای من لێرەوە سەرچاوە دەگرێ، چونکە چاکسازییەکە ئەوە نییە زۆر خراپ بین و چی لەخۆمان بکەین تۆزێك باش بین، چاکسازییەکە سەرچاوەکەی لێرەوەیە، رووتێکردنێکی



زۆر، پێشوازییەکی زۆر لەجاران زیاتر هەیە، ئەرکی زۆر هەیە، بواری زۆری خەباتمان بۆ کراوەتەوە جاران نەبوو، چۆن بەسەر ئەوانەدا زالٌ دەبین، کێشەی ئێمە ئەوەیە، بۆیە (180) دەرەجە لەگەلٌ کێشەی حزبی کۆمۆنیستی ئێران پێچەوانەیە، ئەوان کێشەکەیان ئەوەیە چ بکەن کەخۆیان لەخەلٌك نزیك بکەنەوە، رۆژ بەرۆژ ئەوان لەپەراوێزدان، من پێموایە هیچ کاریگەرییەکی نییە، نالٌیم هیچ بەمانا ریازی، بەلاّم هیچی واقیعیو سیاسی من پێموایە کاریگەرییەکی ئەوتۆیان لەسەر داهاتووی کۆمەلٌگای کوردستان نییە.

## ئێمە نەک ناوی حزبی کۆمۆنیست، کۆمۆنیستیشمان نەهێشتەوە

***دەکرێت پێم بلێن ئەوکوردایەتییە ئێوەی بردۆتە پێش، من زۆرجار لەگەلٌ خەلٌکێکی ئاوا دانیشتووم دەلٌی: کاکە من کۆمۆنیستم بۆچییە، من حزبێکی کوردیم دەویٌ بەبیٌ ئەوەی بگەڕێتەوە بۆ باکگراوندێکی ئایدیۆلۆژیو سیاسیو ئەوانە حیساب بکات، من حزبێکی کوردیم دەویٌ، ئێوە توانیوتانە بەکوردایەتی ئەو هەنگاوانە بنێن؟**

عەبدوللاّی موهتەدی: ئەوە حەتمەن بیٌ گومان یەکێك لەشتەکانی بووە، باسی ئەوەمکرد کە ئێمە سیاسەتێکی روونتر، ئاشکراترو باشترمان لەهی سەردەمی حزبی کۆمۆنیستی ئێران گرتۆتە بەر، خۆمان هێناوەتە ریزی پێشەوەی خەبات بۆ کێشەی کورد، لەسەر شانۆی سیاسی کورددا بەعینوانی حزبێکی کوردستانی چالاکی کە پێشنیاری هەیە،قسەی هەیە، کورد دەباتە پێشەوە، خەباتەکەی دەباتە پێشەوەو دلسۆزە، بەو عینوانانە جارێکی کە خۆیان ناساندۆتەوەو بەڕاستی کۆمەلٌەی جارانی پێش حزبی کۆمۆنیست هەروابوو.

یانی ئەمە یەکێك لەبوارەکانی گەورەی خەباتی ئێمەشو خەلٌکی کوردستانیشە، بێگۆمان ئەوە تەئسیری زۆریشی بووە، بەلاّم من تەنها نایبەمەوە سەر ئەوە، خەلٌك زۆر هەیە پێی خۆشە چەپ بێت، بەلاّم پێی خۆش نییە چەپێکی نامەعقولی نەگونجاوی دوور لەمێژوو، دوور لەواقیع بێت، پێی خۆشە عەدالەتی کۆمەلاّیەتی، پێی خۆشە ئازادی، پێی خۆشە حەقیقەتو راستی، پێی خۆشە گەندەلی نەبێت، پێی خۆشە دزی نەبێت، پێی خۆشە بیٌ ئینسافی نەبێت، عەدالەت هەبێت لەکۆمەلٌگادا، پێی خۆشە ژن ئازاد بێت، پێی خۆشە دینو دەولەت جیاببنەوە، من ئەوانە هەمووی بەوە دەزانم، خەلٌکانێکی زۆریش هەن جۆرێك لەچەپیان پیٌ خۆشە، بەلاّم نەك ئەو خوێندنەوەیەی ئەوان یان کۆمۆنیزمی کاریگەریی هەیەتی، ئەو جۆرە خوێندنەوەیە لەچەپ زەحمەتە.

بەهەرحاڵ ئەگەر ناوی بنێین چەپ، ئەو جۆرە خوێندنەوەیە خەڵك نایەوێ، باوی نەماوە، ناوی کۆمۆنیزمیش یەکێك لەوانەیە، خۆ من ئەوە ناشارمەوە ئەوە بەئاشکرا باسمانکرد، ناوی کۆمۆنیزمیش یەکێك لەو ناوانەیە کە خاسیەتی ئەوەیە، ئەمڕۆ خاسیەتی ئەوەیە رۆژێك لەڕۆژان کرێکاری لە دنیادا پێ کۆدەبووەوە، بەڵام چینە دەسەڵاتدارەکانی لێدەبوون بەدوژمن، ئەمڕۆ کرێکارەکە پشتت لێ هەڵدەکات، دەسەڵاتدارەکەش هەر لەگەڵت دەبێ بەدوژمن، ئەرێ خۆ من بۆ قیامەتم نییە، ئاخر ئەو ناوە بەکارم نایە، زەرەرم لێ دەدات، تۆ بەناوی کۆمۆنیستەوە .. هەر بەخۆیان بڵێن بچن بەناوی کۆمۆنیستەوە کاربکەن، خەڵك روویان تێناکات، خەڵك نایەوێن، لەگەڵ سەردەمی ئێمە گونجاو نییە، من دەڵێم گەر پەیامێك و مەسجێکیشت هەبێ بەو زمانەوە لێت وەرناگرن، دەی ئەوان ئەوەیان ناوێ، ئەویش کە دوژمنتە هەر لەکۆنەوە دوژمنی چینایەتیە، چینی دەسەڵاتدار، خۆ ئەویش هەر دوژمنتە، جیهان نایەوێ دوژمنتە، ناوچەکە نایەوێ، ئەی بۆچی ئەو ناوە هەڵگری، ئەی چ عەقڵێك ئەوە قبوڵ دەکات، ئێمە کارێکی زۆر زۆر باشمانکرد کەوێرای حزبی کۆمۆنیست، ناوی کۆمۆنیستیشمان نەهێشتەوەو بۆ ئەوە تەوزیحماندا، ئەوەش بەو مانا نییە کە ئێمە لەگەڵ ئامانجی عەدالەتخوازانەو یەکسانیخوازی نەماوین، بەڵام نە بەو ناوەو نە بەو زمان و شێوازە هیچ شتێکت بۆ ناچێتە پێشەوەو دەچیتە پەراوێزەوە لەمێژوو وسەردەمی خۆتدا هیچ کاریگەرییەکەت نابێ، تۆ دەتەوێت کاریگەرییت هەبێت؟ بەو جۆرە نابێت.

***کە ئەرکی حزب هەر ئەوەیە؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** کە ئەرکی حزب هەر ئەوەیە، ئەرکی سیاسی هەر ئەوەیە، ئەرکی تێکۆشەری سیاسی ئەوەیە زەمین و زەمانی خۆی بناسێ و بزانێ چۆن دەتوانێ کاریگەریی هەبێ، حەتا هەموو زمان و مەفهومەکانی خۆت هەڵبنابژێری، بەڕاستی رەوتی چوونەپێشی کۆمەڵگا شت دێنێتە پێشێ، تۆ ناتوانی بتۆرێی لەکۆمەڵگای خۆت و لەسەردەمی خۆت، دەبێت رێی خۆتی تێدا بکەیتەوە.

***دەمەوێت بڵێم ئەمە دەرئەنجامی ئەوە نییە پاش شکستی بلۆکی خۆرهەڵاتی و سۆسیالیزم، فەلسەفەی ناسیۆنالیزم و قەومگەرایی گەشەی کردوو ئێستا خەڵکی کوردستانی ئێرانیش ئەوەیان دەوێ؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** لەهەندێك جێگا گەشەی کرد، بەڵێ گەشەی کرد، ئەزانی چۆنە دنیا یەك دەست نییە، ئەوەی یەکێك لەتایبەتمەندییەکانی گەشە لەسەردەمی سەرمایەدارییدایە لەپاڵ ئەوەدا هەموو دنیا دەبێتە سەرمایەداری، یانی ئابووری دونیا هەمووی شێوازەکەی دەبێت بەیەك، پاشکەوتوو پێشکەوتووی هەیە خۆ ناڵێم یەك جۆرە، بەڵام لەهەمان حاڵدا وڵاتان تایبەتمەندی خۆیان رادەگرن، لە ئەورووپا ناسیۆنالیزم خەریکە کەم دەبێتەوەو ئەورووپییەکان خەریکن یەك دەگرنەوە



# سەیرە چەپ بی و خەمی نەتەوایەتیت نەبێ

***بەڵام کێشەیەکی نەتەوەییان نەماوە ئەوان؟**

**عەبدوڵلای موهتەدی:** ئاخر باشە، هەر خۆی دەسەڵاتی دەوڵەتی نەتەوەیی بەقازانجی یەکێتی ئەورووپا کەم دەبێتەوە، یانی خەریکە سنووره نەتەوەییەکان بۆ گەشەی کۆمەڵایەتی لەوێ ئیتر تازە بەرتەسکن، لەوێ دەوڵەتی میللی و سنوری میللی بەرتەسکە بۆ گەشەی ئابووری، کۆمەڵایەتی، سیاسی و تەکنەلۆجی و فەرهەنگی مرۆڤایەتی ئەوێ، بۆ ئێرە پێکهێنانی کیانێکی نەتەوەیی مەرجی پێشکەوتنی کۆمەڵایەتییە. ئەسڵەن بۆیە من دەڵێم ئەگەر تەحلیلێکی ماتریالیستی مێژوویت هەبێت، دەبێت ئەمە تێبگەیت، وەکو چەپێك دەبێت ئەمە تێبگەیت کە مێژووی تۆو مێژووی ئەم سەردەمە چ دەخوازێ، یانی پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی لێرە عەینەن هەمان مانای نییە کە ئێستا لەئەورووپا هەیەتی، تۆ لێرە جارێ هیچ کۆمەڵگایەکی مەدەنیت نییە، لەوێ رەنگبێ لێی تێپەڕیبن.

تۆ لێرە کیان و وجودییەتێکی نەتەوەیت نییە، پێناسەکەت پێشێل دەکرێت، مافت پێشێل دەکرێت، بەو هۆیەوە ئەسڵەن بەس بەخاتری ئەوەی کە کوردیت راگواستنی زۆرەملێیت لەگەڵ دەکەن، ئەنفالت دەکەن، کیمیابارانت دەکەن، بەس بەخاتری ئەوەی کوردیت ناتهێڵن، لەئێران لەهیچ ئیدارەیەك داتنامەزرێنن، فەرعێکی چکۆڵەی بانکیش نادەن بەکوردێك بەڕێوەی بەرێت، بەخشدارو فەرماندارو تاکو دەگاتە ستانداریێکی کوردیشت نادەنێ، لێرەدا لەم وڵاتەدا بەدەستهێنانی مافی نەتەوەیی نەك هەر وەکو لەڕوانگەیەکی قەومی و نەتەوەییە، لەڕوانگەی گەشەکردنی کۆمەڵایەتیشەوە هەنگاوێکە بۆ پێشەوە کە مرۆڤی کورد هەڵی دەگرێ یان بڵێین کە مرۆڤایەتی لەم بەشەی خۆیداو لەڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستداو لەخاکێك بەناوی کوردستان مرۆڤایەتی هەنگاوێك بۆ پێشەوە دەنێت ئەگەر مافە نەتەوایەتییەکانی بچەسپێ، ئەگەر کیانێك و بوونێك و مافێك بۆ خۆی بسەلمێنێ، بۆیە لێرە من بەپێشکەوتنی دەزانم، لێرە کێشەی نەتەوەیی لەخزمەتی پێشکەوتنی ئینساندایە، لەکوردستان وا هەڵکەوتووە کە کێشەی نەتەوەیی زۆر زۆر پەیوەندییەکی نزیکی لەگەڵ دیموکراسیخوازی هەیە، ئێستا ئەوە دەبینین هەیەتی، ئەوەی ستەمت لێدەکات دیکتاتۆرە، تۆ لەداخی ئەویش بێت بووی بەدیموکراسیخواز، بۆیە کەوتویە بەرەی دیموکراسیخوازییەوە، یانی لەڕاستیدا ئەمە بزووتنەوەی نەتەوەیی کوردی کردووە بەخاوەنی خەسڵەتێکی پێشکەوتنخوازانەی زۆرتر، عەدالەتخوازانەی زۆرتر، ئەسڵن پێم سەیرە کەسێك چەپێکی راستەقینە بێ، لایەنگری ئینسانیەت بێ لەدوونیادا، بەڵام خۆی تێکۆشەرێکی خەبات لەڕێگەی ئەم رزگارییە نەتەوەییەدا نەبێ، چونکە من ئەو خاسیەتە چاکانەی تێدا دەبینم. نەبوونی کیانێك بۆ کورد لەباری ئابووریشەوە زەرەری لێداوە، خەڵکی هەژار کردووە، خەڵکی کردووە بەوەی نان لەدەستی خەڵکی وەرگرن، کوردستان ئابوورییەکی نییە،



ئابووریەکی نییە، کانگاکانی بەتاڵان دەبەن، نەوتەکەی بەتاڵان دەبەن، کشتوکاڵی وێران بوو، ئاخر لەتەکنەلۆژی ناهێڵن کەڵك وەرگرێ، لەبەرنامەی پەرەسەندنی ئابووری ئێراندا هەرچی کانگایە لەکوردستان دەری دێنن هیچی لەوێ بەکارناهێنن، یانی پرۆسیسی ناکەن لەوێ، دەیبەن لەدەرەوەی خاکی کوردستان، کە سنووری کوردستان تەواو بوو لەوێ دەیکەن بە قورگی مەعمەلەکاندا، بۆیە دەڵێم ستاندنی مافی نەتەوەیی رێگە دەکاتەوە بۆ گەشەکردنی ئابووری ئەم کۆمەڵگایەش، پێم سەیرە چەپێك و سۆسیالیستێك لەوانە تێنەگات، مەگەر ئەو جۆرە بیرکردنەوە سەیرو سەمەرەیەی مەنسوری حیکمەت چووبێتە مێشکی ئەو کەسانەی حزبی کۆمۆنیستەوە، دەنا کەی ئێمە جاران لەکۆمەڵە ئاوا بیرمان دەکردەوە.

جارانیش چەپ بووین خۆمان بەپێشەنگی خەباتی نەتەوەخوازی لەکوردستان دادەنا، تۆ بەمن بڵێ بەدەستهێنانی مافی نەتەوەیی لەکوردستان، یەك تاقە زەرەری کۆمەڵایەتی هەبێت، هەتا رێ بگرێ لەخەباتی چینایەتی داهاتوو، ئاخر رێ ناگرێ، ئەگەر سبەینێ کوردستانێکی گەشەکردوو، من دەڵێم لەئێستاوە ئازادی سیاسی بدە، ئازادی خەباتی کرێکاران بدە، ئازادی ئیتیحادیان بدە، ئازادی نەقابەیان بدە، بۆیان بەرەسمی بناسە، ئێمە بۆیە دەڵێین خەباتی پێشکەوتنخوازانەی کۆمەڵایەتی و خەبات بۆ چارەسەرکردنی کێشە کۆمەڵایەتییەکان، ئێمە بەدووری نازانین، بەنزیکی دەزانین لەگەڵ خەباتی بۆ رزگاریی نەتەوەییش، رەنگبێ زۆر زیاترو بە فۆرمولبەندی جیاوازتریش بتوانی ئەوە بڵێی، بەلام بەگشتی من مەبەستەکەم ئەوەبوو کە بڵێم رزگاری نەتەوەیی کورد شتێکی زۆر عادیلانەیە و شتێکی زۆر جێی خۆیەتی و ئەگەر ئێمە بتوانین وەکو کۆمەڵە وەکو حزبی کۆمەڵە جوان ئەوە بەرێوەبەرین لەپاڵ ئەوەشدا ئێمە بین خاوەنی کێشە کۆمەڵایەتییەکان.

***رێکخستنەکانی کۆمەڵە لەناو ئێران گەشەیەکی بەرچاویان کردووە؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** زۆر.



## ئەو جەماوەرەی جاران بەسێ مانگ دەهات
## ئێستا بەیەک رۆژ دێ بۆ ناو کۆمەڵە

---

*چۆن؟ یانی نفوزی ئەو رێکخستنانە تەقدیریەن گەیشتۆتە چەند؟

عەبدوڵلای موهتەدی: ئاخر ناتوانم بڵێم گەیشتۆتە چەند.

*ئامارێکت لا نییە؟

عەبدوڵلای موهتەدی: ئامارێکم لا نییە، بەڵام لاشم بوایە باسم نەدەکرد، ناتوانم ئەوە بڵێم، بەڵام بەس ئەوەندە دەڵێم کە ئەگەر بڵێین مەسەلەن جاران لەسێ مانگدا، لەوەرزێکی ساڵدا چەندە خەڵکمان بۆلا دەهات، ئێستا لەرۆژێکدا دێن، ئەوە بەموبالەغە مەزانە هەر بەڕاستی وایە، بێجگە لەوەی کە زۆر کەسیش هەیە هەمووی نایە بۆ ئێرە، بەهۆی ئەوەی ورده ورده تەکنەلۆژی تازەی ئینتەرنێت و ئەوانە هاتوونەتە ئاراوە، زۆرکەس لەو رێگایەوە لەپەیوەندیداین، زۆرکەس بە تەلەفۆن لەپەیوەندیداین، زۆرکەس ئێمە خەڵك دەنێرین تا بیبینێ تا ئەوبێ، بەڵام بەس ئەوانەی خۆیان بەپێی خۆیان دێنە ئێرە، من جارانیش بوومە ئاخر لەوکارانە دەزانم، یانی بەسێ مانگ ئەوەندە نەدەهات کە ئێستا بەرۆژێك بۆمان دێت، بێجگە لەوە خەڵکەکە کێیە، نەك هەر خەڵکی کادری کۆن و تێکۆشەرانی دێرینی کۆمەڵەمان لەناو کوردستانی ئێران بووژاندۆتەوەو لەدڵ ساردی هێناومانەتە دەرێ و گەشاونەتەوە، کە ئەوە خزمەتێکی گەورەیە بۆ خۆی لەرکود هێنامانە دەرێ، ئومێدێکمان پێداون، بەڵام لەپاڵ ئەوانەدا زۆر خەڵکی تازەو زۆر خەڵکی خاوەن نفوز، بەڵێ گەنجانمان زۆر لەگەڵە، بەڵام هەر ئەوە نییە بڵێم تەنها بەگەنجەکان ئاوەدان بووینەتەوە، زۆر خەڵکی خاوەن نفوزو خەڵکی بەتەمەن، خەڵکی بە ئەزموون، خەڵکی ناسراو لەکوردستانی ئێران پەیوەندیمان پێوە دەکەن.

## کۆمەڵە، ئێستا لە کوردستان چالاکترین حزبە

---

*هەرکەس بێتە ئێرە وەریدەگرن، یانی مەبەستم خەڵکی باش هەرکەس بێتە ئێرە ئێوە وەری دەگرن و رەتی ناکەنەوە؟

عەبدوڵلای موهتەدی: ئێمە زۆر پێمان خۆش نییە بەتایبەتی لەم سەردەمەدا، رەنگبێ دوایی ئاڵوگۆڕی تێدا بێ، بەڵام ئێستا زۆرێك لەو کەسانەی دێنە ئێرە نایانکەین بەپێشمەرگە، دەیاننێرینەوە



بۆ كوردستانی ئێران لەوێ كاربكەن، تاقمێكی چكۆڵەیان لێ وەردەگرین وەكو پێشمەرگە، ئەوەی لەوێ كاری چاكتری پێدەكرێ، بۆ لێرە بیكەین بە پێشمەرگە.

***دەكرێ جوابی ئەوەم بدەیتەوە كۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتكێشانی كوردستان ئێستا یەكەم حزبی بەنفوزی كوردستانی ئێرانە، یان بەهێزترین ڕەوتی سیاسییە؟**

عەبدوڵلای موهتەدی: پێموایە چالاكترینە، بەڵام ئایا ئەگەر هەڵبژاردنێك ببێت، هەڵبژاردنێكی ئازادانە، حەتمەن ئێمە سەرەكیترینین؟ ناتوانم ئەوە بەتەئكید بڵێم، بەڵام ئەو ڕاپۆرتانەی بۆمان دێ شتی ئاوا دەڵێن، بەڵام تۆ هەمیشە ئەو ڕاپۆرتانەی بۆت دێ دەبێ بەحەزەرەوە وەریبگری.

# شاری سنە، قەڵای كۆمەڵەیە

***ئەو شارانە كوێیە كە نفوزی كۆمەڵەی تێدایە، بۆ نموونە سنە وا ناسراوە كە قەڵای كۆمەڵەیە؟**

عەبدوڵلای موهتەدی: هەرواشە.

# لەموكریان و مهاباد جێمان قایم كردوە

***موكریان و مهاباد وا ناسراون كە قەڵای دیموكراتن، بەڵام ئێوە دەڵێن چونتە ئەوێوەو ئێستا ئەو نفوزەتان كەم كردۆتەوە؟**

عەبدوڵلای موهتەدی: هەر زۆر زۆر، ئێمە كەممان نەكردۆتەوە، تەبیعەتی كاری خۆیان، گۆڕانی كۆمەڵگای كوردستان و پێشكەوتنەكانی و هەروەها چالاكی زۆری ئێمە لەم ساڵانەی دواییدا هەر زۆر زۆر لەمەسەلەكەی گۆڕیوە، یەك پێشكەوتنی گەورە یان گۆڕانكاری گەورە لەكاری ڕێكخستنی سیاسی ئێمەشدا ئەوەیە، ئێمە بەتەواوی پەلمان بەرەو كرماشان و ئیلام هاویشتووە.

***هەر بەسیاسەتی خۆتان واتانكردووە، مەبەستتان بووە پەلبهاوێژنە ئەو ناوچانە كە چەند وەختە فەرامۆش كرابوو؟**

عەبدوڵلای موهتەدی: ئاخر یەكێك لەشتەكانی ئێمە ئەوەیە ئەو دوو پارێزگایەش كوردنشینن، وە ئێمەش ئەسڵەن ستراتیجی كۆمەڵە لەكوردستان بەسەراحەت ئەو شتە دەڵێ، دەڵێ: خستنەوە سەریەكی هەموو بەشە كوردنشینەكان، ئوستانەكانی و ڕۆژئاوای ئێران و پێكهێنانی یەكەیەكی



سیاسی و ئیداری لەوان بەناوی کوردستان و خاوەن دەسەڵاتکردنی ئەو خەڵکەی کوردستان بەسەر سەرزەمینی مێژوویی خۆیاندا، ئەوە بەرنامەی ئێمەیە بۆ کوردستان.

## لەئیلام بەهێزە (pkk)

***بەس من ئەوەندەی ئاگادار بم( pkk ) زیاتر چۆتە ناو خەڵکی ئیلامەوەو توانیویەتی نفوزێکی گەشەکردووی لەوێدا هەبێت؟**

**عەبدوڵلای موهتەدی:** بەڵێ، نفوزیان هەیە، راست دەکەیت.

***بۆ ئێوە پێشتر ئەو هەلەتان نەقۆزتەوە، مەبەستم لەدەورانی زووتردا؟**

**عەبدوڵلای موهتەدی:** ئاخر لەدەورانی زووتردا.. بزووتنەوەی کوردی خۆی قۆناغ بەقۆناغ، لەباری جوگرافیاییشەوە چووەتە پێشەوە، هەمووی بەدەست حزبەکان نییە، هەر مێژوویی وا چۆتە پێشەوە، لەمهابادو موکریانەوە ئەم بزووتنەوەی کوردایەتییە سەری هەڵداوە، بەڵام لەشۆڕشی گەلانی ئێران و بەملاوە لە (26) ساڵ لەوەوپێشەوە، سنە بەفراوانی، ئاوا بەجەماوەری لە (25)و(26) ساڵ لەوەوپێشەوە هاتنە نێو خەباتی رزگاریخوازانەی کوردی بەجەماوەرو ئەمەش شانازییەکەی بۆ کۆمەڵە دەمێنێتەوە لەژێر رەهبەریی کۆمەڵەدا بوو کە سنەو بەشی ئەردەڵانی کوردستانی ئێران ئاوا هاتنە نێو کورەی خەباتەوە، جاری داهاتوو نۆبەی کرماشان و ئیلامە، پێموایە ئەم جارە تەکانێك لەئێران ببێت، ئاڵوگۆڕێك ببێت، پێموایە کرماشانیش و ئیلامیش بەخڕی و بەجەماوەری دێنە ناو بزووتنەوەی کوردییەوە.

## پژاک داهاتوویان نییە و رەسەن نین

***بەڵام ( پەژاك )یش نفوزێکی گەورەی لەو شوێنانەی تۆ باست کردوو لەکوردستانی ئێران هەیە؟**

**عەبدوڵلای موهتەدی:** داهاتوویەکیان نییە، ئەوان سەر بەجێیەکی دیکەن، رەسەن نین، ریشەیەکیان نییە، لەنەبوونی خەڵکی دیکەدا ئەوان بوون بەشت.

## (pkk) روو لەشکستە

***یان لەسستی چالاکییەکانی ئێوە، لەخۆ خەریککردنی ئێوە بەململانێکانی ناوخۆتان، هەستتان نەکرد پەژاك و چەند هێزی تر هاتنە ناوەوە؟**

عەبدوڵای موهتەدی: یەکێك لەزەرەرەکانی پێکهێنانی حزبی کۆمۆنیست و دوای ئەوەش بەردەوام مانەوەی تولانی لەوێدا رێك ئەوەبوو کە بۆشاییەکی گەورەی بەجێهێشت، دیارە هەم دیموکرات بەشێوەی خۆی بۆشایی بەجێهێشت، هەم کۆمەڵە بۆشایی بەجێهێشت، بۆیە حەرەکەتی وەکو پەژاك و ئەوانە ماوەیەك بوو، خۆشتان دەزانن ئەستێرەی پەکەکە روو لەگەشانەوە بوو، چونکە پەژاك حزبێکە سەر بە پەکەکەیە، خۆ حزبێکی سەربەخۆ نییە، لەراستیدا لقی پەکەکەیە بۆ کوردستانی ئێران، بەڵام ئەو وەزعە گۆڕاوە، پەکەکە وەکو خۆی نەماوەو روو لەنشستە، لەهەموو بەشەکانی کوردستان و هەروەها لەکوردستانی ئێران روو لەکزییە، بۆیە روو لەتەرەقی و گەشە نین، روو لەکزین و هاتنە خوارەوەن، بێجگە لەوە ئێمە خەریکین پر بەپڕ جێی خۆمان پردەکەینەوەو پێشبینی من ئەوەیە، دیارە خۆ ناکرێ بڵێی سەدی سەد ئەوەیە، بەڵام پێشبینی من ئەوەیە ئەوان هەر روو لەکزی دەڕۆن.

***تۆ بۆ خۆت وەك عەبدوڵای موهتەدی، وەکو سەرکردایەتی کۆمەڵە دەتوانن هەیمەنە بکەن بەسەر یاخود لەدەسەڵاتتاندایە، لەتاقەتی ئێوەدا هەیە ئەو هەموو نفوزە وەربگرن و تاقەتتان بەسەریدا بشکێ و کۆنترۆڵی بکەن؟**

عەبدوڵای موهتەدی: سەرەتاکەی زەحمەتە، دەنا گەورەترین سەرچاوەی ئینسانی و سەرچاوەی کادر برۆ لەکرماشان بەدەست بهێنە، خۆ ئەگەر خەڵکت لەگەڵ کەوت هەر ئەوەنییە تۆ ئیدارەیان بکەیت، بەحیسابی هێزی ئینسانی دەوڵەمەندت دەکات، ئەو هەموو خەڵکە بەئەزموون و تێکۆشەرو خوێندەوارە هەن و زۆرتریش پێکدێن، ئەوانە هەر هیچ موشکیلەمان نییە، بێگومان دەیکەین.

## حزبی کۆمۆنیست ئیلام و کرماشان بەکوردستان نازانن

***تۆ هەر ئەوە بەرنامەت بوو لەسەرەتاوە کە هاتیتە دەرەوە لەحزبی کۆمۆنیست؟**

عەبدوڵای موهتەدی: پێش حزبی کۆمۆنیستیش کەس لەنێو ئەواندا ئەو قسەیەی لێنەدەبیستم، بەگاڵتەیان دەزانی، هەمیشە پێموابووە ئێمە دەبێ رووبکەینە کرماشان، نموونەیەکت بۆ دێنمەوە، ئێمە باسی کرماشان و ئیلام و ئەو جۆرە شتانە دەکەین، یەکێك لەسەرکردایەتی حزبی کۆمۆنیستی



ئێران بەناوی کاك حەسەنی رەحمان پەنا بەگاڵتە باسی دەکات دەڵێ: باشە گەر کرماشان و ئیلام دەکەنە کورد، بۆ تا خەلیجی فارسیش ناچن بیکەنە کورد، یانی لێرەدا هەڵوێستی شۆڤێنیستە فارسەکان دەگرێ، کرماشان و ئیلام هەر بەکورد نازانێ و گاڵتەی بەو حزبە دێ کە خەریکە کار دەکات لەنێو ئەو بەشانە لەکوردستان، خۆ لەباری ئەتنیکییەوە هەر کوردن، بەڵام لەباری سیاسییەوە دەیانخاتەوە سەر بزووتنەوەی کوردی، ئەمە ئەسڵەن یەکێك لە ئەرکەکانی ئێمەیە، بەئەرکێکی گەورەی خۆمانی دەزانین کە ئەوانە بخەینەوە سەر بزووتنەوەی سیاسی کوردی بەبێ لەبەرچاوگرتنی جیاوازییەکان، بەبێ لەبەرچاوگرتنی جیاوازی مەزهەب و ئایین و ئەوانە.

دیارە هەرکامە تایبەتمەندی خۆی هەیە و دەبێ رێزی لێبگیرێ، بەڵام لەهەمانحاڵدا من ئەوە بە سەرکەوتنێکی گەورە دەزانم ئەگەر کۆمەڵە بتوانێ، بەخزمەتێکی زۆر گەورەی دەزانم ئەگەر کۆمەڵە بتوانێ وا کار بکات کە زەمینەکەش ئامادەیە، دیارە کۆمەڵە نایخوڵقێنێ، زەمینەیەکی هەیە کە ئەو دوو بەشانەش لەگەڵ سەرجەمی بزووتنەوەی رزگاریخوازانەی کوردستان تێکەڵ بنەوە.

# خەڵک دوای کۆمەڵە کەوتون نەک موهتەدی

***دەتوانی پێم بڵێی خەڵك، لەو خەڵکانەی کوردستان دوای عەبدوڵای موهتەدی کەوتوون، یان دوای سیاسەتی کۆمەڵەی شۆڕشگێڕانی زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێران کەوتون؟**

**عەبدوڵای موهتەدی:** ئەوان دوای سیاسەتی کۆمەڵە کەوتوون، بێگومان ئاوایە و هەر دەشمانەوێ ئاوابێ، یەکێك لەپێناسەکانی کۆمەڵە ئەوەیە سیاسەتی حزبەکەی، خزمەتی حزبەکەی، ئامانج و هەدەفی حزبەکەی ئەوانە بکاتە بەرژەوەندێکی باڵاتر تا هیچ تاکێکی تر، بەڵام بێگومان تاکەکانیش دەورێکیان هەیە، خۆ ئەوە ئاشاردرێتەوە لەهەموو دونیا بەتایبەتی لەو دونیایانەی نەوعی ئێمە، دەورێکیان هەیە خۆ رەنگە خەڵکانێکیش بن پێیان وابێ من دەتوانم لەئاستێکی باشدا، لەئاستێکی سەرەوەدا خزمەت بۆ کوردستان بکەم، پێیان وابێ کە قسەم پێیە، پێیان وابێ دەتوانم سەری خەڵکی کورد بەرزبکەمەوە، شتێکیان رەنگبێ هەر لەڕابردووی کۆنەوە لەمن دیبێ، بەهەرحاڵ من بم یان هەر کەسێکی تر، کەسایەتیش لەهەموو حزبێکدا دەوری خۆی دەبینێ، ئەو کەسایەتیەش بەتەنیا من نیم، ئێمە زۆر کەسایەتی ناسراومان هەیە لەنێو کۆمەڵەدا دەیان ساڵ، بیست بیست و پێنج ساڵ ئەزموونی خەباتیان هەیە و لەنێو خەڵکدا بوون و ئیمتیحانیان داوە لەسەردەمە سەختەکانداو سەرکەوتوو و رووسوور لەو ئیمتیحانە هاتوونەتە دەرێ، هەمووی ئەوانە تەئسیریان هەیە.



## نامەوێ دیکتاتۆر و پێغەمبەر بم

***وەك کارێزما نەناسراوی؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** من بۆ خۆم چووزانم، ئەوە دەبێ خەڵك ...

***حەز دەکەی وەك کارێزما بناسرێی؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** کارێزما چییە؟

***شەخسییەتێکی سیمبولییە، زۆرجار خەڵك تا ئەو رادەیەی دەیپەرستن؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** من پێمخۆشە هەموو شتێك لەوانە گەشەکردن و پێشکەوتنی کۆمەڵە لەسەر ئەساسی تەعەقول بێ، نەك لەسەر ئەساسی هیچ جۆرێك لە عەبدایەتی و کۆیلەیەتی ئینسان، من ئەو گەشە کردنەم بەدڵە بۆ کۆمەڵە و نفوزی کۆمەڵە، ئەو خۆشەویستییەی خۆشم بەدڵە و ویژدانم لێی ئاسوودەیە کە عەقڵ و هەڵبژاردن و عەقلانیەتی تێدابێ و زۆرتر بەدی بکەم تا هیچ جۆرێك بڵێم کۆمەڵگایەکی هەموو عەبدو چاو لەسەرەوەن و تەنها کەسێك یان تاکێك دەپەرستن.

پرۆژەکەی ئێمە ئاوا نییە، پرۆژەی کۆمەڵە ئاوا نییە، یانی ئێمە وەختێك، رۆژێك لەرۆژان ئەگەر تەعەقول و عەقلانیەت، بیرکردنەوە، وشیاریی سیاسی، هەڵبژاردن، ئەگەر ئەوانە میلاك بن کۆمەڵە سەردەکەوێ، ئەوانە میلاك نەبن ئەمرۆش منیان خۆشبوێ و بەو حیسابە لەگەڵ کۆمەڵە بەرێکەون، بەڵام سبەی رۆژ خەڵکێکی ئاوا گوێ لەمست و فەقیرحاڵ هەر دەبنە هێزی ئەحزابی دیکە، هێزی رەوتی دیکە، هێزی ئێمە هێزی ئاگایی و تێگەیشتنی خەڵکە، بەڵام لەپاڵ هەموو ئەوانەشدا رەنگبێ ئەو خۆشەویستییە، خەڵك هەست بکەن کەسایەتیەکیش پێویستە، ئەوەش دەوری خۆی ببینێ یان ئەگەر بەو مانایە بێ بۆمباسکردی لەو چوارچێوەیەدا قەیناکا دەورببینی منیش یان هەر کەسایەتییەکی تریش لەکۆمەڵەدا بێگومان جێی شانازی و خۆشحاڵیە، بەڵام نە دەمەوێ دیکتاتۆرێك بم، نە دەمەوێت پێغەمبەرێك بم، نەك هەر خۆم نامەوێ پێمخۆشە وەها کۆمەڵە خزمەت بکا هیچ کەسی تریش نەتوانێ ببێ.



# لەداهاتوودا قەسر و قسور دروست ناکەم

***بەڵام دوایی هەموو ئیمتیازەکانی بۆ تۆ دەگەڕێتەوە وەکو سکرتێری حزبەکە، زۆربەی زۆری ئیمتیازەکانی بۆ تۆ دەگەڕێتەوە، وانییە؟ یانی وەکو ئەوەی کە تۆ دەتەوێ کۆمەڵە ببێ بەحزبێکی گەورە لەکوردستاندا، هەموو کوردستان داگیر بکات، زۆربەی ئەوکابینەیە ئەو پێکیبهێنێ، زۆربەی ئەو دەسەڵاتە بەدەست ئێوە بێ، زۆربەی خەڵك لەگەڵ ئەو بێ، ئەمە بۆ کۆمەڵەو لەناو کۆمەڵەشدا ئەم ئیمتیازانە دەگەڕێتەوە بۆ عەبدوڵای موهتەدی نەك بەو شکڵەی ئەمە لەناو کۆمەڵەدا، ئەمە سیاسەتێکی عومیە لەناو حزبی کوردیدا هەمیشە قائید، سکرتێری حزب لەهەرەمی دەسەڵاتدایە، زۆربەی ئیمتیازەکان بۆ خۆی دەبا؟**

**عەبدوڵای موهتەدی:** ئاخر ئیمتیاز بەچی دەڵێی، ئەگەر من قەسرو قسورم دروستکرد، حەقی گلەیی و رەخنەت هەیە، خەیاڵم نییە ئەو کارە بکەم، ئەگەر لەچوارچێوەی یاسا چووەمە دەرێ، لەچوارچێوەی ئەخلاقی مرۆڤانە چوومە دەرێ، ئەگەر بووم بەدیکتاتۆرێك جوابی هیچ کەس نەدەمەوە، ئەگەر هەموو مەسڵەحەتێکی حزبی و مەسڵەحەتی کۆمەڵگای خۆم بخەمە پێناوی ناوو شوهرەت و سەروەت و مەکاسبی خۆم، دیارە ئەو وەختە ....، هیواداریشم وام لێنەیەت، بەڵام لەهەموو دونیادا نەك هەر لەکۆمەڵگای کوردیدا، لەهەموو دونیادا کە حزبێك سەرکەوت هەر کەسێك دادەنێن بەقائید، بەلیدەر، بەسەرکردە، تۆ هەر ناوێکی لێ بنێ، لەبەریتانیای دیموکراتیش حزبی لەیبەر دێتە سەرکار، تۆنی بلێر دەبێتە سەرۆك وەزیر، هەموو کەس نابێ بەسەرۆك وەزیر، بەڵام وانییە خۆ هەموو سەروەت و سامان و ئیمتیازاتی بەریتانیا بخاتە گیرفانی خۆی.

من عەقیدەم بە شەفافیەتی ئەحزاب، شەفافیەتی دەوڵەت و شەفافیەتی ئەو سەرکردانە هەیە، ئەو کەسانە هەیە کە لەئاستی سەرکردایەتیدا خزمەتدەکەن، پێموایە دەبێ سەروەت و سامانیان مەعلوم بێ و خەڵك بزانن مەعاشێکی کە وەری دەگرن لەحزب دەبێ ئاشکراو عەلەنی بێ لەدواڕۆژی خۆیاندا، هەر لەئێستاشەوە تا دواڕۆژ، بەهەرحاڵ ئەوەیان مەعلوم بێ، پێموایە ئەو کەسەی خەباتی کردووە حەقی هەیە سبەینێ خۆ نابێ بەهەژاری بژی، بۆ بە هەژاری بژی، من لەگەڵ ئەوە نیم، پێموایە دەبێ وای لێبکەیت کە ژیانی بێ، ئاسوودەیەکی بێ، بەڵام پێمخۆش نییە مەسئولانی سبەی رۆژی حزبی، دوای سەرکەوتن، ببن بەچینێکی سەرمایەداری تازە، سەرمایەداری مەسئولین، ئەوەم قبوڵ نییە. نابێ بهێڵین ئەوە ببێ.

ئەگەر کۆمەڵە بیەوێت خزمەت بەکۆمەڵگای کوردستان بکات و شتێکی نوێ بببینێ، رێك یەکێك لەشتەکانی ئەوەیە کە هەوڵ بدات دەوڵەتێکی پاك و خاوێن بێ گەندەڵی و خزمەتگوزار بۆ کوردستان



پێك بێنێ، من ئەوە بە گەورەترین خزمەت دەزانم، دەوڵەتێکی شەفاف، قابیلی لێپرسینەوە، قابیلی رەخنەگرتن و قابیلی گۆڕان بەرەئی خەڵکی و بەخواستی خەڵکی.

# دەمتوانی ببمە ملیاردێر، بەڵام خزمەتم کرد

***حەز دەکەیت لەمیتینگەیەکی جەماوەری بەرفراواندا خەڵك هاوار بکات: بـژی عەبـدوڵای موهتـەدی، بژی عەبدوڵای موهتەدی؟**

عەبدوڵای موهتەدی: ئەگەر بزانم لەتام دەچێتە دەرێ، پێم خۆش نابێ، هەموو کەس پێی خۆشە، خۆشەویستی خەڵك بێ، هەموو کەس پێی خۆشە قەدری زەحمەتەکانی بزانن، من فەقەت ئەوەی لەناو کۆمەڵەدا بووم لەرۆژی دامەزراندنییەوە تا ئەلعان (36) ساڵ تێپەڕیووە، زۆرم چەرمەسەری دیوە، زۆرم زیندان دیوە، زۆرم تێهەڵدان دیوە، ژیانی پێشمەرگایەتیشم دیوە، برسێتی، رووتیەتی، زۆر هێرش کراوەتە سەر کەسایەتیەکەم، زۆر تاوانبارکراوم و هیچی حەق نەبووە، لەبەر ئەوە من وەکو ئینسانێك پێمخۆشە ئەو کۆمەڵگایە قەدری زەحمەتەکانی من بزانێ، من دەمتوانی ملیۆنێر بم، دەمتوانی ملیاردێر بم، دەمتوانی مامۆستای زانکۆ بم، زۆر شتم دەتوانی ببم، من خۆم بۆ خزمەت بەختکردووە، هیچ پێم ناخۆش نییە وەختێك تەمەنم بەنێوەچوو، لەئاخریەکانی عومری خۆمدا ئەگەر بژیم، پێمخۆشە قەدری زەحمەتەکانم بزانرێ.

***ئەمەت باشتر نییە لەملیۆنێرییەکەت؟**

عەبدوڵای موهتەدی: من بۆ خۆم پێمباشترە.

***خەڵکیش پێیوایە باشترە؟**

عەبدوڵای موهتەدی: دەزانم خەڵکیش پێی باشترە، بەڵام بۆ خۆشم ویژدانم ئاسوودەترە، بەڕاستی ویژدانم ئاسوودەترە، من سەرەڕای ئەوەی لەبنەماڵەیەکی هەژار نەبووین و ناڵێم ماڵمان دەوڵەمەند بووە، بەڵام تەواوی عومری خۆم لەسەرەتای گەنجیمەوە تا ئەلعان بەهەژاری ژیاوم، ئەو وەختانەش کە بە تەواوی هەژار نەبووم زۆر بەسادەیی ژیاوم بەنێستاشەوە، بەڵام هەست بەهیچ کەموکورتیەك ناکەم، یانی حەسوودیم نییە بەو کەسەی دەوڵەمەندە.



## پێمخۆش نییە بکوژرێم، بێترس نیم

***ئەی ناترسی رۆژێ بکوژرێیو ئەو ئاواتانەت نەیەتەدی؟**

**عەبدوڵای موهتەدی:** با، پێمخۆش نییە وابێ، بەڵام زۆر کەسی لەمن ئازیزترو خۆشەویستترو بەتواناتر لەڕیزی کۆمەڵەو دەرەوەی کۆمەڵەشدا گیانیان لەدەست داوە، منیش مومکینە ...

***ئەوەی کە مردیش جێگاو پێگەیەکی نەماوە، ئەم قسەیەشم دوا بەدوای سەرکەوتنی شۆڕشی خەڵکی کوردستانی عیراق دێ هەزاران کەس خۆی بەکوشت داوە، بەڵام ...؟**

**عەبدوڵای موهتەدی:** وانامێنێ، واش بمێنێ خۆ ئەوەی دەیکەم تازە هەر دەیکەم، بەڵام من ئەو باری ناڕەحەتیو ناڕەزایەتیو بۆڵە بۆڵی کە ئێستا لەکوردستانی عیراق هەیە بەهەمیشەیی نازانم، ئەو دیاردە خراپانە شەرت نییە هەمیشە بمێنێتەوە، بیری خەڵکی شەرت نییە هەمیشە ئاوابێت، نا وانییە رێز دەگیرێ، حەتمەن رێز دەگیرێ، ئەمساڵ پێی نەزانن ساڵێکی دیکە.

## هیچم بۆ منداڵەکانم جێ نەهێشتووە

*** پاش چی کە منداڵەکانت برسی بوون؟**

**عەبدوڵای موهتەدی:** هیوادارم برسی نەبن، بۆ ئاگاداریت من هیچم بۆ بەجێ نەهێشتوون، یانی هیچ شتێك نییە ئەگەر من بمرم لەپاش من.

## پارەم نییە و قەرزدارم

***خاوەنی هیچ سەرمایەیەکی زۆر نیت ئێستا؟**

**عەبدوڵای موهتەدی:** خاوەنی نە زۆر، نە کەمی سەرمایەم.

***خاوەنی چەندیت؟**

**عەبدوڵای موهتەدی:** هیچ، زۆر قەرزدارم بەقەد تووکی سەرم قەرزادرم، بە ویژدانم.



# ژیانی من لەرێگای هاوسەرەکەمەوەیە

*بۆ دەبێ سکرتێرێك قەرزدار بێت؟

عەبدوڵڵای موهتەدی: من بەمیزانێکی زۆرکەم پارە لەحزب وەردەگرم، ئەوەڵەن نەمانبووە، ئێمە حزبێکی دەوڵەمەند نین، پاشان ئەوە ئەسڵەن بەرنامەمان نییە، خۆمان وەکو مەسئولانی سەرەوە، خۆمان دەوڵەمەند بکەین، ئێمە ئەوەی پەیدای دەکەین، خەرجی چالاکییەکان و فەعالییەتەکانی کۆمەڵەی دەکەین و ئەوەی چەند کەسانێکمان هەیە یەك لەوانە منم ئەوەی پێویستییەکیان هەیە قەرەبوو دەکرێتەوە، کەمە ، نەك تەنها پێی دەوڵەمەند نابیت، قەرەبووکانیشی بەئاسانی پێنادرێتەوە، من بێجگە لەوە ئەسڵی ژیانم لەرێگای هاوسەرمەوە کە ناهیدی بەهمەنییە، لەرێگای ئەوەوە دابین دەکرێت، لەبەر ئەوە هیچ ماڵێك، هیچ موڵکێك بۆ منداڵەکانم بەجێ ناهێڵم، بەڵام بۆ خۆیان گەورە بوون و خەریکن دەخوێنن و وەك منداڵی خەڵکی.

# ئەگەر پارەی حزبم خوارد، دەچمە بەردەم دادگا

*ئەگەر دەرکەوت تۆ پارەی حزبت خواردووە، تۆ ئامادەیت بچیتە بەردەم دادگایەك؟

عەبدوڵڵای موهتەدی: تەبعەن، هەر دەبێ بچم، دەبێ بمبەن، ئامادەی چی.

*ئەگەر کەسێکی تر چوو لەناو کۆمیتەی ناوەندی، تۆ ئامادەیت دادگایی بکەیت لەسەر ئەوەی پارەی پێشمەرگەکانی خواردووە یان پارەی خەڵکی خواردووە؟

عەبدوڵڵای موهتەدی: بەڵێ بەتەئکید، دەبێ وابێ، ئەگەر کاری خۆت لەئێستاوە قایم نەگری، سبەینێ تووشی گەندەڵی گەورە دەبی.

*ئەی بۆ دەڵێن هەمیشە سکرتێرەکان دەوڵەمەندن و های لایف دەژین؟

عەبدوڵڵای موهتەدی: وەڵا بۆ ئێمە وانییە نازانم بۆ خەڵکی کە، بۆ ئێمە وانییە، تەبعەن یەك شت هەیە من رەنگبێ ئیحترامم بگرن یان مەسەلەن سبەینێ بچینەوە ئێران ئاخر دەبێ تۆ لەماڵێکدا بژی کە بگونجێ بۆ سکرتێرێك، بگونجێ بۆ حزبێك، خۆ ناچیتە ماڵێکی سێ ژووری.

# باحزب خەرجی میوانەکانم بکێشێ لەداهاتوودا

***با ڤێلایەکت هەبێ، یەك دانە، با مانگی (20)ملیۆن تمەنت هەبێ، قبوڵتە؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** زۆرە، ئەوەندەم بۆ چییە، خەرجییەکانم حزب بیکێشێ، یانی خەرجی میوان و هاتن و رۆیشتن و ئەوانە بکێشێ.

***بەلام ئێمە چەندین تەجرەبەمان لەبەرچاوە، هەموو ئەو قسانەی جەنابت راست دەرناچێت، بۆیە مەترسی لەقسەکانی جەنابت هەیە؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** ئاخر ناحەقت نییە، مەترسیت هەبێت، وەلامی ئەو مەترسیە چییە، ئەمە نییە ئێستا بڵێم باوەڕ بەسوێندو قورئان و بەڵێن و قەولەکەی من بکە، من دەڵێم دەبێ ئەحزابی سیاسی شەفافیەتی سیاسی و شەفافیەتی ماڵییان هەبێت، ئەگەر ئەمە بەڕێوەچوو، دز دەردەکەوێ، ناڵێم دز بنەبڕ دەبێ، بەلام دز دەردەکەوێ، ماڵی خەڵکخۆر دەردەکەوێ، هەژاری دوێنێ و ملیۆنێری ئەمڕۆ بۆ خەڵکی دەردەکەوێ، من خزمەتی کۆمەڵە بەکۆمەڵگای کوردی یەکێ لەهەرە خزمەتە گەورەکانی بەوە دەزانم، دەوڵەت بەرپرس و وەلامدەرەوە بەخەڵکی بێ، حزب بەرپرس و وەلامدەرەوە بۆ خەڵکی بێ.

***تەرحەکانت کە کردبووتن کە حزبی کۆمەڵە وا گەشە دەکات، وا دەڕواتە پێشەوەو نفوزی زیاد دەکات و دەچێتە ئیلام، پێویستە کوردایەتی وابکرێ، ئەوانەی هەمووی راست دەرچوون و سەرکەوتوش بوویت، پێت وایە سەرکەوتوو بوو ئەو تەرحانە؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** پێموایە زۆر سەرکەوتووە، من وەکو خۆم و کۆمەڵەش وەك حزب، بەلام پێم کەمە، دڵم ئاو ناخواتەوە، هێشتا ئێمە زۆر زۆر، هەم کۆمەڵگای کوردستانی ئێران زۆر جێگەی پێشکەوتن و گەشەکردنی سیاسی و فەرهەنگی هەیە، زۆر خەزێنەی نوستووی دەست لێنەدراوی ئینسانی هەیە دەبێ بیخەینە گەڕ، بکەوێتە گەڕ، لەبەر ئەوە لەپاڵ ئەوەدا زۆر کارکراوەو زۆر سەرکەوتن بەدەست هاتووە، بەلام هێشتا پێم کەمە.

***بەهیوای گەیشتنی ئەو رۆژە؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** زۆر سوپاس، بەهیوای ئەو رۆژە.



# من و فوئاد و ساعدی وەتندۆست هەڵبژێردراین

---

***پێش روخانی شا لەساڵی (1979) لە پایزی (1978) یەکەم کۆنگرەی کۆمەڵە لەسنە و نەغەدە، بەئامادەبوونی (12-14) کەس بەسترا، پێمخۆشە یەکەم کۆنگرەی حزب کەی بوو، لە کوێ بەسترا چۆن چۆنی پێکهات، گرنگترین بڕیارەکانی ئەو کۆنگرەیە چیبوو؟کەسەکانی کێ بوون؟**

**عەبدوڵلای موهتەدی:** کۆنگرەی کۆمەڵە رۆژەکانیم لەبیر نەماوە، بەلام دەزانم لەپایزی ساڵی (1357)ی هەتاوی کە دەکاتە(1978)ی زاینیی لەرۆژانی پایزیدا بەسترا، ئەمە کۆنگرەیەکی زۆر دووردرێژو تولانی بوو لە دوشوێن بەسترا، یەکیان لە ماڵێك لە گەرەکی چوارباخی سنە، دوای ئەوەی چەند رۆژانێك ئێمە لەوێ پێکەوە بوین و زۆربە چری و پری کۆبونەوەمان گرت و لەسەر هەمووشتەکان قسەمانکرد، بەهۆی مەسائیلی ئەمنیەتی وامان بەباشزانی کە چیدی ئەو کۆبونەوەیە لەوێ درێژە نەدەین پشویەکماندا، نازانم رۆژێك دووروژ سێ رۆژ وە درێژەکەیمان بردە ماڵێك لەشاری نەغەدە، کەلەوێش رێکخستنمان هەبووخەڵکمان هەبوو، لەشاری نەغەدە، کەزۆر دوربوو هیچ پەیوەندی بەسنەوەنەبوو باقییەکەیمان لەوێگرت.

ئەم کۆنگرەیە خاسیەتی ئەوەبوکە دوای(9)ساڵ چالاکی ژێرزەمینیوکاری رێکخستنی نهێنی و کاری سیاسی نهێنی بۆ یەکەمجار نەك هەموو بەلام ژمارەیەکی بەرچاو لە کادرە سەرەکیەکانی کۆمەڵە تیایدا کۆبونەوە.

ئێمە لەسالانی پێشتر هەر لەسەرەتای دروستبونی کۆمەڵەوە زۆرجار خەڵکمان گیرابوو بەتاق و چەند کەس و ئەوانە.

بەلام لەساڵی (1974)ی زاینیی بەپۆل خەڵکێکی زۆر لە کۆمەڵەگیرا لەرێکخستنی کۆمەڵە بەگشتی لەتاران ولەهەندێك شارەی دێ، بەلام بەشی کوردستانەکەیمان تاڕادەیەکی باش بەساغی مایەوە، زۆرتر ئەو پەیوەندیانەنمان لێگرا کە ئێمە لەتاران بومان جا چ پەیوەندیە خوێندکاریەکانمان چ پەیوەندیە کرێکاراییەکانمان وە سەرجەم چاکم لەبیرنەماوە رەنگە زۆر دەقیق نەبێت، بەلام دەزانم دەیان کەس بوو نزیکەی رەنگ (50) کەسێك سەرجەم گیرا، کە چەند کەس لە ئەندامانی سەرکردایتیش تێدابوو وە لەیەك ساڵ و نیو ساڵ دوو ساڵ و سێ ساڵ و چوار ساڵ‌وئەوانەوە مەحکوم بوین، دیارە یازدە ساڵیشمان هەبوو، ئەمانە وایکرد کە چالاکی کۆمەڵە لەدەرەوەی زیندان بۆ ماوەیەك، نەك توشی وەستانێکی یەکجارەکی ، بەلام توشی رکودو کەم کارییەك بێ، تاڕادەیەك شێرازەی هەندێك کار لەیەك بپسێ، کە بەدو جۆرە ئەوەمان قەرەبوکردەدەوە یەکەم ئەو هاوڕێیانە

کەلەدەرەوەی زینـدان بـون دەسـتیانکرد بـووە لـەناوەوە کۆمیتەیـەکیان پێکهێنـا بـۆ بـەڕێوەبردنی کاروبارەکان وە نەیانهێشت کارەکان بخەون هەرچەند کزیەك رویتکردین لەراستیدا.

دووەمیش وەختێك بەرەبەرە لەزیندان ئازادبووین، ئێمە مانان، من یەکێك لەوانەبوم لەزیندانیەکان بوم کەلەزینـدان ئـازادبوین دەسـتمانکرد بەکۆمـەڵێك کۆبونـەوە بەرلـەوەی "کـاك فوئـاد-" کـاك فوئـاد ساڵی(78) ئـازادبوو مـن (77) ئـازدابوم، سـێ سـاڵیان دابـومی، مـن کـە خـۆم هاتمـەوە، کۆمـەڵێك کۆبونەوەمان دەستپێکرد، هێشتا چونکە رێکخراوەکەمان ژێرزەمینی بوو.

نەدەکرا هـەموو کـەس لەیـەك شوێن و لـەژێر یـەك سـەقفدا هـەموو کـەس ببینـی، بۆیـە بەدوسـێ مـەنزڵ یەعنی لەدوسێ شوێن کۆبونـەوەمانکرد لەگەڵ ژمارەیـەك کـادر، لێرە لەگەڵ ژمارەیەك کادر لەولا چۆن ئەمان خۆیان یەکتریان نەدەناسێ.

بەڵام یەکێك وەکو من هـەموویانم دەناسی، یـەك ئەمـەمانکرد، مانگەکانی داهـاتوو کەسـەرە هـات " کـاك فوئـاد" هاتـەوە بـەو نەتیجەیـە گەیشـتن کۆبونەوەیـەکی فـراوان بگـرین، دوای چـەندین سـاڵ سـەرو سامانێکی تازە بدەینەوە بە کۆمەڵە.

لەم کۆنگرەیەدا بوو کە بۆ ئەوەڵین جار سەرکردایەتی کۆمەڵـە هەڵبـژێردراو چۆن کۆمەڵـە پێش ئەوەش سـەرکردایەتی بـوو، بـەڵام بەشـێوەیەکە هەڵبـژێردراو نـەبوو، بـە شـێوەیەکی دانراوبـوو، رێگەیـەکی تریشمان نەبوو لەو حاڵەتی خەباتی ژێر زەمنیدا.

بەڵام لێرەدا سەرکردایەتی کۆمەڵـەمان هەڵبـژاد، ئەگـەر بەهەڵەنەچوبم ئـەوە دیـارە پێداچونەوەی دەبێ و من دەبێ لـە هاورێیانی تریش پرسم، بـەڵام مـن ئـاوام لـەبیرماوە کـە "فوئادی مستـەفا سوڵتانی" و مـن و"ساعیدی وەتەندۆست" کـە هەندێکجار بە(ماﻣۆستا برایم) دەناسرێت لـەدنیای پێشـمەرگەتیدا ئـەو سیانەمان هەڵبـژێردراین، دوو جێگریش لـە جێگرەکـان دیسـان ئەگـەر بەهەڵەنەچو بم یـەکیان وام لـەبیرە کە"سەید برایم عەلیزادە"بوو

بەڵام ئەمە کۆنگرەی یەکەم بوو.هەروەکو باسمکرد خاسیەتی کـۆنگرەی یەکـەم ئـەوەبوو جارێکی دی سەروسـامانیدا بـە کۆمەڵـە جـارێکی دی چـۆن بڵـێم جموجـوڵی و چـالاکیەکی باشـتر داوە بەکۆمەڵـە، گەرموگۆڕییـەکی زۆرتـری داوە بـە کۆمەڵـە،کارەکان باشـتر دابەشـکران، لەبیریشـمان نەچـێ ئـەم پـایزە بزوتنـەوەی جـەماوەری دژی رژێمـی شـا ماوەیـەك بـوو دەسـتپێکرابوو، لەبەرئـەوە ئەگـەر چـی نزیکـەو راپەڕین نەبووبوینەوە، هێشتادووربوو لەوەی ئەسڵەن کـەس پێـی وا نـەبوو جارێ رژێمـی شـا دەروخـێ، بەڵام بەهەرحاڵ بزوتنەوە لەئێران دەستپێکرابوو، لەبەرئـەوە قۆنـاغێکی نوێ لـەژیانی هـەموو خەڵکداو ئێمەشدا وەکـو رێکخراوێکـی سیاسـی خـەریکبوو دەهاتـەئاراوە، بۆیـە لێکدانـەوەی بـارودۆخی تـازەش، یەکێك لە کارەکانی ئەم کۆنگرەیە بوو کەکرا.



لە کۆنگرەی یەکەمدا باسێکی زۆرمان بوو، وەجیاوازییەکی زۆرمان بوو لەسەرئەوەی کە کۆمەڵگای ئێران چ جۆرە کۆمەڵگایەکە ئایا کۆمەڵگایەکی سەرمایەدارییە یاخود کۆمەڵگایەکی نیوە موستەعمەرە و نیوەفۆدالییە یاخود کۆمەڵگایەکی نیمچە فیئودالییە، دیارە لەوێدا بەتەواوی یەکماننەگرتەوەو ئەو ناکۆکیە فیکرییە هەر لەناوەماندا مایەوە و کە ساڵانی دواتر وەلامپێدراوە ئەمە کۆنگرەی یەکەم بوو.

*لەوکۆنگرەدا ناوی کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێران بوو بەناوی حزب؟
عەبدوڵای موهتەدی: نەخێر، ئەو ناوە دوومانگ سێ مانگ دواتر هەڵبژێردرا لە (26)ی رێبەندانی (1357)ی هەتاوی کەدەکاتە شازدەی فێبەروەری (1979).

## ناوی کۆمەڵە لەگەڵ شەهیدبوونی حەمە حوسێنی کەریمیە

*لەوناوەتان تەسبیت کرد؟
عەبدوڵای موهتەدی: بەڵێ، ئەمەش بەشوێن ئەوەدابوو کە هاوڕێ(محەمەد حوسێنی کەریمی) کە لەدامەزرێنەرانی کۆمەڵە بوو، لەرۆژانی راپەڕیندا کە دەکاتە سێ چوار رۆژ پێش ئەوە، رۆژانی راپەڕینی سەرانسەری لە ئێران بریندار بوو و رۆژی (26) گیانی لەدەستدا.

* ئەوکاتە لە پەیڕەوو پرۆگرامی کۆمەڵەدا هاتبوو، پێناسەی کۆمەڵە چۆن کرابوو؟
عەبدوڵای موهتەدی: وەك چ رێکخراوێك

## کۆمەڵە رێکخراوێکی مارکسیستی بوو، بڕوای بە ستالینیزم نەبوو

*بەڵێ؟
عەبدوڵای موهتەدی: وەکو رێکخراوێکی مارکسیستی.



***چی تر هاتبوو لەگەڵیا کۆمەڵە ڕێکخراوێکی مارکسی فڵان ئامانج و هادافونەوانە چۆن چۆنی پێناسەکرابوو؟**

**عەبدوڵای موهتەدی:** ئێمە نوسراومان هەیە لەوبارەیەوە کە بۆئەوەی زۆر بەوردی بتوانم وەڵامتبدەمەوە دەبێ ئەوانە جارێکی تر چاو پیابخشێنەمەوە، بەڵام ئەگەر هەر زاکیرەی خۆم بمەوێ جوابت بدەمەوە، کۆمەڵە خۆی بە ڕێکخراوێکی مارکسیستی دەزانی ئەمەیەك، پێناسەیەکی تر ئەوە بوو کۆمەڵە خۆی لە کامپی شورەی و یەکێکی سۆڤیتدا نەدەدۆزییەوە وە بڕوای بەوە نەبوو، بڕوای نەبەستالینیزم بوو نەبەئەزمونی دەورەی ستالین بوو، وەنەبەسەرجەم ئەزمونی شورەوی وەکو ئەزمونێکی سەرکەتوی سۆسیالیزم نەدەناسی.

***ئارم ومارشی ئەوکات چییتان دیاریکرد؟**

**عەبدوڵای موهتەدی:** هیچی دیاری نەبوو.

***هیچتان دیاری نەکرد؟**

**عەبدوڵای موهتەدی:** نەخێر، ئەوە هەموی ئەو دوو سێ مانگ، دواترە کە عەرزتدەکەم ئەوکات ئەوانە داندران، دەنا لە کۆنگرەی یەکەمدا ئەمانە نەبون، بڕوامان بەشۆڕشی کۆمەڵایەتی هەبوو، بڕوامان بەروخانی ڕژێمی شا هەبوو، بڕوامان بەشۆڕش هەبوو بەمانای ئەم وشەیە، بەڵام بەپێچەوانەی ڕێکخراوە چریکە فیدائییەکانی خەڵکی ئێران ئەو جۆرە کاری چەکدارانە، کە ناومان نابوو کاری چەکدارانەی جیا لە جەماوەر ئەوەمان قبوڵنەبوو، پێمانوابوو کاری چەکداری وە شۆڕش و ڕاپەڕینی چەکدارانە دەبێ بەئەنجامی پرۆسەیەکی سیاسی و جەماوەریدا بێتە ئاراوە، وەکو قۆناغێك لە حەرەکەتی جەماوەر نەك ژمارەیەك بۆ خۆیان هەڵچن.

# گرفتمان لەگەڵ چریکە فیدائیەکانی خەڵقی ئێران بوو

***ئەو بۆچونەی ئێوە دواتر سەریگرت؟**

**عەبدوڵای موهتەدی:** سەریگرت، تەئیسری زۆرگەورەی بوو، لەوەدا لەیەکەم ڕۆژەکانی دەستپێکرانی دامەزراندنی کۆمەڵەوە کە ئێمە دەستمان بەکارکرد ئەمە بۆچونمان بوو، بۆیەش دواتر وەختێك ڕێکخراوی فیدائیانی خەڵق زۆر ساڵ ونیوێك دواتر دوای ئێمە دامەزران ڕێبازی خۆیان باسکرد، لەو



کاتی چەپی ئێراندا ململانێیەکی گەورە لەنێوان خەتی ئێمە و ئەوانەی وەکو ئێمە بیریان دەکردەوە لەئێراندا لەگەڵ خەتی چریکە فیدائیەکان هەبوو، ئەوە خۆی باسێکی دوورودرێژە.

***ئێوە پەیوەندیتان لەگەڵ رێکخراوە چەپەکان باش بوو، توندوتۆڵ بوو، بەتایبەتی وەکو چریکەفیدائیەکان وئەوانە؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** ئێمە هەمان بوو، بەڵام لای هیچ رێکخراوێك ئێمە بریارمان دابوو وەکو رێکخراو موعەریفی نەکەین.

***مەبەستم پاش کۆنگرەیە، پاش ئەوەی کۆمەڵە خۆی وەکو رێکخراوێك نەناسێنی؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** نەخێر، کۆنگرەکەی ئێمە نهێنی بوو، بریارماندابوو لەو کۆنگرەیە راگەیاندن نەدەین, خۆمان رانەگەیاند لەکۆنگرەدا وەکو باسمکرد لەشازدەی فێبەواری مانگی دو سالی (79) ئێمە ئیتر هەمومان وەکو تەقینەوەیەك کۆمەڵەمان ئاشکراکرد.



# کۆنگرە لەمزگەوت سازدەکرێت

---

*** ئەگەر بێینە سەر کۆنگرەی دووەم، لەبەهاری (1981) لە خانەقای زەمبل لەنێوان بۆکان و سەقزدا لە مزگەوت دەستپێکرد؟**

**عەبدوڵای موهتەدی:** بەڵێ، وابوو خانەقا کەئێستا وەکو شوێنەوارێکی مێژوویی وایە ئەلەبەر کۆنگرەکەی ئێمە، هەرخۆی یەکێك لەشوێنەوارەکانی ئەو ناوچەیەیە.

***پێش ئەوەی بچینە سەر ئەساسی ناوەرۆکەکانی، چۆن ڕێگەیان پێدان لە مزگەوت حزبێکی مارکسی کۆنگرە ببەستێت؟**

**عەبدوڵای موهتەدی:** ئاخر کۆمەڵە هێزێکی جەماوەری بوو، خەڵکی زۆر دەیناسی هێزێکی خۆشەویستبوو، ئەوە دوای ڕوخانی شاودوای شۆڕش و دوای سەرهەڵدانی بزوتنەوەی کوردستان بوو، لەبەرئەوە کۆمەڵە خەڵك زۆری دەناسی، دۆستی زۆر هەبوو ئەو بنەماڵەیە دۆستایەتی نزیکیانکرد.

***ئێوەش تاکتیکانە ڕەفتارتان دەکرد، یەعنی بەدژی مەسەلەی مەزهەب شتەکانتان زەق نەئەکردەوە؟**

**عەبدوڵای موهتەدی:** نەخێر نەمانکرد، ئەگەریش بەهەندێك جێگا تەنانەت توندڕەوی کرابێت کارێکی باش نەکراوە.

***ئەو کۆنگرەیە چۆن چۆنی بەڕێوەچوو؟**
**بەڵێ؟**

**عەبدوڵای موهتەدی:** کۆنگرەی دوو، کۆنگرەیەکی زۆر موفەسەڵ تر بوو، زور ڕێك وپێکتر بوو، یەعنی بەمانای واقعی خۆی کۆنگرەبوو، لەبەینی کۆنگرەی یەك وتا کۆنگرەی دوو، ئیتر شەپۆلەکانی بزوتنەوەی جەماوەری لەئێران هەر زۆر ڕوو لە هەستان بوون و سەرەنجام بوو بەڕاپەرینێکی گەورەی جەماوەری لەئێران وشای پێ ڕوخاو ئیتر کوردستان ئازادبوو، بزوتنەوەی گەورە هاتەئاراوە، ئا لەم ماوەیەدا کە دەتوانم بڵێم ساڵ ونیوێکە، لەم ساڵ ونیوەدا ئێمە لەڕێگەی بەستنی کۆنفراسەکانەوە کاری خۆمانکرد.

چەندین کۆنفراسمان بەستوە بەڕاستی ژمارەکەیانم لەبیرنەماوە، تەسەوردەکەم پێنج کۆنفراسمان بەستبێت ، چونکە کۆنفراسی شەشەم دەکەوێتە دوای کۆنگرەی دووەم ، لەبیرەمە دوانیمان لەشاری

مهاباد بەستووە، کۆنفراسمان لەبۆکان بەستووە، کۆنفراسێکمان لەناوچەی ئالانی سەردەشت بەستوە، ئیتر ئەوە کاتی پێشمەرگایەتی و ئەوانەبوو لەشوێنەکانی تر ئەم چوار پێنج کۆنفراسەی بەستمان تێیدا بارودۆخی ئەو سەردەمەمان باس لێکردوە.
بڕیارمان لەسەرداوە شتەکانمان کۆبوەتەوە، بڕیارو قەراری حزبیمان داوە، لەو کۆنفراسانەشدا ئێمە کۆمیتەی ناوەندیمان هەڵبژاردووە، یەعنی رانەوەستاین بۆ کۆنگرەیەکی تر بێتەوە، بڕیارمان ئەوەبوو کۆنفراسیەکان ئەیانتوانی کۆمیتەی ناوەندیش و سەرکردایەتیش بۆ ئێمە دەستنیشان بکەن، لەیەکێك لەوانەدا ساڵێکی خایاند کۆنفراسێکمان بەست لەبەهاری (1980) بەڵکو هەر سەرویەندی ئەوەی ئەو رۆژانەبوو کە دوهەمین هێرشی گەورەی کۆماری ئیسلامی بۆسەر سنە بکرێت، سنە خەریك بوو ئابلۆقەدەدرا لەئەو وەختی بەفەرمانی بەنی سەدر لەرۆژانی پێش ئەوە ئێمە کۆنفراسێکمان بەست ئالەم کۆنفراسەدا من خۆم کاندیدنەکردۆتەوەوە، دیارە هاورێیان زۆریان داوالێکردم ، بەڵام من ئەم ساڵە نەبوم لە کۆمیتەی ناوەندیو لەسەرکردایەتی کۆمەڵەدا هەتا هاتەوە کۆنگرەی دووەم لە کۆنگرەی دوو جارێکی کە من خۆم کاندیدکردۆتەوەو هەڵبژێراومەتەوە .

# دژی هێرشکردنە سەر سەفارەتی ئەمریکا بووین لە ئێران

---

***لەم کۆنگکرەیە کێ هەڵبژێردرا ئەگەر لەبیرت بێت؟**

**عەبدوڵای موهتەدی:** ئەو کۆنگرەیە ئەوانەی بوون دەزانم شوعەیبی زەکەریای تێدابووە بەداخەوە (حەمە حسێن کەریمی) نەمابوو ( فوئادی مستەفا سوڵتانیش) هەرنەمابوو، خانەی موعینیش نەمابوو، ئەو کەسانە ئەگەر بەهەڵەنەچووبم کاك شوعەیبی زەکەریایی، دکتۆر جەعفەری شەفیعی، کاك برایم عەلیزادە، عەبدوڵای موهتەدی، دکتۆر سەعید یەزدیان ناسراو بەدکتۆر زۆراو، کاك محەمەدی شافعی، کاك موحسینی رەحیمی، کاك حوسەینی مورادبەیگی ناسراو بەحەسور کاك سەعید حەسەن قادری.

***کۆنگرەی دووەم لەساڵی ( 1981 ) کۆمەڵێك رووداوی گرنگ رویدا، گرنگترین ئەو روداوانەش روداوی بەبارمتەگرتنی سەفارەتی ئەمەریکابوو؟ دوای شۆڕشی گەلای ئێران لەلایەن کاربەدەستانی جمهوری ئیسلامییەوە، ئەوەبوو تاقمێك گەنج پەلاماری سەفارەتی ئەمەریکایاندا( 25 ) کەسیان بەدیلگرت**

**گوایە ئەوان بەبیانوی ئەوە ئەوە هێلانەی جاسوسی بووە، ئەو رووداوانە چۆن چۆنی بـوو، ئێـوە ئەوکاتـە نەزەرتـان چی بوو لەسەرئەو مەسەلەیە؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** ئێمە دژی ئەوەبووین، زۆر کەم بون لەناوچەی ئێران بەدەگمەن دژی ئەوەبوون، ئێمە دژی بووین، رەنگە زۆر پێت سەیر بێت یان خەڵکانێك پێیان جۆرێکی کە بێت، بەلام ئێمە دیدێکمان بو لەبارەی چەپەوە، ئێمە خۆمان بەچەپێکی سەربەخۆ دەزانی ئەسڵی گرتنی سەفارەتی ئەمریکا بەناوی(هێلانەی جاسوسییەوە) لەتاران لەراستیەکەیدا ئەمە پلانێکی سەرانی جمهوری ئیسلامی بوو بۆ ئەوەی لەژێر ناوی دژایەتی لەگەڵ ئەمریکا و دژایەتی لەگەڵ ئیمپریالیزم و ئەو جۆرشتانە لەراستیدا دەسەلاتی خۆیان بەهێزکەن و تەحکیمیکەن، نەیارانی ناوخۆییان لەناو دەسەلات تەسفیەکەن و دەریانکەن وەکو( مهندس و بازرگان) و ئەوانە ، وەسێهەمیش ئیجماعێك پێکبێنن پێگەیەکی جەماوەری پێکبێنن. کە دەمانزانی ئەو پێگەیە بۆ خستنەرێی شەپولێکی گەورەی سەرکوتی جەماوەرو ئۆپۆزسیۆن وە لەوانە کوردیش، بۆیە ئێمە میعیارومیلاکمان نەبوو کێ جنێو بە ئەمریکا دەدات یان نایدات، ئێمە دەمانگوت چەپ بوون، شۆڕشگێڕبوون، ئازادیخوازبون، دەبێ میلاکەکانی بگەڕێتەوە سەر هەڵوێستەکان لە کۆمەڵگا ئێراندا.

ئەگەر تۆ کرێکارانت سەرکوتکرد، بێکارانت دایەدەست رێژ، تێزابت بەسەر دەموچاوی ژناندا کردوە، چارشێوت بەسەرردادانەوە، خوێندکاران و رێکخراوە خوێندکارییەکانت هەڵوەشاندەوە، شورا کرێکارییەکان و یەکێتی سەندیکا کرێکارییەکانت سەرکوتکرد و خستنەزیندان رۆژنامەکانی وەکو (ئاندەگان)ئە ئەوانی ترن داخست هێرشکردە سەر کوردستانو تورکمان سەحرا، بەمن چی تۆ هێلانەی جاسوسی دەگریت، یان نا لەبەرئەوە ئێمە لەو بروایەدا بوین ئەمە پلانێکەوە هەرگیز نابێ هیچ پشتیوانی بکرێن بەدژی رژێم، ئێمە زۆر رۆشن و بێ ئەملاو لابوین لەسەر ناسینی ماهیەتی رژێمی جمهوری ئیسلامی.

قسەیەکی تریشمان بوو، ئێمە بەئاشکرا ئەوەماندەکرد، ئەویش ئەوەبوو دەمانگوت هەر کەس دژی ئیمپریالیزم بێت مەعنای ئەوە نییە پێشکەوتنخوازە، تۆ لەروانگەیەکی کۆنەپەرستانەشەوە لەروانگەیەکی دەرەبەگایەتیەوە یان زۆر زۆر کۆنتریشە وە ئیرتیجاعییەوە تۆ دەتوانی لەگەڵ ئەمریکا یا ئەورووپا یا ئیمپریالیزم یا هەرچی دژ بێ شەرت نییە خۆ هەرچی دژی ئیمپریالیستی بێت مەعنای ئەوەبێ شتێکی چاکە، لەبەرئەوە نەخێر ئێمە قەت پشتیوانیمان لێنەکردوە، لە دەگمەن رێکخراوە سیاسیەکانی ئۆپۆزسیۆن و چەپ بوین لەئێراندا کە نەکەوێتە ژێر تەئیسری ئەم هەراهەرایە.



# وتووێژەکانی کۆمەڵەو دیموکراتی ئێران ئەنجامی نەبوو
# شێخ عزدین حوسێنی، دۆستی کۆمەڵە بوو، سەرۆکی هەیئەت بوو
# قاسملۆ سەرۆکی وەفدی دیموکرات و من هی کۆمەڵە بووم

---

*** یەکێکی تر لەو روداوانە پاش هاتنە سەرکاری جمهوری ئیسلامی گوایە وەفدێك لە (شێخ عیزەدین حسێنی) وەکو کۆمەڵە بەشدارینەکرد یان وەکو شەخسیەتێك، حزبی دیموکرات بەشداریکردووە ئەو مفاوەزاتانە چۆن چۆنی بوو، بەچ ئاکامێك گەیشت، بۆچی ئێوە یەعنی ئۆپۆزسیۆنی کوردستانی نەیانتوانی لەگەڵ جمهوری ئیسلامی بگەنە رێکەوتنێك تاوەکو ئەوەی کەرویدا روینەدایە؟**

عەبدوڵلای موهتەدی: کورد و حاکیمەتی کۆماری ئیسلامی چەندینجار وتوێژوچاوپێکەوتنیان بووە، ئەمە بۆ خۆی مێژویەکی هەیە، بەلام ئەوەی ئێستا جەنابت ئاماژەی پێدەکەیت دەگەڕێتەوە سەر پایزی (79) هاوینی (79) ئەگەر بەتەقویمی کوردی بیلێی لە (28) مانگی گەلاوێژدا خومەینی فەرمانی هێرشی سەرتاسەری بۆ کوردستان دەرکرد، پێوەربون بە پاسدارو ئەرتەش‌و بەتەیارەوە بە هەموو شتێك، کوردستانیان گرتەوەو خاڵخاڵی هات‌و خەڵکی ئیعدام کردوە لەوەوە پیشمەرگایەتی لە کوردستان ئێران لە سەردەمی نوێدا سەریهەڵدا بۆ (28) ساڵ لەوەپیش،بەلام ئەمە سێ مانگ و وردیەکی زیاتر نەخایان وردە وردە بە مقاوەمەتی جەماوەریەوە بەکاری پێشمەرگانەوە بەکاری ئاوشارەکان وردەوردە پاشەکشە بەحکومەتکرا ئەوە وەختیش لاواز بوون، نا ئامادەبوون، شەڕیان نەدەزانی، ئەسڵەن وەزعی سیاسی و قۆناغە سیاسیەکە ئەوەنەبوو بتوانن سەرکوتێکی ئاوا گەورە بکەن، هەرچی بێ پێشمەرگەو خەڵك رژێمی جمهوری ئیسلامیان هەڵچینەوە لە کوردستان بە کونیاندا کردەوە، هەرئەوەبو بەهۆی ئەوە لەپێش ئەوەی سێ مانگەکەش تەواو پێش ئەوانەیەکسەر پاشەکشە بکەن لە کوردستان بەو ئەتیجە گەیشتن کە دەبێ گفتوگۆ لەگەڵ کورد دەستپێبکەن، ئەو کوردەی کە تا دوێنێ تەکفیرکرابو بەناوی کافروبە"عیزەدینی حوسێن"یان دەگوت" زدەدینی حوسێنی" و هێرشیان دەکردە سەر (دکتۆر قاتسملۆ) و بە کۆمەڵەیان دەگوت کۆمەڵەی مولحیدو ئائەم جۆرەشتاتە وردە وردە ناچاربون بێن و گفتوگۆمان لەگەڵ بکەن لەوەدا.

ئەم گفتوگۆیانە بۆخۆی مێژوویەکی هەیە ، بەڵام لەوەڵامی پرسیارەکەدا هەرئەوەندە دەڵێم لەپایزی (79)دا حزبە کوردیەکان پێکەوە سازان لەسەرئەوەی کە هەیئەتێکی هاوبەش پێکبێنن بەناوی هەیئەی نوێنەرایەتی گەلی کورد، ئەم هەئیەتە حزبی دیموکراتی تێدابوو، کۆمەڵەی تێدابوو، رێکخراوی کوردستانی چریکە فیدائیەکانی خەڵکی تێدابوو، هەروەها شەخسی (سەید عزەدینی حسێنی) تێدابوو، شێخ عزەدینی حوسەێنی وەکو سەرۆك دیارە جێی شانازییە کەسایەتیەکی ئاوا ئەندامی هەر حزبێك بێ ، بەڵام بەڕاستی ئەو ئەندامی کۆمەڵە نەبوو، بەڵام کەسایەتیەکی پێشکەوتنخوازو تێکۆشەرو خۆشناو بوو لە کوردستان، بەحەقیقەت دەوری هەبو لەو بزوتنەوەدا دەوری زۆر سازندەو چاکی هەبوو، دۆستێکی نزیکی ئێمە بو وە ئێستاش هەیە ، ئەو وەکو سەرۆکی هەیئەتەکە وابو، حزبی دیموکرات وتەبێژی هەیئەت بوو کە ئەو وەختە قاسملۆ نوێنەرایەتی حزبی دیموکراتی ئەکرد، بەڵام تیمێکیان هەبوو لە ئەو هەیئەتی نوێنەرایەتیدا کۆمەڵەش تیمێکی هەبوو لەناو هەیئەتی نوێنەرایەتی گەلی کورددا، من سەرۆکی تیمەکەی کۆمەڵەبوم و لە هەمو وتووێژەکاندا بوم.

# وتوێژەکانی کوردو ئێران تەنها (45) دەقیقە بوو، واتا (28) ساڵە لە پشوو داین

---

***گرنگترین ئەو باس و خواسانە کە لەنێوان ئێوە ئەو وەفدە لەگەڵ جمهوری ئیسلامی چی بون، هیچ بڕیارنامە وگەڵاڵە نامەیەکتان پەسەندکردو ئیمزاتان کرد، بۆنەگەیشتنە نەتیجە؟ داواکارییەکانی ئێوە چی بوون، وەڵامی ئەوان چی بوو؟**

**عەبدوڵلای موهتەدی:** ئەوەی کە هەیئەتی دەوڵەتی جمهوری ئیسلامی کە هاتن بۆلای ئێمە ئەوەی کە وەکو دەڵێم زۆرجار لەگەڵ کورد دانیشتون، بەڵام ئەوەی لەگەڵ هەیئەتی نوێنەرایەتی گەلی کورد بەرەسمی دانیشتن.

یەك: ئەوەڵ کۆبونەوە لەساڵۆنی فەرمانداری شاری مەهاباد بەسترا لەلایەن حکومەتی جمهوری ئیسلامییەوە سەرۆکی هەیئەتەکە(داریوشی فروهەر)بوو، لە عەینی حاڵدا(عیزەتوڵلەهی سەحابی) ئەندامی هەئیەت بوو، (هاشمی سەباغییان ) کە ئەو وەختی وەزیری ناوخۆبوو، ئەویش ئەندامی هەیئەتەکەبوو ، ئەوسیانەبوون وەکو هەیئەت، کوردێکشیان لەگەڵ بوو بەناوی (ئەحمەدی قازی) ئەویشیان لەگەڵ خۆیان هێنا، بەڵام دیارە نەك وەکو بەشی رەسمی هەیئەتی رەسمییەکەیان لەگەڵ



کوردەکان دانیشتنی رەسمی هەیئەتی دەوڵەتی ئێران لەگەڵ هەیئەتی نوێنەرایەتی گەلی کورد (45) دەقە بوو، وەلە (45) دەقە زیاتر هەرگیز تولی نەکێشاوە، ئەو (45) دەقیقەیەش ئەوەی پێیدەڵێت (موعارەفە) یەعنی یەکتر ناسین دوو سێ وتاری زۆر کورت بوو وەکو دەستپێکی قسەکان کە ئەمەکرا ئیتر بەشوێنیدا گوتیان با پشوویەك بدەین، هەتا ئەلعان لەپشوودایین ئێمە وا (28) ساڵە.

بەڵێ وەکو هەیئەت لەگەڵ هەیئەتەکەمان دانەنیشتن، چۆن مەبەستی کۆماری ئیسلامی ئەوەبوو جیابەجیا جیادانیشێ و پێیخۆش نەبوو لەگەڵ هەیئەتێکی کوردی دابنشێ، دیارە ئێمە زۆر پێداگریمان کرد لەسەرئەوە کە وەکو هەئیەت دانیشین، بەهەر حاڵدا کۆبونەوەی تر کرا، هەرلەوێ ئەم هەیئەتە وتیان پێمانخۆشە لەگەڵ هەر حزبەو لەوەی دوای پشوەکە بچینەوە ناو جەلەسە لەگەڵ هەر حزبە دابنشین، لەگەڵ حزبی دیموکرات دانیشتنی خۆیانکرد، نازانم چییان و تووە، لەگەڵ ئێمە دانیشتنی خۆمانیان کرد کە تەبعەن دەزانم چیمان وتوە هەمویم لەبیرماوە، ئیتر دوایش وتیان باشە زۆرتر یەکتری دەبینینەوە.

ئەم هەیئەتە جاری تر بەشێوەی تر هاتوتەوە سەرێکی ئێمەی داوە، سەرێکی ئەوەی داوە ئەو کارانەی کردوە، بەڵام حکومەتی جمهوری ئیسلامی لەو زیاتر نەبوو لەگەڵ هەیئەتی رەسمی هەموو گەلی کورد دانیشێ، هەرئەوەبوو عەزرمکردی، ئایا ئێمە گەلاڵەمان داوە یان نە؟ بەڵێ ئێمە گەلاڵەمان داوە ئێمەقسەی زۆر زۆر بەبڕوای خۆم رێكوپێك و گونجاو و باشمانکردوو، ئەوانیش قەولیان داوە لێی بکۆڵنەوە، بەڵام هەر ئەو وەختیش ئێمە وەکو کۆمەڵە دەمانزانی کە حکومەت کاتی دەوێت بۆئەوەی خۆی کۆکاتەوە، هەربۆیەش وابوو چەند مانگێك ئەم بەناو وتووێژە درێژەی هەبوو تا لەبەهاری (1980)دا دووهەمین هێرشی سەرانسەری بۆ کوردستان کراو، ئیتر گفتوگۆکان تێکچوو.

## کۆمەڵە بۆ یەکەمجار لەخومەینی داوای فیدراڵی کرد بۆ کوردستانی ئێران

*** وتت لەو دانیشتنانەکەی کە لەگەڵ من بووە، من ئەوانەم لەبیرە چیتان وت لەو دانیشتنە یا ئەوەی کە تایبەت لەگەڵ تۆ دانیشتن؟ کۆمەڵە داوای چیکرد؟**

عەبدوڵلای موهتەدی: ئێمە وەکو هەموو هێزە کوردییەکان ئەو سەردەمە، ئۆتۆنۆمییان داوادەکرد، پێمخۆشە ئەو بڵێم ئۆتۆنۆمی داخوازی کۆمەڵە نەبوو لەئەوەڵەوە ، تەنانەت عەزرمکردی ئاخر چەندجارێك وەفدی جۆربەجۆری حکومەت لە قۆناغی جۆربەجۆردا هاتونە چاویان بە خەڵکی جۆربەجۆر کەوتوە لە کوردستاندا، مەسەلەن بۆ نمونە مانگی فێبرواری و مارسی (79) پێشئەوەی

هەیئەتی نوێنەرایەتی گەلی کورد پێکبێت، ئەسڵەن پێش ئەوەی هێرشەکە بکرێتە سەر کوردستان هەیئەتێکی تر لەلایەن حکومەتەوە هاتوە لە مهاباد کۆبونەوەی لەگەڵ خەڵك کرد، ئەمجارە چۆن هێشتا هەیئەتێکی نوێنەرایەتی رەسمی نەبوو ئێمە بڕیارماندا لە هەر شارێکی کوردستان دوو نوێنەر بچن، مەسەلەن جوان لەبیرمە لەشاری مەریوان "فوئاد" هەڵبژێرا من ئەمجارە نەبوم لەشتەکاندا، جا مەبەستم چییە، مەبەستم ئەوەیە ئەم جارەیان ئێمە و نوێنەرانی کورد فیدرالیمان پێشنیارکرد.

*ئەوکاتە؟

عەبدوڵڵای موهتەدی: بەڵێ بەسەری تۆ بەڵگەنامەکەی ماوە، وە ئەو وەختە هەموو کورد ئەوەی قبوڵکرد(د. قاسملۆ) ئەوەی ئیمزا کردوە.

*فیدرالی؟

عەبدوڵڵای موهتەدی: بەڵێ وەڵڵا کورد خوازیاری فیدرالی بووە لە فێبەرای و مارسی (1979) لەگەڵ هەیئەتی ئێرانی بەسەرپەرشتی (داریوشی فروهەر) لەشاری مەهاباد گەلالەیەك هەیە بەناوی گەلالەی هەشت مادەیی ، لەگەلالەی هەشت مادەیدا یەکێك لە مادەکانی فیدرالییە، بەلام بەدەلیلی ئەوەی ئەو وەختی هەم حزبەکانی کوردستانی عیراق ئۆتۆنۆمییان دەویست، هەم حزبی دیموکرات لە کوردستانی ئێران ئەتۆنۆمی دەویست. مەبەستم ئەوەیە بەم دەلیلە وردە وردە ئەوەبوو بەباو، خودموختاری کە ئێرانیەکەی پێ دەڵێن یا ئۆتۆنۆمی ئەوەبوو بەباو، ئێمە لەبیرمە جوان جوان دانیشتن کۆبونەوەمانکرد وتمان ئەمە تازە بۆتە ویستێکی جەماوەری ئێمە، خۆنابێ لەبەرامبەریدا بوەستینەوە.

# کۆمەڵە داوای نوێنەری نەتەوەکانی ئێرانی دەکرد

*ئێوە ئەو خالانەی دەستنیشانتان کردبوو لەو بەڵگەنامەیە لەوگەلالە نامەیە هەشت خالیەدا چی‌وچیتان داوائەکرد؟

عەبدوڵڵای موهتەدی: ئەوەی ئێستا لەبیرم مابێ یەکیان داوای سیستمی فیدرالیمان کردبوو.



*بۆ هەرێمی کوردستانی رۆژهەڵات؟

عەبدوڵڵای موهتەدی: وابزانم بۆ ئێران، لە زەمنیدا بەڵێ بۆ کوردستان.

دووههەم داوای ئەوەمانکردبوو کە خەڵکی کوردستان وە نەتەوە بن دەستەکانی ئێران نوێنەریان هەبێ لە شورای ئینقیلابدا ئەو وەختی لە ئێران شتێك هەبوو بەناوی شورای ئینقیلاب کە کاروبارەکانی ئێرانی بەڕێوەبرد، لەدوای هاتنە سەرکاری جمهوری ئیسلامی، تەبعەن دوایی ئەو شورای ئینقلابە نەماو ، بەلام ئەو وەختی شورای ئینقلاب بەهەمەکارەی دەسەلاتی سیاسی لەئێرانی دوایی شا دەناسرا. ئێمە داوامانکرد بوو کە ئەو نەتەوانە نوێنەریان هەبێ لە شورای ئینقلاب وە زۆر شتی ئاوا، شتی کۆمەلایەتی باشمان داواکردبوو، داوای یەکگرتنەوەی ئوستانە کوردنشینەکان یا پارێزگا کوردنشینەکانی رۆژئاوایی ئێرانمان کردبوو، کە هەمووی ئەوانە لەیەکەیەکدا کۆبنەوە، زۆر شت هەمویم لەبیرنییە، بەلام خواستەکانیان ئەوەبوو، باسی ئەوەکرابوو کە کورد خوازیاری رێگە چارەی چەکدارانە نییە، دەیەوێ شتەکانی لەرێگەی ئاشتیەوە بچێتە پێشەوە، کە هەمیشە هەڵبەتە ئەم بەشەی هەمیشە خواستێکی کورد بووە دواتریش کە باسمکردو لە کاتی پێکهاتنی هەیئەتی نوێنەرایەتی گەلی کورد و دوای شەڕی سێ مانگەش ئێمە ئەو قسەمان ئەکرد.

# خومەینیم بەپیاوێکی بەئیرادە دەزانی

* تۆ خۆت خومەینیت بینیوە هیچ جار؟

عەبدوڵڵای موهتەدی: نەخێر خومەینیم نەبینیوە

# کورد قەت خومەینی نەویستوە

*حەزت نەکرد بیبینیت؟

عەبدوڵڵای موهتەدی: بەدڵمدا نەهاتوو، یەعنی قەت شتێکی ئاوام بەدڵدانەهاتوو بەڕاستی .

*خومەینییت بە پیاوێکی شۆڕشگێڕو بە پیاوێکی تیۆرسین ئەزانی؟

عەبدوڵڵای موهتەدی: نا، بەلام بەپیاوێکی زۆر بەئیرادەم دەزانی .

*بۆچی؟

عەبدوڵڵای موهتەدی: ئەزانی چۆنە، هەموو بزوتنەوەیەکی جەماوەری ئەگەربیەوێ نیزام بگۆڕی دەبێ ئەلتەرناتیڤی هەبێ. زۆر شۆڕش لە دنیادا بێ ئەلتەرناتیف بوون، بێ سەرەنجام ماونەوە بە هەر حاڵ خومەینی کەسایەتیەکی بوو کە توانی یەکەم لەناو هەمو روحانییەتی ئێراندا ببێتە کەسی یەکەم، کە خۆ وانەبوو، نەبەپلەی زانستی و ئاینییەکەی نەبەشتی تر وابوو نەبە تەمەن وابوو، ماموستاکانی ئەو هەمووی بون، بەڵام بەهەرحاڵ توانی ئەوەبکا، لەناو خەڵکی ئێرانیشدا بۆ سەردەمێك بێجگە لە کورد، من کوردی لێ جیاواز دەکەم، کورد قەت خومەینی نەویستووە، بەڵام لەناو خەڵکی ئێرانیشدا توانی ببێت بەئەو کەسایەتییە کە ئۆتۆریتەو ئیعتیبارێکی گەورەی پێکهێنا، خومەینی کەسێك بوو لە کاتێکدا کە خۆپیشاندانەکان لەئێراندا دەستیانپێکرد، هەمیشە داوای لە خەڵك دەکرد یەعنی داوای پاشەکشەو سازشی لە خەڵك نەکرد، ماندەربوو، خەڵکی بۆ پێشەوە ماندەدا.

*مەبەستت ئەوەیە ئەو ئەلتەرناتیڤی سیستمێکی مەزهەبییەوە هات تا شوێنی سیستمێکی عیلمانی بگرێتەوە کە خەڵك لێی ناڕازی بون لەسەردەمی شادا؟

عەبدوڵڵای موهتەدی: تەبعەن ئەوەی کرد، هەرچەند ئەو وەختە خەڵکی بەراستی خۆپێیان وانەبوو ئەو سیستمە مەزهەبیە ئاوای لێبی، یەعنی ئەوان تەسەورێکیان نەبوو کە داهاتو یان بەو جۆرەی لێدێ.

*ئەگەر وابوبایە نەیان ئەکرد؟

عەبدوڵڵای موهتەدی: قەت نەیان ئەکرد، بەتاکید.

*ئەوەی بۆدواجار ملیاندا بۆ ئەو هەموو سیستمە مەزهەبییە؟

عەبدوڵڵای موهتەدی: ئاخر وەختێك لێیان حاڵی بوو تازە درەنگبوو، تازە جمهوری ئیسلامی دەسەڵاتی خۆی دامەزراندبوو بەئاگرو ئاسن حکومەتی دەکرد.



# شا، ئێرانی کرد بەگۆڕستانی سیاسیەکان

***ئەکری (50 - 60) ملیۆن خەڵك وا حاڵی بکرێت کە شۆڕشێك هاتوە بە کۆمەڵێك ئەڵتەرناتیڤەوە، دوا جاریش ئەوەی کە خۆی ئەیەوێ تاکتیکانە رەفتاری کردووە وە مەیلەکانی هەموو خەڵکی ژێر پێی ناوە، ئەکری خەڵك مەبەستم ئەوەیە بێ ئاگا بێت ئەوەندە گێل بێ؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** ئاخر ئەوە لێکدانەوەی شۆڕشی ئێران و بۆچی بەو رێگەیەدا چوو، خۆی باسێکی دورودرێژە من ناتوانم ئاوا بەئاسانی جوابت بدەمەوە، بەڵام هاتنە سەرکاری خومەینی من تەنیا بەفریوی نازانم، ئەو کەسانەی وای دەبینین بەهەڵە دەچن، من پێموایە، تەنیا بە فریوی نازانم، بەپێچەوانەی ئەو دیدەی کەسەڵتەنەت تەڵب و کۆمونیزمی کاریگەری و هەندێکجار تاڕادەیەك حزبی کۆمۆنیستی ئێرانیش هەیانە بەپلانی ئەمریکاو غەربیش نازانم، من بە هەڵقوڵاوی کۆمەڵگای ئێرانی دەزانم، بەڵام بۆ وایلێهات ئایا بەحەقیقەت خەڵك ئەو سیستەمەیان دەویست کە مەسەلەن دوای دووساڵ سێ ساڵ دەساڵ لە کۆماری ئیسلامی بەسەرچوو، ئا خەڵك رێك ئەوەیان نەدەویست، بەڵام بێ توانایی ئەڵتەرناتیڤی چەپ و پێشکەوتنخواز، بێ توانای ئەڵتەرناتیڤی لیبرالی و میللی گەرایانە لەئێران، بێ ئەڵتەرناتیوی لایەنەکانی تر وە بێ رێکخراوە بونی ئەوان مەیدانێکی زۆر گەورەیدا کە خومەینی و دامودەزگای روحانی بتوانن خۆیان وەکو ئەڵتەرناتیو پێشکەش بکەن، لەسەردەمی بزوتنەوەی جەماوەریدا تۆ ناتوانی بێ رەهبەری بی.

کێ بتوانێ رەهبەرییەکی بەهێز پێشکەش کا بە کۆمەڵگا ئەوەدییانەوە. لەبیست وپێنج ساڵ دیکتاتۆری شا هەموو رێکخراوێکی چەپی پرژو بڵاوکردبوو لەئێران، هەموو رێکخراوێکی ئازادیخوازو پێشکەوتنخوازی قەدەغەکردبوو، هیچ رۆژنامەو گۆڤارێکی ئازادی نەمێشتبوو لە ئێران، هیچ رێکخراوێکی کاریگەری مافی چالاکی نەبوو، تەنەنات هیچ رێکخراوێکی لیبرالی و ناسیۆنالیستی ئێرانیش مافی چالاکی نەبوو.

شائێرانی کرد بە گۆڕستانی سیاسی، تەنهایەك لایەن مافی چالاکی هەبوو، ئەویش روحانییەت بوون، ئاخوندەکان بون مزگەوتەکان بوون ،بۆیە من دەڵێم، خومەینی میراتگری ئیستبدادی سەڵتەنەتییە، خومەینی میراتگری دیکتاتۆری رژێمی پاشایەتییە، یەعنی دیکتاتۆری پاشایەتی بەچەپەوە، بە کوردەوە، بەنەتەوە بێ دەستەکانەوە بەئازادیخوازاودیموکرات ولیبرال و کرێکارو هەمووی پانکردنەوە، بەڵام لەبەرامبەردا دامودەزگای روحانییەتی ئیجازە داو مەودای پێدا، بۆیە ئێمە قوربانیانی رژێمی شاین، خومەینی هاتەسەر حازری ، ئەوان دامودەزگای روحانییەتیان بوو، کە هەم رێکخستنە هەم سەرچاوەی مالیە، چۆن شتێك هەیە لەئێران بەناوی (سەهمی ئیمام) وەکو جارێك



زەریبەیە، خەڵك زەریبەی خۆیان دەدا بەداموەزگای روحانیەت، سەرچاوەی مالییان بوو، ئیدیۆلۆژییان بوو، رێکخستنیان بوو، هەموو کەس فەوتا هەرئەوانی نەفەوتان شا، ئێ بۆیە من دەڵێم ئەوان لەراستیدا دوو هەزارجنیۆیش بەشا بدەن ئەوان میراتگری رژێمی پادشایەتین، ئێمە قوربانیانی رژێمی پاشایەتی بوین.

گەر لێمان گەرابان (10) ساڵ دیموکراسی لە ئێران بوایە، مە حاڵ بوو تازە روحانییەت بێتە سەرکار لەئێران خومەینی لەم حاڵەدا هاتەسەرکار رەهبەییەکی بەهێزوبەئیرادەی پێشکەشکرد وە لەکاتی شۆڕشدا لە کاتی بزوتنەوەدا جەماوەر رەهبەری دەوێت، تۆ دەبێت رەهبەری پێشکەشکەیت، خەڵکی کە نەیتوانی ئەوەبکات ئەو هەر ئەوەندەش کە کورد توانی پێشکەشی کات حزبە کوردییەکان توانیان رەهبەرییەکی جیاواز دیارە خواستەکەی هەبوو لە کورددا، بەڵام حزبەکان تاڕادەیەك توانیان خەتێکی جیاواز رەهبەرییەکی جیاواز پێشکەشکەن، ئەوە نییە نەچونە ژێرباری خومەینییەوەو ئەوە نییە تائێستاش نەچونە ژێرباری جمهوری ئیسلامی وبەناوشۆڕشی ئیسلامییەوە ئەوە بو هۆی هاتنەسەرکاری خومەینی.

# رۆژئاوا پشتیان لەشاکردو پشتیوانی لە خومەینی

*** تۆ وتت پێموانییە پیشتگیرییەکی غەرب و خۆرئاوا هەبوبێت لە خومەینی؟**

**عەبدوڵای موهتەدی:** نا،نا، ناڵێم ئەسڵەن پشتگیری نەبوو، بەڵام دەڵێم ئەمە هاتنەسەرکاری خومەینی ناتوانی وەکو تەوتەئەیەك وەکو پلانێکی غەرب کە گوایا لە کۆنفراسی (گوادۆلۆپ) دانیشتونە ئاخر وا دەڵێن ئاخر بەڵێ لە کۆنفراسی گوادۆلۆپ دانیشتن تەسمیمیان گرت دەست لەشا هەڵگرن، وتیان کاکە فائیدەی نییە شامان چیدی بۆ راناگیری با دەستی لێهەڵگرین ئەوە راستە، بەڵام خۆئەوە نەبوو بۆ خۆیان بچین ئەو شۆڕشە هەڵگیرسێنن و پەلی خومەینی بگرن بێنن داینێن.

***بەس بە فرۆکەیەك لە پاریسەوە دەینێرنەوە بۆ ئێران؟**

**عەبدوڵای موهتەدی:** بێگومان ئەوان تەئیسریان بوو ، بێگومان غەرب و رۆژئاوا لە هاتنەسەرکاری خومەینی تەئسیریان بووە، چونکە ئەوان بەهەرحاڵ پێیانوابوو ئەمە لەمپەرێکە لەبەرامبەر شورەویدا، ئەمانە حەرەکەتێکی ئاینین بالەبەرامبەر شورەویدا ئەمان تەقوییەبکەن، با نەهێڵن ئەرڵتەناتیوی تر لەئێران بێتەسەرکار، لەبەرئەوە من ناڵێم دەوریان نەبوو، بەڵام دەڵێم ناتوانی هەموو شت بەوە بزانی.



# خومەینی دژی شورەوی بەهێزکرا

***ئەمەریکاش ئەو بۆچونەی هەبوو کە پێیوایە ئەمە گروپێکی مەزهەبین لەبەرامبەر شورەوی و یەکێتی سۆڤیەت قوتیان کاتەوە؟**

عەبدوڵلای موهتەدی: ئەلتەرناتیوی یەکەمیان شابوو، بەلام کە زانیان تازە شایان بۆ راناگیری، بەلی رەزایەتیان دا بە خومەینی وتیان(OK) باشەو بێ ئەگەر وا بێ هەر ئەو باشترە لە دوای شا.

***لەو بیرەوەرییانەی قاسملۆ ئەیگێڕێتەوە، گوایە جارێك خومەینی بینیوە لەبەحسی مەسەلەی دیموکراسی و مەسەلەی کوردو مافی کوردو پێکهێنانی سیستمێکی دیموکراسی و خومەینی بە قاسملۆی وتوە "ئەوەی کە تۆ باسی ئەکەیت ئەو سیستمە دیموکراسییە، وەك باسی هەرزان بوونی شوتی بکەیت" لەبەرئەوە ئێمە پێویستیمان بە دیموکراسی نییە ئێمە پێویستمان بە سیستمێکی مەزهەبییە کە هەموومان لەژێریا بحەسێینەوە کە ئیسلامە، ئەم قسەیە تاڕادەیەکی زۆر توانیویتی خومەینی کاری پێبکات و کۆمەڵێك خەڵك بە ئەنواعی ئیتنیكو مەزهەبە جیاوازانەی ئێران کۆبکاتەوە لەژێرناوی دیندا، لەکاتێکدا ئەوان بەخاتری سوڵتەی سیاسی بوو، ئەو قسەیە تا چەند راستە؟**

*عەبدوڵلای موهتەدی: من ئاگادار نیم کە ئەوقسەی لەپەیوەند لەگەڵ قسەکانی(د. قاسملۆ) یا لەدیدارێك لەگەڵ ئەودا باسکرد بێ، بەلام بەگشتی دوای ئەوەی هاتنەسەرکارو چەند مانگێك لەسەرکاربوون، وردە وردە خەڵك خواستە کۆمەلایەتیەکان هێنایە ئاراوە، ئاخر خەڵك هەم خواستی ئازادی سیاسی هەبوو، هەم خواستی عەدالەتی کۆمەلایەتی، وردەوردە ئەو خواستانەی هێنایە گۆڕی، بۆیە دەڵێم زۆر زوو ئەگەر جمهوری ئیسلامی ئەو سەرکوت و کوشت و کوشتاری ئەخستبایە رێ، قەت نەیئەتوانی ئاوا لەسەرکار بمێنێتەوە، بۆیە زۆر زوو دەستیاندایە سەرکوتکردن، رۆژنامەکانیان داخست دژی ژنان، دژی کرێکاران دژی نەتەوەکان وە هەروەهادژی خواستە ئیقتیسادی و ئابوری و کۆمەلایەتیەکانی خەڵك وە کرێکارن وەستانەوە جا لێرەدابوو کە خومەینی باسی ئەوەی کرد هەردەیانگوت بابە ئیقتیساد ئاوا نابێ ئاخر دەبێ ئیقتیساد چاکەین، خومەینی عیبارەتێکی زۆر مەشهوری هەیە دەڵێ "ئابوری بۆکەر دروستکراوە، ئابوری هی کەرە، ئێمە بۆ کاڵەك و شوتی شۆڕشمان نەکردووە.



# کۆمەڵە بچوکترین پشتیوانی لەبەعس نەکردوە

*ئەو موزوعە پێخۆشە کۆتایی پێ بێنین بەس هەر لەدەورانی کۆنگرەی دوەمی کۆمەڵە لەساڵی( 1981 )دا مەسەلەیەکی گرنگ دێتەناو ئەو ئاڵوگۆڕانە ئەویش جەنگی ( عیراق- ئێران ) لەو کاتەدا شەڕی عیراق- ئێران لەساڵی ( 1981 ) دەستپێدەکات وە ئەو شەڕە تا چەند تەئیسری بووە لەسەر کۆمەڵەو گرنگترین ئەو بڕیارانەی کە لەو کاتەدا ئێوەداتان، چۆن چۆنی بووە، پێتانوایە سەرچاوەکانی ئەو جەنگە چی بوون، دواتر ئێوە لەبەیانامەیەکدا بەڕاستی پشتگیری لەبەعس دەکەن کەدوایی من پێتدەڵێم چۆن؟

عەبدوڵای موهتەدی: وەختێك ئێمە کۆنگرەی دوەهەممان بەست، هێشتا ئەو شەڕە دەستپێنەکرابوو، لەبەرئەوە کۆنگرەی دووەم کۆمەڵێك کێشەی فیکری و سیاسی بۆئێمە یەکلاکردەوە، سەرکردایەتیەکی بۆ کۆمەڵە دانا، من بە قۆناغێکی باشی دەزانم، هەرچەند هەڵەی تەکنیکیشی تێکەوتبوو، بەڵام کە شەڕی عیراق و ئێران دەستپێکرا، من هەڵوێستی کۆمەڵە ئێستاش کە ئەو وەختی کۆمەڵە دەری بڕی و نوسی بەیەکێك لەبەڵگەکانی شانازی و سەربەرزی کۆمەڵە دەزانم، چونکە چکۆڵەترین پشتیوانیەکی لەبەعس تێدا نییە، چکوڵەترین پشتیوانییەکی لە جمهوری ئیسلامی تێدا نییە، بەئاشکرا و راشکاوانە لەڕوانگەیەکی سەربەست و سەربەخۆی ئازادیخوازانە، لایەنگری خەڵك، لایەنگری مافەکانیانەوە، لەسەرئەوشەڕە دەدوێ، زۆریشم پێ سەیرە لە جێگایەك پشتیوانی لەبەعس کرابێ، من ئێستا هیچ شتی وام نەبینیوە، زۆرم پێ سەیرە ئەگەر جا ئێمە لەبەیاننامەیەکدا پشتیوانیمان لەبەعس کردبێ، چۆن ئەوە نەبووە، لە فەرهەنگی ئێمەدا بە حەیاتمان شتی وانەبوو.

# بەعس و کۆماری ئیسلامی کۆنەپەرست بوون

*ئەو جەنگە پێتوابوو تەئیسری چی لەسەر کۆمەڵە دانا؟

عەبدوڵای موهتەدی: لەسەر ژیانی هەموو خەڵك تەئیسری دانا، یەکێك لەو شتانەی ڕەنگبێ دیسان ئێمە جیاوازبکاتەوە لە حزبەکانی ترو لە حزبە کوردییەکان، ئەوەیە زۆر حزبی کوردی پێی وابوو ئەو شەڕە دەتوانێ بە قازانجێکی گەورە بێت بۆ کورد، ئێمە قەت پێمانوا نەبوو، قەت پێمانوانەبوو ئەو شەڕە بە قازانجی کوردە، مەسەلەن ئەمە یەکێك لە جیاوازییەکانی ئێمە بوو بۆیە ئێمە لەئەوەڵ تا

ناخیر دژی ئەوشەڕە وەستاین، دژی هەردو حکومەتی، حکومەتی کۆنەپەرستی بەعسیش و کۆماری ئیسلامیش.

## سەردەمی شەڕی عیراق-ئێران من سکرتێر نەبووم

*ئاتەوەی کە تۆ نەڵێت هەرگیز پشتیوانیمان لە بەعس نەکردوە پێمخۆشە بەبیرت بێنمەوە بە تەئریخی (29)ی پوشپەڕی (1367) یەعنی ئۆتی (1988) لە ژمارە (26)ی پێشڕەو لە ئۆکتۆبەری (1988)دا واتە تەنها دوو رۆژ پاش وەستانی شەڕی عیراق- ئێران لە (27)ی پوشپەری (1367) بە پێی بڕیاری (598) کە ئاگری بڕ لە نێوان (UN) و شەڕی عیراق- ئێران ئەوەستێ، حزبی کۆمۆنیستی ئێران کە ئەوکاتە جەنابت سکرتێری بویت، بەیاننامەیەکی دەرکردووەو خەڵکی چەواشەکردووە؟

عەبدوڵڵای موهتەدی: ئا، جا سکرتێری نەبووم با ئەوە رونبکەینەوە سکرتێری من کەمتر لە دوو ساڵی خایاند.

*کاك برایم سکرتێر بوو؟

عەبدوڵڵای موهتەدی: نا خەڵکی کەبوو ئەسڵەن سکرتێری نەما ئەو جۆرە سکرتێرییە هەر نەما.

*لە حزبی کۆمۆنست ؟

عەبدوڵڵای موهتەدی: نابەسەری تۆ؟

## ئێمە دژی بەعس بووین، ئەی بۆ کۆمەڵە کیمیاویی پێداکراو حزبەکانی تر سەلامەت دەرچوون

* پاش (8) ساڵ بەیاننامەکەی ئێوە دەڵێت( دەڵێت پاش (8) ساڵ شەڕ، ئێران تەسلیمی شەڕبوو وشکستی خوارد) کە ئەمە وانەبوو، دەڵی (جمهوری ئیسلامی دەبێ تاوانەکانی شەڕو تاوانی هەموو جینایەتەکانی خۆی بۆکرێکاران و خەڵکی زەحمەتێکێشی ئێران ببژێرێ) لەکاتێکدا (UN)



**ئیسپاتیکرد کە شەڕ عیراق هەڵیگرساندوە، هەموو جینایەتەکانی خستەملی عیراق، پێویست بوو حکومەتی عیراقی قەرەبووی هەموو ئەو شەڕو زیانانە بکاتەوەوە تا ئێستا( 2006 )خەڵکی عیراق و حکومەتی عیراق باجی ئەوە ئەدەن، ئایا رەوایە شەڕێك عیراق دروستیکردبوو لەسەر ( شەتو عەرەب ) کە ئەوەی بە موڵکی عەرەب ئەزانی، پاش هاتنە سەرکاری جمهوری ئیسلامی، پێیوابوو جمهوری ئیسلامی تازە هاتۆتە سەرکارونەتوانی بەئاسانی دەست بەسەرئەو ولاتەدا بگرێت ، شەڕێك کە عیراق تەسلیمی بوو رایگرت و کە خۆتان ئەزانن هێزەکانی ئێران هاتبون فاویان داگیرکردبوو کۆمەڵێك مەنیقەی زۆریان داگیرکردبوو بە پشیتوانی غەرب، بەتایبەتی ئەمەریکا، لەوکاتەدا مەبەستم ئەوەیە بۆچی ئێوە لەم بەیاننامەدا ئەڵێن عیراق شەڕی راگرت، پێویستە ئێران زیانەکان بژمێرێ لەکاتێکدا( UN ) ساغیکردەوە ئەو مەسەلەیە؟**

**عەبدوڵلای موهتەدی:** نا جا ئەوە شتێکی ترە، من تۆقیم، وامزانی بەڕاستی پشتیوانیمان لەبەعسکردوە ، ئێستا دەبینم من هەڵوێستەکە بە خراپ نازانم، رەنگ بێت بڵێیی ئەو هەڵوێستتە کامڵ نییە، ئەبوایە شتی تریشی تێدا بێ، خۆڕەنگە تیاشیا بێت من نازانم بەیانەکە باقییەکەی چۆنە، بەلام دەزانی چۆنە عیراق شەڕی هەڵگیرسان، لەگەڵ ئێران، ئەوە هەموو کەس دەزانێ و شكوگومانی تێدانییە ، بەلام عیراق لە دوای ئەوەی(خورەم شەهری) گرتەوە، ئێراق دوای ماوەیەك هەتا ئاخر رۆژی شەڕ هەمیشە ئامادەبوو شەڕەکە راگرێ، بەلام ئەمە ئێران بوو کە ئامادەنەبووشەڕەکە راگرێ، راستە ئەو شەڕە عیراق هەڵگیرساندب، وەلی ئێران هەموو سەرچاوە مالییەکانی خۆی خەرجی ئەو شەڕەکرد، رژێمی ئێران یەك ملیۆن کوشتەی داوە، چەندەها دەیان هەزار مێرد منداڵی ناردە بەرەکانی جەنگ، مەیدانی مینی بەلاشەی ئەوان و بەتەقینەوەی ئەوان پاککردۆتەوە، چ پێویستی بوو ئەوانەبکات، شیعاری ئێران چی بوو؟ ئایا ئەوەبوو خاکی خۆم وەردەگرمەوە، ئەو خاکە لە مێژبوو وەرگیرابووە وە، لەساڵی وابزانم (1983) بوو کە (خورەم شەهر) وەرگیراوە، هەموو دەوڵەتە عەرەبییەکان ئامادەییان دەربڕی بۆئەوەی غەرامەی ئێرانیش بدەن، یەعنی لە حسابەکەی عیراق ئەوان بیدەن (UN) ئامادەبوو بە تەواوی عیراق بە تاوانبار بناسێت وە دەوڵەتانی غەرب ئامادەبوون لەباسازی و دروستکردنەوەی ولاتی ئێراندا سەرمایەگوزاری بکەن، بەلام رژێمی ئێران ئەوەی قبوڵنەکرد.

تەبعەن بالە قەوسێکدا بڵێیم "وا دیارە خومەینی قەبوڵێیکردوە، ئەو وەختی رەفسەنجانی و فەرماندەی سوپای پاسداران نەیانهێشتوە"، بەلام بەهەرحاڵ رژێمی ئێران ئەوەی قبوڵ نەکرد لەسەرچی دەیگوت: (راهی قودس از کربلا می گوزر) یەعنی دەیگوت ئێمە بۆ ئەوەی بچین (بیت المقدس) بگرین وە ئیسرائیل شکست بدەین، دەبێ بچین کەربەلا بگرین، یەعنی شیعاری داگیرکردنی



خاکی عیراق ی بۆخۆی هەڵگرتبوو، ساڵی ئەوەڵ عیراق کردی (7) ساڵ رژێمی ئێران شەڕی بەدرێژەکێشا. ئەمە بەو مەعنا نییە تاوانەکانی رژێمی بەعس بشادرێتەوە.

با پێتبڵێم ئێمە ئەو حزبە بوین لەسەر ئەو تاوانانە رۆیشتین و باجەکەشیماندا، بۆیە ئێمە کیمیاباران کراوین، ئەی بۆ حزبی تر کیمیاباران نەکرا لە ئۆپۆزسیۆنی کوردی ئێران ؟ ئەی بۆ ئێمە کیمیاباران کراین لەدوو سێ شوێن؟ ئەی بۆ ئەو هەموو، خوم پارە باران و بۆمب باران کراین. لەبەرئەوە ئەوەنەبوو لەسەر عیراق بێدەنگ بین، بەڵام ناشڵێن ئێمە دەبێ دەوڵەتی ئێران غەرامەی دەوڵەتی عیراق بدا، نابی ئاوا لێتێبگەین لەو بەیانییە، دەڵێین : دەبێ وەڵامدەرەوە بێ بەرامبەر بە خەڵکی ئێران وە ئەو جینایەتانەی دەرحەق بە خەڵکی ئێران کردویەتی لەو حەوت ساڵەی شەڕ، نامەسئولانە ناردونی بۆ شەڕ، بە کوشتنی داون، وڵاتی وێرانکردوە، لەسەر خواستێکی پروپوچی کە کەربەلا دەگرێ، رژێمی ئێران بەرپرس بوو لەو بەشەدا ئەمە من هیچ شتێکی خراپی تێدا نابینم

# خومەینی دەیویست شەڕ رابگرێ، رەفسنجانی و سوپای پاسداران نەیانهێشت

*ئاخر ئێوە پێتانوانەبوو بەعس ئەو شەڕەی هەڵنەکرد، جمهوری ئیسلامی ئەمەی وەکو فاکتەرێك بەدەستەوە بوو تا خەڵکی پێ هاندا، مەزهەب و مەسەلەی کەربەلاو ئەو ئەوەی قوتکردبوووەوە تاوەکو خەڵك هان بدات بەشداری ئەو شەڕە بکەن، شەڕێك بوو عیراق بەسەریدا سە پاندبوو ئەبوو دیفاع بکا؟

عەبدوڵای موهتەدی: ئاخر باشە خۆمەعلومە عیراق بۆچی بوو، هەربۆیە ئەو مەبەستە بوو کە جەنابت باستکرد، عیراق پێ وابوو رژێمی شا روخاوە پێیی وابوو ئەو شەتولعەرەبەی رێکەوتنامەی شەتولعەرەب چی دی کە موعتەبەر نییە، سەدام حسێن دراندی، پێیی وابوو رژێمی ئێران لاوازە بۆی دەولوێ کە ئەو زوڵمە بکات لەئێران و رێکەوتننامەکەی خۆی پێشێلبکا، بەڵێ بۆیە شەڕی کرد، بەڵام ئاخر چەند مانگێکی پێچوو، پێموایە کەمتر لەساڵێك بوو، وردە وردە ئێران کەوتەوە خۆی، شاری خورەم شەهری گرتەوە، لەچۆم پەڕییەوە سەرکەوتنی بەدەستهێنا، خاکی خۆی گرتەوە، ئەلعان دەردەکەوێت هەر ئەم رۆژانە (2006) جا بۆ ئاگاداریت نامەی خومەینی لەسەر ئەم شەڕە ئەم رۆژانە چاپ بووە لەئێران، بۆچی بەهۆی ناکۆکی ناوخۆیانەوە بەدژی یەکترەوە نامەکەیان ئێستا چاپکردوە، خومەینی دەڵێ بابە من هەموو خەڵکەکەم کۆکردەوەو داواملێکردن وتم کاکە خاکەکەی خۆمان وەرگرتۆتەوە، بەسە ئیتر بۆچی شەڕ بکەین، ئێمە لەوە زیاتر، دوژمنمان شکستداوە، ئەوەی هێرشی



هێناوەتە سەرئێمە سوکمان کردوەو شکستماننداوە، غەرامەشمان دەدەنێ، دونیا ئێمە بەحەق دەزانێ با دەست هەڵگرین، کێ نەیهێتشت ئەو وەختە، ڕەفسەنجانی و فەرماندەهانی سوپای پاسداران چونە لای خومەینی وە لەگەڵ مەجلسی ئەعلای ئینقلابی ئیسلامی، ئەوان پێیان خۆش نەبوو خومەینی دەست هەڵگرێ، گوتیان قوربان بۆبچین، بە چەند هەفتە بەمانگێك بەدوو مانگ ئێمە دەچین بەغداش دەگرین ، کەربەلا شاری موقەدەسی شیعەیانی جیهان دەچین و ئازادی دەکەین ، لەوپێشەوە ئیتر بە کەیفی خۆت بچۆ ئیسرائیلیش بگرەو (بەیتول موقەدەس) بکەوە بەشاری خۆت.

کاکە لەسەر ئەم ئەساسە چۆن کردیان جا خۆ ئەوان دەیانزانی (بەیلتولموقەدەس) ناگیرێ، بەڵام ئەوان بازرگانی جەنگ بوون، ڕەفسەنجانی و فەرماندەهانی سوپای پاسداران نەمەبەستی ئازادکردنی بەیتولموقەدەس بۆ سوڵمانان ئەو شەڕەیان درێژەدا، درێژەدانی ئەم شەڕە گەورەترین هۆکاربوو بۆ تەسبیتی دەسەلاتی کۆماری ئیسلامی، ئەوان ئەم جۆرە یەعنی لەژێرسایەی هاندانی جەنگو لەژێرسایەی هەڵمەتی جەنگ، ئەمان توانیان نەیارانی خۆیان لەئێران سەرکوتکەن، لەژێرسایەی ئەوەدا گەورەترین بازرگانیانکرد، وە بوون بەو ماڵت ملیۆنەرانە کە ئەڵنان هەن لەدونیادا.

هەروەها لەژێرسایەی جەنگدا هەموو نەیارانی خۆیانیان لەئێران تەسفیەکردو ئیبادەیان کردن، لەبەرئەوە درێژەدانی جەنگ لەلایەن ئێرانەوە دوای ساڵێك هیچ موبەبەرێکی نەبووە، بێجگە لە تەسبیتی دەسەلاتی کۆنەپەرستانەی کۆماری ئیسلامی، ڕۆژێك لەرۆژان بێگومان خەڵکی ئێران دەبێ سەرانی کۆماری ئیسلامی بۆ درێژەدانی ئەم شەڕە بێهودەیە و بە کوشتدانی خەڵك بکێشێنە پای دادگا.

***من لەروی ئەخلاقیەوە ئە پرسم، ئایا بە قەناعەتی تۆ جینایەتەکانی سەدام حسێن دەبەرابەری جینایەتەکانی جمهوری ئیسلامی نەبوون لەو شەڕەدا، لە کاتێکدا بەعس دەیان جار چەکی کیمیاوی بەکارهێناوە، دژی خەڵکی سەردەشت، دژی خەڵکی کوردستانی عیراق، هەربەبۆنەی ئەوشەڕەوە، دژی کۆمەڵە لەوبارەیەو ئێران ئەو کارەی نەکردووە ، ئێمە بۆیە ئەڵێن کەواتە مەبەستی لەبەیاننامەکە من مەبەستم ئەوەیە نابێ بەیاننامەی حزبێکی چەپ یان کۆمەڵە نابێ واقیعیتر بێت لەوەی کەنوسراوە؟**

عەبدوڵای موهتەدی: ئاخر خۆ من باقیبەکەی نازانم چی نوسراوە ئەتۆ برگەیەکت لەوە هێناوە.

***ئەمە ناوەڕۆکەیەتی باقیبەکەشی هێرشە بۆسەر ئێران کە ئەم شەڕە ئێران هەڵیگرساندووە؟**

عەبدوڵای موهتەدی: نا ئەگەر وتبێتی ئێران هەڵیگرساندوە هەڵەیە لێت قبوڵ دەکەم.



***پێتخۆشە دوایی بەیاننامەکە بخوێنیتەوە؟**

***عەبدوڵڵای موهتەدی:** باشە دەیخوێنمەوە بەسەرچاوەکانم، ئەگەر بوبێت دیارە هەڵەیە، ئەوە لێت قبوڵ دەکەم، بەڵام با پێت بڵێم ، ئاخر ئەوەڵ کات کە شەڕەکە دەستپێدەکات ئەتۆ ئەوە بەیاننامەیە بینەوە پێش پێکهاتنی حزبی کۆمۆنیستی ئێرانە، خۆ ئێستا حزبی کۆمۆنیستی پێکهاتبوو ئەوکاتە ئەوڵ بەیاننامەی کە ئێمە شەڕی عیراق ئێراندا دەیدەین.

***بڵاوتان نەکردۆتەوە لەراگەیاندنە گشتیەکاندا؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** بەهەزاران نوسخە، چۆن بڵاومان نەکردۆتەوە بۆچیمان بوو ئەی، لەو بەیاننامەیەدا بێ ئەم لاوئەولا رژێمی بەعس بە تاوانبار ناسراوە، هەروەها رژێمی ئێرانیش بە تاوانبار ناسراوە، ئەمە بەشەڕی دوو هێزی کۆنەپەرست لەسەر دەسەڵات، کە هەردووکیان دژی خەڵکن ناسراون، ئێمە بەوپەڕی شەفافیەتەوە قسەمانکردوە کێ ئەو وەختی ئاوا قسەیدەکرد، کام حزبی کوردی ئەو وەختی ئاوا قسەیدەکرد.

# بەعس بەهۆی هاوکاری ئێمە بۆ (ی.ن.ک)کیمیاویی لەکۆمەڵەدا

---

***ئەی بۆ کەدووجار پێشمەرگەکانی ئێوە بە چەکی کیمیاوی بەعس بۆمباران دەکرێن لەمەنتیقەی هەورامان لە هەڵە بجەو لەبۆتێ ئێوە جارێك رایناگەیەنێن کە ئەو بەعس بوو؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** یەکەم: رامانگەیاندوە کە ئەوە بەعس بووە، وانییە تۆ دەزانم زۆریش لە مێژووی کۆمەڵە ئاشنایی و لەتەشکیلات و پێشمەرگەیەتی ئێمە ئاگاداری .

یەکەم رامانگەیاندوە.

دووەم بە قوربانت دەبم، ئاخر ئێمە قوربانی ئەو حەملە هێرشە کیمیاوییە بوین، زۆرمان هەراهەراکردبایە کیمیاوییەکی کەی پێدادەداینەوە، ئێمە لەبەر فەقیری خۆمان لەبەربێدەسەڵاتی خۆمان لەبەرئەوەی چیدی بەئاوری کیمیاوی نەسوتێین، نەمانتوانیوە دەنگ بکەین ، ئەوەنەبوە ئێمە هەڵوێستی دژمان، ئەسڵەن دەزانی بۆچی ئێمە کیمیای باران کراین، لەبەرئەوەی پێشمەرگەی شۆڕشی کوردستانمان رادەگرت لە نەخۆشخانەکانی خۆمان هەمو عالەم دەیزانی وە جەیشی عیراقی وە مخابەراتی و ئیستخباراتی عیراقی دەیانزانی ئێمە لەبنەوە یارمەتی شۆڕشی کوردستانی عیراق دەکەین ئەمەیك .



# لەسەردەمی بەعسدا یارمەتی حزبی شیوعی عیراقیمان داوە

**د. قاسملۆ لەکارەساتی کیمیابارانی هەڵەبجە ساڵی (1988) لەکۆنفرانسێکدا ئێرانی تاوانبارکرد نەك بەعس**

*بەس یارمەتی (ی.ن.ك) دەدا؟

عەبدوڵڵای موهتەدی: ئاخر کەسی تر مەنتیقەی ئێمە نەبوو، ئەوە نەبووە یارمەتی خەڵکی تر نەدەین، یارمەتی شیوعیمان داوە کە خۆشت دەزانی کە کەمپێکی تر بووەوە، هەزار یەك ناکۆکیمان بووە، تۆ بڕۆ بزانە یارمەتی شیوعیمان داوە ئەو وەختە یان نا، یارمەتی خەڵکی سەربەخۆو موستەقیلمانداوە ئەو وەختەیان نە، ئەوەی لەدەوروبەری ئێمە بووە یارمەتیمان کردوە.

دووەم : تۆ گوێ بگرە، رژێمی عیراق و سەدام خەڵکی کۆکردەوە، کۆنفراسێکی پێکهێنا لەو کۆنفراسەدا ئێرانیان بە تاوانباری مەسەلەی هەڵەبجە ناسی.(د. قاسلمۆ) ئێرانی بە تاوانبار ناسیوە لە مەسەلەی هەڵەبجەدا، ئێمە ئەو فشارە قورسەشمان لەسەر بوو ئێستا و ئێستاش وەڵامی دەعوەتی سەدام حسێنمان قبوڵ نەکرد و نەچوینە بۆ ئەو کۆنفراسە، ئەو هەموو ساڵە لێرە بوین یەك تاقەدانە موقابەلەی رۆژنامەگەری کەسێکی ئێمە بێتە لەگەڵ رۆژنامەیەکی عیراقی، دووسەدجار، لەبەرمان پارانەوە ، لەگەڵ (الیورە) و ئەوەکانی تر یەك دانە مقابلەمان نەکردوە، چونکە دەمانزانی مەجبورت دەکەن ستایشێکی دەوڵەتی عیراقی بکەین نەمانویستوە ئەوی بکەین ، یەك تاقە دێر بێنەوە غەیری یەك نەفەر ئەوە جیاوازە من ئەو یەك نەفەرە جیاواز دەکەمەوە.



# کۆرشی مدرسی ستایشی بەعسی دەکرد یەک حزبی کوردی ئێرانی و فارسی دژی خراپەکانی بەعس، جگە لەکۆمەڵە هەڵوێستی نەبووە

*کێییە ئەو نەفەرە؟

عەبدوڵڵای موهتەدی: کۆرشی مدرسی، کە ئێستاش کۆمۆنیستی کارگەرییە، دەنایەک تاقە راگەیاندنی ئێمە یەک تاقە موقابەلەی ئێمە هەرگیز هیچ قسەیەکی بە قازانجی حکومەتی عیراق تێدا نییە، لەسەرئەو شتانە بووە ، ئێمە هەڵەبجەمان مەحکوم کردوە، کاکە ئێمە بۆمبارانەکانی عیراق کە چووە خەڵکی بێتاوانی ئێرانی بۆمبارانکردوە، خەڵکی وەرمێ خەڵکی شارەکانی کوردستان، ئاخر ئەوانەمان مەحکومکرد، ئەوانەمان بەوەحشییانەزانی، ئەوانەمان بە دژی خەڵکی ناسی، بۆیە خۆمانیان لە عیراق بۆمبارانکرد، ئێمە لە حاڵێکدا دەرکراوی ئێرانین، هەموو فشاری حکومەتی ئێرانمان لەسەربووە، هیچ پەنایەکی دیکەمان نەبوو غەیری ئەوەی لە خاکی کوردستانی عیراق بوین. بەم حاڵە هێرشەکانی عیراقمان مەحکومکردوە، بۆ مبارانەکانی عیراق، دادەی حزبێکی ترم بۆبێنەوە، بۆ تەنها ئێمە ئۆپۆزسیۆن بوین لە کوردی ئێراندا حزبێکی ترم بۆبێنەوە ئەوانەی مەحکوم کردبێ، ئاخر بۆیە ئەوان سالم دەرچوون و عەمەردرێژبوون ، ئێمە وانەبوین، ئاخر ئێمە ئەوانەمان مەحکوم کردوە و باجەکەیمانداوە، ئێمە بە قوربانیانی خۆمان ئێمە بەباش لەدەستدانی باشترین رۆڵەکانمان باجەکەیمان داوە، بەلام خۆناتوانی بلێن دوای کیمیابارانی ئەمرۆ ئەی بۆ سبەینێش زمانت درێژناکەیەوە ، ئاخر تاقەتمان ئەوەندە نەبوو ئیتر ، یەعنی من پێموایە دەبێ پێی بزاندرێ و رێزی لێبگیرێن، خۆناکرێ ئێمە ئەی بۆ هەموو رۆژی قسەیەکت نەدەکرد هەموو رۆژێ جارێکی کە لێدەدای.

# بەعس داوای لێبوردن لەکۆمەڵە دەکات

*پاش کارەساتەکەی بۆتی بەعس داوای لێبوردنی لەنێومکردو پێی وابوو کە وەفدێکی پلەبەرزی بەعس دەبێ بێتە ناو ئۆردوگاکانی ئێوەو خەڵک کۆکاتەوە داوای لێبوردن بکات، بەلام ئێوە ئەوەتان قەبوڵ نەکرد، ئەوەکو بکەونە ژێر کاریگەرییەوە، بەلام وەفدێکی مفاوەزاتتان نارد بۆ لای بەعس دانیشتن لەسەر ئەوەی کە بەعس پێویستە داوای لێبوردن بکات ئەگەر نا بلاوی ئەکەینەوە؟

عەبدوڵلای موهتەدی: دەقیقەن وایە وەداوای لێبوردنیشیان کردوە.

*بەلام بەڕەسمی ؟

عەبدوڵلای موهتەدی: بەرەسمی کردویانە ئەمن ئەلعان چاکم لەبیرنەماوە، پێموایە لەراگەیاندنەکەی کۆمەڵەشدا هاتوە ئەگەر بەهەڵەنەچوبم، بەحەقەت بە دیقەت لەبیرم نەماوە، من خۆم نەبوم لە هەیئەتەکەی کۆمەڵەدا، بەلام دەزانم هەیئەتی بەعس لەسەرەتاوە وتیان ئێمە نەبوین و چیبوە و چۆن بووە، بەلام لە ئاخرەکەیدا ویتان ئێمە بوین، بەلام هەڵەیەك بوە نەمانزانیوە شەرشتی ئاوای تێدایە داوای لێبوردنیانکرد.

# (72) پێشمەرگەی کۆمەڵە لەهەڵەبجە شەهید بوون

*هەرئەو کاتە باسی مەسەلەی هەورامانتان لەگەڵ کردن، یەعنی کیمیابارانی هەڵەبجە یا پێشتر لەگەڵیان دانیشتن؟

عەبدوڵلای موهتەدی: ئاخر ئەوەپێش ئەوەبوو ئەمە لەهی بۆتێدا بوو.

*لە کارەساتی هەورامان و مەسەلەی هەڵەبجەدا؟

عەبدوڵلای موهتەدی: کارەساتی هەورامان ئێمە هەم ئێران لێبداین، هەم عیراق، لە پێشدا کەوتینەبەر کیمیاوی بارانی عیراق ، کەکیمیاوی بارانی عیراقە، ئەمجارەیان ئەوە نەبوو رێك بۆ ئێمە بێت خەڵکەکەیان کیمیابارانی کردو ئێمەش بەرکەوتین ، بەلام بەشێپرزی کە ئێران هات لەگەڵ ئێرانیش توشی شەربوین بۆیە زۆرمان لێکوژرا (71یان 72) چاکترین پێشمەرگەمان لێ کوژراو.



***باشە بۆپاشەکشەتان نەکرد، پێش ئەوە؟**

عەبدوڵای موهتەدی: ئەوە ئیتر خۆی نقڵێکی دووری هەیە، خۆ ئەبوایە بکرابایە ئەو وەختی فەرماندەکانی ئێمەو بەڕێوەبەرایەتی ئەوکاتی ئێمە چۆزانم پێیانوابوو، ئەم ڕێگەیە ڕێگەیەکی باشە خۆیەتەمای پاشەکشەش بوین ، بەڵام ئیتر چو زانم کەوتینە ئەو هەڵەیەوە.

***بڕیارێکی هەڵەبوو جگە لە ئەوەی کە کاك شۆکی خێرابادی فەرماندەی هێزەکە بوو، بڕیارێکی سەروتر هەبێ کە ئیلحاح بکات ئەبێ ئێوە لەوێ بمێننەوەو نابێ پاشەکشەبکەن؟**

عەبدوڵای موهتەدی: ئەلعان هەمویم بەوەردەکاری لەبیرنەماوە، ئەم قسە زۆر حەساسە من بەبێ ئەوەی وە خۆشم لەوکارەدا نەبووم ، بۆیە بۆ من ئاسان نییە بڵێم دەقیقەن چ هەڵەیەك بووە یان نەبووە رەنگە کەسی تر باشتر لە من وردەکارییەکەی بزانی .

# چوار بەرپرسی کۆمەڵە ئاگاداری کارەساتی هەڵە بجەن

---

***کێیە کەسی تر، کێییە؟**

عەبدوڵای موهتەدی: عومەر ئێلخانیزادە و محەمەدی شافعی و عوسمانی رەوشەن تۆدە ، حەبیب وڵای گەوێلی، من ناڵێم ئەوانە تاوانبارن، من دەڵێم ئەوانە بەرپرسانی ئەوکاتی کۆمەڵەبوون، تەسەوری من ئەوەیە هەموو شتێ کەلە توانایاندا کردویانە بۆئەوەی توشی ئەو کارەساتە نەبێن، بەڵام چۆن چۆنی بوو وردکارییەکانی چۆنە ئەوان دەبێ بیگێڕنەوە.

***تەوەقوعتان ئەکرد بەوشکەڵە بەعس ئێوەکە خۆتان دژتان بێ کەلەژێرسایەی جوگرافیای بەعسدا بوون، دۆستایەتیان هەبوو پەیوەندیتان هەبوو، نوێنەرایەتیان هەبوو لەبەغدا، بەعس بەوشکڵە دڕاندیەتیە بەرامبەرتان بکاو کیمیاویتان لێدا؟**

عەبدوڵای موهتەدی: وەڵڵا تەسەوری کیمیاویمان نەدەکرد، بەڵام دەمانزانی نێوانی ئێمەو بەعس چۆنە یەکترمان دەناسی، ئێمە تەنیا ئەوە بوو بەعس پێویستی بەئێمە هەبوو، بەحسابی ئەوەی ئێمە ئۆپۆزسیۆنی ئێران بوین دەنا هەزارکاری پێدەگوتین یەك تاقیمان ئەنجام نەدەدا.



# بەعس داوای ئیتلاعاتی و تەقینەوەو بردنی پارەی تەزویری لێدەکردین بۆ ناو ئێران

*وەکو چی ؟ داوای چی لێدەکردن؟

عەبدوڵای موهتەدی: داوای ئیتلاعاتی دەکرد لە ئێمە، زانیاری بدەینێ، نەمانداوەتێ، داوای ئەوەی دەکرد پولی تەزویری ئێرانی چاپ دەکرد بیبەینەوە ئێران بە حەیاتمان نەمانکردوە، داوای ئەوەی دەکرد تەقینەوەی بۆبکەین نەمانکردوە، داوای ئەوەی دەکرد لەرۆژنامەکانی سەرەبەئەواندا موقابەلە بکەین و دیاربوو ستایشی دەویست و پێدا هەڵگوتنی دەویست ئەوەمان نەکردوە.

مـن خـۆم وە رەفیقـەکانی دی لـە چـەندین جـاردا، کـە دیـارە زۆر زۆریشـیان پێنـاخۆش بـووە، بـەڵام بەئاشـکرا وتومانـە پەیوەنـدی ئێمـە لەگـەڵ ئێـوە بـە مـەعنای ئـەوە نییـە ئێمـە هـیچ جـۆرە دژایـەتی و خراپەیـەك دەكـەین لەگـەڵ پێشـمەرگەی کوردسـتانی عـیراق، ئـەوان ئـەوەیان زۆر پێنـاخۆش بـوو، زۆر لەبەریان قورسبوو، بە حەیاتمان ئەوەندەی من ئاگاداریم نازانم ئەوچەند ساڵەی ئاخیر ئەوە نازانم، بـەڵام ئـەو سـەردەمی رێکـوپێکی و ئینسـیجامی خۆمـان بـە عومرمـان وشـەی موخـەریبینیش حەتالەدەممان نەهاتۆتە دەرێ.

من خۆم لەوبڕوایەدا نیم هیچ حزبێکی کوردی دیکە ئەو ئەخلاق و پرنسیپە سیاسیەی لە خۆ نیشاندا بێ کە کۆمەڵە نیشانیدا.

# لەشەڕی کۆمەڵە و دیموکرات، بەعس پارە و چەکی لەئێمە بڕی

*مەبەستت ئەوەیە حزبەکانی ئۆپۆزسیۆنی کوردستانی ئێران ئەو کارانەیانکردوە بۆ بەعس؟

عەبدوڵای موهتەدی: نا پێموانییە، ئەمن پێموایە ئەوانیش سەرجەم پاك‌وخاوێن بوون.

*ئەی پەیوەندییەکانی ئەوان لە هی ئێوە لە پێشتر بوو چۆن چۆنی بوە مانای چی؟

عەبدوڵای موهتـەدی: ئـاخر وردکـاری ئـەوان نـازانم، بـەڵام دەزانم هـی ئـەوان لەپێشـتر بـوە، دەزانم مەسەلەن بۆ نمونە سەردەمێك کە کێشەوشەڕی ناخۆیی لەنێوان ئێمەو حزبی دیموکراتدا بوو، بەعس



پارەی لەئێمە بڕی، چەکی لەئێمە بڕی، هەموو ئیمکاناتێکی لە ئێمە بڕی یەعنی ئێمە لەسنوری بەرشکستی کامڵدا بوین، خۆشبەختانە بەکارو کۆششی خۆمان هەستاینەوە.

* بۆ لێی بڕین؟

عەبدوڵلای موهتەدی: ئاخر جا چۆن ئازانم بڵێم چی.

*مەبەستت ئەو بڵێی پەیوەندییەکانی دیموکراتو بەعس زۆر بەهێزبوو؟

*عەبدوڵلای موهتەدی: لەهەرحاڵدا ئاوابوو ، جائیتر تەفسیرەکەی دەسپێرم بە خۆت، بەڵام ئاوابوو، لەوکاتەدا ئەندامانی ئێمە ، ئاڵقەی دەستگیرانی خۆیان ناردوە بۆئێمە، گوارەو دەستبەندی خۆیان ناردوە بۆمان لەهەموو جێیگەوەو زوو دەستمانکرد بەکارێکی بازرگانی و خۆشبەختانە هەستاینەوە، هەتا ئەو کێشەیە مابو، بەعس ئامادەنەبوو هیچ یارمەتی ئێمە بکات، بەڵام ئێمە لەسەر پێی خۆ راوەستاین، ئەوەی کە پێمان چاك بوو پێمان مەسڵەحەت بوو کردمان.

# لە کاتی شەڕدا یارمەتی دیموکراتیان دەدا هی کۆمەڵە نا

---

* پێتان وتن بەبەعس بۆچی یارمەتی ئێمە نادەن، بۆچی یارمەتیەکانتان گیرتوە ، جوابیان چیبوو؟

عەبدوڵلای موهتەدی: ئەی تەبعەن، دەیانگوت ئێمە چۆن شەڕی ناوخۆییەو پێمان ناخۆشە ئەو شەڕە درێژەی هەبێ و ئەوانە، بەڵام خۆ یارمەتی حزبی دیموکراتیان هەرنەوستان هەردەیاندا.



***یەکێتی پێیوایە ئەو کاتە یارمەتی ئێوەی ئەدا؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** لەبیرم نییە بۆ یەکێتی، چونکە ئەوان ئەو وەختە ئەو توانا عەجایەبەیان نەبوو شتێکی وا عەجابەییان نەبوو.

# (ی.ن.ك) هەمیشە لەگەڵ کۆمەڵە باشبووە

***بەس سنورێکی جوگرافیایان بەدەستەوە بوو گومرکیان ئەکرد؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** وایە یەعنی هەمیشە باشبون لەگەڵ ئێمە، ئەگەر قسە لەوەبێ، بەڵام بۆئەو کاتە دیاریکراوە ئایا ئێمە یارمەتیمان لەوان وەرگرتبێ، یان نا من لەبیرم نییە.

# یەکێتی دۆستی باشی کۆمەڵەیە لەهەر چوار پارچەی کوردستان

---

***باشترین دۆستی ئێوەن یەکێتی نیشتمانیە تائەم کاتە؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** لەناوحزبە کوردییەکاندا.

***لەچوار پارچەی کوردستان؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** وەڵڵا زۆرترین پەیوەندیمان بووە، هەردوك لا لەگەڵ یەکتری، هەردوك لا زۆرترین یارمەتیمان کردوە.

***مەبەستم ئەوەیە باشترین دۆستانە؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** دەتوانم وا بڵێم، ئا یەعنی زێد رۆیی نییە ئەگەر وابڵێم، بەڵام مەبەستم ئەوەیە بڵێم واش نییە کە ئێمە تاقانە لەگەڵ ئەو دۆست ببین، وەیا پەیوەندییەکانی کۆمەڵە زۆری پەرەسەندوە، وە هەرلە کۆنیشەوە وابووە، دۆستی زۆر چاکمان هەبوە ئێستاش هەمانە وەدەمانەوێت زۆرتریشمان هەبێت.



# عیراقیمان دەکرد بەئێرانی و داڵدەمان دەدان

*دیراسەی ئەو پەیوەندییانەی نێوان یەکێتیم کردوە لەهەرچوارپارچەی کوردستان، بەدرێژایی پەیوەندییەکانی یەکێتی هیچ حزبێك نییە بەقەد کۆمەڵە دۆستایەتی کرابێ لەلایەن یەکێتیەوە، وە هیچ پەیوەندییەکیش نییە ئەوەندەدورودرێژ بووبێ بەبێ کێشە تا ئەم لە حزبەش؟**

عەبدوڵلای موهتەدی: بەڵێ جا خۆ ئەوە زۆر جێگەی خۆشحاڵییە، بەلام دەتوانێ نمویەك بێ بۆ حزبەکانی تریش ئەوەنیشاندەدات، کۆمەڵە دۆستێکی زۆر بەوەفایە، بەپرەنسیپە وە قابیلی ئیبتیکایە.

*پێموایە هەر لەسەر دۆستایەتی یەکێتیش بەعس زیاتر گێچەڵی پێئەکردن و شەڕی پێ ئەفرۆشتن؟**

عەبدوڵلای موهتەدی: ئەوە یەکێك لەشتەکان بوو بەڵێ، بێگومان ئەمە وابوو، ئەمە زۆر حەقیقەتێکی گەورەی تێدایە، بەلام لە دەرەوەی یەکێتی مەسەلەن بەعس نەیدەزانی زۆر زیندانی هەڵاتوو هەبوو نەماندەهێشت بەعس بزانێ ئێمە پەنامانەدەدا، ئێمە حەشارمان دەدا ئێمە زۆر کەس سجیل و جنسیەتی ئێرانیمان بۆ دروستدەکرد، بەناوی ئێرانی دەمانکرد بە پێشمەرگە بۆئەوەی لەناوریزەکانی ئێمەدا بمێنێتەوە، زیندانی سیاسی بوو، هەڵاتووبوو، خەڵکی ئاوامان زۆرکردوە، هەروەکو باسمکرد هەم ئەم دۆستایەتیەمان دەکردلەگەڵ یەکێتی و لەگەڵ سەرجەم بزوتنەوەی کوردستانی عیراق و لەگەڵ خەڵکی شۆڕشگێڕو ئەوانە لەلایەکی دیکەوە ئاخر داخوازییەکانی دەوڵەتی عیراقشیمان بەجێ نەدەگەیاند، وە لەلای سێیەمەوە لە جێی خۆی ئەو جێێیەی تاوانەکە گەورەبوایە، تاوانکارەکانیشمان لەقاڵ دەدا، دەی ئیتر هەرئەوەندەشمان پێدەکرا.



# مام جەلال دۆستی هەرە باشی کۆمەڵەیە

***کێ لەیەکێتی زۆر دۆستانە؟**

**عەبدوڵای موهتەدی:** دۆستمان یەکجارە زۆرە.

***بەدەرجەی یەك؟**

**عەبدوڵای موهتەدی:** دیارە مام جەلال نێوانێکی نەك هەر بۆئێمە، بۆ زۆر کەسی دیکەشی وایە، ئەو نزیکایەتی و ئەو تێگەیشتن و تەفاهومەی کەمام جەلال هەیەتی بەرامبەر بەسەرجەمی سیاسەت لەئێران لەدەیان ساڵی رابردوو ئەو نزیکایەتییەی کە مام جەلال لەگەڵ سیاسەت لە کوردستانی ئێران هەیەتی، لەگەڵ چەموخەمەکەی هەیەتی، لەگەڵ کەسایەتیەکان هەیەتی کەم کەس لەیەکێتیش و لەپارتیش و لەخەڵکیکەش کەم کەس هەیەتی.

بەنسبەت ئێمەشەوە کەسێکی زۆر نزیکە، چۆن بڕیاردەریش بووە، لەیەکێتی نیشتمانی دیارە ئەوە کەسێکی زۆر نزیکە، بەڵام بەراستی دۆستانی ئێمە تەنیا ئەوەڵەن تەنیا یەکێتی نین لەناویەکێتیشدا تەنیا مام جەلال نییە، زۆر کەسی دیکە هەیە ئەوپەڕی دۆستایەتی ونزیکایەتی و چوزانم تیکەڵاویمان بووەو لەگەڵی هەیەتی و شانازیشی پێوە دەکەین و ئێمە دۆستمان زۆرە.

# مام جەلال خەمخۆری هەر چوار پارچەی کوردستانە

*** برادەرێکی ئێوە ئەگەر بەسوبعەتیش بێت دەڵێ "یاخوا لە تەمەنی من هەڵگرێ و بیخەیتە سەرتەمەنی مام جەلال، بەراستی زۆر دۆستمانە"، ئەوە دەلالەت نییە،بەڕاستی زۆر هاوکاریتان ئەکات؟**

**عەبدوڵای موهتەدی:** بەڵێ من بەدۆستێکی راستەقینەی خۆمانی دەزانم، بەڵام پێموخۆشە بڵێم ئەمن مام جەلال بەدڵسۆزەکانی کوردستانی دەزانم بۆ خەڵکی دیکەش کاری زۆر کردوە، مام جەلال راستە سکرتێری حزبێك بوە، بەڵام خەمخۆری پارچەکانی کوردستان بووە.

# باوکم زۆر یارمەتی مەلا مستەفای بارزانی داوە

*ئەوە پەیوەندییە پتەوەی تۆ و مام جەلال یان کۆمەڵەو مام جەلال ناگەڕێتەوە بۆ ئەو پەیوەندییە بەهێزەی باوکت کەلەوسەردەمەیەدا یارمەتی یەکێتی داوە یاخود بنەماڵەی ئێوە یارمەتی داوە، ئەوە لەلایەك دومیش ئەو پەیوەندییە بەهێزەی ئێستای (سەلاحی مەهتەدی) لەگەڵ مام جەلال هەیەتی؟

عەبدوڵای موهتەدی: جارێ با پێمخۆشە بڵێم کە باوکی من بەحسابی ئەوەی کەلە کۆماری مهاباد بوەو لەوێ وەزیربوە، زۆر کۆن لەگەڵ مەلامستەفای بارزانی و دواتر لەگەڵ پارتیو لەگەڵ ئەوانە هەموی تێکەڵ بووە، لەکاتی شۆڕشی ئەیلولدا من باوکمو مامم و بنەماڵەی ئێمە بەپانەوەو بە خڕی یارمەتی شۆڕشی ئەیلولمان کردوە، کە لەژێر سەرۆکایەتی مەلامستەفادابوو.

# پارتی و هاوکاری کۆمەڵە

*ئەی بۆ پارتی یارمەتی ئێوەنادا ئێستا؟

عەبدوڵای موهتەدی: ئاخر ئەوە پرسیارێکە دەبێ لەوانی بکەی.

*هۆکارت لانییە؟

عەبدوڵای موهتەدی: نەو، ئەمن هیچ هۆکارێك بۆئەوە نابینم.

* پارتی ئەڵێ کۆمەڵە بەدێژایی مێژوو دۆستایەتی یەکێتی ئەکاتو زۆر نزیکە لەیەکێتیو هاوکارییان زۆر ئەکات، هاوکاری یەکتر زۆرئەکەن، دۆستایەتیەکەیان زۆرپتەوە بۆیە هاوکارییان ناکەین؟

عەبدوڵای موهتەدی: جانەوان بۆ خۆیان دۆستایەتی یەکێتی دەکەن، ئەمە جورمە، بێجگە لەوە ئێمە خۆنەمان شاردۆتەوە دۆستی یەکێتین، بەڵام ئایا ئەوە بەو مەعنایە دێت کە ناتوانین دۆستی پارتی بین، بەهیچ جۆرێك ئاوا نییە، جا پەیوەندیشمان هەیە ئەوە بۆ ئاگاداریت لەگەڵ پارتیدا.



***تازەیە؟**

**عەبدوڵای موهتەدی: بەڵی هی ئەم چەند ساڵی رابردوە، بەڵام پەیوەندیمان لەگەڵ پارتی هەیە، لە موناسەبەتەکاندا ئێمە دەچین بۆلای یەکتری وە پەیامی پیرۆزبایی بۆ ساڵرۆژەکانی یەکتر دەدەین، هاتوچۆوسەردانمان لەگەڵ یەکتری هەیە، لەئاستی مەکتەبی سیاسیشدا یەکترمان دیوەتەوە، ئێمە پێمانوایە ئەمە هێشتا هەرچەند هەنگاوێکی باشە، بەڵام ئەوە بەکافی نازانین وە لەلایەن خۆمانەوە زۆرجاریش ئەوەمان دەربڕیوەو خۆشیان ئاگادارن پارتی، سەرکردایەتی پارتی کە ئێمە پێمانوایە ئەو دۆستایەتی و نزیکایەتیە دەبێ زۆر لەوە زیاتر توندوتۆڵ بکەینەوە هەردولامان ئەوە بەمەسلەحەتێکی هیچ لایەك نازانین کە یەعنی دۆستایەتیەکە سنوورداربێ.**

# ئێمە داواکاربووین بۆ هاوکاری لەگەڵ پارتی

***تۆ ئێستا وتت پەیوەندییەکە توندوتۆڵ بکەینەوە، واتا ئیهمالیەکە لەوانە، خەلەکە لای ئەوانە ئەوان چیبکەن ؟ پارتی چیبکات؟**

**عەبدوڵای موهتەدی: پارتی زۆرکار دەتوانی بکات، ئەگەر بیەوێ بیکا، جا ئایا بڕیاریان نەداوە یا قسەکانیان بە جوانی بە گوێ نەگەیشتوە یا هەرچی بووە بەڕاستی ئەمن ناتوانم سەرچاوەکەی بینم، بەڵام قسەی ئێمە ئەوەیە، دەڵێین ئێمە خوازیاری توندوتۆڵکردنەوەی ئەم پەیوەندیەو ئەم دۆستایەتییەین، خوازیاری ئەوەین کە بگاتە باشترین ئاست وسەروترین ئاست لەنێوانماندا وە هیچ هۆکارێك نابینین بۆئەوەی کەوانەبێت لەبەرئەوەی ئەگەر نەکراوە تەبعەن ئێمە بەخەتای خۆمانی نازانین دوای ئەوەی ئێمە داواکاربووین.**

# پارتی چەندین هەڵەی بەرامبەر کوردی ئێران کردوە

***ئاخر خاڵێکیش هەیە لای ئێوە موهمە، ئەوە وەزعیەت و باگراوەند سیاسیە مێژوویەی پارتی سەبارەت بەکوردستانی ئێران، سەبارەت بە خەڵکی کوردستانی ئێران ئەو شتانەی کەلەسەردەمی مەلا ئاوارەدا رویداو، ئەو پەیوەندیەی پارتی وسەردەمی شا ئەوانە لای ئێوە حسابانێکی تایبەتی لەسەرکراوە، وانییە؟**



عەبدوڵلای موهتەدی: ئێمە پێمانوایە هەڵە لەسیاسەتی پارتیدا هەبوە، دیارە ئەوە کاریگەریشی بووە، پارتی چەندین هەڵەی بوە لەپەیوەندی خۆی لەگەڵ کوردی ئێراندا، بەلاّم وا نییە خزمەتیشی نەکردبێ، وانیە خەڵکی دیکەش بەتەواوی بێ هەڵە بووبن، ئێمە خوازیاری چۆن بڵێم کولاندنەوەی ئەو برینانە نین، خوازیاری ساڕێژکردنی ئەو برینانەین و مەسەلەحەت و بەرژەوەندی کوردی عیراق وئێران لەوەدادەبینین، نەك تەنیا حزبەکانیش، کە برینی نێوان خۆیان ساڕێژکەنەوەوە، بەدڵێکی تازەوە بە دڵێکی فراوانەوە بەسنگێکی فراوانەوەو بەدیدێکی تازەوە پێکەوە هاوکاریبکەن، چۆن هەربەڕاستی ئەوەقسەی ئەمڕۆم نییە، دەمێك ساڵە ئێمە ئەوە هەوڵدەدەین بەگوێی هەموو حزبە کوردییەکانی کوردستانی عیراقیدا بدەین کە پەیوەندییەکی تایبەت لەنێوان کوردستانی ئێران و عیراق هەیە وە پێویستە حزبەکانی کوردستانی ئێران و عیراق نزیکایەتی زۆرتر بکەن.

هاوکاری زۆرتربکەن تا ئەو جێیەی کە دەگاتە ئاستی داڕژاندنی ستراتیژییەکی هاوبەش بۆ خۆیان، شەرت نییە ئێمە عەینی یەك سیاسەت و یەك تاکتیکمان بێ، ئەوان لە عیراق و ئێمە لەدیوی ئێران، بەلاّم دەتوانین زۆر زۆر خاڵی هاوبەشی ستراتیژیکمان بێ ڕەوتی ڕووداوەکانی ساڵانی ڕابردوش ئەوە بەئێمە نیشاندەدا، کە هاوچارەنوسی هەموو پارچەکانی کوردستان جا بەتایبەتی ئەم دوپارچە لەگەڵ یەکتری ڕۆژ بەڕۆژ زیاتروزیاترە.

ئێران روو لە گۆڕانە، کوردستانی ئێران دەورێکی گەورەی دەبێ لە گۆڕانی داهاتوی ئێراندا، جێی خۆیەتی کە حزبەکانی کوردستانی عیراق، سەرنجێکی زۆرتر بدەنە ئەوە، ئەمن گلەیم لە هەمویان هەیە لەو پەیوەندیەدا پێموایە کەم کارییەك دەکرێت ئەوەندەی پێویستە گوێنادەنێ، یاخەم ناخۆن لەوەی داهاتوی کوردستانی ئێران چییە، کوردستانی ئێران ئەهەمیەتێکی هەیە لە نەفس وزاتی خۆیدا لە هەمانکاتدا عومقی ستراتیژیکە بۆ کوردستانی عیراق قسە زۆرە لەوبارەیەوە وە بۆیەکە پێموایە نەك لەو ڕەخنەی ئێمە لە حزبەکانی تر، نەهی ئەوان لەئێمە، ئەمانە هیچیان میلاك نین، میلاککردنەوەی لاپەڕەیەکی تازەیە لەپەیوەندی لەگەڵ هەموو حزبەکانداو لەوانە لەگەڵ پارتیشدا بەمەبەستی ئەو هاوکارییە ستراتیژیکیە.

## داوای کردنەوەی بارەگامان لە پارتی کردوە

*هەوڵتانداوە بۆ نزیکخستنەوەی ئەو پەیوەندیانە؟

عەبدوڵلای موهتەدی: بەڵێ داومانە.

*ئەی دەرەنجامی چیبوە؟



عەبدوڵلای موهتەدی: ئەوەندە بوە کە باسمکرد، یەعنی تا ئاستی دەفتەری سیاسیش دانیشتنمان هەبووە، کارمان هەبووە، دۆستایەتیمان هەبوە.

*ئەی بۆ بارەگا لەمەنتیقەی سنوری جوگرافی پارتی ناکەنەوە؟

– عەبدوڵلای موهتەدی: ئاخر دەبێ ئیجازەمان بدەن.

*نەیانداوە؟

عەبدوڵلای موهتەدی: تائێستا نە.

*داواتانکردوە؟

عەبدوڵلای موهتەدی: بڵێم تازەیی نا، بەلام پێشتر داوامانکردبوو، هەتا ئەو لەو ئاستەدا لە ئاستی هەرەسەرەوەدا یەکتر نەبینین.

# خەڵک هەیە قسەی خراپ بۆ پارتی دەکەن، دژی ئێمە

---

*سالی چەند داوای مۆڵەتتان کردبوو ئێوە پارتی پێینەدان ؟

عەبدوڵلای موهتەدی: ساڵەکەم لەبیرنییە، بەلام دەزانم ئەم سێ چوارساڵە بوو چوارپێنج ساڵەبوو(2001–2002).

*وەلامی پارتی چییە بۆئەم پێنەدانی مۆڵەتە؟

عەبدوڵلای موهتەدی: ناڵێن نا، بەلام دەڵێن لێی دەکۆڵینەوەو بابزانین چۆن دەبێ و دیراسەی دەکەین.

*خۆدزینەوەیە؟

عەبدوڵلای موهتەدی: نازانم ئەوەیە خۆیان دەبێ جوابیدەنەوە.

*من پێتدەڵێم خۆدۆزینەوەیە، بەس خوێندنەوەی ئێوە چییە بۆئەو خۆدزینەوەیە؟

عەبدوڵڵای موهتەدی: من زۆرتر ئاوا دەڵێم، من هەست بەوەدەکەم ئەهەمییەتی ئەو پەیوەندییە لەگەڵ بەگشتی کوردستانی ئێران بە تایبەتی لەگەڵ کۆمەڵە یا هێشتا ئەسڵی سەرکردایەتی پارتی هەستی پێنەکردوە، ئەمن پێموایە قسەی خراپیان زۆر بۆ دەگێرنەوە وە بەرچاویان لێڵدەکات ئەو قسانە.

# پەیوەندی پارتی و دیموکرات زۆر لەپێشە

*حزبی دیموکرات؟

عەبدوڵڵای موهتەدی: شەرت نییە هەرئەوان بن.

*پەیوەندییەکانیان لەگەڵ حزبی دیموکرات زۆر لە پێشە؟

عەبدوڵڵای موهتەدی: ئا، لەگەڵ ئەوان پەیوەندییان باشترە تا ئێمە.

*هەرئەوەشە کێشەیەکی لەناو حزبی دیموکرات دروستکردوە، یەکێك لەو فاکتەرە دەرەکییەکانە پێموایە چونە پێشی پەیوەندییەکانی حزبی دیموکراتو پارتیە لەکاتی (مستەفا هیجری)دا مەبەست ساڵی (2006)ە؟

عەبدوڵڵای موهتەدی: حزبی دیموکرات کێشەی زۆر لە کۆنەوە هەبووە، من پێموایە تەحلیلو لێکدانەوەی کێشەکانی حزبی دیموکرات پێش هەموو شتێك دەبێ بگەڕێتەوە سەر هۆکارە ناوخۆییەکان تا هۆکاری دەرەکی.



# تائێستا مەسعود بارزانیم نەبینیوە

*دواتر ئەچینە سەرئەو مەسەلەیە کاك مەسعود بارزانیت بینیوە لە نزیکەوە؟

عەبدوڵای موهتەدی: نەخێر، تائێستا نەخێر.

*حەزئەکەی ببینی لە نزیکەوە ؟

عەبدوڵای موهتەدی: بەڵێ، من زۆر داواکارم بەتایبەتی پێموایە ئەو لەپۆست و مەوقیعەتی ئێستایدا کە سەرۆکی هەرێمی کوردستانە بۆخۆی دەبوو لەدوای ئێمەمانان بنێرێ، لەدوای حزبەکانی تر، هەمویان.

# ئامادە نەبووم، سەدام ببینم

*"سەدام" ت بینیوە؟

عەبدوڵای موهتەدی: نەخێر ، زۆریش ئەو وەختی داواکرا، بەسەری تۆ ئامادەنەبوم ببینم.

*تۆ داواتکرد یان ئەوان؟

عەبدوڵای موهتەدی: نەخێر ، نەخێر ئەوان بەناڕاستەوخۆ ڕایانگەیاندبوو ئەگەر شتێکی ئاوا داوابکەن، ئێمە موافەقەتی لەگەڵ دەکەین داوامان نەکرد.

*ئەم کتێبەی کە ئێستا لەبەردەستماندایە کە ئەیبینی، سەدام حسێن و مەسعود ڕەجەوی یەکتر ماچ ئەکەن، تۆ حەزت ئەکرد ڕەسمێکی ئاوات بلاوبێتەوە؟

عەبدوڵای موهتەدی: نا وەڵلا هی قەت ، پەیوەندی لەگەڵ دەوڵەتی عیراق وحکومەتی بەعس بۆ ئێمە غەیری پێویستیەکی موتڵەقی مانەوەی خۆمان هیچ شتێك نەبوە، هیچ نزیکایەتیەکی فیکری، سیاسی، دۆستایەتی، هیچ شتێك غەیری ئەوەی ئێمە نا عیلاج بووین لە دیوی عیراق بووین، هیچ شتێکی دیکە لەئارادا نەبوە، هەروەکو باسیشمکرد زۆریان بە گوێ هەڵهێنااین، بەتایبەتی ناوی منیان بردوو کە ئەگەر ئۆستاز عەبدوڵلا داوابکا ڕێگەی بۆ دەکەینەوە.

***ئەمە بەخیانەت دەزانی، ئەمەی مەسعودی رەجەوی و ئەم کتێبەکەلەسەر جینایەتەکانی؟**

عەبدوڵای موهتەدی: ئاخر خیانەت تەنیا لەو عەکسەدا نییە.

# مجاهیدین خەڵق بوون بەبەشێک لەبەعس

*** ئەخێر مەبەستم ئەو خەڵکانەیە کە بەدەلیل کوژراون لەسەردەستی مجاهیدین لەراپەرینی (1991)ی کوردستانی عیراق؟**

عەبدوڵای موهتەدی: بەڵێ من پێموایە مجاهیدین، نزیکی موجاهیدین لە حکومەتی بەعسی عیراق، زۆر جیاوازە لە نزیکایەتی ئۆپۆزسیۆنی کورد، ئۆپۆزسیۆنی کورد، بۆمانەوەی خۆی، درێژەدانی شۆڕشەکەی، بزوتنەوەکەی ناعیلاج بوو دەستی تێکەڵ نەکرد لەگەڵ سەدامو بەعس لە جینایەتەکانیدا، جا ئێمە دەڵێن ئێمە باشتریش بوین لە خەڵکی، هەر مەسەلەن یەك نوختەی زەعیف نەبوو، بەڵام بەگشتی ئۆپۆزسیۆنی کوردی ئێران ئیمتیحانی خراپی نەدا، بەڵام موجاهیدین دەستیان لەگەڵ حکومەتی عیراق تێکەڵاوکرد، موجاهیدین بون بەبەشێك لەدەزگای داپڵۆسێنەروە دەزگای زانیاری وئتیلاعاتی حکومەتی عیراق، هاوکاری ئەوان، بەبڕوای من هیچ خەتێکی سوری نەمێشتەوەو زۆر کارێکی زۆر هەڵەبوو یەعنی هیچ سنورێکی نەمێشتەوە.

# لە(31) ئابی (1996) یارمەتی یەکێتی و پارتیمان داوە

***ئەوەم لەبیرچوو پێت بڵێیم لە کارەساتی (31)ی ئابدا کۆمەڵە هیچ هەڵوێستێکی نەبوو، راگەیاندنێکی گشتی بڵاونەکردەوە، تەنها شتێکی بڵاوکردۆتەوە بەناوی راگەیاندنی کۆمیتەی ناوەندی نەناسراوە، ئەویش ئەوەیە کە ئەوە کارێکی خراپە، شەڕی ناوخۆ دەرەنجامی ئەوەیە لە کارەساتی(31)ی ئابدا ئێوە هەندێ خێزانەکانتان گرتۆتەخۆتان لە خەڵکی سلێمانی، بەڵام دواجار بۆ راگەیاندنێکی گشتیتان بڵاونەکردەوە کە پارتی بەعسی هێناومو کۆمەڵێك شت رویدا؟**

عەبدوڵای موهتەدی: ئێمە چ لە (31)ی ئابدا کە یەکێتی لێرە پەرەوازەبوو بە بنەماڵەبەخانەوادە یارمەتی ئینسانیمان کردوە نەك یارمەتی عەسکەری، وەختێکیش پێمخۆشە ئەوە بزانی وەختێکیش



پارتی لێرە ڕۆیی و یەکێتی هاتەوە ئێمە یارمەتی ئینسانیمان بە هەندێك بنەماڵەو کەسایەتی و خەڵکی پارتیش کردوە هەر لەم شارە، یەعنی لەهەردوك حاڵەتدا تەنها یارمەتی ئینسانیمان پێشکەشکردوە بۆ هەردوو لاشمان پێشکەشکردوە، یا تەنانەت بۆ هەندێك خەڵکی بێلایەنمان پێشکەشکردوە، هی وا بووە سەروەت و سامانی هەبوە باوەڕی بەهیچ کەس نەبوە لای ئێمەی داناوە ، بۆمان ڕاگرتوە تادوای ماوەکەو داومانەتەوە.

# پێمان باش نەبوو لە ( 31 ) ئابدا، ڕاگەیاندن بدەین

***مەبەستم ئەوەیە بۆ ڕاگەیاندنێکی کۆمیتەی ناوەندیتان نەبوو لەوکاتەدا؟**

عەبدوڵای موهتەدی: پێمانوابوو جێگەی خۆی نییە، ئێمە ڕاگەیاندنێك بدەین لەوەدا، لایەنێك بگرین بەباشمان نەزانیوە هیچ ڕاگەیاندنێك بەهیچ شێوەیەك بدەین لەسەری.

## دانیشتی ئێران وکۆمەڵە و دیموکرات

## ئێران، مام جەلالی ڕاسپاردوە بۆ دانوستان لەگەڵ کۆمەڵە و دیموکرات

***قسەیەك هەیە گوایە مام جەلال چەندین جار هەوڵی مفاوەزاتی داوە لەنێوان کۆمەڵە یا دیموکرات یا بەیەکەو بۆ دانوسان لەگەڵ جمهوری ئیسلامی ئێران لە قەلاچوالان ئێوە لەوبارەیەوە چەندجار ئەو هەولانەتان پەسەندکردوە؟**

عەبدوڵای موهتەدی: حکومەتی ئێران ئەم دەورەی ئەحمەدی نەژادو ئەم دەورە تازە نالێم، بەلام پێشتر لەسالانی ڕابردودا زۆرجار هەوڵیداوە و داوایکردوە لەخەڵکانی جۆر بەجۆر شتی ڕاسپاردوە یەك لەوانە بەمام جەلالیش بوە بۆلای دیموکراتیشی ڕاسپاردوەو بۆلای ئێمەشی ڕاسپاردوە، یەکێك تەنیا یەکێك لە جارەکان کە پێموایە ئەگەر بەهەڵە نەچووبم لەفێبروەری یان مارسی (2003)دابوە، زۆرجاری ڕاسپارد، بەلام ئێمە تەنها ئەو جارە دانیشتین، بەڵی من مقابەلەی مفەسەلم کردوە



لەسەرئەوەو بەوردی باسمکردوە لەسەری وە خەڵکی تریش لە هاورێکانی ئێمە باسی ئەو دانیشتەیانکردوە ئێمە نەمانشاردۆتەوە.

***ئەو دانیشتانە لەگەڵ کێ بوو، گەیشتین بەچی؟**

**عەبدوڵلاّی موهتەدی:** نەگەیشتن بەهیچ .

***بۆ؟**

**عەبدوڵلاّی موهتەدی:** ئاخر خۆ ئێران نایەوێ هیچ بدا، درۆدەکا.

***ئەی بۆ دانیشتی لەگەڵیاندا؟**

**عەبدوڵلاّی موهتەدی:** جا ئەوە چەند هۆکاری هەیە،

یەکیان: ئەوەی کە ئەوان دوای هەوڵێکی زۆر بەڵێنیاندابوو کە حەتمەن قسەیان پێیەو شتیان پێیەو ئەوانە، ئەمەیەك .

دووهەم: ئێمە نەماندەویست کەوا نیشانبدەین کەلایەنی کورد خوازیار نییە بۆ گفتوگۆو دەمانویست جارێکی دیکە نیشانبدەینەوە کە لایەنی کورد بۆ چارەسەری ئاشتیانەی مەسەلەی کورد ئامادەیە، بەلاّم حکومەتی ئێران نییە،.

سێهەمیش: ئێمە هەر ئەو وەختیش چ لەگەڵ حزبی دیموکرات چ لەگەڵ خودی هەیئەتی کۆماری ئیسلامی ئەوەمان راگەیاندوە، کە ئێمە مزاکەرەو گفتوگۆکانمان ئاوا بەباشی دەزانین کە لەگەڵ هەیئەتێکی کوردی بێت تا لەگەڵ هەیئەتێکی حزبی ، هەروەها من پێموایە ئەو دانیشتنەی (2003) کە ئێستاش نۆتەکانی من هەر لای خۆم ماوە کەچی وتراوە چی باسکرا، ئەمن بەلاپەرەیەکی زۆر زۆر سەرکەوتو وپڕ لەشانازی دەزانم بۆ کۆمەڵە، ئێمە بەبێ هیچ موجامەلەیەك هەموو تاوانەکانی کۆماری ئیسلامیمان لەئێران باسکرد.

# ئێران تەنها بۆ روخان دەبێ

***حەزنەکەی لەگەڵ جمهوری ئیسلامی لەمفاوەزاتێکا رێکەون، ئێوەو دیموکراتو هەموو ئۆپۆزسیۆنی کوردستانی ئێران رێکەون ودانوسانێك بێ لەنێوانتاناو ئێوە بچنەوە ئێران و جەنابتان لەناو دەوڵەتدا کاربەدەستێك بن؟**

عەبدوڵڵای موهتەدی: دەوڵەتی جمهوری ئیسلامی.

*بەڵێ؟
عەبدوڵڵای موهتەدی: نەخێر ئەو دەوڵەتە بۆ روخان دەبێ، بۆ هیچ شتێکی تر نابێت، ئەسڵەن گفتوگۆو رێکەوتنی ئەوان لەگەڵ کورد مومکین نییە، جارانیش مومکین نەبوو چ جای ئێستا کە ئەحمەدی نەژاد لەسەرکارە.

***ئەگەر جمهوری ئیسلامی ئامادەبێت و ئۆتۆنۆمی بدات بەئێوە و دیموکرات ئامادەن دانیشتن و مفاوەزات بکەن و بگەنە ئەتیجە؟**
عەبدوڵڵای موهتەدی: لەروی تیئۆرییەوە ئەوە غەیری مومکین نییە، یەعنی من بڵێم لەتیئۆریدا ئێمە ئاوا دەڵێن ، دەڵێین ئەگەر چی ئێمە خوازیاری لاچونی رژێمی جمهوری ئیسلامین لەئێران، وەکو بەشێك لە خەڵکی ئێران ئێمەش خوازییاری لاچونی ئەو رژێمەین، بەلام لەکاتی خۆیدا ئەگەر ئەم رژێمە بیەوێت بەراستی خواستەکانی گەلی کوردبدا ئێمە ناڵێین نا، چونکە ئێمە نوێنەری خەڵکی کوردستان و ئەو بزوتنەوەین، ئەگەر بەراستی کۆماری ئیسلامی ئێران ئامادەی دانی مافی کورد بوو بێ بەڵێ ئێمە ئامادەین دانوستانی لەگەڵ بکەین، دەڵێم بەشێوەیەکی یەعنی ئەبستراکت، تیئۆرێك ئەگەر قسە بکەین بەلام ئایا عەمەلی ئەو شتە مومکینە.

***ئەگەر مومکین بوو؟**
عەبدوڵڵای موهتەدی: ئاخر دەڵێم ئەبستراکت، ئەگەر مومکین بوو بەڵێ.

***ئەگەر مومکین بوو ئێوە ئامادەن ئۆتۆنۆمی قبوڵ بکەن، بەکۆمەڵی ماف، یا ئێوە بەوە رازین ؟**
عەبدوڵڵای موهتەدی: نەخێر، ئێمە دەسەلاتی کوردستان بدەن بە خەڵکی کوردستان ئێمە خواستەکەمان ئەوەیە ئیتر، دامەزراندنی دەسەلاتی خەڵکی کوردستان بەسەرسەرزەمینی خۆیاندا، یەکخستنەوەی هەموو بەشەکوردنشینەکانی کوردستانی ئێران لەیەکەیەکی سیاسی و ئیداریدا، دانی دەسەلات بەم خەڵکە بەشێوازو بەمیکانیزمی دیموکراتیکەو ئەگەر ئەمە تەحەقوق پەیدابکا و بێتەدی کە تەبعەن شتێکی زۆردورە شتی وا هەرناکرێت، بەلام تۆ فەرزی ئەمە لە من دەپرسی، ئەگەر فەرزی ئەمە بدەن بۆ نایکەین، ئەمە مەعنای ئەوەیە جمهوری ئیسلامیمان هەڵپێچابێ و دەرمان کردبێ لە کوردستان ئیتر، بێجگە لەوە لەم حاڵەتەدا کوردستانێکی دیموکرات و ئازادت هەبێ، کاریگەریەکی



زۆر گـەورە لەسەرتاسـەری ئێـرانیش دادەنـێ، بـەڵام بەهـەرحاڵ ئەوانـە عەمـەلی نـین ئەوانـە بەحسـی ئیپۆتێوزن.

# هێرشی سوپای پاسداران بۆ سەر کۆیەو دیموکرات

# لەکاتی هێرش بۆ سەر دیموکرات لەلایەن پاسدارانەوە کۆمەڵە لەحاڵەتی ئامادەباشیدا بوو

***لەو بەحسانەی کە پەیوەندی ئێوەو یەکێتی و پەیوەنـدی بـەعس، بەتایبـەتی ئـەوەت بیردەخەمـەوە شەوی ( 6/5ی گەلاوێژی 1375 ) بەرامبەر( 27/26ی ژوی 1996 ) چەند هـەزار پاسـدار لـە مەعسـكەر سەلام بەرەو كۆیە ئەڕۆن و وەلە ( 28 )ژوئەی هەرئەوكاتە تـۆپ بـارانی مقـەرەكانی حزبـی دیمـوكرات دەكەن و مەكتەبی سیاسـی حزبـی دیمـوكرات لـە( 7- 5- 1996 ) بەیاننامەیـەك دەردەكـاو ئیدانـەی ئەوكارەی یەكێتی دەكا، یەكـەم مەبەسـتم ئـەوە ئـەو هێرشـە بـۆ نەكرایەسـەر زڕگـوێز بـۆ نەكرایـە سەربارەگاكانی ئێوە؟**

**عەبـدوڵڵای موهتـەدی:** لـەكاتی ئـەو هێرشـەدا لـەحاڵی ئامادەباشـی بەسـەرماندەبرد، خۆمـان ئامـادەكردبوو كـە ئەگـەر هێـرش بكەنـە سـەر ئێمـەش لەبەرامبەریانـدا بوەسـتینەوەو شـەرمان بكـەن شـەڕیان بكەینـەوە، ئـەوەتا ئـەو جێـی دەگەڕێتەوەسـەر خۆمـان، ڕەنـگ بـێ ئێسـتاش هـەموو شـتێكی دەرنەكـەوتبێ كـە بۆچـی ئەوشـەڕەكرا، بـەڵام پێموخۆشـە ئـەوەت پـێ بڵـێم ئێمـە ئـەو وەختـیش وە دواتریش ئەو هاتنـەی ئێرانمـان مەحكوم كردوە، بەكارێكی خراپی دەزانینین وە ئەو ڕێگەدان وشان شلكردنی یەكێتی بۆئەوەی كە پاسدار بێنێتە ناو خاكی عیراق وە لە دەفتەری سیاسی بدات.

# گلەیمیان لەشەخسی مام جەلال كردوە

***پێیتانوایە هۆكارێك؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** پێشمان وتون بەشەخسی مام جەلالم وتوە، وتی ڕاستدەكەی هەڵە بوین.



***ئەی بتوتایە بۆکردتان؟**

عەبدوڵڵای موهتەدی: ئاخر ئیتر خۆمن ئەم کێشاوەتەگیروگازی محاکەمە، بەڵام هەڵویستی خۆمان و تێبینی خۆمانم، ئەوانە هەموو پێڕاگەیاندن.

*** پێت نەوتن ئەوە لەروی مێژووییەوە کارێکی خراپەو دەمێنێتەوە لەسەر داهاتوی ئەو پەیوەندییانە؟**

عەبدوڵڵای موهتەدی: هەموی ئەوانەی کە تۆ پێتوابێ دەبێ بیڵێیت، تەبعەن لەچوارچێوەی ئەدەب و گفتوگۆیەکی سیاسی لەگەڵ کەسایەتیەکی وەکو مام جەلالدا ، بەڵام هەموی ئەوانەمان پێی راگەیاندوە.

***لەهەموو ئەو بەحسانەی کە کراوە لەگەڵ خەڵك، دەڵێن جا خۆ یەك پێشمەرگەی دیموکرات خوێنی لە لوت نەهاتوە، ئەو جوابە مەنتقییە پێتوایە؟**

عەبدوڵڵای موهتەدی: ئەو جوابە بەشێك لە حەقیقەتی تێدایە، بەڵام هەرگیز پاساوی هەڵەکە ناکات.

# ئەوە هەڵە بوو یەکێتی کردی

*** پێتوانییە ئەوە خیانەت بوو؟**

عەبدوڵڵای موهتەدی: پێموایە هەڵەیەکی سیاسی بوو، ئەو، من بەخیانەتی دانانیم ، بەڵام بەهەڵەیەکی سیاسی گەورەی دادەنێم قەت نەدەبوایە ئەو کارەبکەین ، بەڵام حزبی دیموکراتیش بێتاوان نەبوو لەوکارە.

# دیموکرات زیادەرۆیی دەکرد

***چۆن؟**

عەبدوڵڵای موهتەدی: حزبی دیموکراتیش لەوسەردەمە دیاریکراوەدا زیاد لەحەدی خۆی، زیادە لەوحەدەی کەبەبڕوای من مەسئولانەبوو، زۆریان لەبەر پارانەوە، یەعنی مەبەستم ئەوەیە یەکێتی، سەرانی یەکێتی شەخسی مام جەلال، هەینەتی جۆرەبەجۆرەیان نارد، زۆریان تکا لەگەڵ کردن، زۆریان داوالێکردن ، بەڵام بەهیچ جۆرێك حزبی دیموکرات ئامادەی بەڕێوەبردنی هەندێك شت یان



قبوڵی هەندێك تەعەهودات نەبون بەرامبەر بە کوردستانی عێراق ، من پێموایە ئەو کارە لەلایەن ئەوانیشەوە کارێکی بەجێگەنەبوو.

# دیموکرات بەڵێنامەی داوە بەیەکێتی دوای هێرشەکانی پاسداران

*چیان داوانەکرد، یەعنی یەکێتی چی داوانەکردو ئێوە کردبوتان؟

عەبدوڵلای موهتەدی: من پێم باشە ئەو وردەکارییانە لە حزبی دیموکرات بپرسی، جا بۆ ئاگاداریتان، من پێموخۆشە یەك شت بزانن ئێمە هەرگیز نەچوینە ژێرباری هیچ شتێکەوە کە ئێران بیڵێ، بەڵام حزبی دیموکرات شتی ئیمزاکردوە بۆ ئاگاداریت، دوای ئەو هێرشە مەکتەبی سیاسی حزبی دیموکرات شتی ئیمزاکردوە، تەعەهودی نوسراوی داوە بەیەکێتی، بەڵام ئێمە هەرگیزتەعەهودی نوسراومان نییە، بەڵام خۆمان ئینسان بۆ خۆی دەبێ ژێربێ بزانی چوارچێوەو سنورەکە تەشخسش بدا، مەسئولانە بەرامبەر بە ئەزمونی کوردستانی عێراق بجوڵێتەوە، ئێمە ئەوەمانکردوە ئەگینا قەت بەحەییاتمان تەعەهودێکی ئەوتۆمان نەداوە کە حزبی دیموکرات داوێتی.

# کۆمەڵە تەعەهودی نەداوە، دیموکرات داویەتی

*ئەو تەعەهودانە ئەوەبووە کە ئیتر لەسنورەکان نەپەڕێتەوە، هێرشی چەکداری ناکا؟

عەبدوڵلای موهتەدی: داویەتی هەموی داوە ، یەك تاقیمان نەداوە ئێمە.

*بۆ نەتانداوە هەر لەبەرئەوەی کە ژێرانە رەفتارتانکردوە ، یا ئەی بۆ باسی ئەوەناکەی رەنگە یەکێتی فشاری نەخستۆتەسەرتان وەك حزبی دیموکرات ، پاسداری نەهێناونەسەر، ئەگەر پاسدار بهاتایە سەر زرگوێزیش ئێوەش دەبوو ئەو تەعەهودە بدەن کە ئیتر چالاکی چەکداریتان کەم بکەنەوە، فەعالیاتی نهێنیتان، کەم بکەنەوە جمهوری ئیسلامی قەڵس نەکەن؟

عەبدوڵلای موهتەدی: ئەگەر پاسدار هەتبایە سەر ئێمە سەریشیان ببریبایین ئەو تەعەهودەمان نەدەدا، بەپێچەوانە بەتەواوی تێکدەچوین لەگەڵ یەکێتی ئەمن ئەگەر خۆمان بناسم ئاوامان دەکرد، بەڵام ئێمە

بۆ خۆمان تەشخیسی تەنگانەکانی خەڵکی کوردستانی عیراق و لەوانە یەکێتماندابوو، تەشخیسی ئەوەماندا بوو ئێران لەبەهانە دەگەڕێ.

# بەعس دیموکراتی هاندەدا بۆ چوونەوە ئێران و بەکۆمەڵەشی وت

---

***حکومەتی بەعسی عیراق ئەوە کاتە دەیویست، بەهەر قیمەتێك هەیە پاڵ بە پێشمەرگەو بەحزبەکانی کوردستانی ئێرانەوە بنێ کە لەدیوی ئەم دیو بوون، لەدیوی عیراق بون، بەهەرجۆرێك هەیە بەگژ دەوڵەتی ئێرانیان بکات دەشیزانی دەوڵەتی عیراق درەنگ یا زوو دێتە ناوخاکی عیراقەوە؟**

عەبدوڵلای موهتەدی: لەواقیعدا ئەوەی پێیدەڵێن پرۆڤۆکاسیۆن، یەعنی تەحریکی دەوڵەتی ئێران بوو، ئەم کارە ئێمە ئەو تەحریکەمان پێ ئاقڵانە نەبوو، عەواقبی زۆر زۆر نێگەتیڤیشی بۆ هەموو لایەك بوو، ئەو کارە چ خۆشییەکی تێدابوو، ئەو تەحریکە رادەوستم شەش مانگ ئەو تەحریکە ناکەم ، سورسور مەعلوم بوو حکومەتی عیراق لەپشت ئەو ناردنەوەی هێزی پێشمەرگەیە ، ئەمن بەرژەوەندی بزوتنەوەی خەڵکی کوردستان بەرێوەدەبەم، لەسەر ئەساسی ئەم بەرژەوەندەیە تەماشا دەکەم لە کوردستانی عیراق لە تەنگانەیەکی زۆر سەختدان، ئێران قاچی ناوەتەسەرملیان، ئەلعانی جارێ ئێران تەحریك ناکەم تا ماوەیەك، ئاخر بۆیە دەڵێم حەرەکەتی حزبی دیموکراتیشم پێ مەسئولانەنەبوو، دەشمانزانی کە عیراق بە هەموو هێزیەوە خەریکە بەئێمەشی دەگوت ئاخر نەچویینەوە ئیمکاناتی دەدای و پارەی دەدایی و چەکی دەدای بەهەموو جۆرێك بەگژ ئێرانیدا دەکردیەوە لەوسەردەمەدا، عیراق دەیزانی ئێران عاقیبەت رەت فعلێکی دەبێ دێتە ئەم دیوەوە، کارێك دەکات، دەیویست ئێران بەگژ دەسەلاتی کوردی عیراقدا بکات هەردوو حزبەکە هەرکامێکیان بێ فەرق ناکات دەیویست ئێران بەگژیاندا بکات، کە عاقیبەتیش ئێران هاتوو پاسدار هات، کە من دەڵێم هەڵەیەکی سیاسی زۆر گەورەو خراپ بوو، عاقیبەت عیراق ئیستیفادەی نەکرد.



# یەکێتی بۆ دیموکرات باشتر بووە، تا کۆمەڵە

*هەر لەو بارەیەوە دووبۆچون هەیە یەکێکیان ئەوەیە کە ئێران کۆمەڵەی پێ موهیم نەبوو یان پێی موهیم نییە کە نایەوێ زەربەی لێدا لەوبارەیەوە ئەزەت چییە؟

عەبدوڵلای موهتەدی: رەئی من وانییە، بەلاّم کەسیش خوازیاری ئەوە نییە دوژمن زەربەی لێدا، یاخوا قەت زەربەمان لێنەداباشە، بەلاّم ئاخر خۆ تاریخی ئەوبەینەو مێژوی ئەوە بەینە هەمو ئەوەنیشاندەدا.

*فاکتەرێکی تریشیان ئەوەیە کە ئێوە زۆر دۆستی یەکێتین ، یەکێتی رێگابەوە نادات ئەگەر تۆپ بارانی دۆستەکەی بکرێت بەوشێوەیە ، یان مەجالی زۆر شتی پێبدرێ، ئەو پەیوەندی و دۆستایەتی و نزیکییەی ئێوەو یەکێتی وایکردوە کە ئێوە لەو مەترسیانە بەدورترین؟

عەبدوڵلای موهتەدی: باوەرم پێبکە، ئەگەر بەئەندازەو بەژمارەو بەئەوانە بێ، دۆستایەتی یەکێتی لەگەلْ حزبی دیموکرات لەئێمە زیاتر بوەو کەمتر نەبوە، پەیوەندییان لەئێمە زیاتربوە و کەمتر نەبوە، ئەمن ئەم دیوە قەت یەکێتی نیشتمانی قسورێك بکا بەرامبەر بە حزبی دیموکرات، بەلاّم بەبڕوای من یەکەم دەبوو حزبی دیموکرات مەسئولانەتر، ژیرانەتر، بەدەربەست تر کاربکات ئاکامی نێگاتیڤی کارەکەی بۆخۆی و بۆ بزوتنەوە کوردستان بزانێ، دەستی عیراقی لەپشتەوە ببینێ، هەموو ئەوشتانە عەرزمکردی، یەکێتی نیشتمانی هەرگیز نەدەبوو توشی ئەو هەڵە سیاسیە گەورە ببوایە.

# دیموکرات و یەکێتی هەردووکیان هەڵە بوون

*هەقی ئەوە بەیەکێتی دەدەی مادام بەعس لە پشت ئەو مەسەلەوەبوو، یەکێتی لەلایەکەوە کەوتبوە شەڕەوە لەگەلْ پارتی، لەلایەکەوە تورکیاوپەکەکەو تەنها دەروازیەکی ئێران مابوو، ئێرانیش لەوکاتەدا فشاری ئەکرد کە ئەبێ ئەم مەرجەی من قبوڵکەی لە هەموو ئەو هاوکێشە سیاسیانەدا تاکە رێگای لەبەردەست مابوو کە ئەوەبوو؟

عەبدوڵلای موهتەدی: نەو، هەرگیز ئەو هەقەی نادەمێ.

*نایدەیتێ؟

عەبدوڵلای موهتەدی: نەو.



***نەدەبوو بیکا؟**

عەبدوڵلای موهتەدی: نەدەبوو بیکا، بەهیچ جۆر.

***حزبی دیموکرات ئەی بۆ هەستی بەو مەسئولیەتە نەکرد؟**

عەبدوڵلای موهتەدی: ئاخر باشە ئەویش رەخنەی خۆی لەسەرە، بەڵام ئەمە پاساوی حەتتابەو رەخنەشەوە وە بەو هەڵەی سەرکردایەتی حزبی دیموکراتیشەوە، ئەمە پاساوی هەڵەکەی سەرکردایەتی یەکێتی ناکا.

***ئەی داخستنی رادیۆی دەنگی کوردستانی ئێرانی حزبی دیموکرات پێش ئەوە؟**

عەبدوڵلای موهتەدی: بەڵام بۆ رادیۆکەش داوایان لێکردن تۆزێك شوێنەکەی بگوێزنەوە، شوێنەکەیان گۆڕیستباوە، خۆ دنیا خراپ نەدەبوو .

***یەعنی لە کوێوە بۆ کوێ بیگوێزنەوە؟**

عەبدوڵلای موهتەدی: نازانم ئەلعان بەڕاستی لەبیرم نەماوە بەسەرت، بەڵام دەزانم شوێنیان پێ پێشنیازکردن وتیان کاکە لێرە ئاوایەو وەهایە لەبەرچاوە لێرەوە هەڵسن بچنە ئەوێ و شوێنی تر.

***ئەوە گێچەڵە، ئەوە سوکە گێچەڵە، لەم گردە بۆئەو گردە، لەم شوێنە بۆئەو شوێنە ؟**

عەبدوڵلای موهتەدی: قەیچێکە، دەبیگوێزەوە، قەیچێکە.

# دیموکرات ،ملی نەدا بەگواستنەوەی رادیۆکەیان لەکۆیە

*** ئاخر لەوێش دیسانەوە ئەیانگوت بگوێزنەوە بۆ شوێنێکی کە؟**

عەبدوڵلای موهتەدی: قەیناکە ئەو وەختی دنیا دەیزانی گێچەڵە، بەڵام ئێستا شەخسی مام جەلال چوو، وتی هاتومە ماڵتان خۆم لە ماڵتان خستوە، بابە تۆزێك شوێنی رادیۆکەتان بگوێزنەوە، نەیانگوێستەوە ئیتر حەتتا پێی گوتن کاکە بۆخۆتان لایبەن ، وتیان نەو، دەبێ هەر پێشمەرگە بێنن بە زۆر پێمان لابەن ، ئەوە بەڵگەیە ئەو قسانە کراون، بۆ؟ ئەم عەداوەتەبۆ؟ ئەم قبوڵ نەکەرییە بۆ؟ ئاخر تۆزێك موشکیلاتی لایەنەکەی تریش تێبگەین.



***ئەگەر سبەینێ بەتۆ بڵێن رادیۆی کۆمەڵە بگوێزرەوە، ئەیکەی؟**

عەبدوڵڵای موهتەدی: ئاخر ئەگەر بزانم، دەبێ سەرجەمی هەلومەرجەکە لێکدەدەمەوە، تێدەفکرم، بزانم ئەگەر بەڕاستی لەژێر فشاردا بن، ئەگەر من زەرەرێکی ئەوتۆم لێنەکەوێت لێرە هەڵیدەگرم لەوێی دادەنێم مومکینە ئەوەشی بەقسە بکەم، ئەگەر بزانم سور بەهانە گرتنە و دژایەتیە ئیتر ئەوە شتێکی دیکەیە.

***ئەگەر سبەینێ بڵێن ستۆدیۆکانی تەلەفزیۆنی رۆژهەلات لەزرگوێزلە داخە و ئێران پێناخۆشە، هەڵوێست چییە؟**

عەبدوڵڵای موهتەدی: وانییە دنیاکەئاوابێ، ئێستاکە پێم وانییە کەس موحتاجی ئێران، بێ هیچ حزبێکی کوردسانی عیراق، موحتاجی ئێران نییە، پێموایە گلۆڵەی جمهوری ئیسلامی ئێران لەلێژییە وەمن شتێکی ئاوا بەدور دەزانم.

# مام جەلال بەعومەر ئاغای سورچی دەڵێ، فەرموو تۆ رادیۆی دیموکرات بەرە سەر چیا

***ئەوکاتە مام جەلال حزبە کوردستانیەکانی عیراقی هەموو کۆکردنەوە لەسەر داخستنی رادیۆی حزبی دیموکرات ، تا بەعومەر ئاغای سورچی وت "فەرموو تۆ رادیۆکەیان بۆ بەرەمەنتیقەکەی خۆت، من ئەمەنە ئەمتوانی خزمەتیان بکەم، و دۆستایەتیان بکەم کێ لەئێوە لە خۆتان رائەبینێت رادیۆکەیان بۆ بەرێتە شوێنی خۆی، پێتوا بوو ئەوە دەرەنجامی چیبوو ئەوە لەمیدیاکان پەخشکرا، فشاری جمهوری ئیسلامی بوو؟ ناەمسئولیەتی حزبی دیموکرات بوو؟**

عەبدوڵڵای موهتەدی: لەبیرم نییە، بەلاّم پێموایە ئیتر لەوبارەیەوە یەعنی ئەوەی بەعەقلم بگا وتومە، وەکو هەڵوێست وەکو لێکدانەوەو خوێندنەوەی من بۆئەو شتە ، بەلاّم ئەم کۆبونەوەم لەبیر نییە بە حەقیقەت .



***لەوبارەیەوە تا ساڵانی رابردوو چ فشارێك خرایە سەر ئێوە وەکو راگەیاندنەکانتان وەکو مقەرەکانتان وەکو ناردنەوەی هێزی چەکدارتان؟**

عەبدوڵای موهتەدی: ناردنەوەی هێزی چەکداری بەڵی، ئەمە شتێکە داوایان لەئێمەش و حزبی دیموکراتیش کردوە کە هێزی چەکدار نەنێرینەوە.

# یەکێتی، سازمانی خەبات دەردەکات

***هەرلەوبارەیەوە هەر لەسەر ئەو مەسەلەیە بوو سازمانی خەبات، لەبەکرەجۆ دەرنەکرێت لەلایەن یەکێتی، بەوپێیەی کە موجاهیدینی خەلق لەبەغداوە دەهێنێ و بەسنورەکانی کوردستان رەتی ئەکا بۆ ئێران؟**

عەبدوڵای موهتەدی: من سەرەرای جیاوازی بیروباوەر لەگەڵ سازمانی خەبات رێز لە شەخسی مامۆستا (شێخ جەلالی حوسەینی دەگرم و خیانەت بەرێکخراوێکی قابیلی هاوکاری دەزانم، بەباشی دەزانم حزبەکانی کوردستان ئێران دۆستایەتیان بکەن، یارمەتیان بکەن، من لەسەر پەیوەندی ئەوان و موجاهیدین بە خۆشیانم وتوە، زۆرمان ئەوە پێوتون پەیوەندی ئەوان و موجاهیدینم پێ هەڵەیەکی خراپە، وە تایبەتی کاتیشی نەماوەو ، ئەبو ئەو ساڵانەی ئاخیر بیپسێنن و هیواداریشم وابکەن، لەبەرئەوە ئەم کارەیانم پێ خراپە، بەڵام سەرجەم پێموایە رێکخراوێکی قابیلی هاوکارین، قابیلی پشتگیری کردنن، بەحەقی نازانم ئەوانیش هیچ خراپەیەکیان لەگەڵ بکرێ.

# خەبات و مجاهیدین پەیوەندیان هەیەو هەڵەیە

***ئێوە هاوکارییان ئەکەن؟**

عەبدوڵای موهتەدی: ئێمە لای ئێمە نین بڵێیی نزیکن، بەڵام ئێمە پەیوەندیمان لەگەڵیان هەیە، دۆستایەتیمان لەگەڵیان هەیە، هەندێك گیروگرفتیان بووە، لەم لا ئێمە بۆمان جێبەجێکردون و کارئاسانیمان بۆ کردون تەبعەن ئەوتێبینی و رەخنەی خۆشمانمان پێ وتون ، وەپێشمانوایە ئەوانیش لەکۆڵ مجاهیدین بینەوە، چارەنوسی ئەوان لەگەڵ بزوتنەوەی خەڵکی کوردستانە، مجاهیدی چی وشتی چی.

*تائێستا وازیان لەو پەیوەندیانە نەهێناوە لەگەڵ موجاهیدین؟
عەبدوڵلای موهتەدی: تا پار نەیانهێنابوو(2005)، نازانم.

*تا دوو هەفتە لەوەوپێشیش (2006)؟
عەبدوڵلای موهتەدی: بەڕاستی نوسیویانە.

*بەڵێ؟
عەبدوڵلای موهتەدی: لەگەڵیان نیم و پێم هەڵەیە لەلایەن ئەوانەوەوە، پێموایە ئەم بارە لە کوڵ خۆیان نەکەنەوە بەزەرەریان تەواو دەبێ.

# پێمخۆشە دیموکرات و خەبات لێک نزیکبن

* تاداوا لەنێوش دەکات لەهێزە ئۆپۆزسیۆنەکانی کوردستانی ئێران کە هاوکاری مجاهیدین بکەن دۆستایەتی مجاهیدین بکەن؟
عەبدوڵلای موهتەدی: من پێموایە ئەگەر حزبە کوردییەکان دۆستایەتی بکەنو لەگەڵ خەبات، یارمەتیان بکەن چ پێویستیەیان بە موجاهید نامێنێ.

*تەوەقوع ناکەی سازمانی خەبات دۆستایەتی لەگەڵ حزبی دیموکرات نزیکتر بێت تا ئێوە؟
عەبدوڵلای موهتەدی: نا پێموایە نییە، بەڵام پێم ناخۆش نییە دۆستایەتیان لەگەڵ ئەوانیش هەبێ.

* ئەی هەر لە پەیوەندی کۆمەڵە لەگەڵ ئەم ئەحزابانە یا دوو پارچەبونی خەبات؟
عەبدوڵلای موهتەدی: ئەوە زۆر کۆنە، ئەوەقسەی ئێستا نییە، ئەوە زۆر کۆنە حەڤدە هەژدە ساڵ لەمەوپێش ، ، بەڵام بەدیقەت لەبیرم نەماوە ئەلعان هەریەکن خۆ دولایەن نەماوە هەریەک ڕێکخراو هەیە بەناوی خەبات ئیشدەکەن.

# بێگومان دوو خەبات هەیە

*بەحسێکی گرنگ پەیوەندی کۆمەڵەو مجاهیدینی خەڵقە، موجاهیدین خەڵق بەهۆی ئەوەی هێزێکی سیاسی ئۆپۆزسیۆنی ئێرانی بەهێزە، وەکو خۆشتان دەزانن خاوەنی پێگەو نفوزێکی زۆرە، یەکێکە لەو هێزانەی کە حسابی سیاسی لەسەرئەکرێ، ئەو پەیوەندیانەی ئێوە پێشتر لەشورای میللی مقاوەمات هەبون چۆن بوو؟

عەبدوڵڵای موهتەدی: نەبووین ، نەخێر.

# مجاهیدین خەڵق، پێگە و جێگەی نەماوە

*نەبون؟

عەبدوڵڵای موهتەدی: نەخێر

# مجاهیدین رێکخراوێکی دیکتاتۆر و دژی مافەکانی کوردە

*پەیوەندیتان هەبوو ئەوکاتەی کە لەکوردستانی ئێران بون ، بەلام دوابەدوای ئەوە پەیوەندییەکانی ئێوە لاواز ئەبێ، ئەو فاکتەرانەچییە؟ پەیوەستە بەدۆستایەتیو نزیکی ئەوان لە بەعسەوە یان لەروی ئیدیۆلۆژی و فیکرییەوە بووە یان پێداگری ئەوان بووە لەسەر قبوڵنەکردنی مافی خەڵکی کوردستان، ئەو پەیوەندیانەی ئێوە چۆن چۆنی بووە؟

عەبدوڵڵای موهتەدی: وەڵڵا پێموخۆشە یەکەم بزانی کە مجاهیدنی خەڵق هیچ پێگەو جێگەیەکی جەماوەری و خەڵکی نییە لەئێران، ئەم مەعلوماتە(25) ساڵ لەوەپێش و(20) ساڵ لەوەپێش رەنگ بێ شتێك هەبێ، بەلام ئەلعان بەهیچ جۆرێك نییە، ئێمە سەرەتای شۆڕشی ئێران لە(1979) و تاماوەیەکیش بەڵێ جۆر لێك نێوان و هەڵسوکەوتمان بوو لەگەڵ موجاهیدین هەرچەند هەمیشە رەخنەو شتی جیاوازی زۆریشمان لەگەڵیان هەبوو یادی بەخێر (د. جەعفەری شەفیعی) مان ناردوە وەختی خۆی لەگەڵ (مەسعودی رەجەوی) دانیشتنیکردوەو.

یەکەم: ئێمە نەچوینە ناو شواری میللی مقاوەمەتەوە، پێمانوابوو ئەو گەلاڵەی کە شواری میللی مقاوەمەت بۆ مەسەلەی کورددای وحزبی دیموکراتیش قەبوڵیکرد گەلاڵەیەکی خراپ بوو مافەکانی گەلی کوردی تێدا نەبوو، زۆرنیوە چڵوناقیس و بێ ناوەڕۆك بوو.

دووەهەم: نزیکی و تێکەڵاوی موجاهیدنی خەلق لەگەڵ بەعسی عیراق، دەست تێکەڵکردن لەگەڵ جینایەتەکانی سەدام ئەوەش تاوانێکی گەورەیە کەلەسەر پەروەندەی مجاهیدنی خەلق هەیە ئەوەش ناهێڵێ هاوکاری لەگەڵ بکەین یەعنی رێگرە لەسەرئەوە.

سێهەم: رێکخراوی موجاهیدنی خەلق بەگشتی، زۆر زۆر رێکخراوێکە نادیموکراتێك وە زۆر زۆر فەنەتیك وە لەناوخۆیدا ئیستبیدادییە، زۆری لەسەر ناڕۆم، بەلام لەناوخۆیدا زۆر رێکخراوێکی داخراوە وە دیکتاتۆری وە ئیستبدادی وە نادیموکراتە، بەرنامەکەی بۆ ئێران بەرنامەیەکی نادیموکراتییە، پەیوندییەکی یەعنی پێکەوجێگەیەکی جەماوەری ئەوتۆی لەئێران نییە، ئەویش خوازیاری هەرجۆرێك حکومەتی دینییە لەئێران، کە هەمووی ئەوانە دەبێتە هۆکاری ئەوەی کە ئێمە حزبی ئێمە موجاهیدینی خەلق بەهێزێك نەزانین کە هاوکاری لەگەڵ بکەین، بەلام ئەمە بەو مەعنایە نییە دوژمنایەتیان دەکەین، ئێمە بەهێزێکی دیموکرات قابیلی هاوکارییان نازانین لەهەلومەرجی ئێستادا، ئەگەر موجاهید خۆی گۆڕی و ئالوگۆڕی لەناوخۆیدا پێکهێناو جۆرێکی تر سیاسەتی گرتەبەر، ئەوە رەنگە ئێمەش ئەوە وەختە بیرێکی لێبکەینەوە، بەلام حاڵی حازر ئەگەر دەپرسی بۆ نەمانکردوە لەسەر ئەو چەند هۆکارەیە.

# قەت مەسعودی رەجەویم نەدیوە

***چەندجارلەگەڵ مەسعود رەجەوی دانیشتون؟**

**عەبدوڵلای موهتەدی: من قەت .**

***نەت ویستوە؟**

عەبدوڵلای موهتەدی: نەم ویستووە یەك کەسی ئێمە ئەندامێکی سەرکردایەتی ئێمە کە (د. جەعفەری شەفیعی) بووە لەگەڵی دانیشتووە ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ کۆن و...



# پەیوەندی کۆمەڵە و چریکە فیدائیەکان- ئەکسەریەت باشە

*** پەیوەندییەکانی ئێوە لەگەڵ چریکە فیدائییەکانی خەلکی ئێران بەتایبەتی کە ئێستا بون بە چەند شاخە چۆنە، پێشتر چۆن بووە؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** مێژوی چریکە فیدائییەکانی خەڵك و پەیوەندی کۆمەڵە لەگەڵیان، زۆر هەمەلایەنەو پڕە لەوردەکاری و شتی مێژوی ئەلعان بەڕاستی ڕەنگە سەری تۆی پێنەیەشێنم، ئەگەر بمەوێ بڵێم دەبێ هەموو وردکارییەکانی بڵێم، بەڵام کە دەپرسی ئێستا و دوای ئەوەی کە بون بەچەند لق، ساڵەهایە ئەوان زۆریان ئینشیقاق تێداکراوەو و چەندین لقیان هەیە، ئێمە لەگەڵ چ وەکو کەسایەتی تاکیان کە ئێستا مابێت نێوانمان هەیە، چ لەگەڵ ڕێکخراوی فیدائیان بەشی ئەکسەرییەت ئێمە نێوان و دۆستایەتی و پەیوەندیمان هەیە، ئێستا لەگەڵیان، ئەو کێشەو ناکۆکییەی جاران نەماوە لەنێوانماندا، دیارە ڕەخنەی قوڵ وگەورەمان هەیە لەسەر مێژویان چۆن دیارە ئەوان کاری خراپیان زۆر کردوە ڕەخنەیان لە خۆیان گرتوەو سیاسەتیان گۆڕیوەو زۆرشتی تر بەسەرهاتووە زەمان زەمانێکی زۆریش بەسەرداهاتوە، ئێمە ئێستا دۆستایەتی و پەیوەندیمان لەگەڵیان هەیە.

لەگەڵ کەسانێکی تریش پەیوەندیمان هەیە ئەویش بەشێکی بەرچاو لەو کوردانەن کە لەگەڵ فیدائیان و لەگەڵ ئەکسەرییەت لەگەڵ فیدائیان بەگشتی، بەتایبەتی هەندێك لەوانە لەگەڵ ئەکسەرییەت.

ئەوانە دوای شکستی ڕێکخراوەکەیان بەشێکیان بەرەو فیکرێکی ئازادیخوازنەتر هاتون، تێگەیشتنێکی باشتریان لە مەسەلەی نەتەوەیی کورد هەیە دڵسۆزییەکی باشتر نیشاندەدەن وە ئەوە بۆتە هۆکاری نزیکی ودۆستایەتیمان لەگەڵیان، نەك لەگەڵ هەمویان، هیوا هەیە، بە حسابی کۆن دوژمنایەتی خۆی لەگەڵ ئێمە هەر ڕاگرتوە، بەڵام زۆرێکیان ئێستا کراوەترن، سیاسەتەکانی جارانی ڕێکخراوەکەی خۆیانیان پێ باش نییە و دۆستایەتی و نزیکایەتیەکی باش لەنێوان کۆمەڵەو ئەواندا، هەیە ئینسانی باشیشن ئینسانی خوێندەوار وتێگەیشتوو خاوەنی ئەزمونێکی باشن.

تەنانەت هەندێك هەن کە کاری حزبی دەکەن، بەڵام بەهەرحاڵ دۆستایەتیمان لەگەڵیان هەیە، بەگشتی دەتوانم بڵێم ڕێکخراوی چریکە فیدائییەکانی خەڵك زۆریان بەسەرهات، زۆر کارەساتیان بەسەرهات، هەڵەی سیاسی زۆر گەورەیان کرد، کاری خراپی زۆریانکرد، بەڵام زۆر لەمێژساڵیشە ڕەخنەیان لە خۆیانگرتوە، زۆرکەسیان دانیشتوە، زۆرکەسیان وازە هێناوە، بۆیە پێموایە جێی خۆیەتی کە فەسڵێکی تازە لەگەڵ ئەوانیش دەستپێبکرێت.

***من لە هەموو ئەو پرسیارانەی کە کردم سەبارەت بە پەیوەندییەکانی کۆمەڵە لەگەڵ ئەحزابەکان لە کوردستانی عیراق، لە کوردستانی ئێران، خسوسەتەن لە کوردستان ئێران، ئێوە پەیوەندییەکانتان لەگەڵ حزبی دیموکرات پێ باشە بچێتە پێش وە پەیوەندییەکی باشتان هەبێ دۆستانەبێ، ئێوە خۆتان بەوە ئەزانن کە ئێوە دوو هێزن، پێکەوە زۆربەی کاروبارەکانی ئەو وڵاتە بەڕێوەبەرن، ئەوانەی تر ئەهەمییەتی دەرەجەیەکیان نییە، لەم بۆچوونەیا لەگەڵمای، پێتوایە ئەمە تێگەیشتنێکی واقیعی کۆمەڵەیە بۆ ئەو روداوانەوەو خوێندنەوەیەکی واقیعیە بۆ حزبی دیمرکرات ، کە دو حزبی سەرەکی لە کوردستانی ئێران هەیە کە ئەویش کۆمەڵە و دیموکراتن؟**

**عەبدوڵلای موهتەدی:** ناڵێین تەنها دوو هێز هەیە، بەڵام...

***هێزی سەرەکی؟**

**عەبدوڵلای موهتەدی:** بەڵام دوو هێزی سەرەکی هەیە، بەڵی ئاخر ئەوەخۆ بەدەست من و تۆ نییە، ئەوە مێژوی ئەم سی ساڵە وایە،بیست وهەشت نۆ ساڵە ئاوایە لە کوردستان، پێشێ فەقەت حزبی دیموکرات دوایی بەهەر چەرمەسەرەیەك بوو کۆمەڵە جێگەی خۆی کردۆتەوە، ئەوە دەگەڕێتەوە بیست و حەوت، هەشت ساڵە لەوەپێش، لەمێژوی ئەو بیست وحەوت هەشت ساڵە ئەوانە دوو حزبی سەرەکی بوون، حزب و ڕێکخراوی تریش بوون یا زەربەیان خواردووە یافەوتاون یا خەڵکیان لێ دانیشتوە، حزب و گروپی تریش بون نازانم کە لەم ساڵانەی دوایدا پێکهاتوون، ئێمە خوازیاری ئەوە نین هیچ کام لەوانە نادیدە بگیرێن وپەراوێزو بخرێن و گوێیان نەدرێتی، بەڵام ئەوە خۆیانن دەبێ نیشانیبدەن وە بەکردەوە بیسەلمێنن کە ئەوان چ دەورو نەخشێکیان هەیە، ئەگەر حزبی دیکەو گروپی دیکەش هاتنە ئاراوە و توانیان بەڕاستی جێی خۆیان لە کوردستان بکەنەوە، بێگومان ئێمە مانیعیان نابین، دۆستیان دەبین هاوکارییان دەکەین.



# هێزی کۆمەڵە و دیموکرات لەشارەکان دەرکرابوون

*** لەرۆژی ( 11 ) گوڵانی ( 1361 ) لە ( 1 )ی مەی ( 1982 ) داکۆنگرەی ( 3 ) پێموایە ئەوکاتە لەسەردەشت بەستوتانە ئالوگۆڕەکان چی بوون؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** بەڵێ لە نزیک ئاوایی بەردەسور لەناوچەی سوێسنێ سەردەشت بەستومانە، ئەو وەختی ئێمە زیندانێکمان هەبوو زیندانیەکانمان لەوێ رادەگرت، بنەوەی زیندان بوو، بەڵام سەرەوەی مقەری پێشمەرگەکان بوو ساڵۆن‌و قاعەیەکی گەورەبوو، ئەلەوێ کۆنگرەمان بەست، مانگی پێنجی (1982) لەوێ بەستومانە، ئەگەر چی شارەکانی کوردستان بەدەست هێزی کۆماری ئیسلامییەوە داگیرکراوەتەوە، بەڵام ناوچەی رزگارکراوێکی پان‌و بەرین هێشتا لە کوردستان مابوو هێزی پێشمەرگە لەوپەری چالاکی خۆیدابوو، ئێمە کۆمیتە ناوچەکانمان هەبوو، گوردانەکانمان هەبوو، رێکخستنی شارەکانمان هەبوو، یەعنی ئەوانەمان هەموو هەبووە، هێشتا هێزی پێشمەرگە نەکۆمەڵەو نەدیموکرات هیچی لە کوردستان تێك نەشکابوون، ئەگەر چی شارەکانیان لەدەست سەندرابووە.

***گەلاڵەی خودموختاری لەو کۆنگرەدا پەسەندکرا؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** ئاخر گەلاڵەیەك لەوێ پەسەندکراوە، زۆر پێش ئەوە عەرزمکردی هەر کە بزوتنەوە لە کوردستان دەستپێکراو هێرشەکەی خومەینی‌وکاری پێشمەرگایەتی دەستپێکرا هەر ئەو وەختی گەلاڵەی خود موختاری درا، چونکە هەروەکو عەرزمکردی تەماشامانکرد فیدراڵییەکە خەڵك کەس باسی ناکا، ئێمە چوینە سەرمەزەبی خەڵکی وە لەبەرئەوە خودموختاریمان دانا، نەخێر بە دووساڵیش پێش ئەوە هەر لەسەرەتای ئەو وەختەکە هەیئەتەکان هاتن عەرزمکردی هەیئەتی نوێنەرایەتی گەلی کورد پێکهات‌ونوێنەرانی جمهوری ئیسلامی هاتن و تووێژیانکرد، گەلاڵەمان بوو، گەلاڵەمان پێشکەشکردن، هەیئەتی نوێنەرایەتی بۆ خۆی گەلاڵەی خود موختاری یا، ئۆتۆنۆمی پێشکەشکردوە ، کۆمەڵە ئۆتۆنۆمی خۆی هەبووە دیموکرات هەیبوە ، یەعنی جۆرەها شتی ئاوا هەمووی هەبوە.

# ئەوکات لەگەڵ ئیتحادی موبارزانی کۆمۆنیستدا ئیشمان دەکرد

***لەو کۆنگرەیەدا باس لەشوراو پێکهێنانی حزبی کۆمۆنیستی ئێران کرا، ئەوانە چۆن چۆنی بون، تەرحی کێ بوون ؟**

**عەبدوڵلای موهتەدی:** وایە ڕاستە، ئێمە لەو کۆنگرەیەدا باسمان لەوەکردوە کە بتوانین لەناوچە رزگارکراوەکان کاری کۆمەڵایەتی بکەین، دەسەڵاتی خەڵك دامەزرێنێن، یەعنی کارەکەمان تەنیا کارێکی پێشمەرگانە نەبێت، بەڵکو کاری سیاسی و ڕێکخستنیش کە هەبێت، کاری کۆمەڵایەتیشی لەگەڵ بێت، لەو پەیوەندەدایە مەسەلەی شوراکان و بنکەکان و ڕێکخراوە جەماوەرییەکات و هەموو ئەوانە باسکراون، لەپاڵ ئەوەشدا لەو کۆنگرەیەشدا باسی حزبی کۆمۆنیستی ئێران، پێویستی پێکهێنانی ئەو حزبەکراوە، بەرنامەیەکیش بۆ ئەو حزبە پەسەندکراوە.

بەرنامەکەی لە کوێدا هاتبوو؟ بەرنامەکەی لەئەوەوە هاتبوو کە کۆمەڵە، ڕێکخراوەێك بەناوی ئیتحادی موبارزانی کۆمۆنسیت کە ڕێکخراوەکەی (مەنسوری حیکمەت) بوو، ئەوانە پێش ئەوە دانیشتیان بوو جۆرێك پێکهاتن و ڕێکەوتنیان بوو، ئەوە بۆ خۆی مێژوییەکی هەیە، گەیشتبون بەبەرنامەیەکی هاوبەش بەناوی(بەرنامەی موشتەرەکی کۆمەڵە، ئیتیحادی موبارزانی کۆمۆنیست) ئەوەمان تۆزێك زیاتر پەرەپێداوو ئیسلاحاتێکمان تێداکردوە بوو بە بەرنامەیەك بۆ حزبی کۆمۆنیست، یەعنی هێشتا حزبەکە پێکنەهاتووە ئێمە لەسەر ئەوە کە دەبێ ئەم حزبە چ بەرنامەیەکی هەبێ ساغ بوینەوە و لەکۆنگرەی (3) پەسەندکراوە.

***ئەوکاتە و دواتر ئەبی بەسکرتێری یەکەمی حزبی کۆمۆنیست؟**

**عەبدوڵلای موهتەدی:** بەڵێ، جا ئەمە خۆ هێشتا حزبەکە پێکنەهاتبوو، ئەمن لەو کاتەدا هەر سکرتێری گشتی کۆمەڵەبووم، ئێمە لە کۆنگرەی (3) دا بووە کە دەفتەری سیاسی پێکهێناوە، پەیڕەوی ناوخۆمان زۆر دەقیقترو باشترکردۆتەوە ، یەعنی سەرجەم زۆر کۆنگرەیەکی ڕێکوپێك کەربوو بۆ ئێمە.

***کێ بوون ئەوانەی کەلەوێ بۆ کۆمیتەی ناوەندی هەڵبژێران ؟**

**عەبدوڵلای موهتەدی:** دەزانم ، من بووم ، (شوعەیبی زەکەریایی، عومەری ئێلخانیزادە، ئیبراهیمی عەلیزادە،جەوادی مشکی، سەعیدی یەزدییان بووە خەڵکی کرماشان بوو، ساعیدی وەتەندۆست،

محەمەدی شافیعی، موحسینی رەحیمی، حوسەینی مورادبەیگی ناسراو بەحەمە سوور، ئێرەجی فەرزاد و دکتور جەعفەری شەفیعی یەعنی کەم نەبون ژمارەی کۆمیتەی ناوەندیمان تەواو زیادیکرد، وە دەفتەری سیاسیشمان پێکهێنا.

# مام جەلال و شێخ عیزەدین حوسێنی و ئالآی رزگاری باکوور بەشداری کۆنگرە بوون

***هەرئەوکاتە پێموایە مام جەلال و شێخ عیزەدین حوسەینیش بەشداری کۆنگرەیانکردوە؟**

عەبدوڵای موهتەدی: مام جەلال و هەیئەتی هەم یەکێتی نیشتمانی و هەم کۆمەڵەی رەنجدەران، بەشداریکردوە، شێخ عیزەدین حوسەینی بەشداریکردوە، پێموخۆشە کە بزانی ئالآی رزگاری کوردستانی تورکیاش بەشداریکردوە، رەسمەکانیش ئێستاش ماون.

***کۆنگرەیەکی سەرکەوتوو بوو؟**

عەبدوڵای موهتەدی: من زۆر بەسەرکەوتوی دەزانم، زۆر رێكوپێکبوو، ئێمەی زۆر رێکوپێك کرد.

# یەکەم کۆنگرەیە کۆمەڵە دەبێتە سازمانی کوردستانی حیزبی کۆمۆنیستی ئێران

***دوای باسەکانی کۆنگرەی سێیەم تەواو بوو، دێینە سەرکۆنگرەی چوارەم پێمواپە کۆنگرەی چوارەم لەساڵی (1363) لەناوچەی گەلاڵە لە مەنتقەی شینکایەتی لەشارباژێر بەستوتانە، لەو کۆنگرەیە هەمدیسان مام جەلال وە چەندکادری پایەبەرزی یەکێتی بەشداربون، مەنسور، ئیرەج و ئەوانەی هەموی بەشداربون لەو کۆنگرەیدا، وە باس لەچالاکی پێشمەرگانەکراوە، باس لە پەیوەندییە تازەکانی کۆمەڵە لەگەڵ بەعس کراوە، وە ئەو وەزعیەتەی کە کۆمەڵە لە کۆنگرەی سێی لەناوچەکانی کوردستانی ئێران دیسان ئەپەڕێتەوە بۆ ئەمبەر چالاکی وفەعالیەتی، پێمخۆشە لەسەرئەوکۆنگرەیە ئەگەر قسەیەکمان بۆبکەی، گرنگترین ئەو بڕیارو راسپاردانەی لەو کۆنگرەیە دران چیبون و ئەم بارودۆخە تازانە چیبون پاش ئەوەی کۆمەڵە لەوبەرەوە هاتەئەمبەر؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** کۆنگرەی چوارەم وابزانم (1363) بوو ئەگەر بەهەڵەنەچوبم، دەکاتە(1984)، ئەمە کاتێکە کە بەڕێز مام جەلال وئەوانەیش بەشدارییان نەکرد لەم کۆنگرەیەدا، بەڵێ مەنسوری حیکمەت و ئەوان بوون لەم کۆنگرەیەدا. مەنسوری حیکمەت وئەوان ئەوەڵ جار لە کۆنگرەی سێ وەکو میوان بەشدارییانکرد، تا ئەو جێگەیەی من بزانم نەك لە هەموو باسەکان بەڵکو وەکو میوان، میوانەکانی ئەو کۆنگرەیە هەریەکەی جێگەیەکی تایبەتیان پێدرابوو بۆئەوەی وتاری خۆیان پێشکەش بکەن، ئەوانیش جێگەیان پێدرابوو وتاری خۆیانیان پێشکەشکرد.

ئەمە کۆنگرەی سێ بوو یەکەمجار مەنسوری حیکمەت وئەوان بەشداربوون، کۆنگرەی چوارەمیش وەختێك بوو، بەڵام کە ئیتر ئێمە حزبی کۆمۆنیستمان پێکهێنابوو، یەعنی کۆنگرەی چوارەم کۆمەڵە وەکو سازمانی کوردستانی– حزبی کۆمۆنیستی ئێران، لەو رووەوە یەکەم کۆنگرەیە کە کۆمەڵە وەکو سازمانی کوردستان ئەیگرێت، سازمانی کوردستانی حزبی کۆمۆنیستی ئێران، وەیەکەم کۆنگرەشە کەلەخاکی عێراق نەك لەدیوی کوردستانی ئێران بەڕێوەدەچێت، دیارە چونکە خاکی کوردستانی عێراقیش بوو ئیتر نەدەکرا ئەو وەختە لەژێرسایەی بەعس مام جەلال و خەڵکەکەی تر بانگکەی ئەوەنەدەکرا، بۆیە ئەوەندەی من لەبیرم مابێت ئەوان تیای بەشدارنەبوون، لەکۆنگرەی چوار یەکەم کارئەوەبوو کە مۆرێکی تەئید دانراوە لەسەر پێکهێنانی حزبی کۆمۆنیستی ئێران، هەرچەند حزبی کۆمۆنیستی ئێران دروستکردنەکەی پەسەندکراوی هیچ کۆنگرەیەك نەبوو.



# ڕێگا نەدرا حزبی کۆمۆنیست لەکۆنگرەدا دەنگی لەسەر بدرێ

***لە کۆنگرەی سێ دا قسەو باسی لێنەکراوە؟**

**عەبدوڵای موهتەدی:** بەڵێ قسەو باسی لێکراو، بەڵام پێکهاتنەکەی بەرەسمی لە کۆنگرەیەکدا پەسەندنەکراوە دەستی بۆ بەرزکەینەوە و دەنگی بۆ بدەین، بەڵکو لەنێوان کۆنگرەی سێ و کۆنگرەی چوار کرا ئەو کارە، بۆچیش وابوو، یەعنی بۆچی نەهاتە کۆنگرەوەو بڵێین پەسەندبکرێت، دیارە من خۆم رەئیم وابوو، رەئیم وابوو کە ئێمە ئەبێ لەسەر حزبی کۆمۆنیستی ئێران دیراسەی زۆرتری لەسەربکەین بەر لەوەی پێکیبێنین، پێشەوابوو دەبێ لە کۆنگرەیەکی قانونی کۆمەڵەدا ئەمە پەسەندبکرێت، بەڵام زۆربەی هاورێیان و جەماعەت رەئیان وانەبوو، کە رەئیشان وانەبوو لەسەر ئەساسی نەزەرییەیەك یان تیئۆرییەك بوو ئەوییش ئەوەیەکە حزب کادرەکان پێکیدێنن، یەعنی تیئۆری کادرەکان، تیئۆری کادر بریتی بوو لەوە کە کۆمەڵێك کادر بریار دەرن لەپێکهێنانی حزبی نەك ئەوەی هەموو جەماوەری حزبیەکە یا هەموو رێکخستنەکە، وە دەبێ جۆرێکی وا حزبی کۆمۆنیستی ئێران دروست بکرێت کەلەدرێژەی هیچ کام لەو رێکخراوانەدا نەبێت، بەڵکو وەکو کیانێك وەکو هەوییەتێکی بەتەواوی جیاواز وە نوێ بێتە ئاراوە.

هەر لەسەر ئەو ئەساسەش بەهەر حاڵ لەسەر ئەساسی نەزەرییە یان تیئۆری کادرەکان پێکهات، بۆیە مەنسوری حیکمەت ئیسراری هەبوو لەسەرئەوەی کە پێویست ناکا ئەمە لەهیچ کۆنگرەیەك پەسەندبکرێت، بەڵکو کۆمەڵێك کادر کادری کۆمەڵە زۆرتریان کادری کۆمەڵەبوون، هەروەها خۆی و کادرەکانی رێکخراوەکەی ئەوان بەناوی ئیتیحادانی موباریزانی کۆمۆنیست، یەکێتی تێکۆشەرانی کۆمۆنیست ئەم دوانە کادری ئەم دوانە رێکخراوێکی سێهەم پێکدێنن، لەسەروی هەردوك حزبەکەی تر بێت، سەروی هەردوك رێکخراوەکە بێ، یەعنی هەم کۆمەڵەو هەم هینەکەی ئەوان، بۆیە لە هیچ کۆنگرەیەکدا پەسەند نەکرا، مەبەستم ئەوە بوو بڵێم کە کۆنگرەی چوارەم یەکەم کۆنگرەیە لە خاکی کوردستانی عیراق دەبەسترێ، یەکەم کۆنگرەشە کە ئێمە ئیتر چوبووینە ناو حزبی کۆمۆنیستی ئێرانەوە وەکو رێکخراوی کوردستانی حزبی کۆمۆنیستی ئێران کۆنگرەمان دەبەست. مەعنای ئەم قسە ئەوەیە کە کۆنگرەی دامەزرێنەی حزبی کۆمۆنیستی ئێران کرابوو کۆنگرە ساڵی وابزانم ساڵی(1983) بوو، وانەبوو؟

***بەڵێ؟**

# ئێرەجی ئازەرین رۆشنبیر بوو، بەڵام کارنەکەر بوو

*من ئەمەویت ئەوەت بیرخەمەوە، ئێرەجی ئازەرین لەیەکێك لە مەقالەکانی (1984) ئەڵێ: "ئاماجی کۆمۆنیزم تەنیا لەوەدا نییە کە خوازیاری ئازادی ورزگاری کرێکارانە، بەڵکو وەك زانستێکە کە رێبازی تێپەڕبوون لەسەرمایەداری ئەمڕۆ بۆ سۆسیالیزمی سبەینێ، هەروەها دەوری چینی کرێکار لە روخانی کۆمەڵی سەرمایەداریدا"، من ئەڵێم ئایا ئەم بۆچونەی ئێرەجی ئازەرین یۆتۆپیا نەبوو، ئەوەی ئێرەج باسی ئەکا بۆچی کۆمۆنیزم نەك نەیتوانیوە ئەو ئەرکە بگرێتە ئەستۆ، بەڵکو شکستی هێناوە لەبەرامبەر جیهانگیری و عەولەمە و ئەو روداوە تازانەی بەتایبەتی دوای جەنگی سارد رویدا، هێشتا ئێرەج و کۆرش و هەموو ئەوانەی کۆمەڵێ تەرحی لەویابەتەیانکرد، هەموو ئەوانە ئێستا خۆیان لە کۆمەڵێ فەیراندا ئەژین لە ئینشیقاق و ئینشیعابی بەردەوامان، نەیانتوانیوە خۆیان ساغ کەنەوە، تەنانەت لەسەر چەمکی کۆمۆنیزمی کرێکاری لەسەر ئەو خزمەتەی کە پێویستە بەچینی کرێکار بکرێ خۆیان ساغ نەکردۆتەوە بەردەوام لە کێشە و ململانێدان پێتوایە ئەمە چی بوو لەوکاتە یا تەرحی کرد ئێرەج؟

عەبدوڵلای موهتەدی: وەڵڵا ئەوە راستە کە هەموو ئەو بزوتنەوەیە شکستی هێنا، هەمو ئەو بیرە شکستی هێنا، ئەو شتێکیش نییە تەنیا بگەڕێتەوە سەر ئێران، لەئاستی جیهانیدا بوو، نەشی دەتوانی بەتاقی تەنیا لەئێران سەرکەوتن بەدەستبهێنێ، لە هەمان حاڵدا کە لەئاستی جیهانیدا شکستیهێناوە، ئێرەجی ئازەرین ئینسانێکی خوێندەوارو تێگەیشتوو بوو، ئینسانێکی رۆشنبیر بوو، بەڵام تاخوا حەزدەکا ئینسانێکی بێ عەمەل و لەکاروباری عەمەلیدا دەستەوەستان و هیچ نەکەربوو، یەعنی وەك مەنسوری حیکمەت یش نەبوو، مەنسوری حیکمەت بەدەستی خۆی ئینسانێکی بەبڕشت و بەئیقدام بوو، بەڵام ئێرەج زۆر ئینسانێکی دەستەوەستانی کار لێنەهاتوی، بەراستی هەرقسەی زلی هەبوو، تیئۆرییەکانی ئێرەجیش ئەغلەب وابوو لەزۆرترین کاتدا تیئۆری نائومێدانەو رەشبینانە، لە هەرحاڵدا یەعنی چارەنوسی ئەو بزوتنەوەی کەلەدونیادا بەناوی کۆمۆنیزم ناسراوە ئەوە ئیتر شتێکە بۆ هەموو دنیا زانراوە نازانم چەندە لەسەری بڕۆین؟



# ئێمە پاش هاتنە دەرمان لەحزبی کۆمۆنیست، کۆمۆنیست نەماوین

*تۆ ئێستا خۆت و حزبەکەت، ئەمەوێ دەقیقەن پێم بڵێین خۆت مارکسی؟ کەسێکی چەپ و مارکسی و ماوی؟ حزبەکەت حزبێکی کۆمۆنیستییە، ئەو مارشەی کە پێشتر قەناعەتتان پێی بوو ماوە، سرودی ئەنتەرناسیۆنال تاچەند ماوە؟ دقیقەن ئەگەر بە کورتی پێم بڵێی ئەو جیاوازییانەی کەلەنێوان ئێوە، لەگەڵ حزبی کۆمۆنیستی کە ئێوە ناوی ئەنێن سازمانی کوردستانی - حزبی کۆمۆنیست دەقیقەن بە کورتی پێمبڵێی چییە؟ خۆت ئێستا لەسەر ئەو بیروباوەڕانە ماوی؟

عەبدوڵلای موهتەدی: جارێ بابڵێم وەکو حزب ئێمە کە جیابوینەوە لە حزبی کۆمۆنیستی ئێران لە هاوینی ساڵی (2000) ئەم جیابوونەوە ئەنجامی زۆر پێداچونەوەی رەخنەگرانەبوو، بەسەر ئەزمونی حزبی کۆمۆنیستی ئێراندا، بەسەر ئەزمونی حەرەکەی چەپ و کۆمۆنیستی لەئێرانەو تارادەیەکیش جیهان، بۆیە ئەوە نەبوو ئێمە تەنیا قاڵب و چوارچێوەو قەوارەی حزبی کۆمۆنیستی ئێران بەجێ بهێڵێن، بەڵام هەموو فکیرو ئایدیۆلۆژیەکەی لەگەڵ خۆمان بێنین، نەخێر ئەمە گۆڕانی فکری سیاسی وە رێکخراوەیی هەموی تیابوو، ئێمە لەدوای جیابونەوەمان لە حزبی کۆمۆنیستی ئێران، خۆمان بە حەرەکەتێك یا حزبێکی کۆمۆنیستی پێناسە ناکەین، بەڵام خۆمان بە حزبێکی چەپ پێناسە دەکەین، ئێمە پێمانوایە کەلە وڵاتێکی وەکو ئێران وە لەوڵاتێکی وەکو کوردستانیش، چەپ بەشەرتێکی چەپێکی واقیع بین، ئاشنا بەکێشەکانی ئەمرۆی دنیا بێت، خۆی بناسێ پێویستیەکانی بناسێ چەپێکی ئاوا مەعقول و واقیع بین دەتوانی هەبێ وە پێمانوایە بە قازانجیشە بۆ هەموو بزوتنەوەی سیاسی لە کوردستان وە ئەسڵی تێزەکەی ئێمە راستیەکەی تێکەڵکردنی کوردایەتی و چەپایەتیە.

*ئەوەی ئێوە؟

عەبدوڵلای موهتەدی: بەڵێ، یەعنی ئێمە پێمانوایە کە کۆمەڵگای کوردستان وەکو هەموو کۆمەڵگایەکی تری ئەم دنیایە، بەتایبەتی لە کۆمەڵگاکانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست، کۆمەڵێك تایبەتمەندی گشتیان هەیە.

بەڵام کوردستان لەهەمان حاڵدا کۆمەڵگەیەکی تایبەت بە خۆشی هەیە، کێشەیەکی سەرەکی کە کۆمەڵگای کورد گیرۆدەیەی کێشەی نەتەوەییە، کێشەی ئەوەیە کەلەمافی دیاریکردنی چارەنوسی و پێکهێنانی دەوڵەتی نەتەوەیی خۆی بێ بەشکراوە، کێشەی ئەوەیە کە دابەشکراوە لەنێوان چوار دەوڵەت و وە داگیرکراوە لەلایەن ئەوانەوە.

لەبەرئەوە ئەمە کێشەیەکی سەرەکی کۆمەڵگای کوردییە، دیارە ئێمە خۆمان بە حزبی کوردستانی ئێران دەزانین، بەڵام هەموو کێشەی کورد دەبینین، سنوری چالاکی ئێمە کوردستانی ئێرانە، ئەگەر چی خۆمان بەبەشێك لە هەمو نەتەوەی کورد دەزانین و کێشەکەشمان بەبەشێك لەو کێشەیە دەزانین.
پێمانوایە کە ئێمە خۆمان بەئاڵا هەڵگری رزگاری نەتەوەیی لە کوردستانی ئێران دەزانین، بێ ئەم لاولاوە کەسیش لە خۆمان یەعنی پێمانوایە حزبێکی وەکو ئێمە نابێ هیچ بۆشاییەك لەم بارەیەوە بەجێ بێڵێ، لەپاڵ ئەوەدا، وێرای ئەوەش، ئێمە لەو بڕوایەداین پێمانوایە نازانین بۆ هێزێکی چەپ دەبێ مەیدان خاڵی کا لەم بوارەدا بۆ خەڵکی تر یەکێك لەو میحوەریان لەو تەوەرانەی کە کاتی خۆی ئێمە و حزبی کۆمۆنیستی ئێرانی لەیەك جیاکردەوە رێك ئەوەبوو کە (سەید برایم) و حزبی کۆمۆنیستی ئێران لەروی ئامۆژگارییەکانی مەنسوری حیکمەت و لەروی خەت و رێبازی ئەوەوە، لەوبڕوایەدابوون و ئێستاش لەوبڕوایەدان، کە کێشەی نەتەوەیی دەبێ بەدەست ئەحزابی بورژوائییەوە چارەسەربکرێ، ئەوەی بۆ ئێمە دەمێنێتەوە تەنها کێشەی چینایەتییە، ئێمە قەت لەو بڕوایەدا نابین، یەعنی خیلافێکی گەورەی نێوان ئێمە و حزبی کۆمۆنیستی ئێران رێك ئەوەبوو کە بڕوامان بەوە هەبوو، نەخێر ئێمە وەکو کۆمەڵە ئەرکی سەرکەوتن و گەیاندنی بزوتنەوەی نەتەوەی کورد و ئەوەمان هەیە، خۆمان بەئاڵا هەڵگرو پێشەنگ ئەو خەباتە زانیوە، کۆنیش پێش سەردەمی پێش پێکهێنانی حزبی کۆمۆنیستی وابووین تا حزبی کۆمۆنستیش تا ساڵەها وابوین، ئێستا چوینەوە سەرئەو رێبازە.
دووهەمین شت بەڵام کە لایەنی چەپایەتیەکەیە، ئەوەیە ئێمە لەو بڕوایەداین کۆمەڵگای کوردستان پێویستی بەدیموکراسیەکی قوڵ و بنەڕەتی هەیە، پێویستی بە دادپەروەری و عەدالەت کۆمەڵایەتی هەیە، پێمانوایە کە پێویستی بەیەکسانی مافی ژن و پیاو هەیە، پێویستی بەرێکخراوە مەدەنییەکان و کۆمەڵگەیەکی مەدەنی هەیە، پێویستی بەبەشداری و موشارەکەتی هەموان هەیە لەدەسەڵاتی سیاسی، ئەمانە هیچی لەناو کوردایەتییەکی روتدا نین، یەعنی کوردایەتی روت خۆی لە خۆیدا ئەوانەی تیانییە، کوردایەتی بەس مەسەلەی کوردە، ئەوەی ئێمە دەڵێین ئەم ناوەڕۆکە ناوەڕۆکێکی پێشکەوتنخوازانە و عادلانە بۆ بزوتنەوەی کوردستانە و پێشمانوایە کرێکاران و زەحمەتکێشان و خەڵکی چەوساوەی کوردستان بەشی هەرەزۆری ئەم کۆمەڵگایە پێکدێنن، حزبێك ئێمەش نەبین، دەبێ حزبێك هەبێ کە بیر لەوان بکاتەوەو بیر لەچارەنوسی ئەوان بکاتەوە.

*** پێتاوایە ئەو ئێوەن ئەو بۆشاییەتان پڕکردۆتەوە؟**

**عەبدوڵای موهتەدی:** پێمانوایە ئێمەین و ئەبێ ئێمەبین.



***بەدەر لەئێوە نییە یان ئێوە رێبەری ئەو مەیلەن؟**

عەبدوڵای موهتەدی: ئێمە خۆمان بەخاوەنی ئەو دووباڵە دەزانین لە کوردستاندا.

***هەم چەپ، هەم ناسیۆنالیزم؟**

عەبدوڵای موهتەدی: بەڵێ هەم چەپ هەم مەسەلەی کورد.

***بەس ئێوە پێشتر بۆ نمونە لەبەحسەکانی کۆنگرەی شەشەمدا پێناسەی حزبی دیموکراتتان کردوە بە نوێنەری ناسیۆنالیستی کورد، دەقیقەن وایە یەعنی پێتان هەڵەبوو بۆئەو کاتە؟**

عەبدوڵای موهتەدی: جا من رێك تەمام بوو ئەوە بڵێم کە لە کۆنگرەی شەشەمەوە رێك رەوتی کۆمەڵە شێوا.

# حزب کەخەڵک نەیویست دەبێ لاچێت

*** دێینە سەر کۆنگرەی شەشەم، بەڵام پێش ئەوە پێموخۆشە یەك سەرنجت بۆ قسەیەکی مارکس راکێشم، مارکس دەڵێ: "شۆڕشە پرۆلیتارییەکان بەردەوام رەخنە لە خۆیان دەگرن، تاسەر لەنوێ پەیدا ببنەوە، تۆ ئەم رەخنانەت گرتوە، بەڵام لە پێناو بزوتنەوەو شۆڕشە پرۆلیتارییەکان نەبوو، بەو پێیەی کە تۆ دورکەوتویتەوە لەئەوانە، زیاتر هەستی کوردایەتی یا هەستی ناسیۆنالیستی بەو باڵەدا کشایتەوە، بەڵام من بیستومە کە "عەبدوڵای موهتەدی" تاکە سەرکردەی کوردەکە دووجار رەخنە لە خۆی دەگرێ، پێتوایە ئەم رەخنە گرتنەی تۆ لەخۆت لەگەڵ ئەم رەخنە گرتنەی مارکس کە پێیوایە بزوتنەوە پرۆلیتارییەکان پێویستە بۆ سەرلەنوێ بەخۆدا چونەوە رەخنە خۆیان بگرن ئەمەی تۆ کامیان دەقیق لەگەڵ ئەم قسەی مارکسدایە، یان شتێکی شەخسییەو؟**

عەبدوڵای موهتەدی: نا، زۆر شتێکی شەخسی نییە راستیەکەی، حەتمەن لایەنی شەخسیشی هەیە، بەڵام من بڕوام بەوە هەیە کە ئەو کەسەی کاری یەعنی لەقەڵەمڕەوی گشتیدا کاردەکات، ئەرکی حکومی هەیە یا ئەرکی حزبی هەیە، ئەوانە بەرپرسیارن بەرامبەر بەخەڵك دەبێ شەفاف بن، دەبێ وەڵامدەرەوە بن، کەسێك نایەوێت وەڵام بەخەڵکی بداتەوە بچێت بازرگانی خۆی بکات، بچێت کەسابەت بکات، بچێت خوێندن بکات، بچێت ببێتە کەسێکی ئەکادیمی لە زانکۆکان، ئەوەی ئەرکی حزبی دەکات، حزبی ئەرکی گشتیە(پەپلیکە) ئەوەی ئەرکی حزبی و ئەو ئەرکی حکومەت دەکات



وەکو حزبەکەی چ وەکو کەسایەتیەکانی ناو حزبەکە ئەوانە بەرپرسیارن بەرامبەر بەخەڵک،یەعنی ئەبێ بن، نین بەداخەوە لە کوردەوارییدا، نین لە زۆربەی کۆمەڵگاکان.

*بۆنین؟

عەبدوڵای موهتەدی: چونکە بڕوایان بە دیموکراسی نییە، چونکە بڕوایان بە مەسئولییەتی خۆیان بەرامبەر بە خەڵك نییە، پێیانوایە هەر سەروەری خەڵکن و ئەربابی خەڵکن، بەڵام وانییە فەرقێکی قوڵی لەنێوان کۆمەڵەو رەنگ بێ زۆر زۆر لە حزب ڕێکخراوە سونەتی و تەقلیدییەکان ڕێك ئەمەیە یەعنی بەشێك لەچەپایەتی ئێمە ئا لەوانەدا خۆی دەنوێنێ لەو فەرهەنگە حزبییە تازەو نوێیەدا دەنوێنێ کە زیاد(25) ساڵە کۆمەڵە هێناویەتیە کوردستان. ئێمە جارێکی تر ئاڵاکەیمان هەڵگرتۆتەوە. ئێمە پێمانوایە خەڵك تەنها رەعیەت و گوێرایەڵی حزبەکانو حکومەت نین، بەڵکو قازییان، یەعنی دادوەرن لەچاکەو خراپەی ئەواندا، بڕیاردەرن لەوبارەیەوە، حزبەکان دەبێ تەوزیح بدەن بۆ خەڵك لەباری کردەوەکانیانەوە، ئەگەر جێی رەخنەبوو قبوڵی بکەن، هەر بۆیەش پێمانوایە بە دیموکراسی دەبێ بێن، بەدیموکراسیش دەبێ لاچن، هەزار شۆڕشیان کرد بێ وە خزمەتیان کردبێ‌کە کردویانە لەوەدا هیچ شك و گومانێك نییە، بەڵام کاتی خۆی دوای ئەوەی سەرکەوتن بەدەستهات، ئەوانە دەبێ گوێ بدەنە خەڵکی و بەرپرس بن بەرامبەر خەڵکی، شەفاف بن، وەڵام دەرەوە بن، قابیلی گۆڕان بن، ئەو چوار شتەیان دەبێ تێدا بێت.

# سوسیالیزم ئایندەی دوورە و ڕێزم بۆ مارکس هەیە

*من سەرنج بۆیەك شت رادەکێشم ئەو رەخنە لە خۆگرتنەی تۆ کە پێویستە لەناوچە پەکاندا هەبێ بە پێچەوانەوە بۆ نمونە شۆڕشەکەی فیدل کاسترۆ و گیڤارا بەو وەزعیەتەی کە هاتە سەر حوکم، بەڵام ئێستاکانە بۆ نمونە فیدڵ کاسترۆ بۆتە دیکتاتۆرێکی گەورە لە مەنتقەکەدا، بەرێزان تاڵەبانی و بارزانی ئەو وەزعییەتی کەلەشاخ باسیان ئەکرد، ئێستا خەڵك گلەیی ئەوەی لێی هەیە کە ئەوان دەسەڵاتیان بۆ خۆیان پاوانکردووە، کۆمەڵێك ئەحزابی تر کە پاش جەنگی سارد هاتەنەسەرکار، ئەمانە هەموویان هەم دەسەڵاتی هەم حزب هەم ئیدارە هەم سیستمە سیاسیەکەیان بۆ خۆیان کۆنترۆڵ کردوە، ئەوەی کە تۆ ئەیڵێی ئەیلێن پێویستە ئێمە بە دیموکراسی و بەقسەی خەڵك هاتوینە سەرکار،



**بەقسەی ئەوانیش لائەچین، بەلام کاتێك کە پرۆسەی دیموکراتی بەڕێوە ئەچێ هەزار ویەك فرت و فێڵ ئەهێننەوە تاوەکو خۆیان دەرچنەوە بڕوایان بەوە نییە کە جارێکی تر لەسەر کورسی دەسەلات بێنە خوارەوە؟**

عەبدوڵلای موهتەدی: جارێ بلێم بۆ شۆڕشەکەی کوبا و فیدڵ کاسترۆ وەختی خۆی شۆڕشێکی رەوا و بەرحەق بووە، دژی ئەو هەمو ستەمکاری و بێ عەدالەتییەی کەلە کۆمەڵگای کوبادا خەڵکی ئازار داوەو مەینەتی پێکهێناوە بۆ خەڵك دژی ئەوان بەڕێوەچووە، وەختی خۆی حەق بووە، بەلام کۆمەڵگای ئێستای کوبا و شەخسی فیدڵ کاسترۆ لەکاتی ئێستادا بەبڕوای من جێگەی هیچ پشتیوانییەك نین، من هیچ شتێکی روناکیان تێدا نابینم، منیش وەکوتۆ پێموایە دیکتاتۆرییەکن، من لەگەڵ ئەو جۆرە حکومەتانە نیم، ئەمانە هەر بەناو پادشایەتی نین، ئەگینا من ئەوانە بەکۆمەڵگایەکی دیموکراسی نازانم.

ئەگەر رۆژێك لەرۆژان جارێ پێموایە سۆسیالیزم ئەگەر بێتە سەرکار لەدنیادا بشکۆفێتەوەرکە من لەئاییندەی نزیکادا پێشبینی شتی واناکەم، بەلام بەهەرحاڵ ئەگەر شتی وا هەبێ پێموایە ئەوە لەکۆمەڵگا پێشکەوتوەکانی ئەم دنیایەدا دەبێ روبدات، ئەویش ولاتانی ئەوروپایی و ئەو جۆرە ولاتانەن.

بەلام ئەگەر سۆسیالیزم نیزامێکی عالی ترو بالاتر نەبێ لەوەی کە ئێستا هەیە لە دنیادا، قەت قەت سەرناکەوێ، بۆیە پێموایە ئەوەی کە بەداخەوە لەدنیا هاتەئاراوەوە بوو بە مایەی رسوایی و بەدناوی بەداخەوە بۆ زۆر جەنگ، بۆنەو شتانەی کە مارکسیش وتبووی، کە من خۆم رێزێکی زۆر گەورەم هەیە بۆ مارکس بەلام چۆن بلێم خەوشداریکرد شتەکانی مارکس ئەو پراتیکەیە کەبەناوی مارکس و بەناوی سۆسیالیزم لەدنیاکراوە ئەویش ئەوەیە کەلەجیاتی ئەوە کۆمەڵگایەکیان بنیاتنا لەجیاتی ئەوەی پێشکەوتو تر بێ لەسەرمایەداری دواکەتووتربوو لەسەرمایەداری.

***هەربۆیە شکستی هێنا؟**

عەبدوڵلای موهتەدی: هەربۆیە شکستی هێنا، ئاخر مارکس خۆی ئەوەی رونکردۆتەوە، "دەڵێ هیچ نیزامێك، هیچ سیستمێك نایەتەجێ نیزام و سیستمی ئێستا مەگەر ئەوەی بالاتروە بەرزتر بێ لە هەمووبوارێکدا لەسیستمی ئێستا"، تۆ ناتوانێ داوای لابردنی سەرمایەرداری بکەی، بەلام سەرمایەداری لەچاو سیستمی دەرەبەگایەتی پێشکەوتنێکی گەورەی بۆ مرۆڤایەتی بەدەستهێناوە ئێتر، چ لەبواری سەنعەت و پیشەسازی و ئابوری لەبواری پێکهێنانی جموجوڵ وە دەرهێنانی کۆمەڵگا لەو خەوەی کەلەسەدەکانی ناوەڕاستدا لەو نوستن و خەوەی ئەو وەختەش، هەروەهاش لەبواری پێکهاتەی دەوڵەتدا، دەوڵەت لەسەردەمی دەرەبەگایەتیدا مەسئول نییە بەرامبەر بەهیچ کەس، جواب



دەرەوە نییە بەرامبەر بە هیچ کەس، ملکی شەخسی سوڵتانە، لە حاڵێکدا سەرمایەداری دەوڵەتی کرد بەخەسڵەتێکی تاڕادەیەکی زۆر دیموکراتیکی تری پێداکە ئەوڕۆ لە دنیادا هەیە، بۆیە ماوە، بە ئیقتیساد پێشکەوتووتر بوو بەسیاسەت بە فەرهەنگ پێشکەتووتر بوو، ئەگەر ڕۆژێ لە ڕۆژان دنیایەکی سۆسیالیستی بێت کە من هیوادارم ئەو دنیایە بێ، چۆن من دنیای ئێستەم بێ ناقیسە، پێموایە پڕپڕە لە کەموکوڕی، پڕپڕە لەناعەداڵەتی.

یەکەم: ئەو دنیا لەبەشە دواکەوتووەکانی نایە وەکو ئێمە، دەبێ لەمیترۆپۆڵەکانەوە ئەو نیزامە هەستێ هەروەختی خۆی سەرمایەداریش لەوێ هەڵسا.

دووهەم:-هەرنیزامێك بێ وجێی سەرمایەداری بگرێتەوە کاتێك نەکرێ ئەو کارە، کاتێك ئەبێ پێشکەوتنێك بۆمرۆڤایەتی دەستکەوتێك بۆ هەموو دنیا کەبەئیقتیساد و بەسیاسەت‌وفەرهەنگ، هەروەکو چۆن سەرمایەداری کاتی خۆی کردی، ئەمیش چەندین هەنگاوی گەورە بنێ بە جۆرێکی کە تازە بەشەریەت نەیەوێ بگەڕێ بۆ دواوە، ئەلعان هەزار خەڵك لەسەرمایەداری ناڕازی بن، کە هەن لەچوارگۆشەی دنیا، کەس هەیە بڵێ بابگەڕێینەوە بۆ (200) ساڵ لەوەپێش، کەس ناگەڕێتەوەتازە، چۆن هەرچی بێ نیزامی ئێستا باڵا دەستی خۆی باشتری خۆی بەسەر رابردودا نیشانداوە، مەقسودم ئەوەیە ئەو ئەزموونەی کەلە دنیادا لەژێرناوی سۆسیالیزم و لەژێر ناوی تیئۆری مارکسدا هێنایان لەپراکتیکدا بەبڕوای من نەتەنها نەبوو بەهۆی پێشکەوتنێك بۆ مرۆڤایەتی بەڵکو سیستەمێکی دواکەوتوتری هێنان لەسیاسەتیش و لە ئیقتیسادیش.



# کۆمەڵە بوو بەحزبی سەرتاسەری، بەڵام خەت و ڕێبازی نەگۆڕابوو

## کێشەکانی دروستبوونی حزبی کۆمۆنیست لەنێوان عەلیزادە، موهتەدی، مەنسوری حیکمەت

***ئەمەوێ بێینە سەر کۆنگرەی پێنج، کۆنگرەی پێنج لەبەفرانباری ( 1365 ) گیراوە لەمالومە لەکوردستانی عیراق، هیچ ئاڵوگۆڕێك بەسەر کۆمەڵەدا هات، دوای ئەوەی کە حزبی کۆمۆنیستی دروست ئەبێ ؟**

**عەبدوڵای موهتەدی:** نەخێر، بەو مەعنا بڵێم، ناکرێ بڵێی هیچ ئاڵوگۆڕێك نەهات، بەڵام لەراستیدا من لێکدانەوەم ئاوایەوە لەزۆر جێگاش ئەوەم باسکردوە لەناوخۆمان، کە حزبی کۆمۆنیستی ئێران لە (1983) پێکهات، راستە کۆمەڵە چووە ناوە ئەو حزبە کۆمۆنیستەوە، بەڵام هەمان سیاسەتەکانی پێشوی خۆی بەڕێوەدەبرد، تۆ بڕوانە هەموو سیاسەتەکان هەموو خەتی ڕێبازی تەئانەت تاڕادەیەکی زۆر زمان و ئەدەبیاتی هەر ئەو شتە بوو کە جاران ئەیکرد، لەراستیدا فەرقێکی ئەوتۆی نەکرد، یەعنی بە قەوارەی حزبی بەڵی گۆڕانی بەسەرداهات و بوو بەبەشێك لە حزبێکی سەرتاسەری، بەڵام بەسیاسەت، بەخەت و ڕێباز نەخێر، تا دەگەینە کۆنگرەی پێنجەمیش ئەو گۆڕانە نەبوو.

بەڵام کۆنگرەی شەشەم ئیتر کۆمەڵە نەك هەر بە قەوارەی حزبی بە خەتی سیاسیش گۆڕانی بەسەرداهات، من لێرەوەیە پێموایە چۆن بڵێم ئەگەر ئەو گۆڕانە لە کۆنگرەی شەشەم نەهاتبایە، مومکین نەبوو دوایی کۆمۆنیزمی کارگەری، ئەو فەرتەنەی کۆمۆنیزمی کارگەری دواتر سەرهەڵداو ئاوا سەرکەوتنێکی نیسبی و ڕێژەیی بەدەست بێنێت، بۆیە من کۆنگرەی پێنجەمیش هەر بەیەکێك لە کۆنگرەکانی کۆمەڵە دەزانم، دیارە ئەلعان بەراستی بە وردەکارییەوە لەبیرم نەماوە باسەکانی، بەڵام دەزانم ئەم کۆنگرەیە لەسەر بزوتنەوە جەماوەرییەکان تەئکیدێکی زۆریکرد، لەسەر سازدانی خەڵك، لەسەر تێکۆشان لە کوردستان، لەسەر چۆنێتی خەبات، بوارەکان وەکو هەموو کۆنگرەیەك ئەرکی خۆی بە بردنە پێش و بەسەرکەوتن گەیاندنی بزوتنەوەی کوردستان و خەباتی خەڵك دانابوو.

دیارە ئەو ساڵانە ئەگەر چی کوردستانی ئێران داگیرکراوبوو، ئێمە ناوچەی رزگارکراومان نەمابوو، سەرکردایەتی و چاپخانە و کۆمیتەی ناوەندی و چوزانم پایگاکانی هێزی پێشمەرگەمان لەکوردستان عیراق بوو، بەڵام بە فراوانی هێزی پێشمەرگە چالاکی دەکرد، لەکوردستانی ئێران هێشتا شەڕ زۆر گەرم بوو هێشتا خەباتی پێشمەرگانە جێیەکی رەنگدانەوەی خۆیان هەبوو لە کۆنگرەی پێنجدا، بەڵام کۆنگرەی شەشەم ئێتر من لەکۆنگرەی شەشەم قەبوڵم نییە.

# کۆنگرەی شەشەم لەنێوان عەلیزادەو حیکمەت لەدانمارک سازکراوە، بێ ئاگاداری من

*** کـۆنگرەی شەشـەمی سـازمانی کوردسـتانی- حزبـی کۆمۆنیسـتی ئێـران- کۆمەڵـە- لـە (17)ی گولانی(1367) واتە لەساڵی(1988) بەسترا، ئەوکاتە کـاك بـرایم سـکرتێر بـوو، لـەو ێـدا چـەند بڕیارنامەیەکدراوە، بڕیارنامەیەك سـەبارەت بـە دیمـوکرات دەرکـراوە، کـە پێناسـەکراوە ونوێنـەری ناسیۆنالیزمی کوردە، ئەمە تاچەند واقیعی بوو، بۆچی دیموکراتتان ناونا بە نوێنـەری ناسـیۆنالیزم، یەعنی ئێوە لەژێر فشارەکانی مەنسوری حیکمەت و سـەهەندو جـەنابتابوو، ئەمـەوێ بڵـێم جەنابیشـت بووی؟**

**عەبدوڵای موهتەدی:** نەخێر من سکرتێر نەبووم، نـەخێر نـەك هـەرمن نـەبووم، من لەسـەدا سەد دژی هەموو بڕیارو پەسەندکراوەکانی کۆنگرەی شەشەم بووم، پێمخۆشە ئەوە بۆ مێژوو بمێنێتەوە، زۆرێك لە هاوڕێیان هەن ئێستا دەتوانیت، ئاشناییت هەیە لەگەڵ برایمی عـەلیزادە فـەرموو بچو لێی بپرسە. کۆنگرەی شەشـەم کـە گیرا، یەکـەم کۆنگرەیـە کـە ئێمـە مانـان مـن خـۆم یـەکیان کەلەداڕێـژەرانی خـەتو سیاسـەتی کۆمەڵـە بـووم، چـکۆڵەترین دەورونەخشـێکم تێدانـەبووە، لەگـەڵ پەسـەندکراوو بڕیارەکـان نـەبووم، ئـەو بڕیارانـە نـەی چـۆن نوسـراون و لـەکوێ نوسـراون، بۆیەکـەمجار برایمـی عـەلیزادە، لەگـەڵ مەنسـوری حیکمـەت، لـەماڵی ئـەو کـە ئـەو وەختـە لـەوڵاتی دانیمـارك بـوو لەئـەوروپا، لـەماڵی ئـەو دانیشتون و ئەوانەیان نوسیوە، تەنانەت پێش نوسەکەیان نیشانی من نەداوە.

# مەنسوور حیکمەت کۆمەڵەیەکی دەویست، کەخۆی بەرنامەکەی داڕێژێتەوە

***بۆ؟**

**عەبدوڵای موهتـەدی:** ئـاخر، چـونکە مەنسـوری حیکمـەت، دەیویسـت بنـەماکانی کۆمەڵـە بگـۆڕێ، ئەوەی پـێ بـەس نـەبوو کـە کۆمەڵـە لـەناو حزبـی کۆمۆنیسـتی ئێراندا بـێ، عـەرزم کـردی، چووبووە نـاو حزبی کۆمۆنیستی ئێران، بەڵام بنـەماکانی خـۆی ڕاگـرت، خـەتوسیاسـەتی خـۆی ڕاگـرت، ئـەو بڕوایـەی کە بەبزوتنەوەی ڕزگاریخوازانەی گەلی کوردی هەبوو ئەوەی ڕاگرت، ئـەو پێشـەنگی و چالاکییەی خـۆی لـە بزوتنـەوەی کـوردی ئێرانـدا هـەرماوە، خـەتی، ڕێبـازی هـەمووی ئەوانـە ئێمـە دامانڕشـتبوو، ئێمـە



مانان وئەوانە دامانڕشتبوو. مەنسوری حیکمەت کۆمەڵەیەکی دەویست کە خۆی سەرلەنوێ لە (بێ)ی بسمیللاوە وەك فارس دەڵێ:لەبێی بسمیللاوە تا(تێی) تەممەت، هەموی بۆ خۆی نوسیبوو، هەرواش بوو، کۆنگرەی شەشەم دەستی ئێمە تێدا نییە؟

## عەلیزادە، زۆر موعجیبی مەنسور بوو

* تۆ سکرتێری حزبی کۆمۆنیست نەبوی ئەو وەختە ؟

عەبدوڵلای موهتەدی: بەڵێ، ڕێکوایە، من سکرتێری حزبی کۆمۆنست بووم، بەڵام برایمی عەلیزادە کە ئەو وەختی، من سکرتێری حزبی کۆنۆنیستیش نەمابووم چا بۆ ئاگاداریت ئەمە مەسەلەیەکی ترە ئەوکات، بەڵام خۆ ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی حزبی کۆمۆنیستی ئێران بووم، بەڵام ئەو کاتە برایمی عەلیزادە هاتۆتە لای مەنسوری حیکمەت، ئەوەی پێی وتوە، ئەری برادەر تۆ زۆر دەمێکە دەڵێی دەبێ زۆر شت بگۆڕێ، پێداچونەوەیەکی رەخنەگرانە بە هەموو بنەماکانی کۆمەڵەدا بکرێ، ئەوە هاتوم بزانم رەئیت چییە؟ سەید برایم زۆر موعجیب بوو بە مەنسوری حیکمەت، ئەمن وانەبووم، وە چووە و ئەوەلەوێ قسەکانی کردووەو، وە وردە وردە بەیەکەوە، لەراستیدا زۆرتر مەنسوری حیکمەت ئەوشتانەیان داڕشتبوو، بۆیە لەسەر ستراتێژی کۆمەڵە لە بزوتنەوەی کوردستان، لەسەر حزبی دیموکرات لەسەر زۆر زۆر شتی تر لەوێ شت نوسراوە، کە ئەمن لەگەڵی نەبوم، ئەوەشم کە لەگەڵی نیم بە کاك برایمی عەلیزادم وتوە، دانیشتوم دوو بەدوو ، بە تەفسیل ئەوانەم بۆ باسکردووە، ئەمە هەڵەیە، ئەمە هەڵەیە، ئەمە هەڵەیە،

## حزبی دیموکراتمان کرد، بەخاوەنی کوردایەتی

*چی بوون ئەو هەڵانە؟

عەبدوڵلای موهتەدی: زۆر شت، یەکیان هەر ئەوەبوو کە ئێمە لەژێر ناوی ئەوەی ئێمە حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران ناسیونالیستەبزوتنەوەی کوردمان پێ بەخشی، پێمانبەخشی، کە چی کۆمەڵە وانەبوو ئاخر، کۆمەڵە لەسەردەمی پێش حزبی کۆمۆنیستی ئێران، لەسەردەمێك کە خۆی رێکخراوە و حزبێکی سەربەخۆ بوو وەتا کۆنگرەی پێنجەمیش بێ وچان لەسەر ئەو خەتە بوو کەوا عەرزت دەکەم، یەعنی خەتی خۆی بە خاوەنو رەهبەرو دڵسۆز و پێشەنگی بزوتنەوەی رزگاریخوازانەو شۆڕشگێرانەی گەلی کورد بۆ ئازادی نەتەوەیی دەزانی ئەمە هەر پێشتریش.

لەهەمان حاڵدا خۆشمان بە حزبی چەوساوەکانی کوردستان، حزبی چەپ و عەداڵەتی کۆمەڵایەتی و یەکسانی ژن و هەمو ئەوانە ناسیوە، بەڵام لە کۆنگرەی شەش ئەمەگۆڕا، کۆنگرەی شەش ئیتر ئێمە مانان داڕێژەرانی سیاسەتەکەی نین من بەش بە حاڵی خۆم ناکۆکیشم هەبوە، ئەو ناکۆکیانەم بە تەفسیل لەگەڵ (سەی برایم) باسکردوە.

یەکیان: ئەوەبوو کە رەهبەری ئەسڵەن کێشەی کوردی کرد بەکێشەیەکی لاوەکی بۆ خۆی، لە حاڵێکدا ئەوە لەناوەندی بیروباوەڕو لە ناوەندی ستراتیژی کۆمەڵەدا بوو، پێشتر، بەڵام مەسئەلەی کوردی کرد بە کێشەیەکی لاوەکی لەبیرکردنەوەی حزبی کۆمۆنیستی ئەوکات و سازمانی کوردستانەکەیدا. کۆنگرەی شەشەم ئەوکارەی کرد، لەسەر حزبی دیموکرات هەڵوێستەکەیم بەهەڵە زانیوە، لەسەر ستراتیژی ئێمە لە کوردستان، لەسەر زۆرشت ئەلعان ناچمە ناو وردەکارییەکانیەوە، بەڵام لەسەر زۆرشت، وەدوویەدوییش لەگەڵ سەید برایم زۆرم قسەکردوە، هەربۆیەشە من ئامادەنەبووم لەو کۆنگریەدا بەشداریبکەم، چۆن بەراستی جا نازانم بڕیارێکی باشم دابێ یان نا، بەڵام ئەو وەختی پێموابوو ئەگەر من ببم و ئەو قسانەش بکەم ئیتر ئەوە مەعنای زۆر لێك جیابونەوەیەکی گەورەیە، ئەو وەختی من لە فکری خۆمدا پێموابوو ئەو ئینشیقاق و جیابونەوە نا مەسڵەحەتە ناکرێ ئەیکەین باشە.

## کۆنگرەی شەش بنەماکانی کۆمەڵە هەڵدەتکێنێ

***تۆ پێتوابوو لەو کۆنگرەیەدا یا بەحسەکانی ئەو کۆنگرەیە، کۆمەڵە کرابووە قوربانی حزبی کۆمۆنیست و مەیلی نەتەوەگەرایی یا ئەوەی کە کۆمەڵەی پێناسراوە بەرەو لاوازبوون و پەراوێز خرابوون، مەنسوری حیکمەت و سەید برایم بەرپرسی بوون؟**

عەبدوڵای موهتەدی: ئاخر مەیلێکی چەپی زۆر دوگماتیکی، زۆر ناواقیعی، هەڵەی زۆر پڕو پوچ کە هیچ بنەمایەکەی نەبوو، ئەم کۆنگرەیەیەکە بەتیئوری بنەماکانی کۆمەڵە هەڵدەتکێنێ، ئەم کۆنگرەیە پەسەندکراو ئەوجۆرە بیرکردنەوە هاتەئاراوە، بۆیە ساڵێك، دوو ساڵ دواتر وەختێك بیری کۆمۆنیزمی کارگەری هاتە ئاراوە، ئیتر ئێمە چۆن بڵێم جەبهەیەکمان نەبوو مقاوەمەتی تێدا بکەین بەفکر، تازە کۆمەڵە خۆی دۆڕاندبوو، ئەگینا تا کۆنگرەی پێنجەمیش هیچ کەس نەیدەتوانی ئەو قسانە بکات، بەڵام چۆن بڵێم کۆنگرەی شەشەم ئەو بنەمایانەی کە کۆمەڵە لەسەری بوو زۆرێك لەوانەی روخاند، بۆیە خەڵك بەرگەی نەگرت وەختێك دیدگاکانی کۆمۆنیزمی کاریگەری هات، ئەو موقاوەمەتە گەورەیە نەکرا کە تۆ چاوەڕوانت دەکرد، مەسەلەن هەر لەکۆنگرەی شەشەمدا بوو کە ئەو باسە هاتەئاراوە، کە ئێمە حزبی بزوتنەوە نین، ئێمە حزبی بزوتنەوەی کوردستان نین.

***ئەمە کێ وای وت؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** مەنسوری حیکمەت، برایمی عەلیزادە، ئاخر هەر ئەسڵەن بەحسەکان ئەوەیە، بۆماوەیەك حەتتا بەگاڵتە ئەو کەسانەی کە ئەو بیروباوەڕەیان پێ نەبوو، پێیاندەوتن (کادری جومبشین) یەعنی کادری بزوتنەوەن ئەوانەی هیچ نین، شتی بێ قابیلن.

# مەنسور، جەختی کرد کەسکرتێری کۆمەڵە بدەین بەسەید برایم

***تۆ بۆ وازت هێنا ئەو کاتە لەسکرتێری حزبی کۆمۆنیست یان دانیشتی؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ پێش پێکهێنانی حزبی کۆمۆنیستی ئێران، لەچەند شتدا مەنسوری حیکمەت تاقیکردبووە کە ئەگەر من هەروەکو ئەوکات بووم، سکرتێری کۆمەڵە بمێنمەوە، تەنانەت کۆمەڵە بشچێتە ناو حزبی کۆمۆنیستی ئێرانەوە، ببێ بەسازمانی کوردستانی حزبی کۆمۆنیستی ئێرانیش من سکرتێری بمێنمەوە، من خۆم بەخاوەنی بیروباوەڕو خەتو ڕێبازێك دەزانی، زۆرێك لەو شتانەی کۆمەڵەدابوو، دەستی منی تیابوو، جێ پەنجەی منی تیابوو لەدارشتندا، بۆیە ئەو لەو بڕوایەدا بوو کە ئەو جۆرە کۆمەڵەی بۆ رامناکرێت، ئەگەر من لەوێ بم، بەڵام سەید برایم بەبێ ئەو قامکی لەئاوڕۆنەدەکرد، لەبەرئەوە ئەو بۆیە زۆری پێخۆشبوو، زۆری ئیسراری کرد کە با سەید برایم دوای ئەوەی کە حزبی کۆمۆنیستمان پێکهێنا، سەید برایم ببێتە سکرتێری یەکەمی کۆمەڵە، ئەی رەفیقەکانی تری خۆمان ئەوانەی ناو کۆمەڵە چین. ئەوان لەروانگەیەکی ترەوە بۆ هۆیەکی تر، بەڵام هەر پیتانخۆش بوو من بچمە حزبی کۆمۆنیستی ئێرانەوە ببم بەسکرتێری حزبی کۆمۆنیستی ئێران چۆن ئەوان بڕوایان زۆر بەمن بوو.

پێیانوابوو یەکێکی خۆمان لەوێ بێ، یەکی کۆمەڵە سکرتێری حزبی کۆمۆنیستی بکا، ئەو باشترین گارانتیە و بڕوایان بە من بوو، پێشی ئەمن کەسێکی نەوێراونەبووم لەبزوتنەوەی چەپی ئێران و لەبزوتنەوەی ئۆپۆزسیۆنی ئێرانیداو پێیان وابوو جوابی ئەو بوارەم پێدەدرێتەوە، رەنگبێ جوابی ئەو بوارەم پێ بدرێتەوە، بۆیە بەهەرحاڵ ئەنگیزەکان یان دەلیلەکان زۆر جیاوازبون لەیەکتری، بەڵام بەهەرحاڵ هەرچی بوو نەتیجەکەی ئەوەبوو، بەڵام ئەوە وابزانم ساڵ و نیوێك شتێکی ئاوا تولی کێشا، دواتر پێرەوی ناوخۆی حزبی کۆمۆنیستی ئێرانمان گۆری و ئەسڵەن پۆستی سکرتێری گشتی نەما.

# عەلیزادە و مەنسور دەیانویست دەستی من لەکوردستان و کۆمەڵە کەم بکەنەوە

***ئەتەوێ بڵێی مەنسورو ئیبراهیمی عەلیزادە بون بـە کوتلەیـەك بۆدژایـەتی تـۆ، تـاوەکو ئـەوەی کـە ئەیانەویست ئەوە تەحقیقەکەن؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** عەمەلەن وابوو، عەلەمەن، وابوو، پێیانخۆش بوو دەستی من لەکوردستان و کۆمەڵە کورتکەنەوە.

***کردیان؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** کردیان، بەڵێ بۆ چەندساڵێك کردیان، پێشم بەزەرەربوو، من ئەو چەند ساڵەی کـە خـۆم دورکەوتـەوە لـە کوردسـتان و کۆمەڵـە بـۆ کۆمەڵـەم پـێ بـەزەرەربوو، بـۆ شەخسـی خۆشـم زەرەربوو.

***ئەوان گلەیی ئەوە ئەکەن یان بابڵێین واباسی ئەوە ئەکەن کە گوایا تۆ لەبەرئـەوەی هەڵنەبژێرایتـەوە لەو کۆنگرەدا بەسکرتێر بۆیە وازهێنی و دانەنیشی؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** ئەوە دواترە، ئەوە هی ساڵی (1999) یە وا بزانم ، وەنییە، کۆنگرەی حەوتە.

***لەو کۆنگرەیەش جەنابت عاجزبوی؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** کامە؟

***لە کۆنگرەی شەشدا.**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** کۆنگرەی شەشی کۆمەڵە؟

*** بەڵێ؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** هەرباسـی سـکرتێری نـەبووە، وەختێـك ئێمـە لـە مـانگی سێپتامبری (1983) کـۆنگرەی دامەزرێنـەری حزبـی کۆمۆنیسـتی ئێرانمـان بەسـت، هەرلـەوێ دانیشـتین لـە پۆسـتەکان قسـەمانکرد ، لـەوێ ئـەو مەسـەلە باسـکرا کـە مـن سـکرتێری گشـتی حزبـی کۆمۆنیسـتی ئێـران بم، مەنسوری حیکمەت تەبعەن زۆری تاریفی منی کرد، گوتی کەسایەتی ئاوا هەرنییە لە ئێران، من قەت



ئەزمونی ئەوم نییە، شتی ئەوم نییە، بەحیقیەتیش ئەو وەختی پێی وابوو خۆی بەرەژێرتر دەزانی لەئێمە مانان، هاوڕێیانی سەرکردایەتی کۆمەڵەش زۆریان پێخۆش بوو کە من ئەو پۆستە وەرگرم بۆئەوەی کەسێکی خۆیان لەوێ بێ لەبەرئەوە ئەو وەختە دابەشکراوە، خۆ کۆنگرەی شەشی کۆمەڵە بەحسی سکرتێری کۆمەڵەی تێدانەبووە، کەس مونافیسێکی نەبوو.

## ئەوکات نەمویست کۆمەڵە تووشی ئینشقاق بکەم

*باشە ئەو مەیل و گەرایشەی تۆ ئەڵێی کە تۆ بەشێك لەهاورێکانت پێیتان قبوڵ نەبوو، بەڵام برایمی عەلیزادە مەنسوری حیکمەت جەختیان لەسەر ئەکردەوە، تاوەکو بیچەسپێنن و، ئەگەر زۆرینەی کۆمیتەی ناوەندی لەگەڵی نەبوو، بۆ بووە بڕیارو راسپاردە؟

عەبدوڵای موهتەدی: من نەمکرد بەکێشەیەك لەناوخۆماندا، لەئەم دیدو بۆچونانەی خۆم تەنیا لەلای ژمارەیەکی کەم باسکرد چون بەراستیش جا چاکم کردبێ یان خراپ، تێگەیشتنی، باسکردنی و تەقینەوەی ئەوانە لەناو ئەوکاتی حزبی کۆمۆنیستدا دەبوو بەدووبەرکایەتییەکی گەورە، پێموابوو ئەو وەختە ئامادەنین یا من بەهیچ جۆرێك ئامادەنەبووم کەیەك ریزی ئەو حزبەی کە خۆشم تێیدا بووم و لەسەرکردایەتیەکەیدا بووم بکەوێتە مەترسییەوە، بۆیە لەراستیدا من کۆتا هاتووم من نەم تەقاندەوە زۆرم باسنەکرد، بەڵام ئەوە کەخەڵکانێك هەبوون ئەوەیان دەزانی، بۆیەش هەرنەچوومە وەکو عەرزم کردی ناو کۆنگرەکەوەوە، خواحافیزیم لێکردن و جەلەسەی ئەوەڵی چووم پیرۆزباییم لێکردن و وتم ئیتر سوپاستان ئەکەم و وتم پاسپۆرتەکەم مەوعیدی تەواوبووە، واش نەبوو.

## دەیانویست رۆڵی من پەراوێز بخەن

*رۆشتی بۆ ئەوروپا؟

عەبدوڵای موهتەدی: بەڵێ.

*تاچەند ساڵ یان چەند ماوە؟

عەبدوڵای موهتەدی: نا خۆ زوو زوو دەهاتمەوە، هەمیشە دەهاتمەوە بۆ کوردستان، ساڵی چەند مانگی هەمیشە لێرەبووم.



***ئەمەوێ بڵێم ڕۆڵی تۆ پەراوێزخرابوو لەناوکۆمەڵەو حزبی کۆمۆنیست، دەیانویست وای لێبکەن؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** دیاربوو ئەیانویست وای لێبکەن زۆر بەئەنقەست.

## دیدی مەنسور لەسەر شوراکان هەڵە بوو

***مەبەست لەوەبوو، تۆ مەیلێکی نەتەوەیی و تێکەڵەیەك لەچەپ و ناسیۆنالسیتت تیابوو؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** ئەزانی چۆنە، مەیلی نەتەوەییم تێدابوو، بەو مەعنایە کە من بەڕاستی وەکو ڕێبازی کۆنتری کۆمەڵە لەو بڕوایەدا بووم، ئەرکی ڕزگاری نەتەوەیی لە کوردستان، من بەئەستوی کۆمەڵەم دەزانی و پێموابوو دەبێ بە هەمومان هەوڵی بۆ بدەین، بەڵام بێجگە لەوە شتێکی تریشی بوو، من خۆم بە خاوەنی باوەڕو خەت و ڕێبازێك دەزانی گوێ لە مستی مەنسوری حیکمەت نەبووم، شەرت نەبوو هەرچی ئەو بیڵێتەوە، لەچەندین شت یەعنی خۆ هەرئەوە نییە مەسەلەن بۆ نمونە بیڵێین لەمەسەلەی شوراکان و ئیتیحادییە کرێکارییەکاندا، هەر لە ئەوەڵ تا ئاخر هەموو عالەمەکە لەگەڵ مەنسوری حیکمەت کەوتن لەسەر مەسەلەی شوراکان، ئەمن لەگەڵیان نەبوم، من پێموابوو دیدی مەنسوری حیکمەت لەسەر شوراکان هەڵەیە، هەر لەسەرم نووسی ، دیارە ڕەئییەکەی من نەیبردەوە، بەڵام کەسێکی ئەوجۆرە بووم یەعنی بەئاسانی نەدەچوومە ژێربارەوە، پێیانوابوو مانەوەی من لەکوردستان دوبەرەکایەتییەکی گەورە پێکدێنێ لەنێوان کۆمەڵەو حزبی کۆمۆنیستی ئێراندا لەنێوان سازمانی کوردستانەکەی و بەشە سەرتاسەرییەکەی ، لەزۆر بواری تیئورییدا من وەکو ئەوان بیرم نەدەکردەوە، تازە ئەو هاتوو ڕۆی بەڵام وابوو.

## کۆمیتەی ناوەندی ڕەخنەیان هەبوو

***کۆنگرەی شەشەم کە دەبوو زستانی( 1987 ) بگیرێ، بەڵام دواکەوت هەرئەو بەحسانەبوو دیارە کۆنگرەی دواخستوە؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** نا، لەو بڕوایەدا نیم، پێموایە شتی تەکنیکی بووە وام لەبیرنییە، ئەزانم ئەو سەردەمە نارەزایییەکی زۆر لە کاك برایم لەناو کۆمیتەی ناوەندیدا هەبوو، زۆربەی هەرە زۆریان نارازیبون.



***لەسەر چی نارازییوون لێی ؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** لەشێوەی ئیدارە، لەو مودیرییەتی (سەید برایم) نارازیبون، پی ئانوابوو پرس بەکەس ناکات، پێتانوابوو سەرجەم سەید برایم ئەو وەختی کۆمیتەی ناوەندی کۆمەڵە، زۆر زۆر کەسایەتی بە ئەزمون و گەورەی تێدابوو ، ئیدارە کردنی بۆ کاک سەید برایم ئاسان نەبوو کاك( سەید برایم) ، بۆیەش بوو لەوەدا (سەید برایم) یارمەتییەکی زۆری لە مەنسوری حیکمەت وەرگرت، ئەوهات وقسەی لەگەڵ کردن و بۆی ئارامکردەوەو ئەویش لە موقابیلدا لەشتە تیئورییەکاندا زۆر زۆر بەقسەی دەکرد.

*** پێتوایە ئەوان بردیانەوە یا تۆ، لەو کێشمەکێشمانەدا لەو چەند ساڵدا رویدا؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** ئەوکات ئەوان بردیانەوە.

***دواتر؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** دواتر ، دواتر پێموایە خەتی دروست کە منیش یەکێکیانم بردێتیەوە، ، پێموایە بزوتنەوەی کوردستان قازانجی کردووە لەو پرۆژەی ساغکردنەوەی کۆمەڵەدا ، پێموایە خەڵکی کوردستان قازانجیان کردوە.

# من وتم، دروستبوونی حزبی کۆمۆنیست جارێ زووە

***ئەی تۆ چی ئەڵێی سەبارەت بە هەموو ئەو شتانە رەنگە (سەید برایم) یان زۆر لەبرادەران تۆ تاوانباردەکەن کە تۆ دەستت هەبووە لەدروستکردنی حزبی کۆمۆنیستدا، تۆ مەیلێکی چەپی رادیکاڵت هەبووە، هەرئەوکاتە تۆ(مەنسوری حیکمەت ) رائەکێشی ؟**

عەبدوڵڵای موهتەدی: نا، نا من چەپبووم، چەپێکی رادیکاڵ بووم، دەستیشم بوو لەدروستکردنی حزبی کۆمۆنیستی ئێراندا ئایشارمەوە، ئەوەبەشێك لەژیانی سیاسی من و بەشێك لەبیۆگرافی سیاسی من و هەرمووو کۆمەڵەشە، بەڵام دووسێ شت دەڵێم لێرە.

یەکەم: من بەتەنیا نەبووم ، هەمومان بەخێری ئاوامان بیرکردۆتەوە.

دووەم: ئەگەر چی من لەپرەنسیپدا لەگەڵ دروستکردنەکەی بووم، بەڵام من لایەنگری ئەوەبووم جارێ زۆرتری لێبکۆڵینەوەو زۆرتر دیراسە بکرێ پەلەی لێنەکەین، بەڵام (مەنسوری حیکمەت و سەید برایم) رەئی رەفیقەکانی تریشیان بۆلای خۆیان راکێشاو ئەوان پەلەیان لێکرد، پێت وانییە برۆ لێی پرسە.

سێیەم: من پێموابوو پەسەندکردنی حزبی کۆمۆنست و دامەزراندنەکەی دەبێ لە کۆنگرەیەکی کۆمەڵەدا پەسەندبکرێ، بەدەنگی نوێنەرانی ئەو کۆنگرەیە ، بەلام ئەوەش نەکرا.

لەمەسەلەی بزوتنەوەی کوردستاندا نەخێر من لەزۆر بواردا جیاوازم بیرکردۆتەوە، بەتایبەتی لە کۆنگرەی شەش، زۆر جیاوازم بیرکردۆتەوە، دواتریش، ئاخر هەر ئەو قسانەی کۆنگرەی شەشی کۆمەڵەبوو کە دوای جیابونەوە و رۆشتنی کۆمۆنیزمی کارگەری، کە کۆنگرەی هەشتی کۆمەڵەمان بەست، ئیتر من لەوێ تازە دوای ئەو جیابیە شتەکەم ئاشکراکردووە، ئەو قسانەی والە کۆنگرەی شەش من دەبوایە بیکەم و نەمکرد لەگەڵ کۆڕو کۆمەڵێکی چکۆڵە لەوانە شەخسی (سەید برایم) باسمکرد، ئیتر لە کۆنگرەی هەشتی کۆمەڵە من بەئاشکرا باسمکردوە، ئەو دیدوبۆچونەی کە سەید برایم لە کۆنگرەی شەش لەژێرتەئسیری (مەنسوری حیکمەت)دا باسیکرد، دوای رۆشتنی ئەو و دوای ئەو کارەساتەی لە کۆنگرەی هەشتیش هەر عەینەن دیدوبۆچونی باسکرد، چۆن خۆ سەید برایم دیدی نەگۆرابوو.

*ئەی ئێستا؟ هەرلەسەر ئەو دیدەیە؟

عەبدوڵای موهتەدی: هەرئەو دیدەی هەیە(سەید برایم)، سیستمێکی فکری دیکەی غەیری ئەوەی(مەنسوری حیکمەت) داویەتێ، نییەتی تا ئێستاش هەوڵینەداوە پێداچونەوەیەك بەو سیستمی فیکرییەی خۆیدا بکات. من زۆرم هەوڵ لەگەڵدا، زۆر چۆن زۆر رەفیقی نزیکبوین زۆر برادەربوین زۆر هەموو هەستان و دانیشتنمان پێکەوەبوو، من زۆر هەولم لەگەڵەدا، زۆرم زەحمەتکێشا کە (سەید برایم) بچێتە ناو پرۆسەیەکی بیرکردنەوەوە، روانگەی بەرامبەر بە چەپ، بەرامبەر بەمەلەسەی کورد، بەرامبەر بە ئەزمونی خۆمان بگۆڕێت.(سەید برایم) راستیەکەی بلێم وەکو ئیماندار وابوو، پێی وابوو ئەگەر باسی خواو پێغەمبەر بکرێ هەر دەبێ دووربکەویتەوە ئەگینا کافر دەبێ، من بەپێچەوانەوە پێموابوو بەهی شتێك کافر نابێت یەعنی بیرلە هەمو شتێك دەبێ بکەیەوە.

## جیابوونەوەی حزبی دیموکرات-رێبەرایەتی شۆڕشگێر و هاوکاری کۆمەڵە

*من پێمخۆش- نییە جارێکی تر لەسەرئەوە بڕۆین، بەلام هەر لەو کۆنگرەدا ئەوکات ئێوە لە( 3 ی گولانی( 1374 ) راگەیاندنێکتان بلاوکردۆتەوە ئەو کاتەشەڕی ئێران- عیراق ئەوەستێ، ئەوە لەبەحەسەکانی پێشودا ئێمە قسەمان زۆر لەسەرکرد کە تۆ لەگەڵ بۆچونەکانی من نەبووی، پێموابوو



**ئێوە لەوبارەیەوە جمهوری ئیسلامیتان تاوانبارکردوە، لەکاتێکدا شەڕ بەعس هەڵگیرساندوە، پێمخۆش نییە جارێکی کە باس لەو مەسەلەیە بکەینەوە لەبەرئەوەی لەبەشەکانی پێشوترا قسەمان زۆر لەسەرکرد، بەڵام لەو کۆنگرەیەدا یا لە کۆنگرەی شەشەمدا باس لەسەر جیابونەوەی باڵی (حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران- رێبەرایەتی شۆڕشگێڕ)کراوە؟ مەبەست لەو باسکردنە چیبوو؟ هەندێ کەس پێیانوایە کۆمەڵە دەوری هەبووە لەئینشیقاقی حزبی دیموکرات، هەرئەوکاتە شەڕی نێوان رێبەرایەتی شۆڕشگێڕو کۆمەڵە ئەوەستێت وە دیموکرات، کۆمەڵە بەدنەدانی رێبەرایەتی شۆڕشگێڕ بەهاوکاری ماڵی و چەك دەزانێ کە باڵێکن لە حزبی دیموکرات جیابونەوە و حزبی دیموکرات لاواز بووە؟**

عەبدوڵلای موهتەدی: دەزانی چۆنە جیابونەوە و ئینشیقاقەکەی حزبی دیموکرات، ناگەڕێتەوە بۆ ئێمە، دەگەڕێتەوە بۆ هۆکارە ناوخۆییەکانیان، بەڕاستی ئەو کێشە کێشەیەکی قوڵ و لەمێژینەی خۆیان بوو، کە سەرەنجام تەقیەوە دوای کۆنگرەی هەشتی ئەوان. بەڵام دوای ئەوەی کە جیابونەوە ئەمەڕاستە، ئێمە دۆستایەتیمان کردون، یارمەتیشمان کردون پشتیوانییەکمان کردون، ئێستاش بیرەوەری ئەو وەختە دۆستت ترین لەگەڵ ئەو لایانە بەحەقیقەت.

***لەگەڵ ئەو باڵە؟**

عەبدوڵلای موهتەدی: لەگەڵ ئەو باڵە، دەزانی بۆ چونکە لە هەردوك لامانەوە ئەو حاڵەتی شەڕوشەڕخوازی و عەداوەتە کاڵ بووەوە، هەردوك لامان کاڵمانکردەوە لەگەڵ یەکتری، بۆیە وەختێك ئینسان دوای ناکۆکیەکی زۆر قۆناغێکی دۆستایەتی دابمەزرێنێ دیارە ئەوە تەئیسری خۆی هەیە ، ئەمەش وابوو دوای ئەوەی کە چۆن ئەو بەشەکەی تری حزبی دیموکرات بەدوژمنایەتی خۆی درێژەیدا ئەمان دەستی دۆستایەتیان بۆلای ئێمە هێنا، بۆ دەبێ وەرینەگرین، بۆ دەبێ یارمەتیان نەکەین، کردمان.

# رێبەرایەتی شۆڕشگێڕ، راگەیاندیاندا کەشەڕ دژی کۆمەڵە رادەگرن

------------------------------

***ئەوە پێموایە لەو روانگەیەوە سەیرتاندەکرد کە ئێوە دوژمنی دیموکرات بوون، دژایەتی یەکترتان نەکرد، لەشەڕابوون، پێیتانوابوو حزبی دیموکرات لاواز ئەبێ بەم شکڵە، ئێوە بەشداری لایەکتان نەکرد کە دیسان دژی حزبی دیموکرات بوون لەشەڕابوون لەگەڵ حزبی دیموکرات، مەسەلەکە ئەوەنەبوو**



**کە ئەوان دەستی دۆستایەتیان درێژکردبوو، پێموایە ئەوان دوژمنی حزبی دیموکرات بوون، بەهەمان شێوە ، ئێوەش و باڵی رێبەرایەتی شۆڕشگێر لەشەڕابوون لەگەڵ حزبی دیموکرات، ئەمە باشترین دۆستایەتی بوو کە ئێوە کوتلەیەك پێکبێنن دژی حزبی دیموکرات؟**

عەبدوڵلای موهتەدی: ئێمە نەبوین و پێکمانهێنا، بەڵام کە ئەمە خۆی پێکهات، بوو بەشت، ئامادەبوو شەڕ لەگەڵ ئێمە بوەستێنێ، ئاخر لەبیرت نەچێتەوە، رێبەرایەتی شۆڕشگێر لەیەکەم بەیاننامەیدا شەڕی لەگەڵ کۆمەڵە راوەستاند، تۆبی چی ئەکەی؟ حزبێك کە دوژمنایەتی تۆ دەکات شەڕی ناوخۆی هەیە لەگەڵ تۆ، باڵێکی بەشەڕەکە درێژە ئەدا، باڵێکیشی شەڕ دەوەستێنێ و دەستت بۆ درێژدەکات، تۆش بێ هەر ئەوکارە دەکەی، کێ پێی خۆشە، دوژمنی بەهێز بێ.

# من داوام کرد باشەڕ دژی دیموکرات رابگرین، تەنها من دژی ئەو شەڕە بووم

***بەڵام پێیتان خۆش بوو، دوژمنی دوژمنەکەتان دۆستتان بێت؟**

عەبدوڵلای موهتەدی: بۆ ئەو سەردەمی شەڕ بێگومان هەمو کەس وابیردەکاتەوە، بەڵام ئەگەر تۆزێك فراوانترو درێژخایەنتر بڕوانی بە حەقیقەت ئێمە نەمانویستوە، یەعنی ئێمە خۆمان بە هەڵگیرسێنەری شەڕی ناوخۆی کوردستان نازانین، وەختاکەی بەهی خۆمان نازانین، بۆیە هەر بەشێك لە حزبی دیموکرات بیویستیایە لەگەڵ سیاسەتی شەڕخوازانەی ئەو کاتی سەرکردایەتیەکەی سنورێك دابنێ و لەگەڵ ئێمە شەڕنەکا، ئێمە پێشوازیمان لێدەکرد، وەپێموایە هەرکەس بێ ئەوە کارە دەکات، ئێمە لێی پەشیمان نین، بەڵام کە کردمان وردە وردە بەراستی دۆستایەتیەکیش لەنێوانماندا پێکهات، بەڕاستی تێگەیشتن و موفاهەمەیەك پێکهات، یەکێك لەوشتانە مەسەلەن پێت بڵێم جا ئەوە ئەلعان کەوتەوە بیرم بەو پرسیارەی تۆ، یەکێك لەو شتانەی کە ئەمن لەگەڵ من لەلایەك لەگەڵ " سەید برایم وەمەنسوری حیکمەت" و ئەوان لەلایەکی دیکە هاوفکر نەبوین، هاوسیاسەت نەبوین هەر رێك مەسەلەی حزبی دیموکرات بوو، من زۆر دەمێك پێش ئەوە پێموابوو کە ئێمە دەبێ ئاگر بەستی یەك لایەنبدەین لەگەڵ حزبی دیموکرات وە " سەید برایم" و ئەوان پێیان وابوو ئەوە ئاڵای شکستەو ئاڵای سپیم هەڵکردوە، هەموو ئەو قسانە ئەو وەختە سەبارەت بەمن کرا. دیارە من خۆم یەعنی هەم بە شەخسی ئینسانێکی ناقایم نەبوم لەنەو گێرەو کێشانەدا، زوو بۆ خۆم ئینسانێکی ناقایم نەبووم، هەم مەوقیعیەتیشم خراپ نەبوو، خەڵك دەیزانی من کەسێکی ئاوانیم یەعنی کەسێکی ، ئا، خۆم تەسلیم کەم وخۆم بەدەستەوە بدەم، لەبەرئەوە ئەو قسە نەیگرت بەدژی من، بەڵام ئەوەی کە ئاڵای سپی تەسلیمیان



هەڵکردوە، ئەوە ئەگینا من خۆم یەکێك لەو کەسانەبووم، پێشترو هەر لەناوخۆی خۆمان بارەها نوسراوە ناوخۆییەکانیش ئێستا ماوە لەو بڕوایەدا بووم کە شەڕ نابێ بێ، رەنگ بێ پێت سەیر بێ ، بەڵام دەزانم حزبی دیموکراتیش ئەوەی زۆر بڵاوکردۆتەوە دەڵێ لە گۆڤاری کۆمۆنیست ئەو وەختی نۆرگانی ئێمە بوو، لەژمارە پازدەکەیدا، گوایە من شتێکم نوسیوەکە زۆر شەڕخوازانەیە، تائێستاش حزبی دیموکرات (بەناهەق هەڵبەتە بەبڕوای من) ئەمە بە هۆکاری ئەوە دەزانێ کە گوایا من پفم بەئاوری ئەو شەڕەدا کردووەو خۆشمکردوە ، لەراستیدا هیچ کەس نازانێ غەیری ژمارەی کەم لەسەرکردایەتی تەنانەت ئەمن یەکەمجارە ئابەوشێوە باسیدەکەم، ئەگینا لەناو ریزەکانی خۆشمان کەس نازانن، بەپێویستم نەزانیوە باسی بکەم، دەنا تەنها کەسێك تەنها کەسێك، لەسەرکردایەتی ئەو وەختی خۆماندا کە لەگەڵ ئەوشەڕە نەبوو من بووم .

# قسملۆ بڕیاری لەشەڕی سەرتاسەریدا دژی کۆمەڵە

*** پێتوابوو ناڕەوایە؟**

عەبدوڵای موهتەدی: ئەو، پێموابوو حزبی دیموکرات خەتابارە، پێموابوو نادیموکراتە، بەڵام پێموابوو شەڕخوازە، بەڵام پێموابوو سیاسەتی ناقڵانە بۆ ئێمە ئەوەیە خۆی لێببوێرین، ئەگینا من قەت قەت حەقانیەتم نەئەو کات نەئێستا نەداوە بەسیاسەتی حزبی دیموکرات.(د. قاسملۆ) لەبیرم نەماوە ژمارەی پلنیۆمەکەی، بەڵام لەپلنیۆمێکدا پەسەندیدەکەن بەئاشکرا وەکو بەڵگە ماوە، ئێستاش دەڵێن، ئێمە شەڕی سەرتاسەری بەو مانایە لە هەموو کوردستان نەك شەڕی لۆکاڵ، نەك ئێرانی پێی دەڵێن مەوزیعی، یەعنی نەك شەڕ لەشوێنێك و لەئاستێك، شەڕی سەرتاسەری لەگەڵ هەموو کۆمەڵە دەکەین ئەمە پەسەندکراوی پلینۆمی حزبی دیموکراتە.

*** پرۆزی درجنگ، در حزبی کۆمەڵە ؟**

عەبدوڵای موهتەدی: بەڵێ، ئەوان وا دەڵێن، سیاسەتیان هاتەسەر ئەوە لە قۆناغێکدا ، من ئەمەم دەدیت ، نەك ئەوەی بڵێم باوەڕم بەسیاسەتی خۆمان نەبوو، وەهی حزبی دیموکراتم بەهەڵەو شەڕخوازانە دەزانی، بەڵام من وتم تەواوی قسەکەی من ئەوەبوو لەرابردوو کە من خۆم یەکێك لەداڕێژەرانی ئەو سیاسەتە بوم ، بڕوام پێی بوو، کاری دەکرد سیاسەتەکەمان ئەویش ئەوەبوو(هەر زەربەیەکی ئەوان لەئێمەن بدەن، ئێمە بەزەربەیەك جوابی دەدەینەوە قسەیان لێ ناخۆین) پێموابێ کاری چاکمان کرد، ئەو کارەمانکرد بەمە ئێمە ئاشتیمان لە کوردستان پاراست چونکە حزبی دیموکرات ، نەجارێك نەدووجار نەدەجار هاتۆتە سەرمان و شەڕی لەگەڵ کردوین، ئەی کاکە تۆ

مقاوەمەت نەکەی هەردەتخوات و دەتپێچێتەوە لەکوردستان، حەقی خۆمان بووە، من شانازی پێدەکەم بەو مقاوەمەتانە کردومانە، بەڵام دەیزانی فەرقەکەی چیبوو.

# دیموکرات تەوقەیان لەگەڵ دەکردین و لەپشتەوە تەقەیان لێ دەکرین

## جەمیل هەورامی لەناوبژیواندیدا بوو، لێی بپرسن شەڕ خەتای دیموکرات یان کۆمەڵە بوو

* بەو کوشتارانەی کەرویداوە، شانازی ئەکەی، ئەو هەمو خەڵکەتان بە کوشتدا، هەردوولاتان؟

عەبدوڵای موهتەدی: نا،نا، باپێت بڵێم، من ئەمە قۆناغی بەر لە شەڕی ناوخۆییە، مەقسودم ئەو کاتانەیە تێهەڵچونێك لەشوێنێ سازدەبوو، تێهەڵچونێك لە بۆکان، یەك لە مهاباد، یەك لە سنە، یەك لەشوێنێکی تر. (99٪) ئەو تێهەڵچونانە ئەوە بووە حزبی دیموکرات هاتۆتە سەر ئێمەو کەمینی بۆ داناوین، پێشی پێگرتوین لە خەودا تەقەی لە پێشمەرگەکانی ئێمەکردووە، تەوقەی لەگەڵ کردوین دوایی لەپشتەوە تەقەی لێکردوین، هەمووی ئەوانەبووە من شانازی بەوەوە دەکەم کە کۆمەڵە مقاوەمەتی کردوە، ئەی سەری دانەواندبایە لەبەرابەر ئەوانەدا بیانپێچابایەوە.

من کۆمەڵەم بە نوختەی هومێدی خەڵکی کوردستانم دەزانی و دەیزانم، بەحەقیقەت بەباڵی پێشکەوتنخوازی بزوتنەوەی کوردستانم دەزانی، ئێستاش دەیزانم، ئاخر بۆ بخورێ، بۆ بەناحەق سەربڕێن. ئاوەڵا خۆی شەڕخواز نەبێ ئێمە ئەوەمان لەسەربوو خۆمان شەڕخواز نەبین، نەشبوین، بەڵام خۆ ئەوەم لەسەر نییە خۆم بە کوشتبدەم بەدەست خەڵکیشەوە، لەبەرئەوە، نەخێر ئەو مقاوەمەتەکانی ئەو سەردەمانەی پێشوو من هەموویم قبوڵە، فەرقەکەی لەچیدایە، من پێموابوو ئەو کات لەژێرتەئسیری زۆرشت بەهەرحاڵ سەرکردایەتی ئەو وەختە بەتایبەت " سەید برایم" یەك شتیان دەرك نەکرد، ئەوەی قۆناغ گۆڕاوە، چۆن قۆناغ گۆڕاوە، یەعنی حزبی دیموکرات لەپلینۆمی خۆیدا بەسەراحەت پەسەندیکرد، دەڵێ لەوە بەولاوە ئێمە شەڕی سەرتاسەری دەکەین، لەگەڵ کۆمەڵە، من ئەوە تێگەیشتبوم من پێموابوو " سەید برایم" و باقی هاوڕێیان جوان لەو نەگەیشتون، من وتم کاکە ئەو قۆناغەی کە ئێمە لەبەرابەر ، مەسەلەن بڵێین کەمینێکیان بۆ ئێمە دادەنا ئێمەش موقاوەمەتمان دەکرد و زەربەیەکمان لێئەدانەوە، یادەستمان دەکردەوە لەبەرابەریاندا، قۆناغەکە گۆڕاوە،یەنی ئێمە دەبێ بزانین حزبی دیموکرات شەڕی سەرتاسەریت لەگەڵ دەکات، ئەوە بە ئینگلیزی



پێیدەڵێن(ریتالییەیشن)(Retalyaition) یەنی شتێکن لێدەکات و تۆ وەڵامی دەدەیەوە، من پێموابوو لەرابردودا ئەو کارەمان کارێکی بەحەق بووە، بەڵام پێموابوو قۆناغ گۆڕاوە حزبی دیوکرات دەیباتە ئاستی سەرانسەرییەوە.

لێرەدا بوو کە من پێموابو، دەبێ ددان بە جەرگی خۆماندا بگرین. هەر ئەوانم پێ ناحەق بوو، هەرئەوانم پێ شەڕخوازبوو،بۆ مێژوش ئەوە دەڵێم ، ئێستا و زۆر لەمێژساڵە، ئێمە لایەنگری دۆستایەتی حزبی دیموکرات بوین، هەین، لایەنگری دروستکردنی بەرەین لەگەڵ ئەوان ، بەڵام خۆ بەخاتری دروستکردنی بەرە من ئامادەنیم مێژوی رابردوو بگۆڕم، مێژوو هەر ئەوەیە کە بوو ئەوان بەناحەق دەزانم.

بەڵام ئەوەی کە ئێمە هەڵەمانکرد، هەڵەی ئێمەی تێدابوو، بریتی بوو لەوە دروست تەشخیس نەدرا کە ئەو قۆناغە گۆڕاوەوە، حزبی دیموکرات شەڕی سەرتاسەریت لەگەڵ دەکا، دەبوو ددان بە جەرگی خۆماندا بگرین، کاکە شەش مانگی تر ساڵێکی تر کە دوو ساڵی کە بەهەرجۆرێکی هەیە ئێمە نەهێڵین ببێ، دەتوانم بڵێم لەوەدا ئێمە کەوتینە داوی حزبی دیموکراتەوە ئەوان بڕیاریان دابوو بۆ شەڕی سەرتاسەری شەڕەکەشیان لە هەورامان دەستپێکرد، شەڕیکیان دەستپێکرد کە خۆت بەڵگەکان لە من باشتر دەناسی و رەنگ بێ زاکیرەشت باشتربێ لە من، شەڕێکیان دەستپێکرد، بەبێ هیچ هۆیەك بەبێ ئەوەی هیچ تەحریکێك لەئارادا بێ لەلایەن ئێمەوە، رێك هاتنە سەرمان، وەکو قران، قرانیان تێخستین، ئیبادەیان کردین لەوێ دەبڕۆن ئەلعانیش لە هەیئەتێك کە یەکێتی نیشتمانی لەبەینی هەردوك لاماندا سازیکرد بڕۆن لێیان بپرسن من دەزانم یەکیان (جەمیل هەورامی) بوو ئەرێ لێیان بپرسن، بڵێن کاکە ئەو شەڕە خەتای کێ بوو، کێ شەڕەکەی سازکرد، لە هەورامان.

یەعنی من شکم نییە لە ئەوەکە ئەوان تاوانباربوون، بەڵام کەئەوان تاوانباربوون، من هەستم بەوەکردبوو کاکە ئەوان مەبەستیانە بیکەنە شەڕی سەرتاسەری، مەبەستیانە شەڕی ناوخۆی بخەنەڕێ، پێموابوو دەبێ ئەم جارەش ددان بەسەر جەرگی خۆتدا بگرێ، ئەوە نییە بڵێم حەقی ئەوان بوو یان حەقی ئێمە بوو، بەڵام ئەم تەشخیسە تاکتیکییە دروست نەدرا ئەو کاتە، جا لە هەر حاڵدا مەسەلەن ئەمە یەکێك لە جیاوازییەکان بوو لە زۆر شتی ئاوا بوو لەمەسەلەی ئەوەکە دوای ئەوەش یەك ساڵ دوو ساڵ شەڕی ناوخۆییکرا وردە وردە کزبوو ئیتر هاتەکۆتایی ، من پێموابوو خۆمان دەبێ ئاگر بەستی یەکلایەنە بکەین لەگەڵ حزبی دیموکرات " سەید برایم" و بەشێکی کە لە هاوڕێیان لەگەڵمدا نەبوون.

# تیرۆری کۆمەڵە، دیموکرات و ئۆپۆزسیۆنی ئێران لەلایەن کۆماری ئیسلامی ئێرانەوە لەکوردستانی عیراق





# ئۆپۆزسیۆنی ئێران دەکەونە بەر تیرۆری ئێران لەکوردستانی ئێران

## (110) پێشمەرگە و بەرپرسی کۆمەڵەو دیموکراتو خەبات تێرۆر دەکرێن

---

***ئەمەوی سەرنجت بۆنەوە راکێشم لە( 15- 4- 1996 ) (کۆمەڵە و حزبی دیموکرات- رێبەرایەتی شۆڕشگێر) بەیاننامەیەکی هاوبەشتان دەرکردوەو راتانگەیاندووەتا( 1996 ) ( 110 ) پێشمەرگەی ئێرانی لە کوردستانی عیراق تیرۆ کراون و بریندارکراوە، داواتان لە حکومەتی هەرێم کردووە بۆ سزا گەیاندنی بەکردەوەی ئەوانە، داوای هاوکاریتان لە حزبەکانکردوە، لەرێکخراو و شاعیران و نوسەران کردوە، ئەو لیستەی کە باسمکرد پێکهاتون لە پێشمەرگەکانی (کۆمەڵە، رێبەرایەتی شۆڕشگێر، دیارە دیموکراتیش و خەباتیشی) تیایەوە خەڵکی بێلایەنیشی تیایە کە پەنابەربوون، ئەو لیستە نازانم لەیادتە لە چییەوە سەرچاوەیگرت، وە تاچەند حکومەتی هەرێم، حزبەکان خەڵك بەبەرپرس ئەزانی لەو تیرۆرو لەو کردەوانەی کە لەلایەن جمهوری ئیسلامیەوە ئەنجامدەدرا؟**

**عەبدوڵای موهتەدی:** جمهوری ئیسلامی ئەوکاتە خراپکاری و تیرۆری زۆر دەکرد لە کوردستانی عیراق.

یەکەم: دوای راپەرین بوو خەڵك زۆر برسی بوون، زۆرنەداربوون، لەو نەداری و هەژارییەی خەڵك ئیستیفادەی ئەکرد.

دووەمم: حکومەتی هەرێمی کوردستان، هێشتا ئەو هێزو توانا و رێکوپێکییەی کە دواتر پەیدایکرد، ئەوەی پەیدانەکردبوو، ئەتیجەکەی ئەوەیە کە زۆر کەس من ئێستا لیستەکەیم لانییە، بەڵام خۆم دیومە ئەو لیستەکاتی خۆی لە(110) دوا زیاتربوو پێموایە تا نزیك (200) کەسێك چووە ئەوانەی ئەگەر بمەڵە ئەچوبم، زۆر کەسییان تیرۆرکرد، زۆرکەسیان رفاند، زۆر کەسیان دەرمانخواردکرد، تۆرێکی تێرۆرستی بەرفراوان و دری لە کوردستانی عیراق دامەزراندبوو، جمهوری ئیسلامی، دەستی لێنەپاراستن، خەڵکی ئێمەی بەرکەوت، خەڵکی حزبی دیموکراتی زیاتر لەئێمەش بەرکەوت، بەڵام ئێمە لە خەڵك نارازی نین، ئەوە تۆری جاسوسی و تیرۆرستی خۆیان بوو، دیارە بەکرێگیراوانیان هەبوو، کوردی عیراق بوون، بەڵام ئێمە حسابی بە کرێ گیراویان بۆ دەکەین. بەگشتی ئێمە لە خەڵکی کوردستانی عیراق رازین، حکومەتی هەرێمیش سەرەنجام کاردانەوەیەکی باشیکرد، یەعنی تۆزێك بنبڕی کردوە بنبڕنا، بەڵام کزیکردن و دەستی لێوەشاندن.



*لەژێر فشاری ئێوە چەند کەسی ئیعدام کرد؟

عەبدوڵڵای موهتەدی: بەڵی، من ناڵێم لە ژێر فشاری ئێمە، بەڵام ئێمەش یەکێك لە هۆکارەکان بووین، بەڵێ بێگومان ئێمە زۆرمان داوا هەبوو بۆئەوە، خۆشیان وەکو حکومەتێك هەستیان بەوەکردبوو، وەکو دەسەڵاتێکی سیاسی کە ناتوانن دەسەڵاتی سیاسی بن لە وڵاتەکەی خۆیانا بەشەرتێك وڵاتەکەی ئەوان بێتە مەیدانی رمبازی و تیرۆرزمی جمهوری ئیسلامی، دەبوایە لەجێیەك پێشی پێبیگرن، تاڕادەیەکی باش ناڵێم سەداسەد ، بەڵام تاڕادەیەکی باش پێشیشیان پێی گرتبوو، دواتر کە خاتەمی هاتەسەرکار تۆزێك ئەو سیاسەتە گۆڕا، بۆ چەندساڵێك ئەو سیاسەتی توندوتیژی و تیرۆروکوشتن و گرتنە هێوربووە، ئێستا کە (ئەحمەدی نەژاد) هاتووە ئیتر دەبێ بزانین چۆن دەبێ، نازانین(مەبەستی ساڵی (2006)ە لێرەدا ، نەك دەورەی دووهەمی ئەحمەدی نەژاد).

# ئێمە خۆمان لەگەڕان و رابواردن و ماڵان پاراست

*لەو لیستە( 106 ) کەسییە( 23 ) کەسیان سەر بە رێبەرایەتی شۆڕشگێربوون ( 11 ) کەسیان سەر بە کۆمەڵە بون( 46 ) کەسیان سەر بە دیموکرات بوون( 1 ) دانەیان سەر بەخەبات بووە( 25 ) کەسیش بێ لایەن بوون، مەبستم ئەوەیە لەناو هەرسێ گروپەکەدا رێبەرایەتی و دیموکرات و کۆمەڵە کەمترین پێشمەرگەی کۆمەڵە کوژراوەو بەرتیرۆرکەوتوە پێتوایە هۆکارەکەی چییە؟

عەبدوڵڵای موهتەدی: پانزەبوو چەندبوو هی کۆمەڵە؟

*( 11 ) کەس؟

عەبدوڵڵای موهتەدی: (11) کەسی دەگەڕێتەوە بۆ ئێمە، من زۆرتر دەیبەمەسەر، جا خۆ ئەو قەزا ئێمە زۆرتر لە ئێمە لە سەرجەم لەمەنتیقەی سلێمانی بوین بەگشتی، یەعنی سەرجەمی پارێزگاکە، لەرانیەوئێرەوئەم لاو ئەولاو سلێمانی و دەوروبەری و شارو ئەوانە کە چالاکی بەکرێگیراوانی جمهوری ئیسلامی زۆرتر لەم ناوچەیە بوو، بەڵام ئێمە زۆر زۆر دیسیپلینمان زۆربوو، زۆر خۆمان دەپاراست، نەماندەهێشت پێشمەرگەمان هێندە هاتووچۆی ماڵان بکەن، ئەم لاو لا بچن پیاسە بکەن و بگەڕێن و رابواردن وئەوانەمان کەمتر بوو، زۆرچاك خۆمان پارێزگاری دەکرد، من پێموایە ئەوە بەهۆکاری دەزانم.



# خەڵکمان گرت و دامانە ئاسایش، کەتەقەیان لەکۆمەڵە کردبوو

***هەر ئەوکاتە پێموایە موشەکبارانی مقەرەکانی ئێوە ئەکرا، چەندین جار بۆمب لەسەر جادەکەتان دادەنرا، تەقە لە پاسەکانتان کرا، هەڵوێستی ئێوە چی بوو؟ یان چەند کەستان دەستگیرکرد، یان بۆتان ئاشنابوو ئەو خەڵکانە کێن؟**

**عەبدوڵای موهتەدی:** هەبوو، بەڵام جاری واش بوو کەسیشمان دەستگیرکرد، تەحویلی ئاسایشماندا، ئەوکاتە یا کەسمان ناسییەوە کارت و کارتی پێناس و شتی لێ بەجێمان، لە موشەك بارانەکەدا، بەڵێ موشەکبارانیان کردین کەسمان لێ نەکوژرا، بەڵام کەسمان لێ بریندار بوو، بەهاوەن و ئەوان لێیان داین، بەخومپارە، بە(ئارپی جێ) لێیان داین، کەمینیان بۆ دانان، لە پاسەکەیان داین، ئەوجار تەقەیان کرد لەبەرمقەر، یەعنی زۆر چوزانم بە هەموو شێوەیەك هەوڵیان بۆ داین، لێرەبووم من لەکاتی هەموویانادا تەقریبەن لێرەبووم لەوکاتانەدا، خۆشبەختانە زەرەرو زیانمان ئەوەندە زۆرنەبوو، ئەو وەختی جمهوری ئیسلامی نازانم ئێستاو ئەم سەردەمە ئەگەر بیەوێ بیکا رەنگبێ کاری زۆر توندوتیژی گەورە بکا بە دژی ئۆپۆزسیۆنی کوردی ئێران من لەو بڕوایەدام، جمهوری ئیسلامی سەردەمی (ئەحمەدی نەژاد) خۆی بۆ کاری توندوتیژی و تیرۆرستی زۆرگەورە وە بەربڵاو بەدژی ئۆپۆزسیۆنی کوردی ئێران، بە حزبی دیموکراتیش و بەکۆمەڵەشەوە ئامادە دەکات، بەڵام ئەو کات زۆرتر بەدەستی ئەم بەکرێگیراوو ئەو بەکرێگیراوو ئەم جاسوس و ئەو جاسوس دەیکرد.

# سەردەمی ئەحمەدی نەژاد مەترسیدارە

***ئەی ئێستا لەرێگای چییەوە بە نیازە؟**

**عەبدوڵای موهتەدی:** نازانم، بەڵام من پێموایە جمهوری ئیسلامی، لەخۆی دەترسێ، بەگشتی لە خەڵکی ئێران دەترسێ، بەتایبەتی لە خەڵکی کورد دەترسێ، دەزانێ کوردی لەگەڵ نییە، دەزانێ خەڵکی بە گشتی لەگەڵ نییە، بەڵام بەتایبەتی کوردی لەگەڵ نییە، دەزانی خەڵك لە ئینتیخاباتەکەی (ئەحمەدی نەژاد) دا بەهیچ رێژەیەکی کەم بەشدارییان کرد، موقاتەعەی هەڵبژاردنیان کرد، قەت قەت بەراستی نمونەیەکی مێژوویە ئەو موقاتەعەی کوردی ئێران کردیان دەزانێ راپەرینی پارەکەیان کرد، (مەبەستی 2005)ە، وە دەشزانێ حزبەکان بوژاونەوە، بەتایبەتی دەزانێ کۆمەڵە چەندە بوژاوەتەوە.



***ئەگەر ئەحمەدی نەژاد بەرنامەی تیرۆری هەبێ لەناوئۆپۆزسیۆنی ئێراندا، بە تائکید یەکەم شەخس تۆی، لەو حاڵەتەدا ئەو بەربەستانە چین کە ئێوە دەیگرنەبەر، لەم بارەیەوە چەند مانگ پێشتر هەموو مۆبایلەکانتان لێرە کۆکردۆتەوە، ڕێ و شوێنێکی ئەمنی توندوتیژتان گرتۆبەر، دیارە یەکێك لەو هۆیانە هەستتان بەوەکردوە یان خەبەرتان بۆ هاتوە کە لەو بارەیەوە ئێران یان( ئەحمەدی نەژاد ) لەهەوڵی سەر لەنوێ بوژانەوەی تۆڕی تیرۆریستییە لە کوردستان؟**

عەبدوڵای موهتەدی: بەحقیقەت ناتوانم من ئێستا ئاوا بەئاشکرا بڵێم، کە هەنگاوەکانمان چین، بەڵام لەچوارچێوەی توانای خۆماندا ئێمە ئەوەی دەستمان هاتوە کۆمەڵێك هەنگاوەمان هەڵگرتوە، ئێمە ماوەیەکە هەستمان بەو مەترسییەکردوەو زانیاریمان پێگەیشتوو، لەئێرانەوە کە نازانین ڕۆژو کاتو ساتەکەی، بەڵام دەزانین کە ڕژێمی ئێستای جمهوری ئیسلامی دەست دەوەشێنێ و خراپە دەکات،

***ناترسی یەکەم کەس تۆبکەویتە بەرئەو پەلامارانە؟ ئەترسی ؟ مەبەستم ئەوەیە؟**

عەبدوڵای موهتەدی: ئاخر جا بشترسی تەئیسری چییە، خۆ هەر ئەبێ کارەکەت بکەی، ترس ئیحساسێکە، هەستێکە هەموو بەشەرێك هەیەتی، گرنگ ئەوەیە کە نەیەڵی ترس بەسەر تۆدا زاڵ بێت، تۆ بەسەریدا زاڵ بێ ، وەنەیەڵی چەواشەت کات.

***ئەوەندەی لەتیرۆرئەترسی، ئەوەندە لە ڕوبەڕوبونەوەی چەکدارانە ئەترسی؟**

عەبدوڵای موهتەدی: نازانم بڵێم چی، تیرۆر بۆ من بێ جا با بۆ هەرکەسی تربێ، ئەو تیرۆرانە بێ بەزەییانەترن لەشەڕێکی ڕوبەڕوو، وانییە لەهەمان حاڵدا، چۆزانم چۆن بڵێم غەیرە ئینسانی ترن وەختێك تۆ لەشەڕای هەست بەوەدەکەی تۆش ئەتوانی دەست بکەیەوە.

# ئێران و ئیتلاعات، پێشمەرگە دەنێرن بۆ جاسوسی

***ئێوە پێموایە وەکو من ئاگاداربم چەندین جار خەڵك هاتوە بۆ پێشمەرگایەتی، یان بە هەر وەسیلەیەك خۆی گەیاندۆتە زرگوێزەڵە، بەڵام دواجار دەرچووە کە ئەوە سەر بەئیتلاعاتن یان پیاوی ڕژێمن، لەوبارەیەوە هەڵوێستتان چی بووە؟**

عەبدوڵای موهتەدی: ئێمە زۆریان لێ دەکۆڵینەوە، ڕایاندەگرین، موقابەلەیان لەگەڵ دەکەین، ناتوانم بڵێم سەدە سەد، بەڵام تاڕادەیەکی زۆر زۆر سەرکەتوو بوین لەناسینەوەو کەشفیاندا هی ئەوکەسانە، بەردەوام جمهوری ئیسلامی خەڵك دەنێرێ بۆ ئێمەش و بۆلای حزبەکانی تریش .



***تائێستا خەڵکتان کەشفکردوە، ئیجرائاتتان چی بووە؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** کەم وا هەیە بیانگرین، زۆرتر دەرمانکردون و خۆمان رامان نەگرتون، ئەگەر ئیتلاعات و زانیارییەکیان پێ بێ ئەوانەمان لێ وەرگرتووەو دەستمان پێوەناون بڕۆن.

## لەگەڵ ئیعدامدا نیم

*** پێش جیابونەوەتان پێموایە خەڵکیشتان لێ ئیعدام کردون، پێش ساڵی(2000)؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی: کردومانە.**

***ئەوانە ناچێتە قاڵبی پێشێلکردنی مافی مرۆڤ و ئێوە وەکو رێکخراوێکی چەپ و ئینسانیخواز، خەڵك ئیعدام کەن؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** من خۆم پێموایە لە قانونی ئەساسی یا دەستوری داهاتوی ئێران، ئەگەر ئێران فیدراڵی بێ و کوردیشی تیا بێ یا داهاتوی کوردستان ئەگەر کوردستان خۆی دەوڵەتێکی سەربەخۆبێ، دەبێ سزای ئیعدام هەڵوەشێتەوە، بەڕاستی عەقیدەم وایە، بەڵام ئەگەر دوژمنانی تۆ سزای ئیعدام هەڵوەشێننەوە، تۆ لە وڵاتێکادا بژی پێویست بەوشتانە نابێ، بەڵام لە حاڵەتێکدا کە تیرۆریست دێتەسەرت، وەکو باسمکرد موشوکباران هەیە تۆپ ئەوە ئەنواعی ئەوشتانە هەیە، تەقینەوە هەیە، رەنگ بێ تۆش تۆ بەگوێرەی ئەو هەڵوێست وەردەگری، بەحەقیقەتیش نازانم بەدیقەت چۆن ئەو ساڵانەی پێش(2000) بەرپرسیاریەتەکەی بە من نەبووە، لەبەرئەوە ناتوانم بەوردەکارییەوە بڵێم دەقیقەن چۆن بووە، بەڵام دەگونجێت بووبێت، هەر لەکۆنیشەوە بووەو هەرناگەرێتەوە پێش(2000).

## (ی.ن.ک) ئیعدامی چەند تیرۆریستی کرد کەپێشمەرگەی ئێمەیان تیرۆر کرد بوو

*** پاش ئەوەی دوو پێشمەرگەی ئێوە لەبەردەمی مەڵبەندی رێکخستنی سلێمانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان( عوسمانی فەرمان ) ( عوسمانی کیانی ) تیرۆرئەکرێن لەلایەن چەند تاقیمێکەوە، دواتر ئێوە فشار ئەخەنە سەر یەکێتی نیشتمانی کوردستان و خەڵکەکان دەستنیشان ئەکەن کە ئەمانە بوون، دوای فشارێکی زۆر ئەو خەڵکانە ئیعدام ئەکرێن، ئەوە چۆن چۆنی بوو؟ چۆن فشارتان خستەسەر یەکێتی**

**نیشتمانی؟ چۆنە ئەوانە تاکە گروپ بوون پێموایە لە ماوەی(15) ساڵی رابردوودا لەلایەن یەکێتی نیشتمانی و پارتی دیموکراتی کوردستانەوە سزای ئیعدامیان بۆدەرچێ؟**

عەبدوڵای موهتەدی: بەڵی سزای ئیعدامیان بۆ دەرچوو، ئەمانە تاقمێکی زۆر زۆر تاوانبارو تاوانکار بوون، نەك هەر بەدژی ئێمە ئەسڵەن بەدژی زۆر کەسی دیکە، بەراستی جینایەتکاربوون ئەوانە، خۆشبەختانە ئەوانە ناسران، یەکێتی نیشتمانی و حکومەتی هەرێمی ئەوکات، زۆر بەدەست و برد دەستی لێکردنەوەو بەسزای خۆی گەیاندن، پێموایە تەئیسری زۆری بوو لەوەدا ئێران بەخۆ بابێتەوەو بەو هاسانییە، یەعنی بەپانەوە کاریدەکرد ئێران خۆ نەیدەپاراست، تۆزێك دەستوو پێی ئێرانی کۆکردەوە باشییەکەی ئەوەبوو.

***ئەی بۆ؟ پێشتر چەند بەرپرسی حزبی دیموکرات کوژران و تیرۆرکران، بەلام یەکێتی نیشتمانی ئەو هەڵوێستەی نەگرتەبەر کەسەکانیش مەعلوم بوون، ئاشکرا کرابوون؟**

عەبدوڵای موهتەدی: ئاخر تۆ هەر تەماتە ئەو نەتیجە وەربگری کە یەکێتی نیشتمانی کوردستان ئەوەی کە کردویەتی بۆ ئێمە نەیکردوە بۆ دیموکرات، من زۆر لەوبڕوایەدا نیم، یەعنی ئەمە ناگەڕێتەوە سەرئەوە رەنگ بێ قۆناغێك نەیانکردبێ و قۆناغێك کردبێیتان.

***نامەبەستم ئەوەیە لەو تیرۆرەی (عوسمانی فرمان) و (عوسمان کەیان) ئێوە گلەییەکی توندتان لەیەکێتی نیشتمانی کردوە، ئەگەر بێتو لەم جارەیا هەڵوێست وەنەگرن، ئێمە هەڵوێستێکی توندترمان نەبێ، ناچارین هەڵوێستێکی ترمان هەبێ رایبگەیەنین کە حکومەت بەرپرسیارە کە وەسیلەی تر هەیە بیگرینەبەر؟**

عەبدوڵای موهتەدی: لەروی چییەوە ئەو قسەدەکەی من شتی ئاوام لەبیر نییە؟ من شتی ئاوام لەبیر نییە ،قسەی ئاوامان کردبێ.

***من پێموایە هەر ئەو فشارەشە واکا؟**

عەبدوڵای موهتەدی: نا، ئێمە رەخنەمان بووە خۆ هیچ شكوگومان لەوەدانییە ، بەلام ئەم ئایا ئەم سیغەمان کردوە و ئەم زمانە، زۆر لەوبڕوایەدا نیم، بەلام ئێمە هاوکاری و دۆستایەتییەکی زۆر نزیکمان هەبوولەگەڵ ئاسایش بە حەقیقەت لەوسەردەمەدا، چۆن بڵێم ئێمەش زۆر مەعلوماتمان بەدەست دەگەی، ئاسایش پێویستی بە مەعلوماتەکەی ئێمە هەبوو، وە رەنگ بێ داوامانکردبێ، رەنگ



بۆ رەخنەمان، گرتبێ، رەنگ بۆ سکالآمان کردبێ، ئایا ئەو زمانەمان بەکاربرد بۆ یان نا، لەهەرحاڵدا ئەوان کاری چاکیان کردووە سوپاسیان دەکەم.

## پێشمەرگەمان ئیعدام کردبێ نازانم

*لە ئەوریلی (1993) کەسێك بەناوی (تاهیری بیگی) ویستویێتی بەرپرسێکی ئێوە بکوژێ، بەبیرت بێ چیتان لەو (تاهیرە) کرد؟

*عەبدوڵلای موهتەدی: بەسەری تۆ هەرناوەکەشی نازانم کێیە، تاهیری بێگی کێیەو ناوەکەی کێیە من نازانم.

*بەکارێکی ئیتلاعاتی نێردراوە؟

عەبدوڵلای موهتەدی: خەڵکی کوێیە(تاهیر بێگی) ئێرانیە.

*ئێرانییە؟

عەبدوڵلای موهتەدی: کوردیشە؟

*بەڵێ؟

عەبدوڵلای موهتەدی: نازانم ، مەگەر لە خەڵکی خۆی پرسی، من قەت لەکاری زانیاری‌و کاری تەحقیقات و ئەوانەدا نەبووم و ئەو ساڵی (1993) یەش من بەرپرسایەتیەکی راستەوخۆم لە کۆمەڵە و سازمانی کوردستانی کۆمۆنیستی ئێراندا نەبووە لەبەر ئەوە نازانم .

* نمونەیەکی ترت بۆبێنمەوە لە جولای (1994) (سەلاحی وەیسی )بە بۆمبەوە هاتوە لە مقەرەکانی سلێمانی تەقینەوە بکات پاش ئەوەی ئێوە دەستگیری ئەکەن و ئیعدامی دەکەن؟

عەبدوڵلای موهتەدی: ئاگادار نییم.

# لەخەلەکان ئیتلاعات دەیویست عەلیزادە بکوژن

***(23-6-1997) لەرێگای (خەلەکان) مەسئولێکی ئیتلاعاتـان کوشت ئـەوە کـە ئەیویسـت (سـەید برایم) تیرۆربکات، وە دواتر شـەش پێشـمەرگەی ئێـوە لەلایـەن یـەکێتی نیشـتمانیەوە گـیران دواتـر بەیاننامەتان دەرکرد؟**

**عەبدوڵای موهتـەدی:** ئـا.ئـا. راسـتە ئـەوە، ئـا ئـەم روداوە مـن ئـەو وەختـە لـەدەرەوەی وڵات بـووم، بەتەلـەفۆن پێیـان راگەیانـدم لەراسـتیەکەیدا دووکـەس بـوون، یـادەبوو هیچـیان نـەکوژێن یـادەبوو هـەردوکیان بکـوژێن ، هەڵەکـە ئـەوەبوو یـەکیان کـوژرا، دیـارە ئـەوان نـازانم بەحەقیقـەت راسـتەوخۆ بـۆ تیرۆرهـاتبون یـان نـا، بـەڵام زۆر مەشـکوك بـوون، زۆر گومـان لێکراوبـوون، چـەندجار ئیختیاریـان پێکردبوو سـەیارەکەیان هـەر هـاتبووە نـاو سـەیارەکانی ئێمـە بەشێوەیەکی هەڕەشـە ئـامێز، تۆ دەبێ حەق بدەی بە، دوای ئـەو هـەموو تیرۆرە دوای ئـەو هـەموو خراپەیە، دوای ئـەو هـەموو خـەڵك کوشتن و خـەڵك رفاندنـە، ئـێ (سـەید بـرایم) و کـاروانێکیش بەوێـدا دەڕۆن حـەقی خۆیانـە بترسـن لـە خۆیـان، لەبەرئەوە من حەقیان پێدەدەم لەو کارەدا کە ئەوەکرا، ئەو کاردانەوەیە، بەڵام کەلەماشێنەکە چوو بونە پێشـەوە، ئەگـەر کرابایە یاهیچیان نەکوژرابایان و هـەردوکیان دەسـتگیرکرابایان و تـەحویلی ئاسایش درابایان دەناکە تازە کە تەقەیان کردبوو ئەوە تریش هەردەبوو بروا لەگەڵی. لەهـەر حاڵدا ئەمە بوو، وە بوو هـۆی دەسـتگیربونی چەند کەسێك لەلایەن ئاسایشـەوەو ماوەیـەکیش ساردیو ناکۆکی پێکهێنـا، سەرەنجام من ئـەو وەختـە لـەدەرەوەی وڵات ئـەوەی لەدەستم دەهـات کـردم بۆئـەوەی کـە ئـەو رەفیقانـەی خۆمـان کەلەزینـدابوون ئـازادبکرێن، بەڵام کەلەزیندانیشـدا بـوون راسـتیەکەی هـیچ خراپەیـەکیان لەگـەڵ نەکراوە، سەرەنجامیش تەحویل نەدرانەوە ماجەراکە ئاوابوو.

# ئێران سدیقی کەمانگەری تیرۆر کرد

***لەو قوربانیانە یەکێك لەگـەورەترین سـەرکردەکانی ئێـوە (سـدیقی کەمانگـەر)ئـەو روداوە گوایـە لەلایەن خزمێکی خۆیەوە کراوە؟**

**عەبدوڵای موهتەدی:** نا، نا، خزمی خۆی نەبووە بەهیچ جۆر.(سدیقی کەمانگـەر) خـەڵکی کامیارانەو لەتایەفـەی کەمانگەرەکانـە، تایەفەیـەکی زۆر گـەورەن لەمەنتیقـەی کامیـاران، قاتڵەکـەی بـەکرێگیراوێکی جمهوری ئیسلامی بوو ، خۆی و براکەی جا براکەی دەسکیسی بوو لـەئێران ئیتلاعـات دەینـارد بـەناوی مولاقاتو چاوپێکەوتن، کەسەکە نـاوی نـاوی پێشـمەرگایەتیەکەی(تـەوفیق گرژاڵی) بـوو بەدەسـتی ئـەو

کرا، (تەوفیق گرژاڵی) حیمایە و ئیسکۆرتی کاك سدیق بوو، بەڵام ئیتر تیرۆریکردو، خەسارێکی زۆر زۆر گەورەبوو بۆ کۆمەڵە. کاك سدیق یەکێك بوو لەریزی هەرە هەرە پێشەوەی سەرکردەکانی ئەو وەختەی کۆمەڵەدا، کەسێك وەك کاك فوئاد، کەسێك وەکو دکتۆر جەعفەر، لەو ڕێزەدابوو بەداخەوە، وابزانم ساڵی(1989) بوونەگەر بەهەڵە نەچووبم.

***ئەمەوێ پرسیاری ئەوەت لێبکەم چەند کەس لەسەرکردە سیاسیەکان ئۆپۆزسیۆنی ئێرانی بەر ئەم حەملەی تیرۆرەکەوتون (قاسملۆ، شەرەفکەندی، کازمی رەجەوی، سدیقی کەمانگەر)، چەند سەرکردەیەکی تری حزبی دیموکرات ، ئەم هەمو تیرۆرە، ئێوە چۆن ئەم هەموو تیرۆرەتان نەگەیاندە ڕێکخراوە نێو دەوڵەتییەکان، چۆن ئێستا تاکە شەخسێك لەشوێنێك تیرۆر ئەکرێت بەڵام هەمو ئاژانسەکانی جیهان باسیدەکەن ، چۆن نەتانتوانیوە لەوبارەیەوە هەڵوێستی وڵاتانی جیهان ڕاکێشن سەرنجی وڵاتانی جیهان ڕاکێشن؟چۆن ئەوەنە خۆتان نەپاراست لەو مەسائیلانە؟**

عەبدوڵلای موهتەدی: جارێ بۆئەوەی کە بۆ ئێمە هەڵوێستمان نەنا، ئێمە هەڵوێستی خۆمان گرتووە، هەر ئەو کاتیش دنیا گوێی بۆ نەدەگرتین نەك هەر ئێمە ، تۆ بڕوانە ئەوە ئەنفالکرا کوردستان، جابۆ سدیقی کەمانگەر یان دکتۆر قاسملۆ بڵێ ئەنفالکرا، هەڵەبجە کیمیاباران نەکرا، دنیا وە دەنگ هات؟ کەس لەسەر کورد هاتە جواب ، کەس بەجێنوساید مەحکومی کرد، کەس عیراقی تاوانبارکرد.

دنیا ئەو وەختی لەبێدەنگیدا بوو بەرامبەر بەکورد، جینایەتەکانی جمهوری ئیسلامی لەقاونەدەدران لەدونیاوەجینایەتەکانی سەدام هەروا، ئەلعان دنیا گۆڕاوە، ئەلعان دنیا دنیای ڕاگەیاندن و زانیارییە، دنیا دنیا شەپۆلێکی دیموکراسی هەیە، حکومەتە دیکتاتۆرییەکان جێیان پی لەق بووە، عیراق بەجۆرێك و ئێران بە جۆرێك ئێرانی کۆماری ئیسلامی کەوتونەدژایەتی یەعنی لەگەڵ غەرب کلاویان تێکگیراوە، کەوتونە دژایەتیەوە، بۆیە دنیای غەربیش لایەکت لێدەکاتەوە، دەنا هەموو ئەو جینایەتە رادەگەیەنران جاران کەس نەبوو لێت پرسێتەوە، بۆ بۆ خۆپاراستن ، خۆ حەتمەن هەڵەکراوە لەلایەن ، لەلایەن ئێمەش و لەلایەن حزبی دیموکرات و خەڵکی تریشەوە، بەڵام دەزانی چۆنە ئەمە بەشێك لەواقیعییەتی خەباتی سیاسیە لە وڵاتی ئێمەدا.

خەباتی سیاسی لەم وڵاتەی ئێمە خۆ وەکو وڵاتانی دیموکراتێك نییە، لەرێگای سندوقی دەنگدان و نوسین وتەلەفزیۆنەوە بەرێوەبچێ ، حکومەتگەلێکی دیکتاتۆری داپڵۆسێنەری بێ بەزەیی لەسەرکارن کەبەئەنفال و کوشت و بڕکاری خۆیان دەکەن، بەتیرۆر کاری خۆیان دەبەنەپێشێ، خەباتی وڵاتی ئێمە مەعنای ئەوەبووە لەو وڵاتانە کە ئەو کەسەی دێتە نێو جەرگەی خەباتی سیاسیەوە هەموو ئەوانەی داناوە بۆ خۆی، ئەم خەباتە خۆ هەر شەرت نییە پێشمەرگەوکادری خوارتربگرێتەوە، سەرکردایەتی و کادرە پێشکەوتوەکانیشی گرتۆتەوە.



# قسملۆ بۆ دانوستان لەگەڵ ئێرانیەکان پرسی بەسەرکردایەتی دیموکرات نەکردبوو

---

# ئەنفال هۆکارێک بوو بۆ تیرۆرکردنی قسملۆ

---

***لەو بارەیەوە پێمخۆشە کۆتایی پرسیارەکانمان لەسەر تیرۆری قاسملۆ بێ؟تیرۆری قاسملۆ تیرۆرێکی سیاسی گەورەبوو، هەم زەرەرێکی زۆری لە بزوتنەوەی سیاسی خەڵکی کوردستاندا.کە پێموایە تۆش لەگەڵم بی، ئەگێرنەوە کە قاسملۆ بەبێ راوێژ بەمەکتەبی سیاسی و تەنها بەئاگاداری چەند شەخسییەتێك هەوڵی گفتوگۆیداوە لەگەڵ ئێران، بەتیرۆرکردنی قاسملۆ بزوتنەوەی سیاسی خەڵکی کوردستان، حزبی دیموکرات زەرەری چی لێکەوت؟ ئەو فاکتەرانەی کەوایەکرد قاسملۆ تیرۆر بکرێ چیبون؟ حزبی دیموکرات پێتوانییە دوابەدوای تیرۆری قاسملۆ زەربەیەکی گەورەی لێکەوت؟**

عەبدوڵلای موهتەدی: من بەراستی ئەو جۆرەی کە حزبی دیموکرات خۆی وردەکارییەکانی ئەم گفتوگۆیە لە (ڤییەننا) کرا، ئەم گفتوگۆیە دەزانێ ئێمە ئاوا لە وردەکارییەکانی شارەزانین، رەنگە زۆر زۆر راستی تیا بێ لە وردەکارییەکانیان کە ئێستاش کەس نەزانێ، حزبی دیموکرات باشتر لەئێمە دەزانێ، بەڵام بەگشتی ئەوە راستەکە تیرۆری قاسملۆ زەربەیەکی گەورە بوو هەم لە حزبی دیموکرات وە هەم زەربەیەك بوو لەخەڵکی کوردستان وبزوتنەوەکەی کارەساتێکی زۆر ناخۆش بوو، ئێمە ئەو وەختی سەرەڕای هەموو ناکۆکییەکیش بەڵام زۆر بەتوندی مەحکوممان کردوە، یەکێك لە جینایەتەکانی لاپەڕەیەکی رەشە لە جینایەتەکانی جمهوری ئیسلامی بەدژی خەڵکی کوردستان، منیش هەروەکو جەنابت بیستومە ئاوا ئاگاداربووم کە دکتۆر قاسملۆ پرسی سەرکردایەتی خۆی نەکردبوو غەیری چەند کەسێك، ئەو عاملیەی یەعنی بەقییەی خەڵکەکەی خۆیان نەیانزانییبو لە کوێن، بۆیە نەیانتوانی بوو تەکبیرێکی بۆبکەن و پاراستنێکی بۆبکەن، ئەوکارەی کە پێویستە بۆی بکەن، راستە ئەوە نەکرابوو، دەزانی چۆنە ئەمە نابێ لەبیرمان بچێتەوە ئەنفال هەر ئەوەنەبوو تەئسیری لەسەر کوردستانی عیراق و بزوتنەوەی هەبێ، ئەنفال تەئسیری زۆربوو لەسەر کوردی ئێرانیش، لەسەر حزبەکانی کوردی ئێرانیش ئەنفال تەئسیرێکی روخێنەری هەبوو لەسەر هەموو حزبەکان و هەموو بزوتنەوەکە لەسەر بێ ئومێدکردنی خەڵکانێك.

لەم چوارچێوەدا دیتنی کارەساتی ئەنفال وبێ ئاسۆییەك کەلەگەڵ خۆی هێنانی بێ تەئسیر نەبوو لەوەدا خەتی کۆمۆنیزمی کاریگەری کە خەتی بەجێ هێشتنی کوردستان و چۆڵکردنی کوردستان و پشت هەڵکردنە لە بزوتنەوەی رەوای ئەو گەلە لەنێو کۆمەڵەدا سەرکەوت، ئەنفال بێ تەئسیرنەبوو



ئەوەی (د.قاسملۆ) ئەو گفتوگۆیانە لەگەڵ جمهوری ئیسلامی قبوڵ بکات، دیارە ئەو لێکدانەوەی خۆمە من هیچ بەڵگەیەکم نییە لەسەرئەوە، بەلام پێموایە زۆر بێ ئومێد، بەلا ئومێد هەبوو بۆیە ئاوا سوك و هاسان چووە بەردەستی جمهوری ئیسلامی، بەڵکو بەتەمای ئەوەی کە بەڵکو جۆرێك پێکهاتن و دانوستاندنێکی هەبێ، جمهوری ئیسلامیش زۆر فریو کارانە هاتە مەیدان، گفتوگۆکانی جۆرێك بردەپێشەوە وەکو ئەوەی کە راست بێ، یەعنی زۆریان کێشەوجەڕو بەحس لەسەر مادەکان وخود موختاری، چی بێ، چۆن بێ دەکرد، چەندین جار بۆئەوەی کە بڕواو ئیتمینانی دکتۆر قاسملۆ هاورێکانی جەلب کەن و راکێشنن بۆئەوەی کە بەراستی ئەوان بەجیدییانە و تەمایانە شتێك بدەن، لەهەرحاڵدا رەنگ بێ هەڵەی خۆیانی یەعنی د.قاسملۆ ئەوانیش تێدابوو لەمەدا، بەلام بەهەرحاڵ تاوانەکەرو جینایەتەکە دەگەڕێتەوە بۆ جمهوری ئیسلامی و فریوکاریەکەی.

# تیرۆری شەرەفکەندی جیاوازبوو

***بۆچی(د. سادقی شەرەفکەندی) هیچ ئەزمونێکی لەم تیرۆرە وەرنەگرت؟**

عەبدوڵلای موهتەدی: ئاخر ئەمە شتێکی جیاوازبوو، خۆ ئەو نەچوو بوو بۆ دانوستان د. قاسملۆ لەڤییەننا بەبێ تەکبیرو ئامادەکارییەکی زۆر بەبێ خۆپاراستنێکی کافی کە جێی خۆی بوو بەراستی بۆ ئەو بیکات، بەبێ ئەوانە گفتوگۆکانی درێژەدا، ئەمە جۆرێکە وە فەرقی هەیە جیاوازە لەگەڵ ئەوەی(د.سادقی شەرەفکەندی) دەعوتیان کرد بۆ ریستۆرانێك لەگەڵ بەشێك لەئۆپۆسیۆنی ئێرانی، ئەمە پلانێکە ئیتر پلانێکە لە هەموو جێیەك مومکینەرویدا قەت پێی وانەبوو ئەو کارە دەکرێ.

***ئەوانە تاچەند زەرەری لە بزوتنەوەی سیاسی خەڵکی کوردستان و حزبی دیموکراتدا؟**

عەبدوڵلای موهتەدی: زۆر ، زۆر شەهیدکردنی هەر سەرکردەیەك هەرکادرێك، بەتایبەتی کەسانی ئاوا ناودار، جا چ(سدیقی کەمانگەر) بێ یا(د. قاسملۆ ) و ئەوانی ترین ، ئەوانە جمهوری ئیسلامی بەدەستکەوتێکی داناوە بۆ خۆی، زەربەیەکیشە لله بزوتنەوەی خەڵکی کوردستان.



# سەعیدی یەزدان پەناش تیرۆر دەکرێ

***هەربەمشێوە (28)ی خەرمانانی (1370) (سەعیدی یەزدان پەنا) سکرتێری یەکێتی شۆڕشگێڕان تیرۆرکرا، ئەوکاتە لە چریکەکان جیابووە، بۆچی هەمیشە پەنا ئەبرێتەبەر بەرپرسە یەکەمەکان، سکرتێرەیەکەمەکان؟**

**عەبدوڵای موهتەدی:** ئاخر ئەوان شەخسی مونەسیرن، شەخسی کاریگەرن، دوژمن لەوبڕوایەدایە کە بەلێدانی شەخسی یەکەم رەنگ بێ بتوانی شیرازەی حزبەکە تێکدا، کزیان کا، بێ ئومێدیان کا، لەداهاتوودا توشی دووبەرەکایەتیان بکات، تەبیعیە ئەوان هەوڵدەدەن لە شەخسی یەکەمەکان یەعنی زۆرتر هەوڵدەدەن بۆ هەموان هەردەیدەن، بەلام هەوڵدەدەن لەکەسایەتیە گەورەکان، لەکەسانی کاریگەرو مونەسیر لە کەسانێك کەلەدوارۆژدا خەڵکیان پێ کۆدەکرێتەوە، لەدوارۆژدا سەرکردایەتی خەڵکیان پێدەکری هەوڵدەدا لەوانە بدا.

# لەهەوڵی ئیعدام رزگار بووم

***کەواتە قسەکەی منە، بەرپرسی و سکرتێرە یەکەمەکان هەمیشە ئەهدافی تیرۆرەکانن؟**

**عەبدوڵای موهتەدی:** هەموو کارێك، هەموو مەسئولییەتێك خۆشی و ناخۆشی خۆی لەگەڵدایە، لەم وڵاتانەی ئێمەوایە، کەسێك هەر لەپێشمەرگەیەکی سادەکە دێتە ریزی حزبێکەوە، هەر لە تێکۆشەرێکی رێکخستنی نهێنی کەلەشارەکانی کوردستانی ئێران لەشاروگوندەکانی کوردستانی ئێران دێتە ریزەکانی ئێمە، بۆئەوەی خەبات بکا، هەر لە گەنجێکەوە کەدێتە خۆپێشاندانێك و بەردە فڕکێ دەکات هەتا سکرتێری حزبێکی گەورە، هەموی ئەوانە دەبێ بزانن لەم وڵاتە دیکتاتۆرییە داپلۆسێنەرە ئیستبدادیانەدا خەبات بێ فیداکاری و بێ قوربانی ناچێتە پێش.

*** تائێستا چەندجار هەوڵی تیرۆرکردنت دراوە؟**

**عەبدوڵای موهتەدی:** نازانم، بەلام لەگەلٌ ئیعدام روبەروبووم و بەموویەك نەجاتم بووە لێی .

***نا جگە لەوانەی کە بەعەلەنی بووە بەنهێنی بووە ؟**

**عەبدوڵای موهتەدی:** نازانم، نازانم خۆم ئاگادارنیم.

* یەعنی تائێستا هیچ هەوڵێکی واتان پوچەڵنەکردۆتەوە کەسێك هاتبێ، بۆمبێك دانرا بێ؟
عەبدوڵڵای موهتەدی: بۆ شەخسی من ئەلعان نایەتەوە بیرم، بەڵام زۆر هەوڵمان پوچەڵکردۆتەوە، بەڵام ئەوەی بڵێی بەتایبەت روی لە من بووە، هاتوە بۆلای من و پوچەڵکراوەتەوە ئەوەم نایەتەوە بیر ئەلعان بیرم نییە.

*ئەوە ئەگەڕێتەوە بۆ خۆپاریزی تۆ یانەوەی کە جمهوری ئیسلامی تۆی مەبەست نییە؟
*عەبدوڵڵای موهتەدی: جاچوزانم خۆ هیوادارم منی مەبەست نەبێ، هیچ خۆش نییە دوژمن تۆی مەبەست بێ، وەڵلا هی خۆپارێزییەکی زۆر عەجایەب ترم لە خەڵکیش نەکردوە، دەزانم کە رەنگ بێ تەرتیباتێکی قورس و قایمتر گیرا بێ بۆ من.

* پێتوایە هی برادەرەکانی دەزگای ئەمنییەتە وا پارێزگاری لە تۆ ئەکەن؟
عەبدوڵڵای موهتەدی: پێموایە پارێزگاریم لێدەکەن، بەڵێ.

## ناتوانم بڵێم دەزگای ئیتلاعاتمان هەیە

*ئێوە دەزگایەکی تایبەتتان هەیە بەناوی (دەزگای زانیاری، پاراستن، نهێنی) بۆئەوەی مەعلومات کۆکاتەوە لەسەر دەرەوە ناو خۆتان؟
عەبدوڵڵای موهتەدی: ناتوانم هیچ شتێك لەوبارەیەوە بڵێم .

*یەعنی هەتانە؟
عەبدوڵڵای موهتەدی: ئەیشمان بێت هەر ناتوانم بیڵێم.

## تیرۆری کەمانگەرم زۆر پێناخۆشبوو

*ئازیزترین کەسانێك کە بەهۆی تیرۆرەوە لەدەستتانداوە یاتۆ زۆر موعجیب بووی ، خۆشەویستت بوو بێ بەهۆی تیرۆرەوە گیانی لەدەستدا بێ کێیە؟
عەبدوڵڵای موهتەدی: ئەوەی بەهۆی تیرۆرەوە گیانی لەدەستدابێ، بەلای منەوە ئازیزترین وموئەسیرترین و بەناوبانگترینیان (سدیقی کەمانگەر)ە

*بۆ؟

عەبدوڵڵای موهتەدی: (سدیقی کەمانگر) بێجگە لەوە زۆر رەفیقی نزیك بووین، وە لەدامەزرێنەرانی کۆمەڵەیەو، لە(1968)و(1969) وە لەڕاستی یەکمان ناسیووە، نزیکایەتیەکی تایبەتمان هەبوو لەگەڵ یەکتری، بەڵام بێجگە لەوە زۆر کەسایەتیەکی بەتوانابوو(سدیقی کەمانگەر) یەعنی کەسایەتیەکی زۆر بەتوانابوو، زۆر لێهاتووبوو، بۆ خۆی لەبواری پێشمەرگایەتیدا زۆر ئازابوو، لەبواری کاری رێکخستنی نهێنیدا بوو، سوخەن وەرو ئاتیقێکی موئەسیربوو، یەعنی بەدەیان و سەدان هەزار خەڵکی دەهێنایە جۆش و خرۆش، زۆر خەسارێکی گەورە بوو لەکۆمەڵە، بەنسبەت شەخسی منیشەوە کۆستێکی گەورەبوو.

## لەکۆنەکانی کۆمەڵە، تەنها حەیفم بۆ عەلیزادە دا، کەلەگەڵ حزبی کۆمۆنیستە

*ئەگەر تیرۆر نەکرایە ئێشتا پێوابوو لەگەڵ کۆمەڵەی شۆڕشگێری زەحمەتکێشان بێ؟

عەبدوڵڵای موهتەدی: حەتمەن ، حەتمەن ئەوانی کۆن لەگەڵ کۆمەڵەبوون، هەموو ئێستا هەن، حەیفم فەقەت بۆ (سەید برایم)دێت.

*بەس کۆمەڵێکی زۆرهێشتا لەگەڵ ئێوە نین؟

عەبدوڵڵای موهتەدی: نا هەن بەڵام ئەوەی کەلە کۆنەوە بێ هەر کاك(سەید برایم)ەو بەداخەوە کەوایشە.

*کاك سدیق خۆ لە موئەسیسنی کۆمەڵە نییە؟

عەبدوڵڵای موهتەدی: سەید برایم؟

## کەمانگەر لەدامەزرێنەرانی کۆمەڵە بوو

*کاك سدیقی کەمانگەر؟

عەبدوڵڵای موهتەدی: با، دوشانەی سەرەکی کە داندراوە لە پایزی (1969) لەیەکیاندا(سدیقی کەمانگەری) تێدابوە.



***تۆ لەبەحسەکانی پێشودا ئەوت باس نەکرد؟**

عەبدوڵڵای موهتەدی: بەری وەڵڵا تێیدایەتی (سدیقی کەمانگەر)ی تیابوو (سەید برایم) نەبووە، ئەو دواتر هاتبووە بەڵێ(سدیقی کەمانگەری) تیابووە منی تیابووم،(فوئادی مستەفا سوڵتانی) تێدابووە،(محەمەدحسێنی کەریمی) تێدابووە ، ئەمانە هەموو ئەوانە کەلەسەرەتاوە لەگەڵ کۆمەڵەبوون.

# ئێران غولام کشاوەرزی لە قوبرس تیرۆرکرد

***هاورێیەکیشتان پێموایە لە( قوبروس ) تیرۆر نەکرێ؟**

عەبدوڵڵای موهتەدی: بەڵێ، بەڵێ وایە ئەوەش زۆر بەحەقیقەت تێکۆشەرێکی تربوو، (غوڵامی کەشاوەرز) لوڕبوو ئینسانێکی زۆر تێکۆشەربوو، زیندانی سیاسی بوو، خۆش نێو بوو لەلای خۆیان و لەمەنتیقەی خۆیان، دایکی هاتبوو بۆ ملاقاتی بۆ لە(لارناکا) لە(قوبرس) ئەویش لە سویدەوە چووە بۆ چاوپێکەوتنی، بەڵام شوێنی دایکیان هەڵگرتو، هەربەوتەیارەی دایکی سواربوو تیرۆریستەکان بەو تەیارە سواربوون .

***ئێوە تائێستا ئەوانەی کە هەوڵی تیرۆرکردنی پێشمەرگەو کەسایەتی کۆمەڵەی داوە نەتانویستوە تیرۆریان کەنەوە، نەتانتوانیوە ، نەتانوێراوە، ناتانەوێ تیرۆریکەن؟**

عەبدوڵڵای موهتەدی: دایدەنێین بۆ داهاتو، بادنیا کە بگۆڕێ .

***ئەو کاتە محاسەبەیان دەکەن؟**

عەبدوڵڵای موهتەدی: نا، پێموایە ، حەتمەن دەبێ محاسەبە بکرێن، ئەوانەی بەرامبەر بەئێمە یا بەخەڵکی تر تاوانیانکردوە بێگومان دەبێ.

*** من مەبەستی پرسیارەکەم ئەوەبووە بۆ نەتانکردوە، ئێوە نەتانتوانیوە ، ناتانەوێ ، بۆتان نەکراوە ، مەبەستتان نییە؟**

عەبدوڵڵای موهتەدی: چوزانم، ئەوەندە توانابووە، ئەوەی لەدەستمان هاتووە کردومانە.

***یەعنی نەتانتوانیوە؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** رەنگ بێ وابوو بێ.

***بۆنمونە خەڵکانێك هەیە بەشداری تیرۆریکردوە لەناو کۆمەڵە ئێستا لەیەکێك لەشارەکانی ئێران دانەنیشێ؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** تاکەی، رۆژێك هەردێ ئەم نیزامە بگۆڕێ و ئەو کەسانەی بەسزای خۆیان بگەن.

***چییان لێئەکەن؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** تەحویلی دادگایان ئەدەین، وەکو تاوانکارێك بەدادگا سزای خۆیان وەردەگرن.

***لەبەینی ئەو تیرۆریستە، وجاشێك کامیان تاوانبارترن؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** ئاخر، بەوە کەوتووە جاشەکەچیکردووە، دەستی ئالودە بەچییە؟

***ئەو جاشانەی کە ئێستا پیاوی رژێمن؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** جاش کەمن لەئێران، ئەسڵەن کوردستانی ئێران زۆر زۆر کەم جاشی تیابووە، هەر شارێ رەنگە سێ چوار کەسی چەند کەسن، بەژمارەی دەست دەژمێردرێن وەکو کوردستانی عیراق و تورکیا نییە کە بەپۆل دەیان هەزار خەڵك ناونوس دەکران ئەوە نییە.

## جاشەکان بەسزای خۆیان دەگەن

***ئێستاش بونەمەسئول؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** خەتای حزبەکانە.

***دوای چەند ساڵ ئێستاکانە خەریکی لێ پێچینەوەن لەگەڵیان؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** وەڵڵا قەت نەدەبوایە، نابێ ببن بە مەسئول، وەختی خۆشی دەبوو لێکۆڵینەوەیان لێبکرێ، من موناقەسەیەکی حزبی نا سالم لەنێوان حزبەکاندا بەهۆکاری ئەوە دەزانم ئەو جاشانە لەوەدا رزگاریان بوو.



***هەندێ لەمستشارەکان دەڵێن ، فلانە سکرتێر ، فلانە کەس ئێمەی راسپاردووە بۆ جاشایەتی وتویەتی برۆن بن بە جاش، تۆ کەست راسپاردووە لەناو کوردسانی ئێران ببێت بە ئیتلاعات و هەواڵت بۆ بێنێ یان ببێ بە جاش؟**

عەبدوڵلای موهتەدی: واتە ناردنی خەڵك بۆ ناو ریزەکانی دوژمن، ئەمە شتێکی جیاوازە تۆ رەنگ بێ کەسێکی خۆت بێ زۆر خاوەنی بیروباوەڕیش بێ، بیچێنی لەناو هێزەکانی دوژمن.

***بەجاشایەتی؟**

عەبدوڵلای موهتەدی: بەجاشایەتی، نەوەڵلا ، بەلام بەهەرحاڵ ئەمە شتێکی ناسراوە لەدونیادا، زۆرێك لە حزبەشۆڕشگێڕەکان و بزوتنەوە رەواکانی دونیاش خەڵکیان لەنێو ریزەکانی دوژمندا چاندوە، ئەمەش حسابێ جیاوازە لەگەڵ کەسێك کەبە رەغبەتی خۆی چوو بێ و وەکو خراپەکردن دەرحەق بە خەڵك ومیللەتەکەی کردبێتی.

***سزا گەیاندنی ئەوانە پێتوایە نزیك بوو بێتەوە؟**

عەبدوڵلای موهتەدی: پێموایە دەوڵەتی جمهوری ئیسلامی ئێران لەسەرچەقۆیە، پێموایە ئایندەیەکی زۆری نەماوە، پێموایە خەڵکی ئێران نایانەوێ ، پێموایە توشی قەیرانێکی ئیقتیسادو ئابوورییە، تەنها و تەنها بەوەی نرخی نەوت لەسەرەوەیە خۆی راگرتوە، پێموایە لەبواری فەرهەنگی و ئایدیۆلۆژیدا لەبواری گوتاری زاڵ هی کۆمەڵگادا، دەمێك ساڵە زیاتر لە(10) ساڵە جمهوری ئیسلامی

ئەو ئایدۆلۆژییەی کە کۆماری ئیسلامی ئێران بەسەر خەڵکی ئێرانیدا سەپاند لەراستیدا دۆڕاوە، یەعنی بەر لەهەموو شتێك لەمەیدانی ئایدۆلۆژی و گوتاردا حکومەتی جمهوری ئیسلامی دۆڕاوە، لەبواری ئیقتیساد دۆڕاوە، هیچ بەرنامەو پلان و ستراتیژییەکی بۆ پەرەدانی ئابوری نییە، تەنیا و تەنیا بەپارەی نەوت خۆیان لەسەر کار راگرتوە، حکومەتێکی داپلۆسێنەرن.

ئاخر (27) ساڵە لەسەرکارن رەنگ بێ هەردوو ساڵی بە خوایشتی خەڵك و رەغبەتی خەڵك بووبێ، دنیا لە حاڵی گۆڕاندایە، سەردەمی جیهانگیرییە سەردەمی گلۆبلیزاسیۆنە، سەردەمی ئینتەرنێتە، سەردەمی دیموکراسی خوازییە، نەتەوەبن دەستەکانی ئێران بەئاگا هاتون و بەخەبەر هاتون، هەر کورد نییە ئێستا لەئێران، کرێکارانی ئێران پاش(25،20) ساڵ لەئێران سەرکوت، ئەم یەك دوو ساڵی رابردوو تۆزێك سەریان هەڵداوە، ژنان دەست هەڵناگرن، زیندانیانی سیاسی دەزانن لەبرسان دەیانکوژن، لە زیندان یان دەرزییان لێدەدەن سەرەرای ئەوەش لەزیندانەوە موقابەلەدەکەن لەگەڵ رۆژنامەکان. خەڵك نەترسن، خەڵك بوێرن.

ئاخر بە چ حسابێك ئەم ڕژێمە دەبێ بمێنێتەوە، دوژمنی جیهانی بۆ پەیدابووە، کە ئەویش ئەمریکاو دنیای ڕۆژئاوابێ، هاندەری تیرۆریزمە لە عیراق، نایەڵێ عیراق سەقامگیر بێ، حزبوڵلا هاندەدا بۆ خراپەکاری لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، ئاخر یا هەموو دنیا یەعنی یادەبێ هەموو دنیا شکستی بخوا یا دەبێ ئەم شکست بخوا، بۆیە من ئایندەی ڕون نابینم بۆ حکومەت، بۆیە هیواداریشم بەچاوی خۆمان ببینین بەڵام منو ئێمە مانانیش نەی ببینێ ئەم حکومەتە پێموایە کاری هەرتەواوە.

***سەبارەت بەوانەی کە تیرۆریانکردوە سەبارەت بەوانەی کە جاشێتی و جاسوسیانکردوە ئەگەر هاتوو لە داهاتودا ئەوانە پاڵیان دایە پاڵ حزبی دیموکراتەوە، پاڵیان دایە پاڵ موجاهیدینی خەڵقەوە، پاڵیان دایە پاڵ یەکێك لە گروپەکانی ترەوە، چی ئەکەن ؟**

عەبدوڵلای موهتەدی: وەڵلا هیوادارم، موجاهیدین پێموانییە جێگەو پێگەیەکیان لە کوردستان مابێ، کە خەڵك پاڵیدا بە وانەوە، بە داخەوە جاری پێشو حزبی دیموکرات ئەو کارەیکرد لە کوردستانی ئێران، ئاخر جارێك شارەکان گیران و ئازادکرانەوەو ئێنجا بۆ دووەمجار گیرانەوە ساڵی (1979-1980)و ئەوانە، بەداخەوە هەندێك خەڵکی خراپی وەرگرت لەریزەکانی خۆیدا هیوادارم ئەمجارە ئەوەکارە نەکرێت، پێموایە دەبێ تەنسیق و هەم ئاهەنگییەك لەنێوان حزبەکاندا هەبێ، بڕیارێکی هاوبەشیان هەبێ بۆئەوەی هەموی ئەوانەی شکایەتیان لەسەرە دادگایی بکرێن و تەحویلی دادگا بدرێن، پەنایان نەدەین سەر بەهەرکەس بێ پەنایان نەدەین .

# کۆنگرەی حەوتی کۆمەڵە
(1992)
(کوردستانی عیراق)





# کێشەکانی کۆمۆنیزمی کارگەری

## مەنسور دەیگوت"تاقە شتێك لەحزبی کۆمۆنیست دلّمپێخۆشە کۆمەلّەیە"

## لەسەرەتاوە حزبی کۆمۆنیست باشبوو، دوایی وشکایی هات

## مەنسوری حیکمەت دواتر وتی"پاشەکشەی حزبی کۆمۆنیست بەهۆی ناسیۆنالیزم بوونی کۆمەلّەوەیە"

## مەنسوری حیکمەت بۆ شکستەکانی خۆی کۆمۆنیزمی کارگەری دروستکرد

***بەحسەکانی کۆنگرەی حەوتی کۆمەلّە تیرمای ( 1371 ) ئۆگستی ( 1992 ) لەکوردستانی عیراق لەزرگوێز دەبەسترێت، ئەو کۆنگرەیە کاتێکە کەمەنسوری حیکمەت لەکۆمەلّە رۆیشتووەتە دەرەوە، بەشێوەیەکی زۆری دورستکردووە، ئێوە لەو کۆنگرەیەدا هەولّتانداوە جارێکی تر کۆمەلّە رێکبخەنەوە، ئەو خالّە نیگەتیڤانەی بەرۆیشتنی مەنسوری حیکمەت لەسەر کۆمەلّە جێهێشتبوو، گرنگترین هۆکارەکانی جێهێشتنی مەنسوری حیکمەت و رۆیشتنی زۆربەی کادرو کۆمیتەی ناوەندی کۆمەلّە لەگەلّیدا چی بوو؟**

**عەبدوللّای موهتەدی:** من وا دەزانم رۆشتنی مەنسوری حیکمەت لەبەر هەستکردنی بەناکامییەکانی حزبی کۆمۆنیستبوو ئەو چاوەڕوانی دەکرد، ئەو دەستکەوت و سەرکەوتنانەی ئەو لەسەرەتاوە چاوەڕوانیدەکرد کەبیبێ نەیبوو، واتە خۆی سەرهەلّدان و ئەو پەرەسەندنەی کەمەنسوری حیکمەت وەکو دیاردەی کۆمۆنیزمی کاریگەری لەناو حزبی کۆمۆنیستی ئێراندا روویدا، سەرچاوەکەی لەقەیرانی حزبی کۆمۆنیست بوو قەیران و بنبەستی حزبی کۆمۆنیستی ئێران بوو، وایکرد مەنسوری حیکمەت لەپێشدا تیۆرییەکانی کۆمۆنیزمی کاریگەری بلّێ، ئینجا تیۆرییەکانی گۆرانی بەسەرداهات، تۆزی پێچەوانەش بووە وە.

سەبارەت بەکۆمەلّە، لەئەنجامدا ئەو حزبەش بەجێبهێلّێت، وەختێ ئێمە حزبی کۆمۆنیستی ئێرانمان پێکهێنا، ئێمە وەکو کۆمەلّە، دیارە لەباری هێزی ئینسانی و ئیمکانیات و کادرو پێگەی کۆمەلاّیەتی.



هێزێکی سەرەکی بووین، بەڵام لەهەمانکاتدا مەنسوری حیکمەت ئەو (رێکخراوی موبارەزانی کۆمۆنیست) رۆڵێکی زۆریان بوو، لەواقیعدا بەیارمەتیو کارکردنی ئەوان بوو حزبی کۆمۆنیستی پێکهات، مەبەستم ئەوەیە کەحزبی کۆمۆنیست پێکهات زۆر کەس باسی ئەوەی دەکرد کەپێگەی کۆمەڵە لەکوردستاندا دیارە، لەناو جەماوەر، خەڵك، کرێکار، جوتیارو رۆشنبیرو مامۆستا، کۆمەڵە پێگەیەکی دیاری هەبوو، خۆیشی نیشاندابوو ئەو پێگەیە.

خەباتی سیاسی هەم پێشمەرگانەی زۆر بەفراوانیش کوردستانی ئێرانی بەڕێوەدەبرد، پرسیار ئەوە بوو ئەی ئەگەر کۆمەڵە ئەو پێگەیەی هەیە، پێگەی حزبی کۆمۆنیستی ئێران، یان باشترە بڵێین بەشە سەرتاسەریەکەی لەکوێیە؟ لەواقیعدا کەموکوڕی ئێمە زۆرتر لێرەدا بوو تابڵێین لەبەشی کوردستانی حزبەکە یان لەکۆمەڵەدا ، هەر ئەمەوایکرد ئێمە لەکۆنگرەی دامەزرێنەری حزبی کۆمۆنیستیشەوە لەساڵی (1983) ، لەوێوە کەوتینە ئەو فکرە، ئێمە دەبێت کارێکی وەها بکەین کە ئەوپێگەیە بۆ حزبی کۆمۆنیستی ئێرانو لەسەرتاسەری باقی شوێنەکانی ئێران، لەتارانو لەشوێنە گەورەکانیش پەیدابکەین، لەسەر ئەو بنەمایەش بوو کەئێمە کادری زۆرمان بۆ تەرخانکرد

بەڵکو ئەو حزبی کۆمۆنیستە لەباقی ئێراندا ریشە دابکوتێت، ببێتە حزبێکی جەماوەری، بۆیە رادیۆی حزبی کۆمۆنیستی ئێران تارادەیەکی زۆر خۆی تەرخانکردبوو، هەم بۆ بڵاوکردنەوەی سەبکی سیاسیو فکری حزبەکە، هەم بۆ کاری رێکخستن، کاری زۆری ئەو رادیۆ لەراستیەدا کاری رێکخستنی بو لەناو ئێراندا، لەکوردستانیش ئێمە هاتین بەڕاستی لەکادرەکانی خۆمانو لەوانەی لەرێکخراوی نهێنیماندا بوون، هەندێکیش لەپێشمەرگە ئەوانەی زۆر ناسراو نەبوون بەڵام بەشی زۆری لەرێکخستنە نهێنیەکان خەڵکمان گوڵبژێرکردبوو، هێنامانو فێرمانکردنو وەکو ئەو وەختەی دەمانگوت خشتەی نیشانە (جدول رمز) مان دانێو شێوەی کاری نهێنیو بەرەنگاربوونەوە لەگەڵ پۆلیسو زیندان، جۆرەها خولمان بۆ کردنەوە، ناردماندنەوە بۆ شوێنەکانی ئێران، ئەم کارە ماوەیەکی پێچوو، دیارە پەیوەندیش دروستبوو نەك بڵێم هەر دروستنەبوو، ئەوانە بەشێکی زۆری بوو هەندێ خەڵکی ترشیبوون کەخۆیان جیاواز لەکۆمەڵە پەیوەستبوون بەحزبی کۆمۆنیستی ئێرانەوە، دوو سێ ساڵی سەرەتا، یەك دوو ساڵی سەرەتا پەیوەندی خراپ نەبوو لەگەڵ باقی ئێران، بەڵام وردە وردە کزبووەو کەمبووەوەو پاش چەند ساڵ وشکانی هات.

جا من ئەوە لەڕووی چییەوە دەڵێم، بەڵگە هەیە لەسەر ئەوانە، ئێمە بڵاوکراوەیەکی ناوخۆیمان هەبوو، تەرخانبوو بۆ رێکخستنی نهێنیێ شارەکانی ئێران، هەموو پەیامو نامەو ئەو نامانەی کەلەنێوان ئێمەو رێکخراوی نهێنیو رێکخستنەکانماندا لەشارەکانی ئێران بوو، لەوێ کۆدەکرانەوە، لەژمارەیەکی دیاریکراودا چاپدەکراو دەخرایە بەردەست کۆمیتەی ناوەندی، لەکۆمیتەی ناوەندی



دەمانزانی چەند نامەمان بۆ هاتووە لەشارەکانەوە، هەموو نامەکان دیاریبوون، کۆمیتەیەکی تایبەتمان بۆ ئەو کارە دانابوو کەفارسی پێیدەڵێت "کمیتەی سازمانگر"، واتە کۆمیتەی ڕێکخستن.

لەبەرئەوە ئەم کۆمیتەی سازمانگەرە، بڵاوکراوەی بەدەستەوەبوو، نامەکانی خۆی وەڵامەکانی خۆی، لەسەرەتاوە جاری واهەبوو دەبوو هەفتەی جارێك بڵاوبکرێتەوە، ئەوەندە ژمارەی نامەکان زۆربوو، وردە وردە دوای یەك دوو ساڵ کەمبووەو بووە مانگی جارێك، ئەوەندە نامە نەدەهات، دوای ماوەیەك کەمتربووە وشکایی هات، جالێرەدا بوو پرسارەکە ئەوەیە، کەلەناو حزبی کۆمۆنیستی ئێراندا لەدووبەشی سەرەکی پێکهاتبوو، بەشێکیان کوردستانەکەی بوو کەهەمان کۆمەڵە بوو، کاری خۆی دەکرد، گیرانی هەبوو، کوژرانی هەبوو، زیندانی سیاسی هەبوو، ئەشکەنجەی هەبوو، بەڵام حزبێکی جەماوەری خاوەنی نفوز بوو، دیاریبوو، ئەی بەشە ئێرانەکەی کوا؟ ئەویش وردە وردە کزوکەم بووە، بۆیە درەنگ، یان زوو خەڵکانێك بیریان لەوە دەکردەوە کەئێستا بەشە سەرتاسەریەکەمان چی لێهات، پرۆژەی حزبی کۆمۆنیستی ئێران بۆ ئەوەیە حزبەکە سەرتاسەری بێت، لەهەموو ئێران بتوانێت جێگەو پێگەی هەبێت، بۆیە درەنگ، یان زوو مەنسوری حیکمەت دەیزانی کەپەنجەی تاوان ڕووەو ئەوان دەبێتەوە، ڕووەو ئێمە نەدەبووە، پشکی ئەوان لەو حزبەدا بەشە سەرانسەریەکەی بوو، پشکی ئێمە بەشی کوردستان بوو، کەئاوەدانبوو کارەکەمان.

لێرەدا بوو کەکۆمۆنیزمی کاریگەری سەریهەڵدا، لەکۆنگرەی دووەمی حزبی کۆمۆنیستی ئێران، کەهاوکات بوو لەگەڵ کۆنگرەی پێنجەمی کۆمەڵە.

لێرەدا قسە کەئەوە بوو، ئەگەر تێبینیتان کردبێت، قسەکانی مەنسوری حیکمەت زۆر ڕوونو ئاشکرایە لەدوو چاوپێکەوتندا باسیکردووە، دەڵێت :((حزبی کۆمۆنیستی ئێران حزبێکی جەماوەری نییە، حزبێکی کرێکاری نییە، ڕیشەی دانەکوتاوە لەناو خەڵك، چی بکەین بۆ ئەوەی وابێت، دەڵێت تەنیا بەشێك کەلە حزبی کۆمۆنیستی ئێرانەو واتە دەقی قسەکانیەتی، من دڵم پێیخۆشە، بریتییە لەبەشی کوردستان واتە کۆمەڵە، ئەوەیە کەئێمە پێگەی جەماوەریمان هەیە لەوێیە کەلەگەڵ مێژووی خەباتی سیاسی زیندووی گەلێك ئێمە تێکەڵێن، دەبێت ئەمە بکەینە سەر مەشقی خۆمان، کۆمەڵە بکەینە سەر مەشقی خۆمان، باقی حزبیش ئاوها لێبکەین)).

ئەسڵەن کۆمۆنیزمی کاریگەری ئەو وەختە خۆی ئاوا پێناسەدەکرد، بەڵام هێڵو ڕێبازێکە بۆ بەجەماوەریکردنی حزبی کۆمۆنیستی ئێرانو دەرهێنانی لەحاڵەتی دابڕان، ئەمەش مەبەست بەشە سەرانسەریەکەی بوو، بەشە ئێرانیەکەی بوو، نەك بەشە کوردستانییەکەی، بەڵام دوای ساڵێك دوو ساڵ ئەوە تێپەڕبوو ئەو قسانە هەر کراو زۆرتربوو ، بەڵام لەواقیعدا هیچ تەکانێك لەبەشە سەرتاسەریەکەی نەدرا، کزترو لاوازتر و بێ پەیوەندی تر بوون، من پرسیارەکەم ئەوەیە درەنگ یان زوو خەڵك دەیانگوت ئەرێ کامە خۆ تۆ بەشی سەرانسەریەکەت پێی چاکنەبوو ، پشکەکەی من



کەمێناوەمەتە ئەگەر بڵێیت وەك کۆمپانیایەك ئەوەی بەشی منە هەر ئاودانەو هەزاران پێشمەرگە لەکوردستان هەن و هەزاران خەڵك لەرێکخستنی نهێنیداو هەر رۆژێك لەجێیەك مانگرتنە، جۆرەها بەشی شێوازەکانی خەبات لەکوردستان هەبوو، زۆر گەرم و گوربوو، ئەی بەشەکەی تۆ کوا، کەبەشە سەرانسەرییەکەیە؟

لێرەدایە کە وەکو سەرمەو قولاتێك، وەکو پێچێك دەکەوێتە ناو کۆمۆنیزمی کاریگەری، شتەکە هەڵدەگەرێتەوە، ئەویش ئەوەیە لەجیاتی ئەوەی کۆمەڵە سەرمەشق بێت، بۆ باقی حزبی کۆمۆنیستی ئێران، نمونەیەك بێت باقی ئەوەی چاوی لێبکەن، وەکو ئەوبن بەجەماوەری، وایلێهات کەکۆمەڵە بوو بەکۆسپی سەر رێگای لەجەماوەری بوونی حزبی کۆمۆنیستی ئێران، ئەما کۆمەڵە ناسیۆنالیزمی تێدایە، دەرگاکانی لەکرێکاران داخستووە، ئەو دەرگایانە دەبێت بکرێنەوە، دەبێت ناسیۆنالیزم پاشەکشێ بکات و بروات، واتە کۆمەڵە لەشێوەی (نمونە) وە بوو بەشێوەی ئەو نەخۆشیەی دەبێت چارەسەربکرێت.

لەراستیدا کۆمەڵە نەخۆشەکە نەبوو بەڵکو ئەو (نمونە) ساغەکەبوو کەدەبوایە خەڵك تەماشایبکەن و چاوی لێبکەن، بۆیە ئەو چەرخەی پێدرا لەناو کۆمۆنیزمی کاریگەریدا، من پێموایە هیچ شتێکی تێدانەبوو، غەیری ئەوەی مەنسوری حیکمەت ونەمسالی ئەو دەبو وەڵامبدەنەوە کەبۆچی بەشە سەرانسەرییەکە ئاوەدان نابێت، بۆیە رووی تاوانەکە خرایە سەر کۆمەڵەو پاشان سەر وێرانکردنی کۆمەڵە من چەند جاریش ئەوەم باسکردووە، لەفکری خۆیدا بەو ئەنجامە گەیشت کەبەشە سەرتاسەرییەکەی پێ چارەسەرناکرێت، خۆنەشیدەتوانی هەر وا ئاسان بێتە دەرەوەو راستگۆیانە بێت بڵێت"کاکە وەڵلا هی من بەشی ئێرانم سەرینەگرت، چی بکەین؟ نەمامیشمان زۆر بۆ برد لەکوردستان لەو خاکەشین نەبوو، ئیمکانیەتمان دایە، ئاوماندایە، پول و پارەمان بۆ تەرخانکرد رادیۆمان بۆ دانا، رێکخستنمان بۆ کرد، لەوێ سەرینەگرت، ئەگەر ئینسانێکی راستگۆ بوایە دەبێت بۆ ئەوە بڵێت، دەبێت چارەیەکی دیکەی بۆ بدۆزینەوە.

***تۆ ئەم بۆ چوونانەی ئێستات ئەو کاتە بۆ تەرحنەکرد؟**

**عەبدوڵای موهتەدی:** پێموایە ئەوەم جارێکی تریش وەڵامداوەتەوە، من خۆم وەکو کەسێك تێگەیشتنم لەوبارەیەوە تەدریجی تربوو، بەڵێ کۆمەڵێ لەو شتانە پێموایە جاری پێشووش باسمکرد، لەکۆنگرەی شەشیشدا باسمکردووە، واتە من لەکوێی کۆمۆنیزمی کاریگەری لەگەڵی بووم و لەکوێی لەگەڵی نەبووم، لەبەشی یەکەمیدا، واتە ئەو جێیەی قسە لەوەبوو کۆمەڵە سەرمەشقێکە، مەبەست ئەوەیە کەئێمە هەموو حزبی کۆمۆنیست لەئێران بکەینە حزبێکی جەماوەری کاریگەری لەوەدامنیش لەگەڵی بووم و هەموو کەسی تریشی لەگەڵی بوو، بەڵام ئەو کاتەی کەقسە هاتەسەر ئەوەی کەئێمزا

لەسەرو گوێلاکی کۆمەڵە بدرێت، ئەگەر حزبی کۆمۆنیستی وەکو کۆمەڵە بۆلێناکرێت، کۆمەڵە نزمبکاتەوە سەرکوتی بکەیت نا من لەوەدا لەگەڵی نیم.

## من تەنها ساڵ و نیوێک سکرتێری حزبی کۆمۆنیست بووم

---

***باشە لەدەورانی حزبی کۆمۆنیستی ئێرانەوە هەتا دەگات بەو کۆنگرەیەش تۆ سکرتێری ، کەواتە....؟**

**عەبدوڵای موهتەدی: نا، نەخێر، نەخێر من تا کۆنگرەی دوو سکرتێر بووم.**

***دوای ئەوە کێ سکرتێر بوو؟**

**عەبدوڵای موهتەدی: ئەسڵەن سکرتێر نەما، شتێك بەناوی سکرتێری گشتی نەمابوو، بەناوی سکرتێری کۆمیتەی ناوەندی، زۆر کەس پێئەڵێ تۆ ساڵەها سکرتێری ئەوە راست نییە، بەس نێوان کۆنگرەی یەکەمو دووەم کەپێموایە ماوەی ساڵو نیوێکە، نێوان کۆنگرەی دامەزرێنەرو کۆنگرەی دووەم وێنای دەکەم ساڵو نیوێك بێت شتێکی ئەوهایە، تەنها ئەو ماوەیە سکرتێر بووم.**

***باشە جگەلە مەنسوری حیکمەتو گروپی سەهەند کێ تر بوو؟ کەمادام حزبی کۆمۆنیستیان پێ بەهێز ناکرێت، کۆمەڵە لاوازبکەن؟**

**عەبدوڵای موهتەدی: نا پێموانییە کەسی تربوو بێ، بەلام وردە وردە خەڵك نەك بەمەبەستی لاوازکردنی کۆمەڵە، کەس ئەو مەبەستەی نەبوو لەکۆمەڵەدا، بەلام کەوتنە ژێر کاریگەری بۆ چوونو جیهانبینیو شێوازی بیرکردنەوەو ئایدۆلۆژیەکەی مەنسوری حیکمەت، بۆیە پێنانوابوو بەو قەناعەتە گەیشتن یان بەو قەناعەتایان گەیاندن، ئەما! بەراستی دەبێت جارێ چووزانم! ناسیۆنالیزم راوە دوو بنرێت، یاخود فلانە کێشە هەیە، لەوەوە یان لەبری رووی رەخنە بکەوێتە سەر بەشی سەرانسەری، دیارە بەرپرسەکانیش دەچنە ژێر پرسیارەوە، لەوەوە رووی رەخنەکە هاتە سەرکۆمەڵە، ئەمە گۆڕانێك بوو بۆ مەنسوری حیکمەتو ئەوان زۆر بەئەنقەستو بەمەبەستبوو، بەلام خەڵکەکە من پێموانییە کەس دڵی پێخۆشبووبێ.**

***بەلام وەلامێکی سەیدبرایم کەلەبەردەستمدایە پێچەوانەی بۆ چوونەکانی تۆیە کەدەڵێت "لەسەرەتاوە عەبدوڵای موهتەدی لەبەرەی حیکمەت دا بووە، بەشێك لەو فشارەی کەوتبووە سەرکۆمیتەی ناوەندی، عەبدوڵای موهتەدی بوو"؟**

عەبدوڵلای موهتەدی: راستەکات من لەسەرەتاوە لەگەڵی بووم، خۆشم باسمکردووە، رەنگبێ جیاوازی من لەگەڵ هەندێ کەسی تر ئەوەبێ کە شتەکانی من لەڕوون، من نووسینم کردووە لەسەریان، چاوپێکەوتنم لەگەڵ کراوە، شتەکانی من لەڕوون لەتاریکیدا نەبووە، شتەکانی من بەچاکو، خۆشم دەزانمو ئەسڵەن خۆم لێکۆڵینەوەم لەسەر کردووە، بەنووسین لەسەرم نووسیوە، بەزمانقسەی لێدەکەم، ئەوە راستە من لەدەورییەکدا، بەلام ئەمە کام دەورە بوو؟ لەبنەماداو زۆرتر ئەو دەورەیە بوو کەقسە لەسەر بەجەماوەریکردنی حزبی کۆمۆنیستی ئێران بوو، ئەو دەورەی کەهاتەسەر بەلاوازکردنو شکاندنی کۆمەڵە، ئەگەر نەڵێم هەر لەڕۆژی یەکەمەوە، بەلام هەر زۆر زوو لەگەڵم نەکرد، هەربۆیەش مەنسوری حیکمەتو ئەوان شتێکیان پێکهێنابوو بەناوی کانوونی کۆمۆنیزمی کاریگەری کەبانگیانکردم من نەچووم، من جیاوازی خۆم راگەیاند.

*سەید برایم دەڵێت "مەنسوری حیکمەت دەیویست هەمان سیناریۆی پاش شکستی حزبی ((توودە)) کەلەئێران تووشی هاتو کادرەکانی ناردە ئەوروپا، هەمان سیناریۆ دووبارەبکاتەوە، بەکادرەکانی دەوت "کێ دەڵێ شەڕی ئێران-عیراق ناوەستێو ئێمە تەحویلی ئێران نادەنەوە، بۆچی ئەم کادرانە نەڕۆنە ئەوروپا"، مەبەستی لەوەچی بوو، کەلەکاتێکدا کەئەوانو حزبی ئێوە حزبێك بوون پێگەیەکی تایبەتتان هەبوو، کەبمێننەوە، مەبەستی ئەوەبوو ئەم حزبە لاواز بکات؟ یان مەبەستی ئەوەبوو کەکادرەکان تووشی چەواشەکاری بکات؟

عەبدوڵلای موهتەدی: پێموایە کۆمەڵی مەبەستی هەبوو، جاری یەکەم مەنسوری حیکمەت رەشبینێکی زیادەڕۆ بوو، لەهەموو شتێکدا لایەنە رەشەکەی دەبینی، هەر کەس لەزیندان دەگیرا پێیوابوو خیانەت دەکات، ئێرانو عیراق شەڕیان دەبوو.

پێیوابوو حەتمەن ئێمە دەفەوتێین، ئەو گیروگرفتو تەنگو چەڵەمانەی کەدەهاتە پێشەوە زۆر زوو لایەنە رەشەکەی دەگرتو ئەوەی پێیدەڵێن پارێزی، پارێزی دەکرد، هەر سروشتی خۆی وابوو، بەلام بێجگە لەوە ئەوەی ئەو لەگەڵ ئەو شیکارییەی من دەگونجێت کەعەرزمکردن، کەئەویش ئەوەیە پێموایە کەدەیویست کۆمەڵە پەرەوازبکاتو بیانباتە دەرەوە، لەحاڵێکدا نەدەبوو وابێ، باپێشت بڵێم جەماعەتی کۆمیتەی ناوەندی کۆمەڵە لەناوەوە بەکاك سەید برایمیشەوە لەگەڵی نەبوون، بەلام منیش عەینەن لەحزبی کۆمۆنیستی ئێراندا لەگەڵی نەبووم.



# من بەرگریم لەراپەڕینی کوردستانی عیراق کرد، مەنسور دژی بوو

***سەید برایم دەڵێت "عەبدوڵلای موهتەدی لەگەڵ مەنسوری حیکمەت بووە تا لە پلینۆمی شانزەدا کەلەسوید بەڕێوەچووە، بەڵام دواجاری دەڵێ بەهۆی هەندێ هۆکاری شەخسیو سیاسیەوە جەماعەتی مەنسوری حیکمەت، عەبدوڵلای موهتەدیان قبوڵنەکردووە، داوایان لێکردووە کەبەنووسینی رەسمی ئەو بۆچوونانەی بنووسێ، بەڵام دیسانیش پێیانوابووە کەنووسینەکانی موهتەدی محافزکارانەیەو قبوڵیان نەبووە لەگەڵ ئەم رەوتە بکەوێ؟**

عەبدوڵلای موهتەدی: من وام لەبیرنییە، وام لەبیرە، یەکەم داوایان لەمن کرد هەتا وەختێ حەمیدی تەقوایی نەبوو لەکانوونی کۆمۆنیزمی کاریگەری، مەنسوری حیکمەت خۆی دانیشتێکی کرد، دوو سێ کەس بوون، ئەوەو ئیرەجی ئازەرینو رەزای موقەدەم تەنها ئەو سیانەبوون، زۆریشی گوت هەتا حەمیدی تەقوایی زۆری داواکردووە، هەتا فارسیەکەی وت "خیلی پستوندان می چەسپوونە" واتە زۆر سنگی بۆ دادەنەوێنێت بۆ ئەو کارە، کەبەڵکو بێتە ناو کانوونەوە، بەڵام من پێموانییەو پێیوتم من حەزدەکەم تو بێیتو تۆ کەسێکی، بەڵام من وتم (من بیرکردنەوەم جیاوازە) لەدوو سێ شتدا بیرکردنەوەم جیاوازبوو.

یەکێکیان کوردستان بوو نەك بەو رۆشنییەی کەئێستا عەرزتدەکەم، بەڵام تۆوی شكو گومان لەبارەی دروستبوونی کۆمۆنیزمی کاریگەرییەوە هەبوو، بۆیە خۆم نەچوومە ناوەوە وانییە، ئەوان منیان رێگەنەدابێ.

دووەهەم، لەڕاستیدا وانەبووە، ئەوان لەو بارەیەوە شتێك بەمن بڵێن بنووسێ و من نووسیبێتم یان ئەم نووسیبێت، جارێکی تریش دەڵێمەوە، نزیکی من لەفکری کۆمۆنیزمی کاریگەری، دەگەڕێتەوە سەر ئەو جێیەی کەبەجەماوەری کردنی حزبی کۆمۆنیستی ئێران بوو، ناگەڕێتەوە سەر روانگەمان لەبارەی بزوتنەوەی کوردستان، بەڵگەشم هەیە، تۆ وتارەکانی ئەو وەختەی من بخوێنەوە، مەسەلەن شتێکی درێژم لەسەربەنیسەدر نووسیوە، بەنی سەدر چاوپێکەوتنێکی کردووەو کۆمەڵێ شتی ناڕاستی لەبارەی کوردو شەڕی سنەو شەڕی بیستو چوار رۆژەی سنە گواستووەتەوە، تۆ فەرموو ئەو وتارەی من بخوێنەوە، لەجەنگەی کۆمۆنیزمی کاریگەرییەوە ئەو وەختیشە کەمن هێشتا نەوەستاوەمەوە بەدژیان، بەڵام بەو حاڵەش دیدی من لەسەر مەسەلەی کوردو مەسەلەی بزوتنەوەی کوردستانیو ئەوانە زۆر زۆر جیاوازە، لەوەدا هەرگیز یەکگرتن نەبووە، ئەسڵەن کێشەی من لەگەڵ مەنسوری حیکمەت، لەگەڵ شەخسی سەید برایمیش کەوەك ئەوی بیر دەکردەوە لەمەسەلەی میللیو مەسەلی



کوردد ا هەر لەسەر ئەوەبوو، لەسەر کوردو مەسەلەی کوردبوو، لەڕاستیدا لەسەر ئەو ڕوانگەیەبوو لەسەر مەسەلەی کوردو کوردستان بوو.

مەسەلەی کۆمەڵەش، بێگومان لەوەدا لەگەڵ نەبووم ساغبوونەوەی هەر ئینسانێك، پێموایە هەر ئینسانێك وایە، بەڵام من بەدڵنیاییەوە وام کاتێکی دەوێت و پرۆسەیەکی تۆزێ تەدریجییە، دیارە لەجێیەکەوە دەبێتە گۆڕانیکی کەیفی واتە تۆ هەڵوێست وەردەگری، دەلیلێکی تریشم ئەوەیە کە ئەسەلەن لە جیابوونەوەماندا، ئاخر شتێك یان بڵێین کایەکی کەپشتی وشترەکەی شکاند لەسەر ڕاپەڕینی کوردستانی عیراق بوو، خۆمن لەسەر ڕاپەڕینی کوردستانی عیراق وەستامەوە، ئەگەر من لەسەر مەسەلەی کوردو بزوتنەوەی کوردو لەسەر مەسەلەی کۆمەڵە وەکو بەشێك لەو هاوفکربوومایە، وەکو مەسەلە بەجەماوەریی کردنی حزبی کۆمۆنیستی ئێران، نەدەبوایە تووشی کێشە بم لەگەڵی، ئەوەی تەقاندیەوە ئەوەبوو.

## مەنسور دەیگوت ڕاپەرین کوردستانی عیراق کۆنەپەرستانەیە

***دەقیقترین بۆچوونی ئەو کاتەی مەنسوری حیکمەت و برایمی عەلیزادە لەسەر ڕاپەڕین چۆن بوو، کەهەندێ کەس پێیانوایە مەنسووری حیکمەت بەهەڵچوونێکی کاتی دادەنێت، پێیوایە دەبێت دوایی حزبەکانی باشووری کوردستان بچنەوە باوەشی ئاغاکانیانەوە، کەمەبەستی حزبی بەعسە؟**

عەبدوڵای موهتەدی: یەکەم من دەڵێم هەر ئەسڵەن و بەتەبیعەن گەشبین نەبوو، ڕەشبین بوو، لەبەرئەوە پێیوابوو بەهیچ ناگات، جا من شریتەکەشیم ماوە، سەرەتای ڕاپەڕین تەنیا لەرانیە شتەکە دەستپێکرابوو، دەزانین لەرانیە کۆمەڵێك لە چەکدارەکانی حکومەتیش هەڵوێستیان گۆڕیوە، ئەوە ڕاپەڕینی مومکین کرد، بۆیە کەخەبەرەکانی هات من ئەو وەختە لەدەرەوەی وڵات بووم، لەکۆبوونەوەیەکدا جەماعەتی کۆمۆنیزمی کرێکاری، کۆمیتەی مەرکەزی حزبی کۆمۆنیست و ئەوانە منیان بانگکرد، وتیان تۆ ئەو مەسەلەیەت پێچۆنە، من ئەو مەسەلەم قەت بەباش نەزانی کەشریتەکانی بڵاوبکەمەوە، دەڵێم ئەو ڕاپەڕینە، دەڵێن جا جاشەکان لەگەڵیان کەوتوون دەڵێم جا بەو دەلیلە ڕاپەڕینە، چونکە یەکێك لەپێناسەکانی ئەوەی کەبزوتنەوەیەکی جەماوەری بکاتە ئاستی ڕاپەڕین، ئەوەیە هێزی چەکداری حکومەت ئینشیقاقی تێبکەوێت، بەشێکیان لەگەڵ خەڵك بکەون، لەئێران مەگەر وانەبوو، چەند نموونەیان بۆ دەهێنمەوە دەڵێم بۆچی لەئێران وەختێك پادەگانی (هوما فەرەکان) هومافەرەکانی تاران ڕۆژی بیست و یەکی ڕێبەندان بەرەیان گۆڕی و لەگەڵ خەڵك کەوتن، بەوە ڕاپەڕین دروستبوو، هەموو دنیا وایە دەڵێن قسەیەکی فەرەنسایی هەیە کەدەڵێت (تفەنگ لەم



شانەیانەوە دەخەنە سەر شانەکەی تریان) بەوە ڕاپەڕین سازدەبێت، کەبەشێك لەچەکدارو هێزی داپڵۆسێنەری حکومەت لەگەڵ خەڵكو بزوتنەوەکە بکەوێت، وتم کاکە ئەوە پێناسەی ڕاپەڕینە.

ئەمەیەك زۆری لەسەر ڕۆشتم، مەنسوری حیکمەت بێجگە لەوەی پێیوابوو هیچ نییەو سەرناگرێ، لەوە خراپتر بوو دیدەکەی ئەمە قسەکانی ئەویش هەیە، هەم قسەکانیم لەو شریتەدا هەیە، هەم نووسراوەکانی منو ئەویش لەجەدەلو پۆلیمیکێکدا کەلەگەڵ یەکتری کردمان هەردووکیان ماوە دەقەکانیان بلاوکراونەتەوە، ئەویش ئەوەیە ئەو پێیوابوو نەك هەر سەرناکەوێت، پێیوابوو ئەم بزوتنەوەیە بزوتنەوەیەکی کۆنەپەرستانەیە، بزوتنەوەیەکە کەمێژووی کوردستان دەگەڕێنێتەوە بۆ دواوە، قابیلی هیچ پشتیوانیەك نییە، کەمن قسەکانم کرد پێش ئەو زۆر کەس جۆرێك نزیکی نیشاندا، بەڵام ئەم قسەکانی ئەوەبوو وتی "بۆچی خومەینی ساڵی (1342)، هەتاوی کەدەکاتە (1963) ڕاپەڕێنیك بوو لەبازاڕێکی تاران، وتی بۆچی ئەو وەختەش خومەینی ڕاپەڕینی نەکرد؟ خومەینی داوای ئەوەیدەکرد ژن هەقی دەنگدانی نەبێت، داوای ئەوەی دەکرد ئیسلاحی زراعی لەئێران نەبێت، ئەوە ناکاتە شۆڕشێکی پێشکەوتوو خوازانە قابیلی ئەوەبوو خەڵك پشتیوانی لێبکات، نەخێر ئەم ڕاپەڕینەی ئێستا، باراپەڕینیش بێت، کۆنە پەرستانەیەو چەرخی مێژوو دەگەڕێنێتەوە بۆ دواوەو قابیلی پشتیوانی لێکردن نییە، ئەوە ڕای بوو لەسەرەتاوە تاکۆتایی.

ئەوشتی نووسی، من شتم نووسی، ئەوە وایکرد حزبی کۆمۆنیست نیهایەتەنلەبەر یەکتری بلاوبێت، ئەگینا چ پێویستبوو بڕوات لەحزبی کۆمۆنیست؟ ئەگەر هەموو شتێکی بەدەستبوو، ئێمە ئەو بەرگریەمان نەکردایە لەبەرامبەر ئەو بیرو بۆچوونەیدا، بۆچی دەڕۆی، من پێموایە دوو هۆکار هەبوو کەمەنسوری حیکمەت ڕۆشت.

دەتوانم بڵێم زۆرینەی لەگەڵ بوو لەکادرەکان ئەو کاتە، لەو دوو هۆکارە نەدەبوو نەیتوانی بڕوا یەکەمیان ئەوەیە ساڵێك دەسەڵاتی لەناو حزبی کۆمۆنیستی ئێران بەکۆمۆنیزنی کاریگەری بوو، لەو ساڵەدانە ئەو کرێکارە خەیاڵیانە هاتن کەگوایە بەری دەرگایان بەکۆمەڵ بەحزبی کۆمۆنیستی ئێران گرتووە گوایە تا ئەو وەختە کۆمەڵە ڕێگەیان نەدەدا بێن نەئەو کرێکارانە هاتن نەرێكو پێکی یەکی ئەو تۆ لەناو ڕێکخستنی حزبی کۆمۆنیست پێکهات، بەپێچەوانەوە وردە وردە شیرازەکان تێکچوو ناکۆکی زۆر بوو، تەنانەت دیاریدەی خراپی وەك پوڵ دزینو وەکو گەندەڵیو کەهەرگیز لەناو ئێمەدا پێشینەی نەبوو، چونکە بێ بڕوایی هاتە گۆڕی، بۆخۆت دەزانی بوو بەبێ بڕواییو تەکەتولو هەرکە ئەو دیاردانەش سەرهەڵدەدەن ئەوان ڕوویدا، لەبەرئەوە ئیتر ئەوان بەرپرسیاربوون، چونکە دەسەڵات بەوانبوو، خەڵك ڕوویدەکردە ئەوان، دووهەمیش هۆکاری درێژخایەنتربوو، وەکو پێموتی چونکە بەشی سەرتاسەریەکە هەروا کاول مابووەوە لەعیراق، بەشی سەرتاسەری، دەوترا دەی کاکە بۆ هیچیتان نەکرد.



هۆکاری سێهەمیش ئەوەبوو ئێمەو مانان دەستمانکرد بەدژایەتیکردنی لەسەر مەسەلەی راپەڕین، بەئاشکرا وەستاینەوە، مەنسوری حیکمەت تەماشایکرد خێری بۆی نییە لەحزبی کۆمۆنیستدا بمێنێتەوە، بۆیە چووە دەرەوە حزبێکی تری دروستکرد، مەبەستم ئەوەبوو بڵێم رادەی نزیکی و دووری من لەهەمووشی بەبەڵگە قابیلی نیشاندانە لەو ئاستەدایە.

# بڕوام بەمارکسیزمی دۆگما نییە

***برایمی عەلیزادە دەڵێت "من هیچ کات هەرگیز لەگەڵ ئەو رەوت و کردەوانەی ئەواندانەبووم، ئەم بۆچوونە راستە؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** ئەو بۆچوونە راستە، بەلام کامڵ نییە، کاک سەید برایمی عەلیزادە کارەکانی مەنسوری حیکمەتی پێی خۆشنەبوو، پێیوابوو زێدە رۆییە، توندڕەوییە، پێیوابوو تەشکیلات دەشێوێنێت، شێرازەی کارەکان دەشێوێنێت، واقیع بینانە نییە، گرفتی گەورە ئەوە بوو سەید برایم لەئەساسی جیهانبینیەکەی، لەئەساسی خەتەکەی لەگەڵی بوو ، لەو کردەوە وردەکاندا زۆری لێ نارازیی بوو، هەرگیز نەیتوانی سنوور بەندیەکی تێوری بکات لەگەڵ دیدگاکانی مەنسوری حیکمەت، لەو وەختەوە هەتا ئێستا کەمن زۆر جاریش بەخۆیم وتوە، من ئەوە بەگرفتی گەورەی سەید برایم دەزانم زۆریشم لەگەڵ باسکردووە، هەتا زۆرم شت نووسیوە لەپەیوەند لەگەڵ ئەوەدا، زۆرجار پێموتووە کاک سەید برایم وەرە ئەو زۆر نووسراوە هەن بەزمانی ئینگلیزی من ئامادەم تەنها لەگەڵ تۆ بیخوێنمەوە،بەلام سەید برایم تەنها بەدیلێکی نەبوو، هەرگیز پێداچوونەوەیەکی تێوری نەکرد، بۆیە هەرگیز نەیتوانی سنوور بەندیەکی قوڵ و ئەساسی بکات لەگەڵ بنەما فکریەکانی کۆمۆنیزمی کاریگەری، بەلام ئەوەی راستەکە لەگەڵ زۆربەی راکانی من رازیان نەبوو وپێخۆش نەبوو.

***ئێستا تۆ باوەڕت بە مەسەلەی مارکسیزم ماوە؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** من دەزانی مارکسیزم چۆن دەبینم ، مارکسیزم وەکو جیهانبینیەیک ، وەکو تێگەیشتنێك لەمێژوو لەکۆمەڵگە کەبەناوی ماتریالیزمی مێژوویی ناسراوە وەکو میتۆدێك، بەڵێ من وەکو ئەوانە پێموایە سەرچاوەیەکی گەورەیە بۆ تێگەیشتنی کۆمەڵگەو بۆ تێگەیشتنێکی دروست لەکۆمەڵگەو بۆ ئەوەی هێزێك بیەوێت گۆڕانکاری لەکۆمەڵگەدابکات، کەڵکی لێوەربگرێت، بەلام نەك مارکسیزم بەو واتایەی کەلەحزبی کۆمۆنیست و ئەوانەی تێیگەشتوون، کۆمەڵێ فۆرمۆڵی قسەی وشکی دۆگما و لەئەزەلەوە هاتووە تائەبەدیشی هەیە ئامن بڕوان بەو نییە.

***مەبەستم نەزەریەی، بەدەستەوە گرتنی دەسەلآتی چینی کرێکارە، بڕوات بەوە هەیە؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی**: بۆ ئێران ئەو کارەم پێ ئاسان نییە، بێگومان من پێموایە سەرمایەداری هەروەکو سەرەتایەکی هەیە کۆتایشی هەیە، نیزامەکانی پێشووی کۆمەڵگەش کۆتاییان هەبووە، کێ پێیوابوو ئیمپراتۆریەتی رۆم دەروخێت؟ کێ پێیوابوو ئیمپراتۆری بەریتانیا لەسەردەمی مەلیکە ڤکتۆریادا کۆتایی پێبدێت؟ لەبەرئەوە کێ پێیبوابوو کاتی خۆی ئیمپراتۆری هیدیو چین و ئێران، ئەوانە کۆتایی دێت؟ سەرمایەداریش مەرج نییە تاکۆتایی بمێنێتەوە، ئەمە چارەنووسیی مرۆڤایەتی نییە کەتاکۆتایی لەرژێمێکی ئەوهادا بژی، لەبەرئەوە بڕوام بەوە هەیە ئەم رژێمەش بەدڵنیاییەوە گۆڕانی بەسەردا دێت.

# مارکسیزمم لەناسیۆنالیزم پێ باشترە

---

***لەنێوان هەردوو فەلسەفەوتیۆرەکانی مارکسیزم و ناسیۆنالیزم، تۆ کامەیان بەباشتر دەزانی؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی**: من مارکسیزم، بەباشتر دەزانم، بەڵام پێموایە مارکیسزم کەئاوایی تێناگەم کەبێگانە بێت لەگەڵ مەسەلەی نەتەوەیی و رزگاری، نەتەوەیی نەک تەنیا بێگانە نییە، پێیموایە رێك دەبێت ئالآ هەڵگری ئەوەبێت، بەراستی ئەو ناتەباییەکە زۆرجار باسیدەکەن من وای نابینم.

***پێتوانییە لەفەلسەفەی مارکسیزمدا ئەو ناتەبایە هەیە؟**

**عەبدوڵلا موهتەدی**:: ئەو ناتەبایە خۆی هەیە، ئاخر ناسیۆنالیزم بە چی بڵێین؟ ئەگەر ناسۆنالیزم بەئایدۆلۆژیەکی سیاسی دەڵێین، بەڵێ ئەو ناتەبایە هەیە، بەڵام ئەگەر بەبزوتنەوەی رەوای نەتەوەیی دەڵێین بۆ رزگاری نەتەوەیی نەخێر من ناتەبایی نابییم، بەڵام ناسیۆنالیزم ئەگەر بیکەیتە ئایدۆلۆژیەك، بیکەیت بەجیهانبینیەك، بەڵێ لەو حاڵەتەدا ناتەبایی هەیە، بەڵام من پێموایە هیچ ناتەباییەکی لەگەڵ بزوتنەوەی نەتەوەیی نییە، نموونەش زۆرە، مارکس خۆی گەورەترین پشتگیری کردووە لەبزوتنەوەی نەتەوەیی پۆڵەندا ، لەبەرامبەر روسیای قەیسەریدا، هەروەها پشتیوانی لەبزوتنەوەی نەتەوەیی ئیرلەندادا کردووە لەبەرامبەر بەریتانیادا .

***بەلآم خۆناسیۆنالیزمیش هەر بریتییە لەفەلسەفەی هەستی نەتەوەیگەرایی؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی**: باشە ئەگەر ئەوەبێت، ئەیکەیەنیت بۆ ئاستی ئایدۆلۆژیەك، عیبارەت بێت لەو بزوتنەوەیەو لەدیارخستنی ئەو بزوتنەوەیە، من پێموانییە هیچ ناکۆکیەکی هەبێت، پێموانییە شتێك



بێت جێگەی نەبێتەوە، هەروەکو فێمێنینزمیش، ئاخر فێمێنیزمیش سەردەمی مارکس بەوشێوەیە نەبووە، بەڵام ناتەبانییە لەگەڵ یەك، تۆ دەتوانیت سۆسیالیستێك بیت، دەتوانیت چەپێك بێت، دەتوانیت کەسێکی پێشکەوتنخوازبیت، کەپێتخۆشبێت چەوساندنەوەی ئینسان بەدەستی ئینسان کۆتایی پێبێت، لەهەمانکاتدا داکۆکیکارێکی سەد لەسەدی بزوتنەوەی فێمێنیستیو بزوتنەوەی نەتەوەیی بێت، ئەوانە ئەسڵەن بەیەك دەزانم، ئەوانە هەمووی بەبزوتنەوەیەکی گشتی مرۆڤایەتی دەزانم، کێشەیەك لەنێوانیاندا نابینم.

## ناسیۆنالیزم دەتوانێت ببێتە فاشیزم

***لەگەڵ ئەو بۆچوونەی کەزۆربەی مارکسیزمە توندڕەوەکان، پێیانوایە ئایدۆلۆژیای ناسیۆنالیزم، یان میللی گەرایی و نەتەوەگەرایی ئێستا شتێکی کۆنە پەرستانەیە، تۆ لەگەڵ ئەو بۆچونەدای؟**

عەبدوڵای موهتەدی: نەخێر لەگەڵ ئەو بۆ چوونەدا نیم، بەپێچەوانە پێموایە دەتوانێت شتێکی زۆر پێشکەوتووخوازانەو مێژووساز بێت، وەکو بووەلە هەندێك شوێن، ناسیۆنالیزم دەتوانێت ببێتە شتێکی زۆر توندڕەوی زۆر کۆنە پەرستانە وەکو فاشیزمی لێدەربێت، ببێتە ناسیۆنالیزمێکی زێدەخوازی توندوڕەو کەداگیرکاری میللەتانی دیکە بکاتە بەشێك لەدیدی خۆی.

ئەو جۆرە ناسیۆنالیزمەشمان دیوە، ئەوە شتێکی ترە، بەڵام ناسیۆنالیزمی میللەتێکی وەکو میللەتی کورد ، یازۆرێك لەناسیۆنالیزمی تر لەدنیادا بوون، کەمن زۆرتر ناسیۆنالیزم لێرەدا بەو هەستەو بەو بیرکردنەوەیەو بەو بزوتنەوەیە دەڵێم کە بۆ رزگاری میللی نەتەوەیی لەوڵاتاندا بەرپا دەبێت، من نەك هەر پێم پاشکەوتوو نییە، پێموایە زۆر زۆر شتێکی رەوایە پێموایە ئەگەر کەسێك خۆی بەپێشکەوتووخواز بزانێت و بەچەپ بزانێت دەبێت لەهەموو کەس زیاتر هەوڵی بۆ بدات.

***لەکێشەکانی ئێوەو مەنسوری حیکمەتدا ئێوە لەبەیانیامەیەکدا، راگەیاندنێکتان دەرکردووە بەئیمزای تۆو سەید برایمی عەلیزادەو فاروقی بابە میری، ئیبراهیمی محەمەدی، محەمەدی شافیعی و نوسیوتانە لاوازبوونی حزبی کۆمۆنیست بەزەرای چینی کرێکارو رەوتی سۆسیالیست کۆتایی دێت، بەڵام من پێموایە بەدوای کۆنگرەش کەجیادەبنەوە بە پێچەوانەی ئەمە کاردەکەن، ئەو کاتە ئەو نەزەریە لەچییەوە سەرچاوەی گرتبوو ؟**

عەبدوڵای موهتەدی: ئەو کاتە، ئێمە دوو بەدوو لەگەڵ سەید برایم زۆرم قسەکرد، کەئایا ئێستا کەمەنسوری حیکمەت رۆیشتووە؟ ئێستاکە حزبی کۆمۆنیست بەقەدەر کەلاوەیەکی لەراستیدا لێ

مابووە؟ ئایا باشتر نەوەنییە کەئێمە ئیتر دەست لەحزبی کۆمۆنیست هەڵگرین و واز لەحزبی کۆمۆنیستی ئێران بهێنین و کۆمەڵە ببوژێنینەوەو زیندووی بکەینەوە؟ من ئەوەم پێ خراپ نەبوو، چۆن بڵێم فکرەیەکی ئەوا هەبوو لەمێشکمدا، بەڵام لەڕاستیدا، ئەو فکرە ئەوەندە لەسەری ساغ و سووربەشیمان نەبووم، کەسی تریش نەبوو ئەو وەختە بەراشکاوی وا باسیبکات، ئەگەر کەسێکیش لەفکری خۆیدا بووبێت ناڵێم نەبووە، بەڵام کەس وابەراشکاوی باسی نەکرد، من زۆر بەداخەوەم کەئەو وەختە ئەو کارەمان نەکرد، هەر ئەو وەختی کەمەنسوری حیکمەت و ئەوان ڕۆیشتن دەبوایە ئێمە کەتاوانەکەش تاوانی رووخانی حزبی کۆمۆنیست بوو بەباڵی ئەوان بوو ، بەباڵی ئێمە نەبوو، تاوانەکەمان بخستایە ملی ئەوان. هەروەکو بەئەستۆی ئەوانیش بوو، دوای ئێمە دەچینەوە سەر کۆمەڵەکەی خۆمان ساغی دەکەینەوە، دەبوایە پرۆژەی ساغکردنەوەی کۆمەڵە ئەو وەختە بکرایە، ئەوە دواخستنێکی خراپ بوو، من بۆ خۆشم جێگەی داخە بۆ ئەو وەختە بەقەدەر پێویست ساغ و راشکاونەبووم لەو بارەیەوە، بەراستی وە نەبوو فکرەکەیم نەبێت، فکرەکەیم هەبوو لەگەڵ سەید برایم هێنامە گۆڕی ئەو رازی نەبوو، وتی "نا ئەوە پاشەکشەیێکی گەورەیە، نابێت ئێمە وابکەین" بۆیە ئەو بەیاننامەیەماندا، نەك بەیاننامەی ساغکردنەوەی کۆمەڵە"

## من ویستم دوای ڕۆیشتنی مەنسور، کۆمەڵە زیندوبکەمەوە، سەید برایم رازی نەبوو

***منیش ویستم ئەو پرسیارە بکەم، ئەو کاتە بۆ ئەوەتان نەکرد، تۆ ترست لەوە هەبوو کەسەید برایم لەگەڵ ئەم بۆچوونەی تۆ نییە، کاك برایمیش ترسی لەوە هەبوو کەتۆ لەگەڵ بۆ چوونێکی ئەو نیت، یان ئێوە تا ئەوکاتە بڕواتان بەمەسەلەی مارکیسزم و حزبی کۆمۆنیست مابوو؟**

عەبدوڵلای موهتەدی: نادیارە خۆ، پاشماوەکانی فکری و بڕوا بەحزبی کۆمۆنیست هێشتا لەفکری من مابوو، بۆیە هەروەکو باسمکرد ئەو جۆرەی پێویستە ساغ نەبوو، بوونەوە ئەو بیرەی لەمێشکمدا بوو، هێناشمە ئاراوە، تەنانەت کۆنفرانسێکیشمان گرت لەکۆنفرانسەکەدا دەقی قسەکانی من ماوە من روومکردە جەماعەت وتم "ئەرێ برادەران، هاوڕێیان هیچ بەپاشەکشێشی نازانین با کۆمەڵە زیندووبکەینەوە ، ئەوەتان بێ چاکترە یا لەسەر ئەساسی حزبی کۆمۆنیستی ئێران بڕۆین؟".

ئیتر جەماعەتەکە حزبی کۆمۆنیستی ئێرانیان پێباش بوو، ئەگەر من خۆم تەواو بۆم ساغ بوایە وەکو دواتر ساغبووە دوو سێ ساڵ دواتر.



## درەنگ کۆمەڵەمان ساغکردەوە

***بۆچی سێ ساڵ دواتر ساغ بویتەوە لەسەر ئەم مەسەلەیە؟**

**عەبدوڵلای موهتەدی: ساغبوونەوەی ئینسانەکان پرۆسەیەکی دەوێت.**

***دەکرێت یەکێك لە هۆکارەکان راپەرینی خەڵکی کوردستان و هاتنەوەی هێزە سیاسیە شۆرشگێڕەکانی کوردبێت لەشاخەوە بۆ ناو شارەکانی کوردستانی باشوور؟**

عەبدوڵلای موهتەدی: بۆ نا؟ دەبێت ئەو یەکێکیان بێت! گۆڕانێك لەدنیادا بووە، مەبەستم ئەوەیە ئەگەر من بەتەواوی سەدی سەد ساغبوومایەوە، بەراستی سڵم نەدەکرد تازە کێ وابیردەکاتەوە کێ وا بیرناکاتەوە، هەروەکو دوایش لەپرۆژەی ساغکردنەوەی کۆمەڵە ساڵی (2000) وایلێهات، نەك ساڵی (2000) چەند ساڵێکیش من زۆر بەراشکاوانە قسەمدەکرد، بەڵام ئا لەو ساتە وەختەدا، دەتوانم بڵێم بەداخەوە من بەتەواوی ساغنەبوومەوە، خەڵکەکەی تریش لەگەڵی نەبوون، بۆیە سەری نەگرت. ئەگینا رەنگە زۆرێك لەو ئاڵۆزیو ئینشیقاقانەی دوایش نەبوایە، ئێمە هەموومان خۆمان بکردایەتە کۆمەڵە، ئیتر ئێستاش ئەو کێشەی بەدەست حزبی کۆمۆنیستووە تووشبوون نازانن چی لێبکەن نەدەبوو.

## حزبی کۆمۆنیست جگە لەکادرەکانی کۆمەڵە و کورد، فارسی لەگەڵ نییە

### عەلیزادە، تاکە کەسە دەتوانێ حزبی کۆمۆنیست هەڵوەشێنێتەوە

***حزبی کۆمۆنیستی ئێران، پاش ئەو مێژووە دوورو درێژەی کەتۆ باستکرد، پاش ئەوەی کەرەنگە لەسەر بەشێکی ژیان و خەبات و تێکۆشانی کادری کۆمەڵە بژی، دەتوانێت بەردەوام بێت، کەئێستا گروپێکی نارازی تری هەیە یان بۆ چارەسەرو، حەلناکرێت؟ حزب قابیلی حەل بوونە قابیلی گۆڕینی ئایدۆلۆژیا و فکرە؟**

عەبدوڵلای موهتەدی: بڵێ، قابیلە بەشەرتێك دۆگماتیزم ئیفلیجی نەکردبێت، ئەمن وا دەزانم جۆرێك باوەڕی ئاین و دۆگماتیزمی تەقریبەن، نەك تەقریبەن، تەحقیقەتیش لەگەڵ میتۆدی مارکسیزمیش

نایەتەوە، باوەڕێکی ئاینییە، وەکو چۆن ئیماندارێك تۆ ناوێری باسی خواو پێغەمبەری لەگەڵ بکەیت، بەپیرۆز سەیرکراوە، موقەدەسە، وەکو چۆن کەسێکی زۆر خاوەن ئیمان، بەڵام کەم خوێندەوار، ناوێرێت قسەت لەگەڵ بکات، پێیوایە قسەت لەگەڵ بکات، کافر دەبێت و ئیمانی لاواز دەبێت، ئاوا بیردەکەنەوە.

لەراستیدا حزبی کۆمۆنیست نەوڵا سێ نەفەرم بۆ بهێنێتەوە، نەهەزار نەفەرو دە هەزار نەفەر، سێ نەفەرم بۆ بێنێتەوە کورد نەبن و کۆمەڵە نەبن، کاکە تۆ ناتوانی حزبی مەملەکەتێك بیت، حزبی وڵاتێك بیت، نەلەئەسفەهان نەلەشیراز نە لەمەشهەد نەلەتەورێز نەلەخوزستان نەلەهیچ ئوستان و پارێزگایەکی دیکە ئیلا کوردەواری، خەڵکت نەبێت، نەك شەش مانگیش بەڵێ دەتوانی شەش مانگ وانە بێ، ساڵێ دوو ساڵ بڵێی لەگەڵ دیکتاتۆریەت خۆم رێکدخەمەوە، بەڵام ناکرێت (25) ساڵ چارەکە سەدەیەك ، هەر خەڵکت لەگەڵ نەبێت، لەشوێنێکدا حزبی ئەو جێگایەشی، دەبێت ئەو هاوڕێیانە بیرێك بکەنەوە، بۆیە دەڵێم بۆتە ئاین، بۆتە باوەڕێکی مەزهەبی، ئەگینا خۆ میتۆدی مارکسیزم میتۆدێکی داهێنەرو دینامیکە.

***باشە تۆ پێتوانییە شەخسی یەکەم مەبەستم، برایمی عەلیزادەیە، ڕۆڵی سەرەکی هەیە لەمە، کەنایەوێت دەستبەرداری ئەم حزبە بێت؟**

عەبدوڵای موهتەدی: بەبڕوای من ئەگەر سەید برایم بیەوێت، تەنها کەسێکە لەحزبی کۆمۆنیست کەدەتوانێت گۆڕانی گەورە پێکبهێنێت، ئەگەر ئەو گۆڕانە پێکبهێنێت و بێتەوە سەر بارودۆخ و هەوای ساغکردەوەی کۆمەڵە، من پێموایە گۆڕانێکی گەورە دەبێت، بەڕاستی دەتوانێت ڕێگا بۆ یەکگرتنەوەیەکی گەورە خۆشبکاتەوە، بەداخەوە وای نابینم، تواناکەی هەیەو قەناعەتەکەی نییە!

## حزبی کۆمۆنیست، نامێژووییە

*ئەو دەڵێت"کۆمەڵەی زەحمەتکێشان دەبێت بێتەوە سەر ڕێبازی کۆمەڵە"؟

عەبدوڵلای موهتەدی: دەتوانیت تۆ لەسەر ڕێبازێك مناقەشەبکەیت، بەڵام بەچ ناوێك؟ بەناوی حزبی کۆمۆنیستی ئێران؟

*دیارە ئەو مەبەستی ئەوەیە؟

عەبدوڵلای موهتەدی: قەیناکە ئێمە چواردە، پانزە ساڵ کۆمەڵە بووین، لەدەورەی خەباتی نهێنیدا کارمانکرد کۆمەڵە بووین، ، لەدەورەی راپەڕیندا کۆمەڵە بووین، خەباتی چەکداری و بزوتنەوەی کوردستان کرا کۆمەڵە بووین، گفتوگۆمان لەگەڵ حکومەتکرد کۆمەڵە بووین، لەگەڵ ئەحزابی ئێرانی چاکمانکرد، خراپمانکرد، هەرچیەکمانکرد کۆمەڵە بووین، ئەی بۆ دەمانتوانی ئەو وەختە کۆمەڵە بین و حزبی کۆمۆنیستیش نەبین؟! ئاخر چۆن مەخلوقێك کەبەدەستی خۆمان دروستکراوە، بۆتە ئەرباب و خاوەنی ئێمە؟ ئەوە کاکە وەك بت پەرستی وایە، ئەو بتە بۆ خۆمان دروستمانکردو سوژەمان بۆ بردووە، دەیپەرستین، مەبەستم بتی حزبی کۆمۆنیستە، کاکە بگەڕێنیەوە پێش بت پەرستیەکە، هەموو کۆمەڵە بووین، قەیناکە لەسەر ڕێبازەکەی بزانین کامی ئەو پێوایە نابێت بیکەین، لەسەر ڕێبازەکەی قابیلی موناقەشەیە بەبڕوای من حزبی کۆمۆنیستی ئێران دیاردەیەکی نامێژووییە.

## حزبی کۆمۆنیست، هەندێکیان لەگەڵ ئیرەجی ئازەرینن

*بەقەناعەتی تۆ حزبی کۆمۆنیستی ئێران دواجار هەڵئەوەشێتەوە، بەڵام کاتێکیش خۆی هەڵئەوەشێنێتەوە کەزۆر لاوازبووە؟

عەبدوڵلای موهتەدی: نازانم بەزووی هەڵوەشێتەوە، بەڵام بێگومان ئێستا کەبەتایبەتی فراکسیۆنی لێهاتوونە دەرو دەریانپەڕاندوون، هەرچی ناوێکی بنێین ئەو فراکسیۆنە خۆشیان هاوڕێیانەی خۆشیان کادری قەدیمین، خاوەن مێژوون لەکۆمەڵەدا، نەك بڵێم هاوشێوەی خەتی ئێمەن، ئەوانیش وەك ئێمە بڕوایان بەحزبی کۆمۆنیست نەماوە، من دەڵێم ڕۆژبەڕۆژ زیاتر، جا ئەم جارە کێشەکانی ناوخۆیان سەرهەڵدەدات، کێشەی فکریش و کێشەی تریش، چونکە هەندێکیان لەگەڵ خەتی ئیرەجی ئازەرینن، هەندێکی تریان هەن لەگەڵ خەتی ترن، من پێموایە گرفتی حزبی کۆمۆنیست کەتائێستا نەیتوانیوە چارەسەریبکات، ئەویش ئەوەیە ئایدۆلۆژی لەئەمو ئەو، خواستووەتەوە، دەمێك لەگەڵ



مەنسوری حیکمەت دەمێك لەگەڵ ئیرەجی ئازەرین، دەردی کورد دەڵێت "بۆ ئێمە خۆمان گۆجین ئێمە قەدیم چیمان دەکرد لەگەڵ کۆمەڵە. سیاسەت بۆ خۆمان بیری لێبکەینەوە، ئەزموونیشمان هەیە، پێویستی بەخوێندنەوە هەیە، بیخوێنینەوە، مارکسیزم بخوێنینەوە، نامارکسیزم بخوێنینەوە، لیبرالیزم بخوێنیتەوە، چیت پێباشە وەکو کۆمەڵە بادانیشن بیرێك لەخۆیان بکەنەوە، من وێنای دەکەم، ئەوان زۆر ناتوانن بەئایدۆلۆجی خوازراو بەقەرز وەرگیران لەئەم و ئەو گوزەران بکەن، بێجگە لەوەی کەهەروەکو باسمکرد وتم دیاردەیەکی نامێژوویە حزبی کۆمۆنیستی ئێران پێموایە، بەلام زەحمەتی دەبینم لەڕێگەی دیالۆگەوە بەقەناعەت بێت، ئایا دەبێت گۆڕانێك لەئێران ببێت ئەوان شۆکێکی پێوەرگرن، چونکە دڵنیابە زۆر زۆر بەکەمی خەڵکیان لەگەڵە، رەنگم ئەوە شۆکێکیان پێ واریدبکات، من پێموایە هەتا شۆکێکی کۆمەڵایەتیان پێنەدرێ و پێ وارید نەبێ، زەحمەتی دەبینم گۆڕان، ئەگەر کەسێك بتوانێت بگۆڕێت.

# حزبی کۆمۆنیست بۆ ئێران بێ کەڵکە و بۆ کوردستان بەزیانە

***سەیدبرایم بۆچوونێکی هەیە دەڵێت "تەنها ئێمە لەکوردستانەوە ناتوانین رژێمی کۆماری ئیسلامی ئێران بگۆڕین، بەڵکو پێویستمان بەحزبی کۆمۆنیستیش هەیە"؟ و دەڵێت"رێگایەکیش کەئێمە بیبینین بۆ دیاریکردنی مافی چارەی خۆنووسین حزبی کۆمۆنیستی ئێران"؟**

**عەبدوڵلای موهتەدی:** حزبی کۆمۆنیستی ئێران، بەقەدەر چڵە بوشکەیەك لەسەرتاسەری ئێراندا نفوزی نییە، یەك شانە یەك پۆلی نییە، یەك کۆمیتە، یەك کادری نییە، یەك لایەنگری نییە، بۆ ناوی سوێند نییەتی، حزبی کۆمۆنیستی ئێران بۆ سەرانسەری ئێران بێ کەڵکە بۆ کوردستانیش بەزیانە، بۆ کوردستان زەرەریی هەیە، بۆ ئێرانیش هیچ قازانجێکی نییە.

***ئیتر ئێوە کەلەکۆنگرەی هەشت نزیك دەبنەوە دیارە خیلافێکتان لەگەڵ کاك برایم دروستدەبێت، لەدیدارێکدا مام جەلال دێتە ناو ئەو کێشانەی ئێوەوە؟**

**عەبدوڵلای موهتەدی:** کۆنگرەی نۆیە، تەرحەکەی مام جەلال دێت، کۆنگرەی هەشت بەڵێ کێشەکە سیاسییە، رێك پەیوەندە بەبزوتنەوەی کوردستانیشەوە، ئێمە بزوتنەوەی کوردستان چۆنی پێناسە دەکەین و چۆنی تێدەگەین، مافی چارەنووسی چۆن تێدەگەین و شتەکانی تر، لەکۆنگرەی شەش نەچووم بەشداربیبکەم، لەکۆنگرەی شەش، بەلام قسەکانم، راکانی خۆم لەگەڵ سەید برایم باسکرد، لەوێدا من دژی ئەو شتانە بووم، کەلەکۆنگرەی شەشدا، ئەو بەشەی کەدەگەڕایەوە سەر کوردستان و



ئەو داڕشتنەوەیەو ئەو فۆرمۆڵەبەندەیەی کەمەنسوری حیکمەت و سەید برایم پێکەوە کردیان، جا لەکۆنگرەی هەشت سەید برایم دوای ڕۆشتنی کۆمۆنیزمی کاریگەری جارێکی تریش هەر بەو شێوازە قسەیکرد، من پێموابوو تەواو بوو، بۆیە من لەو کۆنگرەیەدا هەستام بەتەفسیل بەبڕوای خۆم لەڕوانگە ڕەسەنەکانی کۆمەڵە بەرگریمکردوە، ئەو خەتەی خەتی مەنسوری حیکمەتە لەسەر مەسەلەی نەتەوەیی و تێگەیشتنمان لەوە ئەوەم ڕەتکردوەتەوە، ئیتر لەو کۆنگرەیەوە دیار بوو ئێمە لەسەر ئەو مەسەلەیە ناکۆکین، عاقیبەت ئەوەش بوو بەیەکێك لەهۆکارە گەورەکانی کەلەکۆنگرەی نۆ، ئێمە لەحزبی کۆمۆنیستی ئێران جیابینەوە.

***ڕاستە سەیدبرایم لەسەر ئەو مەوزوعانە کەموهتەدی (مەبەستی تۆیە) لەیەکێتی نیشتمانی کوردستان نزیکترە، پێیوایە یەکێتی هاوکاری زیاتری ئێوە دەکات، لەوەڵامی ئەو پرسیارەشدا کەئایا یەکێتی نیشتمانی ڕۆڵی هەیە لەئینشیعابەکانی (پارچە پارچەبوونی) کۆمەڵەی چەندجارە؟ ئەو دەڵێت لەژێر کاریگەری یەکێتیدا نەبووە، بەڵام بەبیروبۆچوون و سیاسەتەوە موهتەدی لەیەکێتی نیشتمانی نزیکترە؟**

عەبدوڵڵای موهتەدی: وەڵڵاهی من خۆم بەنزیك دەزانم، ڕاستە، بەڵام دوو شت پێویستە، بیڵێم یەکەمی ئەوەیە بۆ یارمەتیدان، یارمەتی هەمووومان دراوە، یارمەتی لایەك نەدراوە.

## یەکێتی و پارتی جیابوونەوەی ئێمەیان پێخۆشبوو

***زیاتر یارمەتی ئێوە دراوە؟**

عەبدوڵڵای موهتەدی: نەخێر وەڵڵا وانییە، بەهەمانشێوەش یارمەتی ئەوان دراوە، یەکێتی نیشتمان بەگشتی و شەخسی مام جەلال، مەبەستت هەرچۆنێك بووبێت، کاریگەری لەسەر نەبووە، ئەو یارمەتی خۆی داوین.

دووهەم ئەوەیە، یەکێتی نیشتمانی کوردستان هیچ دەستێك و دەورێکی نەبووە، لەئینشیقاقاتی حزبی کۆمۆنیستی ئێران و ئێمە لێیجیابووینەوە، ئەمە هەڵقوڵاوی ناخ و دەرونی حزبی کۆمۆنیستی ئێران و ئاڵوگۆڕەکان و بیرکردنەوەکانی ئێمەبوو، خۆ هەموو ئەوشتانە هەموو دیارە، مام جەلال، یان یەکێتی نیشتمانی ئاگای لەوە نەبووە ئاخۆ لەکۆنگرەی شەش من چیم وتووە و چیم نەوتووە، لەکۆنگرەی هەشت چی بووە.



بەلام یەك شت راستە، یەكێتی نیشتمانی نەك هەر یەكێتی، پارتیش، حزبە كوردستانیەكانیش، هەمووی ئەوانەی كەكوردستانی بیردەكەنەوە، هەموو ئەوانەی كەگرنگی بەمەسەلەی نەتەوەیی و رزگاری گەلی كورد دەدەن و بۆی تێدەكۆشن، هەموویان كارەكەی ئێمەیان پێ باشبووە، راستە چونكە ئێمە رێبازێكی كوردستانی ترمان گرتەوە، رێبازی رزگاری نەتەوەیی كوردمانكرد بەئالایەك بۆ خۆمان، یەكێتیش پێی خۆشەو هەموو حزبەكانی تریش پێیانخۆشە.

## باسەید برایم، گەلالەكەی مام جەلالی قبوڵكردایە و جیانەبووینایەوە

---

***هاوكاریشیان كردوون؟**

عەبدوڵلای موهتەدی: هاوكاریشیانكردووین، هاوكاری ئەوانیان نەبڕیوە بیدەن بەئێمە، ئێمەش كەجیابووینەوە هاوكاری ئێمەشیانكردووە، مام جەلال هەتا نێوانمان، گەلاڵەیەكیدا لەدوكان دانیشتبووین، دووجارم لە سەید برایم پرسیوە، ئێمە هەردوو خاڵی گەلاڵەكەی مام جەلالمان بۆ یەككرتنەوە قبوڵبوو، كاك سەید برایم هیچیانی قبوڵ نەبوو، دەی قبوڵی بكردایە بەجیانەبووینایەتەوە نەیكرد.

## بۆ منازەری (t V) لەگەڵ سەید برایم ئامادەم

---

***هەموو ئەو باسانەی كەدەیكەین ئەگەر من بێم مونازەرەیەكی تەلەفزیۆنیتان لەگەڵ سەید برایمدا بۆ سازبكەم تۆ ئامادەی هەموو ئەو باسانە باس بكەیت؟**

عەبدوڵلای موهتەدی: بەڵێ، ئامادەم، دیارە من سەرەڕای ئەو جیاوازیە فكری و سیاسیانە، بەلام من رێزێكی زۆرم بۆ سەید برایم هەیە خۆشم دانی پێدادەنێم، تا ئەم ماوانەش كەشتێكم لەسەر حزبی كۆمۆنیستی ئێران نووسی، یان بڵێم شتێكی كۆنم دیسان نوێكردەوەو نووسیم، هەر ئەو رێزو خۆشەویستیەی خۆم دەربڕی، من سەید برایم بەكەسێك دەزانم، ئەگەر ئەو بیەوێت و بەقەناعەت بگات دەتوانێت گۆڕانێكی گەورە پێكبهێنێت، بۆ منازەریەكیش ئامادەم.

# سوپاس بۆ ئەو کادرو پێشمەرگانەی فریامان کەوتن

---

***ئێوە کۆنگرەی هەشت واتان ناوناوە کەکۆنگرەی ڕێکخستنەوەی بەشی تەشکیلاتی نهێنی بووە، ئەم کۆنگرەیەی کۆمەڵە ڕۆژانی (28-30) تیرمای (1374) واتا لە (17- 21) ژوئەنی (1995) لەکوردستانی عیراق بەسترا، دوای کۆنگرەی حەوتیش هێشتا ئێوە هەر خەریکی ڕێکخستنەوەی کۆمەڵەن، باسێکی ئەو کۆنگرەیەم بۆ بکەیت، چۆن چۆنی دەتانویست ئەو کۆنگرەیە ڕێکبخەنەوە؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** بەڕاستی ئێستا من بەڵگەکانم لەبەردەست نییە، یاشریتەکانی لای ئێمەو لای منو لای ئێمەو مانان نییە، لای سەید برایم و ئەوان ماوەتەوە، لەبەرئەوە ناتوانم مراجعەیەکی پێبکەمەوە بزانم چۆنە، ئەوەندەی لەبیرم ماوە دوو سێ باس لەنێوان کۆنگرەی حەوتو هەشتو لەدەوروبەری هەشتو ئەوانە لەنێوانماندا بوو، حەزدەکەم بزانیت یەکیان، مەسەلەی خۆ ڕێکخستنەوە بەڕاستی هەبوو، پێویستە قەدەری هەموو ئەوانە بزانین، هەموو ئەو هاوڕێیانەی کەبەبێ تێکدەریەکانو ئینشیعاباتەکەی کۆمۆنیزمی کاریگەری لەکوردستان مانەوە، کاریانکرد لەهەلومەرجێکی زۆر سەختدا توانیان زیندوومان ڕاگرنو سەرمان بەرز بکەنەوە.

من پێمخۆشە لێرە سوپاسو پێزانینی خۆم دەربڕم بۆیان، ڕەنگە بەشێك لەوانە ئێستاش لەگەڵ ئێمە نەبن لەگەڵ سەید برایمو ئەوان بن، بەڵام هیچ فەرق ناکات، ئەوان ڕۆڵێکی زۆر پۆزەتیڤو چاکیان هەبوو، لەهەرحاڵ ئێمە زۆر هەوڵی دروستکردنەوەو ڕێکخستنمان بوو، لەحەقیقەتدا هیچ سەرکەوتنێکمان لەڕێکخستنی سەراسەری نەبوو.

تائێستایش توانایان نییە، چونکە هەوڵی بۆ نادەن، ئێمە ڕێکخستن سەراسەری ناکەین، ئێمە ڕێکخستنمان کوردستانیە، ئەو وەختەی هەموو لەحزبی کۆمۆنیستی ئێران پێکەوە بووین، لەڕێکخستن سەرتاسەریدا هیچمان بۆ نەکرا، بەڵام لەڕێکخستنی ناوخۆیدا بەڵی ئێمە بوژانەوەیەكو تۆزێك زیادبووین، بەڵام بەو وەختیشەوە هێشتا ڕێکخستنی ئێمە لەشارەکانی ئێران زۆر دابڕاوبوو، زۆر لاوازبوو، ئەمەیەك خاڵ.

خاڵی دووەهەم ئەوەیە هەروەکو باسیشمکرد، بەکورتی ئاماژەی پێدەکەم، لەکۆنگرەی هەشتدابوو، کەدیدو بۆ چوونمان لەسەر مەسەلەی نەتەوەیی لەسەر بزوتنەوەی کوردستانی، لەسەردەنگو جێگەی کۆمەڵە لەبزوتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردستانو لەسەر زۆرێك شتی ئەوها لەسەر بەرنامەی ئێمە بۆ چارەسەری کێشەی نەتەوەیی، خود موختاری، فیدراڵی، هەموو ئەو شتانەی کەپەیوەندیدارن بەمەسەلەی کوردو خەباتەکەی، بەڵێ، لێرەدا ئێمە جیاوازیەکی فکری زۆر لەنێوانماندا هەبوو، من قسەکانی خۆم لەو کۆنگرەدا کردووە.



کە هەردرێژەی تەکمیلکردنی ئەو قسانەیە دوایی دەبێتە پرۆژەی ساغکردنەوەی کۆمەڵەو جیابوونەوەی لەحزبی کۆمۆنیستی ئێران، شتێکی تر کەدەمەوێت باسی بکەم، ئەوەیە لەنێوان کۆنگرەی حەوت و کۆنگرەی هەشت و تا دواتریش، ئێمە باسێکی تریشمان لەسەر چەپی عیراق چۆن لەعیراق بوو.

حزبی چەپی کۆمۆنیستی کرێکاری عیراق پێکهاتبوو، چەپی عیراقیش هەبوو، چەپی سەربەخۆو ئەوانە، ئێمە رایەکمان هەبوو، منیش و ئەو کەسانەی دواتر لەپرۆژەی ساغکردنەوەی کۆمەڵەدا بەشداریانکرد، ئێمە رامان وابوو، خەتی کۆمۆنیزمی کرێکاری لەعیراقی خەتێکی ناڕاستە، خەتێکی چۆن بڵێم، بەهەموو شێوەیەك قابیلی وەلانان و رەخنەگرتن و تەرككردنە، ئێمە پێمانوابوو، دەبێت سنوور بەندیەکی بەتەواوی مانا لەگەڵ کۆمۆنیزمی کاریگەری بکرێت، ئەگەر شانسێك هەبێت و مابێت بۆ چەپ لەعیراق و بەتایبەتی لەکوردستانی عیراق، چەپێکی سەربەخۆ، مەحکومی واقع بینە، کە بەتەواوی لەگەڵ سوننەت و فەرهەنگ و بنەما فکریەکانی مەنسوری حیکمەت و کۆمۆنیزمی کاریگەری سنووری خۆی بۆشلکردوەتەوە، لێیان جیاوازبوو، چەپێك کەبتوانێت ئەو هەڵانە نەکاتەوە کەئەوان کردیان، بەڵکو تێکەڵبوون و ئاشتبوونەوەیەك لەگەڵ بزوتنەوەی نەتەوەیی کوردستان بکات، ئەگەر ئۆپۆزسیۆن دەبێت، ئۆپۆزسیۆنێکی بەرپرس و بنیاد ئەو بێت، ئەوانە نووسراون شریتەکانی ئێستا لای من نین، بەڵام بەشریت هەن بەنووسراوەش نووسراون، بەڵام سەید برایم هەندێك لەهاورێیانی دیکەمان کەدواتر هەر لەناو حزبی کۆمۆنیست مانەوە، ئەوان بەپێچەوانە پێیان وابوو رەنگە ئێمە رەخنەمان هەبێت لەکۆمۆنیزمی کاریگەری، بەڵام هەرچی بێت ئەوان چەپن، نابێت ئێمە رەخنەیان لێبگرین، نابێت لاوازیان بکەین، چەپ ئەوەیە ئەگەر دەمانەوێت پارێزگاریان لێبکەین، ئێمە بەگشتی پارێزگاری لەچەپ دەکەین.

ئێمە لەو بڕوایەدا نەبووین، پێمانوابوو ئەگەر چەپ هەر شانسێکی بوژانەوەی هەبێت لەکەناڵی رەخنەو رەتکردنەوەی وەلانانی خەتی کۆمۆنیزمی کاریگەییەوە مومکینە.

## دروستبوونی حزبی کۆمۆنیستی کرێکاری لە عیراقیش خەتای ئێمەی تێدابوو

---

***بەڵام دواجار ئەو بۆچوونەی ئێوە شکستی خوارد هەر بەو بەڵگەیەی حزبی کۆمۆنیستی کرێکاری عیراق لەسەردەستی مەنسوری حیکمەت دروستدەبێت، تا ئەم چرکە ساتەش؟**

عەبدوڵلای موهتەدی: بەلأم خەتای ئێمەشی تێدابوو ، راست ئێمە دوای راپەرینەکە، دوای کۆنگرەی حەوتیش، ئەگەر ئێمە بەراشکاوییەوە ئەو خەتەی کەوا باسمکرد بمانکردایە، بچووینایە بمانوێرایە، بچووباینایە جەنگی کۆمۆنیزمی کاریگەری جەنگی نەزەری تەحەدای نەزەری و سیاسیمان بکردبایە، بەس نەبوو هەموو چەپی عیراق وای لێبێت، ئێمە نەمانکردن، چونکە کۆنترۆلی ئیدارەی حزبەکە بەدەست سەید برایمو هاوبیرانی بوو، زۆر وەخت ئەو شتەی ئێمە دەمانویست نەکرا، بۆیە جەماعەتی کۆمۆنیزمی کاریگەری زۆریان قین لەمن بوو، هەمیشەی بەتاك بەشەخسی خۆیان هاتوچۆی سەید برایمیان دەکرد.

# کۆمۆنیزمی کارگەری، دایناسۆری کۆمەڵگان و دەبرێنەوە

***حزبی کۆمۆنیستی کرێکاری عیراق پێکهات، بەلأم تاچەند سالی دەست بەکاربوونی توانی بمێنێتەوە، بەلأم دواجار پاشەکشێیکرد، نەیتوانی چەپی کوردستانی عیراق لەدەوری خۆی کۆبکاتەوەو ببێتە هێزێکی بالأ دەست، پێتوابوو هەر لەژێرکاریگەری مەنسوری حیکمەتدا بوویان کۆمەڵگاکە قبولی نەبوو؟**

عەبدوڵلای موهتەدی: ئاخر کۆمەڵگە، فکیری مەنسوری حیکمەتی قبولْ نەبوو، نەشیدەتوانی ببێت، مومکینە لەئێران ئەو حزبی کۆمۆنیستەی ئێران، حزبی کۆمۆنیستی کرێکاری کەئێستا پارچە پارچە بوون، نەیانتوانی هەرگیز شتێبکەن، نازانم مەگەر مێژووی دنیا هەمووی بگۆڕێت و بەرئاوەژوو ببێتەوە، ئەو دنیایەی ئێمە تیایدا دەژین جێگای ئەوان نییە، ئەوانە دیاردەیەکی نامێژووین، ئەوانە دەیناسۆرێکن ماونەتەوە، یەك دوو دەیناسورن، ماونەتەوە لەدارستاندا دێن و دەچن.

تەواو دەبن دەبرێنەوە ئەوانیش، جێگە هەیە بۆ چەپ، بەلأم چەپێکی بەرپرسیار، چەپی کۆمەلأیەتی، چەپێکی کەمتر نا، بەڵکو زیاتر خۆی بەخەمخۆری بزوتنەوەی کورد بزانێت، بەخەمخۆری هەرێمی کوردستان بزانێت، خۆی بەخەمخۆری ئەزمونەکەی بزانێت، یان هەوڵبدات بۆ رەخنەگرتنێکی دڵسۆزانە، لەچاککردنی کارەکە، بەڵێ شتی ئەوها دەیتوانی ببێت ئێستا نا، بەلأم چەپی عیراق بوو بەدژی راپەرین، من خۆم قسەم لەگەلْ دەکردن زۆر لەگەلْ راپەرین بووم، پێموابوو دوژمنایەتی حزبەکانی کوردستانی عیراق کارێکی هەڵەیە بۆ چەپ، دەبێت دۆستایەتیان بکات.

ئەگەر رەخنەیەکیشی هەبێت، پێموابوو دەبێت خۆیان بکەن بەخاوەنی ئەزموونی راپەرین، ئەوان هەموو هاتن کەخۆیان لەراپەریندا بەشداریانکردبوو، لەژێر کاریگەری فکری مەنسوری حیکمەت، راپەرینیان بەکۆنەپەرستانەو بەهەڵەزانی، خەڵك چۆن لەگەڵت دەکەوێت کەتۆ دژی هەموو

کوردبێت؟دژی هەموو ئەزموونەکەبیت، دژی راپەرینی بیت، مەعلومەکە لەگەڵ ناکەوێت، من بەوانە دەڵێم دایناسوور.

# حزبی کۆمۆنیستی عیراق نەماون و ئیسلامیەکان بەهێزترن

*هەتا ئێستاش چەپی کوردستانی عیراق، لەژێر کاریگەری حزبی حیکمەتیست و مەنسوری حیکمەتدایە؟

عەبدوڵای موهتەدی: هەر نە ماون، جاکوا ماون؟ تازە دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی پێکناهێنن بەبڕوای من.

*بەڕای بەڕێزتان حزبی کۆمۆنیستی کوردستانی عیراق کەتازە دروستیانکردووە چییان دەوێت؟

عەبدوڵای موهتەدی: یاخوا ببن بەشت، بەڵام من پێموانییە، نابن بەشت.

* پەیوەندیتان لەگەڵیاندا چۆنە؟

عەبدوڵای موهتەدی: سڵاویان نەکردوە، تا وەڵامی سڵاویان بدەینەوە.

*بزوتنەوە چەپ لەکوردستانی عیراق چۆن دەبینی پێتان وایە ماوە؟ یان دەتوانێت جارێکی تر زیندوو ببێتەوە، یان بزوتنەوەی نەتەوەیی ناسیۆنالیستانەی کورد، هێندە بەهێزە ئەوانی شاردۆتەوە؟

عەبدوڵای موهتەدی: بەڵێ یەکەم، بزوتنەوە نەتەوەیی بەهێزە، دوای ئەوانیش هەرچەندە پێم خۆشنیە، بەداخەوە کەوایە، ئیسلامییەکان بەهێزن، ئەو چەپە لەژێر کاریگەری هەموو ئەو شتە سلبیانەدا کەباسمکردوو، کرچ و کاڵبوونی خۆیان و هەڵەی خۆیان و هەڵەی رێگای سیاسیانە و هەڵەی رێبازیان، وایکردووە کەبەداخەوە شانسێکیان نەماوە.

# دۆستی بزوتنەوە و یەکگرتوونین و دژیشیان نین

* پەیوەندیتان لەگەڵ بزوتنەوەی ئیسلامی لەکوردستانی عیراقدا چۆنە؟

عەبدوڵای موهتەدی: پەیوەندییەکی تایبەتیمان نییە، دوژمنایەتیەکیشمان لەگەڵیان نییە.



***ئەی لەگەڵ یەکگرتووی ئیسلامی؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** تائێستا سەردانێکی ئەوتۆمان نەبووە، بەڵام دژیشی نین، بەمەرجێك حزبێك بێت بەڕاستی لەپرۆسەی سیاسیدا بەشداربیکات، کاری توندوتیژی نەکات، کاری تیرۆریستی مەحکوم بکات، جیاوازی زۆر لەنێوانماندا هەیە، بەڵام دژی نین.

***زۆجار حزبی کۆمۆنیستی کرێکاری ئێران (حیکمەتیست) بەیانی توندو لەسەر ئێوە بڵاودەکەنەوە، یان ئێوە، وەڵامی توندیان دەدەنەوە، دیارە پەیوەندیەکانتان خراپە، ئەو پەیوەندی خراپبوونەی ئێوەو حیکمەتیست لەسەر چ بنەمایەکە؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** پێموایە تائێستا ڕۆشنبووەتەوە، ئەوان بەئابرووبەرەی چەپ دەزانم، پێموایە ئیعتیباریان لەچەپ سەندەوە، چەپیان کرد بەگاڵتەجار، چەپیان کرد بەدوژمنی بزوتنەوەی ڕەوا و ئازادیخوازانەی گەلی کورد، وایانکرد، چەپیان بەئینسانی نامەعقول و نامەسئول پیشاندا، چەپیانکرد بەدژی ئەزموونی کوردستانی باشوور، لەبەرئەوە من گەورەترین زەرەرو زیانیان بەوە دەزانم کە چەپیان سوککرد، شانسەکەیان سوتاندو لەبەرچاوانیان خست.

ئەمەیەك، دووهەمیش ئەوەی بەنیسبەت خۆشمانەوە زۆر بێ وەفاو پێ نەزان و خراپ بوون بەنیسبەت ئێمەشەوە، پێموانییە هیچ داهاتوویەکیان هەبێت، بەڕاستی نازانم تۆنامازەت بەچییە؟ زۆر لەمێژە ساڵەهای ساڵە هەر وەڵامیشیان نادەینەوە هەر شتەکانیان ناخوێنینەوە، دوو هەزار جنێویش بدەن هەر نایخوێنینەوە، نەك هەر ئێمە کەسیش نایخوێنێتەوە، زۆر کەمن، ژمارەیەکی کەمن، ئەوانەی کەمۆگریانن.

## سەید برایم لەژێرکاریگەری کۆمۆنیزمی کارگەریدایە

---

***برایمی عەلیزادە دەڵێت "پەیوەندی ئێمە باشترە لەگەڵیان تاعەبدوڵڵای موهتەدی "؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** بەڵێ ئێمە نیمانەو، ئەوانیش بەداخەوە لەژێر کاریگەری فکری کۆمۆنیزمی کاریگەریدان ئەوان گرفتیان ئەوەیە.

***هێشتا ئەوان لەژێر کاریگەری فکری کۆمۆنیزمی کاریگەریدان؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** بەڵێ وەکو پێم ڕاگەیاندی.



***عەیب نییە؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** زۆر عەیبە، زۆر جێی داخە، زۆر حەیفە، کۆمۆنیزمی کاریگەری هیچ نین، سەید برایم تیکۆشەرێکی ناسراوە، خۆی چی کەمە، نازانم بۆ دەبێت لەوان سود وەربگرێت.

# ترسمان نەبوو (ی.ن.ک) تەسلیمان بکاتەوە

***لەسەروبەندی کۆنگرەی هەشتی کۆمەڵەدا، ئێوە کۆنگرەکەتان لەزرگوێزەوە هێنا بۆ سلێمانی لەبەر باری ئاسایش، بەڵام پێموایە دواجاریش رووبەرووی هەندێ مەترسی و تۆپبارانبوونەوە، ئەو مەترسی و تۆپبارانانە بۆچیبوو؟ سەید برایم باسی ئەوە دەکات لەو کۆنگرەیەدا کەساڵی (1995)، گوایە ئێران فشاری خستوتەسەر یەکێتی نیشتمانی کوردستان بۆ داخستنی بارەگاکانی ئێوە، بەڵام ئەو دەڵێت یەکێتی هەڵوێستی مقاومانەی گرتەبەر، ملی نەدا بۆ ئەو داوایانەی ئێران، دەکرێت باسیکی ئەوەم بۆ بکەیت ئەو کۆنگرەیەتان بۆ گواستەوە، لایەنی ئەمنی ئێوە چۆن بوو؟ یەکێتی نیشتمانی کوردستان بۆ نەچووە ژێر ئەو داوایانەوە، ئێوە تاچەند ترستان هەبوو لەوەی کە رۆژی لەرۆژان تەسلیمتانبکەنەوە، یان رۆژی لەرۆژان رووبەرووی بزوتنەوەیەکی تیرۆرستی بەهێز ببنەوە لەناو ئۆردوگاکەتان؟**

**عەبدوڵڵا موهتەدی:** بەڕاستی وردەکاریەکانیم لەبیر نەماوە کەبەوردی مەترسیەکان چیبوو، بەڵام مەترسی هەبوو لەو خاڵانە کاری تیرۆرستی کاری کوشتن، دەرمانخواردکردن، رفاندن، تەقاندنەوە، موشەك بارانکردن لەئێرانەوە یاخود خومپارە بارانکردن و تەقەکردن بەئاربیجی لەسەر بووە، لەراستیدا بەدوای هاتنی خاتەمی تۆزێ سیاسەتیان گۆڕی، سیاستەکەشیان ئەوەیە لەم تیرۆرە ئاشکراو بێ لێپرسینەوانە تۆزی لەوە کەوتن، پێموایە یەکێتی نیشتمانی کوردستان رۆڵی زۆر کاریگەری هەبوو لەوەدا، تارادەیەك بەرییێگرتن، بەری پێنەگرتنایە تەسور دەکەم سەرجەم کوردستانی عیراق و حکومەتەکەی، زۆر زیانبار دەبوون، ئێران تارادەیەك دەستی ئاوەڵا دەبوو، دەیکردە جێی تەراتێنی خۆی، ئەوانە کۆمەڵێك ئەو ترسانەی کەئەو وەختە هەبوو، ترسەکە هەر ئەوەیە، هەر ئان مومکینە ئێران دەستبداتەوە کاری تیرۆریستی، بەتایبەتی لەم سەردەمی ئێستادا، بەڵام سەردەمی کۆنگرەی هەشت و ساڵەکانی ئەوەدەکان بەڕاستی زۆر بوو لەژێر کاریگەری ئەوانەدابوو، کەئێمە کۆنگرەکەمان گواستەوە، سەید برایمیش راستدەکات یەکێتی وەڵامی چاکی دانەوە، ئائێمە ترسمان نەبوو تەحویلمان بدەنەوە، بەڵام بڵێی ئێران زەختی نەبووبێت و فشاری نەبووبێت هەمیشە بوویەتی، هەندێجار فشاری ئێران بۆ سەر یەکێتی کاریگەری هەبوو چ لەسەر ئێمە چ لەسەر حزبی دیموکرات.

***ئەو حزبانەی کەزۆر هاوکاری ئێرانیاندەکرد لەکوردستانی عیراق کێبوون؟**

**عەبدوڵلای موهتەدی:** بەڵگەی زۆر بەدەستەوە نییە.

# خەڵکمان گرت، عیراقی بوون و بۆ کوشتنی ئێمە هاتبوون

***کەستان نەگرت؟**

**عەبدوڵلای موهتەدی:** بەڵێ هەندێ کەسمان گرت و کارت و پێناسەکانیشمان گرت و داشماننەوە.

***کێ بوون؟ وتیان چی؟**

**عەبدوڵلای موهتەدی:** ناتوانم ئێستا بیڵێم کێ بوون، بەلآم بوون.

***باشە هەر لەو سەردەمانەدایە کەیەکێتی نیشتمانی کوردستان ڕێگا بەسوپای پاسداران دەدات شەو بڕوات بۆ سەر بارەگاکانی دیموکرات، بەلآم ئێوە دەپەرسێنێت، هەندێ پێیانوایە ئەمە دۆستایەتی بەتینی کۆمەڵە و یەکێتی بوو، لەکاتێکدا هاتنی ئێران لەقەرەداغەوە نزیکە هەتا بڕوات بۆ کۆیە، حزبی دیموکرات راستە زیانێکی گیانی و مادی نەخوارد، بەلآم لەڕووی مەعنەویەوە زیانی زۆربووەو بۆ یەکێتی نیشتمانیش خراپبووە، بۆچی یەکێتی بەسەر ئێوەدا بازیدا و پاسداری بردە کۆیە؟**

**عەبدوڵلای موهتەدی:** وەڵلا نازانم، بەلآم ئەوەندە دەزانم ئەو کارەی کەیەکێتی کردی، کارێکی هەڵەبوو، ئێمە وەختی خۆیش پێمان وتون، خۆشیان دیارە لێکدانەوەی خۆیان دا بەو ئەنجامە گەیشتن کەکارێکی هەڵەیە، نەدەبوایە ئەو کارەبکەن، بەتایبەتی ئەوان کەساڵەهای ساڵە ئێمەش و حزبی دیموکرات هەموو ئەوانەیان ، داڵدە دابوو، پشتگیریان کردبووین، لەم وڵاتەدا دەژیاین، چاکەیان زۆربووە، حەیف بوو بەو کارە لێلیبکەن و خراپیبکەن.

***بەبۆچوونی تۆ بۆ کردیان؟**

**عەبدوڵلای موهتەدی:** فشاری ئێران بوو!!



# دیموکرات زۆر پارمەتی دەدرێن لەلایەن یەکێتیەوە

***هەڵە لەژێر فشاردا دەتوانی پاساوی بۆ بێنیتەوە؟**

عەبدوڵای موهتەدی: بەڵام پێم هەڵەیەکی سیاسی بوو، حەیف بوو نەدەبوو ئەو کارەبکەن.

***هەر ئەوەش وادەکات پەیوەندیەکانی نێوان حزبی دیموکرات و یەکێتی تاڕادەیەکی زۆر تێکبچێت و دواجار ئەو ئینشیقاقەشی لێبکەوێتەوە؟**

عەبدوڵای موهتەدی: وەڵڵاهی نازانم ئینشیقاقەکە چەندە بەوەوە پەیوەست بێت، رەنگ بگەڕێتەوە سەرناکۆکییەکانی ناوخۆیان، بێجگە لەوە من دوژمنایەتی نابینم، دیارە ساردیو سڕیو ناکۆکی هاتە نێوان، بەڵام دوایی ئاشتیش بوونەوە، زۆریش یارمەتی دراون لەلایەن یەکێتیەوە.

***برایمی عەلیزادە دەڵێت"هێنانی پاسدارانی ئێران بۆ کۆیە، ئێران هێزە ئەوەندەی مەبەستی شکاندنی سومعەی یەکێتی بوو ئەوەندە مەبەستی لێدان دیموکرات نەبوو"؟**

عەبدوڵای موهتەدی: ئەوە بەڕاستی نازانم، بەهەر حاڵ بەقازانجی ئێران تەواوبوو، یەکێتی لەو کارەدا قازانجی نەکرد، هەڵەیەك بوو کردی.

***چەند پێشمەرگەی حزبی دیموکرات ئێران لەلایەن حزب اللەی شۆڕشگێڕی کورد، کاتی خۆی تەسلیمی کۆماری ئیسلامی ئێران کرانەوە، کەرێبەرەکەی ئەدهەم بارزانییە ئێستا ئەندامی پەرلەمانی کوردستانی عیراقە؟ مەبەستم ئەوەیە ئێوە بۆ دووبارە نەبوونەوەی ئەو سیناریۆیانە نەچوونە ژێر دەسەڵاتی پارتی؟ یان بەحوکمی ئەو باکگراوندە مێژوییەی مەترسیدارەی کەئێوەو پارتی هەتانبووە؟ تائێستا نەتانتوانیوە بارەگاکانتان بەرنە ناو ئیداری پارتیو هەولێر؟**

عەبدوڵای موهتەدی: یەکەم ئەوەیە ناوچەی پارتی پێش هەموو شتێك لەناوچەی ئێران دوورتربوو، ئێمە دەمانویست هەتا بتوانرێت مقەرو بارەگاکانمان لەسنووری ئێران نزیکتر بێت، سروشتی بوو کەبمانەوێت لەم بەشە لەهەرێمی کوردستان بین کەنزیکەو سنوری ئێرانە، ئێمە بێجگە لەهێزی پێشمەرگە، ڕێکخستنی زۆر، دۆستی زۆر، خەڵکی زۆر خانەوادەی زۆر دۆستو ئاشنا سەردانمان دەکەن و پەیوەندیمان پێوە دەکەن ، ئێمە خۆ ڕێکخستن ناکەین لەکوردستانی عیراق، مانەوەمان لێرە بەمەبەستی کارکردنە لەگەڵ کوردستانی ئێراندا، بۆیە تا لەوان نزیکتربواین باشتربوو، ئەمە هۆکارێکی گەورەبوو، دیارە باکگراوندی دۆستایەتیمان لەگەڵ یەکێتی کاریگەری خۆی هەبوو، بەڵام

پێخۆشە ئەوە بزانێت ئێستا دە ساڵ زیاترە هەوڵمانداوە بۆ خۆشکردنی پەیوەندیمان لەگەڵ پارتی تارادەیەکی زۆریش تێیدا سەرکەوتووین لەلایەن ئەوانیشەوە ئیستیجابە دەبیین هیچ گرفتێک لەنێوانماندا نەماوە.

## قیادە مۆقتە شەڕی کوردی ئێرانی کرد

---

***بەڵام وەکو باسمکرد باگگراوندێکی مێژوویی ناخۆشتان هەیە ساڵی (1980) پارتی (قیادە موەقەتە) بەهاوکاری کۆماری ئیسلامی ئێران شەڕی ئێوەو حزبی دیموکراتی دەکرد، ئەوە تائێستا ماوە؟**

عەبدوڵلای موهتەدی: نەخێر نەماوە، ئێمە لەدانیشتەکانماندا؟، چەندەها دانیشتمانکردوە، لەئاستی جۆربەجۆردا هەردوولامان بەو قەناعەتە گەیشتووین، کەدەبێت لاپەڕەیەکی نوێ لەنێوان خۆماندا هەڵبدەینەوە هیچ گرفتێك لەنێوان خۆماندا نەهێڵین.

***باشە ئەو کاتە بۆچی پارتی (قیادە موقەتە) بەهاوکاری ئێران شەڕی ئێوەی دەکرد؟**

عەبدوڵلای موهتەدی: لەئێران بوون لەژێر کاریگەری ئێراندا بوون.

***خۆ یەکێتی نیشتمانی لەئێران بوو، بەڵام دۆستی ئێوە بوو، لەبەرەکانی ئێوەدا شەڕیدەکرد؟**

عەبدوڵلای موهتەدی: چوو زانم، دەبێت لەخۆیان بپرسی، بزانی مێژووی خۆیان چۆن ڕووندەکەنەوە، من ئەوەشم هەرپێ هەڵەیە، هەروەکو چۆن هەندێك سیاسەتی یەکیەتیم پێ هەڵەبوو، ئەوەی پارتیشم پێ هەڵەبووە.

## زۆرتر گرفتی پارتی لەگەڵ دیموکرات بووە تا کۆمەڵە

---

***پەیوەندیەکانی ئێوە لەیەکێتی نزیکترە، پەیوەندیەکانی دیموکراتیش لە پارتی نزیکترە، ئەوە ڕاستە؟**

عەبدوڵلای موهتەدی: باپێتان بڵێم گرفتی سەرەکی پارتی لەگەڵ حزبی دیموکرات بوو نەك لەگەڵ ئێمە، هەم لەزەمانی شۆڕشی ئەیلولەوە هەم دواترین کێشەی سەرەکیان لەگەڵ ئەوان بوو، تێکهەڵچوونێکیشیان ئەگەر هەبوو بێ زۆرتر لەگەڵ ئەوان بووە، یەك بابەتی بووە فەقەت ئەوەش ئێمە



نەبووین تەقەمانکردبێت لەپارتی، بێجگە لەوە ئەگەر شتێکی وابووبێت، ئەوە هی رابردوو ئێمە ئێستا نێوانمان زۆر خۆشە لەگەڵ پارتی، زۆربەوە دڵخۆشبووین، هەشین، ئێستا کەئەو یەکگرتنەوەو نزیکی نێوان پارتیو یەکێتی قازانجی هەموو کەسێکی تێدایە هی ئێمەشی تێدایە.

***لەکوردستانی عیراق، ئێوە هەست بەمەترسی ناکەن؟**

**عەبدوڵلاّی موهتەدی:** مەترسیو کاری خراپکارانەو تیرۆریستی ئێران هەرگیز لانەچووە بەتەواوەتی، تەنانەت لەو دەورەش کەبەعەملی لایانبرد، بەتایبەتی لەسەردەمی ئەحمەدی نەژادو ئاڵۆزبوونی زۆرتری نێوانی ئێران لەگەڵ دنیای دەرەوەدا، ئێمە هەست بەمەترسیەکی زیاتر لەجاران دەکەین، هەرگیز لەئێران دڵنیانین بۆ کاری تیرۆرستیو تەقینەوەو خراپەکاری.

# کۆنگرەی نۆیەمی کۆمەڵە (2000)

# زرگوێز

## جیابوونەوەی عەبدوڵڵای موهتەدی و دروستکردنی کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێران



# جیابوونەوەی عەبدوڵلای موهتەدی و دروستکردنی کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێران

*کۆنگرەی نۆ لەگەلاوێژی (1379) نوتی ساڵی (2000) لەئۆردگای زرگوێز لەشاری سلێمانی لە کوردستانی عیراق بەڕێوەدەچێت، ئێوە بەشداری ئەو کۆنگرەیە ناکەن، پێیتانوایە ئێوە وردە وردە کێشەکانتان زیادبووە، بەو بەڵگەیەی ئێوە نارازین لەحزبی کۆمۆنیست، کەئێوە پێش کۆنگرەش بەنیازبوون جیاببنەوە، داواشتانکردووە کەحزب ببێت بەدوو پارچەوە، لەکاتێکدا حزبی کۆمۆنیست پێیوایە لە (20٪)ی نوێنەرایەتی کۆنگرەتانکردوو، نەچوونەتە ژێر ئەو داوایەی ئێوەوە، داواتانکردووە کۆمیتەی ناوەندی بەتەوافق بێتو پەنجا بە پەنجا بێت، ئەوەشیان قبوڵنەکرد، بەشێکی تریش دەخەنەوە ملی تۆ کەگوایە تۆ لەکۆنگرەی حەوتەدا هەڵنەبژێردراویتەوە بەسکرتێری حزبی کۆمۆنیست، لەکۆنگرەی هەشت نارازی بووی، لەکۆنگرەی نۆشدا ئەو بەرنامەیەی کەهەتبووە، بۆ دروستکردنی حزبێکی تازە جێبەجێبکەیت، سەرەتا باسی ئەو کۆنگرەیەو باسی ئەوا کێشانە تاچەند ئەوە راستە کەتۆ مادام هەڵنەبژێردراویتەوە بەسکرتێری حزبی کۆمۆنیستو لێپێچینەوەت لەگەڵ کراوە، تۆ هەوڵی ئەوەبدەیت خۆت دەرباز بکەیت، حیزبێکی قەومی دروستبکەیت؟

عەبدوڵلای موهتەدی: ئەوەڵا ئەو شتانە بەو شێوەیە نییە، باپێت بڵێم، ئەو کۆنگرەیەی کەجەنابت دەڵێ کۆنگرەی حەوتی حزبی کۆمۆنیستی ئێرانە؛ کەبریتییە لەفیبری وەری مانگی (2000/2) جیاوازی هەیە لەگەڵ کۆنگرەی حەوتی کۆمەڵە، کەباسمانکرد.

## خۆم کاندیدکرد و بەپلان دەنگیان پێ نەدام

*کۆنگرەی حەوتی حزبی کۆمۆنیست؟

عەبدوڵلای موهتەدی: مەبەستم ئەوەبوو مێژووەکە رۆشنبکەم، یەکەمینیان، باشتەکانت یەکەیەکە بۆ دیاریبکەم، ئایا لە کۆنگرەی شەشی کۆمەڵە من رای جیاوازم دەربڕیوە؟ لەسەر لێکدانەوەکمان، لەسەر دیدو بۆ چوونمان، لەسەر کوردو مەسەلەی بزوتنەوەی کوردستانی، یان سەید برایم شاهیدە، ئایا نووسراوەکانی ئەو سەردەمەش کەمن تەنانەت بۆ ماوەیەك هەستم بەنزیکی لەگەڵ کۆمۆنیزمی کاریگەریکردوە، کە سەید برایم بۆ خۆشی دەیکرد، منیش وەکو خەڵکی کردوە بۆ ماوەیەك.



ئایا لەراپەڕینی کوردستانی عیراقدا من لەسەر مەسەلەی راپەڕین و لەسەر مەسەلەی کورد بەتەواوی تەقینەوەیەك سازنەبووە لەنێوان خەتی مەنسوری حکیمەت و ئەوانەدا، ئایا لەکۆنگرەی هەشتی کۆمەڵە لەساڵی (1995) کەباستکرد لەوێدا دوو خەت و بۆچوونی جیاوازنەبووە، من دەڵێم کاکە گیان تاساڵی (2000) و تامانگی دووی (2000) هەڵبژاردنەوەو هەڵنەبژاردنەوەی من زۆری ماوە، پیشانیدەدا کە من هێڵە سیاسیەکەم جیاواز بوو قسەم لێکردوە، لەسەرم نووسیوە، سیمینارم لەسەرداوە، باسمکردوە، ئەوانە هەموو بەڵگەن، وانەبووە کەلەپڕدا ئەوان لەکۆنگرەیەك من هەڵنەبژێرنەوە لەفێبرواری ساڵی (2000) دا، ئیتر من تەصمیم بگرم ، بەو شەش حەوت مانگە فکرەیەك بکەمەوە جیاواز بێت، ناوانییە.

بەڵگەکان هەموو نیشاندەدەن جیاوازییە فکریەکانمان بووە، تەنانەت ئەم کۆنگرەی حەوتی حزبی کۆمۆنیستە، لەکۆنگرەی شەش هی حزبی کۆمۆنیست کەدوو ساڵ پێش ئەوەبوو، من بەتەفەسیل هەموو بەڵگەکانم هەیە، بەڵگەکان بەدەست منەوە نەماوە، بەدەست سەید برایم و برادەرانی حزبی کۆمۆنیست خۆیانەوە، ئەوانە نیشاندەدات کەمن بەتەفسیل جیاوازیەکان لەبواری مەسەلەی نەتەوەیی و لەبواری مەسەلەی کوردی و دەورونە خشی کۆمەڵە، لەبزوتنەوەو ئێمە دەبێت چیبکەین؟ دەبێت سیاسەتمان چۆن بێت، جیاوازیەکی تەواومان هەیە، جیاوازیەکانم نیشانداوە، تۆمارکردوە، کەوابێ چ حەق بەسەر ئەوە هەیە کۆنگرەی حەوت حزبی کۆمۆنیست ساڵی (2000) هەڵدەبژێردرێمەوە، ئەمە لایەکی، دووهەمینیان ئەوەیە باشە لەو کۆنگرەیە ئایا سەید برایم و برادەرانی حزبی کۆمۆنیست شاهیدیم بۆ نادەن، کەمن زۆرم داواکرد، وتم کاکە من کاندیدنیم، من جیاوازی فکریم هەیە بۆ من دەبەنە ناو کۆمیتەی مەرکەزییەوە؟ سکرتێر هەرنا، بۆچوونە ناو کۆمیتەی مەرکەزی حزبی کۆمۆنیستەوە، وتم کاکە من جیاوازی فکریم هەیە، جیاوازییە فکریەکانم، لەپێشدا هەتا لەکۆنگرەی حەوتەکەشدا باسکرد، چونکە خۆت دەزانێ لەپێشدا لەکۆنگرە باسە سیاسیەکان دەکرێت، پاشان لەکۆتایدا دەچنە سەر هەڵبژارد.

خۆمن جیاوازییە سیاسیەکانم لەهەمان کۆنگرەی حەوتدا باسکرد، سەید برایم لەلایەکەوە قسەیکردوە، من لەلایەکەوە بەتەفسیلی قسەمکردوە، کاکە خۆ هەڵبژاردنێك لەگۆڕیدا نەبووە، من چوو زانم دەنگ دێنمەوە، یان نایهێنمەوە هەر لەسەر بنەمای ئەم جیاوازییە فیکریی و سیاسیانە لەسەر بنەمای ئەم ناکۆکیانە کەهاتبوونە ئاراوە، من زۆر سووربووم وتومە کاکە من کاندید نیم بۆ کۆمیتەی مەرکەزی حزبی کۆمۆنیستی ئێران، من فکری جیاوازم هەیە، بۆ بێمە ناو رەهبەریەتەوە. من بەس مۆڵەتی نووسینم پێبدەن هیچی ترم ناوێت، لەئێوە، هەموو خەڵکەکە بیست و چوار کاتژمێر کۆنگرەیان رانەگرت؟! سورنەبوون زۆریان نەکرد، وتیان حەتمەن دەبێت تۆ بێیت، ئەمە بۆ پاراستنی ڕێزەکانمان باشەو چۆن تۆ نەبێ ناکرێ و نابێ، من چوومە پشت مەیکرۆفۆن، لەکۆنگرەی حەوتی



حزبی کۆمۆنیست وتم: کاکە بەراستی دەتانەوێت بیٚم، من بۆ خۆم نامەوێت بیٚم، خوازیار نیم، تکام ئەوەیە لیٚم گەڕێن نایەم، بەڕاستی دەتانەوێت بیٚم، بۆیە زۆرم لێدەکەن؟ یا دەتانەوێت من خۆم کاندید بکەمو ئێوەش دەنگم نەدەنێ بۆ سووککردن، ئەگەر بۆ سووککردنە، خۆشی چییە؟ ئەمە بۆ بکەینە کێشەیەکی تر لەناو خۆماندا؟ داواتان لێدەکەم لەکۆڵم ببنەوە، وتیان " نا،کاکە شتی وانییە، تکات لێدەکەین چۆن شتی وا دەبێ"

وتم" دەی باشە من لەبەر دڵی ئێوە خۆم کاندید دەکەم" خۆم کاندید کردو دەنگیان نەدامێ، دیارە من دوو دەنگم لەکاك سەید برایم کەمتر هێناوە، بەڵام بەهەر حاڵ نەگەیشت بەحەدی نیساب، لەبەرئەوە ئاوانەبوو، کەوابوو هەموو پێشینە سیاسیەکە هەبوو، بەڵام خودی دەنگنەدانەکە بەمنیش کارێکی ناشیرینو ناهاوڕێیانە بوو، خۆ من تکام دەکرد، لەکۆڵم ببنەوە نەیکەم، دوایش هەستم پێکردبوو مەبەستێکیان هەیەو پلانێك هەیە، ئەوەشیان پێمکرد کارێکی زۆر ناهاوڕێیانەو ناشیرین بوو لەئەخلاقی سیاسیو حزبی بەدووربوو ئەو کارە، بەڵام بەهەموو ئەوانەشەوە ئەوەڵڵا ئەوە کاریگەری نەبوو، ئەو فکرانە کەلەوە پێش باسمکرد لەجۆرەها سیمنیار باسکراوە، لەسەریم نووسیوە.

***بۆ لەکۆنگرەی نۆدا داوا دەکەن پە نجا بە پە نجا بێت؟**

عەبدوڵای موهتەدی: نا پەنجا بەپەنجا نەبوو، ئەوە چەند جاریان باسکردووە داوامانکرد بوو بەقەدیەك بێت، ئەو وەختی ئەم هاوڕێیانەی کەئێستا فراکسۆنیان پێکهێناوە، عاقیبەتیش ئەم ڕۆژانە هاتنە دەرەوە یادەرکران مەبەست ساعیدی وەتندۆست، مینەی حیسامی ئەوانە، ئەمانە ئەو وەختە ناوبژی کەربوون لەنێوان خەتی ئێمەوا خەتی سەید برایم، ئێمە قسەمان ئەوەبوو، ژمارەیەك لەئێمە بێت، ژمارەیەك لەئەوان بێت، ژمارەیەك لەو خەڵکەی بێلایەن بن، بەڵێ ڕاستە ئێمە دەمانگوت ئێمەو ئەو لایەنەی کەخوازیاری کۆمەڵەبوونو خوازیاری ساغبوونەوەی کۆمەڵە بوون دەمانگوت ئێمەمە بەشەکەمان یەکسان بێت لەگەڵ کاك سەید برایمدا، مەرج نەبوو پەنجا بەپەنجا بێت، ئێمە (30) بووین ئەوانیش (30) بوون ناوبژیکەرەکانیش (40) یان، ئێمە (40) ئەوان (40) ناوبژیکەر (20) بەهەر حاڵ دەمانوویست لەهەر سێ جۆرەکە پێکبهێنینی.

نەشماندەگوت تائەبەدوا بێت، چونکە بۆ خۆم دەزانم حزب ئاوا ئیدارەناکەن باوەڕم بەو جۆرە حزبە نییە، حزب دەبێت لەکۆتاییدا خەتێکی هاوبەشی هەبێت، خەتێکی دیاریکراو دەنگ پێدراوی هەبێت، بەس بۆیەك دەورە کەباسەکانمان بچێتە پێشەوە، بۆیەك دەورەکە دەورەیەکی دیالۆگی چەند مانگە دابنێین، تابتوانین بەتێرو تەسەلی بەبێ شتی شەخسیو بەبێ قسەی ناشیرین، ڕێك لەسەر شتە فکریو سیاسیەکان بتوانین باسو قسەکانمان بکەین، بۆ دەورەیەکی دیاریکراو، ئەوەڵەن پێموابوو

کۆنگرە نەگرین دوای بخەین شەش مانگ، ئەگەر هەر دوای ناخەیەن بۆ دەورەیەکی دیاریکراو ئێمە ئەو حاڵەتەیان لێ قبوڵنەکردین، ئێمەش نەچووینە ناو کۆنگرە.

***چۆن گەلاڵە بوو، تۆ و ئەوانەی بۆ چوونەکانیان جیاواز بوو، چۆن دەستان بەوەکرد کە ئیتر چارەسەر نەماوە لەگەڵ حزبی کۆمۆنیست، پێویستە وردە وردە پاشەکشێ بکەن و جیا ببنەوە، بۆیەش نەچوونە کۆنگرەوە؟**

**عەبدوڵلای موهتەدی:** ئێمە یەککرتنەکەمان یەکگرتنێکی شەخسیو لەرێگای ویتە ویت وقسەی بن دیواران نەبوو، بەپێچەوانە لەلایەك یەکگرتنێکی سیاسیو نەزەری بوو، ئێمە لەرێگەی چەندین سیمیناری جیاوازەوە، قسە فکریو سیاسیەکانم دەکرد، شتی تەشکیلاتی کێبەکێ بێ ئەوانە بەراستی لەناو ئێمەدا نەبوو. بەدڵو گیان کارمان دەکرد، ئێمە گرفتی کارکردنمان نەبوو، نەگرفتی بێ دسپلینیمان هەبوو، نەگرفتی تێکدەریمان هەبوو، زۆر زۆر تەباو عالو سال بووین لەگەڵ حزبەکەمان، بەلام بەخەتی سیاسی جیاواز بووین، ئێمە هەر ئەوەشمان باسدەکرد، نووسینی زۆریشمان لەسەرکرد، من خۆم یەکێك لەوانە بوو دەتوانم بڵێم نزیکەی چوار کتێبم لەسەر نووسیوە لەگۆڤاری (افق سیالیزم) بەئەندازەی چوار کتێبم لەسەر حزبی کۆمۆنیستو روانگەکانیو دیدو بۆچوونەکانیو پێداچوونەوە ئەوانەو رەخنەگرتن لەوانە کە نووسیومن، زۆرتر ئەوانە وایکرد ئێمە یەکبگرین، ئێمە یەکگرتنەکەمان ناڵێم سەدی سەد، بەلام لەبەشی هەرە زۆری خۆیدا یەکگرتنێکی فکری، سیاسی بوو.

# باوەڕم بەتەکەتوول و فراکسیۆن نییە

***گرنگترین خاڵەکانی کەئێوەی کۆکردبووە چی بوو؟**

**عەبدوڵلای موهتەدی:** یەکەم، پێمانوابوو، بنەمای دروستکردنی حزبی کۆمۆنیستی ئێرانو ئەزموونی حزبی کۆمۆنیستی ئێران پێویستی بەپێداچوونەوەو چاو پیاخشاندنەوەیەکی رەخنەگرانە هەیە، پێمانوابوو ئەو ئەزموونە سەرەڕای نیەتی پاکی ئێمە، سەرەڕای شۆڕشگێڕ بوونو فیداکاربوونو ئەوەی کە ئێمە هیچ مەبەستێکی خراپمان نەبوو لەدروستکردنی حزبی کۆمۆنیستدا، بەراستی دەمانویست خزمەت بکەینو، ئەوە رێگایەکی باشترە، بۆ خزمەت قسەلەسەر نیەتەکان نەبوو هەموو نیەتەکانی ئێمەو نموونەی ئێمە کەلە کۆمەڵەوە چووبووین پاکبووین، بەلام ئەزموونەکە پێمانوابوو ئەزمونێکی سەرنەکەوتووە، دەبێت پێداچوونەوەیەکی بناغەی تێدا بکرێت، ئەمەیەك.



*دواتر؟

عەبدوڵڵای موهتەدی: هەروەها وابوو دەبێت جارێکی تر کۆمەڵە، زیندووبکەینەوەو جارێکی تر لەسەر بناغەی کۆمەڵـە کاربکـەین، دووهـەمیان ئـەوەبوو پێمـانوابوو، دیـدو روانگـەو بۆچـوونی سیاسـەتێك کەلەسەرەتاشەوە وانەبوو، بەڵام پاش ماوەیەك حزبی کۆمۆنیستی ئێران لەسەر مەسەلەی نەتەوەیی گرتویەتەبەر سیاسەتێکی هەڵەیە، بۆیە ئەوەش دەبێت پێداچوونەوەیەکی بناغەیی بکەین و بچینەوە سەر ئەو سیاسەتەی کەوەختی خۆی کۆمەڵە پێش دروستبوونی حزبی کۆمۆنیست ئێران گرتوویەتی، چونکە سیاسـەتی کۆمەڵـە پـێش حزبـی کۆمۆنیست ئێـران نـەك هـەر ڕەتکردنـەوەی مەسـەلەی میللـی و نامۆیکردن و بێزوو بۆکردن لەمەسەلەی کورد نەبوون.

بـەڵکو خۆمـان لەهـەموو کـەس بـەکوردتر دەزانـی، خـەبات و تێکۆشـانێکی گـەورەشمان بـۆ دەکـرد، بـۆ مەسـەلەی نەتـەوەیی و سیاسـەتمان لـەو بارەیـەوە بزوتنـەوەی ڕزگاریخوازانـەی گـەلی کـوردەو دەورو نەخشـی کۆمەڵـە لـەوەدا پێمـانوابوو، دەبـێ پێداچـوونەوەیەکی بناغـەیی بکـەین، پێمـانوابوو زۆرێـك لەسیاسەتەکانی حزبی کۆمۆنیستیش، لەبواری بزوتنـەوە جەماوەرییەکان و ڕێکخراوە جەماوەرییەکان، سیاسـەتێکی هەڵەیـە، سێکتاریستی و سیاسـەتێکە نەلەبەرژەوەنـدی کرێکـاران و زەحمەتکێشـاندایە، نـەهیچ کـام لەوانەدایـە، خـاڵێکی تـری پێداچـوونەوەمان ئـەوەبوو کـەحزبی کۆمۆنیسـتی ئێـران لـەم ساڵانەی دوایـدا لـەژێر کاریگـەری بیروبـاوەڕی مەنسـوری حیکمـەت بـڕوای بەدیموکراسـی و خـەبات بـۆ دیموکراسـی نـەبوو، ئـەوەی بـەبێ بایـەخ دەزانـی، ئێمـە پێمـانوابوو، ئێسـتاش پێمانوایـە، لـەئێران دیموکراسـی مەسـەلەی ئەسـڵیە، هـەر شـۆڕش و ڕاپـەڕینێك و گۆڕانێـك لەئێرانـدا بکرێـت لـەدەوری ئـەو تەورەیە دەکرێت، ئەمەش یەکێك لەشتەکانمان بوو.

بۆیە ئەزموونی حزبی کۆمۆنیست، مەسەلەی نەتەوەیەتی، مەسەلەی دیموکراسی، مەسەلەی ناسینی ئاڵوگۆڕە نوێیـەکانی دنیـا و خـۆ لەگـەڵ گونجانـدنیان، ناسـینی ئـاڵوگۆڕە ناوخۆییـەکانی ئێـران و خـۆ لەگـەڵ گونجانـدنیان، مەسـەلەی بزوتنـەوە کۆمەڵایەتیـەکان و خـۆ لەگـەڵ گونجانـدنیان، زۆرێـك لەسیاسەتەکانی حزبی کۆمۆنیست، بەرنامەکەمان، ئەساسنامەو پەیڕەوی ناوخۆمان، هەمووی ئەوانە ئێمـە پێمـانوابوو پێداچـوونەوەی پێـدابکرێت، بەشـێکی زۆری ئەوانـە لەکۆمـەڵێك سـیمیناری وردو نووسیندا هـاتبوو، گرفـت ئـەوەبوو، بەداخـەوە، حزبـی کۆمۆنیسـت ئێـران نەیهێشـت ئـەو باسـانە جێـی خۆی بگرێت، وەهابوو بەتەپ و تۆزو شتی شەخسـی ئـا لـەو جـۆرە شـتانەی کەجەنابیشـت پرسـیارتکرد وەکـو ئـەوەی وتیویانـە ئـەوە هـەموو عەبـدوڵڵایان هەڵنەبـژاردوو، بۆیـە ئـەو هەرایـەی سـازکردو شـتەکە خەوشی هەڵگرت.

بۆیـە پێمـانوابوو کەئێمـە چـەند مانگێکمـان پێویسـتە، بـەبێ کێشـەو گێـرەی شەخسـی، بـەبێ شـتی تەشـکیلاتیش، کارمـان بەوانـە نـەبوو، بـەڵام ڕێگـای دیـالۆگێکی چـەند مانگـە بهێڵینـەوە، من پێموایـە



حزبی کۆمۆنیست لەو دیالۆگە چەند مانگە ترسا، دەنا خۆ ئێمەش دەمانزانی حزب هەردەبێت ساغ بێتەوە، من باوەڕم بەحزبێکی قوڵو قوڵو تەکەتولو فراکسیۆنی نییە، بەڕاستی ئەو وەختەش هەر بڕوام پێ نەبووە، بەڵام کەکێشەیەکی فکریو سیاسی هاتە پێشەوە، دەبێت قسەی لێبکەیت، تابەلایەکیدادەخەیت، ئەوەندەمان کات دەویست پێموایە هاوڕێیانی حزبی کۆمۆنیست لەدیالۆگدا سەرناکەون، بۆیە دەستیانکرد بەکێشە.

## جیابوونەوەمان لەحزبی کۆمۆنیست زۆر پرشنگدارە

***باشە نەدەکرا ئێوە لەناو حزبی کۆمۆنیست بمێننەوەو خۆتان ئاڵوگۆڕ لەناو سەرکردایەتی پێکبهێننو ئەو کاتە ناوەکەشتیان بگۆڕیایە؟**

**عەبدوڵای موهتەدی:** نەخێر، نەماندەتوانی، نەیاندەهێشت، چونکە هەروەکو ئەزموونی دواتر فراکسیۆنیشیان نەهێشت، بەڵام ئەوان بەو تەمایە لەگەڵ ئێمە نەهاتنە پێش، ساعیدی وەتەندۆستو مینەی حسامیو هەندێك لەهاوڕێیانی دیکە، خەتی فکری هێندە دوو نەبوون لەئێمە، پێیانوابوو ئەگەر لەناو حزبی کۆمۆنیستدا بمێنینەوە، پێکەوە کاربکەین، ڕەنگە سەرەنجام بتوانین زاڵبین تێدا، ئێمە بەپێچەوانەوە، پێمانوابوو ئەو کارە ناکرێت من پێم خۆشبوو هەموو پێکەوە بواین، ئەوە زەرەر بوو هەموو پێکەوە نەبونین، خەتای ئێمەش نەبوو، ئێمە ئەوەندەمان دەسەڵات هەبوو، بەڵام جیابوونەوەمان لەحزبی کۆمۆنیست، خاڵێکی زۆر پرشنگدار دەبینم لەپەروەردەی سیاسی خۆماندا.

***باشە وایە سەید براییم عەلیزادە، دەڵێت "ئەوان ئەو کاتە سەدی بیست بوون"؟**

**عەبدوڵای موهتەدی:** ناوەڵا وانییە، هەرچەند زۆریش مافیان خواردین، لەسەتی پەنجا کەمتر بووین لەژمارەی ئەندامانو لەکۆنگرەدا بەهیچ جۆرێك وانییە.

## زۆربەی کوڕو کچە پێشمەرگە چاکەکان لەگەڵ ئێمە کەوتن

***چۆن دەستانکردوبەتەدارەك سازیو پێکهێنانی حزبی نوێ؟ چۆن بوو دوای ئەوەی ئێوە ئیمکانیاتتان نەبوو؟**

**عەبدوڵای موهتەدی:** دەزانی چیمان هەبوو؟ ئەوەی ئێمەبوومان نەك حزبی کۆمۆنیست بەداخەوە ئێستاش هەیەتی، ئەو ئینسیجامە کەئێمە ڕێبازێکی سیاسیمان بوو، چەندین ساڵ ئەوەندەمان

قسەکردبوو، ئەوەندەمان باسکردبوو، ئەوەندەمان سمینارگرتبوو لەسەر نووسینمان لەسەریکردبوو، خۆمان فۆرمەلە کردبوو، بۆیە ئێمە کۆمەڵێك رەهبەری و کادری هاوخەت و هاو فکرو ساغمان هەبوو کەئامادەبوون بۆ هەموو سەختیەك بۆ هەموو قوربانییەك، کەئیمانمان هێنابوو کەئەو رێبازە دروستە، سەرنجام کۆمەڵە ئاوا دەبوژێتەوە. ئەوە پێموایە گەورەترین سەرمایەی ئێمەیە، لەنێوان ئەو هاورێیانەی لەکوردستان و لەناو هێزی پێشمەرگەدا کادری زۆر چاکمان هەبوو بەراستی زۆرتری کورە چاکەکان و کچە چاکەکان لەگەڵ ئێمە هاتن، ئەو بۆ خۆشیان برادەرانی حزبی کۆمۆنیست دەزانن.

# لەداهاتوو دەردەکەوێ کێ لەسەر هەق بوو

***بۆ ئەوەی مانەوە خراپبوون؟**

**عەبدوڵای موهتەدی:** نا، نالێم خراپبوون، بەلام هەرە گەش و هەرە بەکارو بیروباوەڕو هەرەدەیسپلینەکان نەبوون، یەك زەرەش بۆ ئاگاداریت ئێمە تەشکیلاتی حزبی کۆمۆنیستمان نەشێواند، ئێمە زۆر مەسئول بووین، ئەوانەی هەندێك لەرادیۆ کاریاندەکرد لەرادیۆی دەنگی شۆڕشی ئێران، بۆ نیوەڕۆ بەرنامەکانی دەنگی شۆڕشی ئێرانیان تۆمارکرد، پاشان هاتن بەم دیودا، تا ئاخر کاتژمێر نیگاهبانی خۆیان داوە، هەموو کارێکمان بەرێکوپێکی ئەنجامدا، تێکدەر نەبووین تەشکیلاتمان نەشێواندو زۆر جێی شانازیشە کەئاوامان کارکرد، تا ئاخر دەقەو ئاخر کاتژمێر بەدیسپلین ترین کەس بووین، ئەو کەسانەی کەلەگەڵ خەتی ئێمە بوون، چونکە ئێمە هەر وائامۆژگاریمان دەکردن، دەمانگوت ئێمە گێرەو کێشەی تەشکیلاتیمان نییە، ئێمە خەتی فکری و سیاسیمان هەیە، ئێمە دەبێت نمونەیی بین لەناو حزبەکەدا.

***هەموو ئەو حزبانەی کەجیابوونەوە هەمیشە وا دەڵێن، عومەری ئێلخانیزادە هەمان قسەی تۆ دەکات، دەڵێت "ئێمە خەتی فکریمان جیاوازترە لەگەڵ عەبدوڵای موهتەدی " عەبدوڵا دلێر وا دەڵێت " سەعیدو، مینەی حسامی، بەهەمانشێوە، واتا پێتوایە ئەمە پاساو دانێکە بۆ ئەم جیابوونەوانە، یان رەنگە ئەوەی تۆ هەندێکی راست بێت و هەندێکی ناڕاست نەبێت؟**

**عەبدوڵای موهتەدی:** خۆتان قەزاوەت بکەن، بزانن کێ راستەو کێ راست نییە! نووسەرێکی فەرەنسی ناوەکەیم لەبیرنایەتەوە دەڵێت "زۆرێك لەو تاوانانەی لەدنیادا کراوە بەناوی ئازادییەوە کراوە" لەبەر ئەوە هەق بەجەنابت دەدەم، کەگومان بکەی لەقسەکانی مندا بڵێیت "بابە من ئەو جۆرە قسانەشم پێشتر بیستووە"، بەلام ئەوەی ئێمە راستە، ئەوەی تۆش وتت راستە، ئایا چۆن دەتوانم

وەکو تۆ تاپۆژی خۆی بەخوێنەری بسەلمێنم، ئاسان نییە، بۆ کەسێك لەنزیکەوە نەبووبێ ئاسان نییە، بەڵام پێموایە دەرك دەکرێت، پێموانییە ئەو راستیانە هەر دەردەکەوێ.

***یەکێك لەو بەرپرسانەی حزبی دیموکرات ئێستا ئەندامی مەکتەبی سیاسیە، باس لەوەدەکات کەجیابوونەوەکانی کۆمەڵە شەریفانەترو مۆدێرنانەترو دیموکراسیانەتربوو، تا جیابوونەوەکانی ئێمە، تۆ ئەوە بەئیمتیاز بۆ خۆت دەزانی؟**

عەبدوڵای موهتەدی: بەڵێ، ئەو نەختەش کەتۆزی ئاڵۆزی بوو خۆشبەختانە هیچ شتێکی خراپ رووی نەدا، بەڵام ئەو نەختە ئاڵۆزیو شتە شەخسیەش بوو، تاوانەکەی بەهی خۆمانو بەهی خۆم نازانم، بەڵگەشم بۆ ئەوە، ئەوەیە، یەك تاقە نووسراوە، یەك تاقە وتار بهێنە، کەمن شتێکی شەخسی، کەجۆرێك سوکایەتی بەکاك سەید برایم بێ کردبێ، لەم دەساڵەدا.

## پێیان وتین، لەگەڵ خاتەمی و ئیتلاعات کۆبوونەوە و درۆش بوو

***ئەوان کردویانە؟**

عەبدوڵای موهتەدی: دەیان....... ئایا ئەوە بەڵگەنین، تۆ شتێکی من بهێنە لەسەر ئەوان، شتێکم وتبێت، بەڵام یەکیان دەڵێ لەگەڵ خاتەمی کۆبوونەوە، لەگەڵ ئیعلاعات کۆبوونەوە.

***لەگەڵ ئیتلاعات کۆبوونەوە، پارەی زیادەتان لەیەکێتی وەرگرتووە، پارەتان شاردۆتەوە؟**

عەبدوڵای موهتەدی: ئەنواعی شتی وا دەڵێن، ئەو شتانەی دەیڵێن سەدی نەوەدو نۆی ناڕاستە، هەمووش شتی شەخسیە جوابێکی سیاسی نییە.

***ئاسایی نییە ئەگەر دوو حزب بکەونە ململانێوە ئەو شتانە بۆ یەکتری دروستبکرێت؟**

عەبدوڵای موهتەدی: با.

*دیاره پرەنسیپی کۆمەڵەڕێگات پێنادات؟

عەبدوڵڵای موهتەدی: پرەنسیپی کۆمەڵە ڕێگات پێنادات، بەڵام جاری وایە دەکرێت، بەڵام تێبینیبکەن، ئامارەکان وەربگرن، بزانن ئێمە چەند شتی شەخسیمان لەسەر ئەوان وتووە؟ بیەم نایەت، بەڵام ئەوان دانە دانە نووسراوە بەوتاری رادیۆی کەزەبتکراوە هەیە.

## ئارم و ناو و کۆنگرەمان هی ئەوان نییە

---

*باشە ئێوە بۆ بەشداری کۆنگرەی نۆهەمی حزبی کۆمۆنیست ناکەن، کەچی دوای ئەوەی جیانەبنەوە، کەکۆنگرە ئەبەستن هەر ناوی ئەنێن کۆنگرەی نۆی کۆمەڵە، دواجار هەمان ناو، هەمان ئارم دەبەن، بۆ خۆتان، ئەوە مافی ئێوە بوو، لەکاتێکدا حزبی کۆمۆنیست دەڵێن حەق نەبوو، نەناوی کۆمەڵە بەرن، نەکۆنگرەکەیان درێژەی ئێمە بێت، چونکە ئەوان هیچ شتێکیان وەکو ئێمە نەماوە؟

عەبدوڵڵای موهتەدی: جا، با ئەرزت بکەم، یەکەم ئارمەکەمان ئەسڵەن ئارمی ئەوان نییە، ناوەکەشمان وەکو ناوی ئەوان نییە، چونکە ئێمە لەحزبی کۆمۆنیستی ئێران هاتینە دەرەوە، خۆ لەکۆمەڵە نەهاتینەدەرەوە، بەپێچەوانەوە تەواوی پرۆژەی ئێمە زیندووکردنەوەو ساغکردنەوەی کۆمەڵە بووە، لەبەرئەوەی ئەگەر ئەوان ناویان (کۆمەڵەی- شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێران) بوایە، بێگومان ئێمە ئەو ناوەمان نەدەهێنا، بەڵام ناوی ئەوان (ڕێکخراوی کوردستانی- حزبی کۆمۆنیستی ئێران-کۆمەڵە) ئێمە ئەو ناوەمان لەخۆمان نەناوە.

*بەڵام تۆ پێتوانییە کەهەمووتان بەکۆمەڵە دەناسرێن؟

عەبدوڵڵای موهتەدی: بڵێم چی ئەگەر دەستیان لەگەڵ ئێمە بدایەتەوە، عینادو ئینکار نەبوونایە، ئەو دوگمە مەزهەبیانە ئاوا نەبوایە لەمێشکیاندا وانەدەبوو.

## گەر لەگەڵ سەید برایم و حزبی کۆمۆنیست بمابنایەتەوە دەفەوتاین

---

*برایمی عەلیزادە دەڵێت "ئەوان باجێکیان لەئێمە دەویست کەدانی زۆر زەحمەت بوو؟

عەبدوڵڵای موهتەدی: زەحمەتەکە لەفکری ئەوانەدا زەحمەتبوو، ئەگینا بەڕاستی ئەمە ڕێگەی نزیکبوونەوەی ئێمەیە لەکۆمەڵگەی کوردەواری، ئێمە ئەگەر لەگەڵ ئەوان بمابنایەنەوە دەفەوتاین،

پێمان خۆشبوو ئەوانیش لەگەڵ ئێمە بێن، بەڵام کەنەهاتن خۆ ناکرێت ئێمە خۆمان بفەوتێنین لەسەر ئەوان.

***برایمی عەلیزادە دەڵێت "ئێران کێشەکانی ئێمەی تەعقیب نەکرد" پێشموایە ئێران ڕۆڵی هەبوو لەو ئینشیقاقانەی ئێوەدا ناڕاستەوخۆ؟**

**عەبدوڵای موهتەدی:** یانی چۆن.

***یانی لەلایەن هێزی کوردستانی عێراقەوە نەدرابێت، پارە درابێت، ناکۆکیەکانی قوڵکردوەوە، شەخستێك لەناو حزبدا ڕاسپێردرابێت، شتی واهەبووە؟**

**عەبدوڵای موهتەدی:** نەمانزانیوە، ئەگەر بوبێتیش من ئاگادارنیم.

***پێتوانییە ئێران دەستی هەبووبێت لەو ئینشیقاقانەدا؟**

**عەبدوڵای موهتەدی:** ئێران زۆری پێ خۆشبوو، چونکە پێیوابوو کۆمەڵە دەفەوتێنێت، بەڵام دوایی کەزانی ئێمە تا چ ئەندازە، هاتنەدەرەوەی کۆمەڵە لەحزبی کۆمۆنیست کۆمەڵەی بوژاندوەتەوەو بردویەتیە ناو خەڵك و پێشوازیەکی جەماوەری لێکراوە، ئەو وەختە زانی چ هەڵەیەکی کردووە، بۆیە چ زەرەرێکی کردووە، ئەگینا بەهەموو ناکۆکییەکانی ناو حزبەکانی کوردستانی ئێران، دەوڵەتی ئێران پێیخۆشەو ئەگەر بکرێت کاریشی بۆ دەکات، بەڵام من لەبیرم نییە چ کارێکی کردبێ.

# لەسەردەمی خاتەمی بەئاگاداری عەلیزادە سەڵاحی موهتەدی لەگەڵ ئێرانیەکان دانیشتوەو سەید برایم پێی باشبوە و من تەئیدم نەکرد

---

***بۆنموونە ئێران لەسەردەمی خاتەمیدا کەسێکی ڕاسپاردوە کەلەڕێگای ناڕاستەوخۆوە هەوڵی بینینی ئێوە بدات لەسوریاوە، بەهەمانشێوە لەژێرەوە هەوڵی بینینی حزبی دیموکرات بدات، دیارە ڕۆڵێکی خراپی بینیوە، دیارە ئەوە یەکێك بووە لەو شتانە؟**

**عەبدوڵای موهتەدی:** جا ئەو کەسە سەڵاحەدینی موهتەدییە، سەید برایم، لەبەر ڕێز ناوی نەبردووە، بەڵام سەرتاپا هەڵەیە، داستانەکە وانییەو نەقڵەکەشی وانییە، بەڵام ئاوا نییە، جا بۆ ئەوەش بەڵگەت بۆ دێنم بەنووسراو، ئێرانیەکان داوایان لە سەڵاحی موهتەدی کرد کەچاوپێکەوتنی لەگەڵ بکەن،



سەلاحی موهتەدی پرسی بەحزبی دیموکراتکرد، ئەو سەردەمە مامۆستا عەبدوڵای حەسەنزادە سکرتێری بوو، ئەو ساڵە بوو کەمن لەکوردستان بووم، سەید برایم چووە دەرەوەی ولات، کارەکانی سپارد بەمن، پرسیشی بەمن کرد کاك سەلاح، من بۆ خۆم پێمگوت " کاك سەلاح پرسیش بە سەید برایم بکە، راستە من لێرەم، بەلام ئەو سکرتێری یەکەمی کۆمەڵەیە، بەرەسمی وەلامەکەی لەئەو وەربگرە، ئیتر سەید برایم لەگەڵیدا قسەیکردوە، خۆ من بیستومەتەوە سەید برایم لەو چاوپێکەوتندا مخالەفەتی نەکردووە، من نامەم هەیە، نامەکەش هی ئێستا نییە هی ئەو وەختەیە، نامەیەکم بۆ کاك سەلاح نووسیوە، وەکو رای شەخسی خۆم، وەکو برای، وتومە ئەو چاوپێکەوتنە مەکە، پێم خراپە، ئەو وەختە من لێرە بووم سەید برایم لەدەرەوەی ولات بوو، نوێنەری ئێمە لەبەغدا (رەحیمی عەزیز پور)بوو بەخەتی خۆی نامەیەکی بۆ من نووسی، دوای چاوپێکەوتنەکەی کاك سەلاح لەگەڵ ئێرانەیەکان، نامەکەشی ناڕاستەوخۆ نییە دەڵێت " سەید برایم تەلەفۆنی بۆ کردمو وتی ئەم قسانەی خوارەوەم عەینەن بۆ بنووسە، ئەڵێ دوو خاڵ، هاتۆتە سەری پەرەگراف، دەقی قسەکانی سەید برایمە، ئەوا بۆم دەنووسێت، نامەکەشی دەستخەتە، حەزم نەکردووە بلاویبکەمەوە، ئەو هەموو قسەیان بەمن وت لەسەر ئەو مەسەلەیە حەزمنەکرد بلاویبکەمەوە، بەلام ئیتر ئێستا پێموایە کاتی هاتووە، ئەویش ئەوەیە سەید برایم دەنووسێت" عەبدوڵا" کاك سەلاح چاوی بەئێرانیەکان کەوتووە، وەها باشی لەگەڵیان قسەکردووە، ئەگەر منو تۆش بواین لەوە باشترمان قسەنەدەکرد، ویستم ئاگاداربێت" هاوڕێت برایمی عەلیزادە" بەخەتو بەرێکەوتو بەهەموو شتێکەوە، کەوابێ یەکەم پرسی رەسمی كاك سەلاح بۆ خۆی وا دەڵێت "سەید برایم مخالەفتی نەبووە" ئایا بویەتی یان نەی بووە من لەکۆبوونەوەکەیاندا نەبووم، من خۆم موخالەفەتم هەبووە، یان نا، بەڵێ من پێم خراپ بووە، بۆ کاك سەلاحیشم نووسیوەو چاوپێکەوتن نەکات، بەلام دوای چاوپێکەوتنەکەش کاك سەلاح شەرحەکەی گێراوەتەوە بۆ سەید برایم ئەمە رای سەید برایم بووە لەسەر چاوپێکەوتنەکە، پێم ناڵێی خراپی من لەکۆیدایە لێرەدا، پێم ناڵێی دەوری ئێران چییە؟ ئەوە وەختێکە ئێمە کێشمەیەکمان هەیە.

***ئێران لەو دانیشتنەدا داوای چیدەکرد؟**

**عەبدوڵای موهتەدی:** لەکێ. لەئێمە؟

***لەسەلاحی موهتەدیو لەئێوەو لەدیموکرات؟**

**عەبدوڵای موهتەدی:** داوای چاوپێکەوتنیکردووە.

# خۆمان بەرپرسیارین لەئینشقاق

***سەریگرت؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** نەخێر.

***بۆ؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** ئێمە نەمانویست، نازانم بۆ حزبی دیموکرات، ئاگاداری نیم، ئەوە بۆ ئەوە ناڵێم کەئێمە دژی وتوێژین، بەڵام بەهەر حاڵ ئەوە وەختە وەڵامی چاوپێکەوتنەکەش من هەر نەمداوەتەوە.

***زۆرجار ئێوە، کۆماری ئیسلامی ئێران، خەڵك، یەکێتی نیشتمانی کوردستان، پارتی دیموکراتی کوردستان، کاك برایم عەلیزادە ئەمانە لەپشتی ئینشیقاقی کۆمەڵە ومن، باشە بۆ تۆ و کاك برایمی عەلیزادەو عومەری ئیلخانیزادە خۆتان بە بەرپرسیار نازانن؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** خۆمان بەرپرسیاین، تێوەریەکەی من ئەوەیە کە خۆمان بەرپرسیارین.

# نەئێران و نە مام جەلال و نەکاک مەسعود هۆکارنین

***ئەی بۆ نەیکەن؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** روونکردنەوەمدا، خۆ من پێم خراپ نییە، جیابوونەوەم پێ خراپ نییە، کەسێك بیەوێت خۆی لێبشارێتەوە، هەزار بروبیانوی بۆ دەهێنێتەوە، من خۆمی لێناشارمەوە، من حەزمدەکرد هەموو پێکەوە بووینایە، دەستمان لەحزبی کۆمۆنیست هەڵبگرتایەو کۆمەڵەمان ساغبکردایەوە لەسەر ئەساسی ئەو رێبازی کەمن پێموایە دروستە، بۆ ئەوەش هەوڵمدا، بۆیە پێموابوو ئەگەر دیالۆگ بکەین، رەنگە بەئەنجامێك بگەین کەزانیم دیالۆگەکەمان لەگەڵ ناکەن و هیچ سوودی نییە ئێمە لەحزبی کۆمۆنیست هاتینە دەرەوە ناومان ناوە(پرۆژەی ساغکردنەوەی کۆمەڵە) من بەخاڵێکی زۆر گەش و پرشنگداری ژیانی سیاسی خۆمانی دەزانم، مەسئولە کەشی نەئێرانە، نەمریکایە نەمام جەلالە، نەکاك مەسعودە، نەبەشەری خودایە غەیری خۆمان نەبێت.. ئیتر چیت دەوێت لەوە زیاتر.



# لەسەر مەسەلەی نەتەوەیی شانازی دەکەم

***لەگوزارشتی ساغکردنەوەی کۆمەڵەدا تۆ دەڵێیت "ساغکردنەوەی کۆمەڵە دەستکەوتێکی گەورەبوو بۆ کۆمەڵەمان بەدیهێنا، توانیمان کۆمەڵە بهێنینەوە ناو ناوان" کاك برایمی عەلیزادە ئەم قسانەی تۆ بە پروپاگەندە دەزانی، لە پاش کۆنگرەی نۆ لەدیدارێکدا لەگەڵیدا دەڵێت "عەبدوڵای موهتەدی هەڵنەیژێردرایەوە ئەوەشی کەکردویەتی باوەشێنکردنی مەسەلەی میللە؟**

عەبدوڵای موهتەدی: وەڵلا من لەسەر مەسەلەی میللی جەختی زۆرم کردوە، ئەوە یەکێك لەمەسەلەکانی جیابوونەوەمانە، بێگەمان ئەوە یەکێك لەتەوەرەکانی مەسەلەی جیابوونەوەمانە من نەدەیشارمەوە، پێم جێی شانازییە، پێم شتێکی خراپ نییە، بۆ ئەوەش ئایا کۆمەڵە بەڕاستی (پرۆژەی ساغبوونەوەی کۆمەڵە) هاتنە دەرەوەی ئێمە لەحزبی کۆمۆنیستی ئێران ڕێگای بۆ ئەو بەشەی کۆمەڵە کردەوە، ئەمە وەکو رۆژ دیارە جێی گفتوگۆکردن نییە، بەڵام من چۆن بیسەلمێنم، بەڵام تۆ دەبێت لەنزیکەوە ببینی و لەکارەکەدا بیت، بڕۆ لەخەڵکی کوردستانی ئێران بپرسە، بڕۆ لەدۆستانی کۆمەڵە بپرسە، بڕۆ لەرێکخراوەکانی خۆمان بپرسە، حزبی کۆمۆنیستی ئێران، کۆمەڵەی خستبووە پەراوێزەوە(پرۆژەی ساغکردنەوەی کۆمەڵە)و جیاکردنەوەی ئێمە لەحزبی کۆمۆنیستی ئێران، بەڕاستی هەنگاوێکی گەورە بوو بۆ پێشەوە، کەموکوڕییەکەی من لەوە دەبینم کەهەموومان نەمانکرد.

***تۆ وتت بەشێکی زۆر لەکادرە چالاك و بەتواناکان لەگەڵ ئێمە بوون، لەکادرانی قەدیمیدا مەبەستم بەڕێوەبەرانی لەکۆمەڵەیە، بەشێکیان لەگەڵ تۆ بوون، یان لەولا مانەوە؟**

عەبدوڵای موهتەدی: وەڵلا لەمەردوولا هەبوون.

***برایم پێیوایە، ئەو کاتە کەجیابوویتەوە ئیدارەی سلێمانی هاوکاری زۆری تۆیانکردووە؟**

عەبدوڵای موهتەدی: عەبدوڵای موهتەدی: دەستیان خۆشبێت زۆریش مەمنونیانم، هەرگیز ئەو هاوکاریەم لەبیرناچێتەوە، بەڵام هاوکاری ئەوانیشیانکردووە.



***گرنگترین خاڵ ئەوەیە لەو هەوڵانەی رێگری لەو جیابوونەوەیەکردووە، مام جەلال بووە، پێشنیاری ئەوەی کردووە کەبەدوو فراکسیۆن بمێننەوە، وەکو چۆن لەشاخ یەکێتی نیشتمانی سێ فراکسیۆن بووە؟**

عەبدوڵای موهتەدی: نا، نا، بۆ هەمیشە نا، بۆ ماوەیەکی دیاریکراوە، هەرگیز وانەبووە، خۆشتەکەم لاماوەتەوە، مام جەلال دەڵێت "بۆ کاتێکی دیاریکراو تاقسەکانتان بەئەنجامێك دەگات، ئەگەر زانیتان یەکناگرنەوە، برۆن، ئەگەر زانیتان دەتوانن یەکبگرنەوە، یەك بگرنەوە"، بۆئەوەی چانسێك بدەینەوە بەخۆمان بۆ یەکگرتنەوە ئەمن نە برایم کەسمان خوازیاری ئەوە نەبووین فراکسیۆن، فراکسیۆن بێن و تەکەتوڵ تەکەتول بێن لەناو حزبێکدا ئەوە سەرناگرێت.

## دواین جار لەدوکان بەئامادەبوونی مام جەلال سەید برایم وتی هیچمان قبوڵ نییە

---

***پرۆژەکەی مام جەلال چیبوو؟**

عەبدوڵای موهتەدی: پرۆژەکەی مام جەلال دوو خاڵ بوو، بەندی یەك و بەندی دوو، بۆماوەیەکی دیاریکراو، ئێمە کۆمیتەیەکی هاوبەش پێکبیهێنین، دیالۆگەکەمان بکەین، بزانین یەکدەگرینەوە، یان مەجبورین دەست لەیەك بەردەین، دووەم ئەگەر هەر ئەوەش ناکەین جیادەبینەوە، کۆمیتەیەکی هەمەهانگی لەنێوان خۆماندا بهێڵینەوە، بۆئەوەی تەواو لەیەکتری دانەبڕێین، بەشی ئەوەندە دیسان مۆڵەت بدات کەهەوڵدانێکی زیاتر بکرێت، بەڵکو دەستمان لەیەکتری دانەبردرێت، ئێمە هەردوو خاڵەکەیمان قبوڵکرد (ئەلف و باو) سەید برایم هەردووکیان راتکردەوە.

***مام جەلال چی وت؟**

عەبدوڵای موهتەدی: بەداخەوە بوو، هەوڵی لەگەڵدواین، من هەتا دووپاتیشمکردووە لەدوکان دانیشتبووین، وتم کاك سەید برایم بۆ ئەوەی دڵنیا ببمەوە، ئێوە هیچ کام لەو دوو خاڵە قبوڵ ناکەن، وتی ناکاکە ئەوە چەندجار بڵێم قبوڵی ناکەین، پێمان باش نییە.



# مام جەلال وتی سەید برایم داوای ناوبژیوانی کردوە

***مام جەلال لەسەر ئەوە رای نەگۆڕا کەهەردوولاتان بەگوێتان نەکرد؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** چیبکات، خۆ ئەو ناتوانێت زۆر بکات، هەر ئەوەندەی پێکرا بێت سەردانمان بکات، هەردوولاشمانی پێکەوە کۆکردەوە، هەموو دانیشتین، سی، چل کەس لەدەوری یەکتری دانیشتین، جا سەیر ئەوەیە، یەکێك لەو شتانەی کەکردبوویان بەتاوانێك لەسەر من، ئەوەبوو کەگوایە من داوای ناوبژێیم لەمام جەلال کردووە، هەر لەو کۆبوونەوەیەدا بەئامادەبووانی هەر سی چل نەفەرەکە، مام جەلال وتی "سەید برایم داوای ناوبژێی لەمن کردووە، نامەی بۆ نووسیوم، مەعلوم بوو من نەمکردووە، ئاخر یەکێك لەو شتانەیە دەیانەوێت وابکەن، وانیشانبدەن یا دەستی مام جەلالی تێدایە یان دەستی یەکێتی تێدایە یان ئەوان پشتگیریەکی زۆر تایبەتی منیانکردووە، ئەزانی مەسەلەکە چۆن بوو؟ خۆ من زۆرم دەگوت، بەڵام وەها بوو، بە دەنگۆ کەس باوەڕی نەدەکرد تازە پێیان وەهابوو ئەوەی حزبی کۆمۆنیست دەیڵێت راستە، واتە من داوای ناوبژێیم کردووە، جا ئەوانە من بۆ مێژوو دەیڵێم، بابزانم سەید برایم دەتوانێت رەتی بکاتەوە، مام جەلال وتی " سەید برایم نامەی بۆ نووسیوم، دوایش قسەی لەگەڵکردوم، وتویەتی مام جەلال تۆ دۆستی هەموو لایەکمانی، دەزانم تۆش یەکگرتنەوەی ئێمەت پێ خۆشە، زەحمەت نەبێت تەدەخولێك لەکاری ئێمەدا بکە، مام جەلالیش وتی وتومە کاکە جا ئێوە خۆتان ئاقڵن و ئێوە خەڵکی ئامۆژگاری دەکەن و من چ ئامۆژگاریەکی ئێوەبکەم، وتویەتی نا مام جەلال داوات لێدەکەم، وتی وتومە ئاخر کاکە دەبێت لەلایەنەکەی کەش بپرسم بزانم دەیکات یان نا" من لەئەورووپابووم کەکاك سەید برایم پێشنیاری ئەو ناوبژیوانیەی کردووە بەیەکێتی نیشتمانی.

# عومەر شێخ موس ئاگاداری کێشەکانە

***قبوڵیشی نەکرد؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** دواجار قبوڵی نەکرد، من لەدەرەوەی وڵات بووم "عومەر شێخ موس"یش شاهیدە، تەلەفۆنێکی مام جەلال کرا پێیوتم کاك سەید برایمەکەی خۆمان داوای شتێکی ئەوهای لەمن کردووە، پێموتوە نایکەم ئیلحاحیکردووە، وتومە باپرس بەعەبدوڵڵاش بکەم بزانم دەڵێت چی، وتم : وەڵڵا مام جەلال من رازیم، ئەوهابووە خودی کاك سەید برایم بۆ خۆی پێشنیاریکرد لەدوایشدا پێشنیارەکانی قبوڵنەکرد.



# ساڵی ( 2003 ) لەگەڵ ئێرانیەکان دانیشتووین

***ئەوە راستە لەسەردەمی خاتەمی و لەو دەورانەی ئێوە ئەو کێشانەتان هەبووە، ئێـوە لەگـەڵ ئیتلاعـات کۆبوونەوە؟**

عەبدوڵڵای موهتەدی: نەوڵڵا ئەسڵو ئەساسی نییە! خۆشیان دەزانن ئەسڵو ئەساسی نییـە، ئـەوەش یـەکێك لـەو دەنـگەو درۆیانـە بـوو، بۆیـە دەڵـێم تـەپ وتۆزو قسـەی سـوكو دەنگـۆی ناشـیرین ناڕاسـت لەلایـەن حزبـی کۆمۆنیسـتەوە زۆر بڵاوکرایـەوە لـەوماوەدا، کێشـە سیاسـیەکە بـەناوەڕۆکی فکـری و سیاسـی بەباشـی بشـکۆفێتەوە، لەناومانـدا بێتـە ئـاراوە، هـەر کەسـە بەباشـی بـزانین فکـری چییە؟ دانیشتنی ئێمە لەگەڵ دەوڵەتی ئێران دەگەڕێتەوە بۆ (مارسی 2003) سێ سـاڵ دوای جیابوونەوەکە، نەوەڵڵا هیچ دانیشتنێکمان لەو سەردەمەدا لەگەڵ ئێران نەبووە.

# حزبی کۆمۆنیست ناسیۆنالیزمیان پێ جنێوە

***برایمی عەلیزادە پێیوایە ( کۆمەڵەی شۆڕشـگێڕی زەحمەتکێشـانی کوردسـتان ) ناسیۆنالیسـتێکی بـێ چارەسەرە، بۆ مەسەلەی نەتەوایەتی پێتوایە ئەمە راستە؟**

عەبدوڵڵای موهتەدی: نەخێر، ئێمە چارەسەرمان هەیەو ئێمە ناسیۆنالیزم وەکو ئـەوەی بـەکاردەهێنن بەجنێو نـازانم، ناسیۆنالیزم بێجگە لـەوەی دەتوانێت ئایدۆلۆژیایـەکی سیاسـی بێـت، بـەڵام بزوتنـەوەی گەورەی کۆمەڵایـەتی خـەڵکێکی ستەم لێکراوە بـۆ ئازادی و مـافی خۆیـان، ئـەوان بـەجنێو بەکاریدەبەن، ئەمە یەك، دووەهەم بۆ بێ چارەسەریەکەشی بۆ بێ چارەسەرین، ئێمـە خوازیـاری ئێرانێکـی فیـدراڵی، دیمـوکراتێکی سـێکولارین ئـەوان هـیچ چارەسـەرێکیان بـۆ مەسـەلەی نەتـەوەیی نییـە، زەحمـەت نـەبێت ئەوانە چارەسەریان چییە.



# تاقمی مەنسوری حیکمەت خائینن

***ئێوە لە (2001/3/15) لەراگەیاندنێکی کۆمیتەی ناوەندی خۆتاندا هاتووە، "سەبارەت بە پیلانگێڕیەکانی باندی خائین و رسوایی مەنسوری حیکمەت" هاتووەکە "حزبی کۆمۆنیست بەشدارن لەو پیلانگێڕیانە" کەدیارە دژی ئێوە بووە؟**

عەبدوڵای موهتەدی: دەزانی لەچی بەشدارن؟ ئەوان "مەنسوری حیکمەت" کەخائین و پیلانگێڕ هەن ئەوە راستە، بەڵام مەبەست لەبەشداری چییە؟ ئەویش،ئەوەیە درۆی مەنسوری حیکمەت، درۆی حزبی کۆمۆنیست کرێکاری ئەوەبوو، نەجارێك نەدەجار، دەیان جار لەراگەیاندنەکانیاندا درۆیەکیان دەکرد، دەیانگوت کەیەکێتی نیشتمانی پێشمەرگەی چەکداری ناردووە بۆ ئەوەی بەزۆر لەتیان بکات، تەواوی سەرشاخەکانیان گرتووە، لەهێزی پێشمەرگەی چەکداری یەکێتی ئەو جیاییەی ئێمە لەحزبی کۆمۆنیست لەژێر ئەو فشارو زۆرەدا بووە، لەحاڵێکدا یەك پێشمەرگەیان یەك چەکداریان، یەك مەئموری سیاسیان بەلاماندا نەهاتوون، بەشەرەف، قسەی ئێمە بەسەید برایم لەوە وە بوو، خۆ ئێوە دەزانن درۆیە، ئاخر درۆیە کەڵکی هەیە بۆتان بۆیە رەتی ناکەنەوە، ویژدانتان بێت رەتی بکەنەوە، بڵێن وانییە، کام پێشمەرگەی یەکێتی سەرشاخی لێگرتووین، ئەسڵەن کام پێشمەرگەی یەکێتی بەلاماندا هاتووە، شتی وانەبووە ئەسڵ و ئەساسی نەبووە، رەتیان نەدەکردەوە بۆ چیش، چونکە ئەو راگەیاندنە ژەهراویە بەقازانجیان بوو، ئێمە قسەکەمان ئەوەبوو، خودی حزبی کۆمۆنیستیش لەجیاتی ئەوەی وەڵامی فکری و سیاسیمان بداتەوە، بەداخەوە تەنیا بەپڕوپاگەندەی ژەهراوی ئا لەمجۆرە کەئای لەگەڵ خاتەمین، ئای لەگەڵ فلان پەیوەندیانکردووە، پوڵیان لەکێ وەرگرتووە، نازانم بەو شتانە رایان دەبوارد نەیانهێشت دیالۆگێکی راستەقینە لەنێوانماندا هەبێت.

***برایمی عەلیزادە دەڵێت " ئێوە بەشێوەیە ویستویانە نەیارانی حزبی کۆمۆنیستی کرێکاری (مەنسوری حکیمەت) لەئەمان هاندەن بڵێن ئەوەتا ئەمان دۆستایەتیان نزیکبوونەوە، لەکاتێکدا مەنسوری حیکمەت جنێوی بەمام جەلال ئەداو ئێوەش دەتانویست ئەوە ئیبراز بکەن، تایەکێتی نیشتمانی بکەنە دژی ئەوان؟**

عەبدوڵای موهتەدی: وای دانێ ئێمە واماندەکرد، ئەوانیش ئاقڵ بوو نایە، راگەیاندنێکیان بدابایە، ئەوشتانەی حزبی کۆمۆنیستی کرێکاری بەیەکێتی دەڵێت "هاتوون(پ.م) دەوریانگرتوون بەزەبری ئەوان کراوە ئەو ئینشیقاقە بارەتیان کرد بایەوە، بۆ وایاندەکرد، دەیانویست ئەو ئینتباعە بدەن

کەراستە ئەو قسەیە، بەبێ ئەوەی بۆ خۆیان راستەوخۆ بیکەن، دەیانویست ئەو ئینتیباعە بدەن، کەقسەکەی کۆمۆنیستی کاریگەری راستە.

*ئێوە لەو بەیاننامەشدا راتانگەیاندووە "کەئێوە هەرگیز رێگانادەن حزبی کۆمۆنیستی کرێکاری فعالیەت بکات، منیش دەپرسم ئێوە بەچ بەڵگەیەك، ئێوە ئەو هەرەشانەتانکردووە، مەنسوری حیکمەت بەخائین و بەکرێگیراو دەزانن حکمیت، بەکرێگیراو و خائینی کێبوو"؟

عەبدوڵای موهتەدی: نازانم بەکرێگیراوی کێبووە، لەبیرم نییە بەکرێگیرامان باسکرد بێت.

## تاقمی حیکمەت خائینن، خائین

*لەدەقی بەیاننامەکەتاندا هەیە؟

عەبدوڵای موهتەدی: بەکرێگیراو؟!

*بەڵێ، بە پیلانگێریەکانی باندی خائین و رسوای مەنسوری حکیمەت؟

عەبدوڵای موهتەدی: کەوابێ بەکرێگیراو تێدانییە، چونکە نازانم بەکرێگیراو کێیە، هەر بۆ خۆی شێت بوو، بەڵام خائین و رسوایە، ئەی خاین چۆنە کلك و گوێی هەیە.

## تاقمی حیکمەت دەیانگوت کورد کۆنەپەرستە بۆپیتزا ناخوات لەفەو شۆربە دەخوات

*مەبەست چیبوو لەخائین؟

عەبدوڵای موهتەدی: خائین ئەوەیە، گەورەترین زەربەی لەکۆمەڵەداوە، گەورەترین دوژمنایەتی لەگەڵ کوردو بزوتنەوەی کورد کردوە، گەورەترین سوکایەتی و رسوایی بۆ بزوتنەوەی چەپ لەئێران هێناوەتەکایەوە، لەکۆمۆنیزمی کاریگەریدا ئەوەنییە کەرەخنە لەمن بگرن، یان قسە بەمن بڵێن، قسە بەهەموو کورد دەڵێن، نەك هەر بەکوردو بزوتنەوەکەی نازانم جەنابت خوێندبێتتەوە، یان قسە بەشۆرباولەپە دەڵێن، قسە بەجامانە دەڵێن قسە بەپانتۆڵ دەڵێن قسە بەهەڵپەرکێ دەڵێن، دەڵێن کورد بۆ شۆربا و لەفە دەخوات، پیتزا ناخوات، ئەوە نیشانیدەدات کۆنە پەرستە، لەگەڵ هەموو فەرهەنگ و ئەساسی دوژمنایەتی دەکرد، بەمەرجێکی کورد دەساڵ لەناو لۆکەدا رای گرتن و تەڕو وشکیکردن،

ئەگەر لەبەر دەستی ئێران دابماناییەوە وەکو باقی خەڵکەکە ئیعدام دەکران، کورد پەنای دان لەکوردستان، ئەو دوژمنایەتیە لەپا چی، خائینێکن ئاو لێڵ ناکەن، ریسواشن و گەورەترین عیب و عار بۆ حزبی کۆمۆنیستی ئێران ئێستاش تەغزیە دەکەن لەسەرچاوە فکریەکانی مەنسوری حکیمەت، ئەوە کۆڵی کوتاون، ئەگینا ئەگەر ئەوە نەبێت چ دوریەکیان لەگەڵ ئێمە هەیە چ گرفتێکیان لەگەڵ ئێمە هەیە.

*خۆشیان دوابەدوای ئەمە چەند ئینشیقاقی جیاجیاو عەجیب دەکەن؟

عەبدوڵای موهتەدی: کۆمۆنیستی کاریگەری.

*بەڵێ؟

عەبدوڵای موهتەدی: بەڵێ، ئینجا هەر عەینەن ئەو جنێوانەی بەئێمەیان ئینجا بەخۆیان دەدەن، بەوشێوەیە سوکایەتی دەکەن کەسیان لەگەڵ نەماوە، ماوەیەکی دەنگ و ناوێکی گەورە پێیانوابوو بۆ خەڵك شتێکی تازە دەێنن.

*ئەو رادیۆی تەلەفزیۆن و زۆریان لەکوێ وەهێناوە؟

عەبدوڵای موهتەدی: بەراستی نازانم.

# ئیرەجی ئازەرین دەڵێ ئیسرائیل یارمەتی حیکمەتیست دەدات

*پێتوایە راستیەکەی ئیسرائیل یارمەتیان دەدات؟

عەبدوڵای موهتەدی: قسەیەکی ئەوها هەبوو زۆرتر لەلایەن ئیرەجی ئازەرین و جەماعەتی خۆیانەوە بوو باسدەکرا، خۆ ئێمە لەناویاندا ئاگادار نەبووین، بەڵام جەماعەتی ئیرەجی ئازەرین و ئەوان قسەیەکی وایاندەکرد.

*پێتوانییە جیابوونەوەکانی حەمیدی تەقوایی و ئەوان لەمەنسوری حکیمەت مەسائیلی فکریە وەکو خۆیان باسیدەکەن؟

عەبدوڵای موهتەدی: مەسائیلی فکریەکەیان نازانم چۆن بڵێم، دەڵێن فەقێیی قەدیم موناقەشەیان لەسەر شتی زۆر وردو سەیرو سەمەرە بووە، روحانیەنی مەسیحی سەدەکانی ناوەڕاست، لەسەر



شتی زۆر سەیرو سەمەرە موناقەشەیانبووە، موناقەشەی فکری ئەوانیش ئەگەر بێت ئەوهایە، شتێکی راستەقینەی زیندوو گیاندار نییە، موناقەشەیەکی ئایدۆلۆژی مردووە.

## من سێ کۆمەڵە دەزانم نەک چوار

*ئێستا وەکو من بزانم چوار کۆمەڵە هەیە، دەکرێت پێیم بڵێییت، کۆمەڵەی حەقیقی و جەماوەریترین کێیە؟

عەبدوڵلای موهتەدی: من چوارم پێ شك نایەت!

*ئەی چەندت پێ شکدێ؟

عەبدوڵلای موهتەدی: وەڵاهی سیانم پێ شك دێت، بۆ حەقیقی بوونەکەشی ئەوە بەئیدیعانییە بابزانین مێژوو چ قەزاو تێکمان لەسەردەکات و خەڵك چ قەزاوەتێکمان لەسەر دەکات؟؟

## (16)ی گەلاوێژ ئێمە کردمان نەك عەلیزادە و هەڵەش بوو

*برایمی عەلیزادە دەڵێت "شانزەی گەلاوێژ دەریخست کەکێ کۆمەڵەیە؛ مەبەستی ئەوەیە کە ئەوان داوایانکرد، بانگەوازیانکرد کە خەڵك دوکانەکان دا بخات لەسەر داوای ئەوان بوو، پێیوایە ئێوە رۆڵتان نەبووە، یان لایەنەکانی تر رۆڵیان نەبووە. قسەکەی ئەوەبوو کەشانزەی گەلاوێژ دەریخست کەکێ کۆمەڵەیە؟ تۆ ئەوە بەحەقیقەت دەزانی" ؟

عەبدوڵلای موهتەدی: راگەیاندنێك لەشانزەی گەلاوێژەوە لەلایەن ئێمەوە درا راگەیاندنێکی هەڵەبوو، زۆر شتێکی خراپ بوو.

*بۆ؟

عەبدوڵلای موهتەدی: چونکە لەمیچی خۆرایی بەخەڵکی وتبوو شانزەی ئەو گەلاوێژە، ئەو دوکان داخستن و شتە سەرتاسەریە قبوڵ نەکردبوو، ئەوە پێم هەڵەبوو، با بۆ ئاگاداریشت ئەوەت بۆ بخەمەڕوو، لەماوەی ئەو مانگو ماوەیەدا کە ئەو بزوتنەوەیە بوو، نەخێر ئێمە زۆر چالاك بووین، بەئیسك وپێستەوە بەگیان و دڵەوە لەو بزوتنەوەیەدا بووین، کاریگەری زۆر نزیکمان لەسەر دانە وانەی



خۆپیشاندانی شارەکان بوو، بەڵام لەئاخریدا لەسەر ئەو ڕۆژە، ئەوەی ڕۆژی شانزەی گەلاوێژ بکرێت بەڕۆژی مانگرتنی گشتی لەکوردستاندا بەداخەوە ئێمە ئەو هەڵەیەمانکردو ڕاگەیاندێکی خراپماندا.

# حزبی کۆمۆنیست لەئێمە دەوڵەمەندترن

***برایم دەڵێت "بوژاندنەوەی کۆمەڵە وا دبینم تەنها ڕازاندنەوەی سفرەی ئوردگاکەیانەو دروستکردنی خانووی سپۆرتە" ئەڵێم پارە پەیداکردن بۆ ئەوانە چۆنە؟ دەڵێ پارە پەیداکردن بۆ حزبێك کەبەناوی کۆمەڵەوە نەمابێت ناسانە، ئێوە سفرەتان ڕازاندوەتەوەو پارەتان پەیداکردووەو خانووتان دروستکردووە؟**

عەبدوڵلای موهتەدی: تائەو جێگەیەی من بزانم ئەوان لەئێمە دەوڵەمەندترن، دووەهەم پارە پەیداکردن ئەگەر بەڕێگای ناشەرەفەتمەندانە نەبێت، لەسەر ئەساسی کۆمەڵێك پرەنسیپ بێت، هیچ پێم شتێکی خراپ نییە، من یەکێك لەو کەسانە بووم کە هەوڵمداوە، پارە بۆ کۆمەڵە پەیدابکەم، نەك ئێستا، زووش لەگەڵ کاك سەید برایمیش پێکەوەبووین، ئەو وەختەش پارەم پەیداکردووە، ئێستاش کردومە، بەڵام پێموانییە لەجێیەك شتێکی پێچەوانەی ئەخلاق و پێچەوانەی پرەنسیپمان کردبێت بۆ پارە پەیداکردن.

# (پەیوەندی بەعس و کۆمەڵە)
# بەعس پەیوەندی ئێمەی قبوڵنەکرد

***دیارە دوای جیابوونەوەی ئێوە، پەیوەندییەکانی ئێوە لەگەڵ بەعس پچڕاوە، وەکو لەخۆشتم بیستووە، بەوپێیەی ئێوە نەتانویستووە هیچیتان لەگەڵ بەعس هەبێت، ئێوە دەتانزانی بەعس بەرەو لەناوچوون دەچێت، بەڵام برایمی عەلیزادە دەڵێت بەعس نەیویست پەیوەندی لەگەڵتان دروستبکات؟**

عەبدوڵلای موهتەدی: ئەگەر واشە ڕاستەکەی ئێمە نەمانوتوە پەیوەندیمان لەگەڵ دروستبکات، دوو سێجار هەوڵماندا بۆ پەیوەندی دروستکردن ڕێگای چوونە دەرەوەمان نەبوو، ئەو ڕێگای تورکیاو ئەوانە خۆت دەزانی چەند سەخت بوو، نەدەکرا، ئەو کاتە ڕێی ئێرانیشمان نەبوو، ڕێی سوریاشمان نەبوو، کەهاوپەیمانی ئێرانە، بۆیە زۆرمان بۆ گرنگ بوو لەڕێی عیراقەوە، دەربازین، ئەو کاتەش خودی برادەرانی یەکێتیشمان ئاگادارکرد، کەئێمە خەیاڵمانە شتێکە وەها بکەین، ئەو پەیوەندییە

زۆریان پێباشبوو، دووجار، سێجارمان هەوڵدا سەرینەگرت، جا دوایی دانیشتنێکمان لەناو خۆماندا کرد گوتمان چش ڤیروسیا ئیتر نەکەوتینەوە شوێنی، بەهەموویەوە لەوانەیە دوومانگ سێ مانگ چاکم لەبیرنییە، هەر ئەوەندە ئێمە هەوڵێکماندا، بەڵام ئیتر دوایی بڕیارماندا لەکۆڵیان ببینەوە وتەواو.

*پێشتر پەیوەندی ئێوەو بەعس چۆن بوو؟

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** پێشتر کەهەموومان پێکەوەبووین پەیوەندیمان هەبوو، پەیوەندیەکە کاک سەید برایم و ئەوان درێژەیاندا، کەئێمە جیابووینەوە پەیوەندیمان بڕا.

## بەعس چەند جار بۆ کۆنفرانسەکانی خۆی بانگیکردین نەچووین

*پێش جیابوونەوەی ئێوە پەیوەندی ئێوە، لەگەڵ بەعس لەسەر چیبوو؟

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** ئێمە پەیوەندی خۆمان لەگەڵ بەعس لەسەر چیبوو ئەو ساڵانەی ئاخیر کە دیارە ئیدارەو کۆنترۆڵەکەی زۆرتر بەدەست برادەرانی حزبی کۆمۆنیستەوە بوو، ئێمە تۆزێك پەراوێز خرابووین، ئاگاداری زۆر وردم نییە، بۆئەوەش قسەیەکم نییە، ها، بڵێمقسەی مەنفیم هەیە، بەڵام ئاگاداری زۆر وردم نییە، بەڵام بۆ پێش ئەوە دەزانم زۆر پەیوەندیەکی پاكو خاوێن بووە، پێموایە هەرگیز بچوکترین خیانەتێك بۆ بەرژەوەندی گەلی کوردو بۆ گەلی کوردستانی عیراق نەکراوە، هەر لەسەر ئەوەشە ئێمە کیمیابارانکراین، هەر لەسەرئەوەشە بۆ مبارانکراین، هەر لەسەر ئەوەیە هەزار خراپەمان بەسەر هات لەلایەن حکومەتی بەعسەوە، زۆر پاكو خاوێن بووین لەپەیوەندیەکان، چەندەها جار بانگیانکردوین بۆ کۆنفرانسیان، زەمانی سەدام کۆنفرانسی گەورەیان دەبەست کۆنفرانسی نێو نەتەوەیی قەد نەچووین.

## داوای جاسوسی و تەقینەوەیان دەکرد لەئێران

*داوایانکرد کاری تەقینەوەو جاسوسیان بۆ بکەن؟

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** داوایانکرد کاری تەقینەوەیان بۆ بکەین بۆمان نەکردن، داوایانکرد پارەی تەزویری ئێرانیمان بدەنێ، بیبینەوە ئێران بڵاویبکەینەوە.

*موجاهیدین کردی؟



عەبدوڵلای موهتەدی: وادەڵێن من ئاگاداری وردم نییە، ئێمە قەتعییەن هیچ کام لەو کارانەمان نەکردووە، ئەوانە ئێمەی ناخۆشەویستکردبوو لەبەرچاوی عیراقیەکان.

*دیموکراتیش هاوکاری دەکردن لەو بارەیەوە وانییە؟

عەبدوڵلای موهتەدی: نازانم ، نا.

*لەبەرامبەر چییدا بەعس هاوکاری پارەو ئیمکانی دەکردن؟

عەبدوڵلای موهتەدی: دوژمنی ئێران بوو، تەنها شت ئەوەبوو دەنا ئەو شتانەی ئەو دەیگوت هیچیمان بەقسە نەدەکرد، لەنەخۆشخانەکەی ئێمە هەمیشە پێشمەرگەی عیراقی لێبوو، مەسئولی کوردی عیراقی لێبوو، چەندەها خەڵکمان عەمەلیاتکردوە خەڵکمان چاککردوەتەوە بەنهێنی یارمەتیمان داون، لەئازوقە یارمەتیمان داون هەزارو یەك شت.

*لەم یارمەتیو هاوکاریو تەواوی پێشمەرگە بۆ یەکێتی نیشتمانی کوردستان بوو، ئێوە جار هەبووە لەمەخزەنەکانی خۆتان خواردەمەنیتان داوە بەیەکێتی نیشتمانی کوردستان، بەتایبەتی لەماوەت، یەکێتی نیشتمانی لەبەرامبەر ئەو چاکانەی ئێوە کاریکردووە؟

عەبدوڵلای موهتەدی: بەڕاستی ئەوانیش چاکەیان زۆربووە بۆ ئێمە.

*تۆ ویستت سەدام حسێن ببینی؟

عەبدوڵلای موهتەدی: بەپێچەوانەوە زۆر هەوڵیاندا نەمەدیت، پێمخۆش نەبوو ببینم.

*بۆ؟

عەبدوڵلای موهتەدی: ئاخر ئێمە لەڕووی ناعیلاجییەوە ئەو پەیوەندییەمان لەگەڵ عیراق هەبوو، بۆیە هەوڵماندەدا پەیوەندیەکە لەلایەنی ئاستی کەم رابگرین، بەشی ئەوەندی یارمەتییەك بدرێن، شوێنێکمان هەبێت.



## بەعس هاوكاری باشی مجاهیدین و دیموكراتی دەكرد

***یارمەتی باشیدەكردن؟**

**عەبدوڵلای موهتەدی:** بەقەدەر خەڵكی نەبووە، بەڵام خراپ نەبوو.

***خەڵك یەعنی كێ؟**

**عەبدوڵلای موهتەدی:** رەنگە بەقەد موجاهدین نەبووە، بەقەد دیموكرات نەبووە.

***كەواتە یەعنی یارمەتییەكانی بەعس بۆ لایەنە سیاسیەكان لەبەرامبەر ئەوە بوو كەكێ باشترە بۆیان كێ هاوكاریاندەكات؟**

**عەبدوڵلای موهتەدی:** نازانم، وەڵلا.

*** بانموونەت بۆ دێنمەوە، موجاهیدین خەڵق بوون بەبەشێك لەسوپای عیراق؟**

**عەبدوڵلای موهتەدی:** نافەرق دەكات، ئەسڵەن ئێمەو دیموكرات وانەبووین، ئێمەش و دیموكراتیش لەگەڵ موجاهـدین زۆر فەرقی ئەساسیمان بووە ئێمە لەلایەك، موجاهـدینیش لەلایەكی تر، ئێمە كەڵكمان لەو یارمەتیانەی حكومەتی عیراق وەرگرتووە، بۆ خەباتی خۆمان و شۆڕشی خۆمان، بەڵام خۆنە چووین خراپەی خەڵكی پێبكەین.

## بەعس دیناری دەدایێ نەك دۆلار

***بەعس مانگانە چەندی پارە ئەدانێ؟**

**عەبدوڵلای موهتەدی:** فەرقی دەكرد، زەمان تازەمان بەراستیش هەموویم لەبیرنەماوە.

***چەند هەزار دۆلار؟**

**عەبدوڵلای موهتەدی:** بەدینار دەیدانێ، بەڵام دیناری ئەو وەختە زۆر لەدۆلار بەنرختر بوو، بۆ ئێمە زۆرباشبوو.

***ئێوەش لەو پارەیە بەشی یەکێتیتان ئەدا؟**

عەبدوڵڵای موهتەدی: بەڕاستی ئەوەی لەدەستمان هاتوویێت کردوومانە، بەدڵ و بەگیانیش کردوومانە، بەئەرکی خۆشمان زانیوە منەتیشی نییە، چونکە بەئەرکی نیشتمانی و سیاسی و شۆڕشگێڕانەی خۆمان زانیوە، لێی پەشیمان نین.

## زیندانیانی ئەمنە سوورەکە نوسراوی کۆمەڵەیان پێبوو

***هەستت بەچیدەکرد کەئێوە لەسلێمانی، هەولێر بوون، یان لەزرگوێز بوون، ڕۆژانە بەدەیان کەس ئیعدام دەکرا کەخەڵکی بێ دیفاعی کوردستانی عیراق بوون؟**

عەبدوڵڵای موهتەدی: ئەوە ئێمەی دەبردە حاڵەتی خەفەتێکی زۆرەوە، زۆرمان پێناخۆشبوو، پێشت بڵێم زۆر کەس کەلەدوایی لەئەمنە سوورەکەدابوون، لەراپەڕین ئازاد کران، نووسراوەی کۆمەڵەیان پێبوو، کۆمەڵە لەناو خەباتکەرانی کوردستانی عیراقدا، زۆر خۆشەویست بوون، ئێمە هەرگیز کارێکمان نەکردووە، بەدزی زۆر کەسمان لەدەست حکومەتی عیراق رزگارکردوە، هەموو کەسەکان زۆریان ماون، بەڵگەو شاهیدیان لەسەرە، خەڵکی ژێر ئیعدامان بەنهێنی رزگارکردووە، شاردومانەتەوە لەناو ئوردگاداو بەنهێنی ناردومانەتە دەرەوە، ئەوەندەی پێمانکراوە ئێمە چاکەمان لەگەڵ تێکۆشارانی کوردستانی عیراق کردووە، نەماندەتوانی و نەماندەوێرا ڕووبەڕوو بیکەین، بەڵام ئەوەندەی بۆمانکراوە بەنهێنی کردوومانە.

## عەبدوڵڵا حەسەن زادە و دیموکرات دژی ئێمەبوون

***لەسەردەمی جیابوونەوەکانی ئێوەدا، حزبی دیموکرات تاچەند خۆشحاڵبوو، تەچەند دەستی هەبوو، لەو جیابوونەوانەدا؟**

عەبدوڵڵای موهتەدی: خۆشحاڵبوو، بەڵام هیچ دەستی نەبوو، بەڵێ ئەو وەختی حزبی دیموکرات بەسەرۆکایەتی مامۆستا عەبدوڵڵای حەسەنزادەبوو، بەس لەوەدەچوو خۆشحاڵ بن، بەڵام دوای ئەوەی کەجیابوونەوەکەبوو، شتێکی زۆر ڕەق و ناخۆشیان لەسەر نووسین، من ئێستاش نەمزانی بۆچی ئەو کارە دەکەن، لەجیاتی ئەوەی پێشوازیبکەن و بڵێن ئەوە باشترەو ئەوە لەڕێبازەکەی ئێمە گونجاوترەو، لەمەولا توانای هاوکاریمان دەبێت.



***ئەی لەجیابوونەوەکانی ئەم دوایەی حزبی دیموکرات ئێوە دەستان هەبوو، یان پێتا نخۆشبوو؟**

عەبدوڵڵای موهتەدی: بەقازانجی نابینین، بەڕاستی، بەڕاستی، گەورەترین زەرەری دەزانی چیبوو؟ شانسی پێکهێنانی بەرەیەکی کوردستانی کزکرد، ئێمە پێمانوایە، خۆشت دەزانی لەنووسراوەکانی ئێمەدا، نزیکەی نۆ ساڵ، دەساڵ لەسەر بەرەی کوردستانی کاردەکەین و هەوڵی بۆ دەدەین، پێمانوایە ئەو شانسەی کەمکردوەتەوە.

## جیاوازی فکری نابینم لەنێوان دوو دیموکرات

***تۆ وتت ئێمە لەحزبی کۆمۆنیست جیابووینەتەوە، لەسەر جیاوازی فکری، ئەی حزبی دیموکرات جیابوونەوەکەیان لەسەر چییە؟**

عەبدوڵڵای موهتەدی: هیچ جیاوازییەکی فیکری و سیاسی نابینم، ئەگەر بشبێت من ئاگادارنیم.

***کەواتە جیاوازی ئیمتیازی شەخسی و دەسەڵاتە وەکو سەید برایم دەڵێت؟**

عەبدوڵڵای موهتەدی: وەڵلا هی لەسەر شتی تەشکیلاتییە، ئیتر چەندی ئیتمیازی شەخسیە، ئەوە بۆ من نییە بیڵێم ، نازانم بەو وردەکارییەوە، بەڵام ئەوەیان پێوە دیارە هیچ شتێکی سیاسی بیروباوەڕی لەئارادا نەبووە، بەڵام پێموایە ناکۆکی کۆنی لەمێژینەبووە و لەگەڵ شتی تازە تێکەڵبوون، ئیتر وایلێکردوە جیاببنەوە.

***تۆ وتت ئێران لەم مەسەلانەدا رۆڵی نییە، بەڵام پێتوانییە تێڕوانینی ئێران لەسەر حزبی دیموکرات، باشتر تەعقیبی حزبی دیموکرات دەکات تا کۆمەڵە؟**

عەبدوڵڵای موهتەدی: مەبەستت چییە، یەعنی چۆن؟

*** حزبی دیموکراتی بەلاوە گرنگ بێت، چۆن چۆنی ئینشیقاقی تیابکات، لەرێگای ناڕاستەوخۆوە، وەکو ئەوەی چۆن یەکێتی نیشتمانی و پارتی دیموکراتی کوردستان دەرکەوتووە کە هەریەکەیان تەرەفداری لایەکدەکەن لەکێشەکانی حزبی دیموکراتدا؟**

عەبدوڵڵای موهتەدی: تۆ بڵێی یەکێتی و پارتی دەستیان بووبێت لەو ئینشیقاقەیاندا.

# لەراپۆرتی نهێنی ئیتلاعات تەنها باسی دیموکراتی ئێران و کۆمەڵەی ئێمە کراوە

*ناڕاستەوخۆ؟

عەبدوڵای موهتەدی: ئەگەر بوو بێت من لێی ئاگادارنیم، نازانم، بەڵام بۆ ئەوەی ئێران وابیردەکاتەوە یان نا، من وای نابینم، بەڵام هیچ بەڵگەیەکیشم بەدەستەوە نییە، مەسەلان بۆ نموونە هەر لەم رۆژانی رابردوودا راپۆرتێکی نهێنی ئاشکرابووە کەسەنتەرێکی لێکۆڵینەوەی خۆیان پێکهێناوەو داویەتی بەوەزارەتی ئیتلاعاتی ئێرانی، باسی ئەوە ناکات، باسی کۆمەڵەو دیموکراتی ئێران‌و مەبەستم کۆمەڵەی شۆڕشگێری ئێمەو حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران کەمستەفا سەرۆکیەتی، باسی ئەو دوانە دەکات.

# مام جەلال ، شێخ عزدین حوسێنی و سەلاحی موهتەدی دژی حزبی کۆمۆنیست بوون

***برایمی عەلیزادە دەڵێت " سەلاحی موهتەدی موخالیفی فکری ئێمەبوو، تەرەفداری ئێوەی دەکرد" سەلاحی موهتەدی لەم کێشانەدا رۆڵی چیبووە، تاچەند بەو پێیەی برای تۆیە هاوکاری تۆ دەکات، دۆستێکی نزیکی مام جەلال‌و یەکێتی نیشتمانی کوردستانە، تاچەند لەسەر ئەم پەیوەندیانە کاریگەری باش هەبووە، یان خراپی هەبووە؟**

عەبدوڵای موهتەدی: سەلاحی موهتەدی، بەپێچەوانەوە هەرگیز لەتەشکیلاتی کۆمەڵەدا نەبووە، ئەسڵەن کاری حزبی نەکردووە، ساڵەهای ساڵە ئەلەگەڵ ئێمە نەلەگەڵ خەڵکی کە،ئەمە، یەك، دووەهەم بۆ خۆی کەسایەتیەکی ناسرابوو، هەم لەباری سیاسی و هەم لەبواری رۆشنبیرییەوە، دۆستی زۆرێك لەسەرانی کۆمەڵە بووە بەتایبەتی جەماعەتی قەدیمی تریان، کەسانی وەکو سەدیقی کەمانگەر، ساعیدی وەتەندۆست، فوئاد، دکتۆر جەعفەر، سەید برایم‌و ئەنواعی ئەوانە کەسانی زۆر نزیکی خۆی بوون دۆستی نزیکی خۆی بوون،؟ وەنەبێت بڵێن تەنها ئاشنایەتیەکەی لەگەڵ منە، بەحیسابی ئەوەی سەرجەم فکرێکی پێشکەوتنخوازانەوفکرێکی شۆڕشگێڕانەی بووە، دیارە هەمیشە ئەو تەئکیدی لەسەر مەسەلەی نەتەوایەتی کردوەتەوە، هەمیشە خۆی بەوە دەزانی، بەڵام لەهەمانکاتدا بەدوورنەبووە لەفکری پێشکەوتنخوازانەو چەپ، بۆیە یارمەتی زۆری ئێمەی داوە، نەك ئێستا بەڵکو



بەبیست سالْ، سی سالْ لەمەوپێش، بەماڵی دنیا، بەهەموو جۆرێك، هەرچی بۆی کرابێت بۆیکردووین.

بۆ مەسەلەی حزبی کۆمۆنیست دیارە کاك سەلاحیش یەکێك لەوانەبووە پێی ناخۆشبووە کەئێمە دروستیدەکەین، مام جەلالیش یەکێك لەوانەبوو پێیناخۆشبوو، شێخ عزەدینی حسێنی یەکێك لەوانەبوو پێناخۆشبوو، هەمووشیان دۆستی ئێمە بوون، بەڵام ئەو سەردەمە ئێمە قەناعەتمان وابووە، بەقسەمان نەکردون، بەس چاکیشمان نەکردوە، بەهەرحالْ لەسەر ئەساسی قەناعەتی خۆمان کارمانکردووە، یان یەکێکی وەکو منو هەندێکی تر لەهاوڕێیان پێکەوە هاو فکربووین، ئیتر رەخنەمان لەحزبی کۆمۆنیست گرت، بەقەناعەتی رەخنەگرتن و لاوەنانی حزبی کۆمۆنیست گەیشتن فکری خۆیان زۆرتر دەهات، مەعلومە سەلاحی پێیخۆشبووەو دۆستایەتیش کردوین و هاتوچۆشی کردوین، بەلاّم سەلاّح تاماوەیەك سەردانی حزبی کۆمۆنیستیشی دەکرد، بەلاّم زۆریان قسەی ناخۆش و ناوناتۆرە لێدا، کاری نەماو لەزەتی نەما.

# پەیوەندیمان لەگەلْ ئەمریکاو کۆنگرێس و سەنا باشە

---

***پەیوەندی ئێوە، کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشان ئێستا لەگەلْ ئەمریکادا چۆنە؟**

عەبدوڵلاّی موهتەدی: جا نازانم لەگەلْ ئیدارەی تازە چۆن دەبێت، جارێ زووە، شتێکی لەسەر بڵێم، بەلاّم لەگەلْ ئیدارەی بۆش لەگەلْ وەزارەتی دەرەوەی و لەگەلْ کۆنگرێس و لەگەلْ سەنای ئەمریکا و لەگەلْ کەسایەتیەکان و سیاسەتمەدارانی کۆندا بەقەدەر خۆمان هەوڵماندا لەسێ چوار ساڵی رابردوو، پەیوەندیشمان هەبووە، بەگشتی ئێمە پێمانوایە ئۆپۆزسیۆنی ئێرانی بەجیا، کورد لەکوردستانی ئێران دەبێت رێگای دۆستایەتی لەگەلْ رۆژئاوا لەگەلْ ئەوروپا و ئەمریکا بۆ خۆی بکاتەوە، لەو چوارچێوەیەدا بووە، بەلاّم ئیدارەی بۆش کارێکی ئەوتۆی نەکرد بۆ ئۆپۆزسیۆنی کورد، بۆ ئۆپۆزسیۆنی ئێرانیش کارێکی ئەوتۆی نەکرد، راستە بۆ خۆی هەرەشە زۆربوو لەگەلْ دەوڵەتی ئێران، بەلاّم لەگەلْ میللەتەکە هیچی نەکرد.



## ئەمەریکا تائێستا هاوکاری نەکردوین بۆ روخانی ئێران

*ئێوە مادەم پەیوەندیتان لەگەڵ کۆنگرەێس و وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکی وکۆشکی سپیدا هەیە؟ پەیوەندییەکە لەچ ئاستێکدایە، ئێوە بەو قەناعەتە گەیشتوون کەئەمریکا هاوکاری ئێوە دەکات لەرووخانی ئێراندا؟

عەبدوڵای موهتەدی: تائێستا نەیکردووە، نەتوانم بڵێم پەیوەندیەکەمان ئەوەندە چڕوو پڕبووە، هەمیشەیی بووە، بەڵام چاوپێکەوتن و دیدارمان هەبوو، شوناسیمان هەیە لەگەڵ یەکتری، ئایا لەداهاتوودا هاوکاریماندەکات، هێشتا لێم دیارنییە.

*ئەمریکا هاوکاری مادی ئێوە چۆن چۆنی دەکات؟

عەبدوڵای موهتەدی: نایکات.

*ئەی هاوکاری نیزامی؟

عەبدوڵای موهتەدی: نەیکردوە.

*ئەی لەسەر چ بنەمایەك پەیوەندیتان هەیە؟

عەبدوڵای موهتەدی: ئەرزمکردن نەك بۆ ئێمە، بەدەگمەن، دەنا ئەمریکای دەورەی جۆرج بۆش، کارێکی بۆ ئۆپۆزسیۆن و بۆ میللەت نەکرد، بڕوای ئەوەبوو لەسەرەوە بۆ خۆی ئێران دەگۆڕێت.

## ئۆباما لە جورج بۆش باشترە

* پێتوایە ئۆباما لەو باشتر دەبێت؟

عەبدوڵای موهتەدی: جارێ زووە بۆ قەزاوەت، بەڵام پێموایە ئوباما لەو باشتر دەبێت.

*ئێوە چاوتان لەوەیە وەکو روخانی رژێمی بەعس ئەمریکا هاوکاریتان بکات، بۆ روخانی رژێمی ئێران، یان پێویستان بەتاکتیکی شۆڕشگێڕانەو خەباتی چەکدارانەو هێزی جەماوەری خۆتان هەیە؟

عەبدوڵای موهتەدی: نا، نا گۆڕانی ئێران، ئەسڵەن سیناریۆکەی عیراق ئەئێمە داوایدەکەین، نەئەوانیش دەیکەن.



# نابێ کورد دژایەتی ئەمریکا بکات

***ئەی چۆن چۆنی دەبینەوێت؟**

**عەبدوڵلای موهتەدی:** پێش هەموو شتێ ئێمە خوازیاری پشتگیریەکی سیاسین لەگەڵ کورد، لە داخوازییەکانی، لەگەلانی ئێران، لەخەڵکی ئێران، لەئۆپۆزسیۆنی ئازادیخوازو دیموکراتی ئێرانی، ئێمە خوازیاری ئەوەین کەئەمریکاو ئەوروپاو هەموو دنیا پشتگیری سیاسی بکات، پێشێلکاریەکانی مافی مرۆڤ لەئێران قبوڵ نەکات، کێشەی ئەتۆمی نەکات بەتەنها کێشەی خۆی لەگەڵ ئێران، بەڵکو پێشێلکاری مافی مرۆڤ بۆ ئێمە لەڕوانگەی خەڵکی ئێرانەوە، ئەوە مەسەلەی سەرەکییە، پێمانوایە دەبێت پشتیوانی دیبلۆماسیمان بکات، بەپشتیوانی مادیش ئەوەی ئۆپۆزسیۆنی راستەقینەی ئێران بیکات، جێی خۆیەتی، بەڵام کاری گۆڕانی سیاسی کاری خەڵکی ئێرانە، بەڵام هەموو بزوتنەوەیەك لەدنیادا کەخوازیاری گۆڕانی نیزامی، سیاسیە، هەقی خۆیەتی خوازیاری پشتیوانی و پشتگیری دەرەکی بێت.

پێشمانوایە بەپێچەوانەی سی ساڵ لەوەو پێش، چل ساڵ لەوەوپێش دەورەی رژێمی شا، دەورەی شۆڕشی ئێران بوو، لەساڵانی (1978–1979) کەئەو وەختی شۆڕشی ئێران دژی ئیستبدادی شا، راستەوخۆ دژی ئیستبدادی ئەمریکا بوو، چونکە لەباری بابەتیەوە رژێمی ئەمریکا پشتیوان و داکۆکیکاری سەرەکی بوو لەرژێمی شا، ئەگەر بتویستیا لەدژی شا بوەستیت ئەمریکا دوژمنت بوو، ئەو بارودۆخە گۆڕاو، سی ساڵ بەسەر دونیادا تێپەڕیوە، ئێستا ئەمریکا پشتگیری ئەو رژێم دیکتاتۆریە ناکات، کەدوژمنی ئێمەو دوژمنی کوردو هەموو ئازادییەکە لەئێران.

بەپێچەوانەوە لەوانەیە هاوتەریب بین لەگەڵ یەکتری، لەبەرئەوەی دەبێت ئێمە ئەم بارودۆخە تازەیە تێبگەین ئەو دوژمنایەتیە کوێرانەی ئەمریکا یان هەرچی ئەو دوژمنایەتی سی ساڵ لەوەو پێش ئەمریکا بێ مەعنایە، مێژوو وات پێنالێت، ئەگەر خۆت لەباری ئایدۆلۆژییەوە قسەیەك دەکەیت، دەنا پێویستیەکی سیاسی بەو کارەنییە، ئێستا دنیای رۆژئاوا، ئەمریکا هەموویان فشار دەخەنە سەر ئێران، هەموویان نەیاری ئەو رژێمەن کەوا نەیاری ئێمەیە، لەباری بابەت و ئۆبجکییتەوە، ئێرانێکی گەورە هاتوتە ناوچەکە بەداخەوە حزبی کۆمۆنیست و زۆر کەسی کەلەو جۆرە چەپە تێناگەن، لە مەسەلەحەتی کوردو ئێراندا نییە دژایەتی ئەمریکا بکات نەپێی دەکرێت نەلەمەسلەحەتیشدایە بیکات،

بەپێچەوانە دەیان و بگرە سەدان ساڵە دەوڵەتی مەرکەزی ئێران نێوانی لەگەڵ روس و ئینگلیزو هەموو وڵاتانی دەرەوەی خۆشبووە، هەموویشی بەکارهێناوە بەدژی کورد، باشە بۆ جارێك کورد بۆی هەڵکەوت، بۆی نییە کەڵك وەربگرێت لەبارودۆخێکی لەباری ناوچەیی، نێونەتەوەیی کەرەنگبێت رووبدات، ئێمە پێی کافردەبین، ئەگەر پشتگیریەکی جیهانیمان بێت، بۆچی دەوڵەتی ئێران ئەوە



چەندەها ساڵە بەکەیفی خۆی لەپەیمانی بەغدا بوە لەپەیمانی سەنتۆ بوو، لەپەیمانی سەعد ئابادبووە لەهەمووشی پشتگیری وڵاتە گەورە سەرمایەدارەکانی دینا لەپشتبووە، ئێمە جارێك فرسەتمان بۆ هەڵکەوێت بۆنەیکەین.

# وەکو میوان ئەندامی (SI)ین

***لەگەڵ یەکێتی ئەوروپایان وڵاتی ئەوروپا کۆمەڵە پەیوەندی چۆنە؟ تاچەند هاوکاری مادیتان دەکەن؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** هاوکاری مادییان نەکردوین، بەڵام ئێمە لەم ساڵانی دوایدا، هەرچەندە بەداخەوە کەمە، بەڵام هەوڵماینداوە بۆ دروستکردنی پەیوەندی لەگەڵیان، بەتایبەتی لەگەڵ ئەحزابی سۆسیال دیموکرات و سۆسیالیست، کەدەزانی لە ئەنتەرناسیۆنالی سۆسیالیستدا یەکیانگرتووە، داوای ئەندامێتیمان لێکردون حاڵی حازر، بەمیوانی رەسیمان قبوڵکردوین، بەڵام وەڵامی داواکاری ئێمەیان بۆ ئەندامێتی نەداوەتەوە نێوانمان هەیە، بەڵام زۆر دەبێت لەوە زیاتر کار بکەین.

***گرنگە بۆ ئەندامبوون لەئەنتەرناسیۆنالی سۆسیالیستدا؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** بەڵێ پێمان گرنگە.

***گرنگیەکانی چییە بۆ ئێوە؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** ئەنتەرناسیۆنالی سۆسیالیست، دوای نەتەوەیەکگرتووەکان گەورەترین رێکخراوی جیهانییە، ئەمە بەدەستکەوتێکی دەزانین بۆ گەلی کورد، لەجێیەك ئەگەر ئێمە جاری دەوڵەتمان نییە، ناتوانین بەئالای خۆمانەوە لەنەتەوەیەکگرتووەکان وەکو دەوڵەت بین، رێگەی ئەوێمان نییە، با لەئەنتەرناسیۆنالیست سۆسیالیستدا هەبین، وەکو کورد دەشزانین غەیرە حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران هیچ حزبێکی دیکە لەئێران ئەندام نییە، لەئەنتەرناسیۆنالدا بەسەرکەوتنێکی گەورەی دەزانین بۆ کورد ئەگەر ئێمەش بتوانین ببینە ئەندام، بێجگە لەوە لەباری خەتیشەوە ئێمە خۆمان ئەوەندە بەدوور نازانین، پێمانوایە دەتوانین ئەندامی ئەوان بین لەهەمانکاتیشدا بەرنامەی خۆمانمان هەبێت.



# پەیوەندیمان لەگەڵ ئیسرائیل نییە

*پەیوەندیتان لەگەڵ ئیسرائیل هەیە؟

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** نەخێر پەیوەندیمان نییە.

# زۆر خاڵی هاوبەش لەنێوان کوردو ئیسرائیل هەیە

*حەزدەکەیت ئیسرائیل داوات لێبکات پەیوەندیەکی وا دروست بێت؟

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** بەگشتی من دژی پەیوەندی نیم، بەگشتی لەگەڵ ئەو دوژمنایەتیەی ئیسلامیەکان هەیانە لەگەڵ ئیسرائیل، بۆ کورد بە سیاسەتو بەکارێکی هەڵەی دەزانم، پێموایە زۆر بەرژەوەندی هاوبەش و زۆر خاڵی هاوبەش لەنێوان کوردو ئیسرائیلدا، بۆ نابێت کەڵکی لێوەرگرین، ئەوەش بەمانایەك نییە مافەکانی فەلەستین نابێت بدرێت، کورد پشتیوانی زۆری کردووە لەفەلەستین وەڵامی خۆی وەرنەگرتووتەوە.

# کورد زۆری بۆ فەلەستین کرد، بێ ئاکام بوو

*کارێکی خراپی کردووە؟

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** وەڵامی نابێت خۆتیان بۆ بەکوشت بدەیت، پێموایە فەلەستینیش هەقی خۆیانە، پێموایە گەلاڵەی دودەوڵەت، دەوڵەتی فەلەستین و دەوڵەتی ئیسرائیل گونجاوترین و واقیعبینانەترین شتێکە کە دەتوانێت مافی هەردوو لایەنە دابینبکات، فەلەستینیش میللەتێکی زوڵملێکراون و دیارە بۆ خۆیان هەڵەی زۆریان بووە، بێ خەتانین بۆ خۆیان، بەڵام بەهەرحاڵ ئەوانیش مافی دەوڵەتی خۆیان هەیە، ئیسرائیلیش مافی ژیانێکی لەئەمن و ئاسایشدا هەیە، بۆیە دەبێت هەردوو لاقبوڵبکرێن، من پێموایە سیاسەتی دروست بۆ کورد ئەوەیە کوردی ئێران بەتایبەتی، کورد بەگشتی، بەڵام کوردی ئێران کەمن دەتوانم بەتایبەتی قسەی لەسەربکەم، دۆستایەتی دنیا و عەرەبی هەبێ، بەڵام دوژمنایەتی ئیسرائیلی نەبێت.

*تۆ ئەگەر ئەو پەیوەندیانەت پێباشە لەگەڵ ئیسرائیل بۆ دروستی ناکەیت؟

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** نەموتووە پەیوەندیم پێباشە، بەڵام وتم زۆر مەسەلەحەتە.



*ئەترسی؟ وەکو هەموو سەرکردە کوردەکانی تر زۆر ئەترسن لەعەرەب، لەوڵاتانی ناوچەکە، کە پەیوەندیان لەگەڵ ئیسرائیل هەبێت لەکاتێکدا زۆر لەحزبەکانی کوردستانی پەیوەندیان لەگەڵ ئیسرائیلدا هەیە بەس بەشاراوەی؟

عەبدوڵڵای موهتەدی: دڵنایی.

*بەڵێ؟

عەبدوڵڵای موهتەدی: ترسی ناوێت، بەڵام تائێستا شتی وا پێکنەهاتووە.

## گەر داوای پەیوەندی لەگەڵ ئیسرائیل کرا دەبێ حزب بڕیار بدات

*ئەگەر تۆ رۆژێ لەرۆژان داوات لێبکەن بەلاتەوە ئاساییە وەکو حزبێك؟

عەبدوڵڵای موهتەدی: نازانم بڵێم ئێستا چ شتێك وەڵامدەدەیتەوە ئەگەر شتێکی وام لێداوە بکرێت، من دەیهێنمەوە ناو حزبەکەمو دراسەید دەکەین و لێی دەکۆڵینەوە.

* پەژاك دەیکات، بۆچی؟

عەبدوڵڵای موهتەدی: چۆن دەیزانی.

*بە پێی ئەو سەرچاوانەی کەباسیدەکەن؟

عەبدوڵڵای موهتەدی: ئاخر هەرچی میدیاکان دەیڵێن خۆ راست نییە.

*رۆژنامە جیهانیەکان باس لەوەدەکەن، کەفلانە بەرپرسی پەژاك لەگەڵ ئیسرائیل دانیشتاو هاوکارییاندەکەن، بۆچی ئەبێت عەیب بێت؟

عەبدوڵڵای موهتەدی: قسەکەم دوورنییە لەقسەی بەرێزت، من پێم عەیب نییە، پێموانییە، مەرج نییە ئینسان هەڵپە هەڵپ بکات و نەزانێت کاتی دیاریکراو بۆئەو کارەکەی وەختێتی دەبێت لێی بکۆڵدرێتەوە، بەڵام بەگشتی وەکو شتێکی پرەنسیپی، وەکو شتێکی گشتی نا من دژی هیچ کامیان نیم.



## کورد نابێ دژایەتی ئێسرائیل بکات

***تۆ پێتوایە ئیسرائیل یەکێکە لەوڵاتانەی لەناوچەکەدایە دۆستی کوردبێت، یا بەکەڵکی ئەوەبێت کورد دۆستایەتی بکات؟**

عەبدوڵای موهتەدی: بەڵێ، پێموایە، کورد نابێت دوژمنایەتی نەعەرەب بکات، نابێت دوژمنایەتی ئیسرائیلیش بکات، کورد دەبێت سیاسەتێکی سەربەخۆی هەبێت، لەسەر پێی خۆی راوەستێت بۆی هەیە، دۆستایەتی هەردووکیان بکات، هیچیشیان گلەیی لێنەکەن.

***بەڵام ئەوەشت لەبەرچاو بێت، سیاسەتی ئیسرائیل بەرامبەرکورد سیاسەتێکی ئیزدواجیەتە، لەلایەکەوە (عەبدوڵڵا ئۆچ ئالان) دەگرێت تەسلیمی تورکیای دەکاتەوە، لەلایەکەوە هاوکاری پەژاک دەکات؟**

عەبدوڵای موهتەدی: ئەوەش وایە، من مەبەستم ئەوەبوو خاڵی هاوبەش هەیە لەنێوانماندا، دوژمنایەتی ئیسرائیل پێویست نییە بۆ کورد، کورد ئەگەر کیانێکی هەبێت لەکاتی خۆیدا هەوڵدانێک بۆ پەیوەندی گرتنێکی ژیرانەو مەعقول لەگەڵ وڵاتی ئیسرائیلیش بەخراپ نازانم، بەباشی دەزانم، بەڵام خۆ نەموتوە ئەوان بەرژەوەندی خۆیان نابینن و عاشقی کوردن و ئەوەشتێکی ترە، دیارە ئەوانە دوای بەرژەوەندی خۆیان دەکەون.

## ئیسرائیل هاوکاری (TV) رۆژهەڵات ناکات

***ئەوە چەند راستە تەلەفزیۆنەکەی ئێوەو تەلەفزیۆنی ئینتەرناسیۆناڵ و کۆمەڵە وحزبی حیکمەتیست و ئەوانە هەمووی بەهاوکاری ئیسرائیل دادەمەزرێن؟**

عەبدوڵای موهتەدی: "بەپێکەنینێکی زۆرەوەو لەدڵەوە" ئەو قسەیە بۆ کاک سەید برایم ئەوانیش بێ خۆیان دەکوژن ئەو قسەیە بیستن، وەڵڵاهی من هی خەڵکی نازانم تەسەور ناکەم بۆ ئەوان وابن، نازانم بۆ ئەوان ناتوانم قسەی لەسەربکەم، بەڵام نەخێر بۆ ئێمە واننییە.

***تائێستا هیچ پارەیەکتان لەئیسرائیل وەرنەگرتووە؟**

عەبدوڵای موهتەدی: نەخێر.



# زۆرترین پارەی ئێمە، حکومەتی هەرێم دابینی دەکات

***باشە تۆ دەڵێیت "ئەمریکا پارەمان ناداتێ و ئەوروپا نامانداتێ و ئیسرائیل نەمانداتێ، سەرچاوەی دارایی ئێوە کوێیە؟**

عەبدوڵای موهتەدی: وەڵاهی بەشی زۆری سەرچاوەی داراییەکەمان حکومەتی هەرێمی کوردستانە، ناتوانم بیڵێم کەچەندمان دەداتێ.

***دوایی ئەوە؟**

عەبدوڵای موهتەدی: دوایی ئەو ئێمە خەڵکمان هەیە لەئێران، دۆست و ناشنامان هەیە لەدەرەوەی وڵات، لەهەندێ رێکخراوەی (N.G.O) ی نەك دەوڵەتان، ئەوانە یارمەتی باشماندەدەن.

***بۆئەو تەلەفزیۆنەتان ناو ناوە رۆژهەلات؟**

عەبدوڵای موهتەدی: خەڵکی رۆژهەڵاتی کوردستانین، ئەوە ناوێکی باشە، کوردستانی ئێران هەمان کوردستانی رۆژهەڵاتە.

***بۆچی ستودیۆی ئەسڵیتان لە(زرگوێزڵە) دانەنا، ئەوە راستبوو کەئێران ئاگاداری حکومەتی هەرێمی کوردستانی کردووە کەنابێت کۆمەڵە لەوێ زۆر پەرە بەکاری خۆیان بدەن؟**

عەبدوڵای موهتەدی: وەڵا هەروەکو باسمکرد حکومەتی ئێران هەمیشە لەو فشارانەی هەبووە، ئێستاش هەر هەیەتی لەداهاتوودا ئەگەر زیاتری نەکات کەمتری ناکاتەوە.

***ئەم ماوەیە خۆت سەرپەرشتی ئەو تەلەفزیۆنە دەکەیت، گرنگە بۆت؟ یان لەبەرئەوەی هەستتکرد لاوازە، یان تێڕوانینی تۆ چۆنە بۆ رادیۆ و تەلەفزیۆن؟ کەدەتوانێت رۆڵێکی گەورەی هەبێت؟**

عەبدوڵای موهتەدی: وەڵاهی بڵێم چی جەماعەت بڕیاریاندا من بیکەم ، ئەوە ماوەیە کەسپاردوومە بەئەبوبەکری مدرسی، بەلام ماوەیەك کارمکردووە پێموایە کاریگەری چاکیشی هەبوو وەهەستانەوەیەکی چاکیشی بەخۆیەوە بینی، هەربەمن نا جەماعەتیش زەحمەتی زۆریان بۆ کێشا، زۆر ئەوانەی لەتەلەفزیۆن کاردەکەن، بەراستی بەئانەسکی کاردەکەن، شەو و شەونخونی بۆدەکەن بەکاتژمێر کاریان هەیە، لەبەر کەمی پارە ئابووریەکەی، دیارە خەڵکە کەزۆر تەلەفزیۆنیان



خۆشەویستی و زەحمەتی بۆ دەکێشن، بەڵام مەبەست ئەوەیە ئەگەر ئاوانەبوایە وەکو تەلەفزیۆنەکانی تر بەپارە کارمان بکردبا، هەرگیز نەماندەتوانی دایبنێین، چونکە خۆ ئێمە پارەمان نییە.

*ئێستا هەر حزبێك دەگریت خێرا کەناڵێکی ئاسمانی دادەنێت؟ پرسیارە بۆ خەڵك ئەم پارەیە لەکوێ وەدێنن؟

عەبدوڵای موهتەدی: وەڵلا بەڕاستی ئەوە پرسیاری منیشە.

*منیش لەتۆ ئە پرسم ئەو پارەیە لەکوێوە دابیندەکەن، مانگانە چەندی دەوێت؟

عەبدوڵای موهتەدی: بۆچی ئەوانە بڵێم.

# رادیۆ رادەگرین لەبێ پارەیی

*تەلەفزیۆنەکەتان کاریگەری زۆریکردووە لەئۆرگانەکانی ترتان لەرادیۆکەتان رۆڵی زیاترتان داوە بەتەلەفزیۆنەکە؟

عەبدوڵای موهتەدی: بەڵێ، وایە کاریگەری داناوە، لەوایە رادیۆکەمان بۆ ماوەیەکی کاتی دەستی لێی هەڵگرین، وەکو ستاف بیدەین بەتەلەفزیۆن، ئەوەش لەبەر بێ پارییە، دەنا ئەگەر هەمان بوایە وامان نەدەکرد.

*لای ئێوە کێ سەرپەرشتی راگەیاندن دەکات؟

عەبدوڵای موهتەدی: ئەبوبەکری مودەرسی.

*تۆ وەکو هەموو سکرتێری حزبەکان و ناوچەکە بویت بەکاریزمایەك، لەو حزبە دەست بخەیتە هەموو شتێکەوە بەئارەزووی خۆت خەڵك دەربکەیت و بیهێنیت و لای بەریت؟

عەبدوڵای موهتەدی: وەڵلا نازانم بۆ کاریزمایەکەی، ئەوە بەمن نییە وەڵامبدەمەوە، بەڵام بۆ سەرەڕۆییەکەی نەخێر، من ئەسڵەن بەسروشت ئینسانێکی سەرەڕۆنیم، زۆر بەپرس و تەگبیرم، ئەفەرهەنگی حزبەی ئێمە وایە، ئەمن سروشتم وایە، دەست بخەمە هەموو کارێك، بەم بڵێم لاچۆ بەو بڵێم دانیشە، نا، نا وانییە.



## پارەی کۆمەڵە لای من نییە

***پارە لای کێیە؟ لای تۆ نییە؟**

**عەبدوڵای موهتەدی:** لای من نییە، ناڵێم کاریگەریم بەسەریەوە نییە، بەڵام پارە لای من نییە، بەرپرسێکی خەزانداریمان هەیە پارە لای ئەوە، بڕیارەکانیش لای من نییە پارە چی لێدێت بودجە هەیە.

***تاچەند شەفافن لەکاروباری ئیداریو پارەدا؟**

**عەبدوڵای موهتەدی:** بۆ ناوخۆمان؟ زۆر!

## پێت ناڵێم مانگانە چەند خەرج دەکەین

***بەڵێ، خەرجی حزبێکی وەك کۆمەڵە مانگانە بەهەموو مەسروفاتیەوە چەندە؟**

**عەبدوڵای موهتەدی:** ناتوانم بەڕاستی پێت بڵێم، نەك لەبەرئەوەی ناشەفافین، نازانم ئەوانە بەشتی ئەمنی دەزانم.

***زیاتر تۆ لەراگەیاندنەکانی کۆمەڵەدا دەردەکەوێت، هی ئەوەیە کە تۆ توانات هەیە؟ یان هی ئەوەیە کەتۆ کەسی یەکەمی؟ یان هی ئەوەیە ڕێگا نادەی بەخەڵکانی تر؟**

**عەبدوڵای موهتەدی:** وەڵا خەڵکی دیکەش هەیە، دووەهەم ئەوەیە کەڕێگاش دەدرێت خەڵکی تریش قسەدەکات، زۆرترین من قسەدەکەم بەگوێرەی پەیڕەوی ناوخۆ من سکرتێری سیاسی ئەو حزبەم.

## نازانم تاچەندی تر سکرتێری کۆمەڵە دەبم

***تاچەندی تر سکرتێری ئەو حزبە دەبێت؟**

**عەبدوڵای موهتەدی:** نازانم جارێ.

# خوا خوامە لامبدەن و کەسێکی تر بکەنە سکرتێر

***ئێستا لەحزبی دیموکرات عەبدوڵلای حەسەنزادە پاشەکشێی کردووە بۆ خەڵکێکی تر، تۆ ئامادەی ئەوە بکەیت؟**

عەبدوڵڵای موهتەدی: نا بۆ نا، خۆ من خوا خوامە.

***ئەی بۆ؟**

عەبدوڵڵای موهتەدی: ئاخر داوام لێدەکرێت، ناڵێم پێم ناخۆشە، ئەسڵەن من کاری سیاسی نەکەم، نازانم چیبکەم، کاری سیاسی ژیانمە روحمە، بەڵام مەبەستم ئەوەنییە هەڵپە هەڵپ بکەم، ئەغلەبی جار زیاتر لەسەدی ئەوەندی جارەکان داواکاری لەسەر ئەوەبووە من بکەن، دەنا منیش پێم ناخۆش نییە ماوەیەك پشوو بدەم، ماوەیەك لەگەڵ منداڵەکانم و لەگەڵ خانەوەداکەم زۆر کەم دەیان بینم.

***بۆ ماڵ و منداڵەکەی تۆش وەکو ماڵ و منداڵی خەڵکی نایەنەوە بەیەکەوە بژین لەئۆردوگاکانتان؟**

عەبدوڵڵای موهتەدی: نازانم تازە ئەوان گەورەبوون لەدەرەوە خوێندویانە.

# منداڵەکانمان تازە لەئەوروپا ناگەرێنەوە بۆ ئۆردوگا

***قەیچیکە؟**

عەبدوڵڵای موهتەدی: ئاخر نایەنەوە، بەدەست تۆ نییە، منداڵی ورد دەتوانی پەلی بگریت و بیهێنیتەوە هی بیست ساڵە چۆنی دەهێنیتەوە.

***بەو بەڵگەیەی کوڕو کچی ئەو خەڵکەش پێشمەرگەن، دەبێت ئەوانیش پێشمەرگانە بژین؟**

عەبدوڵڵای موهتەدی: ئاخر نایەنەوە، ئەگەر منیش بێمەوە ئەو بەجێ دەمێنێ لەوێ، مەگەر من زۆریان لێبکەم، منیش زۆریان لێناکەم.

***بەراستی دەزانی منالی خەڵك لەئۆردوگا بژی و منالی تۆ لەئەوروپا بژی؟**

عەبدوڵڵای موهتەدی: هەن لەئەمریکا دەژین، هەن لەئوسترالیا دەژین.

# دوو کچم هەیە و لەئەورووپان

*** پێتان ئاساییە؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** خۆ من نەم ناردوون، وەختی خێزان و هاوسەرەکەی من چووە، خۆ شاهید هەیە لەسەری، ماوەیەکی زۆر داوایکرد نەیئیرێن، بەزۆر ناردومانن، بەگریان ناردومە وەختی خۆی بەگوێرە بڕیارێك چووە، بەڵام ئێستا منداڵمان لەوێ گەورەبووە، من منداڵی هەژدە ساڵم هەیە، هەردوکیشیان کچن، هەژدە ساڵەو بیست و دووساڵە، ئەئەوەیە بتوانیت بەجێیان بهێڵێت بڵێی بۆ خۆتان بن، نەدەتوانی بەزۆر بیانهێنیتەوە.

***هەستی حزبی و کوردانە یان چۆنە؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** هەستی کوردانەیان هەیە، سەرەڕای ئەوەی لەوەی خوێندنی کوردی نەبوو، بەڵام هەردووکیان زمانی کوردی باشدەزانن وقسەی پێدەکەن، نووسینەکەی زۆر زەحمەتە بۆیان، چونکە ئەوان لەوێ ئەو ئەلف و بێیە ناخوێنن.

***کۆمەڵەن؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** وەڵڵا کاری حزبی ناکەن، بەڵام دیارە کۆمەڵەیان خۆشدەوێت و هەستێکی کوردیان هەیە.

# سکرتێری خۆشە، بەڵام بۆ ئێمەنا

***سکرتێریش خۆشە هی حزب، وانییە؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** نازانم هی خەڵکی دیکە، بەڵام هی ئێمە دەردی سەری و ئێش و ئازارەکانی زۆرترە.

***بەلام تۆ بەو ئاما نجە کاردمکەیت لەداهاتوودا وەکو ئەو خەڵکەی تر بێت؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** هیوادارم وابێت، حەسانەوەی تێدا بێت و سەرکەوتنی تێدا بێت، سەرکەوتنی تێدابێت گەورەترین شتە.



## دەترسم بمکوژن

*تۆ ناترسی بکوژرێیت، بمریت، تیرۆربکرێیت، ئەو ئاواتانەت نەیەتەدی؟

عەبدوڵای موهتەدی: چۆن نا، بەرە وەڵا، بەتایبەتی، من پێموایە ئەگەر زەفەرم پێبەرن ، حەتمەن ئامپارێزن

## فارسی، ئینگلیزی، دانمارکی، تۆزێک فەرەنسی و کوردی دەزانم

*چەند زمان دەزانیت؟

عەبدوڵای موهتەدی: فارسی، فارسی وەك زمانی دایکی دەزانم، چونکە لەتاران گەورەبووم، کوردی‌و ئینگلیزی‌و دانیمارکی، تۆزێك فەرەنسی، عەرەبی نازانم، بەڵام لەئەخبارو سەردێری رۆژنامەکان تێدەگەم، تێگەیشتنێکی کەمم هەیە بۆ عەرەبی، بەڵام ناتوانم قسەی پێبکەم.

## باشترین رادیۆ (BBC)یە

*باشترین کەناڵی تەلەفزیۆنی کەتۆ رۆژانە سەیری بکەیت کوێیە؟

عەبدوڵای موهتەدی: BBC.

*باشترین رادیۆ گوێ لێبگریت کوێیە؟

عەبدوڵای موهتەدی: ساڵەهایە وەك جاران گوێم لێنەگرتووە، جاران کەئەم تەلەفزیۆنانە نەبوو، هەمیشە رادیۆیەکەم پێبوو گوێم لە (BBC) دەگرت.

*ئەی بۆ سەیری کەناڵە تەلەفزیۆنیەکانی کۆماری ئیسلامی ئێران ناکەیت؟

عەبدوڵای موهتەدی: تەلەفزیۆن نین ئەوانە.



*بۆ؟

عەبدوڵڵای موهتەدی: هەر ئەو سەروچاو پێچانەوەی ژنان، ئەو ریشی پیاوان هەموو شتێکت لەبیر دەباتەوە، و بەلای منەوە زۆر دیاردەیەکی کۆیلەدارییە.

## زاگرۆس و گەلی کوردستان باشترین (TV) کوردین لەباشوور

*باشترین تەلەفزیۆنی کوردی ئاسمانی بەلای تۆ کامەیە ئێستا؟

عەبدوڵڵای موهتەدی: زاگرۆس و گەلی کوردستان.

*باشترین رادیۆی کوردی؟

عەبدوڵڵای موهتەدی: من زۆر گوێ لەرادیۆ ناگرم، لێتناشارمەوە.

## گاردیان باشترین رۆژنامەیە

*باشترین رۆژنامەی جیهانی کەتۆ زۆر متابەعەی بکەیت؟

عەبدوڵڵای موهتەدی: خۆم بیخوێنمە، ناڵێم باشترینە، بەڵام ئەوەی بۆ خۆم بێخوێنمەوە گاردیانی بەریتانییە.

*باشترین رۆژنامەی کوردی کامەیە کە تۆ ئە یخوێنیتەوە؟

عەبدوڵڵای موهتەدی: من سەیری زۆرێك لەرۆژنامەکان دەکەم، دیارە ناتوانم بڵێم هەموو بابەتێکی هەموویان دەخوێنمەوە، ئەوە دیارە هەرنابێت، بەڵام هەموو رۆژ سەیری نزیکە هەشت و نۆ دە رۆژنامە دەکەم، لەکوردستانی عیراق چاکیان (چاودێر) و (ئاسۆ)، تا رادەیەك هەرچەندە جارانم پێباشتربوو لەئێستا، رۆژنامە حزبییەکان هەموومایان (خەبات) و (کوردستانی نوێ) دەخوێنمەوە، (رووداو) دەخوێنمەوە، (هەولێر)یش دەخوێنمەوە.



*باشرین سایتی ئەنتەرنێتی کامەیە جیهانی و کوردی؟

عەبدوڵڵای موهتەدی: سایتی کوردیم زۆر پێخۆش نییە هیچی، فارسەکان سایتی زۆر چاکیان هەیە، بەداخەوە کورد ئەوەندە سایتی چاکیان نییە.

## مام جەلالم پێ باشترین سەرکردەیە، بەڵام هەندێ لێدوان و موجامەلاتی هەیە

*باشترین سیاسەتمدار لەسەرتاسەری دنیادا کەتائێستا زۆر پێی موعجیب بێت؟

عەبدوڵڵای موهتەدی: زۆر سەختە ئەوەی زیندووە نیلسن ماندێلا، لەکورددا مام جەلال، بەڵام پێموایە جۆرێك لێدوان و مجامەلاتی هەیە.

## عەلیزادە زۆر عاقڵ و زیرە

*ئەی برایمی عەلیزادە؟

عەبدوڵڵای موهتەدی: پێم ئینسانێکی زۆر عاقڵە، تێکۆشەرە.

## عەلیزادەم بینی و ماچم کرد

*تازەترین جار کەیەکتریان دیوە تەوقەتانکردوە؟

عەبدوڵڵای موهتەدی: بەڵێ، زۆر یەکتریمان ماچکرد، دوای ساڵەهای ساڵ، دوایی دە ساڵ یەکتریمان نەبینیبوو، لەمەراسیمی ساڵرۆژی یەکێتی بوو دەعوەتیانکردین بۆ تەلاری هونەر، لەوێ پێکەوە دانیشتبووین.

*ئێوە خۆشەویستیەکەتان هەیە، دەتانەوێت بەیەکەوە کاربکەن، بەردەوام بن، بەڵام کێشە ڕێگا دەگرێت لەبەردەمتاندا؟

عەبدوڵڵای موهتەدی: وەڵڵا پێموایەو ڕەنگە ئەویش وابێت، بێگومان من ئەوم خۆشدەوێت ئاواتی ئەوەش دەخوازم پێکەوە ڕۆژێك کاربکەین



## باکۆمۆنیستەکە لابات ئێمە دەچینەوە لای عەلیزادە

*ئەو دەڵێت من ئامادەم ئەگەر عەبدوڵلای موهتەدی بێتەوە ناو کۆمەڵە ببێت بەسکرتێر؟

عەبدوڵلای موهتەدی: وەڵڵا سوپاسیدەکەم ، بەلام بەمەرجی کۆمۆنیستەکە لابات، هەر کۆمەڵە بمێنێتەوە.

## بابێتە لای ئێمەو ببێتە سکرتێر

*یەعنی تۆش ئامادەی، ئەو بێتە ناو کۆمەڵەی شۆڕشگێڕان ببێت بەسکرتێر؟

عەبدوڵلای موهتەدی: ئەی بۆنا.

*تۆش و ئەویش لەڕێگای کۆمەڵەوە، تۆ دەتوانێت عەبدوڵلا موهتەدی بیت، ئەویش برایمی عەلیزادە، پێتانوایە ئێوە لەسەر مێژووی کۆمەڵە دەژین؟

عەبدوڵلای موهتەدی: من جوان تێنەگەیشتم مەبەستەکەت چییە.

*مەبەستم ئەوەیە عەبدوڵلا موهتەدی شەخسیەتێک و سکرتێری حزبێک و ناسراوێک و مێژوویەکی شۆڕشگێڕانە بەشی زۆری کۆمەڵە ئەوەی دروستکردووە کەچی ئێوە کۆمەڵە پارچە پارچە دەکەن؟

عەبدوڵلای موهتەدی: وەڵڵا پرسیارەکەم ئەوەیە ئێمە کەحزبی کۆمۆنیستمان پێکهێنا، هەموو ئەو پارچە پارچە بوونانە لەئاکامەکانی دروستکردنی حزبێک بوو کەلەگەڵ ڕەوتی مێژوو نەدەگونجا.

## حەسەن زیرەکم خۆشدەوێ

*دەنگی چ گۆرانیبێژێکی کوردی و جیهانت بەلاوە خۆشە؟

عەبدوڵلای موهتەدی: سەید ئەسغەری کوردستانی، حەسەن زیرەك، تایەر تۆفیق، ڕوس سپرنگیس، ئەمریکایی، سەباستیان.



## شێرزاد حەسەن و حسێن عارف باشترین ڕۆماننوسی کوردن

*باشترین ڕۆماننوس ؟

عەبدوڵلای موهتەدی: بەلزاك لەتازەکان، گارسیا مارکیز، هی کورد شێرزاد حەسەن، حسێن عارف.

## نالی و حافز دوو شاعیری گەورەن

*لەی لەشاعیری جیهانی و کورد؟

عەبدوڵلای موهتەدی: لەکورد نالی و حافزلەفارس.

## حەزم لەرەنگی سوورە

* حەزت لە چ رەنگێکە؟

عەبدوڵلای موهتەدی: دژی هیچ رەنگێك نیم، حەزم لەگەڵ هەموویان دەگونجیم، بەلام حەزم لەرەنگی سوورە.

*حەزت لە چ ئوتۆمبیلێکە؟

عەبدوڵلای موهتەدی: مارسی دس.

*حەزت لە پارەیە؟

عەبدوڵلای موهتەدی: بەتەماع نیم، زۆر سەیرە بەحەیاتم دەوڵەمەندانە نەژیاوم، هەرچەندە بنەماڵەمان دەوڵەمەندبووە، بەلام من بەحەیاتم دەوڵەمەندانە نەژیاوم، ساڵەهای ساڵ لەڕووتیدابووم، پێم هەڵکردووە، ئینسانێکی قانعم.



***جوانترین ئافرەت، کە لەمێژووی ژیانتا بینیبێت سەرنجی ڕاکێشا بێت کێیە؟ یان هەبووە شتی وا؟**

عەبدوڵڵای موهتەدی:ئەم پرسیارانە زۆر تایبەتە، من ئەوانەم بۆ ژنەکەشم باسنەکردووە، باشتێکت پێبڵێم لەناو ئەکتەرێستەکان جوانترین جولی کریستە لەفیلمی دکتۆر ژیواگۆدا.

## ژنەکەی خۆمم لەهەموو کەس خۆشتر دەوێ

***ئەی لەکورددا؟ لەژنی کورددا؟**

عەبدوڵڵای موهتەدی: زۆریان جوانن، بەلام ژنەکەی خۆمم لەهەموویان خۆشتردەوێ، بەلام ناکرێ لەهەموویان جوانترین، مجاملەشی نییە

## ژنهێنانی دووهەم عەیبە

***بەنیازنیت ژنی تر بهێنیت؟**

عەبدوڵڵای موهتەدی: هەر پێم کارەساتە.

***کچەکانت خۆشنەوێ؟**

عەبدوڵڵای موهتەدی: زۆر.

***ناویان چییە؟**

عەبدوڵڵای موهتەدی: کچە گەورەکەم ناوی دیلانە، کچە بچووکەکەم ناوی دیانەیە، ماوەیەك لەدیانە بووین شوێنێکی زۆر خۆشە، لەهەمانکاتدا ناوێکە لەگەلّ خاریج یەکدەگرێتەوە.

## حەزمدەکرد، دوو سێ کوڕیشم هەبوایە

***هەر ئەو دووکچەت هەیە؟**

عەبدوڵڵای موهتەدی: پێمخۆش بوو دوو سێ کوڕیشم بوایە، دوو سێ منداڵی تریشم بوایە، بەلام ئیتر بارودۆخی ژیانی من هەر ئەوەندەیە.



## هەندێ سیاسەت و بڕیارمداوە لێی پەشیمانم

***رۆژی لەرۆژان هەستکردووە کە نجێنیت لەدەستداوە، بەئارەزووی خۆت نەژیاوی؟ یان ئەوەی کردووتە کارێکی باشتکردووە؟**

**عەبدوڵای موهتەدی:** رێبازەکەی ئەوەی گرتومە رێبازی خەباتی سیاسی، پێموایە کارێکی باشە، پەشیمان نیم، منەتیش لەسەر کەس دانانێم، هەرچەندە شتم زۆر بەسەرهاتووە، سەختیم زۆر بەسەرهاتووە زیندان، لێدان، ئەشکەنجە، مەترسی ئیعدام، برسیەتی، تونیەتی، قسەی ناخۆش، هەموویم بەسەر هاتووە، پێشمەرگایەتی، هەڵات، هەڵات، یەك ئەوەندە لێی پەشیمان نیم، بەلام لەهەندێك لەسیاسەتەکان و بڕیارەکانمدا پەشیمانم، بریا وانەبووایە، بۆ ئەوە جارجار هەستدەکەم گەنجێنیم لەدەستداوە، ئەگەر بڵێی ئەو فکرەیەم نییە، جار جار هەمە، بەلام خۆم بەپیر نازانم، لەوانە نیم ئاڵەناڵیان بێت و هەمیشە بۆڵەیانە ئای پیربووین من وانیم.

***خۆت بە پیر نازانی؟**

**عەبدوڵای موهتەدی:** ناوەڵڵا.

## حەزدەکەم ئێستا بچمەوە کوردستانی ئێران

***کەی بەتەمای بچیتەوە کوردستانی ئێران؟**

**عەبدوڵای موهتەدی:** بەدەست من بوایە هەر ئەمڕۆ، بەلام دەبێت گۆڕان ببێت، هیوادارم زۆری پێنەچێ ئەو گۆڕانە تا گوڕو تینمان ماوە.

***تا ئەو کاتەی سیناریۆیەك دەبێت تۆ خۆت چۆن بۆ ئامادە دەکەیت چۆن دەگەڕێیتەوە، چیدەکەی؟**

**عەبدوڵای موهتەدی:** نازانم چۆن دەبێت بەعەمەلی و دنیای واقیعدا، بەلام لەئارەزوو خەونی خۆمدا پێمخۆشە بەشێوەی پێشمەرگانە بچمەوە، پێمخۆشە بەجلی پێشمەرگانەو بەپێ بچمەوە ناو خاکی کوردستان، پێمخۆشە نییە بەسواری تەیارەیەکی بۆینگ بچمەوە.

***حەزدەکەی کەچوویتەوە کوردستانی ئێران، دوای ئەو هەموو هیلاکیی و ماندووبوونەوەی چێشتووتە هەستبکەیت وا پێشوازیت لێبکەن، کەتۆ هەست بکەیت ئەوەی کردووتە بەخەسار نەرۆیشتووە؟**



عەبدوڵڵای موهتەدی: پێمخۆشە بزانم، پێمخۆشە کۆمەڵی قسەی ناهەق لەبارەی منەوە دەکرێت بۆم روون بێتەوە.

*بمبورە نابنە مۆتەکە بەسەر شانیانەوە وەکو ئەوەی بینیمان لەکوردستان عیراق، خەڵك لێی نارازیین، یان زۆرجار لێی پەشیمان بن لەو شۆڕشەی کردویانە، لەو هەموو قوربانیدانەی لەو هەموو خزمەتەی پێشمەرگە داویەتی؟

عەبدوڵڵای موهتەدی: زۆرم پێناخۆشە وام لێبێت، هیوادارم وام لێنەیەت، بۆ خۆم پێشبینی ناکەم وام لێبێت، چونکە هیچ نەبێت ئێستا نازانم دوایی چۆن بڕیار دەدەم، ئێستا لەمێشکی خۆمدا کاتیشم داناوە، من چ کاتێك دەست لەمەسئولیەت دەکێشمەوە، ناڵێم دەست لەسیاسەت دەکێشمەوە، من کەسێکی بەتەبیعەت سیاسیم تازە لەمنداڵیەوە وا راهاتووم، بەڵام دەست لەپۆستی مەسئولیەت هەڵدەگرم.

*کەی؟

عەبدوڵڵای موهتەدی: ئاخر پێت ناڵێم، بەڵام بەلای خۆمەوە دیاریم کردووە.

## ئەکچ و ئەژنەکەم ناخەمە شوێنی خۆم

*ئەی دات ناوەکێ بخەیتە شوێنی خۆت، کچەت، ژنەکەت؟

عەبدوڵڵای موهتەدی: نەوەڵڵا شتی وانییە، میراتی بنەماڵەیی نییە چۆن شتی وادەبێت.

*زۆر کەسیش دیعایەی ئەوەیان دەکرد بینمان کردیان؟

عەبدوڵڵای موهتەدی: ئەو خەڵکە کەیفی خۆیانە.



# ژنەکەم بۆ خۆی تێکۆشەرە

*** تۆ نایکەیت؟**

**عەبدوڵای موهتەدی:** ئاخر بڵێم چی ئێستا بڕیارمداوە کەنەیکەم، پێشموانییە، فەرهەنگی حزبەکەی ئێمە شتی وا قبوڵ ناکات، ژنەکەی من بۆ خۆی ئینسانێکی تێکۆشەرە، زیاتر لەسی ساڵ مێژووی خەباتی هەیە، بۆ خۆی کاری ڕێکخستنی کردووە، بۆ خۆی مەسئول کۆمیتەبوو، پێش ئەوەی هیچ پەیوەندیەکی بەمنەوە هەبێ، لەخەباتی ژناندا بووە ، لەخەباتی ژناندا پێشمەرگایەتی کردووە، مەسئولی سیاسی یەکەمینی خولی پێشمەرگەی ژنان بووە لەکۆمەڵەدا، بۆ خۆی کەفائەتی هەیە، بەڵام بەهیچ جۆرێك نەك بەبۆنەی منەوە دەردی کورد دەڵێت دەبێت خۆی داوی خۆی بکێشێت، کچەکانیش بەبۆنەی کەمی تەمەنیانەوە، جاری تەمەنیان کەمەو ئەو ئەزموونەیان نییە، حۆ پێمخۆشە ئەوانیش بەشێوەیەکی مەعقول ئەو ڕێگایە سیاسیە بگرن، بەڵام چ پێویست دەکات پۆستیان ببێت.

***دواتر دەچینە سەرباسەکانی کۆنگرەی ( دە ) زۆر سوپاس؟**

**عەبدوڵای موهتەدی:** زۆر مەمنون، بەڕاستی بەهیمەتی تۆ نەبوایە، هەرگیز ئەو گفتوگۆیانە سازنەدەبوون و ئەو شتانە نەدەدرکان.



# (11) کەس کۆنگرە جێدەهێڵن

***کـۆنگرەی (10)ی کۆمەڵـەی شۆڕشـگێڕی زەحمەتکێشـان لـە(20) گەلاوێـژی (1383)واتـە (10)ی ئۆگەستی (2004) بەسترا، ئەو ئاڵوگۆڕانەی لەو کۆنگرەیەدا پاش ئەوەی لەکۆنفرانسی سـاغکردنەوەی کۆمەڵـەدا ؛ ئێـوە ویسـتان دوابـەدوای ئـەوە لەوکۆنگرەیـەدا چـیبکەن، تاچـەند کۆمەڵـە بـەهێزبوو، راسپاردەی تازەی پێبوو، توانی دەورو نەخشی تازەی هەبێ؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** دیارە بەڕاستی بۆ ئەوەی کەبەووردی لەسەر ئەو کۆنگرەیە بدوێین پێویستە هەموو بەڵگەکانی و راپۆرتەکانی لەبەرچاوبێ کەئێستا لەبەردەم نییە، بەڵام لەچەند تەوەرەدا دەتوانم بۆتان باسبکەم.

یەکەمیان، ئەوەبوو دوای (4) ساڵێك لەپرۆژەی ساغکردنەوەی کۆمەڵەو هاتنەدەرەوەی ئێمە لەحزبی کۆمۆنیستـی ئێـران، بەتـەواوی جێگـەی خۆمـان لەکۆمەڵگـەی کوردسـتان کردبـووەو وەخـەریکبووین بەخێرایی وەکو بەدیلی سەرەکی و ئەسڵی کۆمەڵە لەکوردستان و ئێرانیش دەناسراین، خەڵکێکی زۆر لەلامان کۆبوەنەوەو هیـواو ئومێدێکی زۆر کۆبووبـووە، لەبەرامبەر ئەوانەدا ئێمە پێمانوابوو، وەختی ئـەوە هـاتووە کەئـەو سـەرکەوتنە سیاسـیە یـان ئـەو دەسـتکەوتە سیاسـیانەی لـەو (3و4) سـاڵەدا دەسـتەبەرکراوە، دەبێـت ئەمـە لـەقاڵبی تەشـکیلات و ڕێکخسـتن و باشـترکردنی کـاری ئۆرگانـەکان و باشترکردنی ڕێکخستنی حزبیشماندا رەنگبداتەوەوە بۆیە دەتوانم بڵێم لەسەر دوو خاڵ لەو کۆنگرەیە جەختی زۆرکرا:-

1-چاکسـازی حزبـی بـوو، ئەسـڵەن شـیعاری چاکسـازی حزبـی کەلـەکۆنگرەی (10)دا درا کـەمن خـۆم لەنوێنەرایـەتی کۆمیتـەی ناوەنـدی ئـەو کاتـەی کۆمەڵـە ئـەو باسـەم هێنایـە ئـاراوە، ئەمـە یـەکێك لەپێناسەکانی ئەو کۆنگرەیەیە. مەبەستیش ئەوەبوو کەئێمە پـرۆژە سیاسیەکەمان دروستەو ڕاست و دورستبوونی خۆی لەبەرچاوی خەڵك پشانداوە، لەئەزموونی کوردستاندا نیشانداوە.

کۆمەڵێك شیعاری ئێمە وەکو فیدراڵیزم، بەرەی کوردستانی، وەکو بەرەیەکی گەلانی بن دەستی ئێران، ئەوانـە وورده وورده جێگـای خۆیـان کردبـووەوە، لەبەرئـەوە ئێمـە دڵنیـابووین لـەباری سیاسـیەوە گەشـەیەکی چاکمانکردوە، کۆمـەڵێك دەستکەوتمان دەستـەبەرکردوە، ئیعتیبـاری کۆمەڵـە لـەنێو هـەموو ئەوساتی کوردستانی زیادیکردبوو، لەنێو ئێرانیەکانیش هەروا.

بـەڵام ئێمـە هەسـتمان بـەوەدەکرد کەهێشـتا حزبەکـەی ئێمـە وەکـو ئاپاراتێـك وەکـو دەزگایـەك، ئـەو دەستکەوتانە بەو شێوەیەی کەپێویستە لەکاری حزبایەتیماندا رەنگی نەدابووەوە، بۆیە ئێمە شیعاری چاکسـازی حزبیمـان لـەو کۆنگرەیـەدا هـەڵگرت، لـەپاڵ ئـەوەدا ئینسیجام و یەکخسـتنەوەی ریزەکـانی



حزبیش، چونکە وورده وورده بەعزێ قسەش هەبوو بەبێ ئەوەی زۆر ناوەڕۆکێکی سیاسی دیاری هەبێ، بەلام جۆرێك بۆڵەبۆڵ و جۆرێك دڵ کرمۆڵی، جۆرێك لەوانە دەبینرا.

مەبەستی کۆنگرەی (10) شیعارێکی جەخت و پێداگری زۆرتر لەسەر یەکرێزی و ئینسیجامی حزبی ئەمە دەتوانم بلێم ئەوەبوو.

پێموایە کۆنگرە وەکو خۆشی ناموە فەق نەبوو ماوەیەك پێش ئەو کۆنگرەیە ئێمە کارمان لەسەر ئەوە کردبوو کەلەدرێژەی ئەو رێبازە سیاسیەدا کەئێمە لەکۆمەڵەی شۆڕشێگێر تەعقیبماندەکرد و درێژەمان پێدەدا، کۆمەڵێ شتی تریش لەکۆنگرەدا هاتنەناوەوە، دیارە من ئێستا هەموو بریارەکانیم لەبیر نییە، بەلام دەزانم لەسەر بەرەی کوردستانی جەختێکی دوبارەکرایەوە، بەرەی کوردستانی پێشتر لەکۆنفرانس هاتبووە ئاراوە، ئێمە کەلاڵەی تەواومان بۆ ئەو بابەتە فەراهەمکردبوو هەروەها مەسەلەی فیدرالی، جارێکی تر پێداگری لەسەر کراوە، پێویستی دروستکردنی بەرەیەکی بن دەستی گەلانی ئێران، نەتەوە بندەستەکان پێداگری لەسەرکراوە. پێویستی هەولدان بۆ ئینتیلافێکی دیموکراسیخوازی ئێرانی پێداگری لەسەرکراوە، واتە بۆ بەهەموو جۆرە شکۆفانەوەیەك و پەلهاویشتنێکی سیاسی و پەرەسەندنێکی سیاسین لەکاری کۆمەڵەدا.

دەبینی لەپاڵ ئەوانەدا شتێکی سیاسی تریش بوو، ئەویش ئەوەیە ئێمە ماوەیەك بوو کارماندەکرد لەسەر ئالای کوردستانی و بەرەسمی ناسینی ئالای کوردستانی وەعاقیبەت بەر لەکۆنگرە بریار نامەیەکمان لەناو کۆمیتەی ناوەندی کۆمەڵەدا پەسەندکرد، من دەقی بریار نامەکەم نوسیبوو وەنەزەری هەموو هاورێیانیش خوازرا، بۆیە عاقیبەت سیاغەکردن و فۆرملاسیۆنەکەی جۆرێکی وابوو کەهەموو کەس قبولی کرد بەحسی زۆری لەسەر کرا، من خۆم سیمیناری زۆرم لەسەردا، لێرە لەدەرەوەی ولات، بۆیە بەکۆی دەنگی کۆمیتەی ناوەندی پێش بەستنی کۆنگرەی (10) لەسەر ئالای کوردستان ساغبووینەوە، بەلام ئەو ئالای کوردستانە لەکۆنگرەی (10)شدا هاتەوە ئارا، بەلام لەکۆنگرەدا کەهاتەوە ئارا چەند کەسێك کەپێموایە ژمارەیان (11) کەس بوو ئەگەر بەهەڵەدا نەچووبم لەئیعتراز بەمەدا کۆنگرەی (10)یان بەجێهێشت، دیارە لەکۆمەڵە نەهاتنەدەرەوە، بەلام کۆنگرەیان بەجێهێشت، وەکو ئیعترازێك کەبۆچی ئەم ئالایە پەسەندکراوە ئەوە هەنگاوێکە بەرەو ناسیۆنالیزم.

بەبڕوای ئەوان نەدەبووایە ئەو کارە بکرێ، ئێمە هەر لەو کۆنگرەیەدا هەینەتێك کەبەهەڵەدا نەچووبم (2) کەس بوون کەقسەیان لەگەڵ بکا و بێنەوە ناو کۆنگرە، لەهەر حاڵدا ئەوان نەهاتنەوە، بەلام ئێمە هیچ ئیجراناتێکی حزبیمان لەسەرنەکردن، لەهیچ پۆستێك لامان نەدان، مانەوە لەسەر ئیش وکاری خۆیان، تەنانەت ماوەیەك دوای ئەوەلەیەکێك لەسایتە ئنتەرنێتە کوردییەکان بەناوی دیمانە کۆبوونەوەیەکیان لەگەڵ من سازکردبوو و دیدارێکی دوورودرێژیش بوو، لێیانپرسیم ئەو (11) کەسە بۆچی هاتوونە دەرەوە، منیش خۆیانم بانگکرد پێموتن لێیان پرسیوم بۆچی ئێوە لەکۆنگرەی (10)



هاتونەدەرەوە، زەحمەت نەبێ پێم بڵێین، بزانم بۆچی هاتوونەدەرەوە، مەنتقی قسەکانی خۆتان دەنوسم، من نامەوێ بەس قسەی خۆم لەسەر ئێوە بنوسم، ئەوانیش دەقێکیان دامێ وتیان کاکە ئێمە لەسەر ئەوە هاتووینە دەرێ، رێك قسەکەی ئەوانمکرد، وتم کاکە ئەوە دەقی نوسراوەکەی خۆیانە، ئاوا دەڵێن، لەهەر حاڵدا مەبەستم ئەوەیە هیچ توندوتیژیەك، یان ئیجرائاتێکیان لەسەرنەکرا، ئەگەر بڵێم رووداویان شتێك لەکۆنگرەدا بوو ئەمە بوو.

***ئەو بۆچوونەی ئەو ( 11 ) کەسە تاچەند راستبوو لەسەر ئالای کۆمەڵە کە بەرەو پێشچوونێکە لەسیاسەتی کۆمەڵەدا کەبەرەو ناسیۆنالیزم بچێت؟**

عەبدوڵڵای موهتەدی: نا من پێموایە ئەوان حەق نەبوون، ئەو هاوڕێیانەی لەکۆنگرە هاتنەدەرەوەوە، وردە وردەش ئەو دیدە یان کزبوو هەر نەما.

# کۆمەڵە حزبی کوردستانییە و سیاسەتی ئێرانیشی هەیە

***لەدوای کۆنگرەی ( 10 ) ئەو دیدارانەی کردوتە لەگەڵ ئۆرگانەکانی خۆتان، یان لەگەڵ سایتەکان، راتگەیاندوە"کۆمەڵە حزبی سەرتاسەرییە، بەلام سیاسەتی سەرتاسەری ئێرانی هەیە، مەبەستە راستەکە ئەو پرسیارەیەکە حزبی کۆمۆنیست لەتۆیان هەیە ئەی کوردستانی سەرتاسەری ئێرانی واتە چی؟**

عەبدوڵڵای موهتەدی: نا ئاوایە راستییەکەی، پێش کۆنگرەی (10) ش وتومە "کۆمەڵە حزبێکی کوردستانیەو هەر حزبێکی کوردستانیشە"، واتە بەهەموو مانای خۆیەوە، بەلام مەبەستم ئەوەیە بەرژەوەندی ئێرانی هەیە، ئێمەی کورد نەك هەر بۆ کۆمەڵە، تاوەختێك لەئێران دەژین وە بەرنامەمان مانەوەیە لەئێراندا، ئێرانێکی فیدراڵیمان دەوێت، ناتوانین بڵێین ئاڵوگۆڕەکانی ئێران پەیوەندی بەئێمەوە نییە.

ناتوانین بڵێین کاریگەری لەسەر ئێمە نییە، ناتوانین بڵێین ئەو ئاڵوگۆڕانە کاریگەری لەسەر ئێمە نییە، کەوایە حزبێکی کوردستانی دەبێت سیاسەتی ئێرانیشی هەبێت، واتە بتوانێت تەعامول بکات لەگەڵ ئێران، بتوانێ ستراتیژیەکی کوردی لەچوارچێوەی ئێراندا بەڕێوەبەرێ، من مەبەستم ئەوەیە یەعنی یا دەبێت کوردستان وڵاتێکی جیاوازو سەربەخۆبێت، یا مادام لەئێرانی، تۆ دەبێت سیاسەتت دەرحەق بەکێشە ئێرانیەکان ئەو کێشانەی سەرتاسەری ئێرانن، سیاسەتت دەرهەق بەوانیش هەبێت، ستراتیژت سەبارەت بەوان هەبێت، ناتوانی بێدەنگ بێ وپێموانییە ئەو دوانە ناتەبابن لەگەڵ یەکتری.



ئێمە حزبێکی کوردستانین، بەڵام سەبارەت بەکێشە سەراسەرییەکانی کەهەموو ئێرانیش دەگرێتەوە، سەبارەت بەوانیش سیاسەتو ستراتیژمان هەیە، واتە هەرخۆی ئەوەی دەڵێن فیدراڵی ئەوە جۆرێك سیاسەتی ئێرانییە، خۆ تەنها سیاسەتێکی کوردی نییە، بۆ کورد دیارە مافی کوردی تێدایە، بەڵام پێشنیاری جۆرێك قەوارەی سیاسیە بۆ هەموو ئێران؟ تۆ دیموکراسیت ناوێ بۆ ئێران، سێکولاریزمو نیزامێکی عیلمانی؟ دیموکراسیت ناوێ بۆ ئێران؟ ئێ خۆ ئەوانە هەموو سیاسەتی ئێرانیشت هەیە کەوابێ هەروەکو ئێستا ئەحزابی کوردی عیراق ئەحزابی کوردستانین بەلام سیاسەتێکی عیراقیان هەیە، لەئاست کێشە عیراقیەکانیش کۆمەڵێك سیاسەتو ستراتیژیان هەیە.

# ئێمە کوردستانی و حزبی کۆمۆنیست ئێرانین

---

***ئەمە ئەسلی کێشەکەی ئێوە بوو، پێشتریش لەگەڵ حزبی کۆمۆنیست ئێوە پێیتانوابوو، کۆمەڵە ئەبێ خەباتێکی کوردستانیانە بکات، بەپێچەوانەی حزبی کۆمۆنیست کە پێیانوابوو هەم ڕێکخستن هەم خەبات سەرتاسەریو ئێرانی بێ، کەواتە خاڵی ئەساسی چییە لەبۆچوونی ئێوە لەگەڵ حزبی کۆمۆنیست، یان لەگەڵ ئیبراهیم عەلیزادە لەم مەسەلەیەدا؟**

عەبدوڵڵای موهتەدی: ئا ئەوان خۆیان بەحزبێکی ئێرانی دەزانن، واتە حزبێك کەبەرێکخستن، بەستراتیژ، بەبەرنامە بەهەموو شتێك خۆیان بەحزبێکی سەرانسەری ئێرانی دەزانن، ئەوەی کەلەراستیدا ئایا حزبێکی ئێرانین، یان نەو ئەوە شتێکی جیاوازە، من پێموایە، نین، پێموایە ئەمە ئاواتو ئارەزووی خۆیانە، کردویانەتە بەناوێك بۆ خۆیان کەدیارە لەگەڵ ڕاستیدا نایەتەوە، ئەوان لەراستیدا حزبێکی کوردستانین، بەڵام نایانەوێ وابن، ئەمە بێجگە لەبەرنامەو جیاوازی سیاسەت ئەمە خۆشی لەخۆشیدا جیاوازیمان هەیە لەسەر کوردستانی بوونو ئێرانی بوون حزبی کوردستانی، یان حزبی ئێرانی.



# ڕاپەڕینی داهاتووی ئێران، دژی ئەمریکا نابێ، بەڵکو پشتیوانی لێدەکرێت
# دژبوونی ئەمریکا، دۆستایەتی ئێرانە
# کۆمەڵە نوێنەری سیاسەتی دۆستایەتی ئەمریکا و ئەوروپا دەکات

---

***لەکۆنگرەی (10)دا وتوتە "بەئەرکی خۆمانی دەزانین، پەیوەندیمان هەبێ لەگەڵ ئەمریکاو ئەوروپا" ئائەو پەیوەندیە ئاساییە لەگەڵ ئەوروپا، بەڵام پەیوەندیتان لەگەڵ ئەمریکا جێگای رەخنەی زۆرێك لەهێزە ئۆپۆزیسیۆنەکانی ئێران بەتایبەتی حزبی کۆمۆنیستی ئێرانە، پەیوەندی لەگەڵ ئەمریکا لە پێناوی چی؟ ئەوە درێژەی ئەو بانگەشانەیە کە پێشتر پێیانوابوو کەریفۆرم خوازەکان و خاتەمی هاتوون ئاڵوگۆڕی تازە پێکدێ لەئێراندا، بۆیان نەکراوە، ئەمریکا ئەیەوێ ئێران بڕوخێنێ ئەم بۆچوونانە راستبوو، یان دوای ئەم قسانەی تۆ پەیوەندیتان لەگەڵ ئەمریکا دروستبوو؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** من لەسەر ئەوە کاتی خۆی لەزانکۆی سلێمانی سیمینارێکم پێشکەشکردوە لەسەر مێژووی پەیوەندیەکانی ئەمریکاو ئێران، لەوێدا باسی ئەوەمکردوە زۆر بەکورتی، لەچەند دێردا لەدەورەی کۆنتر هەتا (28)ی گەلاوێژی (1332) کەدەکاتە (1953)ز تا کاتێك کە (C.I.A) ئەمریکا بەبنەدان و هاوکاری بەریتانیا کودەتایان نەکرد بۆ لابردنی دکتۆر مسدق، کەئەو کاتە بەڕاستی رای گشتی ئێران، نوخبەی سیاسی ئێران ئەمریکای بەدوژمنی خۆی نەدەزانی.

بەکوردی، بەرتیانیاو ئیستیعماری بەریتانیا لەلایەکەوە، ڕوس و ڕوسیای بەدوژمنی خۆی زانیوە، بەدرێژایی سەدەی نۆزدە، دواتریش سەرەتاکانی سەدەی بیست ئەمە باوبوو، بەڵام کەحکومەتی دکتۆر مسدق، کە حکومەتێك بوو تاڕادەیەکی زۆر ویست و خواستی خەڵکی ئێرانی لەگەڵ بوو وەحکومەتێکی هەڵبژێراو بوو لەمیعیارو میقیاسەکانی ئەو کاتەی ئێران حکومەتێکی دیموکراتێك بوو، دەیویست دەسەڵاتی دەربار کەمبکاتەوە، دەیویست دەسەڵاتی خاوەن موڵکە گەورەکان کەمبکاتەوە، دەیویست دەسەڵاتی شرکەتی نەوتی لەئێران کەمبکاتەوە، سەروەری ئێران بەسەر نەوتەکەیدا بسەلمێنێ، ئەم کەسە بەیارمەتی (C.I.A) وە ئەمریکاو ئینگلیز کودەتای لێکرا لەهاوینی (1953) لەو کاتەوەیە ئەمریکا وەك دوژمن جێگای ئینگلیزی گرتەوە، لەراستیشدا لەو کاتەوەیە کەئەمریکا نفوزو دەسەڵاتێکی زۆری لەڕێگەی حکومەتی شاوە بەسەر ئێراندا پەیداکرد،



دەیان هەزار پسپۆڕی نیزامیو سەربازیو ئەمنیو ئیقتیسادی ئەمریکای رەوانەی ئێرانکرد، ساواکیش ئەمریکا تەعلیماتیدا، ئەرتەشو سوپای ئێرانی ئەمریکا تەدریبی پێدەکردن.

مەبەستم ئەوەیە ئەمریکا لەپشت زۆرێك لەسیاسەتەکانی شابوو، رایگرتبوو، شا رژێمێکی دیکتاتۆری بوو، کەدوای کودەتاکەی (1953) رۆژبەرۆژ زیاتر رژێمەکەی دەبوو بەدیکتاتۆر، من خەیاڵم نییە لێکدانەوەیەك لەسەر هەموو سەردەمی حکومەتی شابکەم، بەهەموو لایەنەکانیەوە، ئەمەویٛ ئەوە بڵێم لەو کاتەوەیکە ئەو کەسانەی، ئەو ئازادیخوازانەی لەئێران کەبەدژی دیکتاتۆری شا خەباتیاندەکرد، بەشێوەیەکی بابەتی ئەمریکایان لەپشت دیکتاتۆری شاوە دەبینی، بۆیە بوو کەکاتێك لە (1357) یان (1978) یان (1979) شۆڕش لەئێراندا کرا، ئەم شۆڕشە هەم خەسڵەتێکی دژی دیکتاتۆری بوو، هەم خەسڵەتێکی دژی ئەمریکای بووە، لەم هەستەی خەڵك لەم بێزاریەی خەڵك لەوەی لەسیاسەتی ئەمریکا دوولایەنە کەڵکیان هەیە، یەکیان حزبی تودەی ئێرانو یەکێتی سۆڤیەت لەوە کەڵکیان وەرگرت، کەویستیان ئێران لەحاڵەتی یەکێك لەو وڵاتانەی یەکێك لەچەمسەری ئەمریکای بێنەدەرەوەو بەگژ ئەمریکایدا بکەن.

دووەم: ئەو حکومەتە ئیسلامیەی کەلەئێران هاتبووە سەرکار، ئەم دووانە کەڵکیان وەرگرت، بۆماوەی (30) ساڵ هەتا چەند مانگ پێش ئێستا، لەڕاستیدا ئەمریکا حاڵەتی دوژمنیان پێدا لەئێران، من لەو سیمینارەدا باسی ئەوەمکرد، وتم" لەشۆڕشی پێشووی ئێراندا هەرکەسێ دژی دیکتاتۆریو دژی ئیستبداد بووایە دژی ئەمریکاش بوو، واتە شۆڕشی ئێران دژی دیکتاتۆریو دژی ئەمریکای بوو، شۆڕشی داهاتووی ئێران بەهەرشێوەیەك بێ ئایا مەدەنی بێ یاراپەڕین بێ یان هەرچی بێ شۆڕشێك دەبێ دژی ئیستبداد، بەڵام شۆڕشێك نابێ دژی ئەمریکا، واتە ئەمریکا بەشێوەیەکی بابەتی لەحاڵەتی دوژمنی گەلانی ئێران، دوژمنی میللەتانی ئێران هاتووەتە دەرەوە، بەدەست منو تۆ نییە، زەمان گۆڕاوە، پشتیوانیش ئەبێ.

چونکە ئەو دیکتاتۆریەی کەئەمڕۆ بەسەر ئێراندا زاڵە، خەڵکی ئێران رووی هێرشەکەیان، رووی رەخنەکەیان، رووی خەباتەکەیان، لەئەوە، ئەمریکا ژێمی ئێران نییە نەك هەر لەپشتی نییە ئەمریکا دژایەتی دەکا، ئەورووپا دژایەتی دەکا، ئەم دوو حاڵەتە تۆ ناتوانی وەکو یەك دانێی تۆ ناتوانی بەزۆر دوژمن بتاشی بۆ خۆت، ئەمریکا لەحاڵەتی دوژمنی خەڵکی ئێران چۆتە دەرەوە، ئەوەی کەبڵێین وڵاتێکی سەرمایەداریەو لەئاستی جیهانیدا سەرمایەداری زاڵە، بەڵێ ئەوە بابەتێکە بۆ هەموو وڵاتاندا هەیە، بەڵام ئەمریکا دوژمنی خەڵکی ئێران نەماوە.

جانەوە لەکۆنگرەی (10)دا روون نەبوو، بەڵام خۆ ئێستا روونە لەمانگێك، مانگو نیوێك لەوەو پێش لەو نوێژە جومعە گەورەی تاران کەکرا خەڵکی حکومەتی ئەوانەی کەبڵندگۆکانی حکومەتیان پێیە، شیعاریان دەدا بۆ ئەوەی خەڵك دووپاتیبکەنەوە، مەرگ بەر ئەمریکا، سەدان هەزار کەسو



دەیان هەزار کەس وتیان مەرگ بەر روسیا، شیعارەکەی بڵندگۆی حکومەتیان دووپات نەکردەوە، بەبێ ئەوەی کەسیش پێی وتبن، رووی شیعارەکە گۆڕا، من مەبەستم ئەوەبوو، چونکە ئەو قسە بڵاوبووتەوە، لەو مانگەی رابردوودا کەسوپای پاسدارانی ئێران، رووسیا تەدریبی پێکردوون‌و مەشقی پێکردوون‌و رای هێناون هێزە ئەمنیەکانی ئێران‌و ئیتلاعاتی ئێرانی روسیا فێریکردوون‌و کەلوپەلی. داونی واتە خەڵکی ئێران رەنگە ئەمڕۆ نەفرەتێکیان لەرووسیا هەبێ، ئەوانەی کەدژی حکومەتن، بەڵام مەعقول نییە نەفرەتییان لەئەمریکا هەبێ.

لەبەرئەوە خەیاڵی ئەوەم هەیە ئەوە بڵێم، قۆناغە مێژوویەمان دەرحەق بەئەمریکا گۆڕاوە، ئەگەر کەسێك بەڕاستی واقیع بینە، بەڕاستی ماتریالیستە، ئەگەر کەسێك لێکۆڵینەوەی مێژووی لاگرنگە، ئەوە دەکاتە میلاك نەك نوقم بوونی خۆی لەئیدۆلیژیدا، دەبێ ئەوانە لێیبکۆڵیتەوە، هەر شیعارێك دژی ئەمریکا ئاوێکە دەرژێتە ئاشی جمهوری ئیسلامییەوە، هەموو ئەوانەی لەئێران پەروەندەیان بۆ دروستدەکرێ، هەر ئەوانەی کەگیراون، ئێستاوە لەدادگاکانی ئێران محاکەمەیان دەکەن، بەتاوانێ خۆ راستیش نییە، هەموویان بەتاوانی ئەوەی کەپیاوی ئەمریکابوون، محاکەمە دەکران، لەئێران ئێستا دژایەتیکردنی لەگەڵ ئەمریکا، جمهوری ئیسلامی چەپڵەت بۆ لێدەدات، واتە دژایەتیکردنی ئەمریکا وەك ئاوێکە دەرژێتە ئاشی جمهوری ئیسلامیەوە، بۆیە تۆ دەبێ ئەوە تەشخیس بدەی، دوژمنی ئێمە کێیە ئەو ئیستبدادەیە، ئەو رژێمە دیکتاتۆریە لەسەر کارە وەکو ژن وەکو کرێکار وەکو چەپ، تۆ ئەم رژێمە لا نەبەی هیچ کارێکت بۆ ناکرێ، دەی ئەم رژێمە ئەگەر بتەوێ لای بەی ئەمریکا لەبەردەمتدا نییە، کۆسپی سەر رێی تۆ نییە، لەوانەیە یارمەتیشت بدات، لەوانەیە زۆرت یارمەتی نەکا، هەرچەند یارمەتیت بدات بۆ مەبەستی خۆیەتی، ئەوە مەوزوعێکی جیاوازە، بەڵام ئەمریکا کۆسپی سەر رێی تۆ نییە، لەخەباتت بەدژی رژێمی دیکتاتۆری جمهوری ئیسلامی، ئێمە دەبێت ئەو راستیە تێبگەین جا ئەمە تا ئەو جێیەی دەگەڕێتەوە سەر ئاستی سەرانسەری، وەکو خەبات بەدژی ئیستبداد لایەنێکی تریشی ئەوەیە ئێمە وەکو کورد ئەو شەڕە بۆ بکەین لەگەڵ ئەمریکا؟ بۆچی؟ ئێمە کارێکی وانەکەین کەئێمە لەئاستی جیهانیدا دۆست پەیداکەین بۆ کورد، جا ئەو دۆستە ئەورووپیەکان، هەروەها وڵاتە رۆژئاواییەکان، هەروەها ئەمریکاشە.

ئەمە بەو مانایە نییە، کەتۆ دەست لەسیاسەتی خۆت، دەست لەبەرژەوەندی خۆت هەڵگری، بەڵام لەدنیای ئەمرۆدا دەبێت دۆست پەیداکەی بۆ گەلی کورد، ئاخر کاکە گیان دەوڵەتانی ناوچە دۆستت نین، وڵاتانی عەرەبی دۆستت نییە تورکیە دۆستت نین، ئێران سەرت دەکوتێتەوە، بزوتنەوەیەکی شۆڕشگێڕی جیهانی لەدنیا هەڵنەستاوە بڵێی هەموو دنیای سەرمایەداری‌و ئیستعماری‌و هەموو دنیاش دەڕوخێنێ بڵێی ئەو یارمەتیم دەکات، پێم ناڵێی چۆن دەتەوێت خەباتی خۆت بەریە پێشەوە؟ من پێموایە سیاسەتی دوژمنایەتیکردن لەگەڵ ئەمریکاو رۆژئاوا بەتایبەتی سیاسەتێکی

هەڵەیە لەبەرژەوەندی گەلی کورد وەلەبەرژەوەندی بزوتنەوەی رزگاریخوازانەی گەلی کوردا نییە، کەمەفروزە ئێمە نوێنەرو ئاڵا هەڵگری بین.

# ئەمریکا هیچ بەڵێینی بەکورد و کۆمەڵە نەداوە

***دۆستایەتیکردنی ئەمریکا لەچیدایە، هیچ بـەڵێنیکی داوە کەپشـتگیری لەخـەباتی ئازادیخوازانـەی کۆمەڵەو خەڵکی کوردستانی ئێران بکات؟**

عەبدوڵلای موهتەدی: نەخێر، لەراستیدا ئەمریکا هیچ بەڵێنێکی نەداوە، هیچ یارمەتیەکیشی نەکردوەوە، تا وەختێکیش نایکات، ئەگەریش هەرچی بکات لەپێناو مەسڵەحەتو بەرژەوەندی ناوچەیی و جیهانی خۆیدایە، کەسێکیش ئەلفو بێیەکی سیاسەت بزانێ، دەزانێ وایە، ناشتوانێ وانەبێ، ئەمریکا منەزەمەیەکی خێرخوازی نییە، کەدانرابێ بۆئەوەی خێر بەوانە بکات کەزەعیفن و فەقیرن و بن دەستن، بەلام بەبڕوای من دەبێت گەلی کوردوە ئەحزابێك کەخۆیان وەکو ئێمە، نوێنەرو ئاڵا هەڵگری ئەو خەباتەو ئەو میللەتە دەزانن دەبێت لەهەوڵدابن هەتا دەتوانن دۆستایەتیەکی بەرینتری جیهانی دەستەبەربکەن، هەتا بتوانن تێگەیشتنێکی زۆرتر لەئاستی جیهانیدا بۆ مەسەلەی کورد فەراهەم بکەن، دنیا تێبگەێنن سەرنجی بۆ رابکێشن، پشتگیری و پشتیوانی بۆ رابکێشن، ئەوڕۆ رەنگە هەر ئەوەندە بکەن، کەبتناس وە لەچوارچێوەی پێشێلکارییەکانی مافی مرۆڤدا بێ لەسەریشتی هەڵدەنێ، بەلام نەئەمریکا، نەئەوروپا، حاڵی حازر سیاسەتێکی وای نییە کەلەوە زیاتر پشتیوانییەکی گەورە بکەن، بەلام ئێمە دەبێ رێخۆشکەر بین بۆ دروستکردنی پەیوەندیەکی ئاوا، لەگەڵ دنیای دەرەوە، ئەمەش مانای ئەوە نییە لەگەڵ خەڵکی تر دوژمنایەتی بکەین، بەتایبەتی بۆ گەلی کورد لەکوردستانی ئێران، من پێموایە دەبێت دۆستایەتی دنیای عەرەبیش بکا و زۆر لایەنی تر لەدنیادا.



## کۆنگرێس و وەزارەتەکانی ئەمریکام دیوە

***واتە تۆیەکێکی لەباشترین دۆستەکانی ئەمریکا، یان کۆمەڵە یەکێکە لەباشترین دۆستەکانی ئەمریکا، وەتاڕادەیەك زوو زوو سەردانی ئەمریکا ئەکەی، ئەوە ئەکرێ بڵێین ئەچێتە قاڵبی پەیوەندی دۆستانەی تۆو ئەمریکاو کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانی کوردستان، ئەمریکا هاوکاری ئێوە، یان ئەحزابی کوردستانیش لەسەر ئەم پەیوەندیە بەردەوامن؟**

عەبدوڵلای موهتەدی: من جارێ تەسەور ناکەم، لەڕاستیدا من یەکێك لەباشترین دۆستەکانی ئەمریکابم، نازانم ئەوان لەراپۆرتەکانی خۆیاندا چییان لەو بارەیەوە باسکردوە، دووەمیش ئەوەیە چاوپێکەوتنەکانیش ئەوەندە زوو زوو خێرا نییە، بەڵام بەڵێ سەردانی ئەمریکام کردوە، وەزارەتە جۆر بەجۆرەکانم دیوە، کۆنگرێسم دیوە، سەنای ئەمریکام دیوەیان، لێرە هاتوون چاوپێکەوتن بووە لەنێوانماندا، لەو چاوپێکەوتنانەدا لەهەموویدا ئێمە هەوڵمان ئەوەبووە کەبڵێین ئێران وڵاتێکە دەبێت گۆڕان لەناوەوە بکرێ نەك لەدەرەوە.

## دیموکرات پێش کۆمەڵە پەیوەندیان لەگەڵ ئەمریکا هەیە

***گۆڕان لەئێران بە پشتیوانی ئەمریکا بووە؟**

عەبدوڵلای موهتەدی: بەپشتیوانی هەموو دنیا، هەوڵمانداوە ئەورووپاییەکانیش بەو قەناعەتە بگەیێنین کەچاکترین سیاسەت پشتگرییە لەخەڵکی ئێران، پشتگیریە لەخەڵکی کورد، لەخەباتیان بۆ ئازادی، ئەمە رێگای گۆڕانی راستەقینەیە، لەئێران بەپێچەوانەی ئەو دیعایەو قسانەی کەسازدەکرێن هیچی بنەماشی نییە، بۆ یەك تاقە جاریش پشتگیریمان لەهێرشێکی سەربازی ئەمریکا بۆ سەر ئێران نەکردوە، نەك هەر پشتگیریشمان نەکردوە، بەپێچەوانەوە سەرنجی دونیای رۆژئاوامان، هەر کەسمان بینیبێ بۆ ئەوە راکێشاوە کەدەبێ گۆڕانەکان لەناوخۆی ئێرانەوە بکرێ، بۆ باقی کوردیش تا ئەو جێیەی من بزانم ئەحزابی تر، حزبی دیموکراتیش ئەو پەیوەندیەیان لەگەڵ ئەمریکا هەیە وە زۆر پێش ئێمەش دەستیانپێکردوە، رەنگە ئێمە بەچەندین ساڵ دوای ئەوان دەستمان پێکردبێ.



## ناوی ئەمریکیەکان نابەم کەبینیومن

***لەسەر ئاستی بەرز کێت لەبەرپرسانی ئەمریکاو کۆشکی سپی بینیوە لەم ساڵانەدا؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** ساڵێکیش دەبێ ئەوە نەبووە، بەڵام پێشتر کۆمەڵێکم دیوە لێیان گەرێ ڕەنگە ناوبردنیان ئێستا گونجاو نەبێ، بەڵام کۆمەڵێك خەڵکم دیوە.

## کوردی ئێران (10) ملیۆن کەسن

***ئەوەی تۆ لەنزیکەوە بینیتن تێگەیشتنی ئەوان سەبارەت بەکوردستانی ئێران و دۆسیەی کورد لەئێران واتە هەمان تێڕوانینی کوردی عیراقیان هەیە، هەمان تێڕوانینی کوردی تورکیایان هەیە سەبارەت بەکوردو کوردستانی ئێران؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** لەڕاستیدا نەك هەر ئەمریکا، ئەورووپاو هەموو جیهانیش ئەوجۆرەی کەدەزانن کێشەی کورد لەتورکیا هەیە، بەزەقی وە ئەو جۆرەی دەزانن کێشەی کورد لەعیراق هەیە، ئاوا بەو زەقییەوە بەو فراوانییە ئاگاداری کێشەی کوردی ئێران نین، پێیانوانییە جانێتر خەتای هەر کەس بووبێ چەند ڕاگەیاندنی خۆمان بێ یان بارودۆخی مێژوویەکی بێ، هەرچی بێ کێشەی کوردی ئێران ئەو جۆرەی کەپێویستە دەنگی نەداوەتەوە، ئەو جۆرەی کەپێویستە هێشتا سەرنجی بۆ ڕانەکێشراوە لەلایەن دنیاوە.

بەڵام بەم حاڵەشەوە لەساڵانی ڕابردوو خەڵکی تریش هەوڵیانداوە، بەڵام ئێمە هەوڵێکی زۆرمانداوە کەپێیان بڵێین کە کورد کێن، چەندەن، لەکوێ دەژین، کێشەکانیان بەوردی کامانەن، لەپەرەسەندنی ئابوریەوە واتە هەڵاواردن، لەمەسەلەی ئابوریەوە، مەسەلەی سیاسیەوە مەسەلەی کارو مەسەلەی زمان و زمانی دایکیەوە، تاشتە سیاسەکان ئەوانەیان پێی ڕابگەینێن، کوردو بزوتنەوەکەیان پێ بناسێنین، پێیان بڵێین ئەم بزوتنەوەیە خەسڵەتێکی دیموکراتی هەیە.

پێیان بڵێین بزوتنەوەیەکی کۆنەپەرستی دژە دیموکراتی سەدەکانی ناوەڕاست نییە، ئەمە بزوتنەوەی نەتەوەیەکە کەخەریکە پێ بنێتە سەردەمی مۆدێرنێتەوە لەگەڵ ئازادی لەگەڵ مافی مرۆڤ لەگەڵ دیموکراسی، لەگەڵ عەداڵەتی کۆمەڵایەتی، لەگەڵ ئەوانە دێتەوە. بزوتنەوەی کورد بزوتنەوەیەکی دژی هیچ نەتەوەیەك نییە بۆ بەرگری لەخۆیەتی، پێیمان وتون کاکە لە (70) ملیۆنی ئێران (10) ملیۆن دەبن، تۆزێك کەمتریان تۆزێك زیاتر ئەوە شتێکی کەم نییە، ئەوەشمان پێی ڕاگەیاندون کەکورد لەئێران خۆی بەدوژمنی ئەمریکا نازانێ، خۆی بەدۆستی غەرب و ڕۆژئاوا



دەزانێ، تەوەقوعیش هەیە پشتگیری بکری، پشتگیری بۆ ئێمە لەراستیدا پشتگیری سیاسیە لەگەلی کورد، واتە بیناسن کەئەمە گەلێکە، نەتەوەیەکە، مافی هەیە، تەسەوری من ئەوەیە کەلەسالآنی رابردوودا یەك دەستکەوتی چاك لەمبارەیەوە هەبووە، ئەوەیەکە دنیای رۆژئاوا بەگشتی هەستی بەوە کردوە کەئێران تەنها فارس نییە، بەلٓکو نەتەوەی تری تیادا دەژی، ئەم فرە نەتەوەیی و فرە ئیتنیکی، فرە زمانی و فەرهەنگیەی ئێران لەزۆر کۆڕو کۆمەلٓدا باسکراوە، ئێمە خۆمان یەکێك لەو هێزانە بووین پشتگیری ئەوەمانکردوە جەبهەیەکی نەتەوە بن دەستەکان پێکبێت، ئێمە یەکێك لەپێکهێنەرانی کۆنگرەی نەتەوەکانی ئێران بووین کەئێستا هەیە، ئەم کۆنگرەیە زۆرجار لەپەرلەمانی ئەورووپا یا لەکۆنگرەی ئەمریکا قسەی لەگەلٓ خەلٓك کردوە، وابزانم تازە خەریکە لەم سالآنەی دوایدا لەسەر ئەوە پێکهاتووە ئێران فرە نەتەوەیە، ئەمە بەو مانایە نییە لەمافی دیاریکردنی چارەنووسی گەلی کورد پشتیوانی دەکەن، بەو مانایە نییە کەدەلٓێن کوردیش، دەولٓەتێکی دەبێ، بەلآم بەبڕوای من ئێستا تێگەیشتن زۆرترە بۆ ئەوەی قەیچێکە بائێران فیدرالٓی بێ، بامافی نەتەوەکانیش بدرێ، هەموو کەس وردە وردە زۆرتر لەجاران بەو قەناعەتە دەگات کەدانی مافی نەتەوەکان یەکێك لەمەرجەکانی دیموکراتیزەکردنی هێنا دی ئەوانە تۆ هەمووی لەگەلٓ دنیای رۆژئاوا باسدەکەی ئەمە چ زەرەرێکی هەیە بۆ کورد؟

# (C.I .A) هاوکاری کۆمەلٓە ناکات

---

*ئەوە تاچەند راستە کەهێزەکانی ئەمریکا بەتایبەتی (C.I .A) کەکاری نهێنی ئەکەن و تەدریب ی پێشمەرگەکانی ئێوە ئەکەن، لەگەلٓ ئێوەن و هاوکاری مادیتان ئەکەن، نەك هەر کۆمەلٓە لەزۆربەی حزبە کوردستانیەکانی ئێران و تاچەند ئەو پەیوەندیانە هەیە، تاچەند هاوکاری مادیتان ئەکەن، تاچەند دەورەو راهێنانتان بۆ ئەکەن؟

عەبدوللآی موهتەدی: هیچ کەم تازۆر، من ئاگام لەحزبەکانی دیکە نییە، ئەوان بۆ خۆیان جوابدەدەنەوە، بەلآم بۆ کۆمەلٓەی شۆڕشگێری زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێران هیچ.

*هیچ پەیوەندییان لەگەلٓ کۆمەلٓەی شۆڕشگێری زەحمەتکێشانی کوردستان نییە؟

عەبدوللآی موهتەدی: باپەیوەندیمان هەیە.



***لەو مەجالانەدا پەیوەندیتان هەیە؟**

عەبدوڵڵای موهتەدی: پەیوەندیمان هەیە لەگەڵ ئەمریکا، وەك عەرزمكردی ئەگەر مەبەستت ئەوەبێ، بەڵام بەڕاستی نەکەلوپەل، نەپارە، نەتەدریب بەئێمە نەدراوە.

## کۆمەڵە نەبووە کەئەمریکیەکانی بردوەتە ناو ئێران

***هێزێك لەهێزەکانی کوردستانی ئێران جاروبار ئەو ئەمریکیانە ئەباتە ناو ئێران ئەو شتە تاچەندو سادەو ئاساییە، یا کاری سیاسیە بریتییە لەو بەرژەوەندیانەی کەتۆ باستکرد؟**

عەبدوڵڵای موهتەدی: من لێی ئاگادارنیم، بەڕاستی لەشتی ئاواوە، ئێمەش نەبووین.

***پێتوایە لەسیاسەدا شتێکی ئاساییە؟**

عەبدوڵڵای موهتەدی: ئاخر بۆچ مەبەستێك بردویانەوە، لەچۆنیەتیەکەی هیچ ئاگادارنیم.

***واتە بەو پێیەی کەهەردوکتان دوژمنی ئێرانن، جا بۆکاری سیاسی بێ، بۆ کاری ئیستخباراتی بێ، بۆ کاری نهێنی بێ، پێتوایە ئاساییە؟**

عەبدوڵڵای موهتەدی: وەڵڵا کۆمەڵێك هاوکاری ئاساییە، بەڵام بێ سنووریش نییە، بێ سنورنییە، بێ پرەنسیپ نییە، چونکە من نازانم چیبووەو چیکراوە، لەبەرئەوە ناتوانم قەزاوەتیەکی زۆری لەسەربکەم، بەڵام بەگشتی دەتوانم بڵێم کۆمەڵێك هاوکاریو یارمەتی ئەگەر ئەوان بیدەن، من بەئاسایی دەبینم، بەڵام دیارە شتێکی بێ سنووریش نییە، ئەو حزبە کوردییانە دەبێ جوان ئەو سنورانە بپارێزن.

***هێزەکانی ئەمریکا یارمەتی بەرەی باکوریاندا بۆ تێکشکاندنی حکومەتەکەی تالبان لەئەفغانستان، دواتریش یارمەتی هێزەکانی کوردستانی عیراقو هێزەکانی عیراقیاندا بۆ تێکشکاندنی حکومەتی بەعس، دوایی هەمان سیناریۆ لەرێگادایە ئێوە تاچەند ئامادەگیتان تیایە بۆ درێژکردنی دەستی یارمەتی ئەمریکا بۆ روخاندنی کۆماری ئیسلامی ئێران لەهەر حاڵەتێکدا؟**

عەبدوڵڵای موهتەدی: تائێستا شتێکی واله ئارادانەبووە، بەنیسبەت ئێرانەوە ئیدارەی جورج بۆش شەڕێکی راگەیاندنی زۆری لەگەڵ ئێران کرد، نازانم لەبواری ئیستخباراتی چی کردبێ و چی نەکردبێ، نەپسپۆڕشی ئەو بوارەمو نەزانیاریشم هەیە لەسەری، بەڵام بەنیسبەت یارمەتیکردنی



ئۆپۆزیسیۆنی راستەقینەی ئێرانیەوە، بەکوردەوە، بەغەیری کوردیشەوە، تائەو جێگەی کەئێمە لێی ئاگاداربین، کەدیارە ئێمە لەهەمووی ئاگادار نین ، بەڵام تائەو جێیەی ئێمە لێی ئاگاداربووین بەڕاستی حکومەتی جۆرج بۆش هیچی ئەوتۆی نەکرد.

*** پێتوایە حکومەتەکەی ئۆباما بیکات؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** ئەوە دەگەڕێتەوە سەرئەوەی پەیوەندیان لەگەڵ ئێران دەگاتە کوێ، لەسەر دۆسیەی ئەتۆمی، لەسەر دۆسیەی تیرۆریزم، لەسەر دۆسیەی ئیسرائیل، ئەگەر ئەوروپاو ئەمریکا لەلایەك لەگەڵ ئێران لەلایەکی ترەوە ناکۆکیەکانیان زیاتر بێ، هەڕەشەی ئێران رۆژبەڕۆژ زۆرتربێ، رەنگ بێ ئەو سیناریۆیەش عەینی شت نەك لەسیناریۆی هاوکاری ئەوروپاو ئەمریکا لەگەڵ ئۆپۆزیسیۆنی ئێرانی بەڵێ ئەو وەختە دەتوانێ بێتە ئاراوە.

## عەرەب و ئیسرائیل تەنها لەسەر دژایەتی ئێران ڕێکن

***دۆسیەیەی ئەتۆمی ئێران وئەگەری لێدانی ئێران چەندە لەلایەن ئەمریکاو ئیسرائیل، کەهەمیشە میدیاکان باسی ئەوە ئەکەن کەئیسرائیل خۆی ئامادەکردووە بۆ لێدانی وەکو چۆن ساڵی هەشتاکان لە عیراقیدا، کەمەترسیە بۆ سەر ئاسایش و ئەمنی ئیسرائیل، تاچەند ئەوە ئەگەرێکی نزیکە وەتاچەند ئەوە سەرەتایەکیشە بۆ روخاندنی کۆماری ئیسلامی ئێران؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** ئەوەی کەلەرۆژنامەکان دەیخوێنینەوەو میدیای جیهانی باسیدەکات و لێکۆڵەرە سیاسیەکان باسیدەکەن، هەمووان دەڵێن کەئیسرائیل، ئێران و پرۆژەی ئەتۆمی ئێران بەمەترسیەکی گەورەی ئەمنی لەسەر خۆی دەزانێ، بەمەسەلەی مان و نەمانی خۆی دەزانێ، وەدووریش نییە وابێ، چونکە بەڕاستی ئێران وڵاتێکی گەورەیە، ئەگەر تەیاریش بێ بەچەکی ئەتۆمی، دەی خۆ هەزارجاریش رایگەیاندوە، بەتایبەتی لەدەورەی ئەحمەدی نەژاددا کەدەبێت ئیسرائیل لەسەر نەخشە بسڕێتەوە، واتە قابیلی تێگەیشتنە، ئینسان تێیدەگات ئەگەر ئیسرائیل ئەو مەترسیەی زۆرتر بێ تائەمریکاو ئەوروپا لەبەرئەوە، رەنگ بێ ئەو مەترسیەی ئیسرائیل بۆ نیسبەت ئێرانەوە هەیەتی زۆر زۆر زیاتر بێ، لەهەموو کەسی دی لەناوچەکەدا، بەڵام بێجگە لەئیسرائیل وڵاتە عەرەبەکانیش پێی ناقایلن، زۆر گلەییان هەیە لەئەمریکا لەبنەوە کەبۆچی هیچ لەگەڵ ئێران ناکا.

ناڵێم حەتمەن داوای شەڕی لێدەکەن نازانم، بەڵام داوای سیاسەتێکی سەختگیرانەترو توندوتۆڵتر لەئەمریکاو ئەوروپا دەکەن، چونکە دەوڵەتە عەرەبییەکانیش لەسیاسەتی تێکدەرانەی ئێران دەترسن، لەبڵاوکردنەوەی فیکری شیعەگەری بۆ دروستکردنی ئیمپراتۆرێکی شیعە دەترسن، لەچەکە ئەتۆمیەکەی دەترسن، لەزۆر شتی دیکەی لەوەی کەئێران دەسەڵاتێکی ناوچەیی پەیدابکات‌و بڕیاردەربێت لەهەموو ناوچەکە لەوانە دەترسن‌و نیگەرانن زۆریشی پێ ناڕازین، بۆیە دەبینین لەم یەك دووساڵی رابردوودا بەپێچەوانەی ئەم (60) ساڵەی کەدەوڵەتی ئیسرائیل دروستبووە، کەیەك کێشە هاتۆتە ئاراوە ئەویش کێشەی ئێرانە، ئەویش بۆتە هۆی ئەوەی عەرەب‌و ئیسرائیل لەسەری کۆك بن، ئاخر لەسەر هیچ شتێك کۆك نەبوون ئەم (60) ساڵە، بەڵام لەسەریەك خاڵ ئەویش نیگەرانی لەئێران‌و سیاسەتەکانی جمهوری ئیسلامی کۆکن، ئەوروپا هەروایە، ئەم رۆژانە نیکۆلا سارکۆزی باسی ئەوەی کرد کەدەزگا ئیستخباراتیەکان‌و ئیتلاعاتیەکان بەئاشکرا راپۆرتیان داوە کەئێران بەدوای چەکی ئەتۆمیە، مەبەستێکی سەربازی هەیە لەپرۆژە ئەتۆمی‌و ناوەکیەکانی، بۆیە ئاسان نییە دنیا شتی ئاوا لەئێران قبوڵ بکات.

# زانیاری لەسەر ئەتۆمیەکەی ئێران نادەینە ئەمریکا و ئیسرائیل

---

***ئێوە هیچ هاوکاریەکی وڵاتێکی وەك ئەمریکا، یان ئیسرائیل ئەکەن بە پێدانی زانیاری لەسەر ئەو دۆسیە ئەتۆمیەی کەهەیەتی؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** یەکەم: بەڕاستی زانیاری ئاوامان هەر نییە، چونکە ئێمە زانیاریەکەمان دەگەڕێتەوە بۆ چوارچێوەی کوردستان، ئێران هیچ پرۆژەیەکی لەکوردستان نییە تازانیارمان ئەسڵەن ببێ لەسەری.

دووەمیش: ئەوەی کەئێمە زانیاری پێدان بەهیچ کەسێك، بەهیچ دەوڵەتێك بەسیاسەتی خۆمان نازانین، وەبیریشتان دەخەمەوە کەکاتی خۆی سەدام حسێن لەسەر کاربوو، پەیوەندیمان لەگەڵیان هەبوو، لەخاکی ئەوان بووین، زۆر موحتاجیش بووین، لەخاکی ئەوان بووین، زانیاریمان نەدانێ، ئێستاو ئێستاش دوژمنی ئێران بووین، ئەویش شەڕی ئێرانی دەکرد، واتە هەموو مواسەفاتەکان‌و مەرجی تێدابوو بۆئەوەی زانیاری بدرێتێ، بەڵام نەماندانێ.



*ئەو دوژمنی کوردەکانی عێراق بوو، بەلام ئەمریکا دۆستی کوردەکانی عێراقە بە پێچەوانەوە؟

عەبدوڵلای موهتەدی: ئەوەش راستە، ئەوەش تێبینیەکی جوانە.

*رەنگە لەبەرئەوە نەتان کردبێ؟

عەبدوڵلای موهتەدی: وەڵلا ئەوەش یەکێك لەشتەکان بوو، بێگومان ئێمە راستە لەوڵاتی عێراق دەژیاین، ئێمە لەکوردستانی عێراق دەژیاین، ئێمە دۆستایەتیمان لەگەڵ حزبەکانی ئێرە بوو، ئێمە یەك نەتەوەین لەگەڵ کوردی عێراقیش‌و هەست سۆزمان لەگەڵیان بوو، ئەی ئێمە بۆچی کیمیابارانکراین، ئاخر لەسەر دۆستایەتی کوردو عێراق‌و پێشمەرگەی کوردو عێراق بوو، ئێمە وامان لێی بەسەرهات، بەلام ئەگەر پەیوەندی ببێ بیکەن یان نەیکەن ئەوان کەیفی خۆیانە رەنگ بێ ئەوان نەیانەوێ بیکەن، رەنگ بێ ئەوان کەسێکیان بوێ زۆرتر بۆ کاری زانیاری، کەیفی خۆیانە، باکەسی ئاوا پەیدابکەن ئێمە ئەگەر باسی پەیوەندی دەکەین باسی پەیوەندی سیاسی‌و بەرژەوەندی نەتەوەیی گەلی کورد وادەخوازێت لەگەڵ دنیای رۆژئاوا ئێمە پەیوەندیمان هەبێ‌و هیچشتێکی تر.

# موجاهیدین هاوکاری ئەمریکا و ئیسرائیل دەکات

* مجاهیدینی خەڵق ئەو کارانە ئەکاو هاوکاریشیان ئەکات؟

عەبدوڵلای موهتەدی: وەڵلای مجاهیدینی خەڵق کاتی خۆی لەعێراقیش هاوکاری زۆرزۆری سەدام حسێنی ئەکرد، لەبواری ئیتلاعات‌و ئیستخباراتیداوە لەراستیدا زۆرتر دەزگایەکی ئیستخباراتی بووە تاحزبێکی سیاسی، ئەوان جیاوازن.

*باسی بەعستکرد لەسەرویەندی کۆنگرەکەی ئێوە (2004) چەند مانگ پێش ئەوە بەعس ئەرۆخێ روخانی بەعس بۆتۆ، یان بۆ کۆمەڵە رووداوێکی گرنگ بوو چاوەرێتان دەکرد؟

عەبدوڵلای موهتەدی: حزبی بەعس زۆر لاواز بوو، ئێمەش لەو کاتەوە کەلەحزبی کۆمۆنیستی ئێران جیاببوینەوە هیچ پەیوەندیەکمان لەگەڵ بەعس نەبوو، واتە لە (2000)وە.



# پێشمەرگەی کۆمەڵە ئامادەبوون دژی روخانی بەعس شەڕبکەن لە (2003)

*** بەعس نەیویستوە، یان ئێوە نەتانکرد؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** ئێمە هەوڵماندا، یەك دوو هەوڵماندا نەیانکرد، ئێمە هاتینەوە لەنێو خۆمان قسەمانکرد، بەونەنجامە گەیشتین کەلێی گەڕێین دەست هەڵگرین، بۆیە هیچمان نەکرد، یەك دوو هەوڵی سەرەتایمان داو دواتر خۆشمان هیچمان نەکرد، بەڵێ روخانی بەعس بەبڕوای من یەکێك لەخۆشترین کاتو ساتەکانی ژیانمان بوو، نازانم ئەو راگەیاندنەت خوێندوەتەوە یان، ئەوکاتە ئێمە دامان، راگەیاندنێکی زۆر دوورودرێژو بەبڕوای من یەکێك لەو بەڵگە مێژوویانەی کە سیاسەتی کۆمەڵەی تیا تۆمارکراوە دەرحەق بەکوردستان، دەرحەق بەدیکتاتۆری بەعس، هیچ شتێك لەوە بەپۆزەتیڤتر نەماندەدی رژێمێك کەئەنفالی دروستکردوە، هەڵەبجەی بۆمبارانکردوە، وەسیاسەتی ئیبادەو فەوتاندنی گەلی کوردی هەبووەو بەنیسبەت بەقیەی گەلی عیراقیش ئەوانیشی تواندوەتەوە، ئەوانیشی سەرکوتکردوە، روخاندنی دیکتاتۆرەکان، دیکتاتۆریەکی وەکو بەعس خەبەرێکی زۆر خۆشبووە، پێشتوازیمان لێکردوەو، ئەو کاتیش بەئەحزابی کوردی کوردستانی عیراقمان راگەیاندوەو وتومانە ئێمە هێزی پێشمەرگەمان لەگەڵتانەو خۆیان سوپاسیانکردوین، بەڵام پێویستیان پێمان نەبوو، دەنا ئێمە ئامادەبووین لەخەباتەکەیاندا بەشداریبکەین.

# کۆمۆنیزمی کارگەری راپۆرتیان دەدا بە بەعس

***هەر ئەو کاتە حزبی کۆمۆنیستی کارگەری رایگەیاند، کەئێوە چەكو فیشەكو ئەسلەحەتانداوە بەهێزەکانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان دژی بەعس؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** ئەوان لەسەردەمێکدا ئەو قسەیانکرد کەبەڕاستی وەکو راپۆرت لێدان وابوو، پەیامێك بوو بۆ بەعس، کەسێك ئەو کارەی کردبایە بۆ ئیعدامو ئیبادەکردن دەشیاو لەڕوانگەی بەعسەوە ناجوامێریەکی زۆر گەورەبوو.

***بەڵام کردبووتان ئێوە؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** ئێمە بەتولی ئەو ساڵانە، رەنگە وردەکاری نەکەین، بەتولی ئەو ساڵە دوورودرێژانە ئەوەی لەدەستمان هاتووە درێخیمان نەکردوە، جارێکی تریش دەیڵێمەوە، بەڕاستی، بەڕاستی زۆر کەسمان لەمردن رزگارکرد، زۆر لەهەڵاتوانی رژێم لەبەعس لەو هەلومەرجو بارودۆخە



سەخت‌و دژوارەدا لەناو خۆمان راگرتووە پەنامانداوە، پێشمەرگەمان دەرمانکردووە، زۆر کاری تریش وەهەر ئەوانە بوو وای لێکردین، ئێمە تەنها حزب بووین غەیری کوردەکانی ئێران کیمیابارانکراوین.

## لەئەدەبیاتی کۆمەڵەدا ستایشی بەعس نەکراوە

***قسەکەم ئەوەیە ئەو چەك‌و ئەسلەحەیەی ئێوە دابوتان بەیەکێتی نیشتمانی هەر ئەوەیە کەبەعس دابووی بەخۆتان، واتە ئەو چەك‌و ئەسلەحەیەی کەلەبەعس وەرتانگرتبوو جا مەبەستم ئەوەیە لەرووی سیاسی‌و ئەخلاقیەوە تاچەند دروستە چەك‌و ئەسلەحە لەولاتێك وەرگری‌و بیدەی بەدوژمنەکەی تا بینێت بەخۆیەوە؟**

عەبدوڵای موهتەدی: ئاخر چۆن دروستە، پەیوەندیمان ەگەڵ بەعس بەوردی قسەمان لێکردوەو بڕیار نامەی نێوخۆیمان، هەیە فۆرمولەمان کردوە کەسیاسەتی ئێمە چییە، ئێمە هەرگیز یەك وشەی چاکمان بۆ بەعس نەوتوە، لەهەموو ئەدەبیاتی سیاسی کۆمەڵەدا بگەڕێ، یەك وشەی تعریف‌و سیاسەتی بەعسی تیانییە، ئێمە رژێمی بەعسمان بەرژێمێکی دیکتاتۆری زانیوە هەڵمان سەنگاندووە، وتومانە پەیوەندی لەگەڵ بەعس بۆ خەباتی ئازادیخوازانەی ئێمە لەکوردستانی ئێران ناعیلاجیە، دەبێ بیکەین، دەبێ بچێتە ئەو قاڵبەوە، بەڵام پەیوەندی ئێمە لەکوردستانی باشوور، پەیوەندیەکی هاوخەباتییە ستراتیژیکە کەهەرگیز نابێ تارمایی هیچ خیانەتێك‌و پشتتێکردنێکی پێوە دیاربێ.

## ئەزموونی هەرێمی کوردستان کەمو کوڕی هەیە

***بەڕوخانی بەعس زیاتر خۆشحاڵ بووی، یان ئەگەر ئەو پلانەی کەئەمریکا دای رشت لەدژی عێراق‌و روخاندنی بەعس‌و سەدام حسێن لەئێران بوایە کەباس لەوە ئەکەن ئەمریکا ئەبوایە ئێران بروخێنێ پێش عیراق؟**

عەبدوڵای موهتەدی: بەڵێ من ئەوەم زۆر بیستوە، زۆر لەئەمریکاییەکانیش دەڵێن ئەو وڵاتەی هەڵمانبژارد، چاکمان هەڵنەبژاردووە، ولاتێکی کەهەڵبژێرین وەڵلا جا بڵێم چی لەهەر حاڵدا روخانی بەعس لێرە وەپێش ئەوەش راپەرینی کوردستانی عیراق لەساڵی (1991) ئێمە یەکێك لەگەرم‌و گوڕترین پشتیوانانی ئەو راپەرینەبووین، دەشزانی من بەش بەحاڵی خۆم چەندین شتم نووسی،

دیارە من بۆ ناوخۆم دەنوسی ئەمدەویست بەعس پێ بزانێ، چەندین شتی گەرمو گوڕم لەپشتگیری راپەڕینەکە نوسیوەو، حکومەتی بەعسم بەناوی فاشستیو دیکتاتۆری ناوبرد، کۆمۆنیزمی کاریگەری ئەوەی بلاوکردەوە دیارە بۆ ئەوەیەن بوو سەرم تیابچێ لەلای بەعس، واتە لەهەر فرسەتێك کەهەڵکەوتوە ئێمە پشتگیری ئەو ئەزموونەی کوردستانمان کردوە بەئێستاشەوە.

جا مەبەستم چیبوو لەو قسانە مەبەستم ئەوەبوو لە (1991)ەوە کەئەزموونێك سەریهەڵداوە لەکوردستان، جۆرە کیانێکی کوردی لێرە پێکهاتووە، تاروخانی بەعس لە (2003) تائێستا.

ئەوەتان پێبڵێم ئەم ئەزموونە بێ کەموکوڕی نییە، ئێمەش ئاواتەخوازین کەڕوو لەباشیو روو لەگەشەو روو لەئیسلاح بڕوا، بەلام ئەم بزوتنەوە دەوری زۆر چاکی بووە لەسەر کوردستانی ئێران، واتە من ئاوا دەڵێم ئەگەر ئەزموونێکی وەك کوردستانی باشوور نەبووایە، کورد ئەم کیانەیەی لێرە دروست نەکردایە، فشاری دیکتاتۆری جمهوری ئیسلامی ئێران زۆر زیاتر دەبوو، ئیعدامەکان زۆر زیاتر دەبوون، سیاسەتی داپڵۆساندنو توانەوەیەکی زۆرتر دەبوو، واتە سڵی نەدەکرد لەهیچ، بۆیە هەزار کوردستانی باشوور بلێ کاکە من دۆستایەتی ئێران دەکەم، لەڕاستیدا ئەم ئەزموونە چقڵی چاوی ئێرانە، بۆیە ئەم ئەزموونە بۆ ئێمەش کەڵکی بووە، مانەوەیو گەشەکردنیو بەهێزبوونی قازانجی ئێمەشی تێدابووە.

***باشە بەڕای تۆ، مانەوەی بەعس باشتر نەبوو تائەوەی حکومەتێکی شیعەی وەکو مالیکیو دۆستی جمهوری ئیسلامی بێنەسەرکار، خۆ ئەگەر کوردستانی عێراق نەبووایە، دوور نەبوو ئێوە دەمێك بوو تەسلیمی کۆماری ئیسلامی ئێران کرابوونەوە؟**

عەبدوڵلای موهتەدی: روخانی بەعس باشبوو، بەلام تۆ چی لەوە دەکەی باقی عێراق ئەو گەشە سیاسیەی کەبەشە کوردستانیەکەی کردبووی، نەیانکردبوو، فارس دەڵێ "گۆزەیەکت پێ بێ، چی تیابێ ئەوە ئەدەڵێنێ" ئیتر دیکتاتۆری ساڵەهای بەعس نەیهێشتبوو کەگەشەیەکی سیاسی بکرێ، کۆمەڵگەیەکی مەدەنی لەبەشە عەرەبیەکە نەبوو، ئۆپۆزیسیۆنێکی سیاسی راستەقینە نەبوو، زۆرشتی تر، دواتر هەڵەکانی ئەمریکاو زۆر شتی تر بەهەموو عەیبەکانیەوە، من ئێستا زۆر بەباشتر دەزانم تاسەردەمی بەعس.



## ئەگەر عیراق بیەوێت ئامادەی پەیوەندین

***هیچ پەیوەندیەکتان هەیە لەگەڵ حکومەتی عیراق و حکومەتی مالیکی؟**

**عەبدوڵای موهتەدی:** نەخێر، وەکو حکومەتی مالیکی نەخێر هیچ پەیوەندیەکمان نییە، دژیشی نین، واتە دژی هیچ پەیوەندیەك لەگەڵ حکومەتی عیراق نین، ئامادەین ئەگەر حکومەتی عیراق بیەوێ پەیوەندیمان هەبێ.

***هەوڵتانداوە دیپلۆماسیەت بکەنەوە لەبەغدا؟**

**عەبدوڵای موهتەدی:** ئەوەی راستی بێ، هەوڵێکی زۆر جدیمان نەداوە عیراقیش ئەوەندە سەقامگیر نەبووە، تائێستا بێجگە لەوە پێمان خۆش نییە بەسەرسەری حکومەتی هەرێمی کوردستاندا ئەو کارە بکەین، ئەگەر شتێکی وابکری بەهاوکاری و بەتەگبیرو بەفکری ئەوان بکرێ باشە.

## ئێمە لەکوردستانی عیراق لەناو کەس و ولاتی خۆمانین

***چەند حەوتوو پێش ئێستا (2009) ئێمە لەکوردستانی عیراق لەناو کەس و ولاتی خۆمانین هێرشێکی بەبەرنامە دارێژراو بۆسەر کەمپی ئەشرەفی مجاهیدینی خەڵق کرا وەزیاتر لەچەند کەسیشیان گیراون، دوای میدیاکان باسی ئەوەیانکرد چەند هێزی ئیتلاعات- ئێرانی بەشداری هێزی پۆلیسی عیراقیانکردوە بۆکوشتن و داخستنی کەمپەکە، ئەو سیناریۆیە تاچەند راستە، تاچەند مجاهیدینی خەلق لەبەردەم مەترسیادایە؟ تاچەند ئێوە رۆژێ لەڕۆژان چاوەڕێی ئەوە ئەکەن کەلەلایەن حکومەتی عیراق و ئێرانەوە فشار بخرێتەسەرتان لەحکومەتی هەرێمی کوردستان کەمپەکانتان داخرێ و ئۆردوگاکانتان داخرێ؟ داوای تەسلیم کردنەوەتان لێبکات؟ یان حکومەتی عیراقی ناچارتان بکات بێگومان جیاوازی ئێوەو مجاهیدینی خەلق نییە کەئێوە ئۆپۆزیسیۆنی ئێرانن لەبەرئەوە ولاتی سێیەم هەڵبژێرن؟**

**عەبدوڵای موهتەدی:** ئەوە چەند جوابی دەوێ

یەکەم: وانییە ئێمەو مجاهیدین زۆرمان جیاوازە، هەر بۆ حکومەتی عیراقیش ئەگەر بەمەنتیق بێ وەبەدلیل بێ جیاوازیمان زۆرە، ئەگەر بەزۆرداری بێ ئەوە شتێکی دیکەیە، مجاهیدینی خەلق تێکەڵاوی رژێمی بەعس بوو، هاودەستیان بوون، هاوکیسیان بوون، ئەوان لەسەرکوتی خەڵکی شیعەی باشوور وەلەسەرکوتی راپەرینەکانی کورد لە (1991) دەستیان هەبووە، ئێمە نەك هەر ئەوە



نەبووین وەکو باسیشمکرد، یارمەتیمان وەرگرتووە لەحکومەتی عیراق، بەلام هەرگیز نەچاکەی حکومەتی عیراقمان وتوە، نەکارێکی وامانکردوە بەقازانجی ئەو تەواوبووبێ، واتە جۆرە هاوکارییەکەی وامانکردوون، بەتایبەتی دژی عیراق بەکوردو عەرەب، ئێمە نەك چکۆلەترین هەنگاومان هەڵنەگرتووە، وەکو باسمکرد ئێمە لەراپەرینەکەی (1991) پشتگیریمانکردوە، لێشمان دەرکەوت پشتگیرییەکە ئێمە بەتەنیا حزبێکی غەیرە عیراقین کەبەر کیمیاباران کەوتوین و لێماندراوە لەبەرئەوە وانییە (180) دەرجە ئێمە لەگەڵ مجاهیدین جیاوازین.

دووەم: مجاهیدین لەخالس و نزیك بەغدا لەکەمپی ئەشرەفن، لەنێو نەتەوەی خۆیاندا نین، ئێمە لەنێو نەتەوەی کورداین، لێرە راستە لەباری حقوقییەوە ئێرە وڵاتی ئێمە نییە، بەلام لەباری سیاسی و فەرهەنگی و مێژووییەوە ئێرە وڵاتی ئێمەیە، کەوابێ ئێمە لەنێو نەتەوەی خۆماندائین، دیارە ئەو سەفەر مەسەلەی حکومەتی هەرێمی کوردستان و حزبەکانی ئێرەش وە ئەو دۆستایەتیە دێرینەی کەلەنێوانمان هەیە، ئەوەش کاریگەرییەکی زۆری هەیە من ئەسڵەن بێجگە لەوەی پێموایە لەگەڵ پرەنسیپ و مەبادئی حکومەتی هەرێمی کوردستان نایەتەوە کەئێمە دابخات و تەحویل بداتەوە، ئەوانە لەگەڵ بەرژەوەندیشیان نایەتەوە، من وادەزانم هەبوونی ئێمەو مانان واتە ئۆپۆزیسیۆنی کوردی ئێران لەخاکی کوردستانی عیراق، کارتێکی گەورەیە بەدەست حکومەتی هەرێمەوە، ئەگەر ئەم کارتەیان بەدەستەوە نەمێنێ ئەو کاتەیە کەعیراق دەتوانێ فشاریان بۆ بێنێ لەبەرژەوەندیشە.

بێجگە لەوەی من پێموانییە بەهیچ جۆرێك لەپرەنسیپیاندا بێ و هیچ نیشانەیەك لەوەدا نابینم و تەسەور ناکەم شتی ئاوا هەبێ پێموانییە هەر لەبەرژەوەندیشیاندا بێ کێ دەڵێ ئێران هەر لەگۆڕانە کێ دەڵێ ئێمە سبەینێ نابێ هاوکاری گەورەتربکەین لەرۆژهەلاتی کوردستاندا لەگەڵ یەکتری ئێمە هاوپەیمانێکی ستراتیژیکین لەگەڵ کوردی عیراق، ئەمانە هەموو جیاوازییەکی گەورە دروستدەکات، بەنیسبەت مجاهیدینی خەڵقەوە هەموو کارە خراپەکانی هیچ کەس نازانێ، چونکە کاری خراپیان زۆرکردوە، بەلام کارە خراپەکانیان دەرحەق بەکوردی ئێران دەرحەق بەکوردی عیراق ئەوانە هەمووی دەزانین، هیچ نزیکایەتیەکی سیاسیمان لەگەڵیان نییە، بەلام لەباری ئینسانییەوە ئەم گرتن و کوشتن و ئەوانەی کەحکومەتی عیراق دەیکات پێمان کارێکی باش نییە.

***تۆ وتت ئێمە کارتێکی گرنگین بەدەست حکومەتی هەرێمی کوردستانەوە بۆ فشار بۆ سەرکۆماری ئیسلامی ئێران؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** دەتوانێ وابێ ئەگەر ئەوان فشار بێنن، بەلام خۆ ئەوان هیچیان نەکردووە.

## حکومەتی هەرێم، بەدڵی ئێران ناکات لەگەڵ کۆمەڵە

***زۆرجاریش ئێوە کێشە بوون بۆ حکومەتی هەرێمی کوردستان ئێران، ئێوەی وەکو کارتێکی کار بەکارهێناوە لەسەر حکومەتی هەرێمی کوردستان وتویەتی بۆ دەریان ناکەن وتویەتی بۆ لەسنوورەکان ئەهێڵن بێنە ئەم دیوەوە بۆکەمپیان هەیە؟**

عەبدوڵای موهتەدی: دەوڵەتی ئێران بەهیچ شتێك تێر نابێ، خۆ تۆ کارێکیشی بۆبکەی، تەوەقوعێکی کەی دەبێ، لەبەرئەوە ئەگەر باسی حکومەتی ئێران بکەین بەهیچ شتێك رازی نابێ، ئەگەر دەستیشی بڕوا هەموو فشارو زەختێك دەهێنن بۆ حکومەتی هەرێمی کوردستان وەدەیانخەنە ژێر فشارەوە بۆئەوەی بەدژی ئێمە هەڵوێست وەرگرێ، بەدڵی ئەوان بچێتە پێشەوە، بەڵام پێموانییە بەدڵی ئەوان بچێتەپێشەوە.

***لەکاتێکدا کۆماری ئیسلامی ئێران تووشی مەترسی تێکشکان، یانروخان ئەبێتەوە، ئێوە هێزی ئۆپۆزیسیۆن پەلاماردانی ئێران و کوردستانی ئێران ئەدەن، پێتوایە حکومەتی هەرێمی کوردستان لە پشتی جەبهەوە هاوکاریتانبکات؟**

عەبدوڵای موهتەدی: جارێ زووە بۆ ئەو پێشبینیانە، جارێ زووە ئەگەر بەڕاستی ئێران روو لەگۆڕانێکی گەورە بێ جابڵێین ئەو گۆڕانە، یان راپەڕینێکی گەورە لەتاران و شارەکانی تری کوردستان بکرێ، یان ناکۆکی ناوخۆیان بگاتە ئاستی لێکترازانێکی گەورە، یان قەیرانێکی جیهانی گەورە رووبکاتە ئێران هەرکام لەوانەبێ کەببێتەهۆی تێکچوونی مەرکەزی شیرازەی دەوڵەتی ئێران من پێموایە ئەو هۆکارێکە کە هەموو خەڵکی ئێران هەڵدەستن لەدژی حکومەت.

## بۆ روخانی ئێران پێویستیمان بەهاوکاری کوردی باشوورە

***پێویستیتان بەحکومەتی هەرێمی کوردستانیش هەیە؟**

عەبدوڵای موهتەدی: پێویستیمان بەپشتیوانی هەموو کەسێکە.

***تۆ باسی حکومەتی هەرێمی کوردستان ئەکەی، یان باسی یەکێتی نیشتمانی کوردستان ئەکەی کەقسە ئەکەی؟**

عەبدوڵای موهتەدی: نا، باسی هەموو حکومەتی هەرێمی کوردستان ئەکەم.



# لە(دە) ساڵی رابردوودا یەکجار لەگەڵ ئێران مفاوەزاتمان بووە

***لەکۆنگرەی (10) دوابەدوای کارمکانی کۆنگرە لەژمارەی (42)ی گۆڤاری شۆرش لەژانویەی (2005)دا لەوەڵامی پرسیاری گۆڤارەکەدا ئەڵێی "هیچ وتوێژێکمان نییە لەگەڵ ئێران، دیارە شتێك هەبووە باس لەومکراوە کەئێوە پەیوەندییەکتان هەبووە لەگەڵ کۆماری ئیسلامی ئێران وە لەشوێنی تریش بلاوبووەتەوە، ئێوە ئەتانویست مفاوەزات بکەن لەگەڵ حکومەتی ئێرانی؟**

عەبدوڵلای موهتەدی: ئەو کاتەی کەپرسیارەکەم لێکراوە بەڕاستی هیچ پەیوەندیەك نەبوو، بەڵام ئێمە لە(10)ساڵی رابردوودا یەك گفتوگۆو پەیوەندیمان لەگەڵ کۆماری ئیسلامی هەبووە، ئەویش ئەگەر بەهەڵەنەچووبم لەمانگی مارسی (2003) بوو لەو بارەیەوە نەك هەر نەمان شاردوەتەوە، بەڵکو بلاویشمان کردۆتەوە. دیارە باپێت بڵێم ئەو گفتوگۆیانە چۆنکران، دیارە کۆماری ئیسلامی چەندجارێك داوایکردوە ئێمەش لێکدانەوەمانکردوە.

یەکەم لەکۆمیتەی ناوەندی ئەو کاتی کۆمەڵەدا هێناومانەتە گۆڕێ، لێکۆڵینەوەی زۆرمان لێکردوە، لەسەر ئەوە دەقێکمان پەسەندکردوە، ، سیاسیەتی خۆمان دیاریکردوە بڕیار نامەیەکی چەند لاپەڕەیمان لەو بارەیەوە هەیە کەبەکۆی دەنگ پەسەندمانکردوە.

دووەم لەگەڵ ئەندامانی خۆمان لێرەهێناومانەتە گۆڕێ، راو تەکبیرو نەزەری ئەوانمان ویستووە لەگەڵ هەندێك لەئەندامانو رێکخراوەکانی خۆمان هێناومانەتە گۆڕێو پرسمان پێکردون، چوارەم من خۆم هەستاوم چوومە دەرەوەی وڵات ژمارەیەك لەتێکۆشەرانی دێرین و خەڵکی بەئەزموونو دۆستانی کۆمەڵەم بانگکردون بۆ کۆبوونەوە (150،100) کەسێك دەبوون، لەستۆکهۆڵم وەلەوێ لەگەڵم باسکردون پرسو تەکبیرمان هەبووە لەسەرئەوە . دوای کرانەکەشی کەدیارە هەموویمان نوسیوە چەندین شوێن یەك لەوانە لەمساحەبەیەکدا لەگەڵ سایتی ئینتەرنێتی دیمانە لەچەندین شوێنی تریش بەدووردرێژ باسمانکردوە، واتە هەوڵێك نەبووە کەبیشارینەوە ئەو رۆژانە کەگفتوگۆکانمانکردوە گونجاو نەبووە کەبیڵێین راگەیاندنی لەسەربدەی، بەڵام دوای باسمکردوە.

***ئێستا یان هەرکاتێك کۆماری ئیسلامی ئێران داوای دیالۆگو دانوستان لەئێوە بکات ئێوە ئامادەن، یان پێیتانوایە تەنها تاکتیکە؟**

عەبدوڵلای موهتەدی: ئەزانی، چۆنە ئەئێمەو ئەکوردی ئێران پێش قەدەم نەبووین لەوەدا کەکێشەی کورد حەتمەن بەتوندوتیژی چارەسەربکرێ، هەمیشە ویستوومانە لەرێگەی سیاسیەوە چارەسەربکرێ، ئەوە قسەی ئێستا نییە لەو (30) ساڵەی رابردوودا هەمیشە وابووە کەوابێ وەك



یەك ئەسڵ و وەکو یەك پرەنیسیپ ئێمە وتووێژمان ڕەت نەکردوەتەوە، بەڵام دیارە کۆمەڵێك مەرجمان هەیە وەکو ئینگلیزیەکان دەڵێیت (Timing)ی ئەوەش گرنگە ئێستا کات و ساتێکی گونجاو بۆ گفتوگۆ لەگەڵ جمهوری ئیسلامی ئێران نییە ئەوانیش نایکەن وە ئەو ڕژێمەی کەئەوەندەی تر دیکتاتۆریەکەی تۆخکردوەتەوە، بێگومان لەگەڵ کوردیش سیاسەتێکی هێمنانە ناگرێتەبەر وە توندوتیژی زیاتر دەکات، بۆیە کات و ساتی نییە ئێستا، بەڵام وەك پرەنسیپێکی گشتی ئێمە هیچ کات موزاکەرەمان ڕەت نەکردوەتەوە.

# پژاک ڕەسەن نییە
# کارمان بۆ (pkk) زۆر کردوە و پێ نازانن

***لەسەروبەری ئەو کۆنگرەدا دوای ئەوە، میدیاکانی پارتی کرێکارانی کوردستان( pkk )و( پژاك ) چەندینجار هێرشیانکردوەتە سەر تۆو مەبەست لەو پەلامارو وەڵامدانەوەی تۆ لەگەڵ پارتی کرێکارانی کوردستان لەچییەوە سەرچاوەی گرتووە پەیوەندیەکانتان ئاسایی نییە لەگەڵ ( pkk )و( پژاك ) ؟**

عەبدوڵای موهتەدی: ئێمە (پژاك) لەڕاستیدا بەحزبێکی ڕەسەنی کوردستانی ڕۆژهەڵاتی نازانین، بەبەشێك لە(pkk) ی دەزانین، بەڵام بۆ پەیوەندی لەگەڵ پەکەکە ئەوان خەتابارن ئێمە خەتابارنین پێمخۆشە بۆ مێژوو بزانی کەلەیەکەم شەڕیدا لەگەڵ یەکێتی و پارتی لەکوردستانی عیراق بەڕاستی جوان لەبیرم نەماوە (1992) بوو یان (1993) بوو یەکەم تێهەڵچوون و ناکۆکی پارتی و یەکێتی لەلایەك و پەکەکە لەلای دیکەبوو، ئێمە لەگەڵ حزبە کوردستانیەکانی تر بانگ کراین بۆ پەرلەمانی کەوردستان، ئێمە تاکە حزب بووین ئەوکاتە وتمان کاری (pkk)بە باش نازانین، بەڵام ئامادەش نین یەك لایەنە (pkk)ە مەحکوم بکەین، فشارێکی زۆرمان لەسەربوو، وەکو باسمانکرد، چونکە ئێمە میوانین لەئێرە، ئێمە بەستراوینەوە بەیارمەتی ئەوان، بەو حاڵەش ئێمە ڕێکەوتنەکەمان ئیمزانەکرد وتمان نامانەوێ یەك لایەنە پەکەکە مەحکوم بکەین، لەسەر ئەو هەڵوێستەی ئێمە (pkk)ە لەستۆکهۆڵم چاوی بەئێمە کەوتووە کەمن خۆم نەبووم، بەڵام نوێنەرانی ئەو کاتەی کۆمەڵە یەکێکیان مینەی حیسامیە کەلەحزبی کۆمۆنیستدابوون، دوای لەفراکسیۆن جیابوونەوە، ئێمە کاتی خۆی دۆستایەتیمانکردون لەوانیە کاریشمان بۆ کردبن خۆیان جوان دەزانن.

## (pkk) خەڵکی کوردستانی ئێران بەمیت و موساد ناودەبەن شەڕی (pkk) دژی یەکێتی و پارتی ناهەق بوو

***چیتان بۆ کردون؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** کاری ئینسانیمان بۆ کردون، کاری دەرمانی، راستیەکەی دەنا هیچ کارێکی توندوتیژیمان بۆ نەکردون، بەڵام یارمەتی ئینسانی خێوەتو چادرو داودەرمان، ئەوانەمان بۆ کردون، خۆشیان دەزانن، بەڵام بەم حاڵەشەوە ساڵی (1998) بوو کەخەڵکی کوردستانی ئێران ئەو خۆپیشاندانە گەورەیانکرد بۆ پشتگیری لەکوردستانی باکوور بۆ دەربڕینی نارەزایی خۆیان لەدەستگیرکردنی عەبدوڵڵائوجەلان زانیم کەپەکەکە (T.V) لەجیاتی ئەوەی سوپاسو پێزانیان بۆ خەڵکی کوردستانی ئێران بەتایبەتی خەڵکی سنە کەشەهیدیاندا لەو رێگایەدا، ئەوەبوو کەئەو خەڵکەی بەناوی نۆکەری میتو نۆکەری مۆسادی ئیسرائیل ناوبرد، وەهێرشیکردە سەر خەڵکی کوردستانی ئێران، چونکە کوردەکەی ئێران لەپاڵ ئەوەی نارەزایەتی خۆی بەرامبەر سیاسەتی تورکیە دەربڕی، نارەزایەتی خۆی بەرامبەر دەستگیرکردنی عەبدوڵڵا ئۆجەلان دەربڕی، شیعاری دژی کۆماری ئیسلامیدا بۆ ئازادی خۆشی قسەیکرد، ئەوەش ئاساییە خۆ تۆ ناتوانی چاوەڕوان بکەی کەدەردی خۆی نەڵێ کەخۆشیان کورد نەبوونایە کەوابێ هاوسۆزییەکە سەرچاوە لەئێشی هاوبەش لەئارادایە بەهەر حاڵ کەوابێجوابی ئەو چاکەیەی کوردی ، جوابی ئێمەیان زۆربەخراپەدایەوە ئەوە خەتابارە شەڕێکی کەکردیان لەگەڵ پارتیو یەکێتی شەڕێکی خراپ بوو، پێموایە ناحەقیان بوو.

## (pkk) خۆی بەکوێخای هەموو کوردستان دەزانێ

*** پێتوایە (pkk) شەڕی ئەوانی کرد یان ئەوان شەڕی پەکەکەیان کرد؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** دەزانی چۆنە پەکەکە ئەگەر سیاسەتێکی ژیرانەی هەبوایە خۆی دەبوارد لەو شەڕە، موشکلەی (pkk)ە ئەوەیە کەخۆی بەکوێخای هەموو پارچەکانی کوردستان دەزانێ، حزبەکانی تر بەخائین دەزانێ، ئەمە گەرای شەڕی ناوخوییە، ئەگەر پەکەکە بڵێ من حزبی کوردستانی باکوورم، داوای پشتگیریو پشتیوانی مەعنەویو سیاسی بکات من ناڵێم پشتگیری



چەکداری لەخەڵکی ناوچەکانی کەبزانە دەیکەن، یان نایکەن، بەڵام مەعنای نییە، پەکەکە دێتە کوردستانی عێراق، پارتی بە (60) ساڵ خەباتی، یەکێتی بەنزیکەی (30) ساڵ خەبات، تۆ دێی کوێخایەتی ئەوان دەکەی و دەسەڵاتیان لێدەستێنی وە رێکخستن دەکەی، لێرە بەدیل دروستدەکەی.

ئێمە پێمانوایە هیچ حزبێکی تری پارچەکانی تری کوردستان بۆی نییە بچێ رێکخستن بکات لەپارچەکانی ترو بەتایبەت بەدیل دروستکات، ئەوان خەریکی بەدیل دروستکردن بن و حزبەکانی ئێرە بن کۆڵکەن، ئاخر دیارە لێیان قبوڵ ناکەن، گەرای شەڕی ناوخۆ ئەم سیاسەتە دەینێتەوە، ئێ دەڵێی تورکیە دەستی تێدابوو، چیکرد، هەموو دنیا دەستی تێدادەبێ بۆ خۆت دەبێ ژیربی، ئەو سیاسەتە نەگریەبەر، بۆ کوردستانی ئێرانیش کاتی خۆی ئێمە بۆ کۆنگرەی نەتەوەیی دەعوەتکراین بۆ کۆمیتەی ئامادەکار، یەکەم جەلەسەش بەشداریمانکرد، بەڵام ئەوەمان پێوتن، یەك دوو مەرجمان پێوتن کورد یەك نەتەوەیە، بەڵام هەر پارچەیە خۆی دیاری ئەکات چ سیاسەتێکی هەیە، هەر پارچەیە شکڵی خەباتی خۆی دیاریدەکات، حزبی سیاسی خۆی دیاریدەکات، هەڵبژاردنی سیاسی بەخۆیەتی، هیچ پارچەیەکی کوردستان و حزبەکانی بۆیان نییە کوێخایەتی و ئاغایەتی بەسەر پارچەکانی دیکەدا بکەن، بۆیان هەیەو ئەرکیشیانە کەلەخەباتی یەکتر پشتگیری بکەن و وتمان ئەگەرئەمە نەسەلمێنرێ ئێمە ئامادەنین بەشداری تیابکەین، دیارە کۆڵێك شتمان هەبوو لەسەر زەوابتی کۆنگرەی نەتەوەیدا، هیچ کام لەو دوو مەرجە بەڕێوە نەچوو، ئێمەش بەشداریمان نەکرد.

کەوایە موشکلیەی گەورەی پەکەکە ئەوەیە دەبێت دەست لە دروستکردنی بەدیل بۆ کوردستانەکانی دیکە هەڵگرێ ، مەبەست لەوە نییە حەقی نییە کەداوای پشتگیریان لێبکات، داوای سۆزیان لێبکات، داوای هاوخەباتیان لێبکات، بەڵام بۆی نییە داوای بەدیلیان لێبکات، وە خۆی بکات بەکوێخای ئەوان، سەرچاوەی ئەو شەڕانەی کەلەکوردستانی عێراق کردویەتی، بەبڕوای ئێمە ئەم سیاسەتەی پێکاکایە یان هیچ نەبێ ئەمە یەکێك لەهۆکارەکانیەتی لەکوردستانی ئێرانیش ئێمە پێمانوایە پەکەکە دەبێ ئەو کارە نەکات، دروستکردنی پژاك خۆی شتێکی هەڵەیە چ پێویستی بەوەیە لقێکی دروستکەن و چوارکەس وە دوای خۆیان خەن لەکوردستانی ئێران، ئەوە کارێکی هەڵەیەوە پشتیوانی کوردی ئێرانیش راناکێشێ بۆ لای پەکەکە.

*رای نەکێشاوە؟

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** نەخێر غەیری ژمارەیەکی زۆر کەم، کەئەویش زۆر زۆر روو لەکەمبوونە.



## پژاک قەت نابێ بەهیچ

*** پەژاك نەبووە بەهێزێکی ئەساسی منافەسەی کۆمەڵە و دیموکرات بکات؟**

عەبدوڵلای موهتەدی: پژاك بۆ ماوەی یەك دوو ساڵ گروکفێکی بوو کەئێجگار زۆر کزە لەنێو خەڵکی جدیو سیاسیو وەلەنێو جەماوەرەدا، نەخێر نابێ بەهیچ.

## پژاک نابێ بەبەدیلی کۆمەڵە و دیموکرات

*** بەلام بەحەرەکەتێکی چەکدارانەی ئەزانن خەڵکی کوردستانی ئێران و پێیانوایە لەبەرئەوەی کۆمەڵە و دیموکرات ناتوانن ئەو خەباتە بکەن ئەوانە بوون بەئەڵتەرناتیڤ؟**

عەبدوڵلای موهتەدی: نەخێر قەت نابن بەئەڵتەرناتیڤ.

## (pkk) دژی کوردی پارچەکانی تر کاردەکات بەقازانجی ئێران و سوریاو عیراق

***بەس مەبەستت ئەوەبوو کە پەکەکە ئەڵتەرناتیڤە بۆیە ئەوەی دروستکردوە؟**

عەبدوڵلای موهتەدی: باشە خۆ ناتوانێ ببێ بەئەڵتەرناتیڤێکی راستەقینە، بەلام کێشە دروستدەکات، تۆ دیقەت بدە، واتە پەکەکە کێشەیەکی بۆ دەوڵەتی ئێران دروستکرد، نەخێر، بەلام کێشەی بۆ کوردی ئێران دروستکرد. پەکەکە کێشەیەکی بۆ دەوڵەتی عیراق دروستکرد، نەخێر، بەلام کێشەی بۆ کوردی عیراق دروستکرد، پەکەکە کێشەی بۆ دەوڵەتی سوریا دروستکرد، نەخێر، بەلام کێشەی بۆ کوردی سوریا دروستکرد، کەتۆ لێ تێدە فکری تەماشادەکەی، لەژێر ناوی کوردایەتیەکی تۆخدا، لەراستیدا دژایەتی بزوتنەوەی رزگاریخوازانەی یەکەیەکەی پارچەکانی کوردستان کراوە، ئەمە چ کوردایەتیەکە دەیکەی؟ شەڕی ناوخۆت لەهەموو جێیەك لەگەڵ کورد کرد لەهەموو جێیەکیش لەگەڵ دەوڵەتانی داگیرکەر هاوپەیمانی، ئاخر ئەمە چ کوردایەتیەکە دەیکەی. رەنگ بێ زۆریشیان هێرشکردوەتە سەرم، دەبێ لەخۆیان بپرسی بۆ وایانکردوە، بەلام کارێکی چاکیان نەکردوە وە دەستپێکردنەکەیو خراپکردنەکەی لەلایەن ئەوان بووە ئێمە هیچ بەرنامەیەکمان بۆ دژایەتیکردنی پەکەکە نییە پێمان خۆشە کێشەی کورد لەکوردستانی باکوور



کەکێشەیەکی ڕەوایەو عادیلانەیە، قابیلی پشتیوانیە، ئێمەش پشتی دەگرین وەبەشێوەیەکی سیاسیانەو هێمنانەو چارەسەربکرێ لەتورکیا، هەندێك هەنگاویش هەڵگیراوە پێموایە کورد دەبێت ئەو هەنگاوانە بقوزێتەوەو بچێتە پرۆسەی سیاسی تورکیاوە ئەوە بەرێگەی دروست دەزانین بۆ ئەوان، بەلام دیسانیش ئێمە بۆیان دیاری ناکەین کەیفی خۆیانە خەباتیان چۆنە.

## (pkk) لەگەڵ ئیتلاعات پەیوەندییان هەیە

***ئەوان شەڕی حکومەتی هەرێمی کوردستان یەکێتیو پارتیانکرد بەو دەلیلەی کەئەیانوت یەکێتیو پارتی بەئێمە ئەڵێن کوردستان بەجێ بێڵن بەلام کوردستان ولاتی ئێمەیە، ولاتی هەموومانە، خاڵێکیان ئەوە تاچەند راستە؟ خاڵێکی تر یەکێتیو پارتی ئەگەر بۆیانبکرایە پارتی کرێکارانی کوردستانیان وەکو ئێوە نەئەکرد بەحزبی ئۆردوگا نشینو لەژێر سەیتەرەی ئەوان رێگانەدەن خەباتی چەکدارانە بکەن، کەبە پێچەوانەوە پەکەکە ملی بەوە نەداوە؟**

عەبدوڵای موهتەدی: من پێموایە ئەگەر پەکەکە ژیربووایە پێگەکانی خۆی کەئێستا لەقەندیل هەیەتی رای بگرێ، بەلام نەکەوێتە شەڕ لەگەڵ یەکێتیو پارتیو لەکوردستانی عیراقو ئەوانیش بۆیە ئەو قسەیانکردوە ئەگەر کردبێتیان کەئێرە بەجێ بێڵەو برۆ، چونکە ئەو گێرەو کێشەو دەردی سەریانەی ناوەتەوە من پێموایە بەژیرانە دەیتوانی زەرەرو زیانەکانی ئەوە بۆ خۆی کەمکاتەوە.

## پارتی خراپی کرد، تورکیای هێنا

***باشە جا ئەوە راستە لەبەرامبەر سیاسەتی هەڵەی پارتی کرێکارانی کوردستان، بەلام پارتی دیموکراتی کوردستان هێزی تورکیا راکێشێ بۆ پەلاماردانی پەکەکەیان بۆ سەر باشووری کوردستان؟**

عەبدوڵای موهتەدی: ئێمە لەگەڵ ئەوەنین کەکێشە لەگەڵ هیچ کەس واتە کێشەی ـ وخۆی حزبە کوردیەکانداڕژی ئەوەین کەهیچ کام لەو دەوڵەتانی ناوچە بەشداریبکرێن، تۆ بۆت هەیە لەدەوڵەتی تورکیە بۆ نموونە دەڵێم ئەگینا شتی وا روویندەداوە کورد بۆی هەبوو لەدەوڵەتی تورکیە یارمەتی وەرگرێ ئەگەر بیکردایە، یارمەتی وەرگرێ لەدژی سەدام،بۆی هەبوو دەوڵەتی جمهوری ئیسلامی وەرگرێ لەدژی سەدام، بەلام بۆ بەکارهێنان بەدژی، هێزێکی کوردی ئێمە لەگەڵ ئەوەنین کەهیچ کام لەو دەوڵەتانە بێنینەکایەوە، ئاخر موشکیلەی گەورە ئەوەیە ئاخر، پەکەکە لەگەڵ هەموو

دەوڵەتەکان نێوانی هەیە، نێوانی لەگەڵ ئیتلاعاتی ئێران خۆشە هاتوچۆیان هەیەو لەهەندێك شتدا تەنسیقیان هەبوە.

***بەڵام لەسەر حسابی پارچەکانی ترە؟**

**عەبدوڵلای موهتەدی:** هیوادارم وانەبێ.

*** پێتوایە وایە؟**

**عەبدوڵلای موهتەدی:** بەڕاستی بەدیقەت من ئێستا بۆم لێك نادرێتەوە، بەڵام میعیارەکە ئەوەیە لەڕوانگەی ئێمەوە تۆ بۆت هەیە بۆ پاراستنی خۆت و خەباتەکەت لەگەڵ ئەو دەوڵەتانە پەیوەندیت هەبێ، بەڵام بۆت نییە دەوڵەتەکان کەڵکیان لێوەرگری، بەدژی هێزێکی کوردی.

***بەڵام من بۆچونێکی جیاوازم هەیە، کاتێك حزبێـك ئەبێتـە هێزێکـی کـاراو کاریگـەر لەناوچـەکەدا پەیوەندیەکانی لەگەڵ ئەم وڵاتـانە دەستپێئەکات، بۆ نموونە یەکێتی نیشـتمانیو پـارتی دیمـوکراتی کوردستان پەیوەندیان هەیە لەگەڵ ئیتلاعات و میت و بەڵام کەئەمانە هێزن و ڕەقەمن؟**

**عەبدوڵلای موهتەدی:** من کێشەکەم تەنها لەسەر ئەوەنییە بۆ پەیوەندیان هەیە، کێشەکەم لەسەر ئەوەیە کەپەکەکە گرفت و دەردی سەری دروستکردوە بۆ بزوتنەوەی ڕزگاریخوازانەی پارچەکانی تر، سیاسەتی پێکاکایەك لەهۆکارەکانی شەڕی ناوخۆبووە، ئەگەر بڵێین هەموو شتێ نەبێ، یەکێك لەهۆکارەکانی شەڕی ڕاگەیاندن بووە. ئاخر پەکەکە پێویستی بەوە نییە، پێکەکە وەکو حزبێك کەلەکوردستانی باکوور هەوڵدەدات کەبۆ خۆی شکڵی خەباتی خۆی دیاریبکات، ئێمە پێمانوایە لەتورکیە ڕێگەی خەباتی سیاسیو پرۆسەی سیاسی هەیە ئەوەمان پێ چاکترە، بەهەرحاڵ ئەمان خۆیان بڕیاردەدەن، ئەوان ئەگەر وەك حزبێکی کوردستانی باکوربن و داوای پشتگیریو هاوخەباتی بکەن لەخەڵکی دیکە حەقی خۆیانە، وەرەنگە زۆر زیاتر پشتگیری بکەن، ئەوان لەجیاتی ئەوەی ئەحزابێکی کارتۆنی دروستکەن لێرەو لەوێ لەگەڵ حزبە ڕەسەنە سەرەکیەکان دۆستایەتی بکەن، لەو ڕێگەیەوە دڵنیام خەڵکیش سۆزی بۆیان زۆر دەبێو پشتگیری بۆیان زۆرتر دەبێ، هەموو هاوکارییەکی زۆرتر دەتوانن بەدەست بێنن لەجیاتی ئەوەی بەدوژمنایەتی ئەو حزبانەی (40) ساڵ یان (60) ساڵە لەناوچەکەدا کاردەکەن بەدژایەتی ئەوان بچن گروپی سەربە خۆیان پێکبێنن.



# (pkk) حزبی کوردستانی تورکیایەو بۆی نییە لەسەر کوردستانی ئێران بڕیار بدات

***بەڵام ئەوان گلەییان لەئێوە هەیە، ئەڵێن ئەوان حزبێکی ئۆردوگان نیشنین، نەیانتوانیوە نەحزبێکی جەماوەری بن نەخەباتی چەکداری بکەن، ئەوان لەدوو ئۆردوگا دانیشتوون، (کۆمەڵەو دیموکرات)و تەواو؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** بەوان مەربووت نییە، ئاخر کێشەکەم ئەوەیە ئێمە ئوردوگانیشینی دەکەین، یان نایکەن خەباتی مەدەنی دەکەین یان چەکداری دەکەین، فیدراڵیزممان دەوێ، یان ئۆتۆنۆمی، ئەمە حەقی ئەوان نییە، ئەوان حزبی کوردستانی تورکیەن، لەوێ چۆن خەبات دەکەن چییان دەوێ مافی خۆیانە، رەنگ بێ رەئێکمان هەبێ، ئەوانیش رەئێکیان هەبێ لەسەرشێوەی خەباتی ئێمە، خۆ ئێمە ناڵێین کەس بۆی نییە قسەبکات، بەڵام ئەوان چی کوردی ئێران و حزبەکان کردیان، چی خەباتی رزگاریخوازانەو میللەتی کورد لەکوردستانی رۆژهەڵات کردی ئەوان ئەرکیانە پشتیوانی بکەن و چییان پێبکرێ دەست گیرۆی بکەن و بۆیان نییە تێکیبدەن، بەدیل دروستبکەن، ئۆردوگانشینی بکەین، یان نەیکەین، ئەوە کێشەی ئەوان نییە.

# رێگا نادەین چەند منداڵ بارودۆخەکە تێکدەن

***واتە تۆ لەگەڵ ئەوە نیت، حزبێکی کوردی ئەگەر بۆی بکرێ، یان خەڵکی کوردستانی هەرچوارپارچەکە قبوڵی بکات، ببێ بەحزبێکی جەماوەری و سەرتاسەری هەرچوار پارچەی کوردستان؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** ئەزانی چۆنە، ئەمە لەکات و ساتی ئێستادا نابێ، ئەزموونیش سابتی کردووە ئەم کوردستانانە مێژوویەکیان هەیە، مێژوویەکی سیاسیان هەیە، پێشینەی خەباتێکیان هەیە، ئێمەو حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێرانیش یەکی چەند هەزار شەهیدمان هەیە، لەکوردستانی ئێران، هەزاران، هەزار خانەوادەی پێشمەرگەو خانەوادەی زیندانی سیاسی و خانەوادەی تەبعیدی و دوورخراوەمان هەیە، سەدان هەزارو بگرە ملیۆنەها کەس پەیوەندی و سۆزو هاوکارییان هەیە بۆ ئەو حزبانە، تۆ ناتوانی لەجێیەکی دیکەوەبێی ئەریشەت هەیە، نەمێژووت هەیە، نەخەباتێکتکردوە لەخۆوە لەجێگەیەکی دی بێی لێرە قوت ببیەوە، بەم بێ ریشەییە بەم بێ پێگەییە خۆت بسەپێنی،



ناعیلاجی چیبکەی ناعیلاجی بەهێزی چەکدار بیکەی ئەمە عەینی ئەو کارەیە، بۆیە ناچارن بەهێزی چەکدار کاربکەن و پێگەیەکی سیاسیان لەبەشەکانی دیکەی کوردستان نییە.
من بەڕاستی دروستکردنی حزبی سیاسیش لەلایەن کوردستانی عیراقیشەوە، هەر تورکیە نییە، کوردستانی عیراقیش بێ حزبێکمان بۆدروستکات لەکوردستانی ئێران بەهەمان ئەندازە پێم خراپە، ئێمە بێین حزبێك دروستکەین پێم ناپێویستە، ئاخر کوردستانی ئێران (10) ملیۆنن ئەو هەمووە خوێندەوارەیان هەیە، ئەو هەموو تێکۆشەرەیان هەیە، ئەو هەمووە شارە گەورەیان هەیە، ئەو هەموو نوسەرو شاعیرە گەورەیان هەیە، فیلم سازو تێکۆشەری دێرینیان هەیە بەهەموویان عەقڵیان پێ ناشکێ چۆن خەباتەکەی خۆیان بەڕێوەبەرن ئاخر دەبێ (3) منداڵ لەجێیەکی دیکەوە بێن کارەکەی بەدەستەوە بگرن، ئەویش بەپشتگیری هێزی چەکدارەوە، ئێ خۆ مەعلومەکارەکە تێکدەدات، مەعلومە ئەوە شتێکی رەسەن نییە، مەعلومە لەجێی خۆیدا نییە غەیری کێشە هیچی لێ ناکەوێتەوە.

# (pkk) تیرۆریست نییە

***(pkk)ت پێی حزبێکی شۆڕشگێرە، یان حزبێکی تیرۆریستە، وەك لەسەرتاسەری دنیا باسی دەکرێت؟**
**عەبدوڵلای موهتەدی:** ناوی نانێم تیرۆرست.

***شۆڕشگێرە؟**
**عەبدوڵلای موهتەدی:** من رەخنەی زۆرم هەیە لەسەر پەکەکە، واتە ئەگەر بێتە سەر لێکدانەوەیەکی سیاسی، بەلام نەك وەکو شەڕی راگەیاندن، وەکو لێکدانەوە بەڵێ قسەم هەیە لەسەری، بەلام ناویشی نانێم تیرۆریست، قەتیشمان پێ نەوتوون، چونکە ئەسڵەن ئەو چەمکە چەمکی ئێمە نییە، ئێمە وەکو کورد وەکو بەشدارێکی بزوتنەوەی کورد، وەکو کۆمەڵەیەکی چەپ و پێشکەوتنخواز رەخنەمان لەپەکەکە هەیە، ئەمە ناچێتە ئەو خانەیەی هەر وڵاتێك وەکو ئەمریکاو ئەوروپا یان تورکیە پێی بڵێین تیرۆریست، ئەوان کەیفی خۆیانە، ئێمە ناچینە خانەی ئەوانەوە لەگەڵ پێکەکە ئێمە رەخنەی خۆمان هەیە لەپێکەکە.



***بەهەموو خراپەکانیەوە پێتوایە بەهێزترین هێزی حزبی کوردییە؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** لەکوردستانی باکوور بەڵێ، پێشموایە بۆ ئەوانیش ئێمە مافی ئەوەمان نییە دەست لەکاریان وەردەین و بیان روخێنین، خەڵکی کوردستانی باکوور بابۆ خۆیان هەڵبژێرن لەرێگای سندوقی دەنگدانەوە یان هەر رێگەیەکی خۆیان هەڵبژێرن کەکام حزبیان دەوێ پەکەکەیان ویست مافی خۆیانە.

# (pkk)ەمان وەک حزبی قائید قبوڵ نییە

***تۆ (pkk)ەو عەبدوڵلا ئۆجەلانت وەکو حزبی قائیدو سەرۆك قبوڵە؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** بۆکوێ.

***بۆ هەر چوار پارچەکەی کوردستان؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** نەخێر، بۆ تورکیە مافی ئێمە نییە قسەی لەسەر بکەین، دەبێ خۆیان قاعیدی خۆیان، حزبی خۆیان هەڵبژێرن و پارچەکانی دیکەی کوردستانیش پێموایە لەو چوار پێنج ملیۆنەی کوردی عیراق بڵێی کەسی لێ پەیدانە بێ دوای (80) ساڵ خەبات، قیادەیان بکات.

***بەڵام عەبدوڵڵا ئۆجەلانت پێ سەرکردەیەکی شۆرشگێڕە؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** پێم سەرکردەی پێکاکایە.

***ئەکرێ ئەوەم پێ بڵێی، کەئەوە هەڵە سیاسی و ستراتیژی و پراکتیکیەکانی عەبدوڵڵا ئۆجەلان بوون دەرئە نجام خستیەزیندانەوە یان پیلانێکی نێودەوڵەتی بوو؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** وەڵڵا بێگومان پیلانێکی نێودەوڵەتی بوو، من بەڕاستی لەوردەکاریەکەی ئاگادارنیم و پسپۆڕی ئەوکارەش نیم.

# دانیال میتران و مەحمود عوسمان بەئۆجلانیان وت ئیتاڵیا جێنەهێڵێت بەقسەی نەکردن

***هیچ ئاگات لێی نییە؟**

عەبدوڵڵای موهتەدی: ئەو جۆرەی خوێندوومەتەوە، من وەك خوێنەرێك تەماشامكردوە، زانیاریەكی تایبەتم لەوە بارەیەوە نییە، بەلاّم ئەو جۆرەی لێیان كۆڵیوەتەوەو لەسەریان نوسیوە، وەك بیستومەتەوە لەملاولا هەڵەكانی خۆشی لەدەستگیریەكەیدا بێ تەئسیرنەبووە، چونكە زۆر كەس دەڵێن نامەمان لێ نوسیوە وتومانە لەئیتاڵیا مەڕۆ، ناتوانن لێرە هیچت لێبكەن، تەنانەت خانمی دانیال میتەران نامەی لێ نوسیوەوە زۆر كەسی دیكە نامەیان لێ نوسیوە، ئەو جۆرەی كەبیستومە كاك دكتۆر مەحمود عوسمان، هەیئەتێكی كوردی كاك عەزیزی ماملێ، زۆر كەسی دیكە نامەیان لێ نوسیوەو داوایان لێكردوە، ئیتاڵیا بەجێنەهێڵێ، وتوشیانە ئیتالیا ناتوانێ هیچی لێبكات، ولاّتێكە ناچارە پەنابەری بداتێ، باشترین جێگەیە بۆ ئەو ئیتر بەچ هۆیەك رۆیشتووە ئەوە بۆ من روون نییە، بەلاّم ئەو قسەیە هەیەو منیش بیستوومە.

# لایەنگری ئازادكردنی ئۆجەلانم

*** پێتوایە تاچەند چانسی ئازادكردنی هەیە لەزیندانەدا ئۆجەلان؟**

عەبدوڵڵای موهتەدی: ئەگەر پرۆسەی سیاسی لەتوركیە بچێتە پێشەوەوە، تۆزێك ئەو بڕینانە سارێژ ببێ رەنگە پێداچوونەوەیەك بەمەسەلەی مەحكومیەتی عەبدوڵڵا ئۆجەلان بكرێ، من خۆم یەكێك لەوانەم لایەنگری ئازادكردنی عەبدوڵڵا ئۆجەلانم.

***ئەو كاتە پێتوایە ببێ بە نیلسۆن ماندێلا؟**

عەبدوڵڵای موهتەدی: بابزانین چۆن دەبێ، بەهەرحاڵ هەر نفوزێكی ئەوان پەكەكە یان شەخسی كاك عەبدوڵڵا ئۆجەلان لەتوركیە ببێ حەقی خۆیانەو قسەیەكمان لەسەر ئەوە نییە.

***حیكمەتی ئەوە چییە زیاتر لە (10) ساڵە سەرۆكی حزبێك لەزینداندایە، بەلاّم سەركردایەتیو كادیران و رێكخستنەكانی هەتائێستا ئیلتیزامی پێوە ئەكەن لەناو زیندانەوە، ئەمە چۆن سیاسەتێكە؟**



عەبدوڵڵای موهتەدی: جائەوان دەبێ جواب دەنەوە، ئەوە وەزیفەی یەکەکەیە دەبێ جوابدەنەوە، دیارە زۆر کەس، ئێمە نا، ئێمە دەخالەتێکمان لەوەدا نەبووە، بەڵام بیستوومە زۆرکەس ئامۆژگاریکردون، بەڵام دیارە خۆیان ئەوەیان پێ باشە.

***ئێستا پرۆسەیەکی دیموکراسی، یان پرۆسەیەکی ئاشتیخوازانە لەنێوان حکومەتەکەی رەجەب تەیب ئەردوغان و پارتی کۆمەڵگای دیموکراتی کوردستانی تورکیا (DTP) کەئەویش باڵێکی مەدەنی پارتی کرێکارانی کوردستانەی لەشار دەستپێکردووە، یەکەکە راستەوخۆ دەستی هەیە، حکومەتی هەرێمی کوردستانیش ئەبێ پشتیوانی لەمەبکات، ئۆباما، ئەحمەد تورکی بینی لەچەند مانگ پێش ئێستا. بەبۆچوونی تۆ وەکو سیاسیەك رێگا چارەکانی چۆنە، چۆن کورد ئەتوانێ لەگەڵ تورکیا رێکەوێ، یان تورکیا چۆن ئەتوانێ مافی کورد بدا، ئەو شەڕەی کەچەند ساڵە هەیە کۆتایی پێ بێ کەخەڵکێکی زۆری تیاکوژراوە؟**

عەبدوڵڵای موهتەدی: من رێگای کرانەوە سیاسی لە تورکیە بەتەنیا رێگایەك دەزانم کەنەك هەر قازانجی کوردی تێدایە، قازانجی تورکیاشی تێدایە، واتە سیاسەتی نادیدەگرتن، توانەوەی بەزۆر سیاسەتی ئینکاری هەبوونی کورد لەتورکیا سیاسەتێکی هەڵەبووە، بەدەیان ساڵ ناڵێم هیچ کاریگەری نەبووە، دیارە لەسەر ئاستی میلاسیۆنی گەلی کورد لەکوردستانی باکور بێ تەئسیر نەبووە، بەڵام دیمان کەعاقیبەت ئەو سیاسەتە سەرنەکەوت ئەگەر سەرکەوتایە سەردەکەوت بۆ تورکیە، ئەگەر بیەوێ بەڕاستی وڵاتێك بۆ خۆی دیموکراتیزە بکاو بچێتە ریزی وڵاتانی دیموکراتەوە، ئەگەر بیەوێ لەگەڵ یەکێتی ئەوروپا یان بچێتە ناویان یان دۆستایەتیان لەگەڵ بکا تەنانەت بۆ گەشەکردنی ئابوری‌و سیاسی‌و کۆمەڵایەتی خۆشی تورکیە پێویستی بەوەیە کەمەسەلەی کورد چارەسەربکات.

ئەو هەنگاوانەی کەئێستا هەڵگیراون رەنگە خۆی لەخۆیدا هەنگاوێکی گەورە نەبن، بەڵام بۆ تورکیا کەتائێستا هیچی نەدەدا وە ئامادەنەبوو ئەسڵەن وشەی کورد ببیستێ، بۆ ئەوان هەنگاو گەلێکی بچوك نییە، هیواداریشم سەربگرێ ئەگەر سەرنەگرێ نەك هەر زەرەری کورد دەبێ بەڕاستی زەرەری تورکیەش دەبێ من پێموا نییە لەتوانای دەوڵەتی تورکیەشدا بێ چی دیکە ئینکاری کورد بکات، لەتورکیا تورکیە دەتوانێ وڵاتێکی ئازادو دیموکراتبێ، کورد دەتوانێ ئەگەر نەڵێین هەموو مافەکانیان، بەڵام زۆرێك لەمافەکانیان وەك مافی فەرهەنگی وەك زمان وەکو مافی هەڵبژاردن وەك رۆژنامەو تەلەفزیۆن‌و خوێندن‌و زۆر شتی دیکە بەدەست بێنن، خۆیان لەگەڵ تورکەکانی تورکیە بەشەریك‌و خاوەن موڵك بزانن، لەو وڵاتەدا دیارە ئەوە حەتمەن مانای ئەوەیە دەبێ دەستوری تورك

بگۆڕێ، مانای ئەوەیە کەدەبێ میزانی دەخالەتو نفوزی نیزامیانو ئەرتەش لەدەوڵەتەدا کەم بێتەوەوە، زۆرێك لەقانوونە کۆنە پەرستەکان بگۆڕێن ئەوانە هەیە.



# تۆرانی چەند کەس دەستپێکرد

***ئێستا قسە لەسەر کۆنگرەی (11)ی کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانی کوردستان ئەکەین کەلە (9) بۆ (4)ی خەزەڵتوەری (1385) واتە لە (31)ی ئۆکتۆبەر تا (5) نۆڤەمبەری (2006) بەسترا، لەو کۆنگرەیە ئێوە سەرلەنوێ قسەتان لەسەر تەشکیلاتی ناوخۆو دەرەوەکردووەوە، قسە لەسەر هەڵبژاردنی حکومەتی ئەحمەدی نەژاد کراوەوە، قسە لەسەر سەدام حسێن و دەستگیرکردنی و مەحکەمەکردنی و بەعسکراوە، باسی زۆر مەسائیلی گرنگتان باسکردوە، کۆنگرەکە دوای روخانی بەعسە کەئێوە پەیوەندیەکی چەند ساڵەتان هەبووە، ئەم پەیوەندیە راستە پەیوەندیەکی گرنگ نەبووە، بەڵام پەیوەندیەکیش بووە ئێوە وەکو ئۆپۆزیسیۆنی ئێران سودتان لێوەرگرتووە، دوای ئەوە حکومەتی هەرێمی کوردستان خۆی تەقوێ ئەکات، پەیوەندی و دۆستایەتیەکانی لەگەڵ ئێوە باشتر ئەبێ، کۆماری ئیسلامی ئێرانیش کێشە و ململانێی زۆرتری لەگەڵ ئەمریکاو ئەوروپا بۆ پێکدێ، ئەم کۆنگرەیە جیاوازی هیچ هەبوو لەگەڵ کۆنگرەکانی تردا، یان کۆنگرەیەکی رۆتین بوو وەك کۆنگرەکانی تردا بەسترا؟**

عەبدوڵڵای موهتەدی: لەباری سیاسیەوە شتێکی زۆر جیاوازو عەجایب نەبوو، دیارە بەعس کەکاتێك روخا ئێمە کۆنگرەی (10)مان بەستبوو، واتە زۆربەی شتەکان ئەو وەختەبوون، بەڵام کۆنگرەی (11) وەختێك بەسترا کەزۆر زۆر لەگەشەکردندا بووین لەناوخۆی کوردستانی ئێران، واتە بەڕاستی موشکیلەیەکی ئەوتۆمان نەبوو لەوبارەیەوەوە، کۆمەڵێك شتی سیاسی گرنگیشمان راستە باسکردوە، لەوێ لەگرنگترین سیاسەتی خۆمان لەسەر ئەحمەدی نەژاد، لەسەر راپەڕینێك کەکرابوو (2005) راپەڕینی شارەکانی کوردستانی ئێران، لەسەرەتای هاتنەسەر کاری ئەحمەدی نەژاد، لەسەر ئەو راپەڕینە لەسەر بارودۆخی بزوتنەوە لەکوردستانی ئێران لەسەر بارودۆخی ناوچەیی و جیهانی حکومەتی کۆماری ئیسلامی لەسەر سیاسەتمان سەبارەت بەحزبەکانی دیکەو زۆر شتی تر لەوبارەیەوە هاتووەتە ئاراوە.

سەبارەت بەنەتەوەکانی ئێران، کۆمەڵێك شتی ئاوا هاتووەتە گۆڕێ و تەنانەت لەسەر شتی حزبیش کۆمەڵێك گەڵاڵە پەسەندکرا لەبابەت پلەبەندی حزبییەوە، لەبارەی سیاسەتی کادرەوە لەحزبدا، ئەوانەکران، لەبابەت گۆڕینی مادەی ئەوەڵێ ئەساس نامە، گۆڕینی پێڕەوی ناوخۆ قسەکرا، کۆمەڵێك شتی وابوو، واتا هەم شتی سیاسی تێرو تەسەلی تیابوو، هەم شتی حزبی، بەڵام ئەوەی لەم کۆنگرەدا جیاوازی بوو، بریتیبوو لەوەی کەژمارەیەك دیارە کەکەمینەش بوون، ژمارەیەك لەناو ئەو کۆنگرەیەدا هەست بەوە دەکرا وەکو فارس دەڵێ جۆرێك جەبهەگیری جۆرێك بۆ خۆیان لاگیریان بوو، چونکە کەمینەش بوون، کەمتربوون پێیانوابوو دەنگناهێنن لەهەڵبژاردنی کۆمیتەی ناوەندیدا،



وەك جۆرە تۆرانێك وتیان ئێمە ئەسڵەن خۆمان کاندید ناکەین بۆ کۆمیتەی ناوەندی، ئێمە پێمانوابوو زۆرینە دەیتوانی .هەڵبژاردن بکات تەواویش دەبوو دەڕۆی، پێماوابوو لەجیاتی ئەوە بەسیاسەتی دڵخۆشیدانەوەو سیاسەتێکی هێمنانە ئەوانە مەجالیان بدەینێ، بۆیە پێشنیارێك کرا ئێمە قبوڵمانکرد ئەویش ئەوەبوو کۆمیتەی ناوەندی پێشوو لەجێی خۆی بمێنێتەوە، لەجیاتی دوو ساڵ و سێ ساڵ کۆنگرەی (12) ساڵێك دواتر بکرێ، لەم ساڵەدا هەوڵبدەین ئەگەر گلەییەك هەیە چارەسەربکرێ بۆئەوەی هەمووان بەیەك ریزی لەئینتیخاباتی کۆمیتەی ناوەندی بەشداربیکەن.

## ئێمە نەمانووتوە خەباتی چەکداری دەبوژێنینەوە

---

***لەم کۆنگرەیەش و لەکۆنگرەی (10)شدا ئێوە وەك کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانی کوردستان پاش هاتنە دەرەوەتان لەحزبی کۆمۆنیست پڕوپاگەندی ئەوەتانکرد، خەباتی چەکداری ئەبوژێنەوە. پاش چەند ساڵ چاوەڕوانی نەمانبینی ئەم خەباتی چەکداریەتان ئەبوژاندەوەو نەتانکردوە، بەهەمانشێوەش کاتێ عومەری ئێلخانیزادەش لەئێوە جیابووە، پڕوپاگەندی ئەوەیکرد خەباتی چەکداری ئەبوژێنێتەوە نەیتوانی ئەوەبکات، ئەویشی نەکرد، ئەوە تەنها پڕوپاگەندەیە یان هۆکاری سیاسی گرنگی لە پشتەوەیە کەئێوە ناتوانن باسیبکەن، هۆکارەکەی چییە، کەهەمیشە بانگەشەی ئەکەن و ناتوانن و ناکرێ؟**

**عەبدوڵای موهتەدی:** نائێمە خەباتی چەکداری دەبوژێنینەوە لەکوردستانی ئێران بەپێچەوانەوە ئێمە زۆر لەسەر ئەو ڕۆیشتووین، دیارە باسی خەباتی چەکداری باسی جێگەو پێگی ئەو خەباتە لەڕەوتی بزوتنەوەی ئازادیخوازانەو رزگاریخوازانەی کوردستانی ئێران باسی ئەوانەمان زۆرکردوە، بەڵام نا من شتێکی ئاوام لەبیرنایە کەئێمە بەڵێنێکی ئاوامان دابێ کەدوای ساغکردنەوەی کۆمەڵەو بوژاندنەوەی کۆمەڵەو جیابوونەوەمان لەحزبی کۆمۆنیستی ئێران، یابڵێین بۆیە جیابووینەوە بۆئەوەی خەباتی چەکداری زیندوو بکەینەوە نا لەو بڕوایەدا نیم.

# خەباتی چەکداری کێشەیە بۆ حکومەتی هەرێمی کوردستان

--------------------------------

*بۆ بەڵێن نادەن ئەگەر وایە؟

عەبدوڵلای موهتەدی: ئاخر بۆ بیدەین، ئێمە قسەمان زۆرە لەسەر خەباتی چەکداری، زۆر قسەمان لەسەر ئەوەکردوە، بەتایبەتی من یەکێکم لەو کەسانەی کەزۆر لەو بابەتە دواوم، ئێمە بەدوو هۆکار هێزی پێشمەرگە رادەگرین، ئەوە هێزی پێشمەرگە، بەڵام عەمەلیاتی پێشمەرگە ناکەین لەکوردستانی ئێران غەیری جارێك کەتووشبووین زۆر زوو ئەوەشمان نەکردوە، واتە عەمەلیاتمان نەکردوە، هۆیەکەی چییە هۆیەکەی ئەگەڕێتەوە بۆ دوو.

هۆکارێکیان، ئەوەیە ئێمە سەرجەم پێمانوایە بۆ کورد لەکوردستانی ئێران لەم قۆناغەی ئێستادا باشترە، کەبەخەباتی سیاسی، بەخەباتی رێکخستن، بەخەباتی راگەیاندن کاری خۆی بەرێتەپێشەوە، واتە ئێمە بڕوامان ئەوەیە کەلەنێو جەماوەردا کاربکەین، بەم شێوازانە کاریگەر ترەوە چاکترە، گونجاو ترە، لەگەڵ سەردەمی ئێستا، پێمانوابوو عەمەلیاتی هێزی پێشمەرگە ئەم رەوتە سیاسیە لەکوردستان پەکدەخات، لەجیاتی ئەوەی تەقوییەتی کاو بەهێزیکات، کاری چەکداری یان هیچ کام لەشکڵەکانی تر ئەموقەدەس و پیرۆزن نەمەتا سەرن، دەبێت بزانین کەبارودۆخ چۆنە، ئامادەی وەرگرتنی لەلایەن کۆمەڵگاوە چۆن، بزانین ئایا ئەم شکڵە لەخەبات خزمەتدەکات بەئامانجەکەی تۆ یان بەپێچەوانە پەکی دەخاو شانسەکانت کوێر دەکاتەوە، کەوابێ ئەمە هۆکاری یەکەم بوو.

هۆکاری دووەمیش ئەوەیە ئێمە بەرامبەر بەحکومەتی هەرێمی کوردستانو ئەزموونی کوردستانی ویستومانە مەسئولانە هەڵسوکەوت بکەین و نەمانویستوە کێشەو گرفتیان بۆ دروستبکەین.

# پەیمانمان لەگەڵ یەکێتی و,پارتی مۆرنەکردوە، خەباتی چەکداری نەکەین

***کەواتە ئەو قسەیە راستە ساڵی (2002) یەحیا رەحیم سەفەوی فەرماندەی سوپای پاسداران ئەڵێ "کۆمەڵەو دیموکرات بەڵێننامەیان بە پارتی و یەکێتی داوە کەخەباتی چەکداری نەکەن و سنورەکان نەبەزێن"؟**

**عەبدوڵلای موهتەدی:** نەخێر، بەنیسبەت کۆمەڵەوە راست نییە، ئێمە هیچ پەیمانێکمان لەگەڵ هیچ کەس لەو بارەیەوە مۆرنەکردوە، حزبی دیکە کردویانە، یان نە، خۆیان دەزانن.

***ئەتەوێ بڵێی دیموکرات کردویەتی؟**

**عەبدوڵلای موهتەدی:** نازانم، ئەوان بۆ خۆیان قسەیان لەو بارەیەوە کردوە، باشتروایە لەخۆیان پرسی، ئێمە هیچ بەڵێن نامەیەکمان لەو بارەیەوە ئێمزانەکردوە، بەڵام ئێمە بۆ خۆمان ئەو تێگەیشتنەمان هەم بەرامبەر ئەزموونی کوردستان هەبووەو هەم بەدەرجەی یەکەم عەمەلیاتی چەکدارانە، ئێستاش پێمانوایە ئێستا کەئەو خەباتە سیاسیە لەئێران هەیە ئەو خەباتە مەدەنی و رێکخستن و راگەیاندنە چڕوپڕە لەئێران هەیە، پێمانوایە عەمەلیاتی چەکدارانە پەکی خەباتەکەدەخا، زیانی پێدەگەیەنێ.

لەجیاتی ئەوەی گەشەی پێبدا ناخر شکڵێکی خەبات تۆ بۆیە هەڵیدەبژێری لەخزمەت بزوتنەوەکەتدا بێ و خزمەت بکا، بەڵام ئەمە جیاوازی لەدوو شتدا هەیە یەکیان ئێمە سیاسەتی چەك داماڵێنی گەلی کوردمان پێ غەڵەتە، هەرگیزیش ناڵێین ئێمە بۆ هەمیشە ئەو خەباتەمان تەرککردوە، چونکە تا کاتێك لەئێران بەڕاستی پرۆسەی سیاسی و دیموکراتی دەست پێ نەکا، تاکاتێك زەبرو زەنگی حکومەتی سەرکوت گەر هەیە، ئێمە چەك لەخۆمان داماڵێن بۆچی ئەو کارەبکەین، ئەوە ئێمە نین دەبێ بەڵێن بدەین دەست بۆ چەك نابەین، نەك ئێمە وەکو حزب، کورد نەیویستوە دەست بۆ چەك بەرێ، بەڵام مافی بەرگری لەخۆ بۆ گەلی کورد هەیە ئێمە ئەو مافە دەناسین، چەکیش لەکورد داناماڵێن، چەکیش لەخۆمان داناماڵێن پێشمانوایە وایە راگرتنی ئەم هێزە چەکدارەو هەبوونی ئەم هێزە چەکدارە تەئسیری پۆزەتیڤی هەیە هەم لەسەر ورەی خەڵکی کوردستان، هەم تەئسیری پۆزەتیڤی هەیە لەسەر تەوازونی هێز لەنێوان خەڵکی کوردستان و دەسەڵاتی رژێمدا. ئەوە ئەبوایە رژێمی دیکتاتۆری لەئێران زۆر زیاتر عەزیەتی خەڵکی دەکرد من بەڕاستی پێموایە.



***بەفیعلی هێزی چەکدارتان هەیە؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** هەمانە بەڵێ.

# هێزی چەکدارمان هەیە ناتوانیین ئێران بروخێنین

***باشە ئەم هێزی چەکدارە ئێوەکەی بەکاری نەهێنن، بۆ نالێن دەستمان بەستراوە ناتوانین هێزی چەکدار بەکاربێنین؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** ناڵێم دەستمان بەستراوە، چۆن دەڵێم دوو هۆکاری هەیە یەکیان لێکدانەوەی ئێمە ئەوەیە کە عەمەلیاتی چەکدارانەی هێزی پێشمەرگەی ئێستا لەکوردستانی ئێران بەکەڵك نییە بۆ بزوتنەوە سیاسیەکە هەر بەدڵ عەقیدەمان وایە، زیانی پێدەگەیەنێ خۆ تۆ ناتوانی رژێمی کۆماری ئیسلامی پێ بڕوخێنی.

***بەڵام ئەتوانی لاوازی کەی؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** نەخێر، وادەکەی ئەو دەست بوەشێنێ لەخەڵکی، وادەکەی لەحاڵێکدا لەئێران بزوتنەوەیەکی سیاسیو کۆمەلایەتیو فەرهەنگیو مەدەنی لەئارادایە بیانوو دەدەیە دەست کۆماری ئیسلامی بۆ سەرکوتکردنێکی پانو بەرینو بۆ کوشتو بڕی خەڵکی لەکوردستان، کەوابێ کاتی ئەو عەمەلیاتە نییە.

بەڵێ مەسەلەی کوردستانی عیراقو پاراستنیشی گرنگە بۆ ئێمە، بەڵام کەدەڵێم کاتی عەمەلیات نییە، مانای ئەو نییە ئاشبەتاڵ بەهێزەکەت بکەیو بڕۆی کۆمەڵێك هۆکار راگرتنی ئەو هێزە گرنگە بۆ ئێستا بۆ ورەی خەڵك لازمە وەکو ئینزارێك بۆ جمهوری ئیسلامی وایە، ئەو مەترسیەیەی لەسەر بمێنێتەوە ئێمە نین دەبێ دەست لەکاری چەکداری هەڵگرین، ئەوە کۆماری ئیسلامیە دەبێ دەست لەسەر کوتی چەکداری هەڵگرێ، ئەگەر هەر رژێمێك لەئێران بەڕاستی جمهوری ئیسلامی دیارە کەنایکا، بەڵام ئەگەر لەئێران نیزامێك بێتە سەرکار کەبەڕاستی پرۆسەی دیموکراسی لەکوردستان قبوڵ بێ، ئاخر تۆش ئەو کاتە کاری چەکداریت ناوێ،(ANC) هەبوو لەئەفریقای باشوور ئەو سیاسەتەی گرتەبەر هەتا پرۆسەی سیاسی دەست پێنەکرا، هەتا رژێمی ئەفریقای باشووری ئامادەنەبوو بۆ گفتوگۆ، بۆ دانی دەسەلات لەڕێگای سندوقەکانی دەنگدانەوە، ئەمان هێزی چەکدارەکەیان راگرت، بەڵام عەمەلیاتیان پێنەکرد، من ئەوە بۆ ئێستا بەکەڵك دەزانم.



***باشە بۆ تابەعس نەڕوخێ ئێوە بەردەوام هێزی چەکدارتان لەسنورەکانە و لەململانێن لەگەڵ کۆماری ئیسلامیدا؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** سەردەم جیاوازی دەکرد.

## سەردەمی بەعس باشتر چالاکی پێشمەرگانە دەکرا

---

***سەردەمەکە ئەوە نییە کەعیراق ڕێگەی بەئێوە دابوو سنوورەکانی عیراق بەکاربێنن، بەڵام حکومەتی هەرێمی کوردستان ڕێگەتان پێنادا؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** نا، نا، ئەوە ڕاستە ناڵێم ئەوە ڕاست نییە، بەڵام تەنها هۆکارە نییە، چونکە تۆ تیمی پێشمەرگە ئەگەر بتەوێ بینێریەوە چوار کاری پێبکەی هەر دەتوانی بیکەی ئەمە هۆکاری سەرەکی نییە هۆکاری سەرەکی پێویستیش ناکات، ئەوان بەزۆر پێشت پێبگرن دەبێ تێگەیشتنێک بەرامبەر ئەزموونی کوردستانی عیراق هەبێ لەنێو ئێمەدا.

## ئەگەر کۆمەڵە (10000) پێشمەرگەی هەبوایە، کوردستانی ئێرانی رزگار دەکرد

---

***باشە ئەگەر هێزێکی (10) هەزار چەکداری پێشمەرگەتان هەبوایە ئاوا ئیلتیزامتان بەبڕیارەکانی حکومەتی هەرێمی کوردستانەوە ئەکرد، یان وەکو پارتی کرێکارانی کوردستان ئەتانوت "نەخێر ئێمە خەباتی چەکداری بەڕەوا ئەزانین تا بەدەستهێنانی مافەکانمان" وەکو چۆن پارتی کرێکارانی کوردستان کردویەتی، کەئێوە ئەوەشتان نەکردوە، ڕێکخراوێکی وەکو (DTP)شتان دروست نەکردوە لەناوخۆی ئێران لەشارەکانی تاران؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** ئاخر ڕێکخراوی (DTP) ئەوە نییە ئێمە دروستی کەین، یان ئەمە تاوانی ئێمە نییە، ساختاری سیاسی ئێران، تۆلێرانسی سیاسیی و تەحەمولی سیاسی ئێران بەنسبەت ئەم جۆرە ئەحزابەوە زۆر زۆر کەمترە لەتورکیە، تورکیە لەدیموکراسیەوە زۆر نزیکترە تا ئێران، ئێران ناتوانێ ڕەفسەنجانی قبوڵ بکا، تا نوێژێکی جومعەی بۆ بکات، بۆیە ئەو حکومەتە حکومەتێکی ئیسلامیە (25) ساڵە نوێژی جومعە ڕەفسەنجانی دەیکات ناهێڵن ئێستا پێش نوێژی بکات، ئەی



قبوڵی ئەوان ناکات، قبوڵی دەتەپەیەکی ئێرانی چۆن دەکات، نایکات، خەتای ئێمە نییەو خەتای هیچ کەسیش نییە، تەحەمولی ئێران ئەوەندە نییە.

ئەمە یەك، دووەمیش ئاخر کاکە من تەواوی قسەکەم لەگەڵ جەنابت ئەوە بوو خەباتی چەکداری موتلەق نییە، خەباتی چەکداری نیسبییە، دەگەڕێتەوە سەر بارودۆخ و سەر هەلومەرج دەڵێی ئەگەر (10) هەزار چەکدارتان هەبوایە چیتاندەکرد، دەڵێم ئەو (10) هەزارچەکدارە کوردستانی ئێرانی پێ رزگاردەکرا، نەدەکرا، ئەگەر بکرایە رانەدەوەستاین، چونکە بەرزگارکردنی کوردستانی ئێران لەئێستادا بنکەیەکی قەویمان بۆ وجود دێنا، بۆ ئەو بزوتنەوە مەدەنییەی ئێستا لەئێران دەکرێ، دەبوو بەپایگای سیاسی هەموو خەباتی سیاسی ئێرانیش، ئەوە جیاوازدەبوو ئەو شەرایتە، ئێستا تۆ جمهوری ئیسلامیت پێ ناڕوخێ، زەربەیەکی ئەوتۆت پێ لێنادرێ، بەس بیانوو دەدەیە دەست جمهوری ئیسلامی بۆ سەرکوت و کوشت و بڕی جوانان، ئەوە سیاسیەتێکی مەسئولانە نییە ئێستا نەئێستا (10) ساڵیشە سیاسەتی دروستکاری رێکخستن و کاری سیاسی و کاری راگەیاندنە، راگرتنی هێزی پێشمەرگەش، بەڵام چالاکی پێ نەکردنی بەنەزەری من بۆ ئێستا دروستە.

***کاری رێکخستنیشتان دروست نەبووە، لەسنوری ئۆپۆزسیۆنی کوردستانی ئێـران بوونتـە (10) پارچـە، ئـەم رێکخسـتنانە چـۆن ئـەتوانن چـالاك و فـەعال بـن، پـەیامێکی یـەکگرتو بگـەیێنن گوتـارێکی یەکگرتووتـان هەبێ؟**

عەبدوڵای موهتەدی: جا ئەوە شتێکی جیاوازە، خۆ ئێمە نەمانویست ئەوە دەبێ لەو کەسانە پرسی کەحزبەکانیان بەپارچە پارچە کرد بۆ وایانکرد، لەحاڵی گەشەکردنێکی یەکجار زۆری کۆمەڵەدا.

## من یەکێک نیم لەوانەی کۆمەڵەمان پارچە پارچەکرد

---

***تۆش یەکێکیانی؟**

عەبدوڵای موهتەدی: نەخێر، من یەکێکیان نیم.

***چۆن؟**

عەبدوڵای موهتەدی: من کەی کۆمەڵەم پارچە پارچەکردوە.

***ئەمە رای تۆیە، بەڵام ئیبراهیمی عەلیزادە ئەڵێ ئەوە موهتەدیە کۆمەڵەی پارچە پارچەکردوە، عومەر ئیلخانیزادەیە و بەهەمانشێوە تۆش رەنگە وابڵێی؟**

عەبدوڵلای موهتەدی: جا ئەوە بەڕاستی باسێکی جیاوازە، ناچێتە چوارچێوەی ئەو باسەی ئێستامان لەبارەی جێگەو پێگەی یان دەوری خەباتی چەکداری من بەتەما بووم بڵێم خەباتی چەکداری نابێ موتەڵەق تەماشاییکەی، نابێ پیرۆز تەماشاییکەی، نابێ بێزراویش تەماشاییکەی، دەبێ زۆر زۆر بەوردبینیەوە زۆر بەلێکدانەوەی بارودۆخەوە دەستی بۆ بەری، بزانی لەخزمەت گەشەکردنی بزوتنەوەکە دایە یان بەپێچەوانەوە، بزانێ خەڵك هەڵدەستێنێ یان بەپێچەوانەوە سەرکوتیدەکات ئەمانە دەبێ لەبەرچاو بگرێ.

## چاوەڕێی خەباتی خەڵکین

***باشە نەزمریاتی تۆ لەسەر خەباتی چەکداری بەم شکڵەیە، تەشکیلاتەکانتان و رێکخستنە نهێنیەکانتان لاوازن، دیموکراسی لەئێران نییە، نەتانتوانیوە رێکخراوی (NGO)ی چالاك و دەتە پەی کوردی لەکوردستانی ئێران دروستکەن، کەواتە چاوەڕێی موعجیزەیەکن لەئاسمانەوە بێ و رزگارتان کا؟**

عەبدوڵلای موهتەدی: نەخێر، چاوەڕێی خەباتی خەڵکین، ئەگەر خەباتی خەڵك نەبێ کەمەڵبەتە دەبێ وای دابنێین بەفەرزی مەحاڵ ئەگەر خەباتی خەڵك نەبێ، غەیری موعجیزە هیچ رێگایەکی دیکە نامێنێتەوە، بەڵام خەبات دەبێ، هەیە، نارەزایییەکی زۆر قوڵ لەئێران هەیە ئاگایی و وشیاری و وریایی خەڵك زۆر روو لەزیادبوونە، کوردستان فەقەت توانای نییە بەتەنیا هیچ بکات لەگەڵ حکومەتی ناوەندی، دەنا ئەگەر بێت و تاران بجوڵێتەوە کوردستان هەمیشە ئامادەیە بۆ خەباتکردن.

## گەر تاران بەتەواوی هەڵستێ، کوردستان راناوەستێ

***خۆ تاران جوڵایەوە لەناوەڕاستی (2009)دا؟**

عەبدوڵلای موهتەدی: یەك هەفتەی تر جوڵانەوەکەی تاران درێژەی هەبوایە، کوردستان هەڵدەستا، کوردستان دەترسێ لەسەر کوتیەکی یەکجار خوێناوی، دەڵێ رەنگبێ تارانیەکان ئەوەندە نەکوژن، رەنگبێ ئەوان ئەوەندە نەبڕن، رەنگە کۆنە قینێکیان کەمەیان بێ لەکوردستان سەدان کەسمان لێ ئیعدام بکرێ، رەنگبێ ئەو تەحەمولەی بۆ خۆپیشاندانەکانی تاران هەیان بێ، لێرە نەیان بێ، ئەو مەترسیە وایکردوە هەتا کورد دڵنیا نەبێ لەوە، تاران بەڕاستی جوڵاوە لێرە هەڵناستێ، من



تێیدەگەم، من ئەو سایکۆلۆژیە تێدەگەم بۆچی وایە، بەڵام دەزانم کورد، ئامادەیە، ئەوەشت پێ بڵێم هەموو شتێك دەبێ کاری بۆ بکرێ.

## هاواری دروستکردنی بەرەی کوردستانی دەکەین، نایکەن

*بۆ پشتیوانی لەو نارەزایەتیانەی تاران و هاتنە سەرجادەی خەڵکی کوردستانی ئێران ئێوە راگەیاندنتان داو پشتیوانیتانکردن، بە پێچەوانەوە حزبی کۆمۆنیست دژی بوون، یان پشتیوانی لەوە نەکرد، واتە ئێوە وەك حزبی دیموکراتی کوردستان بانگەشەی ئەوەیکرد پشتیوانی لەهەڵبژاردنی کەرووبی بکرێ، حزبی دیموکراتەکەی تر دژی بوو، مەسەلەکە ئەوەیە ئێوە هەڵوێستێکی روونتان نییە، کەچۆن ئەبێ حزبێك دژی بێ و حزبێکی تر لایەنگری بێ؟

عەبدوڵای موهتەدی: بەبڕوای منیش دیاردەیەکی خراپ و نێگەتیڤ بوو، نەدەبوایە ئەوە ببێ ئاخر هەر ئەوە بوو ئێمە هەشت نۆ ساڵە هاواری پێکهێنانی بەرەیەکی کوردستانی دەکەین کەخاوەنی سیاسەتی یەککگرتوو، خاوەنی عەمەلی یەککگرتوو ودیموکراتێکی بێ لەکوردستانی ئێران.

## ئێمە یەکەم کەس بووین داوای بەرەی کوردستانیمان کرد

*شکستان هێنا لەدروستکردنی بەرەی کوردستانی؟

عەبدوڵای موهتەدی: سەرنەکەتووین، بەڵام مانای ئەوە نییە سەرناکەوین.

*ئەگەر پێم بڵێی یەکەم کەس تۆ بووی کەلەکوردستانی ئێران بانگەشەی دروستکردنی بەرەی کوردستانیتکرد وەکو من لەنوسراوەکاندا بینیومە، پێموایە چەندین دانیشتنیشتانبوو لەگەڵ حزبی دیموکراتی کوردستان یەکێك لەخاڵەکان هەمان بۆ چوونەکانی عەبدوڵا ئۆجەلان بوو کەحزبی دیموکراتی کوردستان وەك حزبی قائید بناسن؟

عەبدوڵای موهتەدی: من وام لەبیرە، ئێمە یەکەم کەس بووین رەنگە هەندێ خەڵکی دیکە.

*وتویەتی لەژێر لێوەوە؟

عەبدوڵڵای موهتەدی: لەهەر حاڵدا پێمانوایە، ئێمە یەکەم کەس بووین، بەڵام بەڕاستی لەوە گرنگتر ئەوەیە کەئێمەبێ ماندووبوون هەوڵمان بۆ داوە، ئێمە بەڕاستی راستگۆبووین‌و هەین لەدروستکردنی بەرەی کوردستانیدا، ئەگەر هیچ دەستکەوتی تریشمان نەبێ یەك دەستکەوتمان هەیە، ئەویش ئەوەیە رای گشتی کوردستانی رۆژهەلات، جەماوەر، نوخبەی سیاسی هاتوونەسەر ئەم فکرە، بەڵام ئەو قەوارە سیاسیەی دەبێ پێکیبێنن ئێستا ئەو ئامادەگیەیان نییە، کەوایە ئێمە هەوڵەکەمان بێ هودە نەبووە، بێ دەستکەوت نەبووە قەناعەتێکی گەورە ئێستا لەکوردستانی ئێران هەیە، ئەی نالێی هەرکەس هەڵدەستێ لەخۆیەوە باسی بەرەی کوردستانی ئەکات‌و گلەیی لەحزبەکان دەکات بۆ نایکەن، ئێ خۆ ئەوان پێشتر نەیاندەوت ئێمە ئەو قسەیەمان خستەسەر زارو زمان، ئێمە هەوڵمان بۆدا.

# جیابوونەوەکانی کۆمەڵە هەڵەو زەرەرمەندبوون

*باشە پێتوانییە بەرەی کوردستانی لەکوردستانی ئێران فاشل ئەبێ بەو دەرئە نجامەی ئێوە نەتانتوانیوە دوو کۆمەڵە، دوو دیموکرات بەیەکەوە لەحزبێکدا هاوباشانە کاربکەن، لەبەرەیەکی کوردستانی کەرەنگە بەرنامەو مانیفێستەکەی زۆر گەورەتربێ بۆ خزمەتی کوردستانی ئێران چۆن ئەتوانن ئەو کارەبکەن؟

عەبدوڵڵای موهتەدی: هەروەك ئینتلاف‌و یەککرتن شتێکی ئاساییە لەدنیای سیاسەتدا، پێکهێنانی بەرە شتێکی ئاساییە، جاری وا هەیە لێکجیابوونەو لێکدابڕانیش، هەیە ئەمە بەشێکە لەژیانی سیاسەت، ئەمەش مانای ئەوە نییە من پاساوێك بێنمەوە بۆ لێکدابڕانەکان پێموایە هەڵەبوون، پێموایە زۆر زیانمەندبوون، جگەلەزیان هیچ سودێکی لێ نەکەوتوەتەوە ئەو جیابوونەوەیەی لەکۆمەڵەکرا لەهەر حاڵدا عیلاجت نییە.



## حزبی دیموکراتی کوردستانی و ئێران هێزی پێشمەرگەیان لەئێمە زۆرترە

*باسی خەباتی چەکداریمان کرد، ئەمەوێ بزانم بەهێزترین هێزی ئۆپۆزیسیۆنی کوردستانی ئێران لەبابەت خەباتی چەکداری و هێزی چەکدارییەوە ئێوەن، یان حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێرانی ستەفاهیجریە؟

عەبدوڵای موهتەدی: ئەوان هێزی پێشمەرگەیان لەئێمە زۆرترە.

## کۆمەڵە هێزێکی سەرەکییە لەکوردستانی ئێران

*ئەی لەڕووی سیاسی و تەشکیلاتەوە هەر ئەوانن، یان ئێوە هێزی یەکەمن؟

عەبدوڵای موهتەدی: هەڵسەنگاندنی ئاسان نییە، رەنگ بێ لەهەر کەس بپرسی خۆی بەگەورەتر بزانێ، بەڵام کەراستیەکەیت دەوێ هەڵسەنگاندنی ئاسان نییە، بەڵام گومان نییە لەوە کەکۆمەڵەی شۆڕشگێڕ حزبێکی سەرەکیە لەکوردستانی ئێران، ئەگەر ئەو ئاژاوەو جیاییەی بەسەر نەهاتایا (2) ساڵ لەمەوپێش ئێستا کارمان زۆر لەوە باشتر بوو.

## خۆ ئێمەش دەمانتوانی وەک ئەو حزبانە (10-15) پێشمەرگە بنێرینەوەو بەکوشتیان بدەین

*مەبەستی پرسیارەکانی پێشووم ئەوەبوو، رەئی تۆ بزانم لەسەر خەباتی چەکداری ئەو ومرقانەی لەبەردەست منە ئاشکرای ئەکات کەلەڕۆژانی (30) و (31) گەلاوێژی (1388) واتە بەرامبەر (20و21)ی ئۆگۆستی (2009) سێ عەمەلیاتی چەکدارانەی کۆمەڵەی زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێرانی عومەری ئیلخانیزادە، حزبی دیموکراتی کوردستان ئێران و حزبی دیموکراتی کوردستان رویانداوە (11) پێشمەرگە بوونەتە قوربانی و هەرسێ عەمەلیاتەکە فاشل بوون، ئەمان لەراگەیاندنەکانەوە وابلاویانکردەوە کەئەوان بۆ خەباتی تەشکیلایەتی و نهێنی چوون، دیارە بەقەناعەتی من قسەکە ئەوەیە لەبەرئەوە تێکشکاون ئەگینا لەئەسڵدا خەباتی چەکداری بووە، بەو

**دەلیلە وە میدیاکانیش باسی ئەوەیانکرد ئەو خەباتە لەئێستادا دروست نییە، سەبەبەکەی ئەوەی کەتۆ باستکرد، یان ئێوە پلان و تاکتیکی خەباتی چەکدارنەتان بۆ هێزبووە لەبەرامبەر کۆماری ئیسلامی ئێران، واتای چی، سێ عەمەلیات (11) پێشمەرگە لەچەند ناوچەی جیا، سەرکەوتوو نەبووە، پێشتریش چەند عەمەلیاتی لەو جۆرە کراوەو تووشی شکستبوون؟**

**عەبدوڵلای موهتەدی:** وەڵلا بەداخەوە، چەندینجار ناردنەوەی پێشمەرگە هەبووە لەم یەك دوو ساڵەدا، زۆریش شکستیهێناوە ئێمە تێیدا نەبووین لەهیچ کام لەوانەدا، رەئی ئێمە هەر ئەوە بوو کەباسمکرد لەو عەمەلیاتانەی ئەم دەورەی رابردووشدا ئێمە نەبووین، بەشی ئەوەندەمان پێشمەرگە هەبووە ناردنەوەی (10،15) پێشمەرگە هیچ نییە، هەموو کەس دەتوانێ ئەوە بکات، سەرچاوەکەی لەبیری سیاسی ئێمەوە بووە نەك لەنەتوانینمان وە دیارە هەروەکو رامانگەیاند سەرەخۆشی لەبنەماڵەی هەموو ئەو کەسانە ئەکەین کەگیانیان لەدەستداوە لەئەسڵدا کۆماری ئیسلامی بەخەتاباری هەموو ئەوانە دەزانین، بەڵام دوای ئەوانە ئەگەر وردتر لێی بکۆڵینەوە ئەو جۆرە سیاسەتە بەوەخت نازانین، بەڕاستی پێمانوانییە ئەرکی گونجاو بێ ئەو جۆرە کارانە پێشموانییە ناربێتیانەوە بۆئەوەی خەباتێکی تازە لەچەکداری دەستپێبکەن پێموایە تووشبوون.

***تووش بوونێك کەڕووبەڕووبوونەوەیەکی ناچاری بووە، یان ئەمەوێ بڵێیم لەلایەن کۆماری ئیسلامی ئێران لەڕێگەی جاسوس و سیخورییەوە پلانەکانی ئەو حزبانەی ئێوە ئاشکرا ئەکرێ؟**

**عەبدوڵلای موهتەدی:** ئاخر مەڵێ ئێمە، چونکە ئێمەی تێدانەبووین.

***مەبەستم ئۆپۆزیسیۆنی ئێرانە؟**

**عەبدوڵلای موهتەدی:** بەڕاستی نازانم، ئەوە دەبێ خۆیان جوابیبدەنەوە، بەڕاستی نازانم لەکوێوە ئەو زەربەیان خوارد نازانم.

# کەمینەی کۆمەڵە هەرچی گرووپێکی ناردۆتەوە شکستی خواردووە

---

***تۆ ئەگەر پێتوایە سەبەبی زەربەخواردنی ئەوانە چییە، پێتوایە لاوازی ئۆپۆزیسیۆنی ئێران پێشمەرگەی کۆمەڵە و دیموکراتە، یان بەشێکی رەنگە کێشەکە لەناوخۆی حزبەکەیابێ؟**

عەبدوڵڵای موهتەدی: بۆ لێکدانەوەیەکی وردی ئەوانەو بۆنەوەی مرۆڤ قەزاوەتێکی دروستبکات پێویستی بەوەیە زانیاری چاکی لەسەر هەرکام لەوانەبێ، ئەوانە سێ لایەنی جیاوازن، هەرکامەیان پێویستی بەلێکۆڵینەوەی جیاوازی خۆیان هەیە، بەڕاستی من زانیارییەکی تاوام نییە لەسەریان، ئەوەندە دەزانم کەمینە لەیەك ساڵونیوی رابردوو هەرچی تیمی ناردوەتەوە هەمووی زەربەی خواردووە.

## پێشمەرگەمان بەردەوام راهێنان دەکەن

*بارودۆخی هێزی پێشمەرگەی ئێوەو هێزی چەکداری ئێوە چۆنە؟

عەبدوڵڵای موهتەدی: ئێمە هێزی پێشمەرگەمان هەیە، فێرگەی پێشمەرگایەتیمان کاردەکات، لەبەرئەوە راهێنانو مەشق پێکردنو ئەوانەمان هەرهەیە هێزی پێشمەرگە وەکو باسمکرد رامانگرتووە، دوای ئەوەش بوون بەپێشمەرگە ئەغڵەب ساڵ جارێك دووجار دەورەی سەربازیان بۆ دەکەینەوە باشترکردنی ئامادەی سەربازی.

*چەند هەزار، یان چەند سەد هەزار پێشمەرگەتان هەیە؟

عەبدوڵڵای موهتەدی: من بازمارەیەك لەوە نەڵێم، بەڵام چەند سەدە نەك هەزار.

*ئەگرێ لەمێژووی ژیانی سیاسیو خەباتی تۆ ئازاترین پێشمەرگەی کۆمەڵەم پێ بڵێی؟

عەبدوڵڵای موهتەدی: وەڵڵا خەڵکی یەکجار زۆرمان هەبووە.

*یەك کەس زۆر پێی موعجیب بوویی بەڕاستی پێشمەرگەیەکی قارەمان بووبێ؟

عەبدوڵڵای موهتەدی: نازانم وەڵڵا، بەڵام پێشمەرگەی کورد بەڕاستی ئازایە پێشمەرگەی کۆمەڵە زۆر نمونەی بوون لەئازایەتی لەفیداکاری لەتەحەمولی سیاسی لەبرسێتیو سەرماو گەرما بەڕاستی نازانم کێ بڵێیم.



## شۆکێ زۆر ئازابوو

* شوان، شۆکێ؟

عەبدوڵڵای موهتەدی: بەڕاستی ئەوان زۆر ئینسانی تایبەت بوون بەتایبەتی شۆکێ کەفەرماندەی گوردانی ئێمەبوو لەسنە، ئەوە تەقریبەن وەك داستانی لێهاتووە وەکو حەماسەی لێهاتووە کارەکانی.

*شۆکی نموونەی پێشمەرگەی ئازادبوو؟

عەبدوڵڵای موهتەدی: سەوسەن خوشکی هونەرمەند مەرزیە.

*سەوسەن خێزانی شۆکی هەربەیەکەوە لەگوردانی شوان بوون؟

عەبدوڵڵای موهتەدی: ئەوەی من لەبیرم بێ بەڵێ.

*لەکارەساتی هەڵەبجە لە (1988) تیاچوون؟

عەبدوڵڵای موهتەدی: بەڵێ.

*ئەی ئازاترین ژنانی پێشمەرگە کێ بوون؟

عەبدوڵڵای موهتەدی: ئەوانەش هی زۆر ئازامان هەبووە، باوەڕم پێبکە کچە پێشمەرگە هەبووە فەرماندەی دەستەیەك پێشمەرگەبووە زیاتر لە (10) نارنجۆکی دەستیان بۆ خستوەتە خوارێ هێشتا هەرچووە بەرەو سەنگەرەکەی و گرتوویەتی.

## کچی پێشمەرگەی زۆر ئازامان بوو

*کێ بوو؟

عەبدوڵڵای موهتەدی: ەمین ناوێك بوو، بەڵام زۆری ئاوامان بوو پێشمەرگەی کچی ئازاشمان زۆربوو بەهەرحاڵ تۆ ناوی شۆکێت برد یەکێك لەهەرە ئازاکان بووە، زۆر پێشمەرگەمان بووە رەنگە لەباری نیزامیشەوە کارێکی چاك نەبێ، بەڵام تاماوەیەکی زۆر لەسەنگەری دوژمن چوونە پێشێ و تفەنگیان لەشان نەمێناوەتە خوارێ.

# کۆمەڵە (3000) پێشمەرگەی هەبوو

***کۆمەڵە لەسەردەمی خەباتی شۆڕشگێڕانەی لەکوردستانی ئێران خاوەنی چەند هەزار پێشمەرگە بوو؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** پێموایە دەتوانین (2500–3000) پێشمەرگە بڵێین.

# کۆمەڵە (3000) شەهیدی هەیە

***خاوەنی چەند شەهیدە؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** نزیکەی (3000) شەهیدمان هەیە.

***ژن و پیاو؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** بەڵێ بەژن و پیاو نزیك (3000) شەهیدمان هەیە، ئەمساڵ هەوڵێکی چاکدرا بۆ کۆکردنەوەی ئارشیوەکەیان لەرۆژمێری پێشمەرگەدا، بەڵام دیارە ئەوە هەموو نین، وردە وردە خەریکە تەکمیل دەبن.

***ئەوە شانازییەکی گەورەیە؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** ئەرێ وەڵڵا، خۆ دیارە، وەختی خۆی زیانێکی گەورە بووە کەلەکۆمەڵە کەوتوە، بەڵام شانازییەکی گەورە ئەو هەموو کەسە پاك و چاکە ئامادەبوون لەڕیزی ئەو حزبەدا خەبات بکەن و بۆ ئەو ئامانجانە ئامادەبوون گیانی خۆیان فیدابکەن ئەوانە بەشی هەرە زۆریان پێشمەرگەبوون، بەڵام زۆر کەسیش زیندانی سیاسی بوون لەژێر ئەشکەنجەدا دوایش ئیعدام کراون.



# کۆمەڵە یەکەم هێزی چوار پارچەی کوردستانە کەژنانی چەکدار کرد

***ئەکرێ بڵێم یەکەم هێزی کوردستانی هەر چوار پارچەی کوردستان، کۆمەڵەبوو ژنانی چەکدارکرد؟**

**عەبدوڵلای موهتەدی:** بەڵێ جەخت رەنگە دواتر بیبیستنەوە هەندێك هێزی تر وادەڵێن، بەڵام ئەوە راست نییە، چونکە ئێمە خەباتی چەکداریمان لە(1979) وە دەستپێکرد هەر لەو ساڵەوە تاك و تەرا وردە وردە پێشمەرگەی ژن، واتە تێکۆشەرانی ئێمە کەئاشکرا بوو بوون و هاتنەدەرەوە لەرێکخستنەوەکانی شارمانەوە ئەوانە چەکیانە هەڵگرت، بەڵام دواتر بەشێوەیەکی رێك و پێك و سیستەماتیك ئێمەهێزی پێشمەرگەی ژنانمان پێکهێناوە دوای ماوەیەکیش هێزی پێشمەرگەی ژن و پیاومان بەتەواوی تێکەڵکرد.

# لە لەشکری کوردستان ژنان چەکدار دەکرێنەوە

***لەداهاتووی کۆمەڵە و لەرزگاربوونی کوردستانی ئێران بەهەمانشێوە بەنیازن هێزی ژنــان چــەکدارکەن لەناو هێزی سوپایدا؟**

**عەبدوڵلای موهتەدی:** بەڵێ بێگومان، من پێموایە کورد دەبێ هەمووی ئەو کارەبکات وەکو میللەتانی پێشکەوتووی دنیا بتوانێ هێزی ژنان لەهەموو بوارێکدا جا یەك لەوانەبواری پێشمەرگایەتی کەدوای دەبێتە لەشکری کوردستان لەوانە کەڵك وەرگرێ، دیارە ئەوان هەندێك تایبەتمەندی خۆیان هەیە، دەبێ لەبەرچاوبگیرێن، بەڵام ئەوانە رێگرنین لەوەی بەگشتی چەکداربکرێن، ئێمە زۆر کەسمان بووە لەنێو ژنان بێجگەلەچەکدارییەکەی زۆر فەرهەنگی نوێمان لەو بارەیەوە هێناوە کەخۆشت ئاگاداری واتە ئەگەر (25–30) ساڵ لەوە پێش ژنێك هەستێ بۆ خەڵك قسەبکات ئەو هەمووە پیاو و لەمزگەوت و لەجێگەیکی ئاوا سەیر نییە ژنێك هەستێ لەمزگەوت قسەبکات؟ بەسەری روتەوەوە، بیشیان خاتە ژێرکاریگەرییەوە،گوێی بۆ راگرن، وردە وردەبکەونە ژێر تەئسیری من پێموایە ئەوە کارێکی زۆر گەورەیە.

# شەرمەزاری هەندێک لەبنەماڵەی شەهیدانین

*تاچەند هاوکاری خێزان و خانەوادەی شەهیدەکانتان ئەکەن؟

عەبدوڵای موهتەدی: وەڵڵا بەپێی توانا کردومانە، بەڵام یەکێك لەگەورەترین گرفتەکانی ئێمە ئەوەیە بەداخەوە توانای ماڵی ئێمە ئەوەندە نییە بەتایبەتی لەم ساڵانەی دوای شەرمەندەی زۆریانین نەمانتوانیوە بەو جۆرەی پێویستە یارمەتیان بدەین، واتە ئێمە ناتوانین یارمەتیەکی مونەزەم مانگ بەمانگی بنەماڵەی شەهیدانە بکەی کەحەقی خۆشیانە، بەڵام کەمەڵدەکەوێ هەندێکیان موحتاجن لێرەو لەوێ ئەو یارمەتیەمانکردوە.

*تۆ وەك سکرتێری کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشـانی کوردسـتان لـەداهاتووی سـەرکەوتنی شـۆڕش بەڵێن ئەدەی کەهاوکاری باشی خێزان و خانەوادەی شەهیدان بکەی؟

عەبدوڵای موهتەدی: یەکێك لەو شتانەی ئەگەر بۆم بکرێ نازانم دنیاکە چۆنی لێ دێ، ئەو وەختەو سەرقاڵیەکان چۆن دەبێ و مەسئولیەتی من چی دەبێ، بەڵام لەگەڵ ویژدانی خۆم قەولمداوە کەلەجنوبیترین بەشی کوردستانی ئێرانەوە تاشیمالیترین بەشی کوردستانی ئێران بگەرێم، بەهەموو جێ یەکداو بنەماڵەی شەهیدانی کۆمەڵە یەکە یەکە بەبێ فەرق و جیاوازی بەسەرکەمەوەو سەردانیان بکەم، هیوادارم ئەوەم بۆ بکرێ، بەڵام بێگومان هەموو هەوڵێکدەدەم بۆئەوەی بنەماڵەی شەهیدان کاریان بۆبکەین، پێموایە جێی خۆیەتی، بەڵێ من خۆم بەموتەعهید دەزانم بەرامبەر ئەوان، هەر ئەو وەختەنییە کەخەڵك بەقسەت دەکەن دەچن فیداکاری دەنوێنن و لەمەیدانی شەڕی پێشمەرگانە، یان زیندانەکانی کۆماری ئیسلامیدا هەوڵدەدەن، دیارە ئەوان بۆ بیروباوەڕەکانی خۆیان دەیکەن، بەڵام لەژێر سەرکردایەتی کەسانێکدا دەیکەن ئەو کەسانە من بم، یان هەرکەسێکی دیکە بەرپرسن بەرامبەر بەو خەڵکەو بنەماڵەکانیان.

*لەمبارەیەوە مێژوویەکی ناشرین هەیە بەرامبەر پێشمەرگەکان و شـەهیدەکان و زینـدانانی سیاسـیمان کەهیوادارم دووبـارە نەبێتەوە؟

عەبدوڵای موهتەدی: وەڵڵا ئەگەر وابێ زۆر حەیفە نابێ وابێ، من پێموایە تەقەدوسی پێشمەرگە تەقەدوسی شەهیدو گیان بەختکردن و رێگای رزگاری تەقەدوسی زیندانیانی سیاسی دێرین و رێزی ئەوان، پێموایە دەبێ بەدەر لەگێرەو کێشەی سیاسی و حزبی بگیرێ، ئێمە زۆر بەتایبەتی ئەم ساڵانە من هەرجارێ کەقسەمکردبێ وەجێی خۆی بووبێ جگەی لەوەی سڵاوم ناردوە بۆ بنەماڵەی



گیان بەختکردوانی کۆمەڵە، بۆ هەموو شەهیدانی کوردستان و هەموو حزبەکانی تریش سڵاوم ناردوە.

***بەڵام خەڵك بەتەنها سڵاوی ناوێ، خەڵك لەئێستادا سڵاوی پێویست بێ، لەداهاتوو پێویستی بەژیانێکی باشتر، بەخانویەکی جوانتر، بەئوتۆمبیلێکی باشتر، بەخوێندنێکی باشتر بەبێهدا شتێکی باشتر هەیە؟**

عەبدوڵلای موهتەدی: ئاخر بۆ ئەوە هەوڵدەدەین، ئەو شەهیدە ئازیزانە هەر لەورێگەیەدا گیانی خۆیان بەختکردوە، بەڵام روی دنیا رەش بێ کەئێستا دەست کورتین و ناتوانین ئەو خزمەتەی پێویستە بیکەین.

***بەڵام بەڵێن ئەدەی لەداهاتوودا کەبارودۆختان باشبوو بوونە یەکێك لەحاکمانی کوردستانی ئێران، هاوکاری خێزان و خانەوادەی شەهیدا، پێشمەرگە زیندانیانی سیاسی، خەڵکێك کەزەحمەتیکێشاوە شاخ لەگەڵتان بدەن؟**

عەبدوڵلای موهتەدی: هیوادارم ئەگەر ژیانم ئەوەندەبوو، کەبەشی ئەوە بکەم، باسی دەکەی بەڵێ لەم حاڵەدا خۆم بەبەرپرس دەزانم کەئەو کارەبکەم، بەئەرکی سەرشانی دەزانم.

***بەهیوام ئەو رۆژە ببینی وە ئەو بەڵێنانەی کەدات بیکەی؟**

عەبدوڵلای موهتەدی: هیوادارم ئەو رۆژانە ببینم هیوادارم روسوریش دەرچم لەو بەڵێنانە.

## ئێمە داوای بەرەی چەپمان کرد

***هەم لەبەشەکانی کۆنگرەدا جەختان لەسەرئەوە کردوەتەوە کەئێوە پەیوەندیەکانتان لەگەڵ ئۆپۆزیسیۆن و هێزە چەپ و رادیکاڵ و هێزە لیبراڵەکان و هێزەکانی دنیا پەیوەندییەکی باش بێ، ئەو پەیوەندیانەتان بۆ نمونە لەگەڵ هێزی ئۆپۆزیسیۆنی ئێران چۆنە؟**

عەبدوڵلای موهتەدی: لەگەڵ ئۆپۆزیسیۆنی ئێران ئێمە لەدوای جیابوونەوەمان لەحزبی کۆمۆنیستی ئێران، ئەتوانم بڵێم دوو قۆناغمان تێپەڕکردوە، یەکەمینیان ئەوەیە ئێمە کەلەحزبی کۆمۆنیستی ئێران هاتینە دەرێ، لەپرۆسەی هاتنەدەرەوەمان و پرۆسەی پێداچوونەوە سیاسیەکانمان بەو قەناعەتە گەیشتنین کەئێمە دەبێ کرانەوەیەکی سیاسی دەستپێبکەین، کرانەوەیەکی سیاسی



بەرامبەر هەموو هێزە دیموکراتو چەپو راستەقینەکانی ئێران، بەڵام لەیەکەم قۆناغدا ئێمە گرنگیدانی زۆرتر ئەهمیەتدانی زۆرترمان بەهێزە چەپەکان بوو، بۆیە یەکەم شیعارێکیش کەئێمە دووساڵ تا سێ ساڵ دەماندا بەرەیەکی چەپ لەئێران بوو، لەو بڕوایە دابووین کەبەرەیەکی فراوانی دیموکراسیخوازی لازمە، ئەو بڕیارنامەمان لەسەری هەبوو سیاسەتمان بۆ دارشتبوو ئەوانەمان هەبوو، بەڵام پێمانوابوو هەنگاوی یەکەم یەك خستنەوەی هێزە چەپەکانە، بۆیە لەسەر بەرەیەکی چەپ لەئێران زۆرمان هەوڵدەدا، دانیشتنی زۆرمان بۆ کرد، کاری زۆرمان بۆ کرد، خەڵکی زۆرمان بۆ دی، لێتناشارمەوە ئێمە دوای دوو سێ ساڵ بەو نەتیجەیە گەیشتین نابێ پەیوەندی خۆمان لەگەڵ ئۆپۆزیسیۆنی دیموکراتو لیبراڵو پێشکەوتنخوازی ئێرانی بەوە ببەستینەوە کەحەتمەن پێشێ بەرەیەکی چەپ پێکهاتبێ لەئێران، ئەگەر بەرەیەکی چەپی وا پێکهات چ باشتر، بەڵام بەڕاستی ئێمە سەرکەوتوو نەبووین، لەکوردەکان حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران، ئێمەو (پاك)ی تیایە، بەلوچیش‌و چەندین رێکخراوی عەرەبو هەروەها ئازربایجانیو ئەوانی تر کەوابێ ئەمە جۆرێك هاوکاریو هاوپەیمانییەکە لەگەڵ هێزەکانی تری ئێران دەیکەین.

دووەمیان" ئێمە جۆرێك نالێم جەبهە، بەڵام جۆرێك هاوکاری شەش حزبو لایەنمان هەیە کەئێمەو حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێرانو چوار لایەنی سیاسی تری ئێرانی هەن ئەم پێنجو شەشە پێکەوە جارجاری وا هەیە سێ لایەن ئەم پێنج لایەنوشەش لایەنەش جۆرێك هاوکاریو تەنسیقمان هەیە بۆ نموونە هەڵوێستی هاوبەش لەسەر رووداوەکانی ئێران، راگەیاندنی هاوبەشو هەوڵدان بەتایبەتی لەلایەن ئێمەو حزبی دیموکراتەوە بۆ ئەوەی فیدراڵیزم ببێتە جێگەی قبوڵی ئەوانیش کەوابێ ئەمەش دووهەمینیانە.

سێیەمیان" دەگەڕێتەوە سەر شەخسیاتی سیاسی ئێرانی ئۆپۆزیسیۆن کەلەدەرەوەی وڵاتن ئەوانە کەم نین، ئێران خەڵکی سیاسیو کەسایەتیە سیاسیەکانی کەم نییە، ئەم چەند ساڵە هەوڵمانداوە وە دۆستایەتیەکی باشمان لەناو ئەو شەخسیاتانە پەیاکردوە.

چوارەمینی" دەتوانم بڵێم روناکبیرانونوسەرانو سینەماکارانو ئەو توێژەن ناتوانم بڵێم بەتەواویو بەفراوانی بەو جۆرەی دڵمان دەخوازێ، بەڵام لەچاو جارانا ئێمە لەگەڵ ئەوانیشدا پەیوەندیمان هەیە، هەوڵمانداوە لەپاڵ شتە سەراسەرییەکانی ئێراندا قسەدەکەینو هاوهەڵوێست دەبینو رای یەکتری وەردەگرینو رادەگۆڕینەوە، بەڵام هەموو جارێ مەسەلەی کوردو مەسەلەی تێگەیشتنێکی زۆرتر لەنێو ئێرانیەکان بەرامبەر کێشەی کورد.



## پەیوەندیمان لەگەڵ حیکمەتیست نییە

*** پەیوەندی ئێوە لەگەڵ حزبی کۆمۆنیستی کرێکاری ئێران ( حیکمەتیست ) چۆنە؟**

**عەبدوڵلای موهتەدی:** پەیوندییەکمان نییە لەگەڵیان.

## عەلیزادە وەکو فیکر لەحیکمەتیست نزیکە

***ئیبراهیم عەلیلزادە ئەڵێ پەیوەندیەکانی ئێمە باشترە لەموهتەدی لەگەڵیان؟**

**عەبدوڵلای موهتەدی:** وەڵڵا دیارە ئەوان پەیوەندیان هەیە، جگەلەپەیوەندی جۆرێك نزیکی فکرییان هەیە لەگەڵیان، چوارچێوە لەیەك نزیکە، ئێمە نەپەیوەندی فکریمان هەیە لەگەڵیان نەنزیکی فکریمان هەیە، نەنزیکی پەیوەندی سیاسی و حزبی.

***ئەی لەگەڵ گروپی حەمیدی تقوای پەیوەندیتان چۆنە؟**

**عەبدوڵلای موهتەدی:** لەگەڵ ئەوانیش هیچ پەیوەندییەکمان نییە، لەگەڵ هیچ کام لەلق و پۆپەکانی کۆمۆنیزمی کارگەری هیچ پەیوەندییەکمان نییە.

***لەگەڵ چریکەکان لەگەڵ کامیان پەیوەندیتان هەیە؟**

**عەبدوڵلای موهتەدی:** ئەوەی خەتی فیداییان مەبستە، لەگەڵ دوانیان پەیوەندیمان هەیە یەکیان فیداییانی خەڵك -ئەکسەریتن و یەکیان ئیتیحادی فیداییانی خەڵك لەگەڵ ئەو دوانە ئێمە پەیوەندی نزیکایەتیمان هەیە.

## مەنسوری حیکمەت بێ توانا نەبوو، بەلام عەبوس بوو

***ماوەیەکی زۆر تۆ لەگەڵ مەنسوری حیکمەت کارتکردوە، ئەمەوێ لێت پرسم، مەنسوری حیکمەت پیاوێکی تیۆرسین بوو لەمەسەلەی چەپ و مارکسیزمدا ؟**

**عەبدوڵلای موهتەدی:** وەڵڵا پیاوێکی بە بەهرەبوو، ئینسانێکی زیرەك بوو، پیاوێکی بەبەهرەش بوو لەدارشتنی خەتی سیاسی و فیکریدا، بەڕاستی ئینسانێکی بێ توانا نەبوو.



***خۆشتدەویست مەنسوری حیکمەت؟**

عەبدوڵڵای موهتەدی: نێوانمان ناخۆش نەبوو، لەنێو کۆمەڵەدا من لەنزیکەکان نەبووم لەهەرە نزیکەکان نەبووم بۆ حیکمەت.

***لەگەڵ ئەو گروپەی کەلەگەڵ ئێوە کاریاندەکرد، هەموویان فارس بوون، لەگەڵ کامیان تۆ پەیوەندیت باشبوو؟**

عەبدوڵڵای موهتەدی: هاوڕێتی شەخسیم لەگەڵ ئیرەجی ئازەرینیش خۆشتربوو لەبارەی مەڵسوکەوتو ئەوانەوە لەگەڵ حەمیدی تەقوایی هاوڕێتم خۆشتربوو، مەنسوری حیکمەت هاوڕێتی خۆش نەبوو، ئینسانێکی عەبووس بوو، هاوڕێتی شەخسی خۆش نەبوو، بەڵام حەمیدی تەقوایی کەسێکی میوان گری، ئەهلی قسە خۆشو گاڵتەو نەقڵی هاوڕێتی خۆشتربوو، لەگەڵ ئەوان نێوانم خۆشتربوو لەو گروپە، یان لەگەڵ غوڵامی کەشاوەرز نێوانم ناخۆش نەبوو، بەهەرحاڵ لەگەڵ هەموویان خۆشبوو، بەڵام ئەو نێوان خۆشیە هیچ کات نەدەگەیشتە ئاستی ئەو هاوڕێتە نزیکەو خۆماڵییەی کەجەماعەتی کۆمەڵە، ئێمەمانان لەنێوان خۆماندا بوومان.

# پەیوەندیمان لەگەڵ دیموکرات – ئێران باشە

*** پەیوەندیتان لەگەڵ ئەحزابی کوردستانی ئێران لەکامەیان زۆر لە پێشترە لەکوردستان مەبەستم؟**

عەبدوڵڵای موهتەدی: وەڵڵا پەیوەندیمان لەگەڵ هەموویان خۆشە، لەگەڵ حزبی دیموکراتی کوردستان ئێران کەقسەو باسیشمان زۆر کردوە لەپێناو کاری هاوبەشو کار لەپێناو بەرەی کوردستانیو ئەوانە تاڕادەیەکیش چووینە پێشەوە، بەڵام سەرەنجام نەگەی بەجێی پێویستی خۆی، لەگەڵ ئەوان لەگەڵ حزبی دیموکراتی کوردستان عەینەن نێوانمان هەیەو نێوانمان خۆشە لەگەڵ گروپەکانی تریش هیچ موشکیلەیەکمان نییە لەگەڵ کەمینە نەبێ، لەگەڵ ئەوان پەیوەندیمان نییە (مەبەستی عومەری ئێلخانیزادەیە).

## یەک خەبات دەناسین

***لەگەڵ سازمانی خەباتەکان پەیوەندیتان چۆنە سازمانی خەباتی کوردستانی ئێران؟**

عەبدوڵڵای موهتەدی: لەگەڵ ئەوانیش لەگەڵ ئەوانیش هەریەك خەبات دەناسین ئەوەی کەمامۆستا شێخ جەلالی تێدایە، نێوانمان هەیە، نێوانمان ناخۆش نییە.

***خەباتێکی تریش هەیە ئاگاداری سازمانی خەباتی شۆڕشگێڕی کوردستانی ئێران؟**

عەبدوڵڵای موهتەدی: ئەزانم هەیە، بەڵام رەنگ بێ، یان زۆر کزو چکۆلەبن، یان پەیوەندیان کەم بێ، لەگەڵ ئێمە نەخێر پەیوەندیمان نییە.

## پاک شەڕیان بەئێمە فرۆشت

***لەگەڵ پاك ( پارتی ئازادی کوردستان ) پەیوەندیتان چۆنە؟**

عەبدوڵڵای موهتەدی: لەگەڵ پاکیش پەیوەندیمان ناخۆش نییە، نێوانمان هەیە هاتوچۆمان هەیە، ماوەیەك ئێستا تا سێ چوار ساڵ لەمەوپێش گرژییەك بوو خەتای ئێمەشی تێدانەبوو ئەوان لەهیچو خۆرایی شەڕێکی ئیعلامیان لەگەڵ ئێمەکرد، ئێمە وەڵامیشماننەدانەوە خۆش بەختانە چاکمانکرد، بەڵام دوای ئەو گرفتە چارەسەرکرا، ئێستا نێوانمان خۆشە.

## سازمانی خەبات پەیوەندی لەگەڵ مجاهیدین هەیە

***لەدیدارێکدا بابەشێخ حسێنی سکرتێری سازمانی خەبات، ئەڵێ "ئێمە زۆرمان پێناخۆشە کەهیچ پەیوەندییەك لەنێوان سازمانی مجاهیدینو ئەحزابی دیکەی کوردستانی ئێرانیدا نییە. ئەمە پشتیوانی ئەو قسەیە ئەکات کە پێیانوایە مجاهیدین بەردەوام پشتیوانی سازمانی خەباتدەکاتو جۆرێك پەیوەندی نادروست لەنێوانیاندا هەیە؟**

عەبدوڵڵای موهتەدی: سازمانی خەبات، پەیوەندی لەگەڵ مجاهیدینی خەڵق هەیەو ناشی شارێتەوە ئیتر رادەی هاوکاریو پشتگیری مجاهیدینی خەڵق چییە لەگەڵ سازمانی خەبات نازانم، بەڵام پەیوەندییەکە هەیەو بۆ خۆیان نەیانشاردوەتەوە، بەڵام ئێمە بەینمان لەگەڵ مجاهیدینی خەڵق نییەو پێموانییە ئەوانی تریش بیان بێ، یان ئیشیان بێ پێموانییە.



# مجاهیدینمان قبوڵ نییە

***باشە بۆچی ئێوە پەیوەندی دروست ناکەن لەگەڵ مجاهیدینی کەخەڵق هێزێکی ئەساسی و کاریگەری ئێرانە؟**

عەبدوڵای موهتەدی: نەخێر هێزێکی ئەساسی و کاریگەری ئێران نییە، لەداهاتووی ئێرانیشدا بەعەقیدەی من هیچ دەورو نەخشێکیان نابێ، ئەوە قسەی ئێستام نییە، ئێمە زۆر دەمێکە ئاوا بیردەکەینەوە، مجاهیدین سەردەمێك کەلەئێران بوو پێگەیەکی جەماوەری بوو تاڕادەیەك خەڵکی لەگەڵ بوو، زۆر لەمێژساڵە وانەماوەو ناشگەڕێتەوە، بۆ دوو سێ ساڵ پێگەیان بوو خەڵکیان بوو. بێجگە لەوە نەبەئایدۆلۆژی نەبەشێوازی کارکردنیان ئەوانمان قبوڵ نییە، هەڵەی گەورەیان هەیە، خراپەی گەورەیانکردوە پەیوەندییەکمان لەگەڵیان نییە.

# راە کارگەر واقیعی نین

***لەگەڵ سازمانی کرێکارانی شۆڕشگێری ئێران (رای کارگەر) پەیوەندیتان چۆنە، ئەمە حەرەکەتێکی واقیعیە لەئێران؟**

عەبدوڵای موهتەدی: نەخێر، حەرەکەتێکی واقیعی نییە، ئێمە دوای رۆیشتنی کۆمۆنیزمی کاریگەری دەستمانکرد بەوەی نێوانمان خۆشکەین لەگەڵ ئەوان، لەگەڵ رای کارگەر ئەوانیش پێش قەدەم بوون و نێوانمان هەبووەو نێوانیشمان خۆشبووە، بەڵام رای کارگەر لەساڵانی رابردوودا کەوتەسەر هێڵێکی زۆر دۆگم، بەپێچەوانەی رابردووی خۆشیان کەوتوونەتەسەر هێڵێکی زۆر زۆر دۆگم، هیچ کارێکی هاوبەشیان قبوڵ نیی، هاوکاری هیچ هێزێکیان قبوڵ نییە بۆیە خەتای ئێمە نییە، بەڵام ئەوان پەیوەندییان لەگەڵ ئێمە پچڕاوە لەگەڵ هەموو کەس پچڕاندوویانەو بەتاق کەوتوون، پێشم ناخۆشە ئینسانی چاك و خاوەن فکرو تێکۆشەری تێدابوو.

# حیکمەتیست و دارابی نابن بەهیچ

*بەشێکی زۆر لەو کادیرە چاکانەی لەگەڵ ئێوە بوون و کۆمەڵەبوون، خەڵکی چاکبوون، زووکەوتنە گەڵ حزبی کۆمۆنیستی کارگەری ئێران و حیکمەتیست، تاڕادیەك یەکێك لەوانە عەبدوڵای دارابی لەدیدارێکدا ئەڵێ ئەگەر کەسێك لەبەرامبەرمان راوەستێ کەدیارە مەبەستی ئێوەیە، یان هێزەکانی تری، چالاکی سەرگۆڕەپانی کوردستانی ئێرانە، یان مەبەستی دیموکراتە دەڵێ ئێمە لێی دەدەین؟

عەبدوڵای موهتەدی: وەڵا وەختی خۆی کەکۆمۆنیزمی کارگەری سەریهەڵدا، ئەوە راستە بەشێکی بەرچاو لەکادیرەکانی کۆمەڵەی بردوو، کادیری زۆر باشیان تێدابوو، بەڵام کۆمۆنیزمی کارگەری لەم ساڵانەی دوای هەر بەر لەمەرگی مەنسوری حیمکەتیشەوە رەوتێکی کزو روو لە دابڕان دەستپێکرد لەئێراندا بەتایبەتی دوای مەرگی ئەو زۆر پارچە پارچە بوون لەئێرانیش نفوزێکی ئەو تۆیان نییە بەتایبەتی لەکوردستان پێموانییە قەت ببن بەشت.

# کۆمۆنیستی عیراق نابن بەهیچ

* پەیوەندیتان لەگەڵ حزبی کۆمۆنیستی کرێکاری عیراق چۆنە؟

عەبدوڵای موهتەدی: نیمانە.

* پاش ئەوەی حزبی کۆمۆنیستی عیراق تووشی کۆمەڵێك تێکشکانی گەورەبوون لەرووی جەماوەرییەوە، لەکوردستان هاتن حزبی کرێکاری کۆمۆنیستی کوردستانیان دروستکرد، بەڵام ئەوەش نەیتوانی ئەڵتەرناتیڤ بێ، پێتوانییە ئەو دروست نەبوونی ئەڵتەرناتیڤە، لەدەستدانی جەماوەر هۆکارەکەی واقیعی سیاسی هەرێمی کوردستان بوویان هەڵەکانی مەنسوری حیکمەت؟

عەبدوڵای موهتەدی: لەرووی حزبی کۆمۆنیستی کرێکاری عیراقەوە بزانە جا کۆمۆنیستی کرێکاری لەکوردستانی ئێرانیش چەند بەهێزە، ئەمان لێرە ئازادی هەڵسوڕانی سیاسیشیان هەیە، ئۆباریشیان هەیە کەسیش هیچیان لێناکات، کەچی نەبوون بەهیچ، تەبعەن لەئێرانیش هەروادەبن، لەبەرئەوە من پێموایە ئەو پرۆژەیە، ئەو سیاسەتە، ئەو بیروباوەڕە، ئەو رێبازە هیچ شانسێکی لەکوردستان نییە، پێموانییە لەهیچ کوێی گوی زەوی شانسێکی هەبێ.



***ئـەلێن ئەگـەر یـەکێتی نیشـتمانی کوردسـتان لەکوردسـتانی ئێـی نەدانایـە و دەری نەکردینایـە هێرشـی نەکردایە سەریان بارودۆخەیان لەئێستادا باشتر نەبوو، پێتوایە؟**

عەبدوڵلای موهتەدی: ئەی بۆ ئەو وەختە کاك عەبەی دارەبیان نەهێنا، ئاخر ناڵێ هەر کەس ڕێگرم بێ لێی ئەدەم، بۆ ئەو وەختە نەیان هێنا لەیەکێتیو حکومەتی هەرێم بون لێیان نەدا وەڵلا چۆزانم.

## موفتیزاده و مەکتەبی قورئان لە جمهوری ئیسلامی نزیک بوون

***لەکوردسـتانی ئێـران، لەسـەردەمی خـەباتی ئێوەشـدا کەبەشـێك لەکوردسـتانی ئێـران بەدەسـت ئێـوەوە بـوو، شتێك هەبوو بەناوی (مەکتەبی قورئان) ئەحمەدی موفتیزادە رابەرایەتی مەکتەبی قورئانی ئەکرد؟ ئەمانـە گروپێکـی سیاسـی بـوون، یـان گروپێکـی ئایـدۆلۆژی ئیسـلامی بـوو، مەبەسـت لەدروسـتبوونیان چـیبوو، ئـەم گروپـە چـەندجار لەمیدیاکانـدا بیسـتومەو کەهـەتا ئێسـتاش کۆمـاری ئیسـلامی لێیـان ئـەگرێ بەدوایانەوەیـە، واتـە ئەمانـە ئـەکرێ بڵێـی ئیسـلامی سیاسـێ لەکوردسـتانی ئێـران وەکـو گروپـی سیاسـی مەبەست لەدروستبوون و کارکردنیان چییە و ئاما نجیان چییە؟**

عەبدوڵلای موهتەدی: ئەمانە دروستبوونیان دەگەڕێتەوە بۆ پێش شۆڕشی ئێران ئەو کاتە هێشتا ڕژێمی پاشایەتی ئێران نەڕووخابوو، فکرەکەیان و ڕێبەری فکری و مەعنەویان ئەحمەدی موفتیزادە بوو، ئەو لەسەر ئەساسی ئەو فکرە کەگەڕانە لەئیسلامدا دەبێ گەڕانەوە بۆ قورئان بێ، مەلاکانی بەخائین دەزانی، بەدین فرۆش دەزانی تەبلیغاتێکی گەورەی لەدژی مەلاکان بوو کەپێی وابوو ئیسلامی ڕاستەقینەیان بەخەڵك نەناساندووە، پێیوابوو توێژێك بەناوی مەلاو ڕوحانیەت نەك هەر شتێکی نا پێویستە، لەوانەیە زەرەریشی بۆ دین هەبێ، چونکە دین لەڕوانگەی تەفسیری ئەوانەوە بەخەڵك دەناسرێ لەهەر حاڵدا دین خۆی قورئانەو پێویستە قورئانەکە بخوێندرێ هەر بۆیەش لەسەر ئەساسی ئەو فکرەی خۆی شتی دانا، بەناوی مەکتەبی قورئان، ئەو مەکتەبی قورئانانە کەسەرەتا لەسنە دامەزرا دوای وردە وردە مەریوان و سەقزو بۆکان و ئەوانەشی گرتەوە.

ئیتر لەسەروبەندی شۆڕشی ئێران کەماوەیەك دوای ئەو لەحاڵی گەشەکردندا بوو، بەڵام دیارە لێکدانەوەیەکی ورد لەسەر ئەوان بۆ خۆی کارێکی تایبەتی دەوێ، بەڵام من ئەوەندە دەڵێم کەئەم مەکتەبی قورئانانەو شەخسیەتی موفتیزادە لەئەوەڵەوە هاوکاری لەگەڵ نیزامی جمهوری ئیسلامی دەکرد، بەتایبەتی لەگەڵ مهندس مەهدی بازرگان کەیەکەم سەرۆك وەزیری ئێران بوو، خومەینی داینا بوو، ئەحمەدی موفتیزادە لەخەتی ئەو نزیك و وەپێشی وابو چۆن خومەینی ڕەهبەری ئاینی



شیعەیە، پێوابوو وەخۆشی رەهبەری ئاینی سوننییە، پێی وابوو ئەوانیش وای قبوڵدەکەن، ئەو قەیناکە بائیتلافێك بێ لەنێواندا خومەینی رەهبەری شیعەکان بێ و ئەویش رەهبەری سوننەکان بێ، دیارە خومەینی و ئەو داروودەستە هەم لەوە پاوان خوازتر بوون، هەم لەوە بەدەسەڵات تر بوون کاری وابکەن، بۆیە بەتەنیا ئەوەیان نەکرد بۆماوەیەکی کورت نەبێ بەکەڵکی خۆیان دەهات گرتیشیان و زیندانیانکرد ئەزییەتیانکرد، لەراستیدا بەنیوە گیانی ئازادیانکرد، ئەحمەدی موفتیزادە کەلەدەرەوە گیانی لەدەستدا مەکتەبی قورئانەکانیش ئێستا هەن لایەنگرانی ئەحمەدی موفتیزادە لەکوردستان هەن، دیارە ئەوانیش خەتی جیاوازیان هەیە، لەنێوانیاندا دوخەتی سەرەکی هەیە، بەڵام بەهەرحاڵ دەڵێم لێکدانەوەی ئەوان و لێکۆڵینەوەکردن لەسەر ئەوان مەجالێکی تایبەتی دەوێ لەوەڵامی پرسیارەکەی جەنابتدا بەڵێ مەکتەبی قورئان ئەوەبوون.

# خومەینی بڕوای بەسوننە نەبوو

***لەکوردستان ئێران ئێوە مەترسیتان هەیە، هیچ گروپێکی ئیسلامی دروست بێ و کاریگەری لەسەر خەباتی ئێوە هەبێ، کەزۆربەی ئۆپۆزیسیۆنی کوردستانی ئێران، یان زۆربەی حزبە شۆڕشگێڕەکانی کوردستانی ئێران حزبی قەومی، یان چەپ و مارکسین، مەترسیتان هەیە گروپێکی سیاسی حزبی ئیسلامی دروست بێ و جێگا بەئێوە لێژکا، یان بتوانێ جەماوەرێکی زۆر بۆ خۆی رابکێشێ؟**

عەبدوڵڵای موهتەدی: ئەوەی جێگا بەئێمە لێژکا، پێموانییە نەبەئێمە نەبەهیچ کام حزبە سیاسییەکانی کوردستان، بەڵام بەڵێ گروپی سیاسی ئیسلامی توند رەو وردە وردە لەکوردستانی ئێران خەریکە پێکدێ و پشتیوانی ئەسڵیشیان رژێمی جمهوری ئیسلامیە. دیارە جمهوری ئیسلامی سوننی قبوڵ نیە، تەنانەت خومەینی لەکتێبی دابەش و مەسائیلەکەی خۆیدا دەڵێ کەنوێژ لەپشت سونیەوە دروست نییە، هەر نوێژێك لەپشت سوننیەوە بیکەی دورست نییە، لەبیرتان نەچێ دەیخەمەوە بیرتان کەئەو ئیمام جومعەی شارە کوردنیشینەکان و سوننەنیشینەکان هەمووی کەخومەینی هاتە سەرکارو جمهوری ئیسلامی هاتە سەرکاریەك دانەشیان خومەینی داینەناوە، دەیوت من چۆن ئیمام جومعەی سوننی دانێم خۆ نوێژ لەپشت سەری سوننیەوە دروست نییە.

مونتەزری داینا‌وەن لەبەرئەوە ئیمام جومعەی شارە سوننیەکان ئەو دایدەنا، شیعەکان مونتەزری دایناون، چونکە پێیوابوو بەپێچەوانەی ئاینەکەیەتی تائەو رادەیە پێی موتەعەسیب بوو، بەڵام بەو حاڵەش ئێستاش وایە جمهوری ئیسلامی ئاژاوە بۆ دژایەتیکردن لەگەڵ خواستی نەتەوەی و ئازادیخوازانە بەتایبەتی بۆ دژایەتیکردنی حزبە رەسەنەکان جمهوری ئیسلامی چاوپۆشیان

لێدەکاتو یارمەتیشیان دەکات لەبنەوە لەکوردستان خەریکن، بەڵامنەوە ئیتر داهاتوو دەزانێ ئەوان چەندە هێزو توانا بەدەست دێنن، من پێموایە بارودۆخی سیاسی کوردستان جۆرێك نییە، کەئەوان دەستی باڵا پەیدابکەن، بەڵام وەکو هەموو وڵاتانی دیکە دەتوانن لەتێکدانی بارودۆخەکەو ئاژاوەگێڕیداو سەرئێشە دروستکردندا دەوریان هەبێ.

# یەکگرتووی ئیسلامی هاتووچۆی کوردستانی ئێران زۆر دەکەن

*ئەوە تاچەند راستەکە یەکگرتووی ئیسلامی لەکوردستانی عیراقەوە نەیەوێ ئەم شێوازی حزبی بوونەی خۆی بپەڕێنێتەوە بۆ کوردستانی ئێران و لەوێ رێکخراوێکی بەو شکڵەی خۆی دروستکات؟

عەبدوڵای موهتەدی: یەکگرتوو زۆر سەفەریان هەیە بۆ کوردستانی ئێران، زۆر محازەرەو سیمیناریان هەیە لەوێ، بێگومان هەوڵێك هەیە بۆ ئەو کارە بەڕاستی ئایا دەیانەوێ رێکخراوێك دروستبکەن، یان تەنیا شتەکەیان ئاینیە بۆ من ئاسان نییە ئێستا قەزاوەت لەسەر کردنی، بەڵام هەموو کەس دەڵێ و خۆشیان نایشارنەوە کەپەیوەندیان زۆرە لەگەڵ کوردی ئێران.

* پێتوانییە بەهەر حاڵێك حەرەکەیەکی ئیسلامی دروست بێ لەکوردستانی ئێران دروست زەرەرئەدا لەکۆمەڵگەی کوردستانی ئێران و لەو رەوتە شۆڕشگێڕو خەبات و قوربانیدانەی کەهەیەتی؟

عەبدوڵای موهتەدی: بەڵێ بەتەئکید، پێموایە ئەوانەی پشتگیری دەکەن بۆ ئەو مەبەستە پشتگیری دەکەن خۆ لەبەر خواو پێغەمبەر نییە، پێموایە جمهوری ئیسلامی رێك هەر لەبەر ئەوە دەیکات هەر کەسی تریش لەدەرەوەی کوردستان بیکات هەر ئەو مەبەستەی هەیە ئەگینا هیچ کەس لەگەڵ ئاینی گرفتی نییە گرفت لەگەڵ ئەوەیە کەبکرێ بەئیدۆلۆژییەکی سیاسی، ببێتە بەرهەڵستکارێك لەبەرامبەر بزوتنەوەی نەتەوەیی لەبەرامبەر دیموکراسیخوازسی لەبەرامبەر گەشەکردنی کۆمەڵایەتی.

*ئێوە ئەو رێو شوێنانەی گرتوتانەتە بەر بۆ دژایەتیکردنی ئەو گەشەکردنی رەوتە ئیسلامیانە لەکوردستانی ئێران چییە، هەوڵتانداوە، یان بەرنامەی ئێوە چییە؟

عەبدوڵای موهتەدی: ئێمە لەم دەورەی رابردوودا بەرنامەیەکی تایبەتیمان بۆ ئەو مەبەستە نەبوو، بەڵام پێموایە هەموو ئەوانەی بیر لەکێشەی کورد دەکەنەوەو پەرۆشی ئەوەن پەرۆشی دیموکراسین،

پەرۆشی پێشکەوتنی کۆمەڵایەتین، پەرۆشی مافی یەکسانن بۆ ژنان، هەموو ئەوانە بەبڕوای من جێی خۆیەتی بیرێکی جدی لەوە بکەنەوە نەك لەرێگای توندوتیژی، بەڵکو لەرێگای ئاگای بەخشین و شیاری بەخشینی فکریو سیاسیەوە ئەو راستیانە بۆ خەڵکی رۆشنبکەنەوە.

# کۆنگری دوانزەی کۆمەڵە

# (2007)

# زرگوێزەڵە

## جیابوونەوەی کۆمەڵەی زەحمەتکێشانی عومەری ئیلخانیزادە



# کەمینە هیچ روانگەیەکی سیاسیان نەبوو

***ئێستا دێینەسەر کۆنگرەی (12) دوایین کۆنگرەیەوە دوایین ئەم بەحسەی باسەکەی ئێمەیە کە رۆژانی (26)ی گەلاوێژی (1386) بەرامبەر (17) ئوتی (2007) کۆنگرەی (12)ی ئێوە دەستپێدەکات، پێموایە ئەم کۆنگرەیە یەکێکە لەو کۆنگرانەی کێشەو موشکیلەیەکی زۆر تیایە، کەئەو کاتە (رەوتی چاکسازی و گەشە) ئەیانەوێ کۆنگرە جێبێلن و ئەو کۆنگرەیەی ئێوە بەکۆنگرەیەکی واقیعی ناناسن، تا ئەو کاتە عومەری ئێلخانیزادە ئەڵێ "کۆنگرەی (12) تەپڵی جیابوونەوەی لێداوە". ئەو کۆنگرەیە چۆن چۆنی بوو، ئەو کێشەو گرفتانە چۆن سەریانهەڵدا، ئایا ئێوە بۆیە ئەو کۆنگرەیەتانکرد بۆ جیابوونەوەبوو، بۆ دەرکردنی ئەو هاورێیانەتانبوو، یان ئەتانویست لەرێگای ئەو کۆنگرەیەوە کێشەو موشکیلەکان چارەسەرکەن و ئەوان نەهاتنەناوەوە؟**

**عەبدوڵای موهتەدی:** ئەو کۆنگرەیە، خۆی هیچ موشکیلەیەکی نەبوو، وەکو کۆنگرە کێشەکە هەبوو، پێش کۆنگرەبوو لەبەرئەوە ئەو کۆنگرەیە کۆنگرەیەکی تەباو یەکگرتووانە پڕ لەباسی سیاسی و پڕ ناوەڕۆک و ئەوانەبوو، کێشەکە لەو کۆنگرەیە نەبوو، کێشەکە پێش کۆنگرە بوو، هەروەکو بۆم باسکردی بەعزێك لەبرادەران کەکەمینەیەکیان پێکەهێنا وەتا ئەو وەختەش هیچ پلاتفۆرمێکیان نەبوو، روانگەیەکی سیاسیان نەبوو، تەنانەت قسەیەکی حزبی و روانگەییان نەبوو، بەڵام هەست بەوە دەکرا جۆرێك گلەییان هەیە، جۆرێك جەبهەگرییەکیان هەیە، جۆرێك ناتەبیەکیان هەیە، چەند کەسێکی ئەوان لەکۆمیتەی ناوەندی دابوون، ئەوانە لەکۆنگرەی (11) وەکو جۆرێك لەتۆران و جۆرێك مەترسیان دەکرد لەوەی کەهەڵنەبژێرێن، وتیان بەشداری ناکەین لەهەڵبژاردن، واتە خۆمان کاندید ناکەین لەهەڵبژاردنی کۆمیتەی ناوەندی بۆ کۆنگرەی (11).

ئێمە بۆ ئەوەی ئەگەر چی حەقی یاسایی کۆنگرەبوو کەوەکو هەموو دنیا ئەکسەرییەت نوێنەر هەڵبژێرێ و کۆمیتەی ناوەندی هەڵبژێرێ، بەڵام لەو حەقەی خۆی سەرفی نەزەریکرد و وتی قەیناکە ئەمجارە ئێمە لەماوەی ساڵێکی دیکەدا کۆنگرە دەبەستین، ئەو کۆنگرەیە باگێرەو کێشەکان نەمێنێ، خیلافان نەمێنێ و دوای کۆنگرەی (11) ئەو کەسانەی کەمینەیەك بوون جۆرە فراکسیۆنێکیان لەناو کۆمەڵەدا پێکهێنا، بەناوی کەمینەی ناو کۆمیتەی ناوەندی کۆمەڵە، کەعومەریش یەکێك لەو کەسانە بوو، دیارە ئێمە هەر ئەو وەختە پێمان باش نەبوو ئەو کارە زۆرمان قسە لەگەڵ کردن، وتمان، عاقیبەتی نییە غەیری جیابوونەوە، وتمان چۆن ئێوە لەپێشدا فراکسیۆنە کەپێکدێنن، بەڵام هێشتا بەرنامەیەکتان نییە؟ چۆن ئێوە بەرنامە سیاسیەکەتان راناگەێنن، بەڵام

دەیکەن بەفراکسیۆنیش، چۆن ئێوە خەتی سیاسی جیاوازی خۆتان دەرنابڕن، بەڵام لەپێشدا قاڵب‌وشکڵێکی ڕێکخراوی پێدەدەن‌و بەڕاستی هۆشداریمان پێدان، وتمان کاکە ئەمە ڕێگەیەکە غەیری جیایی ئینشیعاب ناپێون ئێوە، ئەو وەختە زۆر سوێندو قورئانیان خوارد، شتێکی ئاوا لەئارادانییەو بۆ ئەو نییە، بەڵام هەروەك دیمان بۆنەوە بوو، ئینجا کەئەو کەمینەیە پێکهات، سەرئەنجام ڕێکەوتنێك پەیدابوو، ڕێککەوتنەکە من دەقەکەیم هەیە ئەگەر حەزبکەی ئەدەمێ، وەکو یەکێك لەبەڵگەکان لەو ڕێککەوتنەدا نازانم (5) مادەیە (6) مادەیە ئێستا لەبەرچاوم نییە، مادەی ئەوەڵی ئەوەیە کەمینەی کۆمیتەی ناوەندی هەڵدەوەشێتەوە، هیچ گروپ‌و ڕێکخراو فراکسیۆنی دیکە لەناو کۆمەڵەدا پێکناتەوە، ئەمەش شەخسی عومەری ئێلخانیزادە ئیمزایکردوە، کەوابێ بڕیاری هەڵوەشاندنەوەکەمان لەسەرئەوەبوو، یەکەم هەڵوەشاندنەوەی فراکسیۆن‌و هیچ فراکسیۆنێکی تریش دروست نەکەن، ئەمە عومەر ئیمزایکردوە، خەڵکانی کەمینە تادانەی ئاخری دەنگیان پێداوە، من خۆم لەکۆبووەکە بووم.

دووەم ئەوەیە کۆنگرە بگرین، لەهەڵبژاردنی نوێنەرانی کۆنگرەدا بەشداریبکەن، بۆیە ئێمە بۆ بەستنی کۆنگرەکان هەموو کۆنگرەیەك پێڕەوێکی هەیە بۆ هەڵبژاردنی نوێنەران بۆ کۆنگرە، واتە نیزامێکی ئینتیخاباتی هەیە بۆ هەڵبژاردنی نوێنەران بۆ کۆنگرە، ئێمە لەسەر ئەو نیزامە ئینتیخاباتیەش ساغبووینەوە، واتە لەسەر کاتی کۆنگرە تەنانەت ڕۆژی کۆنگرە، بەکۆی دەنگ ساغبووینەوە، تەنانەت لەسەرئەوەی کام هەفتە کۆنگرە ببەستی، دوو ڕای جیاواز هەبوو، من وتم بایەك دەنگ بێن لەسەریکردومانە بەیەك، بەشەخسی عومەریشەوە لەسەر هەفتەو ڕۆژی کۆنگرەش هەموو دەنگمان بۆداوەو دەستمان بەرزکردوەتەوە، دوایی لەسەر نیزامی ئینتیخابات‌و پێڕەو بۆ هەڵبژاردنی نوێنەرانی کۆنگرە هێناومانە بەکوێ دەنگ دەنگمان پێداوە، کەوابێ هەموو شتێکی کۆنگرە لەبەرچاوی ئەوان‌و بەموافەقەتی ئەوانیشەوە بووە، ئەو ڕۆژەی کەکاتژمێر (8.30) بڕیاروابوو نوێنەرانی کۆنگرە لێرەش‌و لەدەرەوەی وڵاتیش هەڵبژێرێن شەوی پێش ئەوە کاتژمێر (12.30) دوای نیوەشەو لەسەر ئینتەرنێت دیومانە کەئەوان بایکۆتی کۆنگرەیانکردوەو قبوڵیان نییە، دەنا تا ئەو کاتە ئەوان بەخەت‌و بەئیمزاو بەسورە جەلەسەی ناوخۆی ناو کۆمیتەی ناوەندی لەگەڵ هەموو ئەوشتانەبوو، بەڵام ترسان جارێکی تر کەمینەبن، کەکەمینەش بوو ئایا مەبەستێکی دیکەی هەبوو هەرچی بوو، بەڵام مەبەستم ئەوەیە پێتبڵێم بڕیاری هەڵوەشاندنەوەی کەمینە، بڕیاری بەشداریکردن لەکۆنگرە، ئاییننامەو پێڕەوی هەڵبژاردنی کۆنگرە ڕۆژوکات‌و ساتەکەی هەمووی بەکۆی دەنگ لەنێوانماندا وەتەواوی کەسەکانی کەمینەش دەنگمان پێدا، شەوی پێش بەهەر هۆیەك ئەوان پەشیمان بوونەوە.

# کەمینە هیچ بەرنامەیان نەبوو

*بۆچی پەشیمانبوونەوە، بەبۆچوونی تۆ لەو رێککەوتن نامەیە؟

عەبدوڵلای موهتەدی: بەڕاستی لێکدانەوەکەی زۆری دەوێ، ئاسان نییە، بەڵام ئەوەندە دەتوانم بڵێم هیچ مەسڵەحەتێکی کۆمەڵەی تێدا نەبوو، هیچ شەرعیەتێکی سیاسی و حزبیشی تێدانەبوو، چونکە لەباری سیاسیەوە هیچ پلاتفۆرمێکی سیاسی، هیچ بەرنامەیەکی سیاسی، هیچ رێبازێکی سیاسیان لەیەك برگەوە تایەك دێرنەبوو.

دووەم لەباری رێکخراوەییەوە هەمووی بەئیمزای خۆیانەوە سەنەدەکان وجودیان هەیە، یان لەکۆبوونەوەکانی کۆمیتەی ناوەندی، دەفتەرەکان وجودەیان هەیە، سەرەڕای ئەوەی لەئەوەڵەوە گلەییان هەبوو لەکۆنگرە، بەڵام دوای پێکهاتنەکە قسەیان نەما بۆ بەستنی کۆنگرە، بەڵام ئایا لەبەرئەوەبوو دەترسان دەنگ نەهێننەوە، یان پێیانوابوو ئەگەر جیابنەوە دەتوانن ببن بەحزبێکی گەورە، ئەوە ئاسان نییە زۆری لێکدانەوە دەوێ، من مقارنەیەك دەکەم، یان ئەو مقایەسەت بۆ دەکەم لەنێوان جیابوونەوەی ئێمە لەحزبی کۆمۆنیست و جیابوونەوەی کەمینە، بۆچیش بۆنەوەی قەزاوەتکردن لەسەرجیابوونەو نەتیجەو ئاکامەکانی بانەقسەی من بێ، نەقسەی کەسی تر بێ، بێنین لەباری بابەتی و بزانین چی روویداوە کاتێك ئێمە لەحزبی کۆمۆنیستی ئێران جیابووینەوە یەکەم ئێمە لەباری فکری و ئایدولۆژی و سیاسی شتێکی تازەمان هێنا، شتێکی نوێمان هێنا گۆڕانێکمان هێنا لەحاڵێکدا کەمینە هیچ خیلافێکی سیاسی و فکری نەیتوانی، دوو ئێمە روانگەیەکی ترمان بەنسیبەت حزبی لەسەر مەسەلەی بزوتنەوەی رزگاریخوازانە لەسەر دەورو نەخشی کۆمەڵە، لەسەر دیموکراسی لەسەر تەحلیل ئێران، لەسەر هاوپەیمانی جیهانی، لەسەرمان و نەمانی حزبی کۆمۆنیست هەمووی ئەمانە قسەی تازەبوون، واتە شەرعییەتێکی سیاسی هەبوو، خەتی سیاسیمان جیاوازبوو بەمانگ و دوو مانگیش ئەوە دانەمەزرابوو، چەند ساڵ بوو کاری لەسەر دەکرا، چەندەها مەقالەی لەسەر نوسرابوو چەند وتاری پێشکەشکرابوو، سیمیناری لەسەر درابوو، واتە خەڵك ریزەکانی خۆمان لەجیاوازییە سیاسەکە تێگەیشتبوون، جیاوازییە سیاسیەکە روون و ئاشکرابوو، لێرەدا هیچ جیاوازییەکی سیاسی روون و ئاشکرا ناتوانی دەرخەی، دووەم وەختێك ئێمە لەحزبی کۆمۆنیستی ئێران جیابووینەوە، شەپۆلێکی پێشوازی گەورە لەکوردستانی ئێران هەڵسا، خەڵك پێی خۆشبوو خەڵك رووی تێکردین زۆرێك لەو کەسانەی تا دوێنێ.. یان دڵسارد بوو بوون، دانیشتووبوون، رویان تێکردوە، واتە خەڵك رویکردەوە کۆمەڵە، لەحاڵێکدا خەڵك لەمە دڵسارد بوو لەم جیابوونەوەیەی کەمینەدا. جیابوونەوەی ئێمە لەحزبی کۆمۆنیستی ئێران



مایەی گەشبینی و گەشانەوەو بوژاندنەوەی کۆمەڵەبوو، ئەمەیان مایەی لاوازو کزکردنی کۆمەڵەبوو، ئەویتریان ئیعتیبارو پرەستیژی ئێمەی لەناو ئەحزاب و خەڵك و میللەت بردە سەرێ، خەڵك شانازیدەکرد کەکۆمەڵەیە. ئەمەیان پرەستیژی ئێمەی شکاند، ئیعتیباری ئێمەی شکاند، لەتمیەی لەحەیسیەت و ئابڕوی کۆمەڵەدا، ئەوی دیکەیان خەڵکی لەدەور کۆکردینەوە، ئەمە خەڵکە لەدەورتەکاندینەوە فەرقەکانی ئاوا دیارو ئاشکران، کەوابێ ئەمەیان ناتوانی پۆزەتیڤ بێ و نێگەتیڤە نەك لەڕێی قەزاوەتی منەوە لەڕووی واقیعەتی شتەکەوە.

## کەمینە گەشەی لەکۆمەڵە ساندەوە

*لەقسەکانتان دوو خاڵم بەدیکرد، یەکەمیان ئەوەیە پێی ئەجێ دەستێکی دەرەکی لە پشت هاوکاری و ئینشیعابی عومەری ئێلیخانیزادەو گروپەکەی بێ. دووەمیشیان ئەوەی بەمەبەست ئەم جیابوونەوەیە کرابێ؟

عەبدوڵڵای موهتەدی: بەڕاستی، بەڕاستی ئەم کەمینەیە گەشەی لەکۆمەڵە سەندەوە، نەك گەشەی پێدا، کۆمەڵە لەگەشەکردنێکی زۆر زۆر بەخێرای بوو، ئەمە دوژمنی بۆ ئێمە دروستکرد، وەکو دەزانی خەڵکانێك زۆریان پێخۆشبوو، بەڵام دوژمنی بۆ ئێمە دروستکردبوو، گەورەترین دوژمنی جمهوری ئیسلامی ئێران بوو، ناحەزان پێیان خۆش نەبوو ئەمە واقیعەتێکە کەزیانی بەرەوتی گەشەی کۆمەڵەداوە، بەهەمموو ئەو تەوزیحاتەوە کەزۆر تریشی ئەتوانی لەسەر بڵێی.
دووەمیش بەبڕوای من بێجگە لەپلەوپایەو بێجگە لەتەموحی شەخسی من هیچ شتێکی تیا نابینم، تائێستاش نەمبینیوە تائێستاش هیچ جیاوازییەکی سیاسیان نەتوانیوە فۆڕموله بکەن هیچ شتێکیان نەئەو وەختە نەئێستاش دوای دوو ساڵ شتێکی ئاوایان نەکردوە.

## نازانم بۆچی هەر دەیانوویست جیاببنەوە

*ئەمە جوابی پرسیارەکەی من نەبوو؟

عەبدوڵڵای موهتەدی: وەڵڵا یەك شت هەیە ئەویش ئەوان لەم ئاخیرانەدا زۆر سووربوون لەسەر جیابوونەوە، بۆ ئاگاداریت دوای ئەو هەمموو قەوڵ و بەڵێن و ئیمزایەش کەکردبوویان، دوای ئەوەی خۆیان دەنگیان بەمەبەستی کۆنگرە دابوو، نەهاتن بۆ کۆنگرە، بەڵام ئێمە (5) کورسیمان پێدان، واتە ئامادەبووین (5) کورسیان بدەینێ لەحاڵێکدا مەعلوم بوو ئەوان کەمینەبوون ئەگەر کۆنگرە

بیویستایە دەنگی پێنەدەدان، بەڵام ئێمە بەپێچەوانەوە خوازیاری دەرکردنیان نەبووین، خوازیاری وەلانانو حەزفکردنیان نەبووین ئەگینا (5) کورسیمان پێنەدەدان، کەوابێ ئێمە لەلایەن خۆمانەوە نەرمی زۆرمان پیشاندا شەڕی راگەیاندنیش ئێمە دروستمان نەکرد هەرئەوان شەڕی راگەیاندنیان کرد ئێمە جوابمان نەدانەوە، بەڵام لەم ئاخیریانەدا هەستمدەکرد بەهیچ شتێك رازی نەدەبوون، غەیری جیابوونەوە من بەڕاستی نازانم ئەو سووربونەیانو ئیسرارەیان لەسەر جیابوونەوە لەکوێوە هێنابوو، چونکە ئێمە رەقیمان پێنیشان نەدان، هەمووی نەرمی بوو سیاسەتمان بەرامبەر ئەوان، بەڵام ئایا دەستێکی دەرەکی تیابووە، یاچی بووە بەڕاستی لێم روون نییە.

# ئێلخانیزادە یەکجار چوو لەگەڵ ئەمریکیەکان دانیشت من دوو جار چووم

---

***ئـەوان لەڕاگەیاندنـەکانی خۆیانـدا لـە (2007/4/14) پـاش ئـەوەی کـەرەوتی چاکسـازییان راگەیانـد، لـەناو کۆمەڵـە، دواتـریش لەدیـدارەکانی عومـەری ئێلخـانیزادە ئـەوەی باسـکردووە کەعەبـدوڵای موهتـەدی بۆتـە فەرمانـدەی گشـتی هێـزی پێشـمەرگەی کوردسـتان، کە پێشـتر لـەناو کۆمەڵەیـە نـەبووە، کە پێشـتر لـەناو کۆنگرەیـە سـکرتێر هەڵنەبـژێرا، کەسـەنتراڵ بەدەسـتی عەبـدوڵای موهتەدییـەوە بـووە، پەیوەندییـەکانتان لەگـەڵ ئـەمریکا جێـی گومـان بـووە، هـەموو ئەوانـەی کـاك عومـەر لەڕاگەیاندنەکانـدا ئەمانە بەشـێك بـوون، بـەڵام لەوەڵامـدا تـۆ وتووتـە مـن هـیچ هۆکـارێکی سیاسـی بـۆ جیـاوازی نـابینم بێجگـە لەمەسەلەی دەسەڵات و ئیمتاز؟**

عەبدوڵای موهتەدی: بەڵێ خۆ ئەوانە هەمووی قابیلی جوابدانەوەن، یەکەم دارایی کۆمەڵە بەدەست من نەبووە، خۆ بەزۆر بەسەر مندا ناسەپێی، ئێمە مەسئولی خەزاندارێمان هەبووە، مەسەلەی دارایی بەدەست ئەو بووە، بەڵام سکرتێری هەموو حزبێك هی ئێمە لەئاستێکی کەمدا رەنگ بێ، بەعزێك بڕیاریدابێ، بەڕاستی بڕیاری من لەسەر مەسەلەی ماڵی یەکجار کەمبووە، لەوانەیە خەڵك باوەڕی پێنەکات، ئێمە زۆرێك لەوانە هەرچی کردومانە بەئاگاداری دەفتەری سیاسی بووە هەرچی، واتە کەمن دەڵێم هەرچی بەراستیمە هەرچیمانکردبێ بەئاگاداری دەفتەرەی سیاسی بووە، کەعومەر یەکێك لەئەندامانی بووە، ئەمە بۆ ماڵییەکە.

بۆ مەسەلەی ئەمریکا ئێمە سێ سەفەرمانکردوە سەفەری ئەوەڵ عومەر کردویەتی من نەمکردوە، یەك سەفەر عومەر چووە، دوو سەفەر من ،سەفەرێك کەعومەر چووە کەهاتووەتەوە ئێمە لەدانیشتنی لەدەفتەری سیاسی خۆماندا لەبەر زیادەڕۆییەکانی لەقسە لەگەڵ ئەمریکادا رەخنەمان لێگرتووە،

وتوومانە ئەم هەموو وەعدو قەوڵو قەرارە وادەکەینو وابچێو پێکەوە بکەین کێ وتوویەتی تۆ ئەوانە بڵێ، قەرار وانەبووە ئاوا بڵێ، قەرار وانەبوو، ئێمە لەگەڵ ئەمریکا هێندە بچینە پێشەوە لەبەرئەوە لەعومەر رەخنەگیراوە، ئەوە سەفەری ئەوڵی، سەفەری دووەمیش کەمن هاتوومەوە راپۆرتمداوە بۆئاگاداری هەموو کۆمیتەی ناوەندی، یەك تاکە دیداریشم نەبووە کەهەموو بەناو موشەخەسات لەراپۆرتەکەمدا نەهاتبێ، راپۆرتەکەی من هەموو کەس پێی چاکبوو، لەبەرئەوە رابیتەکە لەگەڵ ئەمریکادا.

هەروا دەبوو ئەمە بۆ ئەمریکا دەی چیبووە؟ بۆ مەسەلەی سکرتێر من لەتۆ دەپرسم (15) نەفەر یان (20) نەفەر لەنێو خۆیاندا سکرتێر هەڵبژێرن ئەوە دیموکراتیکە، یان نوێنەانی هەموو حزبەکە لەکۆنگرەدا هەڵیبژێرنو ئەوە شت پێدەڵێم هیچ کام لەحزبە ئەورووپیەکان نییە کەئەو کارە نەکەن، هەموو ئەو حزبانەی تۆ بەدیموکراتی دەزانی، جاسۆشیال دیموکرات بێ، یان لیبراڵ بێ، یان دیموکرات مەسیحی بێ، ئەمە تازە بۆتە یەکێك لەیاسا دیموکراتەکانی حزبایەتی لەوڵاتانی ئەورووپای کەسکرتێر لەکۆنگرە هەڵدەبژێرن ئەمە دیموکراتێك ترە لەوەی کەسکرتێر لەناو جەمعێکی بچوك هەڵبژێرێ.

***ئەوەی کەبووی بەفەرماندەی گشتی هێزی پێشمەرگەی کۆمەڵە؟**

عەبدوڵڵای موهتەدی: لەهەموو حزبێك کەهێزی چەکداری هەبێ، لەهەموو دەوڵەتێك کەسەر کۆمارێکی هەبێ، جێیەکی دیکە هەیە وانەبێ، واتە لەم دنیایەدا جێیەکی دیکە هەیە وانەبێ، غەیری ئێمە، ئایا ئێمە کاری کەس نەکردومانکردوە هەروەکو هەموو جێیەکی دیکە وایە ئەمەش بۆ ئەوە نییە شەڕی پێبکەی، ئەمە بۆ ئەوە نییە فەرماندەیی مەیدانی پێبکەی، مەبەست لەو کارە ئەوەیە کەفەرماندە نیزامیەکان، واتە چەك بەسەر سیاسەتدا حکومەت نەکات، فەرماندە نیزامیو سەربازییەکان هەر خۆیان نەبنو دەسەڵات لەدەست خۆیاندا بێ کەسێك کەنوێنەری سیاسی حزبەکەی وتەبێژی سیاسیو مەسئولی سیاسی حزبەکەیە چاودێری بەسەریاندا بکات، ئەگینا مەعنای ئەوە نییە کەوەختی خۆی شەڕبوو، یان ئەوەبوو دیارە ئەوە شتێکی عەمەلیاتیەوە فەرماندەکانی هێزی پێشمەرگە خۆی دەیکات، بەڵام چاودێری سیاسی بەسەر هێزی پێشمەرگەدا کەمافی کۆمیتەی ناوەندییە لەلایەن وتەبێژو مەسئولی کۆمیتەی ناوەندییەوە بەسەر هێزی چەکداردا دەبێ، ئەمەش شتێکە ناگەڕێتەوە بۆ سەرکۆمەڵە، ئێمە پێڕەوی ناوخۆمان زۆرتر وەکو باقی ئەورووپا لێکردوەوە، ئەگەر دیقەت بکەی هەم بۆ هەڵبژاردنی سکرتێر هەم بۆ مەسەلەکانی تر هەمووی وەکو ئەورووپاییەکانمان لێکردوە، واتە ئەگەر تەماشاییبکەی دەبینی پێڕەوی ناوخۆی ئێمە دیموکراتیتر بووە، کەم دیموکرات نەبووە.

***عومەری ئێلخانیزادە لەدیدارێکدا ئەڵێ "هیچ هێزو قودرەتێک نییە بتوانێ ئێمە لەکۆمەڵە بسوون بشواتەوە"، ئەمەش بوتە مۆدێلێک هەرکەس لەئێوە جیانەبێتەوە ناوەکە بۆخۆی ئەبات دیسان کۆمەڵەی زەحمەتکێشان لەکۆمەڵەبوون ناشۆردرێنەوە ئەم ناوبردنە دەلالەتە لەچی؟**

**عەبدوڵای موهتەدی:** وەڵڵا من لەگەڵ ئەوە نیم ئاخر یا کەسێك، یا ژمارەیەك لەکەسەکان، یان لەگەڵ حزبە دایکەکە دەمێننەوەو، یان لەگەڵ حزب دایکەکە خیلافێکی سیاسیو فیکری ئەوتۆیان نییە لەم حاڵەدا بۆ جیادەبنەوە حەق نییە جیاببنەوە بەڕاستی خیلافیان هەیە لەگەڵ حزبە دایکەکە لەم حاڵەدا دەبێ ناوی خۆیان بگۆڕن، ئەدی گوێ بگرە دوو نمونەت بۆ بێنمەوە خۆ هەر ئێمە نین خەڵکی دیکەش ئەو کاریکردوە من هیچیان بەئوسوڵی حزبی نازانم، لەگەڵ دنیای شارستانیدا ئاوا نییە نمونەت بۆ دێنمەوە وەختی خۆی دەیبدئۆین کەوەزیری دەرەوەی بەریتانیا بوو وە لەحزبی لەیبەر بوو لەحزبی کرێکارانی بەریتانیا بوو کەلەگەڵ حزبەکەی تووشی کێشەبوو، هاتەدەرەوەو حزبی لیبراڵ دیموکراتی دامەزراند، ئیتر نەیکرد بەگێرەو کێشەو بگرەو بەروە لەگەڵ لەیبەر، نەخێر، من لەیبەرمو تۆ لەیبەرنیت تۆ ئەگەر راستەکەیو پێتخۆشە لەیبەربی دەیبمێنەوە، ئەگەر ناتەوێ لەیبەربی دەی بچۆ حزبێکی دیکە دروستبکە، نمونەیەکی دیکەی ئەوانە ئاریال شارۆنە، ئەوانە تابوو لەحزبی لێکودابوون سەرۆکی حزبی لیکۆدیش بوو وانییە، بەڵام کەلەگەڵ حزبەکەی تووشی خیلافبوو وتی ئەوە من رۆیشتم ناوی خۆم دەکەم. بەحزبی کادیما، کێ لەگەڵی چوو حزبێکی تازەی دروستکرد، من ئەوە بەشێوازێکی شارستانی دەناسم ئەگەر خیلافت کەمە لەگەڵ حزبەکەت مەیکە بەکێشەو مەیکە ئینشیقاقو جیابوونەوە، ئەگەر بەڕاستی خیلافت لەگەڵ حزبەکەت هەیەو دەڕۆی ناوێکی تر بۆ خۆت هەڵبژێرە، من ئەوە بەشارستانیەتر دەزانم، ئەوە کێشەکان کۆتای پێدێنێ ئاخر ئەو بگرەو بەردە لەسەرناو من بەمە نازانم.

***تاچەند ئەو بۆچوونە راستەکە هەمیشە ئێوە لەسەر بەشێك لەمێژووی کۆنتان ئەژێن، ئەم ناوە بۆ ئێوە موقەدەسە، پیرۆزە، بەشێکە لەمێژووی رابردوو، لەبەرئەوە هەرکەس جیابێتەوە، ئەم ناوە بۆ خۆی بەرێ لەسەر مێژووی رابردوو بژیو خۆی دروست کاتەوەو ئیمتیاز وەرگرێ؟**

**عەبدوڵای موهتەدی:** حەتمەن بۆ ئەو مەبەستەیان بووە، بەڵام ئەوە ئەگەر دەتەوێت کێشە نەخوڵقێ ئەگەر نەتەوێ دەردی سەری نەبێ، دوو خیار هەیە، دوو رێگە هەیە، خیلافت نییە، یان خیلافەکەت کەمە لەگەڵ حزبەکەت بمێنەوەو کاری خۆشت بکە، ئەگەر جیاوازییەکانت نا تەبایەکانت لەگەڵ خەتەکەو لەگەڵ حزبە زۆرە، دەی برۆ ناوێکی تر بۆ خۆت هەڵبژێرە هەر ئێمەش نین، مۆدێلی تریش هەیە هەم جیادەبنەوەو دەشڕۆن لەحزبەکەو هەم هەوڵدەدەن ناوەکەشی راگرن

بۆ خۆیان من بەدوور لەئسوڵی حزبایەتی دەزانمو بەنموونەیەکی ناشارستانیانە دەزانمو هیچ خاسیەتو فایدەیەکی نییە غەیری ئەوەی ناهێڵێ کێشەکان بڕێنەوەو چارەسەربن.

# گەر من بەهرەم هەبێت بەلاّم پێشی خەڵکم نەگرتووە

---

***ناسری حیسامی لەوکاتەدا لەدیدارێکدا ئەڵێ "دەوری تاقانەی عەبدوڵلاّی موهتەدی بەشێکە لەخاڵە لاوازەکانی کۆمەڵە، هەر ئەوەش سەرئەنجام بوو بەهۆی ئینشیقاقو جیابوونەوەی ئێمە"؟**

**عەبدوڵلاّی موهتەدی:** خۆ من پێشی خەڵکیم نەگرتووە، من ئەگەر بەهرەیەکم هەبێ، توانایەکم هەبێ هەڵسوڕانێکم هەبێ، ئەگەر خەڵك منیان قبوڵبووبێ، چیبکەم، خۆ ئەوە تاوان نییە، واتا ئەوە تاوانە کۆمەڵگەی کوردستان هەبێ خۆئەوە تاوان نییە، بێجگە لەوە خۆ من بەزۆر نەهاتووم هیچ جارێك نییە بەهەڵبژاردن نەهاتبم، ڕێشم لەهیچ کەس نەگرتووە، هەموو جارێك زۆرێك لەئەو دۆستو هاوڕێیانەی کەپێکەوە بووینو یەك لەوانە هەر ئەو کەسانەی کەدوایی لەگەڵ کەمینە ڕۆیشتن، هەمیشە بۆ خۆیان دەنگیانداوە بەمن ئێ دەنگیان نەدابایە، خۆ من بەزۆر نەهاتووم.

***لەوکێشەو ململانێیەی ئێوە، ئیبراهیمی عەلیزادە هێشتا پیشتیوانی لەتۆ ئەکات، یان لەحزبەکەی تۆ ئەکات، پێتوایە ئەوگروپەی جیابوونەوە هیچ داهاتوویەکیان نییە، تۆ ئەو پشتیوانییە بەپشتیوانیەکی دۆستانە ئەزانی، یان حەقیقەتێکە؟**

**عەبدوڵلاّی موهتەدی:** نەم بسیتووە، ئەو پشتیوانییە، من قەت قسەی ئاوام نەبیستووە.

***ئەوە قسەی ئیبراهیمی عەلیزادەیە سەبارەت بەجیابوونەوەی کاك عومەرو ئەوان ئەڵێ پێموانییە داهاتوویەکیان هەبێ ئەوان؟**

**عەبدوڵلاّی موهتەدی:** وەڵلا ئیبراهیم لەگەڵ بەعزێك لەکەسانی کەمینە دانیشتیان پێکەوەبووە کۆبوونەوەشیانکردوە، بەڕاستی نازانم لەوێ چی وتراوە لەنێوانیدا، بەلاّم لەگەڵ ئەو لێکدانەوەیەی ئیبراهیمم، هەم پێموانییە داهاتوویەکیان ببێ، پێموایە زەرەری زۆریان لەکۆمەڵەدا، بەلاّم قازانجو خێریان بۆ خۆیان نەبوو، کەمینە.

# عەلیزادە دەستی لەجیابوونەوەی کەمینە نەبووە

***دانیشتنەکانی ئەوان لەگەڵ ئیبراهیم بۆ چیبوو ، دەتەوێ بڵێی دەستی ئیراهیم لەو ئینشیقاقەدا هەبوو؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** پێموانییە، نەخێر، نامەوێ شتی وابڵێم.

***ئەی ئەتەوێ چی بڵێی؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** ئەڵێم دانیشتووە، هەرئەوەندە، ئەوەندەی بزانم دانیشتووە.

***وەکو دوو حزب، یان پێش جیابوونەوەکە؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** وەڵڵا پێش جیابوونەوەکە، من هیچ ئاگادارییەکم نییە، پێموانییە نازانم، بەلام دەزانم دوای جیابوونەوەکە داوایانکردوە بەعزێکیان چوون لەگەڵ ئیبراهیم دانیشتوون.

***گلەیەکی ترلەسەر تۆ ئەوەیە کەتۆ ناوە فارسییەکەی (کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانت) لەو کۆنگرەیەدا پێش ئەوە گۆڕیوە بە( حزبی کۆمەڵەی کوردستانی ئێران) مەبەستت لەم گۆڕینە کەفارسییەکەی، واتا کوردییەکەی ناکاتەوە، مەبەستت لەمە چییە؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** جابا عەرزتکەم، ئەم ناوە وەختێك گۆڕاوە کە عومەری ئێلخانیزادە، ئەو کەسانەی لەکەمینەدا بوون، هەمووی لەگەڵمان بوون، هەمووی تەهیدیانکردوە، بۆ ئاگاداریت جا عەرزتدەکەم چۆن ئێمە پێش کۆنگرەی (10) قسەیەکی ئاوا هەبوو کەناوی ئینگلیزییەکەمان (Komala Party of Irainian Kurdistan) بێ، کەفارسییەکەی دەکاتە حزبی کۆمەڵەی کوردستانی ئێران، دەزانم قسە هەبووە ئەمە لەکۆنگرەی (10)ی ئێمە پەسەندکراوە بەدەنگی ئەو هاورێیانەش کەئێستا لەناو کەمینەدان وانییە، واتا هەموومان پەسەندمانکرد، کەئەم شتەببێ.

دووەمین هۆکاری خەیاڵم بوو دەلیلی زۆرە کەبمەوێ لەسەرئەوە برۆم، چونکە سیمینارم لەسەرداوە، بۆ گۆڕینی ئەو ناوە پێویست بووە، نازانم لێرەدا چەندە جێگای هەیە لەسەری برۆم بەهەرحاڵ دەتوانم باسیبکەم، یەکێك لەشتەکانی ئەوەیە کەوشەی زەحمەتکێشان کەبەئینگلیزی (Toiler) ی پێدەوترێت ئەمە وشەیەکی کۆنە، هی سەدەی نۆزدەهەمە، هی سەرەتایی سەدەی نۆزدەیەمیشە بۆ کوردەواری، واتا لەباری مێژووییەوە ولاتانی ئەوروپا ئەو قۆناغەیان تێپەرکردووە، کەتۆ بەعام بتوانی لەزەحمەتکێش قسەبکەی، تۆ لەو کۆمەڵگایانەوە دەتوانی بڵێی چینی کرێکار، زۆر حزب



هەن کەخۆیان لەگەڵ چینی کرێکار پێناسە ئەکەن، ئەوەیشی پێناسەی ناکات، چینی کرێکار دەستەواژەیەکی ناسراو وموعتەبەرە، لەئەدەبیاتی ئەوروپایدا ۆرکنیگلا کلاس ( Working Class)، بەڵام (Toiler) وەکو ئەوەیە ئەمڕۆ لێرە لەجیاتی کرێکاری بیناسازی، بڵێی فەعلا ناوێکی کۆنە، ناوی سەردەمێکی مێژووی کۆنە کە تۆ ئەمەت وت تەرجەمەی ئینگلیزییەکەیتکردوە بە(Toiler) ئەو زەحمەتکێشانە مانای حزبێکی نامۆدێرن دواکەتوو، کۆمەڵگایەکی لادێیانە دەبەخشێ، لەبەرچاوی رۆژئاواو ئەوروپاو دنیای پێشکەوتوو ئەو مانای هەیە، ئەوە بۆ زەحمەتکێشانەکەی.

دووەم بۆچی ئێمە ناومان سازمان، واتا رێکخراوبێ (30) ساڵ دەبێ حزبین بۆ لەبەرچاوی خەڵکی دنیا بە (Organization) واتا رێکخراو خۆمان بناسێنینەوە، بەپارتی (Party) کەشتێکی زۆر ناسراوترو جێگەوتووترو موعتەبەرترە خۆمان نەناسێنینەوە، واتا حزب نیە ئەی چیبکەین تا حزب بین دوای (30) ساڵ کەدەڵێم (10) ساڵیش ، (10) ساڵی پێش ئەوەش ناوی خۆت بنێ رێکخراو قەیناکە تۆ لەخەباتێکی نهێنیو ژێر زەمینیدا بووی، بەڵام کەهەزاران پێشمەرگەت بوو، هەزاران شەهیدت بوو، شارەکانت بەدەستەوەبوو، ئیتر چوزانم کاری گەورەتکرد، دیبلۆماسیتکرد، ئێرانت دی، عیراقت دی، بەهەزاران ئەندامت بوو، بەدەیان هەزار لایەنگرت بوو، ئیتر بۆ ناوی خۆت نانێی حزب، کۆمەڵێك لەو دەلیلانە کەهەمووی بەوردی لەکۆنگرەی (10) باسکراوە، کۆنگرەی (10) پەسەندیکردوە، کەناوی ئینگلیزییەکەی ئێمە(Komala Party of Irainian Kurdistan) بێ، واتا حزبی کۆمەڵەی کوردستانی ئێران لەکۆنگرەی (12)شدا ئێمە فارسیەکەشمان هێنایەسەر ئەوە، بەم دەلیلانە.

بەڵام ناوی کوردییەکەمان نەگۆڕی، چونکە ئەم ناوەچەسپاوە لەکۆمەڵگای کوردستاندا کورتکراوەکەشی (کۆمەڵە)یە ئیتر هەموو کەس بەکاریدەبات، لەبەرئەوە حزبی کۆمەڵە زۆر بەکوردی مانای نییە، کۆمەڵە خۆی، واتا حزب، واتا رێکخراو بۆیە کوردییەکەی وەکو خۆی ماوەتەوە، ئەوانی تریشی گۆڕاوە کەعەرزمکردی بەشێك لەو گۆڕانانە، واتا بەشی سەرەکی گۆڕانەکە لەراستیدا هی ناوەکە کاتێك بووە کەئەو کەسانەی کەمینەش بوونو دەنگیان پێداوە.

## کەمینە دەیوت دەبێ کۆمەڵە بچێتەوە سەرخاکی کوردستان

***یەکێك لەو رەخنانەی ئەوان ئەو کاتە ئەوەبوو، کەداوای ژیاندنەوەی خەباتی چەکداریان ئەکردو خودی عومەری ئێلخانیزادە چەندجار رایگەیاندوە کەکۆمەڵە پێویستە لەخەباتی ئۆردوگانیشینی دەرچێو پەیوەندییەکانی لەگەڵ ئەمریکا شەفافتر بێ ؟**



**عەبدوڵڵای موهتەدی:** نەخێر، نەیانکرد وەڵڵا ئەمریکا خۆیان دەزانن و کەئەسڵ و ئەساسی نییە، بەڵام بۆ راکێشانی سەرنجی ئەم و ئەو ناخۆش نییە، واتا ئەمریکا بۆ خۆی بۆتە دەست کایە هەر کەس بیەوێ شتێك بڵێ، باسێکی ئەمریکا دەکات لەبەرامبەر نەیارەکەی خۆیدا، دەنا ئەمریکا پەیوەندییەکەی هەر ئەوەندە بووە کەئەوانیش دەزانن لەوە زیاتر نەبووە، خۆشیان دەزانن بەقەدەر نوختەیەك خەوشی لەسەر نەبووە، هەر ئەوە نییە پەیوەندی ئێمە لەگەڵ ئەمریکا، بەڵام بۆ مەسەلەی خەباتی چەکداری بەڵێ راستە کەمینە شیعارەکەی ئەوەبوو کەئێمە دەبێ بچینەوە سەر خاکی خۆمان، واتا مەبەستی ئەوەبوو بچینەوە کوردستانی ئێران، ئێمە نابێ، چیتر لەبن دەستی ئەحزابی کوردستانی عیراقدا بین، باسی قەندیلیانکرد، بەوانە ژمارەیەك پێشمەرگەیان لەگەڵ خۆیان خست، بەڵام نەتوانیان بچنەوە ئێران، نەتوانیان بچنە قەندیل، نەهیچ کام ئەوە بەرنامانەیان بۆ بەڕێوەچوو ژمارەیەکیان پێشمەرگە بەکوشتدا تەنیا خاسیەتەکەی ئەوەبوو، دەنا هەر وەکو ئێمە لەئۆردوگایەك دانیشتوون.

## دەیانوت باوەکو یەکێتی ببینەوە بەنیمچە بەرە

***ئەبوبکری مودەڕیسی لەبارەی کەمینە، ئەوکاتەوە لەدیدارێکدا دەڵێ "خەونی کەمینە، گۆڕینی کۆمەڵەبوو لەحزبێکی سیاسی هاوخەت، بۆ حزبێکی لێکترازاو دەستەگەری و پاشاگەردانی و شێواندنی فکری سیاسی و شێواندنی خەتی کۆمەڵە"؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** راستدەکات، ئەوان خوازیاری حزبێکی یەکگرتوو یەك ریز نەبوون، خوازیاری جۆرە حزبێك بوون کەئێمە ناومانناوە تاقمسالاری، واتا قوڵ قوڵ بێ، فلانە کەس و ئەوەندە کەسەی لەگەڵ واتا بردنی کۆمەڵە و گێڕانەوەی مێژوو بۆ دواوە بۆ دەورییەکی عەشارییەگەری لەکاری حزبیدا، پاشاگەردانی و تاقمسالاری راستە ئەسڵەن خۆی، چونکە رۆیشتنیان لەکۆمەڵە بەو حەماسەوە هەروەکو باسمکرد هیچ پێویستیەکی سیاسی نەبوو، بەڵام ئەوان حازر نەبوون لەحزبێکی ئاوادابن وەپێیانخۆش بوو قوڵ قوڵ بێ، هەرکەسە بۆ خۆی بێ، هەر کەسە تاقمێکی خەڵك لەگەڵ بێ.

هەربۆیەش بوو تەنانەت پێشنیاری ئەوەیاندەکرد باڵە حزب بێینەدەرەوەو ببینە نیمچە بەرە وەکو جارانی یەکێتی نیشتمانی، دیارە ئەو پێشنیارە رەتکراوەتەوە وتومانە خەڵك لەنیمچە بەرەوە بۆتە حزب، ئێمە تازە بگەڕێینەوە دواوە، خۆمان پارچە پارچە بکەین.



# کەمینە ئاسایشی هێنایە ناو ئۆردوگاوە

***باشە دوو ئامۆزا لەئۆردوگایەك، لەدەرەوەی دەسەڵاتی کوردستانی ئێران، نەتانتوانی بەیەکەوە بژین، وەکو لەرۆژنامەکانی کوردستانی عیراقیش باسکرا، تەلەفزیۆنی رۆژهەڵات دزرا، ئاسایش چەکیکردن. ئۆردوگاکانتان پڕبوو لەئاژاوەو کێشە؟**

عەبدوڵای موهتەدی: زۆر ناخۆشبوو، جا بۆیە دەڵێم ئەم جیاییە نێگەتیڤبوو پرۆژەی ساغکردنەوەی کۆمەڵە هیوا بەخشبوو، دڵ گەرمکەربوو، پێشوازی لێکرا لەناو جەماوەرەوە، بۆیە دەڵێم پرۆژەی جیابوونەوەی کەمینە غەیری زەرەروزیان هیچی لێنەکەوتەوە، بەڵێ راستە ئەو تەلەفزیۆنەیان دزی، تەلەفزیۆنی رۆژهەڵاتیان دزی، بەپێچەوانەی هەموو یاسایەکی حزبیو هەموو ئەخلاقێکی سیاسی ئەوان بوون کەداوایانکرد هێزی ئاسایش بێتە ناو ئێمە خۆ ئەوە ئاشکرایە من جارێکیش پێشم گرت، بەلام جارێکی تر هەوڵیانداو هێزی ئاسایشیان هێنایە ناو ئێمە، بۆ راگەیاندنەکانیش من هەر ئەوەندەت داوا لێنەکەم، وەکو قازییەك هەموو ئەو شتانەی تاسەردەمی جودایی هەموو ئەو شتانەی من لەرۆژنامەکانی کوردستانی عیراق نوسیومەو عومەرو خەڵکەکەی تریش نوسیویانە بیخوێنەوە، بزانە هی ئەوان هەمووی قسەی رەقو ناخۆش، دوژمن کارانەیە، هی منیش هەمووی قسەی نەرمو ئاواتی یەکگرتنەوەیە، یان نەو ئەگەر وانەبوو بزانە من راست ناکەم.

***تۆ لەدیدارێکدا "ئەو کاتە ئەوان وتیانە ئێمە سلاحیە تمان نییە، یان سەنتراڵ بەدەست عەبدوڵای موهتەدییەوە بووە، تۆش راتگەیاندوە کە راگەیاندن" هەمووی لای ئەوان بووە، دەرەوەی ولات بەدەست ئەوان بووە، کاری ئیجرائیش بەدەست ئەوان بووە؟**

عەبدوڵای موهتەدی: تەلەفزیۆنیان پێبووە، فراکسیۆنی راگەیاندیان پێبووە، بەشێکی زۆری کاری ئیجرائی ماوەیەك بەتەواوی پێیانبووە، دەرەوەی ولاتیشیان پێبووە، لەبەرئەوە بەڕاستی، بەڕاستی دەسەڵاتێکی کەمیان نەبووە.

***باشە ئەوان چییان ئەویست. ئەتوانی بەکورتی پێم بڵێی چییان ئەویست؟**

عەبدوڵای موهتەدی: دووشتیان ئەویست، پێموتی یەکیان بەڕاستی ئەوان دەیانویست کۆمەڵە بکەن بەحزبی تاقمسالاری قۆڵ قۆڵ بێ، هەر کەسە بۆ خۆی، ئەوەی ئەمیرانی حەربی پێدەڵێن، ئینگلیزی پێیدەڵێن (Warlord) هەر کەسە خاوەنی تاقمێك بێ بۆ خۆیو لەگەڵ حزبێکی پێشکەوتووی یەکگرتووی خاوەن خەتی سیاسی کۆك نەبوون، دووەم بێجگە لەشتی شەخسیو



بێجگە لەپۆستو دەسەڵات بەڕاستی هیچ قسەیەکیان پێ نەبووە، کارەکەشیانم پێ نامەسئولانەیە. مەبەستم ئەوەبوو رەتیبکەمەوە، دەڵێن شتمان بەدەست نەبووە هەتا لەباری ماڵیشەوە بەشی هەرە زۆری پارەو داهاتی ئێمە هەمان بوو خەرجی تەلەفزیۆن دەکرا کەئەوان بەرپرسی بوون، خۆ ئێمە بەرپرسی نەبووین.

## گلەییمان لەیەکێتی و پارتی هەیە

***باشە هەر لەگەڵ ئەوەی جیابوونەوە، ئۆردوگایان وەرگرتوو، ئیمکانیەتی باش، ئەوانە یەکێتی نیشتمانیو پارتی پێدان، پێموایە ئەم لایەنی ناوبڕژیوان بوون دواتریش هاوکاری باشیکردن، واتا حزبێك جیا ئەبێتەوە ئیمکانیەتی باشی ئەدرێتێو تەلەفزیۆنی بۆ دائەنرێ؟**

عەبدوڵڵای موهتەدی: پێم کارێکی باش نییە، من پێموایە حزبەکانی کوردستانی عیراق، حزبە سەرەکیەکان یەکێتیو پارتی و حکومەتی هەرێم رای خۆشمان راگەیاندوە لەو بارەیەوە، پێموایە ناتوانن هەر کەمینەیەك بەهەر هۆیەکی حەقو ناحەق جیابوونەوە بڵێ قەیناکە ئەوانیش لایەنێکن نەدەبووایە، وابکرایەدا.

***ئەوانیش ئەڵێن کەئەوان بۆ خۆیان رێك ئەبنو ئەگونجێن ئێمە چیبکەین؟**

عەبدوڵڵای موهتەدی: وانییە، ئاخر پرەنسیپی حزبی هەیە لەدنیادا، ئایا ئەوان کەمینەبوون ئەوەیەك، دووەم" ئەوان حازر نەبوون بێنە کۆنگرە ئەم دووەم، سێیەم" رێککەوتن نامەی مۆرکراو بەناوبژێوانیکردنی خۆیان هەبوو، نوسخەیەکی کۆپییەکی ئەو رێککەوتنە بەئیمزای خۆیانەوە چووە بۆ ناو بژێوانەکە، دەی دوای پێشێلیانکردوە، وانییە ئاخر، وەکو حەکەم ئەوان دەبوو جیاوازی لەنێوان حەقو ناحەق بکەن.

***خۆ هەر ئەوانیش لیژنەی ناوبژییوون لەنێوان ئێوەو ئەوان؟**

عەبدوڵڵای موهتەدی: دەزانم، بۆیە دەڵێم خۆ ئەوان راستیەکانیان دەبینی بەچاوی خۆیان دەیانزانی کێ ئینشیقاق دەکات، کێ نایەوێ ببێ، کێ رێککەوتن نامە ئیمزاکراوەکان پێشێلدەکات، کێ دەیپارێزێ، کێ کۆنگرەیەکی کەخۆی دەنگی پێداوە ببەسترێ دوای شەوی ئاخر بایکۆتی دەکاتو نایەت، ئەوە بەو جۆرە یاسای ناوخۆیو پێرەوی ناوخۆی پێشێلدەکات خۆ ئەوانەیان هەموو دەزانی بەبڕوای من حەق نەبوو هیچ پشتگیریەك بکرێن.



# ئەو سیاسەتەی یەکێتی و پارتی لەگەڵ کۆمەڵەو دیموکرات باش نییە

---

***ئەی بۆ کردیان؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** وەڵڵا نازانم، ئایا یەکێتی زۆر سەرقاڵی کاری خۆیان بوون، نەدەپرژانە سەر هیچ، بەڕاستی من تێینەگەیشتم، بەڵام ئەوەندە دەزانم ئەم سیاسەتە نەبۆ ئێمە نەبۆ حزبی دیموکرات سیاسەتێکی چاك نییە.

***یارمەتی باشیان ئەدرێ ئێستا؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** نازانم ئاگادارنیم لەمیزانیەکەی ئەوان ئاگادارنیم.

***هەر یەکێتی نیشتمانی، یان پارتی دیموکراتی کوردستانیش هاوکاریان ئەکەن؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** وەڵڵا پێموایە هەر حکومەتی هەرێم یەك یارمەتیە وابزانم.

***ئەمەوێ بەراست پێم بڵێی تۆ ئەمە بەیارمەتی حکومەتی هەرێمی کوردستان ئەزانێ، یان پارتی، یان یەکێتی بۆ ئەو حزبانە؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** جاران یەکێتی بوو پارتی بوو، بەڵام ماوەیەکە یەکخراوە هەر هەمووی حکومەتی هەرێمی کوردستانە.

# داوا لەکەمینە دەکەین بگەڕێنەوە

---

***واتە هیچ ئەمەلێك نەماوە بۆ یەکگرتنەوەتان، بۆ پێکهاتنەوەتان، بۆ دروستبوونی سەر لەنوێی کۆمەڵەیەکی یەکگرتوو؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** ئێمە رامانگەیاندوە. سەرەڕای ئەو زەرەرو زیانانەی کەبەکۆمەڵەیان گەیاند سەرەڕای ئەو خراپانەی گەلەگەڵ کۆمەڵەیان کرد، بەڵام دیسانیش ئەگەر بەڕاستی نەك بۆ مانۆڕ، نەك خۆ پیاو چاك هەڵخستن لەلای خەڵکی، بەڵکو بەجدی خوازیاری گەڕانەوەبن خوازیاری تێکەڵبوونەوەبن، ئێمە وەڵاممان پێی موسبەتە.

# عومەر شێخ موس هەوڵیدا بۆ یەکگرتنەوەمان بێ ئاکام بوو

* **پێموا بێ چەند مانگ پێش ئێستا چەند دۆستی نزیکی ئێوە لەئەوروپا یەکێك لەوانە عومەر شێخ موسی و خەڵکی تر ویستیان ئەو پەیوەندییانەی ئێوە بگەێنەنەوە ئاستی یەکبوونەوە، بەلام سەرکەوتوو نەبوون؟**

**عەبدوڵلای موهتەدی:** راستە جا کاك عومەر شێخ موس شاهیدێکی زۆرباشە، بۆ ئەوە لەئەوەڵەوە ئێمە وتمان بەیەك مەرج دادەنیشین، ئێستاش قسەمان ئەوەیە ئەویش، ئەوەیە تەنیا لەسەر یەکگرتنەوە حازرین قسەبکەین، واتا هیچ خاڵێکی تری ئەجێندا قبوڵ ناکەین، باسی سیاسی بکەین، باسی رێکخراوەیی بکەین، باسی ئێران بکەین، عێراق بکەین، کورد بکەین باسی بزوتنەوەبکەین، ئەوانە لەئارادا نییە لەسەر یەك خاڵ تێکەڵبوونەوە ئایا ئەوان خاڵی تێکەڵبوونەوەیان قبوڵە، یان نە، ئەگەر ئەوەیان قبوڵ بێ، ئێمە ئامادەی دانیشین لەگەڵیان قسەکەمان لەرۆژی ئەوەڵەوە ئەوە بووە، عومەر شێخ موس هات لەئەوەڵەوە قەوڵیان پێدا کەبۆ تێکەڵبوونەوەو یەکگرتنەوەش ئامادەن، بەلام دوای ئەوەی کەپەیوەندی لەگەڵ کردنەوە دەرکەوت کەئامادەنین.

* **ئامادەنەبوون؟**

**عەبدوڵلای موهتەدی:** ئامادەنەبوون، شاهیدیش کاك عومەر شێخ موسە، دوای ئەوە یەك دوو هەیئەتی دی لەدۆستانیش هاتوون و چوون ئەم ئەخیرە وامان لێ بیستوون کەئەوان ئەوەیان قبوڵە، واتا بۆ تێکەڵبوونەوە بۆ یەکگرتنەوەوە فەقەت بۆ تێکەڵبوونەوە نەلەسەر هیچ خاڵێکی تر ئەوان ئامادەن ئەگەر وابێ ئێمەش ئامادە دەبین لەگەڵیان دائەنیشین، ئەوان پێشتر خوازیار بوون وەکو دوو حزبی جیاواز بەرەسمی یەکتر بناسین ئێمە ئەوەمان قبوڵ نەبوو، بۆیەش وتمان لەسەر خاڵی جۆراوجۆی سیاسی قسەناکەین ئێمە بەس لەسەر تێکەڵبوونەوە دادەنیشین بەمەرجێك بزانین بەراستی یانە.

* **ئێوە ئەوان وەکو کۆمەڵە، یان حزبی سیاسی بەرەسمی ناناسن؟**

**عەبدوڵلای موهتەدی:** نەخێر.

# عەبدوڵلا کۆنەپۆشی کاری ناحزبی کردبوو

*هەر لەدرێژەی ئەو کێشەو ململانێیەی ئێوە، لەدووەمین پلێنیۆمی دوای کۆنگرەی (12) هی کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشان، دیسان کێشەیەکتان بۆ دروست ئەبێ، لەگەڵ کەسێك بەناوی عەبدوڵلای کۆنە پۆشی کەئەندامی کۆمیتەی ناوەندی ئێوە ئەبێ، میدیاکان زۆر لەسەر ئەوە قسەیانکرد کەگوایە ئێوە چەکتانکردوەو لێتانداوەو سوکایەتیتان پێکردوە، دواتریش دیسان ئەگەر بەناویش بێ رەوتێکی تازەی راگەیاند بەناوی (رەوتی یەکگرتنەوەی کۆمەڵەی زەحمەتکێشان) پێتوایە دەرئەنجامی ئەو کێشەو ململانێیەی ئێوە بوو لەگەڵ عومەری ئێلخانیزادە؟

عەبدوڵلای موهتەدی: ئێمە ئەوەمان لەراياگەیاندنێکی تەفسیلدا باسکردوە، ناوبراو نەکێشەی سیاسی بووە، نەهیچ کام لەوانەی بووە، کۆمەڵێك کاری نایاسایی‌و کاری بێ ئاگای حزبەکەی کردبوو، وەختێك ویستوومانە لێکۆڵینەوەی لەسەربکەین ئیتر ئەو قاڵبەی پێداوە، دیارە کەمینەش دەستی تێخست، هەوڵیدا گەورەی کاتەوە لەبەرئەوە کێشەی ئەو نەحزبیە نەسیاسیە.

*چیبوو کێشەکانی چیبوو؟

عەبدوڵلای موهتەدی: حەزناکەم لێرە باسیبکەم بەراستی، بەڵام کۆمەڵێك کاری ناجوان بوو، ناجوان‌و ناتەبا لەگەڵ سیاسەتی کۆمەڵە، بێ ئاگاداری کۆمەڵە، بەعزێ کاری ئاوایکردبوو.

*باشە ئەو جیابوونەوانە لە پای چی، ناونان بەرەوتی یەکگرتنەوە لە پای چی، ئەوە پێتانوانییە تەئسیر لەناو سومعەو خەباتو مێژووی کۆمەڵە ئەکات؟

عەبدوڵلای موهتەدی: بەڵێ غەیری زەرەر هیچ فایدەیەکی نییە، خۆ دیارە، بەڵام ئیتر خۆنایە بڵێ بەراستی شتەکە لەسەر چیبووە.

# کۆنە پۆشی پەیوەندی لەگەڵ پژاك هەیەو پێشمەرگەی پێفرۆشتوون

*باشە دواتر ئەم خۆی لەگەڵ چەند پێشمەرگە ئەچنە قەندیل پێتوایە لەم مەسەلانەدا پژاك، یان پارتی کرێکارانی کوردستان ناڕاستەوخۆ دەستی هەبێ؟

عەبدوڵای موهتەدی: بەڵێ، عەبدوڵای کۆنەپۆشی پەیوەندییەکی نزیکی لەگەڵ پژاك هەبوو وە هەیە، زۆری جەوانی ئێرانی پێفرۆشتوون، کەمێناونی لەودیوو پێیفرۆشتن‌و بردوونە وە تەحویلی پژاکی داون کردونی بەپێشمەرگەی ئەوان، ئێستا خۆ دیارە هەر نایەنەوە لای خۆشی، خۆ تەبعەن کەدان بەئەوان تازە نایەنەوە بۆ لای خۆت، بەڵام پەیوەندییەکی زۆر نزیکی لەگەڵ ئەوان هەیەو بووی، نازانم ئێستا.

*بەڵام تۆ پێتوانییە هەموو ئەمانە هەرچی چۆنێك کەتەفسیری سیاسیان بۆ بکەی دواجار بەناوی کۆمەڵەوە ئەمانە لەسەر کۆمەڵە ئەکەوێ، چۆن ئەتوانن دیسان ڕێگری بکەن، لەوەی ئەم ڕوداوانە ڕوونەدەن کێشەی زیاترتان بۆ دروست نەبێ، ئینشیقاقی زیاتر دروست نەبێ، دەستێوەردانی زیاتر نەبێ؟

عەبدوڵای موهتەدی: ئاخر گەرەنتییەکی میتافیزێکی نییە بۆ ئەوان، گەرەنتی هەوڵی خۆمانەو تەعەهودی خۆمانەو ئیلتیزامی خۆمانە، هەست بەمەسئولیەتکردنی خۆمانە.

*کەئەیکەن؟

عەبدوڵای موهتەدی: کەئەکرێ کەئەیکەین دەست بۆ ئەو کارانە ئەبەین.

*بۆ ئەیکەن؟

عەبدوڵای موهتەدی: ئاخر دیارە ئەو شتانە.

*هەر کەسەو هەموو بەرپرسیاریەتەکان لەخۆی دائەماڵێ؟

عەبدوڵای موهتەدی: وایە بەڵام..



***کێ ئەبێ ئەمە تەشخیس کا، کەکێ تاوانبارە کێ خەتابەرە، کێ ئەیەوێ مێژووی کۆمەڵە بشێوێنێ؟**

عەبدوڵای موهتەدی: وەڵای هەر لەخۆتەوە تا خەڵکی دیکە ئەگەر بەچاوێکی کراوەوەو بەبێ تەعەسوب بێن لێی بکۆڵنەوە، پێموایە راستیەکانیان بۆ رون دەبێتەوە، بەڵام لەئاکامدا قازی ئەوانە خەڵکی کوردستانی ئێرانە.

***لەسەروبەندی ئەم جیابوونەوەنەی ئێوەیە کۆنگرەی (12)ی حزبی دیموکراتی کوردستانی دیسان ئینشیقاق لەناو حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران دروست نەبێتەوەوە جارێکی تر؟**

عەبدوڵای موهتەدی: کامە.

***کۆنگرەی جیابوونەوەی عەبدوڵای حەسەنزادە؟**

عەبدوڵای موهتەدی: بەڵێ ئەوان ساڵێك پێش ئێمە جیابوونەوە.

## جیابوونەوەی دیموکراتم پێناخۆش بوو

***بەڵێ ئەڵێم لەم سەروبەندەدا، واتا جیابوونەوەی ئەوان تاچەند پێتوایە هەقە، یان دەستی دەرەکی لە پشتەوەیە، وەکو جیابوونەوەکانی کۆمەڵە، یان ئەمە بۆ هەوڵێکە بۆ تەزعیفکردن و سووککردنەی لانی کەمی کۆمەڵەو دیموکرات، کەهەریەك کۆمەڵە نییە، هەریەك دیموکرات نییە، هەریەك مێژوو نییە، هەڵبەت ئەم شتانەش هەیە؟**

عەبدوڵای موهتەدی: من بەڕاستی نازانم هی ئەوان چۆن بووە، وەکو بینەرێك و وەکو لێکۆڵەرەوەیەکی سیاسی لەدەرەوە دەتوانم لەسەر ئەوان قەزاوەت بکەم، ئەوەندە دەڵێم جیابوونەوەکەی ئەوانیش من بەقازانج نابینم، بەڕاستی جیابوونەوەی ئەوان بەقازانج نەبوو نەك هەر بەقازانج خۆیان نەبوو، باوەڕم پێبکە بەقازانجی ئێمەش نەبوو، چونکە بوو بەمۆدێلێك بۆ بەعزێ کەسی ئێمەش پێم حەیف بوو بۆ ئەوانیش و بۆ خۆشمان.

***ئەوانیش هەمان قسەی ئێوەیان هەبوو، واتا ئەوەی حزب کەوتوەتە دەست چەند کەس، سەنتراڵ بەهێزبووە ئیدارەو دارایی بەدەست کێوەیە، واتا ئەمەوێ بڵێم کێشەتان گرفتی داراییە، واتا پارەو ئیمانیاتێکی ئەوەندەتان هەیە تاشەڕی لەسەربکەن؟**

عەبدوڵای موهتەدی: نەوەڵلا، من بەراستی نازانم بۆ حزبی دیموکرات چەندە وایەو وانییە من قازی ئەوان نیم، بەڵام بۆ ئێمە ئەپارەکەمان هێندە زۆربووەو هەیە، ئەئەسڵەن گرفتەکەمان ئەوەیە، بەڵام ئەزانی چۆنە ئەوەندە لەکوردستانی عیراق باسی گەندەڵیکراوە، کەئەلعان تۆ بەهەر کەسیەوە بنوسێنی بڵێی فلانە کەس گەندەڵە، کەس راناوەستێ کەلێپرسینەوەی لێبکات، کەس راناوەستێ بزانێ راستە، یان درۆیە، بۆیە ئەمە زۆرتر وەکو پلارێك وەکو هەوڵێك بۆ بەدناوکردن بۆ ناوزڕاندن بەناو ئێمەدا بەکاربراوە، دەنا هیچ ئەسڵو ئەساسی نییە، خۆشیان جوان دەزانن جا بەچی دەڵێم دوای جیابوونەوەی، دوای ئەوەی کەتەواو رۆی جا ئەو سەفەر تۆ لەمقابلەیەکی عومەر دەخوێنیەوە دەڵێ من هیچ کێشەیەکی ماڵیم نییە، عەبدوڵلا بەکەسێکی پاك دەزانم، دوای ئەوەی کرانو خەڵکەکە هەڵخرا، ئینشیعابەکە کرا ئەو وەختی ئەوانە دەڵێت.

***باشە من پێمواببوو ئێران شەڕی چەکداری ئێوە بکات، تیرۆرتان بکات، باشترە، لەوەی کەبەرێگایەکی سیاسی هاتووە راستەوخۆ، یان ناڕاستەوخۆ ئینشیقاقو ئینشیعابتان تێ ئەکات، وردە وردە لاوازتان ئەکات، کەهیچ متمانەیەك لەنێوانیاندا نەمێنێ؟**

عەبدوڵای موهتەدی: وایە، بەس نییە ئەو شانازییەی تێدابوو وایە زۆر راستە.

***باشە کەوایە بۆ ئێوە خۆتان رێگری بەربەستەکان دانانێن، تێناگەن لەوەی کەئەوەی ئێوە دەیکەن کەدوژمن ئەیەوێ؟**

عەبدوڵای موهتەدی: ئاخر ئەو قسەیەی جەنابت سەدجار لەلایەن ئێمەوە کرا.

***ئەوەی کەدوژمن ئەیەوێ ئەوە ئێوە خۆتان جێبەجێی ئەکەن؟**

عەبدوڵای موهتەدی: رێکوایە، ئەوەی ئێمە بەم ئاخر ئەوەیە، جا عەرزتدەکەم، جیابوونەوەی کەمینە لەکۆمەڵەی شۆڕشگێڕ دوژمنانی شادکردین، دۆستاتی کزو بێ ورەکرد، خۆشکور خۆشبەختانە ئێمە دەورەیەکەی هەستانەوەمان دیو ئەوانە ئەو بریناتە سارێژ دەبن، بەڵام کاریگەرییەکەی بۆ ئەو سەردەمە بەئێستاشەوە کاریگەرییەکی سلبییە، ئاخر من بۆیە دەڵێم هیچ ئیتسفادەیەکی نەبوو، غەیری زەرەر، بەڵام ئاخر تۆ دەڵێی چی سەدجار ئەو ئامۆژگارییانەکرانو

هەموو نەرمییەکیش پیشاندرا، بەڵام تۆچی لەوە دەکەی کەسانێك بڕیاری خۆیاندا جیاببنەوە، جا ئێستا بەراست پەشیمانبووبێننەوە یان نە، ئەوە نازانم هیوادارم پەشیمانبوونەوەکەیان راست بێ.

# لەگەڵ فراکیسۆنی حزبی کۆمۆنیست پەیوەندیمان هەیە

***هەر لەسەر ئەمە جارێکی تر لەناو حزبی کۆمۆنیستی ئێران، چەند کەس لەکادیرانی کۆنی کۆمەڵە فراکسیۆنێکیان پێکهێنا بەناوی فراکسیۆنی فەعالیاتی کۆمەڵە، ئێستاش ناویان ناوە"رەوتی سوسیالیست کۆمەڵە( فراکیسۆن )"و ئەوانە جارێکی کەخەریکە ئینشیعابێك لەوێ دروست ئەبێ حزبێکی تازەش دروست ئەبێ، هەندێکی کەس پێیانوایە عەبدوڵای موهتەدی لە پشت ئەمەوەیە، دانیشتنی هەبووە لەبەریتانیا بۆ هاندانیان تا بۆ لاوازکردنی حزبی کۆمۆنیست ئەو جیابوونەوانە لەکادیرانی کۆنانەی ئێوە تۆ ئاگات لێیەتی، یان دروستبوونی کۆمەڵەیەکی تر بەقازانجی کۆمەڵەیە مەبەستم ساعیدی وەتەندۆست؟**

عەبدوڵای موهتەدی: بەڵێ مینەی حیسامی بەڕاستی هیچ پەیوەندێكو هیچ دانیشتنێك لەگەڵ ئێمە نەبووە، تاماوەیەکیش دوای جیابوونەوە نەبووەو هیچ دەستتێوەردانێکی من، یان هیچی کەس تر لەلایەن ئێمەوە نەبووە، بەڵام حەقیقەتێك هەیە ئەو خەتە سیاسییەی کەئێمە لەنەقدی حزبی کۆمۆنیستی ئێرانداکردمان، من زۆرتر وتەبێژو نوسەری بووم ئەم خەتە کاریگەری خۆی داناوە وەداشی ئەنێ رەنگ بێ، ئەو هاوڕێیانەی لەحزبی کۆمۆنیستی ئێران جیابووبێتنەوە جا باسیبکەن، یان باسی نەکەن، رەنگ بێ لەژێر کاریگەری ئەو قسەیە، یان رەخنەیە بووبن لەسەر حزبی کۆمۆنیست، بەڵام هیچ جۆرە دەستتێوەردانێك تەنانەت هیچ جۆرە چاوپێکەوتنێك لەنێوانماندا نەبوو، ئێستاش کەئەوان جیابوونەوەو ماوەیەکیش تێپەڕیووە من وابەباشدەزانم هەوڵبدەن بۆ یەکگرتنەوەکان نەك ئەوەی خۆیان حزبێکی جیاواز بەناوی کۆمەڵە دروستکەن، بەڵام دیارە ئەوان سەربەخۆنو ئێمە پەیوەندییەکی دۆستانە شمان لەگەڵیان هەیە، کێشەیەکمان لەگەڵیان نییە، چییان پێباش بێ وادەکەن خۆیان بڕیاردەدەن.

***لەگەڵ ئێوە دانوستانیانکردوە بۆئەوەی لەگەڵ ئێوە یەکبگرن بێنە ناو ئێوەوە؟**

عەبدوڵای موهتەدی: باسی یەکگرتنیان لەگەڵ ئێمە نەکردوە، بەڵام دانیشتنو چاوپێکەوتنوقسەیان لەگەڵ ئێمەکردوە.

***باشە ئەگەر بێن لەگەڵ ئێوە یەکبگرن باشتر نییە لەوەی حزبێکی تر دروستکەن وەکو بەنیازن؟**

**عەبدوڵلای موهتەدی:** ئاخر ئێمە ئەوەمان پێ باشترە، ئەوە ماوەتەوە سەرئەوان، بەلام بۆ یەکگرتنەوەی لەگەڵ ئەوانیش وە لەگەڵ هەر کەس تریش، بەراستی پێش هەموو شتێك دەبێ زۆر بەشەفافیەت زۆر بەڕونی باسە سیاسیەکان بکرێ، واتا یەکگرتنەوەکە دەبێ لەسەر ئەساسی یەکگرتنەوەی مەبادیئی فیکرو خەتی سیاسی بێ، نابێ تەنها لەڕووی سۆزو لایەنی عاتیفیەوە بێ، ئێمە هەموو کۆمەڵەبووین و پێکەوەبووین کەوابێ ئەو مەبەستە ئێمە پێشنیارمان پێکردون کۆمەڵی سیمینار دانێین، چەندینجار پێشنیارمان پێکردون، وەعد وایە جوابمان بدەنەوە کۆمەڵی سیمینار دانێین تا لەسەر شتە سیاسیەکان یەکبگرینەوە، چونکە ئەگەر ئەمە ببێ بەراستی کێشەیەکی تر لەنێوانماندا نییە، یاحەق نییە ببێ.

***هەست بەچی ئەکەی کە (4-5) شت هەیە بەناوی کۆمەڵەوە، واتا هەست بەناخۆش حـاڵی ئەکـەی، هەست بەچی ئەکەی (5) گروپ بەناوی کۆمەڵەوە هەبێ؟**

**عەبدوڵلای موهتەدی:** نا، نا پێنج نییە تۆ مەیکە بەپێنج.

## لەگەڵ عەلیزادە یەکناگریت؟

---

***پێنجن بۆت بژمێرم؟**

**عەبدوڵلای موهتەدی:** بەلام شەخسەن وەکو خۆم پێمخۆش نییە، پێموایە زیانێکە لەکۆمەڵە زیانێکە لەبزوتنەوەی رزگاریخوازانەی کورد، زیانێکە لەبزوتنەوەی چەپ و ئازادیخوازانەی هەموو ناوچەکە دراوەو ئاواتیش دەخوازم کەئەو بارودۆخە نەمێنێ و ئێمە لەلایەن خۆمانەوە ئامادەین بۆ ئەوەی ئەو هەنگاوانە هەڵگرین کەرێگا خۆش کابۆ جۆرێك یەکگرتنەوە، بەلام دیارە دووپاتیدەکەمەوە ئەم یەکگرتنەوە دەبێ لەسەر ئەساسێکی شەفافی سیاسی بێ، بەبڕوای من ئەگەر هەوڵی بۆ بدرێ ئەوە نامومکین نییە، بەلام ئێستا دەبینین کەسانێکی وەك ئیبراهیم و حزبی کۆمۆنیستی ئێران هەن، دەی ئەوانە زۆر خەتەکەیان جیاوازی منە، سەرەڕای هەموو رێزم بۆ ئیبراهیمی عەلیزادە وەکو تێکۆشەرێك وەکو هاورێیەکی خۆم، بەلام بەڕاستی تا ئەوان لەسەر ئەو خەتە بن، ئاخر یەکگرتنەوە ناکرێ، بۆ هاورێیانی فراکسیۆنیش کەئێستا بەناوی رەوتی سۆسیالیستی کۆمەڵە کاردەکەن پێشنیارم ئەوەیە کەلەباری شەخسی و هاتووچۆوە نزیك بین دۆستایەتیەکەمان چڕوپڕ کەین، لەباری سیاسی و فیکریشەوە کۆمەڵێك سیمینارو نوسین و گفتوگۆی جدی لەنێوان خۆماندا



بخەینەڕوو، ئەگەر ئاوابێ بەڵێ ئەو وەختی دەکرێ بڵێین هیوایەك هەیە ئەگەر وانەبێ ئیتر ئەوە دەمێنێتەوە بۆ ئەوەی لەداهاتوودا لەمەحەکی بزوتنەوەو لەمەحەکی ئەزموونی جەماوەری بدرێ، بزانین نوخبەیَ کوردستان ئەڵێ چی سیاسیەکانی کوردستان دەڵێن چی، رۆشنبیرانی کوردستان دەڵێن چی جەماوەری خەڵکی کوردستان نیهایەتەن قەزاوەتی خۆیان دەکەن.

# مانگانە (1000) دۆلار دەدرا بەمن

***لێرە بەشێکی زۆر لەدیدارو قسە جدییەکانمان تەواو بوو، پێمخۆشە لێت پرسم تۆ مانگانـە چـەند پارەت هەیە، ئەڵێن عەبدوڵلا پارەی باشی هەیە، دەوڵەمەندە، پێمباشە پێم بڵێـی مانگانـە چـەند پارەت هەیە، یان چەند وەرئەگرێ، یان چەند سەرفئەکەی؟**

**عەبدوڵلای موهتەدی:** بەسەرچاو، سەرفی خۆم ئەوەی لەناو ئۆردوگای کۆمەڵە من لێرە بەقەد هەر پێشمەرگەیەکی تر وەردەگرم، بەدەردی کوردی دەڵی بەنانەزکی کاردەکەم، بەشی ئێرە دیارە مەسەلەن من میوانێکم بێ، من میوانم لەخەڵکی زیاتر دێ ، دەبێ حزبەکەم بۆم بدا خۆ من نیمە شتێك بۆ ئێرە، بەڵام منو چەند کەس نەك لەبەر پۆستەکەم لەبەرئەوەی بەشێك لەبنەماڵەمان لەئەوروپایە، خانەوادەمان لەئەوروپایە، ئەوان هەموو خەرجی خۆیان بۆ دابین ناکرێ، منو چەند کەس لەهاوڕێیانی دیکەی کۆمیتەی ناوەندی مانگانە شتێك دەدرێ بەوان بەبنەماڵەمان کەهی من (1000) دۆلارە.

***خۆت هیچ پارەیەکت هەیە؟**

**عەبدوڵلای موهتەدی:** یەك تاقە فلسم زیاتر لەو پێشمەرگەیە نییە کە (15) رۆژە چەکدارکراوە، هیچ مەعازەڵا کەم تا زۆر، ئەو شتت پێبڵێم لەکۆمیتەی ناوەندیماندا، چونکە هی وا هەیە پێویستی زۆرتر پێیەتی، خانەوادەکەی هەیە کەسی واهەن لەمن زیاتر وەردەگرن، هی من شتێکی هەیە لەمن کەمتر وەردەگری هی من شتێکی وەسەتە (1000) دۆلار ئەوە بەگوێرەی پۆست یان هیچ ئیحترامو رێزگرتنێك نییە، بەگوێرەی ئەوەیە بنەماڵەی ئەو کەسە چەندە لەدەرەوەی وڵات ژیانی خۆی بۆ دابیندەکرێ، هەیە رەنگە ژیانی خۆی پێدابینکری پێویستی بەوە نەبێ هیچی بدەیە هەشە یارمەتییەك دەکرێ، دیارە ئەمە بۆ خۆت دەزانی لەئەوروپاو لەوپێش ژیاوی کەس بەمە نابێ من باری ئەسڵی ژیانم لەئەستۆی هاوسەرمە، کەناهیدی بەهمەنییە، نەك هەر هاوسەرمە، بەڵام بۆ خۆی تێکۆشەرەوە بێجگە لەهەموو کاری سیاسیو حزبی خۆی دەیکات بۆ ژنانو بۆ ئەوانە کاردەکات،

بەڵام ئەرکی نان پەیداکردن بۆ منداڵەکانیشم هەیە، بەڵام ئەم پارەیەی کەدەدری یارمەتیکە بۆ ئێمە بەشێك لەکرێ خانووەکەمان نەك هەمووی لەدەرەوەی وڵات بتوانین بدەین.

## شەرمنم

***تۆ هەست ئەکەم کەسێکی شەرمنی، وایە دەقیقەن؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** ئا، تاڕادەیەك وایە راستە.

***ئەو جارەش لێم پرسی لەبەینی عەشق و سیاسەتا کامیانت بەلاوە زۆر خۆشەویستە؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** ئاخر، هەر کامە جێی خۆیی هەیە ئاخر خۆ من زۆر تێکەڵبووم لەگەڵ سیاسەت، ئەمە وایکردوە زۆر لە هاوسەرەکەم و زۆر لەمنداڵەکانم جیاوازبم. رەنگ بێ لای خەڵکی کوردستان هەمیشە باسی ناکاو ناکروزێتەوە، بەڵام زۆر بۆشاییەك، یان ناخۆشییەکی لەژیانی مندا بەجێهێشتووە، بەڵام ناعیلاجیشم و دەیکەم و بۆڵەشم نەکردوە گلەیشم نەکردوە قەت.

## نوێژم کردوە

***نوێژتکردوە؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** بەڵێ تا جەوانیم، تەقریبەن.

***بەنیازنیت دەستیپێبکەینەوە؟**

**عەبدوڵڵای موهتەدی:** ئێستا نا، ئەوە دەگەڕێتەوە سەر قەناعەتی ئینسان، من پێموایە ئەوانە من لەو بڕوایە دام ئاین مەسەلەی قەناعەتی تاکەکانە، هەر ئاینێکت بێ دەبێ خەڵك ڕێزت لێبگرن، هیچ کام لەو ئاینانە شت نەبێ، یان هەر جۆرێك بیرکردنەوەت بێ، بەبڕوای من ئەوە قەناعەتی شەخسیو هەڵبژاردنی شەخسی کەسەکانە.



# زۆرجار گریاوم

***جەنابت کەی ئەگری، چ کاتێك؟**

**عەبدوڵای موهتەدی:** من وەختێك کەسەعیدی موعینی یا خانەی موعینی لەدەستدا لە(31)ی جۆزەردانی (1357) دا وابزانم وەها زۆر گریام و ئەو وەختەش هێشتا شتی ئاوام قەدەری ئاوام زۆر بەسەرنەهاتبوو، پێموابوو تامن ماوم تازە ناتوانم ژێر ببمەوە، بۆ زۆرێك لەکەسەکان گریاوم، بەڵام نەمهێشتووە خەڵك بزانێ لەتەنیایدا گریاوم.

# کچەکانم وا دەزانن قەت، ناگریم

***تازەترین گریانت کەیبووە؟**

**عەبدوڵای موهتەدی:** من ئەو ئەشکەنجانەی بەعزێك کەس لەزیندانەکانی ئێران لەم دوو سێ مانگەدا کراون، باسیانکردوە وە درکاندویانە، یان بەبۆنەی ئەم بزوتنەوەیەی سێ مانگی رابردوو خەڵکانێك باسی ئەشکەنجەو ئازارو تەعەدایەك دەکەن کەساڵانی پێشتر بەسەریانهاتووەو ئێستا دەی درکێنن، ئەوانە چەندینجار کەخۆم دەیانخوێنمەوە لەسەر سایتە ئینتەرنێتیەکان چەندجار بۆیان گریاوم، بەڵام کچەکانم پێیانوایە من قەت ناگریم.

# زۆر شیعر دەخوێنمەوە

***لەگەڵ ئەو بۆچونەی کە پێیوایە گریان ناخی ئینسان پاك ئەکاتەوە؟**

**عەبدوڵای موهتەدی:** ئا زۆرجار وایە من، جاری وایە بەشیعرێکی شاملۆ، یان هەر شاعیرێکی کورد بەهەر شاعیرێك یا بەحافز کەمن زۆر شیعر ئەخوێنمەوە لەتەنیایی خۆمدا هەر لەناڵییەوە بگرە هەتا شاعیرە نوێیەکانی ئەم سەردەمەو شێرکۆو ئێرانی و عیراقی و ئەوانە هەتا شیعری فارسیش من زۆر شیعر دەخوێنمەوە دیارە حەزمدەکرد زۆر لەوانە زیاتریش بوایە، بەڵام کەبەحاڵ کاتێکم دەبێ فەراغەتێکم دەبێ شیعر دەخوێنمەوە زۆرجار لەخوێندنەوەی شیعرەکانیشدا دەچمە ناخی شیعرەکانەوە ئینسان دڵی پردەبێ.



# شیعرم دەنووسی

***شیعریش ئەنووسی؟**

**عەبدوڵای موهتەدی:** من تا ماوەیەك بەر لەوەی ببم بەخوێندکارو قبوڵبووم لەزانکۆ، پێموایە تا ماوەیەك تا ئەو سەروبەندە تا ئەو وەختە شیعرم دەنوسی، دوای دەستم لێ هەڵگرت، واتا کەئیلتیزامەکەم بەخەباتی سیاسی زۆرتر بوو، دەستم لەشیعر هەڵگرت، پێموابوو ئەم شیعر وتنە رێگەی کارە سیاسیەکەم لێدەگرێ، ئەو دوانە پێکەوە ناکرێن سیاسەتم هەڵبژارد.

***خەون بەچییەوە ئەبینی بەردەوام؟**

**عەبدوڵای موهتەدی:** خەونەکانی خۆم، جاران خەوم زۆر لەبیردەما.

# حەزدەکەم کوردستان رزگاربێ[۷]

***ئا، ئا هەمیشە شتێك خەوی پێوە ئەبینی ئاواتتە، هیوایەتتە چییە؟**

**عەبدوڵای موهتەدی:** ئا ئەو خەونە عەفوم کە وەڵا خەون بەئازادی سیاسیەوە ئەبینم، بەراستی، بەراستی ئارەزووم ئەوەیە کوردستانی ئێران رزگاربێ، ئارەزوم ئەوەیە ئێران ئازادی سیاسی هەبێ، ئارەزووم ئەوەیە ئازادی سیاسی دامەزراوە بێ لەکۆمەڵگاداو ریشە داکوتێ کەپێویستی بەچەك هەڵگرتنەوە نەبێ، پێویستی بەتوندوتیژی نەبێ، نوسینو دیالۆگو قەڵەمو رەخنەو حزبایەتی سندوقی دەنگدانو (Meeting) میتینگو خۆپیشاندانو هەموو ئەوانەم قبوڵە، ئاواتیشم ئەوەیە من پێش ئەوەی پیرو پەككەوتە بم لەسیاسەت، نەك لەسیاسەت لەکاری حزبی دەست هەڵگرم.

# حەزم لەماڵی گەورەیە

***یەك ریز ڤێلات هەبێ و یەك قافلە سەیارەت بەدواوە بێ، ئاوا خۆشە وانییە؟**

**عەبدوڵای موهتەدی:** وەڵا یەك ریزم ناوێ، بەڵام پێخۆشە ئەگەر لەسەر زەمینی بابو پایری خۆمان مابێو هیچی لێ مابێتەوە، پێمخۆشە ماڵی گەورەم هەبێ ماڵی زۆر خۆشم هەبێ پێمخۆش نییە زۆر ئەعیانو ئیستوکراتێك بێ، بەڵام پێمخۆشە ماڵی گەورەم هەبێ باخ و بێستانی تێدابێ من



لەمنداڵیەوە لەماڵی ئاوا گەورەبووم من زۆرم لەگەڵ شوقەو ئەوانە نێوانم نییە من لەماڵی گەورەی دوو سێ حەوشەو حەساری گەورەی بووەو مەڕو ماڵاتی تێدابووە من لەوێ گەورەبووم.

# دەترسم لەمردن

***ئەترسی لەمردن؟**

**عەبدوڵای موهتەدی:** ناتوانم بڵێم ناترسم، بەڵام کابوسیشم نییە، یەك شتیش دەزانم من زۆر هەدەفم، پێم ئاسان نییە گیان لەدەستدان.

***هەمیشە ئەوەت خستوەتە بەرچاوی خۆت بکوژرێی، تیرۆرکرێی؟**

**عەبدوڵای موهتەدی:** بەڵێ، خۆ من زۆر دەمێکە هەدەفم، بەتایبەتی ئەمساڵانەی دوایی، زۆر پێموایە هەدەفم.

***باش دەربازبوونی واتا؟**

**عەبدوڵای موهتەدی:** پێموایە باش دەربازبووم وایە راستە.

***واتا لەمردن ئەترسی؟**

**عەبدوڵای موهتەدی:** بەو مەعنایەنییە، بەڵام بیرێکی لەفکری مندا هەیە، بەڵام رۆژانە نییە، دایمی نییە، دایم هەمیشە لەفکرمدا نییە، ئاواتم ئەوەیە لەبەرچاوی منداڵەکانم هیچم لێ نەیەت.

***شتێك پاڵت پێوە ئەنێ کەلەمردن نەترسی ئەو قوربانیدان و ئەو خۆشەویستییەی خەڵك و شۆڕشگێڕیتی و ئەو هەموو رەنج و ماندوو بوونەوەی کەکێشاوەتە؟**

**عەبدوڵای موهتەدی:** وایە، راستە، نامەوێ بەخەسار بچێ زۆر رەنجمداوە زۆر قوربانی دراوە، زۆر خەڵکی پاكو چاك ئارەقیان بۆ رشتووە، زۆر ئینسانی دی فرمێسکیان بۆ رشتووە، بۆ ئەو هەموو خەباتو قوربانییە بێجگە لەوە من بەڕاستی گەلی کورد بەمستەحەقی ئازادی دەزانم پێشموایە بەمستەحەقی رزگاری دەزانم بەمستەحەقی بەختەوەری دەزانم، پێشموایە دەورێکم هەیە لەوەدا نامەوێ و ناشتوانم دەستی لێهەڵگرم.

## لەبۆکان بمنێژن

***ئەگەر مردی ئەتەوێ لەکوێ بتنێژن؟**

عەبدوڵای موهتەدی: کەمردم ئەمەوێ لەبۆکان بمنێژن، جاری پێش هەموو شتێك ئامەوێ لەدەرەوەی وڵات بێ، دەمەوێ لە کوردستان بێ، من زادەی ئەو ئاو وخاکەمو پێشمخۆشە، ئەگەر مردیشم خاکی ئەو وڵاتە لەشم داپۆشێ، لەنێو کوردستانیش پێمخۆشە لەشاری بۆکان بم، من کوڕی ئەوێم.

## گەر بۆکان نەبوو لەسلێمانی بمنێژن

***ئەگەر پێش ئەوەی ئەو خەونەت نەیەتەدی کەویستت کوردستانی ئێران رزگاربێ، ئەگەر شەهید بووی لەوێ بنێژرێی، لەکوردستانی گەورە حەزەکەی لەکوێ بنێژرێی؟**

عەبدوڵای موهتەدی: ئێمە گۆڕستانمان هەیە، لەسلێمانی زۆرێك لەئازیزانی خۆمان کەگیانیان لەدەستداوە لێرە گۆڕستانمان لەکوردستانی خۆمان هەیە، پێمخۆشە لەریزی ئەو قەبرانەدابم.

***ئەتەوێ چی لەسەر بنوسرێ، شیعری کێ؟**

عەبدوڵای موهتەدی: قەت بیرم لەوە نەکردبووەو شیعرێك پەیدا ئەبێ.

## قەت خیانەتم نەکردووە

***بەڵام تەئکیدی لەوەی کەمەرگی تۆ، خەڵك خۆشەویستییەکی گەورەیان بۆ تۆ هەیە، رێزو قوربانی لەو تێکۆشانەی تۆ ئەگرن، پەنجە رائەکێشن کەئەوە عەبدوڵای موهتەدییە ئەمەش سەرمایەیەکی گەورەیە بۆئینسان؟**

عەبدوڵای موهتەدی: هیوادارم ئەوە بێتەدی، چونکە من دەمتوانی کەسێکی زۆر دەوڵەمەندو بازرگانێکی گەورەبم، نەمکردوە، دەمتوانی ئەکادیمییەکی زۆر خاوەن ناوبم نەمکردوە، دەمتوانی ژیانێکی ئاسودەم بێ، لەهەر جێیەکی ئەم ئەوروپایەوە دوای نەکەوتووم، هیچ موڵکێکم نییە، هیچ ماڵێکم نییە هیچ سەرمایەیەکی مادیم نییەو لەبەرچاویشم گرنگ نییە من هەموو ژیانی خۆم تەرخانکردوە بیارە ئاساییە پێمخۆش بی سەرمایە مەعنەوییەکەم لێ نەفەوتێ بێجگە لەوە من چل

کومله _ سازمان انقلابی زحمتکشان کردستان ایران
کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێران

Komala Party _ Iranian Kurdistan

کۆمەڵە

# دەربارەی پێویستیی پێکهێنانی بەرەیەکی کوردستانی لە ئێران

(پەسند کراوی کۆنفرانسی هەشتەمی کۆمەڵە،
پووشپەڕی ١٣٨٢، ژوئیەی ٢٠٠٣)

بەدوای لێکدانەوەیەکی هەمەلایەنەی دۆخی ئێستای ئێران و کوردستان و ناوچەکە،

بە لەبەر چاو گرتنی بەرژەوەندییەکانی کۆمەڵانی بەرینی خەڵکی کوردستان و بزووتنەوەی رزگاریخوازانەی گەلی کورد،

لەپێناو بەرەو پێش بردنی کوردستان بەرەو کۆمەڵگایەکی مەدەنیی ئازاد و پێشکەوتوو و،

هەر وەها لە پێناو بەهێز کردنی بزووتنەوەی شۆڕشگێڕانە و ئازایخوازانەی سەرتاسەریی ئێران بەدژی رژیمی کۆنەپەرستی کۆماری ئیسلامی و خزمەت بە دیمۆکراتیزە کردنی ئێرانی داهاتوو،

کۆنفرانسی هەشتەمی کۆمەڵە، بە تێکرای دەنگ پرۆژەی پێکهێنانی بەرەیەکی کوردستانی لە ئێران پەسند دەکا.

کۆنفرانس لە سەر ئەوە کۆکە کە پێکهێنانی بەرەیەکی کوردستانی، وەڵام دانەوە بە پێویستییەکی سیاسی و خەباتکارانەی بزووتنەوەی رزگاریخوازانەی گەلی کورد و رەنگدانەوەی واقیعییەتی کۆمەڵگای کوردستانە و ویست و ئارەزووی جەماوەری بەرینی خەڵك دەنوێنێ.

بەرەیەکی کوردستانی، لە روانگەی ئێمەوە، هەم بزووتنەوەی ئازادیبەخشی گەلی کورد لەپێناو مافی رەوای نەتەوەیی‌دا پتەو و بەهێز دەکا و هەم لەناوخۆی کوردستان خزمەت بە دیمۆکراتیزە کردن و چەسپاندنی شێوازی دیمۆکراتیك دەکا و زەمینە بۆ چوونە پێشی کوردستان بەرەو کۆمەڵگایەکی مەدەنیی پێشکەوتوو دەڕەخسێنێ. پێکهێنانی بەرە، دەتوانێ دروشم و داخوازییەکانی گەلی کورد لە حاست کۆماری ئیسلامی یان هەر حکوومەتێکی مەرکەزی لە داهاتوودا یەك بخاتەوە، تینێکی زۆرتر بە خەباتی جەماوەری بدا و توانای خەباتکارانەی کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان هەرچی فراوانتر بخاتە گەڕ، ئەگەری گرژی و بەگژیەکدا چوونەوەی هێزە سیاسییەکانی کوردستان کەم کاتەوە و ناکۆکییە سیاسییەکان بخاتە چوارچێوەیەکی شارستانیانە و کۆنترۆڵ کراو، قەدر و نرخی بزووتنەوەی کورد لە ئێران و کاریگەرییەکەی لە ئاستی سەراسەری ئێراندا بەرێتە سەر و کێشەی گەلی کورد و داخوازەکانی باشتر بە رای گشتیی ئێران و هێزە سیاسییەکان بناسێنێ و بیان چەسپێنێ، کێشەی کورد لە کوردستانی رۆژهەلات بەشێوەیەکی کاریگەرتر لە ئاستی ناوچەیی و نێونەتەوەیی‌دا بناسێنێ و کاری بۆ بکا و ئەو هەلەی کە لە سەردەمی

١

ئێستادا لەبەر دەم کێشەی کورد هەڵکەوتووە بەشێوەیەکی کارامەتر و کاریگەرتر بقۆزێتەوە و کەڵکی لێوەرگرێت و، ئەو بۆشاییيەی کە کاتی خۆی لە نەبوون یا کز بوونی ڕژیمی دیکتاتۆریی کۆماری ئیسلامی دێتە دی بە شێوەیەکی گونجاوتر و ڕێك و پێك تر لەپێناو بەرژەوەندی جەماوەری بەرینی گەلی کورد و قازانجی گشتیی بزووتنەوەی ئازادیخوازانەی ئێران پڕ کاتەوە.

بەرەی کوردستانی، هەوڵی تەواوی خۆی بۆ بەهێزتر کردنی خەباتی ڕەوای گەلی کورد لەپێناو نەهێشتنی ئاسەواری ستەمی نەتەوایەتی و بۆ بەدەست هێنانی مافی دیاری کردنی چارەنووس و لە پێناو بەسەرکەوتن گەیاندنی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازانەی خەڵکی کوردستان لە هەموو بووارەکاندا دەخاتە گەڕ. لە ڕوانگەی ئێمەوە لە سەردەمی ئێستادا گونجاوترین ڕێگەچارەی ئەو کێشەیە کە هەم مافە ڕەواکانی خەڵکی کوردستان بە باشترین شێوە دابین دەکا و هەم خزمەت بە دیمۆکراتیزە کردنی ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسی ئێران دەکا، ئێرانێکی فیدراتیو و کوردستانێکی فیدراڵییە. هەر بۆیەش کۆنفرانس لەو بڕوایە دایە کە پێویستە بەرەی کوردستانی ئەو دروشمە هەڵگرێت و بۆ سەلماندن و قەبڵاندنی ئەو خاڵە بە ڕای گشتیی ئێران و بە حیزب و ڕێکخراوە سیاسییەکانی ئۆپۆزیسیۆنی ئێرانی و کردنی بە بەشێك لە بەرنامەی پەسند کراوی سیاسی ئەوان و هەروەها لە داوڕۆژدا بۆ گونجاندنی لە قانوونی ئەساسیی داهاتووی ئێراندا شێلگیرانە تێبکۆشێت.

کۆنفرانس لەسەر پێویستیی بەڕەسمی ناسین و ڕێز گرتن لە فرەچەشنی و پلورالیزمی سیاسی و فەرهەنگی لە کوردستان وەکوو بەرهەمێکی گەشە کردنی کۆمەڵایەتی و سیاسی و فەرهەنگی کۆمەڵگای کوردستان و ئێران و گۆڕانکارییە جیهانییەکان، پێداگری دەکات. کۆنفرانس لەو بڕوایە دایە کە بە لەبەر چاو گرتنی ئەو فرەچەشنییە، پێویستە بەرەی کوردستانی چوارچێوەیەکی دێمۆکراتیك و ئەوڕۆیی بۆ ژیانی هاوبەش و هەلس و کەوتی هێزەکان دیاری بکات و هەموو لایەنە پێکهێنەرەکانی بەرە بڕوای تەواوی خۆیان بە ئازادیی ململانێی سیاسی شارستانیانە و هێمنانە لە نێوان حیزب و ڕێبازە سیاسییەکانی کوردستان بۆ بەدەست هێنانی ڕای گشتی، بەدوور لە دوژمنکاری و توندوتیژی، دەربڕن و ئیلتیزامی خۆیان بۆ ئەوەی کوردستانیش وەکوو هەموو کۆمەڵگایەکی پێشکەوتوو ببێتە جێگەی پێکەوە ژیانی حیزب و ڕەوتە سیاسییەکان و تەنیا پێوەر لە نێوانیاندا هەڵبژاردنی ئازادانە و دڵخوازانەی زۆرایەتی دانیشتووان بێت ڕابگەیەنن.

بەرەی کوردستانی و هەموو بەشداربووانی پێویستە بڕوای تەواوی خۆیان بە بەرینترین ئازادییە سیاسی و کۆمەڵایەتی و تاکە کەسییەکان دەربڕن و ئیلتیزامی خۆیان بۆ داکۆکی کردن و پاراستنی گشت ئازادی و مافەکانی شارۆمەندان، وەکوو ئازادیی بیروباوەر و دەربڕین، ئازادیی کۆبوونەوە و پێکهێنانی حیزب و ڕێکخراوەی سیاسی و پیشەیی و فەرهەنگی، ئازادیی چاپەمەنی و بڵاو کردنەوە و هتاد، ڕابگەیەنن.

کۆنفرانس هەروەها لەو بڕوایە دایە کە لە وەها بەرەیەکدا پێویستە هەموو لایەك لەسەر جیایی دین لە دەوڵەت کۆك بن و لەسەر ئەوە ساغ بن کە کوردستانی داوڕۆژ دەبێ کۆمەڵگایەکی مەدەنیی سێکولار بێت کە تێیدا بیروباوەڕی ئایینی کەسەکان تەنیا مەسەلەی خوسووسی خۆیانە و ئایین بەتەواوی لە دەوڵەت و لە قانوون دانان و لە دادوەری و لە خوێندنی گشتی جیاوازە.

بە بڕوای کۆنفرانس، بەرەی کوردستانی و هەموو بەشداربووانی پێویستە بڕوای تەواوی خۆیان بە ئازادیی ژنان و بەرابەریی مافی ژن و پیاو لە کۆمەڵگا دەربڕن و ئیلتیزامی خۆیان بۆ هەڵوەشاندنەوەی ناپارتایدی جنسی کە

٢

بەرهەمی نیزامی کۆنەپەرستی کۆماری ئیسلامییە رابگەیەنن. هەموو ئەو یاسایانەی کە پارێزەری کۆیلەتی و هەڵاواردن و بێمافی ژنانن و جێگە و شوێنێکی پلە دوو بۆ ژنان دیاری دەکەن، دەبێ لە کۆمەڵگای داهاتووی کوردستاندا هەڵوەشێنەوە و جێگەی خۆیان بدەن بە یاساگەلی پێشکەوتووی سەردەم کە تێیدا مافی یەکسانی هەموو شارۆمەندانی ژن و پیاو چەسپاو و پارێزراو بێت.

خەڵکی کوردستان دەیان ساڵە قوربانیی دەستی رژیمە دیکتاتۆرییەکان و بەتایبەت رژیمی کۆماری ئیسلامین و لە ریزی پێشەوەی خەبات بەدژی ئەو رژیمانەش دا بوون. جێی خۆیەتی ئێستاش بەرەی کوردستانی لەسەر پێویستیی دیموکراتیزە کردنی ئێران و کردنی بە وڵاتی ئازادی و ئاسایش و ئاشتی و ئاوەدانی پێداگری بکات و هاوپەیمانی و بەشداریی خۆی لە خەباتی سەراسەریی خەڵکی ئێران بۆ لابردنی نیزامی دیکتاتۆریی ویلایەتی فەقیە و بەدەست هێنانی ئازادی و دیموکراسی و عەداڵەتی کۆمەڵایەتی دووپات بکاتەوە.

کۆنفرانسی هەشتەمی کۆمەڵە لەسەر ئەو بنەمایانە بەتێکڕای دەنگ دروشمی "بۆ پێشەوە بەرەو پێکهێنانی بەرەیەکی کوردستانی لە ئێران" بەرز دەکاتەوە و هەموو حیزب و رێکخراو و کۆڕوکۆمەڵ و کەسایەتی سیاسی و رۆشنبیریی کوردستان، لەنێوخۆ و لە هەندەران، بانگەواز دەکا کە لەپێناوی زەمینە خۆش کردن بۆ پێکهێنانی بەرەیەکی کوردستانی فراوانی دیموکراتیکی پێشکەوتنخواز دەست بدەنە دەست یەک و هەوڵ و تێکۆشانی خۆیان بخەنە گەڕ. کۆمەڵە لەو بڕوایە دایە کە پێکهێنانی وەها بەرەیەک ئەرکی تەنیا یەک حیزب و لایەن نییە، بەڵکوو ئەرکی هەمووانە و هەر لێرەشەوە دەستی هاوکاری و پشتیوانی بۆ هەموو تێکۆشەران و دڵسۆزانی ئەو بووارە درێژ دەکا.

---

www.komala.org

Email: Komala1348@hotmail.com
Komala Office in Sulaimania:
Tel: **(0044704)3124711**
Mobile: **00447077537465**

٣



## بەرنامەی کۆمەڵە بۆ پێکهێنانی حکوومەتێکی فیدراڵ و دامەزراندنی دەسەڵاتدارەتیی خەڵك لە کوردستان

### پەسندکراوی کۆنگرەی نۆهەمی کۆمەڵە

**پێشەکی**

لە ڕوانگەی ئێمەوە، دەستەبەربوونی ماف و داخوازەکانی خەڵکی کوردستان بە شێوەیەکی شایستە و پایەدار، لەڕێگەی دامەزرانی سیستمێکی دیموکراتیکی پەیگیرەوە لە ئێران کە بن ئەملاو ئەولا و بەتەواوی مافی نەتەوەکان لە دیاریکردنی چارەنووسیاندا بەڕەسمی دەناسێ و لە دەستوور (قانوونی ئەساسی)ی خۆیدا ڕای دەگەیەنێ، ئیمکانی هەیە.

ئێمە خوازیاری پێکهاتنی ئێرانێکی فیدراتیڤ و دیموکراتیکین کە لەکۆمەڵێك حکوومەتی فیدراڵی هاوماف پێك دێ و حکوومەتی فیدراڵی ناوەندی تێیدا نوێنەری هاوبەش و هەڵبژاردەی هەموو ئەم گەل و ناوچە فیدراڵانەیە.

ئێمە لێرە دا بەرنامەی کۆمەڵە بۆ پێکهێنانی کوردستانێکی فیدراڵ ڕادەگەیەنین؛ بەرنامەیەك کە پەیوەندی لەگەڵ ئامانجەکان و ستراتیژیی گشتیی کۆمەڵە هەیە و، بەدیهاتنی لەخزمەت دیموکراتیزەکردنی ساختاری سیاسیی ئێران، پەرەپێدانی مەیدانی بەشداریی جەماوەر لە بەڕێوەبردنی کاروباری خۆیاندا و هەروەها لە خزمەت لاچوونی ستەمی نەتەوەیی لەسەر نەتەوەی کورد و دامەزرانی دیموکراسی لەکوردستاندایە.

ئێمە بۆ بەدەستهێنانی مافی دیاریکردنی چارەنووس و بەدیهێنانی ئەو ئامانجانەی لەم بەرنامەیە دا ڕاگەیەندراون، لەڕێگەی بزووتنەوەی شۆڕشگێڕانەی کۆمەلانی گەلی کوردەوە خەبات دەکەین و، جەماوەری بەرینی خەڵکی کوردستان بو بەسەرکەوتن گەیاندنی ئەم بزووتنەوەیە و بەدیهێنانی ئەم داخوازانە کۆ دەکەینەوە و ڕێکیان دەخەین. لە هەمان کاتدا ئێمە، ئەم داخوازانە بەپشت بەستن بەخەباتی جەماوەر لەهەموو حکوومەتێکی ناوەندیش داوا دەکەین.

### فەسڵی یەکەم ــ سنووری دەسەڵاتی حکوومەتی فیدراڵی کوردستان

١ــ هەرێمی فیدراڵی کوردستان، لە یەکگرتنەوەی ئازادانە و دڵخوازانەی ناوچەکوردنشینەکانی ڕۆژئاوای ئێران، کە کەوتوونەتە ناو چەند پارێزگا، لە یەکەیەکی سیاسی و ئیداریدا، پێك دێ.

٢ــ هەموو کاروباری پەیوەندیدار بە یاسادانان، دادوەری، پۆلیس، ماڵیات، ئیداری و فەرهەنگیی کوردستان لەئەستۆی حکوومەتی فیدڕاڵی کوردستانە. خەڵکی کوردستان و حکوومەتە فیدراڵەکەی، وەك هەموو ناوچە فیدراڵەکانی ئێران، لە هەمان کاتدا بەشێك لە دەزگاکانی یاسادانان و بەڕێوەبەریتی حکوومەتی فیدراتیڤی ئێران پێك دێنن.

٣ــ کاروباری پەیوەندیدار بە سیاسەتی دەرەوە، پارێزگاری بەرانبەر بە هێرشی دەرەکی، بەرنامە و سیاسەت داڕشتنی درێژماوەی ئابووریی سەراسەری و سیستمی دراوی وڵات و تۆڕی

1

پەیوەندەکانی وڵات، لە دەسەلاتی حکوومەتی فیدراتیڤی سەراسەریدایە. بەلام لە هەر کام لەم بوارانە دا بڕیارێك کە ڕاستەوخۆ پەیوەندی بە بەرژەوەندەکانی گەلی کوردەوە هەبێ، بە ڕاوێژکردن لەگەڵ حکوومەتی فیدراڵی کوردستان دەبڕێتەوە.

٤ـ پۆلیس (انتظامات)ی ناوخۆی کوردستان لە دەسەلاتی حکوومەتی فیدراڵی کوردستاندایە و هەرچەشنە ڕاگواستنێکی چەکدارانەی هێزی چەکداری حکوومەتی فیدراڵی سەراسەری لە هەرێمی فیدراڵی کوردستاندا، بە ڕەزامەندی و چاوەدێریی بەرزترین دەزگای حکوومەتی فیدراڵی کوردستان دەکرێ.

٥ـ حکوومەتی فیدراتیڤی سەراسەری هەمووساڵ بە پێی ڕێژەی دانیشتوانی کوردستان لەچاو هەموو دانیشتوانی ئێران و بە لەبەرچاوگرتنی پێویستیی قەرەبووکردنەوەی دواکەوتووییە ئابوورییەکان و بردنەسەری ئاستی گوزەران و ئاسوودەیی خەڵکی کوردستان، بەشێك لە بوودجەی وڵات بۆ کوردستان تەرخان دەکا. چۆنیەتی دابەشکردنی ئەو بوودجەیە، لە دەسەلاتی حکوومەتی فیدراڵی کوردستاندایە.

٦ـ لە دەزگا دەوڵەتییەکاندا، لە خوێندنگەکان و زانکۆکانی کوردستان و دەزگا ڕۆشنبیری و هونەرییەکان و لە دەزگاکانی ڕاگەیاندندا زمانی کوردی وەك زمانی ڕەسمی بەکار دەبرێ. زمانی فارسیش لە کوردستان زمانێکی ڕەسمییە و لە خوێندنگەکان دەخوێندرێ. زمانی ڕەسمیی نامەگۆڕینەوە و پەیوەندیگرتن لەگەڵ حکوومەتی فیدراڵی سەراسەری، زمانی فارسییە.

## فەسڵی دووهەم ـ سەرخەتەکانی بەرنامەی حکوومەتی فیدراڵی کوردستان

سەرخەتەکانی سیاسەت و بەرنامەی کاری حکوومەتی فیدراڵی کوردستان بریتین لە:

١ـ جیایی دین لەدەوڵەت؛ دین بە مەسەلەی خوسووسیی کەسەکان دادەنرێ و، هەرکەس ئازادە هەر دینێکی هەبێ یان هیچ دینێکی نەبێ؛ ئازادیی هەموو دینەکان و ئازادیی پەیرەوانی دینە جۆراوجۆرەکان لە بەڕێوەبردنی ڕێ و ڕەسمە دینییەکانی خۆیاندا.

٢ـ یەکسانیی مافی ژن و پیاو لە هەموو بوارێکی ئابووری و کۆمەلایەتی و سیاسیدا و دانانی یاسا و ڕێسای وا کە هەموو ئەو نابەرابەرییانەی هەن هەڵوەشێنێتەوە و لەژیان و فەرهەنگی کۆمەڵیان بسڕێتەوە.

٣ـ هەڵبژاردەبوونی دەزگاکانی بەڕێوەبەری و کاربەدەستان.

٤ـ زەمانەت کردنی ئازادیی تەواوی بیروباوەڕ، دەربڕین و چاپەمەنی و هەڵسووڕانی سیاسی؛ ئازادیی تەواوی ڕێکخراوەکان و حیزبەکان و کۆڕوکۆمەڵە ئەدەبی و هونەری و پیشەییەکان؛ ئازادیی تەواوی سەندیکاکان و شووڕا کرێکارییەکان و هەڵسووڕانی پیشەیی و سیاسییان.

٥ـ هەوڵدان بۆ پەرەپێدانی عەدالەتی کۆمەلایەتی و کەمکردنەوەی مەینەت و بێبەشییەکانی جەماوەری کرێکار و زەحمەتکێش و دابینکردنی پێویستییە سەرەکییەکانی لەشساغی و خوێندن و تەئمینی کۆمەلایەتی.

2

٦ــ بەڕێوەبردنی گرنگترین و سەرەتاییترین داخوازەکرێکارییەکان، وەك دیاریکردنی لانی کەمی حەقدەستی کرێکاران بە پێی ئاستی گرانی وپێویستییەکانی بژێوی خانەوادە کرێکارییەکان. دامەزراندنی سیستمێکی تەئمینی کۆمەڵایەتی و بیمەی بێکاری.

٧ــ پێکهێنانی سیستمێکی ماڵیاتی بە پێی رادەی داهات، بۆ دەستەبەرکردنی بەشداریی بە پێی توانای کەسەکان لە دامەزراندن و پەرەپێدانی تەئمینەکۆمەڵایەتییەکان وخزمەتگوزارییەکانی بواری ئاسوودەیی گشتیدا.

٨ــ خوێندنی بێ خەرج و بەزۆری هەتا کۆتایی تەمەنی ١٦ ساڵی. دامەزراندنی سیستمێکی خوێندن و پەروەردەی زانستی و پێشکەوتوو کە بە بێ هەڵاواردن لەدەسڕەسی هەموولاندا بێ. بنەبڕکردنی نەخوێندەواری لە ڕێگەی بەڕێوەبردنی پەیگیرانە و خێرای پرۆژەی خوێندەوارکردنی گەورەساڵانەوە.

٩ــ پاراستن و باشکردنی ژینگە؛ پاراستنی دارستانەکان و ئاو و سەرچاوە تەبیعییەکان و دروستکەڵك لێ وەرگرتنیان لەپێناو ئاوەدانی و ئاسوودەیی گشتیدا.

١٠ــ پەرەپێدان و گەشەپێدانی فەرهەنگ و هونەر، ڕۆژنامەکان، کتێبخانەگشتییەکان و دانانی ڕێگاو شوێنێك کە دەسکەوتەکانی تکنۆلۆژی و زانست و پەیوەندەکان لە دەسڕەسی لاوان و کۆمەڵانی خەڵکدا بن.

١١ــ خەبات لەدژی هۆکارەکانی گیرۆدەیی بەماددەسڕکەرەکان، پێکهێنانی دەرفەت وپێویستییەکانی وچاندان، وەرزش، کارفێربوون و پەروەردەبوون بۆ تازەلاوان و لاوانی کوردستان.

١٢ــ پەرەپێدانی ڕۆحی برایەتی و پێکەوەژیان لەگەڵ گەلانی دیکەی ئێران، دابینکردنی مافەکانی هەموو کەمایەتییە نەتەوەیی و فەرهەنگییەکان لەکوردستان.

3

## سەبارەت بە بزووتنەوەی نوێی ڕۆشنبیری لە کوردستان

### پەسندکراوی کۆنگرەی نۆهەمی کۆمەڵە
### پووشپەڕ ـ گەلاوێژی ۱۳۸۰

کوردستانی ئێران لەم ساڵانەی دوایی دا بزووتنەوەیەکی ڕۆشنبیریی بێ وێنەی بەخۆیەوە دیوە. ئەم بزووتنەوە ڕۆشنبیری یە مۆرکی ئەو ئاڵوگۆڕە فیکری و ڕۆشنبیری یەی پێوەیە کە لە سەراسەری ئێران سەری هەڵداوە و، لە هەمان کاتدا ڕەگی لە تایبەتمەندیەکانی کوردستاندایە وەك کومەڵگایەکی زۆرلێکراو و، ئەنجامی ڕەوتێکی وەخەبەرهاتن و خۆناسینە لە فەرهەنگی نەتەوەیی گەلی کورد دا.

ئەو ئاڵوگۆڕە ڕۆشنبیری یە کە لە دەساڵی ڕابوردوو دا لە بەرینایی مەیدانی ڕۆشنبیریی ئێرانی دا لە ناوخۆی ئێران سەری هەڵداوە و، شکانی دەسەلاتی چەمك و گوتارەکانی کۆنەپەرستیی بەردینی ئایینی، سەرەڕای هەموو کۆسپە دەوڵەتی و ڕەسمی یەکان، تا ڕادەیەك بووەتە هۆی گەشە و هەڵدانی فیکری و فەرهەنگیی کۆمەڵگای ئێران و بە ڕادەیەکی دیاریکراو ڕێگای کردوەتەوە بۆ هەمەچەشنیی فەرهەنگی. لەم ڕێڕەوە دا، ڕەوتی فیکری و فەرهەنگیی جۆراوجۆر، تاڕادەیەك دەرفەتی خۆدەرخستنیان بۆ ڕەخساوە. ئەم ئاڵوگۆڕە، گۆڕەپانی ڕۆشنبیریی کوردستانیشی گرتوەتەوە و شەقامە فیکری و فەرهەنگی یەکانی کوردستانیش جووڵەی گۆڕانیان تێ کەوتوە. ڕۆشنبیرانی کوردستانی ئێران، چ لە ڕێگەی پەرەگرتنی پەیوەندە جیهانی یەکان و تێکەلاوبوونی ڕاستەوخۆوە و چ لە ڕێگەی بەرهەمەکانی نووسەرانی ئێرانی و وەرگێڕدراوی بەرهەمەکانی نووسەرانی دەرەوەی ئێرانەوە، کەوتوونەتە بەر کاریگەریی شەپۆلە فیکری یەکانی جیهانی هاوچەرخ.

لە لایەکی دیکەوە، پەرەگرتنی بەرچاوی خوێندنەوە و نووسین بە زمانی کوردی و پەرەگرتنی عەلاقەمەندی بە ئەدەبیاتی کوردی، سەرەڕای هەموو کۆسپ و بەربەست و قەدەغەکانی سەر ڕێگای ئەم ڕەوتە و سەرەڕای نەبوونی دەرفەتی خوێندن بە زمانی کوردی، هەروەها گەشەکردنی ئەدەبیاتی کوردی بە تایبەت لە دەرەوەی سنووری شیعر، لە چیرۆك و ڕۆمانەوە بگرە هەتا ڕەخنەی ئەدەبی و توێژینەوەی کۆمەلایەتی، گەشەکردنی باسەکانی پەیوەندیدار بە لێکۆڵینەوە و مێژوو سەرەڕای کۆسپەکانی سەر ڕێگای، پەرەگرتنی بەرینایی ئەم بزووتنەوە ڕۆشنبیری یە و پەل هاویشتنی بۆ هەندێك ناوچەی کوردستان کە جاران لەم بوارە دا چالاکی یەکی

۱

وایان نەبوو، ساغ بوونەوەی هەرچی زیاتری زمانێکی یەکگرتوو کە لە هەموو ناوچەکان بەرهەمی ئەدەبیی پێ دەنووسرێ، پێکهاتنی پەیوەندێکی ڕۆشنبیریی بەرینتر لە گەلٌ بەشەکانی دیکەی کوردستان لە وڵاتانی دیکە بە جۆرێك کە لە ئاستێکی بەرینتر دا ئەدەب و ڕۆشنبیریی ئەم بەشانە کار دەکەنە سەر یەکتر، ئەمانە هەموویان لایەنی دیکەی ئەو بزووتنەوە ڕۆشنبیری یە نوێیەی کوردستان نیشان دەدەن.

کۆنگرەی نۆهەمی کۆمەڵە ئەم بزووتنەوە ڕۆشنبیری یە بە گرینگ و بایەخدار دەزانێ و لەسەر ئەو بڕوایەیە کە لە درێژخایەن دا ئەنجامی شایستەی لێ دەکەوێتەوە و سەرجەمی کۆمەڵگای کوردستان بەرەوپێش دەبا، وشیاریی گشتی و ئاستی ڕۆشنبیریی گشتی بەرزتر دەکاتەوە و، کەوابوو سەرەڕای سانسۆر و بەربەستەکانی سەر ڕێگای، زەمینەیەکی گونجاو بۆ پەرەگرتنی فەرهەنگی پێشڕەو و ئازادیخوازانە پێك دێنێ و، دەتوانێ یارمەتیدەر بێ بۆ پێکهاتنی کۆمەڵگایەکی سێکولار و پاشەکشەپێکردن و هەڵچنینی ئەم دۆخەی ئێستا، کە مەرجی هەرەگرینگی گەشەی ڕاستەقینەی فەرهەنگی یە لە کۆمەڵگای کوردستان دا.

ئەم بزووتنەوە ڕۆشنبیری یە لە هەمان کات دا فرەچەشنە و، ڕەوتی ناوخۆیی جۆراوجۆری گرتۆتە خۆی. کۆمەڵە و هەموو ڕێبازی سۆسیالیستی لە کوردستان و ئێران پێویستە وێڕای پشتگیری و بەهێزکردنی ئەم جمو‌جوولە فەرهەنگی یە، هەوڵ بدەن کە ئەم بزووتنەوەیە لە لایەك بە شێوەیەکی پتەوتر لە پێویستی یەکانی کۆمەڵانی کرێکار و زەحمەتکێش هەڵپێکرێ، نەبێتە بزووتنەوەیەکی تەرێك و لاکەوتە بەڵکوو لە گەلٌ ژیانی ڕۆژانە و پێویستی یەکان و خەباتی خەڵك تێکەلٌ بێ و، لە لایەکی دیکەوە لە باری ناوەرۆکیشەوە هەرچی زیاتر بەرەو فەرهەنگێکی پێشڕەو و ئازادیخواز و نوێخواز، لایەنگری ئازادیی ژن، لایەنگری دادپەروەریی کۆمەڵایەتی و، بە کورتی بەرەو فەرهەنگێکی سۆسیالیستی بچێ.

لە بواری کردەوە دا، کۆمەڵە لە هەموو هەوڵ و هەنگاوێك بەرەو لێك نزیك بوونەوە و هاوکاری و لە دەوری یەك کۆبوونەوەی پیشەیی هونەرمەندان و نووسەران و قەڵەم بەدەستانی کوردستان و لە پێکهێنانی ئەو بنکە و ڕێکخراوانە کە بتوانن لە ئاستی کوردستان دا خزمەت بە پەرەگرتنی ڕۆشنبیری بکەن و پشتیوانی لە داوا فەرهەنگی و پیشەیی یەکانیان بکەن، پشتیوانی دەکا و وێڕای ئەوەی بە چاوی ڕێز و بایەخ پێدانەوە دەڕوانێتە چالاکی یە فەرهەنگی یە محەلی یەکان لە هەرکام لە شارەکان و گرینگی و بایەخی کارەکەیانی لەبەرچاوە، لەسەر ئەو بڕوایە یە کە کاتی ئەوە هاتوە کە هەڵسووڕاوانی فەرهەنگی چالاکی یەکانی خۆیان، لەوانە هەوڵدان بۆ پێکهێنانی سەندیکا و ئەنجومەن و بنکەی پیشەیی خۆیان لە ئاستی کوردستان دا بەرەوپێش بەرن و ئەم داوایە، کە داوایەکی تەواو ڕەوا و بەجێ یە، بە هێزی هەڵسووڕان و دەسپێشخەری و

٢



هەوڵی خۆیان و بە پشتیوانیی گشتیی خەڵك، بەدی بێنن.

هەروەها هەڵسووڕاوانی بواری ڕۆشنبیری پێویستە هەوڵ بدەن بۆ بڵاوکردنەوەی گۆڤار و چاپەمەنی و ڕۆژنامەی سەربەخۆ کە بتوانن زانیاری و هەواڵی دروست بگەیەننە دانیشتوانی کوردستان و لەهەمان کاتدا تریبوونی بیروڕای گشتیی وشیاری کوردستان و مەیدانی گەشەی زمان و فەرهەنگ و ئەدەبی کوردی بن. ئەگەرچی چاپەمەنی و ڕۆژنامە سەربەخۆکان لە تارانیش لە ژێر گوشار و هەڕەشە دان بەڵام لەم زەمینەیە دا بێ مافییەکی ئاشکرا بەسەر کوردستان دا سەپێندراوە و هەر ئەو دەرفەت و ئیمکانە کەم وکورتەش بە کوردستان ڕەوا نەبیندراوە. ئەم بێ مافی و سانسورە دەبێ بە دەسپێشخەری و بەدواداچوون و هاوکاریی بەرینی ڕووناکبیرانی کوردستان پاشەکشەی پێ بکرێ و پێکهێنانی چاپەمەنیی ئازاد و سەربەخۆی کوردی ببێتە داوایەکی گشتی.

هونەرمەندان و لاوانی هۆگری بوارەهونەرییەکان پێویستە بە شێوەیەکی بەرین دەست بدەنە پێکهێنانی تیپی مۆسیقا، هەڵپەڕکێ، شانۆ و هی دیکە، کە بە کەڵك وەرگرتن لە ئەزموونی وڵاتانی جۆراوجۆر بە شێوەی جەماوەری و بە کەمترین ئیمکانات بتوانن لەگەڵ جەماوەری بەرینی خەڵك و لاوان پەیوەند پێك بێنن، بە جۆرێك کە سەرنج و عەلاقەمەندیی گشتی بەرەو ئەم بوارانە ڕاکێشن و خزمەت بە پەرەگرتنی هونەر و بەرزبوونەوەی ئاستی هونەر بکەن، پەیامی خۆیان بگەیەننە خەڵك و لە هەمان کاتدا هەوڵ بدەن چالاکییەکانی خۆیان بەرنە ناو لاوان و کارێك بکەن کە لاوان هەرچی زیاتر هۆگری ئەم بوارە بەکەڵکانەی هەڵسووڕان بن.

کونگرەی نۆهەمی کومەڵە وێڕای ئەوەی سەر لەنوێ ڕادەگەیەنێ کە پشتیوانی دەکا لەم وەخەبەرهاتن و جموجوولە فەرهەنگییە نوێیە لە کوردستان و، وێڕای ئەوەی لەمپەری سانسۆر و ئەو کوسپە سیاسییانەشی لەبەرچاوە کە زمانێکی تایبەت بەسەر بەرهەمی ڕوشنبیران و نووسەران دا دەسەپێنن، داوا لە هەموو ڕووناکبیران و هونەرمەندان و نووسەرانی پێشڕەوی کوردستان دەکا کە هەڵسووڕانی خۆیان لەم بوارە دا پەرە پێ بدەن.

٣



## سەبارەت بە
## پێویستیی گۆڕانی ساختاری سیاسیی ئێران بۆ وڵاتێکی فیدراتیڤ

### پەسندکراوی کونگرە ی نۆهەمی کۆمەڵە
### پووشپەڕ ـ گەلاوێژی ۱۳۸۰

لەبەر ئەوەی ئێران وڵاتێکی یەك چەشنی تاك نەتەوەیی نیە بەڵکوو وڵاتێکی زۆر بەرینە بە ژمارەیەکی زۆری دانیشتوانەوە، کە چەندین نەتەوە، زمان، فەرهەنگ و هەلومەرجی ئیقلیمی جۆراوجۆری گرتوەتە خۆی و ناوچە جۆراوجۆرەکانی ئەو وڵاتە لە باری پێش کەوتنی ئابووری و کۆمەڵایەتی یەوە لە ئاستی جیاواز دان و، ئەوە ڕاستی یەکە کە لە بەرین بوون و هەمەچەشن بوونی ئیمپراتۆری یەکانی کۆن و سەدەکانی ناوەڕاستی ئەم وڵاتەوە سەرچاوەی گرتوە،

لەبەر ئەوەی دەوڵەتی هاوچەرخی ئێران، کە لە سەردەمی ڕەزاشا و دامەزرانی دەسەڵاتی بنەماڵەی پەهلەوی یەوە لە ئێران هاتوەتە ئاراوە، لەسەر بنەمای کۆکردنەوەی دەسەڵات لە ناوەند و لەسەر بناغەی حاشالێ‌کردن و پێشێل‌کردنی ئەم هەمەچەشنی یە و، بە شێوەی دیاریکراو لە سەر بنەمای ستەمی نەتەوایەتی دامەزراوە و لە هەشتاساڵی ڕابوردوو دا، چ لە سەردەمی پاشایەتی دا و چ لە سەردەمی دەسەڵاتی هێزی دینی دا، لە کردەوە دا قەڵای زۆرداری و کۆنەپەرستی بووە بەرانبەر بە هەموو بزووتنەوەیەکی ئازادیخوازانە،

لەبەر ئەوەی بەرژەوەندەکانی دیموکراسی و دابین‌کردنی بەشداریی جەماوەری خەڵك لە بەڕێوەبردنی وڵات دا و دیموکراتیزە کردنی ساختاری سیاسیی ئێران، ئەوە دەخوازێ کە ئەو ساختارەی بەڕێوە بردنی وڵات کە تێیدا هەموو دەسەڵات لە ناوەند کۆ کراوەتەوە بگۆڕدرێ و ناوچە و مەڵبەندە جۆراوجۆرەکانی وڵات دەسەڵاتیان پێ بدرێ،

لەبەر ئەوەی گەلانی جۆراوجۆری دانیشتووی ئێران دەیان ساڵە لە ژێر چەپۆکی ستەم و هەڵاواردنی نەتەوەیی دان و مافەکانیان پێشێل دەکرێ، بەڕەسمی‌ناسینی مافی ئەو گەلانە و دانانی ڕێگاوشوێنێك کە ئەم مافانە بە شێوەی یاسایی زەمانەت بکرێن و ئەم هەڵاواردن و نابەرابەری‌یانە کۆتایی‌یان پێ بهێندرێ، دەبێتە هۆی ئەوە کە هەموو خەڵکی ئێران خۆیان بە پارێزراو بزانن و لە ناویاندا هەستی هاوچارەنووسی بەرز

١



دەکاتەوە و هەر بەم بۆنەیەوە دەبێتە هۆی بەهێزبوونی پەیوەندی برایانە و بەهرەمەندی لە مافی یەکسان و لاوازبوونی زەمینەی کینە و دژمنایەتی ی نەتەوەیی و قەومی.

لەبەر ئەوەی گەلی کورد لە کوردستانی ئێران لە دەیان ساڵ لەوە پێشەوە داواکاری نەمانی ستەمی نەتەوەیی و بەهرەمەندی لە مافە نەتەوەیی یەکانی خۆی بووە و بەتایبەت لە کاتی هاتنە سەر کاری کۆماری ئیسلامی ی ئێرانەوە، دەورەیەکی نوێی خەباتی ئازادیخوازانەی دیموکراتیك و نەتەوەیی ی دەست پێکردوە کە تا ئێستا درێژەی هەیە و زیاتر لە بیست ساڵە لە ژێر سەرکوت، زیندان و شکەنجە، دوورخستنەوە و کوچ پێکردن، لەشکرکیشی و داگیرکردنی چەکدارانە، بێ مافی و هەلاواردن لە بواری خوێندن، ئابووری، ئیداری و کارپێسپاردن و، لە بواری ڕۆشنبیری و فەرهەنگی دایە و، هەر بۆیە پێویستە لە وڵاتی ئێران دا جێگاوشوێن و زەمانەتێکی یاسایی و سیاسی و ئیداری ی دیاریکراوی لە بابەت بەڕێوەبردنی ناوچە کوردنشینەکان پێ بدری کە لە بەرانبەر ئەم ستەمگەری و هەلاواردنانە دا بیپارێزێ و داخوازە بنەڕەتی یەکەی وەدی بێنێ کە بریتی یە لە دابین بوونی دەسەلاتدارەتی ی خەڵکی کوردستان.

لەبەر ئەوەی حکوومەتی سۆسیالیستی ی داهاتووی ئێرانیش تەنیا دەتوانی بە یەکسانی ی مافی نەتەوەکان و پێکەوەژیانی برایانە و دڵخوازانەیان پشت ئەستوور بێ و ئێرانێکی فیدراتیڤ زەمانەتێکی وەدیهاتنی ئەو هەلومەرجەیە،

لەبەر هەموو ئەمانە، ئێمە بەڕێوەبردنی ئێران بە شێوەی فیدراسیۆنێکی دیموکراتیك لە پێناو نەهێشتنی هەلاواردنی نەتەوەیی و دابین کردنی یەکسانی ی مافی گەلان و دەستەبەرکردنی پێکەوەژیان و هاوپشتی ی گەلانی دانیشتووی ئێران و هەروەها دەستەبەرکردنی دیموکراسی و بەشداری ی جەماوەری خەڵك لە بەڕێوەبردنی کاروباری خۆیان دا، بە شێوەیەکی گونجاو بۆ ساختاری سیاسی ی ئێران دەزانین و هەوڵدان بۆ وەدیهاتنی دەخەینە بەرنامەی خۆمانەوە.

٢



## گوزارشی کۆمیتەی ناوەندی بە کۆنگرەی نۆهەمی کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێران

هاورێیان، من لە لایەن کۆمیتەی ناوەندیی کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێران، هەڵبژێردراوی کۆنفرانسی ساغ کردنەوەی کۆمەڵەوە پێم سپێردراوە کە گوزارشی سیاسی پێشکەشی ئێوە بەرێزانی بەشداربوو لە کۆنگرەی نۆهەمدا بکەم.

پێشەکی دەبێ روونی بکەمەوە کە مەبەستی ئیمە لێرەدا، پێشکەش کردنی گوزارشێکی ئاماری لە بووارە جۆربەجۆرەکانی هەڵسووڕانی سیاسی و تەشکیلاتی رێکخراوی خۆمان لە یەك ساڵی رابوردوودا نییە. ئەوەش بەجێگای خۆی کارێکی پێویستە، بەڵام ئێمە بە لەبەر چاو گرتنی هەموو هەل و مەرجێك کە لە یەك دوو مانگی رابوردوو تێیدا بەسەرمان دەبرد، وە لەوانە بە لەبەر چاو گرتنی کەمی وەخت و زۆری خاڵەکانی دەستووری جەلەسەی ئەم کۆنگرەیە، بەم ئەتیجەیە گەیشتین کە وەها گوزارشێکی ئاماری بۆ ئەم جارەمان ناتوانێ لە ئەولەوییەت دا بێ و وەختێکی ئەوتۆی بۆ تەرخان بکەین، بەڵکوو پێش هەموو شتێك پێویستیمان بە لێکدانەوەیەکی سیاسی لە هەل و مەرجی یەکساڵەی کار کردنی خۆمان، لەو کاتەوە کە کۆنفرانسی ساغ کردنەوە گیرا تا ئێستا، وە روون کردنەوەی ئاسۆی داهاتووی کارمان هەیە. بە بەیانێکی دیکە، لێکدانەوەی دەسکەوتەکانمان لە دەورەی رابوردوو و ئەو کەم و کووری و ناتەواوییانەی کە هێشتا نەمان توانیوە چارەسەری بکەین لەم دەورەیەدا، لە گەڵ سەرخەتێکی سیاسەتەکانی دەورەی داهاتوومان. کۆبەندییەکی وەها، مەبەستی ئەم گوزارشەیە. ویستم پێشەکی بەئاگاداریتان بگەیەنم کە ئەم گوزارشەی ئێستامان بەو دیدەوە و بەو مەبەستەوە پێشکەش دەکرێ و ئەگەر سەرکەوتوو بێ دەبێ بەو ئامانجانە بگات.

با ئەوەش زیاد بکەم کە جێگەی خۆی بوو ئەم گوزارشە، وەکوو باقی بەڵگەنامەکانی دیکەی ئەم کۆنگرەیە، پێشتر بەنووسراوە لە ئیختیار ئێوە بەشداربووانی کۆنگرە و چاودێران و میوانان سەرجەم دابندرێ، بەڵام ئەرکی زۆر و ماوەی کەم و ئەوەی کە کۆمیتەی ناوەندی نەی توانی لەوە زووتر و بۆ ماوەیەکی زیاتر بەشێوەیەکی چڕوپڕ لە کوردستان بۆ ئامادەکاریی کۆنگرە لەگەڵ یەکتری کۆبێتەوە، نەی هێشت ئەم کارە بەتەاوی بەئەنجام بگەیەندرێ.



خاڵەکانی ئەم گوزارشەی وا پێشکەشتان دەکرێ، لە کۆمیتەی ناوەندیی کۆمەڵەدا باس کراوە و هاوبیریی گشتیی لەسەرە، بەلام چونکە هەموو وردەکاری‌یەکانی ئەم وتارە نەخراوەتە سەر کاغەز، ئەگەر کەم و کورتی و ناتەواوی تێدا بێ، من دەیگرمە ئەستۆ. لە هەر حاڵدا هیوادارێشم وتارەکەی من بە باس و پێشنیارەکانی ئێوە دەوڵەمەند بکرێت.

هاورێیان! یەك ساڵ بەسەر ساغ کردنەوەی کۆمەڵەدا تێپەڕ دەبێت، یەك ساڵ بەسەر ئەو رۆژە هەیەجاناوی و پڕ لە رووداوانە تێپەر دەبێ کە هەموو رێکخراوی کۆمەڵە و حیزبی کۆمۆنیستی ئێران و تەیفی کۆمەڵە و بەشێکی بەرچاو لە چەپی ئێران و خەڵکی کوردستانی بەخۆیەوە مەشغووڵ کردبوو و ئاکامەکەشی بەستنی کۆنفرانسی ساغ کردنەوە بوو. کێشەی ناوخۆیی لەناو حیزبی کۆمۆنیستی ئێران، بلاو بوونەوەی ئەو دەنگوباسە کە پرۆژەیەك وەکوو پرۆژەی ساغ کردنەوەی کۆمەڵە لەناو ئەو حیزبە لەئارا دایە، دواتریش بلاو بوونەوەی بریارنامەکان و سەرەنجام بەستنی کۆنفرانسی ساغ کردنەوەی کۆمەڵە و، مسۆگەر بوونی ئەو حەقیقەتە کە ئەو رێکخراوە ناسراوە سەرەنجام لە حیزبی کۆمۆنیستی ئێران هاتۆتە دەر، وەکوو تەقینەوەیەکی سیاسی وابوو، زۆر جار بەناوی بوومەلەرزەیەکی سیاسی ناومان لێبردووە، پێم وانی‌یە زێدەرۆیی‌مان کردبێ. ئەم رووداوە سەرنجی زۆر کەسی راکێشا، دوژمنان بەتەمای لەت لەت بوونی کۆمەڵە و تەنانەت تێکهەڵچوونی چەکدارانەی باڵەکانی بوون، کە رێگای بۆ فەوتانی خۆش دەکرد، دۆستان و دڵسوزان بە هەستێکی تێکەلاو لە خۆشحاڵی و نیگەرانی خەو و خۆراکیان لە خۆیان حەرام کردبوو و شەو و رۆژ بەدوای ئاکامی ئەو ململانێ‌یەدا بوون. بەم حیسابە، یەکەم دەسکەوتی ساغ کردنەوەی کۆمەڵە هەر لە خودی راگەیاندنی ساغ کردنەوەکەی دابوو و لە رۆژانی یەکەمەوە خۆی نیشان دا، ئەویش ئەوەی کە هاتنە دەری کۆمەڵە لە حیزبی کۆمۆنیستی ئێران جارێکی دیکە بەفراوانی کۆمەڵەی لە کۆمەڵگای کوردستان و تا رادەیەکی بەرچاو لەناو چەپی ئێران و لە هەموو ناوچەکە هێنایەوە نێو نێوان.

با ئەوە بڵێم کە بە شوێن جیایی‌یەکانی سەرەتای ساڵی ئەوەتی زایینی‌دا، ئەوکاتیش ئێمە جۆرێك لە ساغ کردنەوەی کۆمەڵەمان تێپەر کرد. دوای بەسەرهاتەکانی ئەوکاتی کۆمەڵە و دوای زەعیف بوون و لەکیس چوونێکی زۆری هێزی ئینسانی و ئاڵۆزی و چەواشە بوونێکی فیکری ئێگجار زۆر کە ئەو سەردەمە بەسەر ئەو رێکخراوەدا کە بەناوی حیزبی کۆمۆنیستی ئێراندا مابووەوە زاڵ بوو، بە هەوڵ و هیممەتی ژمارەیەك لە هاورێیان "بازسازی" و ساغ کردنەوەیەکی کۆمەڵە بەرێوە چوو. ئەویش بەجێگای خۆی ئەهمیەتی بوو، دەبێ قەدری ئەو



زەحمەتانە بناسرێ و ڕێزی لێبگیرێ، بەڵام ساغ کردنەوەی ئەوکات مەحدوودییەتێکی بنەڕەتی هەبوو و لەو بەرتەسکی‌یە ڕەنجی دەبرد، ئەویش ئەوە بوو کە لەچوارچێوەی تەسکی ساغ کردنەوەیەکی ئۆرگانی و ڕێکخراوەیی، ئەویش لە قاڵبی حیزبی کۆمۆنیستی ئێراندا، تێپەڕ نەبوو. هەرگیز نەیتوانی سەرلەنوێ بنەما فیکری و ئەزەری و سیاسی‌یەکان وەها ساغ کاتەوە کە مەیدانی تێکۆشانێکی بەرین بۆ هێزی ڕادیکاڵ و سۆسیالیست لە کوردستان و لە ناوچەکە بکاتەوە، هەرگیز نەیتوانی ئەو قاڵب و قەوارە فیکری و سیاسی و ڕێکخراوەیی‌یە کە میراتی جەرەیانێکی لادەر لە خەتی مارکسیزم و لادەر لە پێشینەی بەنرخ و شۆڕشگێڕانەی کۆمەڵە بوو، لەسەر خۆی لابا، نەیتوانی دەست بۆ ڕیشەی کێشەکە بەرێ و لە خۆساغ کردنەوەیەکی فیکری و سیاسی‌دا بەسەر ئەزموونی ناسەرکەوتووی حیزبی کۆمۆنیستی ئێراندا زاڵ بێ، نەیتوانی تووی ناکۆکی‌یە فیکری‌یەکانی نێوخۆی دەربهاوێ و بە ڕێبازێکی تازە و بە ڕواڵەتێکی تازەوە بێتەوە مەیدان. بۆیە، سەرەرای ئەو هەوڵ و تێکۆشانە، جارێکی دیش لەناو چەنبەرە و قەف قەفی زنجیری ئەو میرات و قاڵبەدا قەتیس مایەوە و نەشیتوانی ڕەوتی ڕووەو کزی و ڕکودی خۆی کۆتایی پێ بێنێ و بکەوێتە سەر ئەو ڕێبازی گەشە کردنەی کەوا لە ساڵی ڕابوردووەوە دەروازەکەی بەرەو ئێمە کراوەتەوە.

بەڵام ساغ کردنەوەی ئەم جارەی کۆمەڵە بەفراوانی لەشار و دێهاتی کوردستان دەنگی دایەوە، چووە قووڵایی کۆمەڵگای کوردستانەوە، چووە ناو هەموو تەیفی کۆمەڵەوە، چووە ناو خەباتکارانی سیاسی‌یەوە، چووە ناو کۆڕو کۆمەڵە کرێکاری‌یەکان، چووە ناو ڕووناکبیرانی کوردستان، چووە زانستگاکانی کوردستان، چووە ناو بنەماڵەکان، گەڕەکەکان، خانەوادەی شەهیدان، بنەماڵەی زیندانی‌یە سیاسی‌یەکان، مامۆستایان، خوێندکاران، چووە ناو هەموو ئەو کەسانەی کە بە ئەوعێك خوازیاری شتێکی نوێ بوون لە کوردستان، بۆشایی‌یەکی گەورەیان هەست پێدەکرد و، لە قووڵایی دڵی خۆیاندا هیوا و ئارەزوویان ئەوە بوو کە جەرەیانێکی وەکوو کۆمەڵە سەرهەڵداتەوە. هەموو ئەوانە بە ساغ بوونەوەی کۆمەڵە گەشانەوە.

هەڵبەت زۆر کەسیش پێی نیگەران بوون. نابێ ئەوە بشارینەوە کە بەهۆی کەم بڵاو بوونەوەی باسەکانی ئێمە پێش کۆنفرانس، بەهۆی ئەوەی کە ئێمە ئیمکاناتی ڕێکخراوەیی و تەبلیغاتیمان بۆ ئەو بڵاو کردنەوە بەرینە نەبوو، ئیمکاناتی ماڵیمان نەبوو، ڕادیۆ و تشریات بەدەست ئێمە نەبوو، تەشکیلاتی شارەکان بەدەست ئێمە نەبوو و لەسەرەتادا هەڵسووڕاوان و لایەنگرانی کۆمەڵە لە کوردستان هێشتا ئەو پەیوەندە شیاوەیان لەگەڵ خەتی ساغ کردنەوەی کۆمەڵە نەبوو، وە بەهۆی ئەوەش کە کۆمەڵە بەگشتی پەیوەندی لەگەڵ خەڵك لەکوردستاندا

زەعیف ببوو، وە هەروەها بەهۆی تەبلیغاتێکی ژەهراوی و چەواشەکارانە کە نەیارانی ساغ کردنەوەی کۆمەڵە لە ساڵێك پێشترەوە لەبنەوە و بەئاشکرا بەدژی ئێمە کردبوویان و دەیان کرد و ئێمەش سەرەتا رادیۆمان نەبوو کە راستییەکان بۆ خەڵك روون بکەینەوە، بەهۆی گشت ئەمانەوە ئەلبەتە نیگەرانیش لە ریزەکانی کرێکارانی وشیار و لە ریزەکانی هەڵسووراوان و دۆستان و دڵسۆزانی کۆمەڵە و تێکۆشەرانی سیاسی چەپ و شۆڕشگێر لە کوردستاندا بەفراوانی وجوودی هەبوو. هەبوو کە بە بیستنی ئەو خەبەرە، بەتایبەت بەو نەوعە تەبلیغاتە ژەهراوییەوە کە رەهبەرانی حیزبی کۆمۆنیستی ئێران دەیان کرد، بەندی دڵی دەپسا. بەڵام زۆری پێنەچوو کە ئەم رەوتە ورنە ورنە هەڵگەڕایەوە، وەرەق هەڵگەڕایەوە، راستییەکان بۆ خەڵکی دەرکەوتن، وە بەهەر حاڵ هەوڵێن نەتیجەی، هەر وەکوو پێشتر ئاماژەم پێکرد، ئەوە بوو کە ساغ کردنەوەی کۆمەڵە و هاتنەدەری لە حیزبی کۆمۆنیستی ئێران کارێکی بۆ گەشە پێدان و سەرلەنوێ ئاساندنی کۆمەڵە لەناو جەماوەری خەڵك دا کرد کە ساڵەهای ساڵ هەڵسووڕانی تەدریجی نەیدەتوانی بۆ ئێمەی بکا. وە ئەمەش خاسییەتی کاری شۆڕشگێڕانە و خاسییەتی دەورەی شۆڕشگێڕانەیە، ئەوەی کە بە مانگێك دەکرێ، جاران بە یەك دەهە بۆت نەدەکرا.

هەر لە پێوەند لەگەڵ ئەمەدا، لایەنێکی دیکەی ئەم دەسکەوتە بریتییە لەوەی کە کۆمەڵە جارێکی دی وەکوو ئۆپۆزیسیۆنێکی جیددی رژیمی کۆماری ئیسلامی چەسپاوە و جێگیر بووەوە. راستە، کۆمەڵە هەمیشە وەکوو ئاگرێکی ژێر خۆڵەمێش وابوو، بەڵام ساڵەها بوو لە حاڵەتی "کۆما"دا بەسەری دەبرد، لەپڕدا باوەشێنێك کرا و ئەم ئاگرە کڵپەی سەند و گەشایەوە. نەتیجەکەی ئەوە بوو کە لەپڕدا هەم دەروازەی فرسەت و ئیمکاناتێکی تازە لەبەرابەر کۆمەڵەدا کراوە، وە هەم ترس و دوژمنایەتی گەورەتریش لەلایەن کۆماری ئیسلامی و دوژمنانی بزووتنەوەی شۆڕشگێرانەی کوردستانەوە بەدژمان هەڵخرا. ئەمەش هەر خاسییەتی کاری شۆڕشگێڕانەیە. حیزبی شۆڕشگێر و کاری شۆڕشگێر ئەوەیە کە بە وەزعی مەوجوود رازی نییە، رەخنەگر و تێکدەری نیزامی زاڵ و موناسەباتی کۆنە و گۆمی مەندی وەزعی مەوجوود دەشڵەقێنێ. تەنانەت زۆر جار بۆ حیزبی شۆڕشگێر وا روو دەدا کە پێش ئەوەی بتوانێ ئەو هێزە گەورە جەماوەرییە بۆ لای خۆی راکێشێ، دوژمنانی زووتر وشیار دەکاتەوە.

ئەوانەی کە تەمەنیان ئیجازە دەدا لەبیریانە، دەنا بیستوویانە، کە جاری پێشتر لە ساڵانی ١٣٥٨ و ١٣٥٩ (رێکەوتی ١٩٧٩ و ١٩٨٠ی زایینی) کۆمەڵە جۆرێك لە تەقینەوەی سیاسی نفووز و خۆشەویستی بەخۆوە بینی. لە ماوەیەکی نەك چەندان زۆردا، لە



ڕێکخراوێکی سیاسی نهێنی کە چالاکانە لە شۆڕشی ئێران و کوردستاندا بەشداری کردبوو، بوو بە حیزبێکی گەورەی جەماوەری، ڕاوەستاو لەبەرابەر ڕژیمی کۆماری ئیسلامی تازە بەدەسەڵات گەیشتوو، ڕەقیبی ئەحزابی سوننەتی سی‌چڵ ساڵە، وە بەربەرەکانی‌کەر لەگەڵ داب و نەریت و سوننەتی کۆن کە ئەوکات تێکەوتن لەگەڵیان بەراستی زۆر سەخت بوو. ئەو چالاکی و گەشە کردنە لە هەمان حاڵدا کە فرسەتی گەورەی بۆ کۆمەڵە خوڵقاند و کردی بەو کۆمەڵەیەی کە دەزانین، بەڵام دوژمنایەتی گەورەشی لەبەرامبەردا ڕێکخست. زۆر جار، وەکوو مارکسیش باسی دەکا، پێشرەویی چینی شۆڕشگێر و هەستانی بۆ مەیدانی خەبات، کۆنەپەرستی و چینە دەسەڵاتدارەکان لە بەرامبەری‌دا چڕوپڕ و ڕێکخستوو دەکا. ئەمە جاری پێشوو لەبەرامبەر ئێمەدا رووی‌دا. ڕژیمی کۆماری ئیسلامی لە بەرامبەرماندا بە ئەوپەری بێرەحمی‌یەوە خۆی دەرخست، تەنانەت ئێمەی زۆرتر لە حیزبەکانی دیکەی کوردستان دەبوغزاند، حیزبی توودەی ئێران رەسمەن ئێمەی بەناوی دژی شۆڕش ناو دەبرد وە لە هیچ شتێك بۆ زەربە لێدانی ئێمە کۆتایی نەکرد، ڕەوتە مەزهەبی‌یە کۆنەپەرستەکان کە دەستیان لەگەڵ دەستی چەوسێنەران و زۆردارانی مەحەللی تێکەڵ کردبوو، لە مفتی‌زادەوە تا ڕزگاری و ئەوانی دی، لە بەرامبەر ئێمەدا ریزیان بەست، کۆنە دەرەبەگ و مالیکی کوردستان و عەشایر کە نفووزی خۆیان لە ئەسەر ئیسلاحاتی ئەرزی سەردەمی شاوە لەدەست دابوو، بە تەمای ئەستاندنەوەی زەوی و دەسەڵات، دەستیان دابووە مانۆڕ دان بۆ ترساندن و تۆقاندنی زەحمەتکێشان و جووتیارانی دێهات و بۆ ئەوەی جارێکی دیکە سەرنەوی‌یان بکەنەوە، ئەوانیش کۆمەڵەیان لە بەرامبەر خۆدا دەبینی، لەبەرابەری‌دا چەکدار بوون و کەوتنە دوژمنایەتی کردنی. تەنانەت ئەحزابی سوننەتی کوردستان لە بەرامبەر ئێمەدا وەستانەوە و بۆ بەربەست کردنی نفووزی ڕوو لە گەشەی کۆمەڵە، لە زۆر شت خۆیان نەپاراست. بەم ئەوعە بوو کە لەلایەکەوە کۆمەڵە دەسترەسی بەدڵ و بە مێشکی دەیان و سەدان هەزار و بگرە میلیۆنەها ئینسانی چەوساوە و تێکۆشەر پەیدا کرد و لەلایەکی دیکەشەوە ریزێکی لە نەیاران لەبەرابەر خۆیدا خستەگەڕ.

ئەم جارەش لەوانەیە عەینی شت بۆ ئێمە ڕوو بداتەوە، بۆیە ساغ کردنەوەی ئەم جارەی کۆمەڵە هەم مەودای تازەمان بۆ کار بۆ فەراهەم دەکا و هەم ریسکی تازەمان بۆ دەخوڵقێنێ و دوژمنان و نەیارانمان فەعال دەکاتەوە، هەروەکوو تا رادەیەك دیومانە. بۆیە پێویستە ئێمە لەم سەردەمەدا هەم دەست و برد بکەین بۆ وشیار کردنەوە و ڕێکخستنی کرێکاران و چینی چەوساوە و کۆکردنەوەیان لە دەوری خۆمان و بۆ ڕاکێشانی جەماوەر و، تەنانەت بتوانین هێزە بەینابەینی‌یەکانیش بۆ لای خۆمان ڕاکێشین یان دەنا هیچ نەبێ



بێلایەنیان بکەینەوە. ئەو کاتەی کە پێشڕەویی ئێمە لە کاری خۆماندا ئاحەزانمان بێهیوا و بێئومێد بکا و سەدان هەزار و میلیۆنەها خەڵکیش بهێنێتە مەیدان و لە دەوری ئاڵای کۆمەڵە کۆیان بکاتەوە، ئەو وەختە دایە کە دەتوانین بەدڵنیاییەوە بڵێین بەئامانجی خۆمان دەگەین و سەرکەوتنمان مسۆگەر بووە.

دەسکەوتێکی دیکەی ساغ کردنەوی کۆمەڵە و دەست بەکار بوونەوەی چالاکیی سەربەخۆی بریتییە لەوەی کە رەوتی چەپ و رادیکاڵی لە کوردستان، وە لەم رێگایەوە لە ئێران و لە هەموو ناوچەکە، خستەوە سەر هێڵێکی دروست، هەنگاوێکی گەورە بوو بۆ ئەوەی چەپی کوردستان لەو ئاڵۆزی و چەواشە بوونی فیکری و سیاسی کە ساڵەهایە لەم ناوچەیە ئازاری دەدا و بە لارێیدا دەبا و مەیدانی پێ چۆڵ دەکا و تەنانەت هێندێک جار بووە بە هۆی لە خشتە چوون و هەڵوەشانەوەی، رزگار کا و رێگەیەکی تازە و نوێی بۆ بکاتەوە.

لە لایەکی دیکەشەوە دەبینین کە رێکخراوێک بە ئەتەوەگەرییەکی متعصبانە و هەندێک جار کۆنەپەرستانە، بەرواڵەت و رووکەشێکی چەپەوە، لە ساڵانی رابوردوودا لە هەموو بەشەکانی کوردستان هاتە مەیدان و زۆرێک لەو جەوانانەی کە خواست و هەستێکی رادیکاڵیان بوو بۆ لای خۆی راکێشا و ناو و شۆرەتێکی لە کوردستانی رۆژهەڵاتیش بۆخۆی پێکەوە نا.

ساغ کردنەوەی کۆمەڵە جوابێکی رەد بوو بەهەردووک ئەو رەوتانە و کردنەوەی دەروازەیەکی تازە بوو بەرەورووی چەپێکی شۆڕشگێڕی راستەقینە کە بتوانێ ئاسەواری شکست و چەواشەکاری ئەوانە بشواتەوە، مەیدانی تێکۆشان بە حوزووری خۆی پڕکاتەوە و رێگا بکاتەوە بۆ ئەوەی کە لە روانگەی بەرژەوەندی کرێکارانەوە بتوانێ پێشەنگی خەباتی دێمۆکراتیک و رزگاریخوازانە لە هەموو بووارەکان، لەوانە مەیدانی خەبات بۆ رزگاری لە ستەمی ئەتەوەییش، بێت.

بەم حیسابە، رێک بەپێچەوانەی ئەوەی کە نەیارانی کۆمەڵە ئێمەی پێ تاوانبار دەکەن، ساغ کردنەوەی کۆمەڵە نەک تەنیا بەمانای مەیدان خاڵی کردن و زەمینە لەدەست دانی رەوتی سۆسیالیست نەبووە لە کوردستاندا، بەڵکوو لەراستیدا بەمانای بنیات نانەوە و سەرلەنوێ ساغ کردنەوەی ئەوە سەنگەرانە بوو کە رەوتی سۆسیالیستیی کۆمەڵە لە دوو دەیە پێشترەوە هەڵیبەستبوو و بەشانازییەوە و بەدانی هەزاران قوربانییەوە پارێزگاری لێدەکرد. فەراهەم کردنی زەمینە بوو بۆ ئەوەی جارێکی دی ئالتێرناتیڤی چەپ و پێشکەوتنخواز لە کوردستان بتوانێ سەرهەڵدا و کوردستان و بزووتنەوەکەی نەبێتە مەیدانی رەمبازی هێزی کۆنەپارێز.



ئەو وڵاتانەی کە کێشەی دێموکراتیکیان تێدایە، لەژێر چەکمەی دیکتاتۆری‌دا دەناڵێنن، بێ‌مافی کریکاریی بێداد دەکا، ناپارتایدی جینسی و فەرق و هەڵاواردنی جینسی تێیاندا بەردەوامە، ستەمی نەتەوەیی تێیاندایە، ئازادی سیاسی بەخۆیانەوە نابینن، ئەو وڵاتانە زەرفییەت و پۆتانسیەلێکی گەورەیان بۆ بزووتنەوەی رادیکاڵ و شۆڕشگێرانە تێدا بەدی دێ، وە ئەمەش فورسەت دەکاتەوە بۆ هێزی چەپ و مارکسیستی کە بە دامەزراندنی پەیوەندی قووڵ و دڵسۆزانە لەگەڵ ئەو بزووتنەوانە بتوانێ جەماوەری بەرینی خەڵك بۆ لای خۆی راکێشێ و هەم جواب دەرەوەی ویستی دانە دانەی ئەم بزووتنەوانە بەشێوەی دروست و گونجاو بێت و هەم هەمووشیان لە ژێر چەتری ستراتیژی‌یەکی سۆسیالیستی کۆبکاتەوە و بەرەو داهاتوویەکی روونتر بۆ ئینسانی چەوساوە بیان با. هەنگاوە شۆڕشگێرانەکەی ئێمە، یانی ساغ کردنەوەی کۆمەڵە و هاتنەدەری لە حیزبی کۆمۆنیستی ئێران بەو رێبازەی کە کرا، لەراستی‌دا کردنەوەی دەروازە بەرەو ئەنجام دانی ئەو ئەرکە مێژوویی‌یەیە.

زۆر جا لەنێو خۆماندا قسە لەوە دەکرێ کە ئێمە لە تەشکیلاتی پێشووی حیزبی کۆمۆنیستی ئێراندا، بەتایبەتی ئەوانەی کە لە سازمانی کوردستانی ئەو حیزبەدا بوون و لە بەشی کۆمەڵەدا کاریان دەکرد، لە وەزعێکی رێکخراوەیی و تەشکیلاتی بێ‌سەرەو بەرە رەنجمان دەبرد، هەق کوژی تێدا هەبوو، گەندەڵی تێدا بوو. ئەمە زۆر راستە. بەڵام هەڵەیەکی گەورەیە ئەگەر ساغ کردنەوەی کۆمەڵە و هاتنەدەری لەناو حیزبی کۆمۆنیستی ئێران، وە پاشان ئەو پێشوازی‌یە گەورەیە کە لە هەموو کۆمەڵگادا لەم پرۆژەیە کرا، بەتەنیا بیبەینەوە سەر ئەو گیروگرفتە رێکخراوەیی‌یانە. لەراستی‌دا پێویستی‌یەکی سیاسی قووڵ لەنێو کۆمەڵگا و لەنێو خەتی چەپ و رادیکاڵ و شۆڕشگێر و خەباتکارانی سیاسی‌دا بۆ ئەو بووژاندنەوەیەی کۆمەڵە هەبوو. نیازێکی راستەقینە بۆ سەرهەڵدانەوەی رەوتێکی شۆڕشگێر هەست پێدەکرا، بۆشایی‌یەکی گەورە هەست پێدەکرا کە خەڵك و تێکۆشەرانی شۆڕشگێری رەنج دەدا، بەو ئازارەوە دەتلانەوە، مەجبوور بوون یا تووشی بێ‌عەمەلی و بێ‌هیوایی بن یا روو بکەنە ئەم لاولا بەهیوای ئەوەی کە گۆیا رەوتێکی رادیکاڵ وجوودی هەیە کە جوابی خواست و نیازی ئەوان دەداتەوە. لە وەها مەوقیعییەت و هەل و مەرجێکدا بوو کە بووژانەوەی کۆمەڵە گرتی.

ئەم قسەیەش بەو مەعنا نی‌یە کە خۆراگری و فیداکاری ئەو هاورێیانەی کە ئەوکات لە تەشکیلاتی کوردستاندا بوون و لەبەرامبەر رەوتی زاڵ بەسەر ئەو تەشکیلاتەدا وەستانەوە، بێ‌قەدر بکرێ و پێی نەزاندرێ. جارێکی دیکەش پێویستە بگوترێ کە کۆمەڵە مەدیوونی خۆراگری ئەوانە و جێگەی ئەوان بۆ هەمیشە دیارە. بەڵام لە عەینی حاڵدا جێگەی پرسیارە: ئەگەر ئێمەمانان، تەنیا هونەرمان ئەوە بوو کە لەبەرامبەر ئەو بێ‌سەرەو بەرەیی و گەندەڵی و



هەقکوژی‌یەدا راوەستاین و سەرکەوتنێکیشمان بەدەست هێنا، ئەگەر ساغ کردنەوەی کۆمەڵە تەنیا بەم چوارچێوە قەتیس دەبێتەوە، ئەی چۆن دەتوانین تەوزیح بدەین کە خەڵکی مەریوان و سنە و سەقز و بۆکان و مەهاباد و شوێنەکانی دی بۆچی پێی خۆشحاڵ بوون و بووژانەوە و کەوتنە هەڵپەرکێ؟ ئەی ئەم روو تێکردن و پێشوازی‌یە گەورە بەرامبەر بە پرۆژەی ساغ کردنەوەی کۆمەڵە لە کوێوە سەرچاوە دەگرێ؟ لەراستی‌دا زەمینەی بەرینی کۆمەڵایەتی ئەم پرۆژەیە، پێویستی و خواستێکی سیاسی قووڵ بوو کە بەپانایی کۆمەڵگای کوردستان لەگۆڕێ دابوو.

زۆر جار دەوترێ کە حیزبی کۆمۆنیستی ئێران و سازمانی کوردستانی ئەو حیزبە رەهبەری‌یەکی سیاسی بێکیفایەتی هەبوو، رەهبەری‌یەکی بێئینیتیکار و بێ دەستپێشخەری، رەهبەری‌یەکی دەست بەکڵاوی خۆگر و رازی بە وەزعی مەوجوودی هەبوو کە لەباری سیاسی‌یەوە تووشی وەستان و زۆر جاریش تووشی گەندەڵی سیاسی ببوو، فەقەت دەستی بە کورسی‌یەکانی دەسەڵاتە پچووکەکەیەوە گرتبوو و هیچ خاسییەتێکی دیکەی بۆ بردنە پێشی بزووتنەوەی سیاسی نەمابوو. ئەمانەش زۆر راستن، بەڵام ئەم دیاردانەش خۆیان بەڵگەی بێخەتی و بێئاسۆیی سیاسی و تەریك بوونەوەی حیزبی کۆمۆنیستی ئێران و سازمانی کوردستانی ئەو حیزبە و نەمانی پەیوەندی ئەو رێکخراوە لەگەڵ جەماوەری کرێکاران و زەحمەتکێشان و خواستەکانیان، بەڵگەی خولانەوە لەناو بازنەی ئەزموونێکی شکست هێناو و بێدوارۆژن .

هەر لێرە پێویستە ئیشارە بە شتێك بکەین: نەیاران و دوژمنانی کۆمەڵە بۆ بەدناو کردن و خەوشاندنی روخساری گەشی کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێران وا لە قەڵەم دەدەن کە ئەم پرۆژەیە بە بزووتنەوەی بەناو "دووی خورداد" لە ئێراندا بەستراوەتەوە. مەبەستی ئەوان لە بەستنەوەی ئەم پرۆژەی ئێمە بە شتێکی وەهاوە بریتی‌یە لەوەی کە هیچ نەبێ و لانی کەم خۆشباوەری بە رژیمی کۆماری ئیسلامی و بە ئیسلاحاتێك کە لە سەرەوە لە لایەن دەسەڵاتەوە دەکرێ هاندەری ئێمە بووە. هەموو راستی‌یەکان نیشان دەدەن کە ئەم قسەیە پرووپووچە. ئەگەر هەموو پێشینەی شۆڕشگێڕی کۆمەڵەش لەبەر چاو نەگرین، تەنانەت کاری سیاسی و راگەیاندنی ئەمساڵی ئێمە دەتوانێ ئەوە بەدرۆ خاتەوە و بۆ نموونە نیشان بدا کە کێ لە کوردستان، دیارە بە بوونی زەمینەی سیاسی و کۆمەڵایەتی لەبارەوە، هێزی سەرەکی هاندەر و دەست پێشخەر بوو لە تەحریمی هەڵبژاردنی سەرکۆماری لە ئێراندا. ئەوانەی کە بەدنییەتتر و بوغزاوی‌ترن بەوەشەوە ناوێستن، لەسەر رادیۆکەیان ئەندامی کۆمیتەی ناوەندییان دەڵێت: "من دڵنیاتان دەکەم بەشێك لەم پرۆژەیە لە وەزارەتی

ئیتیلاعات تەرح ڕێژی کراوە." ئەو وتەیە بۆ وەڵام دانەوە نابێت و تەنیا دەتوانێ دەریبخا بدا کە ڕەبەرانی حیزبی کۆمۆنیستی ئێران و سازمانی کوردستانی ئەو حیزبە لەدژایەتی کردنی کۆمەڵەدا خۆیان خستۆتە چ زەلکاوێکی ئەخلاقی‌یەوە.

بەڵام هاورێیان، بە یەك مەعنای تر لەراستی‌دا پەیوەندی‌یەك هەیە بەینی ساغ کردنەوەی کۆمەڵە و ئەو ئاڵوگۆڕەی کە لە چەندین ساڵ لەوە پێشەوە لە ئێران لەئارا دایە. دەزانین کە لە چەندین ساڵ لەوە پێشەوە ویستێکی کۆمەڵایەتی گەورە بۆ ئاڵوگۆڕ ئێرانی داگرتووە و ئاکامەکانی ئەم ویستەیە کە بە شکڵ و شێوەی جۆراوجۆر لە نێو کۆمەڵگای ئێران دا سەری‌هەڵداوە. ویلایەتی فەقیە چۆتە ژێر پرسیارەوە، شێوەی حکوومەتێك و مۆدێلێك کە ڕژیمی کۆماری ئیسلامی لەژێر ناوی گەرانەوە بۆ ئیسلامی ڕاستەقینەی هەزار و پێنسەد ساڵ لەوە پێش و، لەواقیعدا بۆ ئیمتیازاتی مادی و سیاسی و بۆ پڕکردنی گیرفانی مافیای ڕووحانییەت لە ئێران، ویستی بەسەر کۆمەڵگای ئێرانی دا بسەپێنێ، وە بە کوشتارێکی بێ‌وێنە ماوەی زیاتر لە بیست ساڵ درێژەی دا، سەرەنجام لەلایەن خەڵکی ئێرانەوە ڕەت کراوە. خەڵکی ئێران لەهەر دەرفەتێك دا کە بۆیان ڕەخسا، چ ئەو کات لە قەزوێن و تاران و ئیسلام ئاباد و مەشهەد و شوێنەکاتی تر بە ڕاپەرینی خوێناوی خۆیان و چ لە فورسەت و مەودایەکی زۆر کەم و بەرتەسك دا کە لە هەڵبژاردنەکاندا بۆیان فەراهەم بوو و هەڵکەوت، نیشانیان دا کە ئەوان ئەو ڕژیمەیان ناوێ، بە شێوەی حکوومەتی پێشوو ڕازی نین و، کەم تا زۆر جۆرێك لە ئاڵوگۆڕیان دەوێ. ئیدیۆلۆژی زاڵ بەسەر جەمهووری ئیسلامی کە ساڵەهای ساڵ حکوومەتی دەکرد و، تەنانەت مێشکی ڕووناکبیرانیشی تا ڕادەیەکی زۆر بۆ لای خۆی ڕاکێشابوو، هێژێمۆنی و باڵادەستیی خۆی لە ئەفکار دا لە دەست داوە، گوتاری زاڵ لە کۆمەڵگا، یان بە فارسی بڵێین "گفتمان"، ئیتر لە ئێران وەکوو خۆی نەماوە، خاڵەکانی بیرکردنەوە و باس کردنی کۆمەڵگای ئێران تازە لە زەین و مێشکی جەماوەردا گۆڕاون، "ئەجێندا" ئەوە نی‌یە کە جەمهووری ئیسلامی و ئیدیۆلۆگەکانی ویلایەتی فەقیە ساڵەها بەسەر کۆمەڵگای ئێرانیان داسەپاندبوو. تازە هیچ شتێك ناتوانێ خەتی حەرەکەی ئیسلامی سیاسی لە ئێران لەباری مەعنەوی و سیاسی‌یەوە لەناو دڵ و مێشکی خەڵك دا بەرێتەوە جێگای خۆی. بەم مەعنایە و لەم مەیدان و بووارەدا، جەمهووری ئیسلامی تازە بۆ هەمیشە ڕووخاوە. بەس دەزگای دەوڵەت و خەزێنەی حکوومەتی و هێزی چەکداری بەدەستەوە ماوە.

بەکورتی بڵێین، خواستێکی زۆر بەرین بۆ ئاڵوگۆڕ لە هەموو ئێراندا سەری هەڵداوە. کوردستانیش، بە تایبەتمەندی‌یەکانی خۆیەوە، هاتۆتە نێو مەیدانی ئەو تەوژمە فیکری و سیاسی‌یە نوێیەوە. بەڵام هەر وەکوو زۆر حەرەکەت و زۆر دیاردە نیشانی دەدەن، چ بە



بزووتنەوەکان و خۆپێشاندانەکان و چ لەرێگای نەچوونێکی بەرفراوان بۆ سندووقەکانی دەنگ دان لە هەڵبژاردنی سەرکۆماری‌دا، خەڵکی کوردستان بەشێوەیەکی رادیکاڵتر لە بەرامبەر کۆماری ئیسلامی‌دا وەستاونەتەوە و بەو ئەندازە ئیسلاحاتە کە لە بەشەکانی دیکەی ئێران مومکینە خەڵك بەشێوەیەکی کاتی ئارام کاتەوە، رازی نین.

لەوانە چ نەتیجەیەك وەردەگرین؟ ئەو نەتیجەیە وەردەگرین کە حیزبێکی سیاسی ئەگەر جیددی بێ، ئەگەر بیەوێ تەئسیر دابنێ و کاریگەر بێ لەسەر رەوتی رووداوەکان، ناتوانێ گوێ نەداتە ئەم بزاڤە گەورە و ئەم ئاڵوگۆڕە گەورەیەی کە لە قووڵایی کۆمەڵگای ئێران لەئارا دایە. ئەگەر وەکوو بورجی عاج نشینانی رەبەریی ئەم چەند ساڵەی حیزبی کۆمۆنیستی ئێران و سازمانی کوردستانەکەی تەنیا دڵی بەوە خۆش نەبێ کە دەبیرخانەیەکی هەیە دەتوانێ هەرەشە و گورەشە لەم و ئەو بکا، ئەگەر دڵی تەنیا بەوە خۆش نەبێت کە ئوردوگایەکی پچووك و ساڵێ چەند جاریش مەودای سەفەری بۆ ئورووپا هەیە و هەموو ئومێد و ئارەزووی بۆ سەرکەوتن لەو چوارچێوە تەنگەدا قەتیس نەکرابێ، ئەگەر رێکخراوێك ئاوا گردەنشین و بێ‌ئاسۆ نەبووبێ، چۆن دەتوانێ بەوە رازی بێ لە حاڵێکدا کۆمەڵگا خەریکە لەو بەستەڵەکی داسەپاو لەلایەن ئیستیبدادەوە دێتەدەر و تۆزی مردوو لەخۆی دەتەکێنێ، ئەو لە هەمان وەنەوز و کۆمای پێشووی خۆی‌دا بەسەر بەرێ و فیکرێك بەحاڵی خۆی نەکاتەوە و جم و جۆڵێکی تازە لەنێو خۆیدا پێك نەهێنێ؟

لەم روانگەیەوە، بێگومان پرۆژەی ساغ کردنەوەی کۆمەڵە لەسەرێکەوە مەربووت دەبێتەوە بە ئاڵوگۆڕی سیاسی لە ئێران، نەك ئەو جۆرەی کە نەیارانی کۆمەڵە دەنوێنن بەڵکوو بەو مانایە کە هەڵسووراوانی خەتی ساغ کردنەوەی کۆمەڵە تەشخیسی دروستی ئەو ئاڵوگۆڕ و جم و جۆڵانەی نێو خەڵکیان دا، کەوتنە خۆیان و هەوڵی خۆ تەیار کردنیان دا. رەوتی ساغ کردنەوەی کۆمەڵە، لەپاڵ هەموو پێداچوونەوەی رەخنەگرانەی بەسەر بیر وئەزموونی حیزبی کۆمۆنیستی ئێراندا، هەروەها بەدروستی تەشخیسی دا کە هەل و مەرج و فەزا لەحاڵی گۆڕان دایە و کاتی ئەوە هاتووە تەکانێك لە خۆمان بدەین. ئێستا جم و جۆڵێك لەنێو خەڵکدا پەیدا بووە، بەستەڵەکی دیکتاتۆری رەشی دینی خەریکە دەتوێتەوە، نەترسی و بوێری خەڵك پەرەی سەندووە، لەبەرابەردا ترس و خۆپارێزی دەسەڵاتداران زیادی کردووە، زەمینە بۆ بزووتنەوەی جەماوەری و بۆ هێنانە گۆڕی خواستە رادیکاڵەکانی خەڵك خەریکە پەیدا دەبێ، مەودا بۆ کاری سیاسی بەرفراوان خەریکە دەکرێتەوە، لەم حاڵەدا حیزبێکی شۆرشگێر وەزیفەی ئەوەیە بەخۆیدا بێتەوە، وزیفەی ئەوەیە لەنێو خۆیدا بە وەستان و سستی و دابڕان کۆتایی بێنێ و، سیاسەتی نوێ رەچاو بکا.



بەداخەوە گوێی رەهبەرانی ئێستای حیزبی کۆمۆنیستی ئێران و سازمانی کوردستانی ئەو حیزبە، لەحاست ئەم راستی‌یانەدا بەتەواوی ئاخنرا بوو و هەرگیز نەیان توانی ئەم واقیعییەتانە دەرك بکەن، نەیان توانی لە ئاستی رەهبەرانی سیاسی‌دا تێگەیشتن و هەست بە بەرپرسایەتی بنوێنن و نەیان توانی بەرژەوەند و مەسڵەحەتی بزووتنەوە بەسەر قازانجی شەخسیی خۆیاندا زاڵ کەن، لە دنیای تەسك و تەنگەبەری خۆیاندا هەموو شتێکیان بە "مەوقیعیەت تەڵەبی فەردی" ئەم و ئەو لەقەڵەم دا، هەنبانە بۆرینەی فەرهەنگی ژەهراویی کۆمۆنیزمی کریکاری‌یان پشکنی تا رەقترین و دزێوترین جنێو بدۆزنەوە و بە گورچووی هاورێیانی دێرینی خۆیانیدا بدەن، بەڵام هەرگیز نەیان توانی بە لەسەرخۆیی بیر لە ناوەرۆکی تینۆری و سیاسی پرۆژەکەی ئێمە بکەنەوە. با بە حەقیقەت بڵێم: ئەگەر چی بەشێك لەو کارەیان وەکوو جنێو و تۆمەت و بۆ شکاندنی کەسەکان بەکار برد، بەڵام لە کانگای دڵی خۆشیاندا عەقلییەتیان لەوە زیاتر بڕی نەدەکرد و ئەوەندە بیرتەسك بوون کە لەوە زیاتر لێکدانەوەیەکی سیاسیان نەبوو کە حەرەکەتی ئێمەی پێ تەوزیح بدەن.

جا مەبەستم ئەوە بوو کە دەبوایە حیزبێکی شۆڕشگێڕ لەم هەل و مەرجەدا بکەوێتە خۆی و ئێمە کەوتینەوە خۆمان. جا کە تۆ خۆت هەڵبڕیەوە و لەو وەزعە هاتیە دەر و قەفی ئەو زنجیرانەت پساند و سەرەنجام بە هەڵکردنەوەی ئاڵای کۆمەڵەی شۆڕشگێڕ وەڵامی پێویستی‌یەکانی سەردەمی خۆت دایەوە، هەڵبەتە لەگەڵ جوابی موسبەت و دڵخۆشکەریش بەرەوروو دەبیەوە. سەرچاوەی ئەوەی کە ئێمە وەها پێشوازی‌یەکمان لێکرا ئەوەیە کە کۆمەڵگای کوردستان خوازیار و تینووی وەها حەرەکەتێك بوو. نە ئێمە بلیمەت بووین و نە پرۆژەکەی ئێمە پرۆژەی نابیغەکان بوو، ئێمە تەنها تەشخیسی سیاسی دروستمان دا و پێویستیی ئەم ئاڵوگۆڕەمان دەرك پێکرد. ساغ کردنەوەی کۆمەڵە و خستنی بۆ سەر ئەم هێڵ و رێبازە دەیخوێندەوە و جووت بوو لەگەڵ نیاز و خواستی کۆمەڵگا، لەگەڵ بەرژەوەند و مەسڵەحەتی کرێکاران و زەحمەتکێشان و لەگەڵ سەردەمێکی سیاسی کە کۆمەڵگای ئێران بەگشتی و کوردستان بەتایبەتی تێپەری دەکا. هەر بۆیەش ئەم کارە توانی وەها بیگرێ، بە واتەیەکی تر بۆیە ئەم تیرە ئەو ئامانجەی پێکا.

لەلایەکی دیکەشەوە ویژدانی شۆڕشگێڕانە لە ئێمەدا نەمردبوو و لە تانە و توانجی نەیاران و لە دژواری‌یەکانی رێگا سڵمان نەکرد. بەپێچەوانەی ئەوەی کە نەیارانی کۆمەڵە دەڵێن، نە ماڵی دنیا و نە مەوقیعییەتی تەشکیلاتی رێگرمان نەبوون بۆ ئەوەی دەست بدەینە ئەو کارە گەورەیە، بەڵکوو دار و نەدار و هەست و نیستی شەخسیمان خستە پێناو

مەسلەحەتێکی گەورەتری سیاسی، ئەو جۆرەی کە پیشەی شۆڕشگێرانی راستەقینەیە و خۆشبەختانە لەم ئەزموونەدا رووسوور هاتینەدەر.

هاورێیان، دەسکەوتێکی دیکە یان بڵێین خاڵێکی بەهێزی دیکە لە مەسەلەی دەست پێکردنەوەی کاری سەربەخۆی کۆمەڵەی شۆڕشگێری زەحمەتکێشان، کە لە یەك ساڵ لەوە پێشەوە تا ئێستا بەردەوامە، ئەوەیە کە رێگە دەکاتەوە بۆ بەهێز کردنی راستەقینەی چەپی رادیکاڵ لە ئێرانیشدا. رێك بەپێچەوانەی ئەو ئیدیعایانەی کە نەیارانی کۆمەڵە، بەتایبەتی لەنێو حیزبی کۆمۆنیستی ئێراندا، دەیکەن، کۆمەڵەیەکی زەعیفی کەم جم و جۆڵی روو لەکزی هەرگیز ناتوانێ نەخشێکی لە بەهێز کردنی چەپی ئێراندا هەبێ، هەرگیز ناتوانێ تەوەرێکی پتەو و جێگەی متمانە بێ بۆ ئەوەی بەرەیەکی چەپ یان جەمسەر و قوتبێکی چەپ لە ئێران شکڵ بگرێ. راگرتنی قاڵبێك بەناوی حیزبی کۆمۆنیستی ئێران کە پشت ئەستوور بە هیچ پێویستی‌یەکی سیاسی نەبێ، لەمەرگی رۆژانەی خۆیدا هیچ کارکردێکی سیاسی نەبێ و کەس نەتوانێ نیشانی بدا ئەو قاڵبە بۆچی هەیە، بەڵکوو تەنیا وەکوو رازاندنەوە و ماکیاجێك بێ بۆ رواڵەتی شتێکی دیکە، راگرتنی ئەم حاڵەتە ساختە و رووکەشە، هەرگیز ناتوانێ ببێتە پێگەیەکی واقیعی بۆ بەهێز کردنی چەپی ئێران.

وەختی خۆی لە ساڵانی ١٣٥٨ و ١٣٥٩ (رێکەوتی ١٩٧٩ و ١٩٨٠ی زایینی) و تا ماوەیەك دواتریش، تا ئەو کاتەی کە چەپی ئێران لەژێر فشاری کوشتاری بەکۆمەڵی رژیمی کۆماری ئیسلامی‌دا بەتەواوی لەیەك پرژ و بڵاو نەبووبوو، ئەو کات کۆمەڵە پێگەیەکی زۆر گەورەی بۆ هەموو هێزی چەپی ئێران پێك هێنابوو، وە ئەگەر وەختی خۆی پرۆژەیەك بەناوی حیزبی کۆمۆنیستی ئێران ئەسڵەن ئیمکانی ئەوەی پەیدا کرد دەستی بدرێتێ و تا رادەیەك درێژە بەکاری خۆی بدا، تەنیا بەهۆی ئەو خاسییەتەی کۆمەڵەوە بوو. لەبەر ئەوە هاتنەدەری کۆمەڵە لە حیزبی کۆمۆنیستی ئێراْن نەك تەنیا بەزیانی چەپی ئێران نی‌یە، بەڵکوو بەم رێبازەوە کە هەیەتی دەتوانێ هاوپەیمانێك و پاڵپشتێکی زۆر بەکەڵکتر و گونجاوتر بۆ چەپی ئێران فەراهەم بکا. ئێمە دەبێ بتوانین ئەو راستی‌یە بۆ هەموو چەپی ئێران روون بکەینەوە. رێکخراوێك یان حیزبێك کە پەیوەندی لەگەڵ کۆمەڵگاکەی خۆی لەدەست داوە، گوێی بیستن و چاوی دیتنی نەماوە، لە چوارچێوەی نێوخۆی تەشکیلاتەکەی‌دا تەسك و قەتیس بۆتەوە و رۆژ بە رۆژ خەریکە کزتر دەبێ، وەها رێکخراوێك ناتوانێ بەسیرفی ئەوەی ناوێکی زل لەخۆی ناوە جێگەی هیچ برواییەك و گۆچانی دەستی هیچ هێزێکی چەپ بێ لە داهاتووی ئێراندا. ئەگەر کۆمەڵە لەم پرۆژەدا کە دەستی پێکردووە بتوانێ بەعەمەلیش موفق و سەکەوتوو بێتە دەر، یانی بتوانێ بەکردەوە کرێکاران و کۆمەلانی زەحمەتکێشی کوردستان و رای گشتیی



خەڵك و جەوانان و ژنان و رووناکبیران و ئەوانی تر بۆ لای خۆی راکێشێ و ئەو پێگەیەی شیاویەتی لەناوخۆی کوردستان پەیدا بکاتەوە، لەم حاڵە دایە کە زەمینەیەکی لەبارتر بۆ چەپی ئێرانیش دەخوڵقێتەوە و هەربۆیە پێم وایە کارەکەی ئێمە خێر و مەسڵەحەتی هەموو چەپی ئێرانیشی تێدایە.

بە بڕوای من، ئەگەر چی رەنگە تا ئێستا چەپی ئێران توانیبێتی تا رادەیەك نیگەرانییەکانی خۆی وەلابنێ، بەڵام هێشتا ئەو تێگەیشتنە دروستەی کە پێویستە لەم بارەیەوە نییەتی. چەپی ئێران دەبێ بەروونی بزانێ نەك تەنیا لەبەر ئەوەی کورد میللەتێکی زوڵم لێکراوە، نەك تەنیا لەبەر خاتری ئەوەی بزووتنەوەی شۆڕشگێڕانەی گەلی کورد بزووتنەوەیەکی عادلانە و قابیلی پشتیوانییە، بەڵکوو هەروەها بەدەلیلی ئەوەی کە هێزێکی رادیکاڵ و چەپ لە پێشەوەی ئەو بزووتنەوە دایە، بەهێز کردنی ئەو بزووتنەوەیە و بەهێز کردنی کۆمەڵە لە روانگەیەکی ئەنترناسیۆنالیستی و سۆسیالیستیشەوە پێویستە. بەم دەلیلە ئەرکێکی سەرشانی چەپی ئێرانە کە پشتیوانییەکی بێئەم لاولا و بێ‌رارایی لە کۆمەڵە بکات و پێم وایە هەر بەرنامە و سیاسەتێکی کە لە داهاتوودا لەگەڵ چەپی ئێران هەمان بێت، ئەگەر ئەمەی تێدا نەبێ ناقیسە و کەم و کووری هەیە.

یەکێکی دیکە لە دەسکەوتەکانی ساغ کردنەوەی کۆمەڵە ئەوەیە کە لەناو ریزەکانی خۆیدا جم و جۆڵی سیاسی زیاد کرد، هەوڵ و تێکۆشان بۆ خوێندنەوە و تێگەیشتنی فیکری و سیاسی بردە سەر، هەوڵ دان بۆ بردنە سەری ئاستی وشیاری سیاسی زیاد کرد، تێکۆشەر بوون و فیداکاری و رەفاقەت و سەداقەتی جارێکی دیکە وەکوو میلاك و نۆرم لە ژیانی سیاسی کۆمەڵەدا هێنایەوە گۆڕێ. دۆست و دوژمن دەزانێ کە ئێمە لەم بووارەش دا، یانی لەبوواری پرەنسیپەکانی کاری ناو تەشکیلاتیش دا زۆر دەسکەوتمان بووە، زۆر خۆمان هەڵبڕیوەتەوە لەو حیزبەی کە رەهبەرییەکەی هەموو سوننەتە شۆڕشگێڕانەکانی رابووردووی کردبوو بە گاڵتە و هەموو شتێکی کردبوو بە خۆویستی و قازانج پەرستی شەخسی و سات و سەودا کردن بە بیروباوەر و سات و سەودا کردن بە هەڵویستی سیاسی. ئێمە خۆمان لەو شێوەکارانە هەڵبڕیوە و لە بوواری نێوخۆی رێکخراوییش دا دەتوانم بڵێم کەوتووینەتە سەر رێبازی دروست.

بەڵام با ئەوەش بڵێین کە لەم بووارەدا هێشتا زۆرمان رێگە ماوە کە بیپێوین. با بەراشکاوییەوە بڵێین کە هێشتا نەمان توانیوە خۆمان بکەین بەو حیزبە شۆڕشگێڕە پۆڵایینە کە هەموومان دەزانین پێگەیشتنی مەرجی سەرکەوتنمانە. لە حالێکدا کە چینە دەسەڵاتدارەکان هەموو ئیمکاناتێکیان هەیە، سەرمایە و سەروەت و سامانیان بەدەستە،

دەزگای دەوڵەتیان بەدەستە، دەزگاکانی راگەیاندن بە ئەوانە، حیزبێکی شۆڕشگێڕ وەکوو ئێمە تەنیا بیروباوەری پتەو، رێبازی سیاسی دروست و رێکخستنمان هەیە. ئێمە دەبێ لە تێگەیاندن و لە رێکخستنی سەرچاوەی لەبن نەهاتووی هێزی خۆمان، یانی وەکوو ئۆژێن پواتیە دەڵێ: کۆمەڵی مەزنی زەحمەتکێش، تێبکۆشین. چەکی ئێمەش بۆ ئەو کارە حیزبی شۆڕشگێڕە، ئەو چەکە دەبێ لەگەڵ مەبەست و ئامانجەکانی خۆی گونجاو بێت، دەبێ تەیار بێ بە تێئۆری شۆڕشگێڕ و دەبێ لە شۆڕشگێڕانی تێگەیشتوو و خاوەن بیروباوەر پێك بێت کە بردنە سەری ئاستی وشیاری سیاسی بە ئەرکی هەمیشەیی خۆیان دەزانن. هەروەها بە دیسیپلینێکی پۆڵایین تەیار بێ کە هەمیشە بەوپەری بەدەربەستی و خۆنەویستی‌یەوە بۆ بەرێوە بردنی دژوارترین ئەرکە سیاسی و رێکخراوەیی‌یەکان ئامادە بێت. دروست کردنی حیزبێکی وەها، یان باشتر ئەوەیە بڵێم کردنی کۆمەڵە بە وەها حیزبێکی شۆڕشگێڕ کە لە بیروباوەر و لە دیسیپلین دا پۆڵایینە، نموونەی شۆڕشگێڕی و خۆنەویستی‌یە، ئەرکێکی گەورەی سەرشانی ئێمەیە. دەروازە بەرووی دروست کردنی حیزبێکی ئاوا کراوەتەوە، بەڵام هەر وەکوو ئاماژەم پێکرد، ئێمە لەم بارەیەوە هەر لە سەرەتا داین. با ئەوەش بڵێم کە رەهبەریی کۆمەڵە، رەهبەریی داهاتووی کۆمەڵە هەرکەس بێت، دەبێ لەم مەیدانەدا پێشقەدەم و پێشەنگی هەمووان بێت.

ئەم بەشە لە قسەکانم کورت دەکەمەوە: دەڵێم کە تەنیا پرۆژەی ساغ کردنەوەی کۆمەڵە و سەرهەڵدانەوەی کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێران بوو کە توانی ئاخرین پەیوەندە فیکری و سیاسی‌یەکانی ئێمە لەگەڵ رەوتی ناسراو بە کۆمۆنیزمی کرێکاری بۆ هەمیشە بپسێنێ، کۆمەڵە بەشێوەیەکی لێبڕاوانە لە نەخۆشی و سستی و چوونە پەراوێزەوە، لە سیس بوون و توانەوە رزگار بکا و، جارێکی دیکە بیکاتەوە بە پێشەنگ و ئاڵاهەڵگری بزووتنەوەی جەماوەری ستەم لێکراو لە ئاستی کۆمەڵگادا، جارێکی دیکە شانسی چەپ و سۆسیالیست لە کوردستانی رۆژهەڵات بژێنێتەوە، ئاڵای کرێکاران و زەحمەتکێشان و شۆڕشەکەی ئەوان بەرز کاتەوە و، ئومید بە هاتنە گۆڕی ئالتێرناتیڤێکی پێشکەوتنخواز ببووژێنێتەوە. ئەو پرۆژەیە بوو کە ویژدانە نوستووەکانی وەخەبەر هێنا، بێهیوایی‌یەکانی کرد بە ئومێد و بە هیوا، ماندوو بووەکانی ساڵەهای لەوەپێشی هێنایەوە خۆ، پەیوەندە پساوەکانی سەرلەنوێ لێك گرێ داوە، بێدەنگی و خۆخواردنەوە و سەرداخستنی، کە بەداخەوە لەم ساڵانەی دوایی‌دا لە زۆرشوێنی کوردستانی ئێران ببوو بە بەشی ئەوانەی لە تەیفی کۆمەڵەدا بوون، نەمێشت و لە جێگەی ئەوانە سەربەرزی و سەروەڵ خۆشی هێنایەوە گۆڕ، کۆمەڵەی هێنایەوە نێوەراستی شانۆی سیاسی کوردستان و، ئیمکانی ئەوەی فەراهەم



کرد کە بەرنامە و سیاسەتەکانی بچێتەوە نێو خەڵك و سەر زار و زمانان، دەیان و سەدان هەزار لە جەوانان و نەوجەوانانی کوردستان کە پێشوو تەنیا ناو و باسی کۆمەڵەیان وەکوو ئەفسانەیەکی دوور بیستبوو، لەگەڵ سوننەت و خەباتی کۆمەڵە ئاشنای کردن و ئارەزووی فیداکاری لە ریزەکانی کۆمەڵەی لە دڵی ئەوان دا هەڵگیرساند. ئەمن بەچاوی خۆم دیومە کەسانێك، بەتایبەت نەسلی جەوانێك کە لە شارەکانەوە بۆ ئاگاداری سیاسی یان بۆ گرتنی پەیوەندی دێنە لامان، ئەو فەرقەیان لەگەڵ چەند ساڵی رابوردوو هەیە کە ئەگەر کاری شۆرشگێرانەیان پێ‌نەسپێری، ئەگەر ئەرکی قورسیان پێ‌نەسپێری گلەییت لێ‌دەکەن، پێیان وایە بروات پێیان نی‌یە، یانی ئەم بزاڤە وەکوو جاری جاران ئامادەیی بۆ فیداکاری لەژێر ئاڵای کۆمەڵەی شۆرشگێڕی زەحمەتکێشان لە نێو جەماوەرێکی بەرینی ئەو جەوانانەدا خوڵقاندووە و پەرە پێداوە.

من لێرەدا لە باسی لێکدانەوەیەکی گشتی لە یەك ساڵ چالاکی و هەڵسوورانی سەربەخۆی خۆمان دێمە دەرەوە و بەعزێك لە بووارەکانی فەعالییەتی خۆمان لە ساڵی رابوردوو دێنمە بەر چاوی هاورێیان و یەکە یەکە زۆر بە کورتی باسی ئەوە دەکەم کە چیان تێدا کراوە، کەم و کووری‌یەکانیان چین و بەتایبەت لە داهاتوودا دەبێ چیان بۆ بکرێ. لە کۆتایی راپۆرتەکەشدا بە لێکدانەوەیەك لە وزعی سیاسی ئێران و ئەو ئەرکانەی لەبەرامبەر ئێمەدا قەرار دەگرێ، کۆتایی بە قسەکانم دێنم.

لە پێشدا لە کاری کۆمەڵە لە شارەکان، یان بڵێین لە تەشکیلاتی نهێنی لە شار و دێهاتەکانی کوردستانەوە دەست پێدەکەم. یەکێك لە دیاردەکانی ئەم یەك ساڵەی رابوردوو بووژانەوەی بەرچاوی کاری سیاسی و رێکخستنی ئێمەیە لە شار و دێهاتەکانی کوردستانی ئێران. من لێرە بە گونجاوی نازانم کە گوزارشێکی ورد لەسەر ئەم بەشە لە کار بدەم، بەڵکوو بە چەند خاڵی گشتی و چەند تێبینی لەم بارەیەوە اکتفا دەکەم.

رەنگە زێدەرۆیی نەبێ ئەگەر بڵێین لە ماوەی یەك ساڵدا کە بەسەر کاری ئێمەدا تێدەپەرێ، زیاتر لە دە ساڵی رابوردوو خەڵکمان چاو پێکەوتووە. ئەوەشمان لەبیر بێ کە ئەوانە بەشێکی زۆر پچووکن لەو خەڵکەی کە لە ناوخۆی ئێران بووژاونەتەوە و بەرەو کۆمەڵە هاتوون. یانی بە تەئکید دەتوانم بڵێم نەك یەك لە دە بەڵکوو یەك لە سەتی ئەو خەڵکەی کە بەرەو کۆمەڵە هاتوون ئێمە هێشتا چاومان پێیان نەکەوتووە. جگە لەوە، تەنیا ژمارەی ئەو کەسانەش کە دێن بۆ لای ئێمە شەرت نی‌یە، خاڵێکی گرینگ ئەوەیە کە ئەوعییەتی ئەو کەسانە، ورەیان، گەرم و گوری‌یان، ئامادەیی‌یان بەکار و زۆر شتیان فەرقی کردووە، دیارە



ئەو قسانەش کە ئێمە پێیان دەڵێین زۆر لەگەڵ رابوردوو جیاوازە. با ئەوەش بڵێم ئەوانەش کە ئێمە دیومانتەتەوە، هەمووی بە هەڵبژاردنی خۆمان نەبووە، لەبەر ئەوە ئێمە ئەمان توانیوە و ئەمان ویستووە هەمیشە و لە هەموو مەوریدێکدا باشترین کادرەکانی ئەو بزووتنەوەیە ببینینەوە. تێیان دابووە سەرەتای کاری سیاسی‌یان بووە، بەڵام دەتوانێ وەك مشتێك نموونەی خەروار وەزع و فەزامان لە کوردستانی ئێران پێ‌نیشان بدا. ئێمە لەنێو تەیفی کۆمەڵە، لەنێو هەڵسووڕاوانی سیاسی، چ لەنێو ئەو نەسڵە قەدیمی‌ترەی کە سارد ببووەوە، دڵسارد ببووەوە، ئومیدێکی نەمابوو و ئێستا بووژاوەتەوە و هەروەها لەنێو نەسلێکی تازەدا کە ئێستا پێ دەنێتە مەیدانی خەباتی سیاسی و رێکخراوەیی، خەڵکمان دیوەتەوە و ئەوانەی بەتایبەتی لەنزیکەوە پەیوەندی‌یان بەم کارەوە بووە دەزانن ئەو پەیوەندی‌یانە چەند و چۆن بوون.

کە دەڵێم پەیوەندیمان زۆر بووە با هەر لێرە تبصرەیەکی لەسەر دانێم: من بە بەراورد لەگەڵ ئەو رکود و سستی جاران دەڵێم زۆرە و رەزایەتی لێ‌دەردەبڕم، دەنا هێشتا زۆر دوورە لەوەی کە کۆمەڵە دەبێ هەیبێ. تەشکیلاتی کۆمەڵە، نەك تەنیا بە رێکخستنی نهێنی بەڵکوو بە سیاسەت، بە نفووزی جەماوەریی و هەروەها بە پتەو بوونی رێکخراوەکانی، دەبێ سەدان قات لەوە گەشەدارتر بێت و ببێتە یەکەم رێکخستنی کوردستان. ئەسڵەن بۆ نابێ کۆمەڵە جێگەی حیزبی سەرەکی و یەکەمی کوردستان بۆخۆی مسۆگەر بکا؟ کێ دەڵێ باڵی چەپ لە کوردستان ناتوانێ و نابێ بەمەودایەکی زۆر هەموو رەوتەکانی دیکە بەجێ بهێڵێ؟ توانایی و زەرفییەتی فیکری و سیاسی کۆمەڵە ئەو ئیمکانەمان پێ‌دەدا، دروستیی رێبازی سیاسی کۆمەڵە ئەو مەودایەمان پێ‌دەدا. جەزابییەتی سیاسەت و رێباز و مێتۆدی کاری کۆمەڵە بۆ تێکۆشەرێکی ئەم سەردەمەی ئێمە، بۆ سەدان هەزار و بگرە میلیۆنەها جەوانی کوردستان زیاترە، بۆ کرێکاران قسەی زیاترمان پێیە، بۆ ژنان، بۆ لاوان، بۆ رووناکبیران، بۆ مەسەلەی نەتەوەیی، ئێمە قسەی زیاترمان پێیە. ئێمە حیزبی داهاتووی کۆمەڵگای کوردستانین کە گەشە کردنی کۆمەڵایەتی و سیاسی زەمینەمان لێ ناستێنێتەوە بەڵکوو زەمینەی زیاترمان دەداتێ. هەر بۆیەش جێی خۆیەتی ئەو ئامانجە سیاسی‌یە لەبەر پێی خۆماندا دابنێین، بەڵام دیارە ئێمە شێوەی خۆداسەپاندن و پاوانخوازی رەت دەکەینەوە و رێگە و شێوەی سیاسی و دێمۆکراتیکی خۆمان بۆ گەیشتن بەو ئامانجە هەیە. لەهەرحاڵدا، مەبەستم ئەوە بوو کە لەچاو وەها داهاتوویەك ئێمە هێشتا هیچمان نی‌یە، شتێکی ئەوتۆمان نی‌یە، بەڵکوو دەتوانین لەچاو رابوردووی ئەم چەند ساڵە وەکوو کرانەوەی دەروازەیەك باسی بکەین.



سەرەتا، سەروبەندی بەستنی کۆنفرانسی ساغ کردنەوەی کۆمەڵە و بەدوای ئەوەش دا تا چەند مانگێك، دەتوانم وەکوو قۆناغێك نێوی بەرم و بڵێم قۆناغی ساغ بوونەوە و ساغ کردنەوە بوو. زۆرێك لە کەسان، لە شارەکانی کوردستانەوە دەهاتن، بۆ لای ئێمەش دەهاتن، بۆ لای حیزبی کۆمۆنیستی ئێرانیش دەچوون. با ئەوەتان پێبڵێم سەرەتا زۆر کەس بەو جیاییە ناڕەحەت و عاجز بوون، چونکە پێیان وابوو کۆمەڵەی تێدا زەعیف دەبێ، هەرچەند لەهەمان حاڵدا جۆرە هیوایەکیشیان بوو کە ڕەنگە ئەو کارە بە چاك بگەڕێتەوە. لەهەرحاڵدا، لەو چەند مانگە سەرەتایی‌یەدا ئێمە زۆر بە خەست و خۆڵی کاری ئەسڵیمان ئەوە بوو کە لەسەر مەسەلەی ساغ کردنەوە کار بکەین، تەوزیحی بدەین کە بۆ ئەم جیایی‌یە لە حیزبی کۆمۆنیستی ئێران پێویست بووە، تەوزیحی بدەین ڕێبازی ئێمە چی‌یە، داهاتوومان چی‌یە، هەم لە سیاسەت و هەم لە مەسائیلی ناوخۆیی ڕێکخراوەیی‌دا ئێمە تەوزیحی زۆرمان بۆ ئەوان دا. دەتوانم بڵێم بەگشتی و سەرجەم ئێمە لەم بووارەدا سەرکەوتنی گەورەمان بەدەست هێنا. زۆرێك لەو کەسانە، ناڵێم هەمووان، بەڵام بە تەئکید زۆرایەتی‌یەکی زۆر باڵا لەوانەی کە سەری هەردووك لامانیان دا بەلای ئێمە دا ساغ بوونەوە؛ بەتایبەتی هەرچی زەمان تێپەڕی ڕەوتی ئەم پرۆسەیەش خێراتر بوو.

دوای ماوەیەك ئێمە هەستمان بەوە کرد کە بڵاوکراوەی ئێمە کەم بڵاو دەبێتەوە، هەر بۆیەش هەوڵێکمان دا لە شارە جۆربەجۆرەکانی کوردستان، نووسراوەکانمان، تراکتمان، ڕاگەیاندنەکانمان، نشریەمان بڵاو بکرێتەوە. دەتوانم بڵێم لەم بووارەشدا ناسەرکەوتوو نەبووین و بەتایبەت لەچاو ساڵانی ڕابوردوو ئێگجار زۆر شتمان بڵاو کردۆتەوە، بۆ زۆرێك لە ڕۆژەکان و بۆنەکان و سووژەکان ئێمە شتمان بڵاو کردۆتەوە: لە دژی ئعتیاد، بۆ ڕاگەیاندنی ساغ کردنەوەی کۆمەڵە، بۆ بیست و شەشی ڕێبەندان ڕۆژی کۆمەڵە، بۆ ڕۆژی ژنان، بۆ نەورۆز، بۆ هەوەڵی مانگی مەی، بۆ ڕۆژی ٣١ی جۆزەردان ڕۆژی پێشمەرگەی کۆمەڵە، بۆ تەحریمی هەڵبژاردنی سەرکۆماری، ڕەنگە هەموویم بەباشی لەبیر نەمابێ، بۆ زۆر بۆنەی ئاوا شتمان بڵاو کردۆتەوە و لە ئاستێکیشدا ئەو کارەمان کردووە کە، تا ئەو جێگەیەی من بزانم و لێی ئاگادار بم، لە ساڵەهای ساڵ لەوە پێشەوە بەو ژمارە و میزانە لە شارەکان شت بڵاو نەبۆتەوە.

نوکتەیەکی جالب لێرەدا کە دەتوانێ وەزعی بزووتنەوەکە و ئامادەیی خەڵکمان پێ نیشان بدا ئەوەیە کە هەموو ئەو ژمارە و تیراژە لێرەوە نەچۆتەوە، بەشێکی زۆر لەوانە لەلایەن خودی خەڵکەوە لەبەریان گیراوەتەوە. لەبیریشمان نەچێتەوە کە خەڵك ئێستا فەقیرن، وەکوو جارانی بیست ساڵ لەوە پێش نی‌یە کە هەموو کەس پاشەکەوتی هەبێ، خەڵك ئێستا لەچاو

جاران زۆر هەژار بوون و ئەزانەش کە لەگەڵ ئێمەن مەعموولەن توێژە هەژارەکانن، بەو حاڵەشەوە و بە هیممەت و فیداکاری شەخسی خۆیان هەم لە تەکسیر و هەم لە بڵاو کردنەوەیدا تۆڕێك دەست بەکاربووە کە ئێمە هەر ناشیناسین.

ئێمە هەروەها هەوڵمان داوە بۆ تێگەیشتن و ناسینی مەسائیلی فیکری و عەمەلی تێکۆشەرانی ئێستای کوردستانی ئێران. هەوڵمان داوە گیروگرفتی فیکری و سیاسیان بناسین و بزانین ئێمە چۆن دەبینن، پەیوەندیان لەگەڵ ئەم بزووتنەوی ئیسلاحاتە کە ئێستا لە ئێران هەیە، لەگەڵ رەوتی لیبرالی، لەگەڵ رەوتەکانی دیکە کە لەلایەن حیزبەکانی دیکەوە نوێنەرایەتی دەکرێن، چییە و تێگەیشتنیان لەوان چۆنە؟ ئاستی تەجروبە و لێزانییان لە کاری تەشکیلاتی نهێنیدا چەندەیە؟ هەوڵمان داوە کە ئێمەش لە ئەوان بگەین و لەم رێگەیەوە ئێمەش زۆر شت لەوان فێر بووین. هەروەها تا تارادەیەکیش لە کار پێسپاردن و رێکخستنی کارەکانیش دا هەوڵمان داوە.

سیاسەتێك کە دەتوانم بڵێم لە کاری ئەم دەورەدا لەبەر چاومان بووە، بار هاتنی هەڵسووڕاوان لە پرۆسەی تێکۆشانی خۆیاندا بووە، ئەوەی کە دەبێ لە کوورەی تێکۆشانی خۆیان لە شوێنی کار و ژیان و هەڵسووڕانی خۆیاندا قاڵ بن و لەوێدا پێبگەن. لە پرۆسەیەکی وەها دایە کە وردە وردە ئەوانەی شایستگییان زۆرترە، قودرەتی رەهبەرییان زۆرترە دەتوانن بێنە سەر، یانی جۆرێك سیاسەتی هەڵبژاردنی تەبیعی، یان باشترە بڵێین هەڵبژاردن لە پرۆسەی تێکۆشانمان بۆ هەڵسووڕاوان و لایەنگرانی خۆمان رەچاو کردووە. لەجیاتی ئەوەی ئێمە لەسەرەوە خەڵکیان بۆ دیاری کەین، لێگەراوین لەپرۆسەی تێکۆشانی عەمەلیدا تەجروبە کۆ کەنەوە، زانست کۆ کەنەوە و بێنە روو.

خاڵێکی دیکەی کە هەمیشە هانمان داون بیکەن ئەوەیە کە تەنیا لە چوارچێوەی رێکخراوەی خۆیان و سرت و خورتی نێو خۆیان نەمیننەوە، بەڵکوو هەوڵ بدەن ببن بە کادری راستەقینەی بزووتنەوەی جەماوەری، هانمان داون کە لەنێو خەڵك دا کار بکەن، بەتایبەت لەم دەورەیەدا هەرچەندی مومکینە لەکاری جەماوەری، لەکاری فەرهەنگی، لە کاری ئتحادیەیی، لەکاری رێکخراوە جۆربەجۆرەکان، لەکاری عەلەنی، لەم جۆرە کارانە خۆیان نزیك کەنەوە. تەشکیلاتی ئێمە نابێ جەماعەتێکی سەرلە قالان خستووی سرت و خورت کەری بێخەبەر لە بزووتنەوەی خەڵك بن، ئەمە مودیلی پێشووی حیزبی کۆمۆنیستی ئێران بوو، ئەو مودێلە تەواو بوو. کادری تەشکیلاتی ئێمە دەبێ دەقیقەن لە پرۆسەی خەبات و بزووتنەوەی جەماوەریدا پەروەردە بێ و ئێمە ئاوامان هەنگاو هەڵگرتووە.

لەپاڵ هەموو ئەوانەشدا ئێمە مەجموعەیەکمان کەم و کووری هەیە کە هەر بەکورتی ئیشارەی پێدەکەم: پێش هەموو شتێك ئیمکاناتی ماددیمان بۆ ئەو بەشە لە تەشکیلات ئێگجار زۆر کەمە، ئەمەش بەحیسابی گلەیی ئۆرگانی نالێم، سەرجەم توانیومانە هەر ئەوەندە بۆ ئەم بەشە تەرخان بکەین. جێگەی خۆیەتی کە وێڕای باشتر کردنی وەزعی مالی کۆمەڵە، سەهمێکی زۆر زیاتر و جێگەیەکی زۆر بەرجەستەتر و باشتر لە جاران لەم بارەیەوە بۆ ئەم بەشە لە کار تەرخان بکەین.

هەروەها کادر و هێزێکی ئینسانی کە بۆ ئەو بەشەمان تەرخان کردووە هێشتا کەمە، لە ئاستی خۆیدا نی‌یە، فریا ناکەوێ. ئەم دەورەی ئەخیری کە من بەرپرسی ئەو کارە بووم، دەتوانم بڵێم بە هەوڵی هەموو ئەو هاورێیانەی کە لەم بەشە کاریان کردووە و زەحمەتیان کێشاوە، ئەوەندەمان بۆ کراوە کە شەپۆلێك کە بەرەو لای ئێمە دێت لەکیسی نەدەین، ئەگەر ساغ کردنەوەیەکی دەوێ بیکەین، ئەگەر وەختی کار پێ‌سپاردن و کاری عەمەلی هاتووە بیکەین. بەڵام هێشتا بەباشی بەسەر کاروباری هەڵسووڕانی نهێنی لە ناوخۆی کوردستان سوار نین و نەمان توانیوە وەکوو ناوەندێکی رەهبەری، بە ئیبتیکار و بەرنامەی خۆمان بەرێوەی بەرین. ئیمکاناتی ماڵی و هەروەها کادر و هێزی ئینسانی تەرخان کراو بۆ ئەو بەشە لەوە کەمترە کە بتوانین ئەو شەپۆلە گەورەیە و ئەو ئێنێرژی‌یە فراوانە کۆنترۆڵ کەین و بیخەینە گەر. چارەسەر کردنی ئەم کەم و کووری‌یە، تەگبیری خێرای دەوێ.

موشکیلێکی دیکەمان ئەوەیە کە بەتایبەت بەشی گەنج و تێکۆشەرانی تازەساڵتر، تەجرەبەیان لەکاری خۆیاندا کەمە. هەروەکوو چۆن پێشمەرگەی ئێستای کۆمەڵە، سەرەرای هەموو هەوڵ و تێکۆشانی، تەجرەبەی ئەو پێشمەرگە قەدیمی‌یەی کۆمەڵەی نی‌یە کە قاڵبووی سەدان دەرگیری و ئاڵوگۆر و بەسەرهات بوون لە ژیانی فەردی و جەمعی خۆیاندا، چ ناو خەڵك و چ لە ژیانی پێشمەرگانەدا، هەر بەم جۆرەش بەشی تازەکارتری هەڵسووراوانی ئێمەش لە ناو ئێران عەینەن ئەو کەم و کووری‌یەی هەیە. یانی تەجروبەی پێویستی نی‌یە و خۆپاراستن و نهێنی‌کاریشی کەمە. ئێمە ئەم بەینە هەوڵێکی دائیمیمان لە گەڵ ئەو هاورێیانە ئەوە بووە کە لەم بارەیەوە قسەیان لەگەڵ بکەین و داوای بەرێوەبردنی نهێنی‌کاری‌یان لێبکەین.

بەڵام لەپاڵ هەموو ئەهمییەتی فێربوون و بەکار بردنی ئوسووڵی نهێنی‌کاری‌دا، نابێ لەبیرمان بچێتەوە کە ئەم دیاردەیە تەنیا ناگەرێتەوە سەر جەوان بوون و کەم تەجرەبە بوونی هەڵسووراوانی ئێمە، بەڵکوو هۆیەکەی لە ئاستێکی گەورەتردا گۆڕانی فەزای سیاسی و هاتنە ئارای دەورەیەکی سیاسی تازەیە لە ئێران و لە کوردستاندا. بەگشتی خەڵك نەترسترن، بوێرترن، هەموو کەس لە تەلیفوندا قسە دەکا، هەموو کەس لە خیابان، لەنێو تاکسی، لە

کووچە و کۆڵان قسە دەکا و شێوەکاری نەسلی تازەی هەڵسووڕاوانی ئێمەش تا رادەیەک رەنگ دانەوەیەکی ئەم وەزعە گشتی‌یەیە. هەروەها بەپێویستی دەزانم جارێکی دیکەش دووپاتی بکەمەوە کە هەڵسووڕاوی ئێمە لە شارەکان نابێ لەژێر ناوی ئەوەی کە خۆی لە پۆلیس دەشارێتەوە، فەردێکی کزی بێ‌لایەنی دوور لە بزووتنەوە بێ؛ بەڵکوو دەبێ لە عەینی حاڵدا بەژیری و وریایی‌یەوە بزانێ چلۆن خۆی بەپۆلیس و ئیتیلاعاتەوە نادا و چۆن کارەکانی خۆی دەکا بەبێ ئەوەی دەگیر بکەوێ.

ئەوەش دەزانن کە لە نهێنی‌کاری تەشکیلاتی‌دا ئێمە هەمیشە دوو لایەنمان هەیە: لایەنێکی ئەو کارە بەشی فەننی و زانست و مەهارەتێکە کە دەبێ بە تەمرین و تەجروبە فێری بی و سەلیقە و لێزانینی ئەو کارە لای خۆت کۆ کەیەوە. بەشێکی دیکەشیان شەبەکە و تۆڕی پەیوەندی‌یەکی بەرینی جەماوەری‌یە کە تۆ لەنێو ئەو دەریای خەڵکەدا دەشارێتەوە.

یەکێکی دیکە لە کەم و کووڕی‌یەکانی بەشێک لە هەڵسووڕاوانی ئێستامان، کەم بوونی ئینسیجامی سیاسی و ئیدیۆلۆژیکیانە. هێشتا هاوخەتی کامڵ لەنێویاندا نی‌یە، بیرکردنەوەی جۆراوجۆر و هێندێک جار لار و لوێر کەم نی‌یە لە ناویاندا. تەنانەت بەعزێک لەوانەی بەناوی هەڵسووڕاو دێن و پەیوەست دەبن بە کۆمەڵە و ئامادەیی خۆیان بۆ کار نیشان دەدەن، مێژووی کۆمەڵە ناناسن و لەراستی‌دا لەباری فیکری‌یەوە ئاوێتەیەکن لە مارکسیزم و لیبرالیزم. هەڵبەت بەبروای من نابێ لەم سەردەمەی ئێستادا لەم بارەیەوە زۆر سەختگیر بین؛ نابێ فەورەن هەڵبەزینەوە و لە زەوقیان بدەین. دەبێ ئەوەڵ پەیوەندی هاورێیانە و گەرم و گوڕیان لەگەڵ دابمەزرێنین، قسەکانیان گوێ بدەینێ و سەرنجیان بۆ لای خۆمان راکێشین، لە پرۆسەی کار کردن و گەشە کردنی خۆیاندا بەکاوەخۆ قسەیان لەگەڵ بکەین و رێبازی سیاسی دروستیان بۆ تەوزیح بدەین.

خاڵێکی کەم و کووڕی دیکەی ئێمە لەم بووارەدا، زەعیف بوونی ئیرتیباتاتمانە. دەتوانین بڵێین لەچاو پێشوو باشە؛ بەڵام بەهیچ جۆر لە ئاستی پێویستدا نی‌یە..... یەکێک لە بەرهەمەکانی تری ئەوەیە کە هێشتا گۆڤار و بڵاوکراوەکانی ئێمە لەو ئاستەدا کە پێویستە و بەو رێک و پێکی‌یە کە پێویستە بڵاو نابێتەوە و زۆر شتی تریش......

بەڵام بە هەمووی ئەوانەشەوە بەدڵنیایی‌یەوە دەتوانین بڵێین کە بە دوای ساڵەهای ساڵ رکود و کزی لەم بووارەدا، دەروازەی کارێکی گەورەی سیاسی – تەشکیلاتی لە ناوخۆی کوردستان بەرەورووی کۆمەڵە کراوەتەوە.



مەیدانێکی دیکەی هەڵسووڕانی یەک ساڵی ڕابوردوو، کاری ساغ کردنەوە و پەرەپێدانی هێزی پێشمەرگەی کۆمەڵەیە، ئەو بەشە لە تەشکیلات کە هێشتا بەعزێک جار بەهەڵە پێی دەگوترێ "تەشکیلاتی عەلەنی". یەکێک لەو کارانە کە ئێمە کردمان، سەروسامان پێدان و ڕێکخستنی بەشی هێزی پێشمەرگە و تەشکیلاتی پێشمەرگە و دامەزراندن و خستنەوە گەڕی فێرگەی پێشمەرگایەتی بوو. دیارە لەو وەختەوە ئێمە فێرگەی پێشمەرگایەتیمان کاری کردووە، هاوڕێیانی جۆربەجۆری ئێمە کە لەوێ بوون زەحمەتێکی زۆریان کێشاوە کە جێگەی ڕێز و پێزانینە. بەڵام هەر لەسەرەتاوە هەستمان دەکرد پێداچوونەوەیەکی جیددی بەسەر ئامووزشی سیاسی و نیزامی ئێمە پێویستە. ماوەیەک لەوە پێش کۆمیسیۆنێکمان لە کۆمیتەی ناوەندی بۆ لێکۆڵینەوەی ئەو بەشە دانا کە دەسکەوتی باشیشی بوو و بیرکردنەوەکانی کرد بەیەک و بەعزێک بەڵگەنامەشی لەم بارەیەوە تەهییە کردووە. کاروباری کۆنگرە مەجالی نەدا کە ئەو کارە بەتەواوی جێبەجێ و پیادە بکرێ و دەمێنێتەوە بۆ کۆمیتەی ناوەندیی داهاتووی هەڵبژێردراوی ئەم کۆنگرەیە کە ئەو سیاسەتانە لەگەڵ بەرپرسانی ئەو بەشە بێنێتە گۆڕ و دوایەش بۆ هەموو تەشکیلات تەوزیع بدرێ و پیادە بکرێ.

تا ئەو جێگەی کە دەگەڕێتەوە سەر ئێمەی کۆمیتەی ناوەندیی پێشوو، بەبڕوای ئێمە ئەم پێداچوونەوە بە کاری وەرگرتن و فێرکردن و ڕاهێنانی پێشمەرگە دەبێ لە خزمەت ئەوە دابێ کە لە گوزینش و هەڵبژاردندا باشترینەکان هەڵبژێرین، فێرکردنمان لە زەمینەی سیاسی و نیزامی‌دا ئەمرۆیی و گونجاو لەگەڵ هەل و مەرجی ئێستای خۆمان ڕێکەین و بار هێنانی پێشمەرگەی تازەی کۆمەڵەش بەرهەمەکەی ئەوە بێ کە ڕووحی فیداکاری و شۆڕشگێڕی، باڵاتر دانانی کۆمەڵە لە هەموو قازانج و دەسکەوتێکی شەخسی، خزمەت کردن بە کرێکاران و زەحمەتکێشان، ئامادەیی بۆ هەڵسووڕانی ماندوویی‌نەناسانە و دڵسۆزانە لەڕێزەکانی پێشمەرگەی کۆمەڵەدا بەباشترین ئەوع لە مێشك و زەینی ئەواندا بچەسپێ و دەروازەیەکیش بکاتەوە بۆ ئەوەی بە فێربوونی سیاسی عەلاقەمەند بن و لە داهاتوودا بتوانن لەباری وشیاری سیاسی‌یەوە ئاستی خۆیان بەرنە سەرێ.....

یەکی دیکە لە کارەکان کە لە ساڵی ڕابوردوودا کراوە، بریتی‌یە لە دامەزراندن و خستنەگەڕی ئۆرگانەکان کە تارادەیەکی زۆر چۆتە پێش و هەمووتان لێی ئاگادارن و منیش بە پێویستی نازانم کە لەسەر وردەکاری‌یەکانی بڕۆم. بەڵام ئێمە لەو بڕوایە داین کە کۆمیتەی ناوەندیی داهاتوو بەدوای ئەم کۆنگرەیەدا دەبێ سەرجەم پێداچوونەوەیەک بە هەموو ئۆرگانەکان و هەموو بووارەکانی کاری ئەم بەشە لە تەشکیلات دا بکات.

یەکێك لەو کەم و کووڕییانە کە لەم بەشەدا نەکرا لە ماوەی یەکساڵەی پێشوودا بەشێوەی گونجاو جوابی پێبدرێتەوە، ئامووزشی نێوخۆیییە. ئێمە لەو بەشەمان زۆر زەعیفە، چ ئامووزشی سیاسی چ ئامووزشی نیزامی. ئەوانەی کە لە فێرگەی پێشمەرگایەتی دێنە دەر بۆ ماوەیەك لەگەڵ بۆشایییەك بەرەوروو دەبن و تەفسیری چاك وەر ناگرن. دەبێ هەوڵ بدرێ کاری فێرکردنی سیاسی و نیزامی وەکوو کارێکی بەردەوامی لێبێت و بەین بەین دەورەی دیاریکراوی بۆ دابندرێ. دەبێ بتوانین دەورەیەك دوای ئەم کۆنگرەیە لە فرسەتی موناسب دا بۆ پەروەردە کردنی کادر دابمەزرێنین کە لە ساڵی پێشوو لەبەر سەرقاڵی زۆر و کەمی کادری مامۆستا بۆمان بەرێوە نەچوو.

هەروەها دەبێ پەیوەندی رەهبەری لەگەڵ ئەم بەشە لە تەشکیلات و دیالۆگ و کۆبوونەوە لەنێوانیاندا زۆرتر بێت. ماوەی رابوردووش بەپێی توانا هەوڵ درا، بەڵام هێزی رەهبەری ئەوەندە زۆر نەبوو و سەرقاڵییەکان ئەوەندە زۆر بوون کە نەی هێشت ئەو کارە بەو چڕوپڕییەی کە پێویستە بەئەنجام بگا.

یەکی دیکە لە پێویستییەکانی ئێمە ئەوەیە کە جێگامان تەنگە، پێویستە ئوردوگایەکی دیکە دابمەزرێنین کە لە فیکریدا هەین و هەنگاوە سەرەتایییەکانیشمان بۆ هەڵگرتووە.

هاورێیان، بەشێکی تر لە فعالییەتی ئێمە کاری هەڵسوورانی کۆمەڵە لە دەرەوی وڵاتە. قۆناغی یەکەم لە پێش جیابوونەوەی کۆمەڵە و سەروبەندی کۆنفرانسی ساغ کردنەوەی کۆمەڵە و بەدوای کۆنفرانسیشدا تا ماوەیەکی چەند مانگی، دەتوانین نێوی بنێین قۆناغی باس و موناقەشەی سیاسی بۆ دیفاع لە هەڵویستەکانی کۆمەڵە و جواب دانەوە بە هێرشەکانی‌حیزبی کۆمۆنیستی ئێران و جواب دانەوە بە پرسیارەکان و نیگەرانییەکان و ئیسباتی هەقانییەتی کارەکەی کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێران و سەرجەم راکێشانی رای گشتی بۆ لای خۆمان. ئەگەر ئەمە بە قۆناغێك دابنێین، دەتوانین بڵێین کە ئێمە بێگومان تێیدا سەرکەوتوو بووین. بەگوێرەی گوزارشی هاورێیانمان لە دەرەوەی وڵات، لەهەموو شوێنێك بێجگە لە شاری ستۆکهۆڵم ئێمە وەزعمان لەناو خەڵك و لەناو تەیفی کۆمەڵەدا بەرادەیەکی زۆر لە نەیارانمان چاکترە و، بەراشکاوییەوە دەتوانین بڵێین لەباری سیاسییەوە پرۆژەکەمان لای بەشێکی بەرچاو لە خەڵك و هەڵسووراوانی سیاسی و بەتایبەت تەیفی کۆمەڵە چەسپاوە. گەرچی ئەمە بەو مەعنایە نییە کە لەبواری رۆشن کردنەوە و ساغ کردنەوەدا کارێك نەماوە بیکەین و هەموو شتێك کۆتایی پێهاتووە، گەرچی ئەم کێشەیە



جارێ درێژەی هەیە، بەڵام تا ئێستا ئێمە لەباری سیاسی‌یەوە لایەنی براوە بووین. دیارە ئەمەش بە زەحمەت و هیممەت و خۆماندوو کردنی زۆرێك لە هاورێیانمان بەدەست هاتووە کە جێگەی سوپاس و پێزانینە.

بەڵام کە دێتە سەر دامەزراندنی ڕێکخراوێك و شێوەکارێك کە بۆ هەڵسووڕانی حیزبێکی وەکوو کۆمەڵە، بەو مەبەست و ئامانج و هەدەفانە کە بۆخۆی داناوە، گونجاو بێت، دەبێ ئیعتیراف بکەین کە ئێمە هێشتا لەسەرەتا داین. هێشتا زۆر شت لەبارەی چۆنیەتی و شێوەی کارمان لە دەرەوەی وڵات، نەوعی ڕێکخراومان لە دەرەوەی وڵات، ئامانجە دیاری‌کراوەکانمان لەو بووارەدا، ماونەتەوە کە جوابیان پێ‌نەدراوەتەوە، هێشتا سەرلێشێواوی و چەند مودێلی لەکاری ئێمە لە دەرەوەی وڵاتدا وجوودی هەیە.

یەکێك لەو کارانەی کە لەسەر کۆمیتەی ناوەندیی داهاتوو فەرزە، بریتی‌یە لەوەی کۆبوونەوەی تێروتەسەل بکا، وە ئەگەر بتوانێ دەعوەت لە خەڵکانێکی لێزان و لە عەلاقەمەندانیش بکا، تا ئێمە بەتەواوی لەسەر شکڵ و شێوە و چۆنیەتی و ئەهدافی کارمان لە دەرەوەی وڵات ساغ دەبینەوە و بەرهەمەکەشی بکا بە بریار و ڕێنوێنی‌گەلێك کە لەسەر ئەو ئەساسە هەموو ڕێکخراوی ئێمە لەدەرەوەی وڵات بکەوێتە گەڕ. بۆ نموونە، نوێنەرایەتی کۆمەڵە لە دەرەوەی وڵات دەبێ زۆر لەوە بەهێزتر بکرێت.

پەیوەندی‌یەکانی دەرەوەی کۆمەڵە، چ پەیوەند لەگەڵ ڕێکخراوە کرێکاری و چەپەکانی دەرەوەی وڵات و دنیا، چ پەیوەندی دیپلۆماسی، چ ئەو جێگایەی کە ئێمە لەگەڵ ڕاگەیەنە گشتی‌یەکان و رادیۆ و چاپەمەنی و ڕۆژنامەکان پەیوەندی پەیدا دەکەین، چ ئەو جێگایەی لەگەڵ ڕێکخراوە خێرخوازەکان یان هەر لایەنێکی گونجاو لەتەك سیاسەت و پرەنسیپەکانی خۆمان بۆ بەدەست هێنانی ئیمکاناتی ماددی تەماس دەگرین، هەمووی ئەوانە دەبێ چالاکی‌یەکی ئێکجارتر زۆر بەخۆیەوە ببینێ و بەتەواوی ئاوەدان بکرێتەوە. هاورێیان، ساڵەهای ساڵ بوو نێوی کۆمەڵە لەسەر ئەو ڕاگەیەنە گشتی‌یانە کوێر ببووەوە، ئێستاش هەر ئەو بۆشایی‌یە پڕنەکراوەتەوە. کۆنفرانس دەگرن لەسەر مەسەلەی کورد، ئەوەی دەعوەتی ناکەن کۆمەڵەیە.... دەبێ کارێکی وا بکەین کە کۆمەڵە لەم بووارەدا بەتەواوی مانا ببووژێتەوە و وەکوو حیزبێکی ڕابەری بزووتنەوەی گەلی کورد لە کوردستانی ئێران ببێتە پای سابیتی هەموو کۆبوونەوەیەکی گەورەی جیهانی و ناوچەیی لەسەر مەسەلەی کورد. ئێمە لەم ڕێگایەوە دەبێ بتوانین دەنگی بزووتنەوەی ڕەوای خەڵکی کوردستان بە هەموو دنیا ڕابگەیەنین. کۆمەڵە لەهەمان حاڵدا کە لەباری جیهان بینی و وابەستەگی چینایەتی خۆیەوە حیزبی کرێکارانە، نوێنەری گەلی کوردیشە لە بزووتنەوەکەی خۆیدا و دەبێ بەم عینوانە لە

ئاستی جیهانی‌دا خۆ بنوێنێ و بەو عینوانە بتوانێ ڕێگەی خۆی بکاتەوە بۆ هەموو شوێن و کۆڕ و کۆمەڵێکی نێونەتەوەیی کە لەسەر ئەو مەسەلەیە کار دەکەن یا قسەیەکیان هەیە لەسەری.

ئەوەش بڵێم کە هەموو ئەو کارانە و بەگشتی هەموو کار و هەڵسووڕانی ئێمە لە دەرەوەی وڵات، هەر وەکوو تەجروبەی ئەم دەورەیەش نیشانی دا، دەبێ پەیوەندێکی نزیکی هەبێ لەگەڵ سەرجەم ئەرکەکانمان و لەخزمەت سیاسەت و هەڵسووڕانی کۆمەڵە بەگشتی دابێ و، لەباری ڕێکخراوەییشەوە ئەو کۆمیتە یان کۆمیتانەی کە لە دەرەوەی وڵات هەمانە دەبێ ڕاستەوخۆتر سەر بە کۆمیتەی ناوەندیی کۆمەڵە لە کوردستان بن و وەکوو هەر بەشێکی دیکەی تەشکیلات لەژێر چاوەدێری‌یەکی زۆر نزیکتر دابن لە چاو ئەوەی کە لە ساڵی پارەکە بوون.

ئاخرین شتێکیش کە پێم وایە دەبێ لە تەشکیلاتی دەرەوەماندا بکرێ، هەر وەکوو دەبێ لە هەموو کۆمەڵەدا بکرێ، ئەوەیە کە هەم ئاستی چالاکیمان و هەم ئاستی تێکۆشەر بوونمان بچێتە سەر. لەڕاستیشدا لە ساڵی ڕابوردوودا چۆتە سەر، فەرقی بەرچاوی کردووە، ئەو سستی و خەواڵوویی و هیچ نەکەری و قسەزلیی جاران، ئەو دووری و بێ‌وازی سیاسی و خۆتینەگەیاندنەی جاران، کە پێناسەیەکی حیزبی کۆمۆنیستی ئێران لە دەرەوەی وڵات بوو، بەڕاستی لەکاری ئێمە لە دەرەوەی وڵاتدا کەم بۆتەوە. تۆزێك لەو مەیدانەدا خۆمان هەڵبرییوەتەوە، بەڵام لەو بڕوایە دام تەشکیلاتی ئێمە لە دەرەوەی وڵات و هەڵسووڕانی ئێمە لە دەرەوەی وڵات دەبێ مەودایەکی زۆر زیاتر لەگەڵ ئەو سستی‌یە بگرن، ئاستی چالاکیمان دەبێ زۆر لەوە زیاتر بچێتە سەرێ، هەروەها ئاستی تێکۆشەر بوون، ئاستی زەحمەت کێشان و فیداکاری و لەخۆ مایە دانان بۆ کار لەپێناو کۆمەڵەدا دەبێ زۆر زیاتر بێ لەوەی کە ئێستا هەیە، ئەگەر بمانەوێ ئەو حیزبە بین کە لە بەشێکی دیکە لەم وتارەدا بە ئاگاداری ئێوەم گەیاند.

هاورێیان، ئێستا کە باسی کار و چالاکیمان لە دەرەوەی وڵاتە، پێم باشە باسێك لە خستنە گەڕی پرۆژەیەك بکەین لە دەرەوەی وڵات، یان هیچ نەبێ لەوێوە دەست پێ‌بکا. کە پێم وایە کۆمەڵە دەتوانێ و بەکەڵکیشیە تێیدا پێشقەدەم و پێشەنگ بێ، ئەویش دامەزراندنی نیهادێك یان چەترێکی سیاسی‌یە کە بتوانێ کوردی ئێرانی لە دەرەوەی وڵات لە دەوری خۆی کۆ کاتەوە. بۆیە دەڵێم چەتر چونکە مەبەستم سازمان یان ڕێکخراوێکی حیزبی نی‌یە، بەڵکوو "تجمعێك" بێ کە هەوڵ بدا هەمووان بۆ مەبەستێکی گشتی کۆبکاتەوە. نیهادێکی

پێشکەوتنخواز بێت، مەنشوورێك یان پلاتفۆرمێکی هەبێ و هەموو ئەو کەسانەی کە خوازیار بن و ئامادە بن لەژێر ئەو پلاتفۆرمەدا کار بکەن، بتوانن بەشداری تێدا بکەن.

من بەنموونە ئەوە دەهێنمەوە کە لە ساڵی ١٣٥٧و ١٣٥٨دا، تا کاتی ٢٨ی گەلاوێژ کە هێرش کرایە سەر کوردستان، کۆمەڵێك ڕێکخراو لە زوربەی شارەکانی کوردستان هەبوون بەنێوی جۆراوجۆر بەڵام هەموویان وشەیەکی "جمعیت"یان لە ئەوەڵەوە پێوە بوو، یەکێك لە ناسراوەکانیان "جمعیت دفاع از ازادی و انقلاب" بوو لە سنە، ئەوانە تەیفێکی فراوانی تێکۆشەرانیان لەخۆیاندا کۆکردبووەوە، غەیری خەتی فیدایی و خەتی "حیزبی تودە"، ئەم دوو خەتە جیاواز بوون، "تودە" کە هەموو ئەو حەرەکاتەی بە دژی شۆرش و شتی وا دەزانی و لەبەرەی دژی دابوو، فیداییانیش حازر نەبوون لەگەڵ کەسی دیکە هاوکاری بکەن و بە سیاسەتیش بەرەو سازش لەگەڵ ڕژیم دەچوون، بەڵام تەیفێکی وەسیعی خەتی سێی تێدا بوو، کەسایەتی‌یە سیاسی‌یەکانی تێدا بوون، کرێکارانی تێدا بوو، خەڵکی زەحمەتکێشی تێدا بوو، هەڵسووڕاوان و تێکۆشەرانی شارەکان، ئەوانەی مەیلەو چەپ بوون و نزیکی‌یەکیان لەگەڵ بیروڕێبازی چەپ هەبوو تێیدا بوون. لە کات و سەردەمێکدا کە ئازادی فەعالییەتی سیاسی هەبوو و لەلایەکی دیکەشەوە تەشکیلاتی کۆمەڵە توانایی یان تەنانەت مەیلی جەزبی هەموو ئەو توێژانەی نەبوو، "جمعیت"ەکان توانیان دەورێکی چاکیان هەبێ، تەشکیلاتێکی چەپ و دێموکرات بوون، پێشکەوتنخواز بوون، لەسەر جووتیارانیان دەکردەوە، لە خواستی کرێکاران دیفاعیان دەکرد، لە بێکاران دیفاعیان دەکرد، لایەنگری مافی ژنان بوون و کاروباری مەربووت بە ژنانیان هەبوو، کاری ڕاهێنانی تیزامیان هەبوو، و زۆر کاری دیکە کە من نامەوێ بچمە ناو وردەکاری‌یەکەیانە و، مەبەستیشم ئەوە نی‌یە کە ئێمە دەبێ عەینەن ئەوە دووپات بکەینەوە. ئەو تەجرەبەیە نە قابیلی تیکرارە، نە هەل و مەرجەکان وەکوو یەکن، بەڵام قابیلی دەرس لێوەرگرتنە.

ئەگەر ئەوانە نموونەی سەرکەوتووی ڕابوردوو بوون، با نموونەیەکی ناسەرکەوتووی ئەم دوایی‌یانەش بێنمەوە بۆ ئەوەی دەرسێکیش لەو وەربگرین. مەبەستم کۆنگرەی نەتەوەیی‌یە. کۆنگرەی نەتەوەیی هیچ نەبێ ئیدیعاکەی ئەوە بوو کە چەترێکە بۆ کۆکردنەوەی هەموو کورد بەتایبەتی لە دەرەوەی وڵات. بەڵام عەیبی سەرەکی‌یەکەی ئەوە بوو کە لە ڕاستی‌دا وانەبوو، بەڵکوو بەتەواوی مەعنا لەژێر تەئسیری ڕێکخراوێك و سیاسەتێکی دیاری‌کراو دابوو، سیاسەتەکەش خۆی زۆر جێگەی پرسیار بوو، بۆ مەبەستێکی تەسك دامەزرابوو، شوێنەواری دێموکراتیك بوونی ڕاستەقینەی پێوە دیار نەبوو و زۆر شتی‌تریش. بەهەرحاڵ ئەو مۆدێلە نابێ ڕەچاو بکرێت.

بەبڕوای من چەترێکی دێموکرات و پێشکەوتنخوازی فراوان بۆ کوردی ئێران پێویستە، پێم وایە سەری کوردی ئێران لە زۆر ڕووەوە بێکڵاو ماوەتەوە. لە کاتی هاتنە گۆڕی مەسەلەی کورد، کەمتر نێوی کوردی ئێران دێنن، جینایەتەکانی جەمهووری ئیسلامی زۆر کەمتر ئیفشا دەکرێ و کەمتر لەدنیا دا دەنگ دەداتەوە. پێم وایە جێی خۆیەتی کۆمەڵە لەو کارەدا پێشقەدەم بێ و هەوڵی بۆ بدا، لەگەڵ کەسایەتی‌یە جۆربەجۆرەکان تەماس بگرێ، زۆر کەسایەتی پاك و چاك هەن، ئینسانی باوەر پێکراون، جێگای ڕێزن، بەشێك لەوانە هەلسووڕاوانی پێشووی کۆمەڵەن، لەوانەیە هەموو بیروباوەری ئێستای کۆمەڵەیان نەبێت، بەڵام ئەوانیش دەتوانن لەژێر چەترێکی ئاوادا کۆبنەوە. زۆر کەس کە عەینەن ئیدیۆلۆژی و بیروباوەری حیزبە سیاسی‌یەکانیان نی‌یە، ناشزانن لەکوێ و چلۆن فەعالییەت بکەن، بەڵام ئینسانی باشیشن، هەقە زەرفێکیان هەبێ بۆ فەعالییەت. ئەم پرۆژەیە دەتوانێ یارمەتی‌یان بکا. دامەزراوەیەك یان چەترێکی سیاسی فراوانی ئاوا، دەتوانێ زۆر کار بکا کە لەوانەیە هەرکام لە حیزبەکان بەتەنیا نەتوانن بیکەن. زەرفێکی فراوانترە و لە هێندێك بوواردا قودرەتی مانۆڕی زۆرتری لە حیزبەکان هەیە. دەتوانێ بەناوی هەموو کوردی ئێرانەوە لەگەڵ زۆر مەراجیعی نێونەتەوەیی تەماس بگرێ، دەتوانێ وردە وردە وەکوو نوێنەرێك یان دەم ڕاستێکی لێبێت بۆ مەسەلەی کوردی ئێران، لەگەڵ زۆر حیزب و لایەن و دەوڵەت بەنێوی کوردی ئێرانەوە قسە بکا. بەشداری حیزبی دێموکراتی کوردستانیش لەو پرۆژەیەدا زۆر بەکەڵکە، پێویستە بە حیزبی دێموکراتیش پێشنیار بکەین و داوای لێبکەین بەشداری بکا و هەوڵی خۆمانی لەگەڵ بدەین، سەرەڕای ئەوەش ئەگەر ئامادە نەبوو بەشداری بکا لەسەر نەهاتنی ئەو پەکی نەخەین. من وادەزانم ئەو کارە ڕێگەیەکیشە بۆ ئەوەی وردە وردە لەگەڵ بزووتنەوەی سیاسی و ڕۆشنبیری لە کوردستانی ئێرانیش جۆرێك تەماس و پەیوەندی درێژەدار دابمەزرێت.

با کورتی کەینەوە: پێویستە کۆمەڵە هەوڵ بدا بۆ پێك هێنانی ڕێکخراوێکی چەتری کە کوردی ئێران لەخۆیدا نوێنەرایەتی بکا، بە پلاتفۆرمێکی دێموکراتیك و پێشکەوتن خوازانەوە و پێم وایە زۆر کەس هەن کە لەو پرۆژەیەدا بەشداری بکەن. من لەو بڕوایە دام کە ئەم پرۆژەیە هەم بەکەڵك دەبێ بۆ بزووتنەوەکە و هەم توانایی زۆر کەس دەخاتە کار. دیارە ئەو قسانەی من هێشتا تۆزێك کوللی‌یە، ئەم پرۆژەیە دەبێ زۆرتری قسە لێبکرێ و کاری لەسەر بکرێ و بکرێتە گەڵاڵەیەکی دیاری‌کراو و نزیك لە عەمەل، بەتایبەت بەهاوکاری و تەگبیری هاوبەش لەگەڵ دڵسۆزان و کەسایەتی‌یەکانی دەرەوەی کۆمەڵە، بەشێوەیەك کە هەر لە سەرەتاوە لە داڕشتن و دامەزراندنی کارەکەدا بەشدار بن.



یەکێك لە مەسەلە نێوخۆییەکانی کۆمەڵە کە بەکورتی ئیشارەی پێدەکەم و لێی تێدەپەڕم، بریتییە لە کاری کۆمیتەی ناوەندی خۆی لە دەورەی رابوردوودا. مەبەستم ئەوە نییە کە لێکدانەوە و هەڵسەنگاندنێکی تێروتەسەلی لێبکەم، بەڵام پێم خۆشە بڵێم کارێکی چاکمان کرد کە لە کۆنفرانسی ساغ کردنەوەی کۆمەڵە ژمارەی کۆمیتەی ناوەندیمان زۆر هەڵبژارد، ئەوە چ لەرووی سیاسی و چ لەرووی تەشکیلاتیشەوە بەکەڵك بوو. کۆمیتەی مەرکەزی سەرجەم لەم ساڵەدا سێ پلێنۆمی بووە، یەکیان سەرەتا لێرە گیرا، ئەمە پلێنۆمێکی دووبەشی بوو، بە نەوعێك بەشداری هاوڕێیانی دەرەوە لەرێگای فاکس و تەلیفونەوە دابین کرا، پلێنۆمی دووەم لە دەرەوەی وڵات گیرا و تەماسیان لەگەڵ ئێمە لە کوردستان گرت، وە سێهەمیش رۆژانی پێش ئەم کۆنگرەیە گیرا. بەڵام کەم و کوورییەکی ئەساسی لە کاری کۆمیتەی ناوەندیدا، کە کەم و کووری دیکەش ئەگەر بووبن لەوەوە سەرچاوەیان گرتووە، بریتی بوو لە نەبوونی تمرکز و ئەوەی کە بەشێکی هەرە زۆری کۆمیتەی ناوەندی نەیان توانی بۆ ماوەیەکی بەرچاو پێکەوە بن. ئەمە رێی لە دارشتنی هێندێك سیاسەت گرت، رێی لەوە گرت کە زووتر بەعزێك کار راپەڕێ، هەروەها درەنگ ئەو نزیکی و هاوفیکرییە پتەوەی پێك هێنا کە هەمیشە بۆ کۆمیتەی ناوەندی پێویستە. ئێمە بۆ ماوەیەك لە جۆرێك دوومەرکەزی، یەك لێرە و یەك لە دەرەوەی وڵات، رەنجمان دەبرد.

ئەوانە بۆیە باس دەکەم کە دەرسی لێوەرگرین بۆ کۆمیتەی ناوەندیی داهاتووی هەڵبژێردراوی ئەم کۆنگرەیە: یەکەم ئەوەی کە یەك ناوەند هەبێت و ئەویش لە کوردستان بێت، دووهەم ئەوەی کە کۆمیتەی ناوەندی تمرکزی زۆرتری لەو ناوەندەدا هەبێ. هەروەها یەکێك لە کارەکانیش کە بەشوێن کۆنگرەدا دەبێ بکرێ ئەوەیە کە شێوەکار و زەوابتی کاری نێوخۆیی کۆمیتەی ناوەندی هەر لەسەرەتادا بە لێکۆڵینەوەیەکی زۆر ورد دیاری بکرێت و دوایەش هەوڵ بدرێ کە رێك و پێکییەکی زۆرتر و موناسەباتێکی حیزبی زۆرتر لەناو کۆمیتەی ناوەندیدا بەرقەرار بکرێت و بچەسپێت.

ئەگەر قسە لەکاری روو بە دەرەوەمان بکەم، یەکیان بەکورتی لەسەر پەیوەندییەکانمان بەتایبەت پەیوەندە کوردستانییەکانمانە. بەشێك لەو پەیوەندییانە لێرە لە کوردستان لە ئاستی کۆمیتەی ناوەندیدا لەگەڵ حیزبەکانی کوردستان گیراوە. بەگشتی دەتوانم بڵێم نێوانمان لەگەڵ حیزبە کوردستانییەکان دامەزراوە و روو لە گەشە بووە، بەڵام لە هێندێك شوێن و مەوریدا هێشتا ئەو پێشرەفتەی کە پێویستە بەدەست نەهاتووە. لەگەڵ یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، چ بەبۆنەی دۆستایەتی و نزیکایەتییەکی دێرین کە لەبەینماندا بووە و چ بەهۆی درێژە دان و گەشە پێدانی لە سەردەمی ئێستادا، ئێمە نێوانێکی

باش و دۆستانەمان هەیە. لەگەڵ پارتی دێموکراتی کوردستان ئێمە هەر لە سەرەتاوە هەوڵمان بۆ داوە و لەوەوە کە هیچ پەیوندی‌یەك لە بەینماندا نەبوو و بگرە بەدگومانی‌یەکیش لە بەینماندا بووبێت تێپەر بووین، ئێستا نێوانێکی دۆستانەمان هەیە، بەتایبەت لە ئاستی پەیوەندی‌یەکانی ئێمە و ئەواندا و هەوڵ دەدەین لە داهاتوودا لە ئاستێکی سەرەوەتریش پەیوەندی و تەماسمان لەگەڵیان هەبێت.

لەگەڵ حیزبی شیوعی کوردستان هەر لە سەرەتاوە تەماسمان بووە و تا ئێستاش درێژەی هەیە. ئێمە لە لایەن خۆمانەوە هەنگاومان بۆ هەڵگرتووە و چاوەڕێی گەرم و گوڕی‌یەکی زۆرتر دەکەین. لەگەڵ حیزبی زەحمەتکێشانی کوردستانیش کە یەکێك لە حیزبەکانی کوردستانی عیراقە تەماس و چاوپێکەوتن و پەیوەندیمان بووە و نێوانمان دامەزراندووە.

لەگەڵ رووناکبیران و تێکۆشەران و کەسایەتی‌یەکانی کوردستانی عیراق تەماس و پەیوەندیمان بووە، لە سیاسەتمەدار و شاعیر و نووسەر و پارێزەر و دوکتور و ژنان و هەموو ئەو جۆرە کەسانە. بەڵام پێویستە بگوترێ کە پەیوەندی لەگەڵ ئەوانە لەو ئاستەدا کە بشێ نەبووە، سەرچاوەکەی تەنیا سەرقاڵی زۆری ئێمە بە کاری تەشکیلاتی و شتی لەو بابەتە بووە، دەنا ئێمە ئەمان ویستووە و ئامانەوێ ئاوا بمێنێتەوە و، بە پێویستی دەزانین ئەو چەشنە پەیوەندی‌یانە هەم فراوانتر و هەم چڕوپڕتر بکرێنەوە. هەمووتان دەزانن ئێمە لێرە رێکخستن دروست ناکەین، بەڵام دامەزراندن و پەرە پێدان بە دۆستایەتی و تێگەیشتن و هاوکاری لەگەڵ لایەن و کەسایەتی جۆراوجۆر، بەتایبەت کە ئێمە ئێستا لە کوردستانی عیراق دەژین، شتێکە دەبێ گرینگی زۆری پێبدەین. هەروەها لە بەشەکانی دیکەی کوردستانیش دەبێ ئەم نەوعە پەیوەندی‌یانە پەرە پێبدەین. بەجێی خۆی دەزانم لێرە شاهیدی‌یەك بدەم بۆ کۆنگرە: لەم دەورەیەدا ئێمە لە بۆنەی جۆربەجۆردا چاومان بە زۆر کەس کەوتووە، جاری وابووە نەشمان ناسیونەتەوە، هاتوون و دۆستایەتی دێرینی خۆیان بۆ کۆمەڵە دووبارە کردۆتەوە. کەسانێك بوون لە ساڵەکانی ٨٠ و ٨١ و ٨٢ پەیوەندێکی دۆستایەتی‌یان لەگەڵ کۆمەڵەی زەحمەتکێشان بووە و پاشان بەدوای ئەزموونی حیزبی کۆمۆنیستی ئێران بە زۆر هۆ نەیان پرسیوەتەوە، ئەوانە بە بیستنی بووژانەوەی کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانی کوردستان خۆشحاڵ بوون و کە چاوپێکەوتنێك هەڵکەوتووە، دۆستایەتی خۆیان دەربڕیوەتەوە. مەبەستم ئەوەیە بزانین ئەو دۆستایەتی و پەیوەندانەی پێشوو بەفیڕۆ نەچوون. ئێستا جارێکی دیکە کۆمەڵە دەروازەیەکی بۆ کراوەتەوە بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی گونجاو و

شیاو پەیوەند و دۆستایەکی پان و بەرینی کۆمەڵایەتی لەگەڵ زۆر کەس و لایەن لە هەموو کوردستان دا پێك بهێنێ.

لەگەڵ بەشەکانی دیکەی کوردستانیش، هەم لە دەرەوەی وڵات و هەم لێرە لە کوردستانەوە، تەماسمان لەگەڵ حیزب و کەسایەتی‌یەکان تارادەیەك دامەزراندووە بەڵام هێشتا زۆری ماوە بگاتە ئاستی پێویست. سەرجەم ئەگەر کۆی کەمەوە دەتوانم بڵێم کە پەیوەندی ئێمە لەگەڵ حیزبەکانی کوردستان هێشتا کەمە، هێشتا جێی خۆی نەگرتووە، وە ئەوەش دەمێنێتەوە بۆ دەورەی داهاتوو کە کارێکی زۆرتری بۆ بکرێ و پەرەیەکی زۆرتری پێبدرێت.

یەکێك لەو شتانە کە ئێمە دەبێ زۆرتری لەسەر بنووسین و بڵێین مەسەلەی کوردە لەئاستی گشتی‌دا. ئەوە یەکێك لەو بووارانەیە کە دەبێ روانگەی خۆمان لە هەموو وردەکاری‌یەکانیشی‌دا رۆشن کەینەوە. ئێمە سیاسەتمان لە کۆنەوە روونە و سەرخەتەکانی لە وتاری ٢٦ی رێبەندانیش رابوردوودا لەلایەن کۆمیتەی ناوەندی‌یەوە جارێکی دی بە ئاگاداری هەمووان گەیشت، بەڵام پێویستیمان بە چالاکی‌یەکی زۆرتر لەم بووارەدا هەیە.

خاڵێکی دیکە کار و ئێوانی ئێمە لەگەڵ چەپی ئێران بووە. ئێمە تەماسمان لەگەڵ چەپی ئێران زۆرتر لەدەرەوەی وڵات بووە، چونکە هیچ رێکخراوێکی چەپی ئێران، بێجگە لە بەشێکی پچووك لە رێکخراوی "راه کارگر"، کە ئەویش جارێ ئێمە دەستمان پێی راناگا، لێرە نین. بەڵام لە دەرەوەی وڵات هەیئەتی جۆراوجۆری ناوەندیی کۆمەڵە لە وڵاتە جۆربەجۆرەکان و لە مەجالە جۆربەجۆرەکاندا چاوی بە رێکخراوە چەپەکان کەوتووە. دیارە چەپی ئێران بەهیچ جۆر مەحدوود نابێتەوە بە رێکخراوە چەپەکان، چەپی غەیرە رێکخراو بەژمارە زۆر زیاترن و بە چەندایەتیش رەنگە لەسەر داهاتووی کۆمەڵگای ئێران کاریگەری‌یان کەمتر نەبێ و ئێمە دەبێ جێگەیەکی تایبەتی بۆ ئەوان دابنێین، بەڵام ئەم باسە بمێنێتەوە بۆ کاتی خۆی.

ئێمە لەگەڵ چەپ هەم کۆبوونەوەی گشتیمان کردووە و هەم لەگەڵ رێکخراوەکان دانیشتووین. لە کۆبوونەوە و سیمینارە فراوانەکاندا هەوڵ دراوە بۆ ئەوەی نارۆشنی‌یەکان وپرسیارەکانی ئەوان لەسەر مەسەلەی کۆمەڵە و هاتنەدەرمان لە حیزبی کۆمۆنیستی ئێران جوابی پێبدرێتەوە، بۆیان رۆشن بکرێتەوە کە نیگەرانی ئەوان لە بەعزێك زەمینەدا بناغەیەکی نی‌یە و زۆرتر لەئەسەر تەبلیغاتی نەیارانەوە جێی خۆی کردۆتەوە و هەروەها لەسەر ئیلتیزاماتی خۆمان لە حاست بزووتنەوەی کرێکاری و سۆسیالیستی لە ئێران پێمان داگرتۆتەوە، لە عەینی حاڵیشدا هەوڵمان داوە هەڵوێستەکانی کۆمەڵەیان بۆ شی بکەینەوە و داوای پشتیوانی و داکۆکی‌یان لێبکەین. بەگشتی دەتوانم بڵێم ئەو سیاسەتەی کە ئێمە لەو

دانیشتنانەدا رامان گەیاندووە ئەوەیە: ئێمە پرۆژەیەکی حیزب سازیمان لە دەستوور دا نیيە و ئەرکی دروست کردنی حیزبێکی سەرتاسەری لە ئەستۆی کۆمەڵە نابینین. هەروەها ئێمە بەگشتی پێمان وایە بەبێ بوونی پێگەیەکی کۆمەڵایەتی لە ئاستی ئێران و بەبێ فەراهەم بوونی هەل و مەرجی گونجاو، دەست دان بەو کارە هەڵەیە. بەڵام ئەوە بەو مەعنایە نیيە کە پەیوەندیمان لەگەڵ چەپی ئێران بەهێز نەکەین و هاوکاری و هاوخەباتی و نزیکیيان لەگەڵ نەکەین. ئێمە ئەوانەمان پێ راگەیاندوون و ئەوان دەزانن کە سیاسەتی ئێمە چیيە، بەڵام هەم نووسین و رۆشن کردنەوەی زۆرتری سیاسەتەکانمان و هەم لەوە بەولاوە چالاکیيەکی زۆرتری دەوێ.

سیاسەتێکی راگەیەندراوی دیکەی ئێمە کە لەمە بەدواوە دەبێ خەست و خۆڵتر و مونەکەدتریش بیهێنیە گۆڕێ، ئەوەیە کە پشتیوانی کردن لە کۆمەڵە و بەهێز کردنی ئەم باڵە چەپە لە کوردستاندا نەك تەنیا بەقازانجی کۆمەڵە و بزووتنەوەیە لە کوردستان، بەڵکوو هەروەها لە بەرژەوەندی چەپی ئێراندایە بەگشتی و کۆمەڵەیەکی بەهێز دەتوانێ ببێتە نوختەی بەهێزی هەموو چەپ لە ئێران. بەبروای ئێمە ئەم مەوزووعە هێشتا بەتەواوی بۆ چەپی ئێران رۆشن نیيە و تێگەیشتنی چەپی ئێران لەم بارەیەوە هێشتا مۆرکی سێکتاریزمی زۆر پێوەیە. لە هەرحاڵدا، تا ئەو جێگەی کە دەگەڕێتەوە سەر رێکخراوەکان ئەگەر چی ئەو حاڵەتی نیگەرانی و بەدگومانیيە کەم بۆتەوە، بەڵام ئەو هەڵوێستەی کە بشێ و بەتەواوی تێگەیشتبێ کە، نەك بەخاتری مەسلەحەتی رێکخراوەیی ئێمە بەڵکوو بەخاتری قازانجی سەرجەم بزووتنەوەی چەپ لە ئێراندا، دەبێ لەچی و لە کێ پشیتوانی بکەن هێشتا بەرۆشنی لەنێو رێکخراوەکاندا مەوجوود نیيە، رەنگ بێ زۆرێك لە چەپی نارێکخراو لەم بارەیەوە ژیرانەتر و باشتر بیر بکاتەوە.

خاڵێکی دیکە پەیوەندیمان لەگەڵ دەوڵەتی عیراق و کاری ئێمە لەو بووارەدایە. ئێمە سەرەرای هەوڵێکی کە داومانە و لێرە واریدی وردەکارییەکانی نابم، گەرچی قەول و بەڵێنیش هەبووە، بەڵام تا ئێستا و تا ئەم سەعاتەی لەگەڵ ئێوە قسە دەکەم نەتیجەیەکی حەتمی لێ وەرنەگیراوە. هەموو کەسیش دەزانێ بۆچی وای لێهاتووە، بەدەلیلی قسەی خراپ و شەیتانی کردنی نەیارانی ئێمە ئەو رێگایە جارێ لە ئێمە بەستراوە. ئێمە پێمان وابووە بە راگرتنی شەئنی کۆمەڵە و پرەنسیپەکانی هەوڵی پێویست بدەین، خۆمان زۆر تەنگاو و هەڵەداوان هەڵنەخەین و هەر واشمان کردووە، لەعەینی حاڵدا پێمان وایە بۆ راگرتنی کۆمەڵە لەم مەنتیقەیەدا کە ناوچەیەکی ئاڵۆز و ناسەقامگیرە، هەبوونی پەیوەندییەکی ئاوا پێویستە، بۆیە بە لەبەرچاو گرتنی هەموو ئەو پرەنسیپانە بەو هەوڵانەی خۆمان درێژە دەدەین.



لەگەڵ حیزبی دێموکراتی کوردستان، پێویستە بزانن کە ئەوان چ لەنێو ڕیزەکانیاندا و چ لەنێو ڕەهبەری خۆشیاندا زۆر بەوردی ڕوانیویانەتە پرۆسەی ناکۆکییەکانی ناوخۆیی ئێمە و مەسەلەی ساغ کردنەوەی کۆمەڵە. هەر کەس سەروکاری لەگەڵیان بووبێ دەزانێ کە ساغ کردنەوەی کۆمەڵە لەنێو ڕیزەکانی حیزبی دێموکراتدا بە گەرم و گوڕییەوە وەرگیرا و جۆرێك جم و جۆڵی لەنێو ئەوانیش دا پێك هێنا. دواتر ئێمە لەگەڵ دەورەیەك دامەزراندنی مەحدوودییەت بۆ ڕیزەکانیان لەلایەن ئەوانەوە بەرەوروو بووین. تا ئەو جێگەی کە دەگەڕێتەوە بۆ پەیوەندی ڕەسمی لەنێوان کۆمیتەی ناوەندی و دەفتەری سیاسی هەردووك لا، سەردان و چاوپێکەوتن لە بەینماندا هەبووە و، بەگشتی حاڵەتێکی تفاهم لەبەینمان دا هەیە کە ئێمە پێمان باشە و یەکەڵکی دەزانین و هەوڵیش دەدەین ڕای‌بگرین و پەرەشی پێ‌بدەین، بەڵام پێم خۆش بوو ئێوە وەکوو کەسانێك کە هەڵە لێی ئاگادار بن بزانن ئەگەر لە مەقتەعێك بەم لاوە خاو بوونەوەیەك لە پرۆسەی نزیکی لەگۆڕێ دا بووە، لەلایەن ئێمەوە نەبووە، بۆ نموونە ئێمە لە دوو ڕێگاوە، چ لێرە چ لە دەرەوەی وڵات، داوامان لێکردن کە بە لەبەر چاو گرتنی ئەوەی کە هەردوو لامان سیاسەتمان بەشداری نەکردنە لە هەڵبژاردنی سەرکۆماری‌دا، با ڕاگەیاندنی هاوبەش بدەین و بە یەك دەنگ انتخابات تەحریم کەین، ئەوان بۆ ئەو کارە ئامادە نەبوون و پێیان کافی بوو کە هەرلایە ڕاگەیاندنی خۆی داوە.

پێویستە لێرەدا ئەوە بڵێم کە یەکێك لەو شتانەی کە ئێمە لەگەڵ ئەوان هێناومانەتە گۆڕێ و چەندین جار لە موناسەبەتی جۆربەجۆریش دا، لەوانە لە پەیامی کۆمیتەی ناوەندیی کۆمەڵە بە بۆنەی ٢٦ی ڕێبەندان، ڕۆژی کۆمەڵە، باسمان کردووە ئەوەیە کە ئێمە خوازیاری پێك هێنانی هەینەتێکی هاوبەشین بۆ نوێنەرایەتی کردنی مەسەلەی کورد لە ئاستی دیپلۆماتیکدا. ئەم باسە دەخەمە وەختێك کە لەم گوزارشەدا بەتەمام بەکورتی لەسەر مەسەلەی موزاکەرەش قسەیەك بە عەرزتان بگەیەنم.

یەکی دیکە لەو مەسەلانەی کە لە ساڵی ڕابوردوودا مەشغەڵەی هەموومان بووە، هەریەکە بەجۆرێك، مەسەلەی نێوانی ئێمە و حیزبی کۆمۆنیستی ئێران و چۆنیەتی پەیوەندیمانە لەگەڵیان. پێویست ناکا من لێرەدا "شەرحی موسیبەت" بدەمەوە و هەمووان دەزانن کە لەکاتی جیابوونەوەدا ئێمە، سەرەڕای ئەو گشتە قسە و کردەوەی ناشیرین کە لەوانمان دیبوو، بەوپەڕی ددان بەسەر جەرگی خۆ داگرتن و خۆڕاگرییەوە لەگەڵ کێشەکان بەرەو ڕوو بووین، چونکە دەمان زانی کە ئەگەر ڕووداوێکی ناخۆش ڕوو بدات زەرەر و زیانی بۆ داهاتووی کۆمەڵە هەیە و پەڵەیەکی پێوە دەنیشێ کە بەهاسانی لێنابێتەوە، پێمان وابوو پرۆژەکەی ئێمە لەوە گەورەتر و خۆشەویستترە کە بە شتی ئاوا لەکەداری بکەین. هەر بۆیەش

بە دەستی خاڵی و بەچەکی سەرشانمانەوە کۆمەڵەمان زیندوو کردەوە، هێندێک کەس پەتوویەکیان هێنا یا نەیان هێنا، هەر ئەوەندە. من لێرەدا بەپێویستی دەزانم ئەوە بە کۆنگرە و لە ڕێگای ئێوە بە رای گشتی کوردستان و ئێرانی رابگەیەنم کە ئێمە، هەر وەکوو لە نامەکانی کۆمیتەی ناوەندیش دا رامان گەیاندووە و بۆخۆتان دیوتانە، لەو بروایەدا بووین و هەین کە بەشدار بوونمان لە ئەسناد، ئەموال و ئیمکاناتێک کە ئێستا حیزبی کۆمۆنیستی ئێران دەستی بەسەر داگرتووە، بە هەقی مسۆگەری خۆمان دەزانین، ئەو قەرزە رەنگە کۆن بێ، بەڵام نافەوتێ و بەسەریانەوە هەیە و، ئەزەری هەمووان بەتێکرایی ئەوەیە کە کۆمەڵە دەبێ لە ڕێگای گونجاوی خۆیەوە بۆ وەرگرتنەوەی هەوڵ بدات.

خاڵی دووهەم ئەوەیە کە ئەوان مانگەها، نزیکەی ساڵێک، تەبلیغاتێکی ژەهراوی و دوژمنکارانەیان بەدژی ئێمە خستە رێ کە چونیەتی‌یەکەی بۆخۆتان باش دەزانن. ئەگەرچی ئەو کارە تا ئەو جێگەی دەگەرێتەوە سەر خەڵک و سەر کۆمەڵگا و سەر رای گشتی، بەقازانجیان تەواو نەبوو، بەڵام لە هەر حاڵدا توانیان هێزی خۆیان، دەزگا و ناپاراتی رێکخراوەکەی خۆیانی پێ‌راگرن و لە حاڵەتێکی هەڵخراوی تۆڵەئەستێنی خوێن بەری‌چاوگرتوودا رایانگرن. تەبلیغاتی ئەوان نامەسئوولانە و شەرەنگێزانە بوو و هەمووی بۆنی خوێنی لێ‌دەهات. من دواتریش باسی دەکەم کە چەندین هەینەت لەبەینی ئێمە و ئەواندا هاتن و چوون و لەم بارەیەوە قسەمان لەگەڵ کردن.

هەروەها خۆشتان دەزانن کە ئەوان لە ناوەرۆک و مێتۆدی تەبلیغاتی خۆیان دا وەدوای جەرەیانی ریسوای کۆمۆنیزمی کرێکاری کەوتن و لاسایی ئەوانیان کردۆتەوە. خاڵێکی دیکە کە پێویستە دەست نیشانی بکەم ئەوەیە کە لە مەقتەعێک بەم لاوە، بەتایبەت دوای ئەوەی کە یەک دوو راگەیاندنی توندمان لەسەر دان، ئەوان، بەهەر دەلیل، هێندێک لەو ئەوعە تەبلیغاتەیان لە رادیۆ و بەئاشکرا کەم کردۆتەوە، بەڵام بەزمان لەنێو خەڵک و لەنێو ریزەکانی خۆیاندا هەر درێژەی هەیە.

لەبەینی ئێمە و حیزبی کۆمۆنیستی ئێراندا چەند جار خەڵک و هەینەتی جۆربەجۆر هاتوون و چوون، هەر لە سەرەتاوە تا ئەم دواییانە. دەتوانم بەگشتی بڵێم تا ئێستا ئەوان جوابی هیچ جۆرە ناوبژی و پێشنیارێکیان بۆ چارەسەر کردنی ناکۆکی‌یەکان نەداوەتەوە. ئێمە، بەپێچەوانە، لەهەمووی‌دا ئامادەیی خۆمان بۆ دانیشتن لەگەڵیان و وت و ویژی راستەوخۆ بۆ چارەسەر کردنی ناکۆکی‌یەکان راگەیاندووە. بەدوای راگەیاندنەکانی کۆمیتەی ناوەندی ئەوان سێ دەستە خەڵکیان راسپارد بۆ لای ئێمە،... کەسانێکی کە نزیکەی یازدە مانگ بەرەسمی و لە رادیۆکەیانەوە تەبلیغاتێکی دوژمنکارانە و شەرەنگێزانە و

جنێوفرۆشانەیان بڵاو کردبووەوە ئەم جارە قۆڵیان لە کراس هێنا دەرێ و دەستیان کرد بە مەزڵووم نومایی و خۆپەراندنەوە. یەکێك نەیزانیبایە پێی وا دەبوو زۆر ساڵح و پیاوچاکن و بەرماڵیان لەسەر ئاو دەگەڕێ. کارێکی ئێمە کردمان ئەوە بوو کە هەوڵمان دا تەوزیحێکی مەنتیقی بۆ هەینەتەکان بدەین و بڵێین کە بۆچی تاوانی ئەو وەزعە لەسەر ئێمە نییە. دەتوانم بڵێم ئێمە سەرجەم لە روون کردنەوەی راستییەکاندا سەرکەوتوو بووین. پێشنیارەکانی خۆشمان پێ‌ڕاگەیاندن. بەشێوەیەکی دیاریکراویش ئەم چەند خاڵەمان پێ پێشنیار کردن:

یەکەم، هەر دووك لا نێوی کامڵی یەکتر بەرن. ئێمە ئامادەین نێوی ئەوان بەکامڵی بەرین، ئەو جۆرەی کە لە لای سەرەوەی ئۆرگانەکەیان نووسراوە، ئەوانیش با ئامادە بن نێوی ئێمە بەرن. چۆن دەکرێ قسە لە خۆش کردنەوەی نێوان بکەین ئەگەر ئەوان تەنانەت لە بردنی ناویشمان خۆ بپارێزن؟

دووهەم، ئێمە خوازیاری دانیشتنێك بووین لەگەڵیان لە ئاستێکی سەرەوەی بریاردەری هەردوو کۆمیتەی ناوەندیدا، بۆ ئەوەی کە بە هەموو کێشەکانی نێوانمان رەسیدەگی بکا. ئەگەر ئەوان قسەیان لەسەر ئێمە هەیە، ئامادەین بیبیستین، لە عەینی حاڵدا ئێمەش قسەمان هەیە لەسەر ئەوان، یەك لەوان مەسەلەی اسناد و ئیمکاناتە. لەبەر ئەوە پێمان وایە خاڵەکانی باس کردن لەلایەن هەر دووك لاوە دیاری بکرێ و هەینەتی خاوەن سەلاحییەتی هەردووك لاش بۆ گفتوگۆ کردن چاویان بەیەکتر بکەوێ.

سێهەم، ئێمە داوامان لە رەهبەریی حیزبی کۆمۆنیستی ئێران و سازمانی کوردستانی ئەو حیزبە کردووە لەسەر خاڵێك هەڵوێست وەربگرن ئەویش ئەوەیە: جەماعەتی مەنسووری حیکمەت و ئەوان بەناوی دیفاع لە حیزبی کۆمۆنیستی ئێران و رەهبەرییەکەی درۆیەکیان لە دنیادا بڵاو کردەوە و خستیانە سەر ئینتێرنێت و دەیان شتیان لەسەر نووسی کە گۆیا پێشمەرگەی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان دەوری کۆنگرەی نۆی ئەوانی گرتووە و لەژێر بەرقی سەرنێزەی ئەوان دابووە کە پرۆژەی هاتنە دەری کۆمەڵە لە حیزبی کۆمۆنیستی ئێران رووی داوە. ئێمە داوامان لێکردن ئەمە بەدرۆ بخەنەوە. با ئەوە روون بکەینەوە کە رەهبەریی حیزبی کۆمۆنیستی ئێران کەیفی خۆیانە نزیکی سیاسی و فیکرییان لەگەڵ خەتی مەنسووری حیکمەت هەیە یان نا، ئێمە ناتوانین ئەوە بکەین بە شەرت بۆ پەیوەندی خۆمان لەگەڵ حیزبی کۆمۆنیستی ئێران. هەروەها ئێمە ناڵێین ئەگەر کۆمۆنیزمی کرێکاری قسەیان بە ئێمە گوت لەسەرمان بکەنەوە، پێویستیشمان پێی نییە. بەڵام لێمان راسپاردن کە بەناوی دیفاع لە ئێوە درۆیەك کراوە لە پەیوەندیی بەینی هەردووك لاماندا، بۆیە وەختێك کۆمۆنیزمی کرێکاری بەنێوی ئەوەی لەسەر ئێوە دەکاتەوە دەڵێ ئێمە پێشمەرگەمان لە حیزبێکی دیکەوە

هیناوەتە سەرتان، ئێوە کە لە هەموو کەس باشتر دەزانن ئەوە ئەسڵ و ئەساسی نییە دەبێ هەڵوێست وەربگرن و بەدرۆی بخەنەوە. ئەگینا مەعنای ئەوەیە کە ئێوە خەریکن لەو چەواشەکاری و تەبلیغاتی ژەهراوییە کەڵك وەردەگرن وە ئەوەش لەنەزەر ئێمەوە قابیلی قبووڵ نییە. ئەمە جوابێك بووە کە بە ئەو هەیئەتانەمان داوەتەوە، زوریەیان زۆریان پێ چاك بووە و وتوویانە مەسڵەحەتە و دەچینەوە لای رەبەریی سازمانی کوردستانی حیزبی کۆمۆنیستی ئێران و قسەیان لەگەڵ دەکەین. دواتریش چوونەوە لایان و هاتنەوە لای ئێمە و پێیان راگەیاندین کە ئەوان جواب نادەنەوە و پێشنیارەکان قبووڵ ناکەن. تەنانەت ئەگەر کەسێك لەو هەیئەتانە بەرامبەر بە ئێمە بێلایەنیش نەبووبێ، هیچ نەبێ قسەی پێنەماوە. لەمەرحاڵدا ئەوانە کورتەیەك لە رەوتی کارەکان لە بەینی ئێمە و رەهبەریی حیزبی کۆمۆنیستی ئێراندا بوو و هەر وەکوو دەردەکەوێ ئەوان لەسەر سیاسەتی دوژمنکارانە و هەڵخراندنی دژایەتی هەر دەرۆن و هیچ ئامادەییەکیان بۆ ئاسایی کردنەوەی نێوانمان و بۆ دانەوەی هەقەکانی خۆمان نیشان نەداوە.

هاورێیان، لەبابەت رژیمی کۆماری ئیسلامی ئێران، هەڵوێستی سەرەکیی ئێمە روونە: جەمهووری ئیسلامی دەبێ بروات، رووخانی رژیمی کۆماری ئیسلامی مەرجی گەشە کردنی خەباتی چینایەتی کرێکارانە، مەرجی گەشە کردنی سیاسی و رۆشنبیریی کۆمەڵگای ئێرانە. کۆسپی ئەسڵی سەر رێگای ئازادی و بەختەوەری خەڵکی ئێران رژیمی کۆماری ئیسلامییە. ئەم رژیمە لەسەر ئەساسی دەسەڵاتی توێژێکی بان یاسا و بان کۆمەڵگای ئینسانی بەناوی روحانییەت دامەزراوە کە وەکوو مافیایەك ئابووری ئێرانی گرتۆتە ژێر کۆنترۆڵ و وەکوو توێژێکی سەدەکانی ناوەراست بەدەسەڵاتێکی بان قانوونییەوە سیاسەت و دەوڵەتیشی بەدەستەوە گرتووە. بەحوکمی خودی قانوونی ئەساسی ئەم رژیمە، خەڵك مافی حاکمییەتیان لێ سەندراوەتەوە و لێ زەوت کراوە. بەپێچەوانەی ئەو ئەسڵەی کە لە قانوونە ئەساسییە دێمۆکراتیکەکانی دنیا بەرەسمی ناسراوە یانی ئەوەی کە حاکمییەت هەڵقوڵاوی خەڵکە، لە قانوونی ئەساسی ئێرانی ئیسلامیدا حاکمییەت دراوە بە خوداوەند، نوێنەرانیشی مەعلوومە کە من و ئێوە نین، روحانییەتە و، لەبەر ئەوە وەکوو توێژێکی پاوانخوازی بان قانوون هەموو دەسەڵاتێکیان پێیە. جەمهووری ئیسلامی ئامێری سەرمایەدارییە، بەڵام لە قاڵبی سەدەکانی ناوەراست دا، رژیمی بێمافیی کرێکارانە، رژیمی بێمافیی ژنان و ناپارتایدی جینسییە، رژیمی ستەمی نەتەوایەتییە، رژیمی شکەنجە و کوشتاری زیندانیانی سیاسییە و بێگومان

مەسەلەی رووخانی جەمهووری ئیسلامی دەبێ لە سەرلەوحەی سیاسەتەکانی ئێمە و هەر رێکخراوێکی شۆڕشگێڕ لە ئێراندا بێت.

بەڵام ئەمە هەموو شتێك نییە کە دەبێ سەبارەت بە وەزعی ئێستای کۆماری ئیسلامییەوە بگوترێ. پێش هەموو شتێك شکڵ و شێوازی ئەو رۆیشتنەی رژیمی کۆماری ئیسلامی و ئەو ئاڵوگۆڕەی کە مەبەستی ئێمەیە لە هیچ کەس روون نییە. ئێمە وەکوو خۆمان خوازیاری راپەڕینی جەماوەرین و بۆ ئەوەش تێدەکۆشین و پێمان وایە کە ئەم رێگایەیە کە بەکەڵکترین شێوەی رووخانی رژیمی کۆماری ئیسلامی پێك دێنێ و زۆرترین بەرژەوەندی کرێکاران و زەحمەتکێشان و هەموو چەوساوەکان و ستەمدیدەکانی تێدا بەدی دێت. لە عەینی حاڵدا بەتەجرەبەی مێژوو ئەوەش دەزانین کە قانوونێکی دیاریکراو نییە بۆ ئەوەی پێشەکی نیشان بدا کە ئاڵوگۆڕی سیاسی لە ئێران چ رەوتێك دەپێوێ و چ شکڵێك بەخۆیەوە دەگرێ.

ئێمە هەمیشە باسی ئەوەمان کردووە کە ئیسلاح خوازیی ناو دەسەڵات رەنگ دانەوەی مەیلێکی بەرینی کۆمەڵایەتییە بۆ ئاڵوگۆڕ و نیشانەیەکە لە بێتوانایی نیزامی جەمهووری ئیسلامی. رژیمی کۆماری ئیسلامی بە حوکمی ئەو شتانەی کە لێرە و پێشتر لەم وتارەدا ئیشارەم پێکردن و بارەها کامڵتر و باشتر لەلایەن نووسەرانی کۆمەڵەوە ئاماژەیان پێکراوە، توانایی درێژە دانی ئەو نیزامەی بەهەمان شێوەی پێشوو نییە. بەم حیسابە دروستە ئەگەر بڵێین رەوتی ئیسلاح خوازی ناو دەسەڵات رەنگدانەوەی بێتوانایی رژیمی کۆماری ئیسلامییە لە بەڕێوە بردنی ئێران وەکوو پێشووی خۆی.

بەڵام ئەمە هەموو شتێك تەوزیح نادات. سەرهەڵدانی دیاردەیەك بەناوی بزووتنەوەی ئیسلاحات کە تەنیا بەشێکی لەناو حاکمییەت و دەسەڵاتدا رەنگی داوەتەوە و زوربەی زۆری لەناو جەماوەری خەڵك دایە، بەگشتی نیشانەی تەنیا یەك بێتوانایی نییە، نیشانەی دوو بێتوانایییە و بەرهەمی یەککگرتنەوەی ئەو دوو بێتوانایییەیە: بێتوانایی رژیمی کۆماری ئیسلامی بۆ ئەوەی کە وەکوو رابوردوو درێژە بە حاکمییەتی خۆی بدات و بێتوانایی ئیستا و ئەم سەردەمەی خەڵکی ئێران بۆ ئەوەی راستەوخۆ ئەو رژیمە بە راپەڕینی خۆیان بڕووخێنن. لەئەنتیجەدا، نوختەی سازشێکی کاتی و دەورەیی لە ئێران دا پێك هاتووە کە خۆی لەو بزووتنەوەی ئیسلاحاتەدا دەدۆزێتەوە. ئەگەر رژیمی کۆماری ئیسلامی بیتوانیبایە و بۆی بلوابایە بەهەمان زەبر و زەنگی پێشوو و بەهەمان شێوەی دەسەڵاتدارەتی پێشوو حاکمییەتی خۆی بەرێتەوە پێشەوە، دەیکرد، وە ئەگەر کۆمەڵانی خەڵکیش بیانتوانیبایە تەجرەبەی "اسلام شهر" و "مشهد" پەرە پێبدەن و بیکەنە تەجرەبەی تاران و ئیسفەهان و تەورێز و



شارەکانی تر و بەم جۆرە بەساتی دەسەڵاتی زۆردارانەی ئاخوندەکان تێکەوە پێچن، ئەوانیش دەیانکرد. هەر دووکیان گەیشتوون بە نوختەیەك کە بە بڕوای ئێمە نوختەی سازشێکی کاتی‌یە، کەی کۆتایی پێ‌دێ و بەچ شکڵ و شێوازێکی تایبەت دا تێپەڕ دەبێ، ئێستا جارێ نازانین.

هەر بۆیەشە گرینگترین ئەرگ لەسەردەمی ئێستای ئێراندا ئەوەیە کە بزووتنەوەی سەربەخۆی کرێکاری و جەماوەری بەبێ بەسترانەوە بە ئەم یا ئەو باڵی ڕژیم پەرە پێ‌بدرێ، بزووتنەوە عەمەلی‌یەکان، کەم و پچووك بن یان گەورە و بەهێز، لە پچووکترین بزووتنەوەیەکیش کە بۆ بەدەست هێنانی هەقدەستی نەدراوی مانگەکانی پێشوو یان لەسەر ئەوەی کە لە فلان گەرەکی هەژارنشین شێرەی ئاو نی‌یە دەخرێتە ڕێ هەتا بزووتنەوە لەپێناوی گۆڕانی ویلایەتی فەقیە و قانوونی ئەساسی ئێران، پیشتیوانی و پارێزگاری‌یان لێ بکرێ. سەرەنجام توانای گشتیی هەموو ئەو بزووتنەوانەیە کە دەتوانێ دیاری بکا کە دەورەی بەناو ئیسلاحات، یانی دەورەیەك کە چینە ئەسڵی‌یەکانی کۆمەڵگا ڕاستەوخۆ پێکیان دانەداوە، کەنگێ و چلۆن کۆتایی پێ‌دێت و سەرەنجام نیزامی کۆماری ئیسلامی لەو ئەزموون و تاقی کردنەوەیە چۆن دێتە دەر و کرێکاران و خەڵك چۆن دێنە دەر.

خەڵك زۆر زیاتر لەوە کە خۆشباوەر بن بە ڕژیمی کۆماری ئیسلامی، توانایی بالفعلی ئەمرۆیی‌یان بۆ لابردنی نی‌یە، بۆیە ڕازین بە بەعزێك دەسکەوت. خەڵك بێگومان نایانەوێ وەکوو ڕابوردوو بژین و، نە لە باری ئابووری و نە لە باری فەرهەنگی و سیاسی‌یەوە ڕازی بە ژیانی ڕابوردوویان نین. هەقخوازی‌یەکی زۆر زیاتر هەر ئێستا لەنێو خەڵکدا شەپۆل دەداتەوە، بەڵام لەعەینی حاڵیشدا توانای ئەوەی کە هەر ئەمرۆ بۆ لابردنی ئەو ڕژیمە بڕژێنە خیابان لەخۆدا شك نابەن. بەرهەمی ئەم دوو بێ‌توانایی‌یەیە کە ئاوا یەکی گرتۆتەوە و کۆمەڵگای ئێرانی لە حاڵەتێکی ناسەقامگیردا ڕاگرتووە و، لە حاڵەتێکی سەیال کە دەتوانێ بە ئەم یان ئەو بار دا بکەوێ، بە ئەم یان ئەو ڕێگادا بڕوات، هێشتویەتەوە.

بەگشتی، لە سەرتاسەری ئەم سەدەی بیستەمەدا، ئەگەر باش لەبەر چاو بگرین، لە ئێراندا هەمیشە سێ ڕەوتی سیاسی هەبوون و دایم لە ململانێ لەگەڵ یەکتری دابوون: ڕەوتی ئیسلامی، ڕەوتی میللی و لیبراڵی و ڕەوتی چەپ و سۆسیالیستی. شۆڕشی ئێران لە ساڵی ١٣٥٧ (١٩٧٩) لە کاتێکدا ڕووی دا کە ڕەوتی چەپ و ڕەوتی لیبراڵ_ میللی لە حاڵی قەیران دابوون، هیچکام لەو دوو ڕەوتانە نەیان توانی ئالتێرناتیڤێك لە بەرامبەر ڕژیمی شادا لەخۆ بدەنە دەر کە بڕوای جەماوەری خەڵك بۆ لای خۆی ڕاکێشێ. ڕەوتی ئیسلامی سیاسی هاتە مەیدان و ئەو بۆشایی‌یەی قۆستەوە.



چەپ و بزووتنەوەی کرێکاری نەیتوانی خۆی کۆ کاتەوە و سەرکەوتن بەدەست بێنێ چونکە بیست و پێنج ساڵ دیکتاتۆری رەشی رژیمی شایەتی، بیست و پێنج ساڵ حاکمییەتی ساواك بەدوای کۆدەتای ٢٨ی موردادا، توانای لە چەپ سەندبووەوە. چەپ خەریکی گەشە کردن بوو، بەڵام لەژێر دیکتاتۆری پاشایەتی‌دا قودرەتی خۆ رێکخستن و خەملین و پەرە گرتنی لێ سەندرابووەوە. کرێکارانی ئێران بەشێکی زۆریان تازە پێگەیشتوو بوون، سەنایعی سوننەتی ئەو جێگە و ئەهمیەتە ئابووری و کۆمەڵایەتی‌یەیان نەمابوو، باقی دیکەشیان سەنایعێکی تازە بوون، بەلێشاو میلیۆنەها نەفەر لە دێهاتەوە رەوانەی شار و کارخانە و کارگە و پرۆژە ساختمانی‌یەکان کرابوون، ئەوانە تەکامولی خۆیان وەکوو چینێك ئەوەندە تێپەڕ نەکردبوو و لە دنیای پێشووی خۆیان ئەوەندە نەهاتبوونە دەر کە بتوانن وەکوو کرێکار خۆ رێك خەن و وەکوو کریکار لە ئاستی کۆمەڵایەتی‌دا داوای هەقی خۆیان بکەن، وەکوو هێزێکی کۆمەڵایەتی راستەوخۆ و سەربەخۆ بێنە مەیدان. ئەم گەشە نەکردنانە بوو کە نەی‌هێشت چەپ وەکوو ئالتێرناتیڤێك بێتە مەیدان و ئەم گەشە نەکردنانەش بوو کە مەیدانی دا بە زاڵ بوونی فیکرێکی تێکەڵ کە ئێمە پێمان دەگوت پۆپۆلیزم. پۆپۆلیزم بەرهەمی گەشە کردنی ناکامڵی خەباتی چینایەتی بوو لە ئێران. مەودای ئازادی بەدوای شۆڕشی ئێرانیشدا زۆر کورت بوو و دیکتاتۆری‌یەکی دینی کە بەشوێن دیکتاتۆری پاشایەتی‌دا هاتە سەرکار، ئەوەندەی تر رێگەی پێگەیشتن و گەشە کردنی لە بزووتنەوەی کرێکاری و چەپ گرت.

رەوتی میللی لیبراڵ بۆیە نەیتوانی ببێتە ئالتێرناتیڤ چونکە شا بە ئیسلاحاتی خۆی بن کۆڵی کردبوو، قسەی لێ سەندبووەوە. ئیسلاحاتی رژیمی شا زەمینەی بۆ رادیکاڵیزم لە خوارەوە ئامادە کردبوو، لەباری کۆمەڵایەتی‌یەوە فورسەتی بۆ کرێکاران فەراهەم کردبوو، بەڵام دیکتاتۆری سیاسی وێڕای جەوان بوون و تازەکار بوونی چینی کرێکار نەیهێشت ئەو فورسەتە بخەملێ و بە ئەندازەی پێویست سەربگرێ و بێتە بەرهەم، بەڵام بۆ خەتی میللی لیبراڵ، بەپێچەوانە، شا بە ئیسلاحاتی خۆی زەمینەی کۆمەڵایەتی لێ سەندنەوە.

زۆر ئاچمە قووڵایی ئەم باسەوە، کۆماری ئیسلامی هاتە سەر کار و ئەرکی تەواونەکراوی رژیمی شای تەواو کرد، ئەو سەرکوتەی کە رژیمی شا نەیتوانی تا ئاخر بیبا و سەرەنجام لەبەری هەڵات، رژیمی کۆماری ئیسلامی بەوپەڕی بێ‌بەزەیی‌یەوە بەئەنجامی گەیاند. تۆڵەیەك کە رژیمی شا بۆخۆی نەیتوانی لە خەڵکی شۆڕشگێڕی ئێرانی بستێنێتەوە، رژیمی ئاخوندەکان لە خەڵکی سەندەوە: کوشتاری بەرفراوانی کۆمۆنیستەکان، دەسگیر کردن و پەرەوازە کردن و لەبەر یەك بڵاو کردنی رێکخراوە کرێکاری‌یەکان وەکوو اتحادیەکان و شووراکان، پاڵ پێوەنانی ژنان بۆ پلەیەکی زۆر نزمی کۆمەڵایەتی و لێسەندنەوەی تەنانەت ئەو

مافە پچووکانەی کە لە زەمانی شادا تا رادەیەك بەدەستیان هێنابوو، هێرشی بەربڵاو بۆسەر کوردستان و داپڵۆسینی خوێناوی هەموو بزووتنەوە نەتەوەیی‌یە هەقخوازانەکان و، بەگشتی کردنی ئێران بە زیندانێکی گەورە، ئەمە ئەرك و وەزیفەیەك بوو کە رژێمی کۆماری ئیسلامی خۆی بۆ تەرخان کرد و بە ئەنجامی گەیاند. شۆڕش لە ئێران شکستی خوارد، ئەو شکستەش بەنرخێکی زۆر گەورە بۆ خەڵك، بۆ ئازادی و بۆ چینی کرێکار کەوت. نەسلێك قەتڵوعام کرا، خانەوادەما لەبەر یەك بڵاو بوون، رۆژنامەکان داخران، رێکخراوە جەماوەری‌یەکان هەڵپێچران، هەزاران و بگرە دەیان هەزار کەس لە تێکۆشەرانی سیاسی، لە هەڵسووراوانی کرێکاری، لە رووناکبیران و کەسایەتی‌یە سیاسی‌یەکان و لە لاوان بە پچووکترین بیانوو و بەبێ هیچ دادگایەك خرانە بەر دەستەی ئیعدام. باشترین مێشکە سیاسی و رۆشنبیری‌یەکانی ئێران بە زەبری دەزگای ئەشکەنجەی ئاخوندە کۆنەپەرستەکان پژان. شەری ئێران و عیراق بەشوێنی‌دا ئاسەواری موقاوەمەتی سڕیەوە و ئێرانی کرد بە گۆرستانێك بۆ دەسەڵاتدارانی کۆماری ئیسلامی.

بەڵام عومری هیچ زەبر و زەنگێکی رەش و دیکتاتۆری‌یەکی دڕندەش هەتا سەر نی‌یە. پاش چەندین ساڵ دوای شەر، ئەم وەزعە وردە وردە گۆڕا و ئێران گەڕایەوە حاڵی عادی خۆی. خەڵك دەستیان کرد بەوەی لەژێر باری شەر و لەژێر باری هەژاری و لەژێر باری دیکتاتۆری پشت راست کەنەوە. تەواوی بزووتنەوەی ئیسڵاحات بەرهەمی ئەوەیە کە خەڵك پشوویەکیان هاتۆتەوە بەرخۆ و جارێکی دیکە بەویست و خواستی خۆیانەوە خەریکن دێنە مەیدان.

ئەم جارە رەوتی ئیسلامی سیاسی، ئەگەریش نەڵێین بۆ هەمیشە بەڵام هیچ نەبێ هەتا سەردەمێکی دوور لە ئێران دۆڕاندوویەتی، بەهیچ قودرەتێك و وەك بەکوردی دەڵێن بە هیچ مەلا و شێخێك چا نابێتەوە. بەگشتی رەوتی ئیسلامی سیاسی لە ساڵانی رابوردوودا نەك هەر لە ئێران بەڵکوو لە هەموو ناوچەکە و وڵاتانی ئیسلامی تووشی کزی و نوشستێك بووە، تووشی دابەزینێك بووە بەم هاسانی‌یە جێی خۆی ناگرێتەوە. ئەو هەڵچوون و گەشە کردنی ئیسلامی سیاسی کە لە دەیەی هەشتادا بەرچاوە دەکەوت، هێواش بۆتەوە و بەتایبەتی لە ئێران کە شوێنی تاقی کردنەوەی ئەم مۆدێلە لە ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی بوو شکستی کامڵی خواردووە. ئەو پرۆژەی کە بۆخۆیان پێی دەڵێن "ئینقیلابی ئیسلامی"؛ لە فەرهەنگی چەپ دا بەدروست ئەو ناوەی لێ نانرێ بەڵام ئەگەر بە زمانی خۆیان قسە بکەین پرۆژەی "ئینقیلابی ئیسلامی" شکستی ئیگجاری خواردووە و، تەنیا زۆر توانیویەتی ئەوان لەسەر



کار راگرێ و تەنیا بێتوانایی خەڵك و سەرهەڵنەدانی ئالتێرناتیڤێکی گونجاو ئەو رژیمەی لەسەر کار هێشتۆتەوە.

لەم سەردەمە تازەیەدا کە نزیکەی دەهەیەکە وردە وردە لە ئێران هاتۆتە ئاراوە و هەر رۆژ زیاتر فەزای ئێران دادەگرێ، ئیسلامی سیاسی وەکوو ئیدیۆلۆژییەك و رێبازێك کە مێشکەکانی داگیر کردبوو کاڵ بۆتەوە، بەهاکانی بێبایەخ بوون و کۆمەڵگای ئێران تازە ئەو مۆدێلە لە ژیانیکۆمەلایەتی و سیاسی و فەرهەنگی قبووڵ ناکا. ئیدیۆلۆگەکانی نیزامی کۆماری ئیسلامی هەرچی دەکەن ناتوانن ئەو رەوتە بەرەو نشێوە بەربەست کەن. لە بەرامبەردا وەنییە کە خەتی چەپ و رادیکاڵ جێگەی گرتبێتەوە. لەم دەورەیەدا خەتی میللی و لیبراڵ دەستی باڵای لە رای گشتیدا پەیدا کردۆتەوە. مەعنای ئەم قسەیە ئەوە نییە کە چەپ ئاسۆیەکی لە داهاتووی ئێراندا نییە یان زەمینەی کۆمەلایەتی نەماوە. کەلێن و شکافی چینایەتی لە ئێران خێراتر لە هەمیشە زیادی کردووە، بوونی کۆمەلانی بەرینی خەڵك بە کریکار یا بێکارانی چاوەڕێی کار لە هەمیشە زیاترە، ستەم لە ژنان، ستەمی نەتەوایەتی، بێئاسۆیی لاوان، وەزعی فەلاکەتباری ئابووری، هەمووی ئەوانە زەمینەیەکی گەورەن بۆ ئەوەی بزووتنەوەی رادیکاڵ لە ئێران وەرێ بکەوێ و چەپ لە بزووتنەوەی رادیکاڵدا هەمیشە جێگەی هەیە. بەڵام ناتوانین ئەو راستییە نادیدە بگرین کە فکرسازانی دەیەی رابوردوو، تێئۆریسیەنی چەپ نەبوون، بەڵکوو زۆرتر تێئۆریسیەنی خەتی لیبراڵ بوون و، ئەوە لەگەڵ رەوتی ئاڵوگۆڕە فکرییەکانی سی ساڵی رابوردووی دنیاش دێتەوە.

لە ئاستی جیهانیشدا ئێمە لەگەڵ پاشەکشەیەکی چەپ لە ئاخرەکانی هەزار و نۆسەد و حەفتاکانەوە هەتا سەرەتای ئەوەدەکان بەرەوروو بووین. لەهەموو دنیادا لیبرالیزمی نوێ لەباری ئیدیۆلۆژییەوە پێشرەوی کردووە و سیاسەتەکانی خۆی هێناوەتە ناو کۆمەڵگاوە. هەڵبەت جێی خۆیەتی ئیشارە بەوەش بکەین کە وردە وردە کاردانەوە لەبەرامبەر زاڵ بوونی لیبرالیزمی نوێ و ئاکامە کۆمەلایەتییەکانی لە دنیا روو لە زیاد بوونە و، رەوتی پاشەکشەی چەپ کە لە هەشتاکاندا ئێگجار زۆر بوو، لە نەوەدەکاندا وردە وردە وەستاوە. چەپ و فکری پێشکەوتنخوازی و بەگشتی بلێین فکر و جووڵانی دژی سەرمایەداری خەریکە تینێکی دێتەوە بەر. هۆیەکەشی ئەوەیە کە نیزامی سەرمایەداری جیهانیی ئەمرۆ سەرەرای هەموو پێشکەوتنی تەکنۆلۆژیکی خۆی نەیتوانیوە مەسەلە سەرەکی و سەرەتاییەکانی ژیانی ئینسان چارەسەر بکا. دەبینین ئەفریقا و بەشێکی زۆر لە ئاسیا لە هەژاریدا دەسووتێن، بێکار کردنی بەکۆمەڵ کە چەند دەیە لەوە پێش تەسەوور نەدەکرا ئێستا لە ئورووپا و لە هەموو دونیا نۆرمە، ژنان هەروا بێبەشن، کاری منداڵان بەفراوانی رەواجی هەیە، لافاوێك یان

وشکەساڵی‌یەك کە بەتوانای ئێستای ئینسان بەهاسانی ئەکرێ چارەسەر بکرێ ئەبێتە هۆی مەرگ و ماڵوێرانی‌یەکی وەها کارەسات، ململانێی تەسلیحاتی و کۆکردنەوە سەریەکی چەکی بەکۆمەڵکوژی دنیافەوتێن هەروا درێژەی هەیە و زۆر شتی تریش. ئەمەش لە حاڵێکدا کە مرۆڤایەتی لەوپەری توانای بەرهەم هێنانی خۆی دایە و دنیا پرۆسەی شۆرشێکی گەورەی تەکنۆلۆژی تیپەر دەکات، بەڵام بەهۆی زاڵ بوونی شێوەی سەرمایەداری هێزی داهێنەری کۆمەڵگای ئینسانی لەپێناو کەڵکە کردنی سەروەتی ئەفسانەیی بۆ کەمایەتی‌یەکی پچووك قەتیس کراوە و ئاخرێتە خزمەت بەختەوەری جەماوەرەوە. بە وتەی راپۆرتێکی چەند ساڵ لەوە پێشی رێکخراوی نەتەوە یەککگرتووەکان سەروەتی چەند کەس لە میلیاردێرەکانی دنیا دەتوانێ هەموو فەقیری و هەژاری قارەی ئەفریقا چارەسەر بکا. بەڵام لەلایەکی تریشەوە دەبینێ کاردانەوەیەك لەبەرامبەر ئەم وەزعەدا پێك هاتووە، ئەم کاردانەوە کاریگەریی خۆی لەئاستی فیکریشدا داناوە و لیبرالیزم، ئەگەرچی ئێستاش دەستی باڵای هەیە، بەڵام بێ‌رەقیب و بێ‌بەرهەڵستکار نی‌یە.

بەهەرحاڵ ئەگەر بگەرێینەوە سەر باسی ئێران، چەپ ئەرکێکی گەورەی لە ئەستۆیە، ئەویش تەنیا ئەرکی رێکخستن یا ئەرکی خەباتکارانە بەمانای بزووتنەوەی عەمەلی نی‌یە، بەڵکوو ئەرکی فکری و رۆشنبیری‌یە. چەپ دەبێ بتوانێ ئالتێرناتیڤی خۆی، دید و روانگە فیکری‌یەکانی خۆی لە حاست ئاڵوگۆڕەکان و باسە کۆمەڵایەتی‌یەکانی سەردەم دا بهێنێتە گۆڕ و بەزەبری هێزی تیئۆری و مەنتقی خۆی دەستی باڵا پەیدا بکا. ئەمە بەراستی ئەرکێکی گەورەی رۆشنبیریی سۆسیالیستی‌یە، ئایا تێیدا سەردەکەوێ و لە عۆدەی بەردێ، ئازانم بەڵام بەبێ شك سەرکەوتنی بەوەشە بەستراوەتەوە. من بە ئاواقیعی دەزانم ئەم ئەرکە گەورەیە، بەتەنیا بخەینە سەر ئەستۆی کۆمەڵە، ئەمە بە توانایی هەموو مێشکی پێشکەوتنخواز و چەپ و سۆسیالیستی ئێران ئەکرێت، بەڵام ئێمەش لەقەدەر خۆمان ئەبێ بۆی تێبکۆشین.

ئێمە وەکوو کۆمەڵە دەتوانین لە کوردستان لەم بارەیەوە چی بکەین؟ دەزانین ئەم بزووتنەوە سیاسی‌یە بەرینەی ئێستای ئێران لەپاڵ ئەوەدا کە زۆر داخوازی عادڵانەی جەماوەریی تێدایە، بەڵام وەکوو هەموو بزووتنەوە و حەرەکەتێکی جەماوەر لە دنیادا، لەژێر تەئسیری بیروباوەر و رێبازی سیاسی جۆراوجۆر دایە، فەلسەفەی ناسیونالیستی و لیبراڵی و ریفۆرمیستی و ئیسلاح خوازی و هەموو ئەوانەشی تێدایە. ئێمە هەوڵ ئەدەین ئەو بزووتنەوانە خەت و سیاسەتێکی رادیکاڵتر وەرگرن، خەت و سیاسەتێك کە خوازیاری ئاڵوگۆرێکی قووڵتر لە بنەماکانی کۆمەڵگای ئێستای ئێران و کوردستان دایە. لەساڵانی رابوردوودا زۆرێك لەو بزووتنەوانە لە ئێراندا پەیوەندیان لەگەڵ خەتی سۆسیالیستی ئەگەر



نەپسابێ زۆر کز بووە، کەوتوونە ژێر تەئسیری ڕەوتە فیکرییەکانی دیکە بەتایبەت لیبرالیزم. ئێمە دەبێ جارێکی دیکە کارێکی وا بکەین کە ئەم بزووتنەوەی کە ئێستا لە ئێران و لە کوردستانی ئێران لەئارا دایە نەک هەر لە باری عەمەلییەوە لە کۆمەڵە نزیک کەینەوە بەڵکوو لەباری فیکری و خەتیشەوە لەگەڵ خەتی سۆسیالیستی ئاشتی بکەینەوە. مەبەستم ئەوەیە کۆمەڵە دەبێ جارێکی دیکە بچێتە جەنگی ڕەوتە فیکری و جیهان بینییەکانی دیکەوە و جارێکی تر بتوانێ و ئەوەندە هەوڵی فیکری بەهێزی خۆی و بەهێزی ڕەوتی خۆی پەیدا بکات کە بالادەستیی خۆی لەم بووارەشدا بنوێنێ. وەختی خۆی، کاتێک ئەو تەقینەوە جەماوەرییەی کۆمەڵە رووی دا، کۆمەڵە توانی سەرتۆپی ڕووناکبیرانی کوردستان بۆ لای خۆی ڕاکێشێ. کۆمەڵە دەبێ بتوانێ جارێکی دیکەش مێشکی ڕووناکبیرانی کوردستان بەدەست بهێنێتەوە.

هەروەها هێزی چەپی شۆڕشگێر دەبێ بەهەر جۆرێک هەیە پەیوەندی خۆی لەگەڵ بزووتنەوەی جەماوەری دابمەزرێنێ و پتەوی کات، نابێ پشت لە ئیسلاحات هەڵکا بەدەلیلی ئەوەی ئەم یان ئەو بزووتنەوە ئاوێتە بە ئەم یان ئەو ئاخالیسی فکری و سیاسییە، دەبێ تێکەڵی بێ، لەگەڵی بێ و لە ڕەوتی لەگەڵ بوونیدا ڕادیکاڵیزەی بکا، ئەمە تەجرەبەی مێژووی فەعالییەتی کۆمەڵەیە. بەدەستووراتی گشتی و شیعارمانەند لە دەرەوەرا مومکین نییە کەس بتوانێ لەسەر بزووتنەوەی واقیعی تەئسیر دابنێ، دەبێ تێکەڵاوی بزووتنەوەکە بێ، خەمخۆری بێ، تێکۆشەری بێ، لە ڕیزی پێشەوەی دابێ تا بتوانێ وردە وردە ڕادیکاڵیزەی کەی و ڕەهبەرییەکەی بەدەستەوە بگرێ. ئەمانە دستورالعملی چەپن لەباری عەمەلییەوە و لە باری فیکری و ڕۆشنبیریشەوە.

لەپاڵ هەموو ئەوانەدا کە لەبارەی وەزعی سیاسی ئێران بەگشتی و لەوانە مەسەلەی ڕووخاندنی ڕژیمی کۆماری ئیسلامییەوە دەیڵێین و ئێمە وەکوو کۆمەڵە، وەکوو حیزبێکی شۆڕشگێر، ناتوانین غەیری ئەوە بیر بکەینەوە، بەڵام نابێ لەبیرمان بچێتەوە کە ناتوانین ئەرکی ڕووخاندنی ڕژیمی کۆماری ئیسلامی بخەینە ئەستۆی بزووتنەوەی کوردستان. خەڵکی کوردستان، وەک بەشێک لە خەڵکی ئێران، بەگشتی خواستی لاچوونی ئەو ڕژیمەیان هەیە، کاتی خۆی لە بزووتنەوەیەکی ئازادیخوازانە و دیمۆکراتیک و شۆڕشگێرانە بەشدارییان بووە و لەمە بەولاوەش بێگومان دەیان بێت. ئەگەر ئەو خواستە بوو بە جووڵانێکی واقیعی و عەمەلەن مەسەلەی ڕووخانی ڕژیمی کۆماری ئیسلامی لەبەر دەمی خۆی دانا، خەڵکی کوردستانیش بێگومان بەباشترین شێوە دەوری خۆیان دەبینن و لەخەڵکی لەپێشتر نەبن لەدواتر نابن، بەڵام کاتێک هێشتا ئەو بزووتنەوە سەراسەرییە نابینین، ئەو کاتەی کوردستان



لەسەر بنەماکانی خۆی رادەوەستێ و بەتەنیا تواناکانی خۆی بەکار دێنێت، بزووتنەوەی کوردستان ناتوانێ ئەرکی هەموو بزووتنەوەی سەراسەری بۆ رووخان بگرێتە ئەستۆ و بۆی هەیە و دەبێ ئامانجە تایبەتی‌یەکانی خۆی دیاری بکا. خەڵکی کوردستان نەك تەنیا وەك بەشێك لە ئێران هەموو خواستە دێموکراتیکە گشتی‌یەکانیان هەیە، بەڵکوو لە هەمان حاڵدا وەکوو کۆمەڵگەیەك و نەتەوەیەکی دیاری‌کراو بە کێشەی تایبەتی و مێژووی خەباتی خۆی و ئامانجی تایبەتی خۆیەوە، بۆیان هەیە بەهێز و توانای خۆیان و بزووتنەوەکەی خۆیان لەرێگای گونجاوەوە، بە کەڵك وەرگرتن لە هەموو شکڵێك لە خەبات لەوانە خەباتی چەکداری؛ هەوڵ بدەن هەرچەندی بۆیان مومکین بێ لەو ئامانجانەی کە رایانگەیاندووە و لەو مافانەی کە داوای دەکەن بەدەستی بهێنن. لێرەدایە کە مەسەلەی وت و وێژ لەگەڵ رژیمی کۆماری ئیسلامیش بۆ کورد و بۆ بزووتنەوەی کوردستان مەعنا پەیدا دەکا.

بەم حیسابە رێکخراوێکی سەرنگوونی‌خواز دەتوانێ لە ریزی پێشەوەی بزووتنەوەی کوردستاندا بێت، بەڵام هەمان رێکخراو لە نوێنەرایەتی بزووتنەوەی خەڵکی کوردستاندا دەتوانێ وت و وێژ لەگەڵ کۆماری ئیسلامی یان لەگەڵ هەر رژیمێکی داهاتوودا بەرێوە بەرێ. ئەمە تەجروبەی پێشووی کومەڵەشە. کۆمەڵە لە یەکەم رێکخراوەکان بوو کە هەرگیز باوەری بە رژیمی کۆماری ئیسلامی نەبوو و لە رۆژی هەوڵەوە کە خومەینی گوتی "بشکنید این قلمها را"، راگەیاندنی لەسەر دا و هەرگیز تووشی خۆشباوەری بەو رژیمە نەبوو. بەڵام ئەو کاتەی کە بزووتنەوەی خەڵکی کوردستان گەیشتە ئاستێك کە جەمهووری ئیسلامی هێنایە ئەو جێگایە کە ئامادەیی خۆی راگەیاند بۆ ئەوەی خواستەکانی گەلی کورد بدات، سەرەرای ئەوەش کە ئەو سیاسەتەی رژیم کاتیش بوو، بۆ پشوو دان و هێز کۆکردنەوە بۆ سەرکوتی سەرلەنوێش بوو، بەڵام کۆمەڵە بەدروست لە روانگەی نوێنەرایەتی گەلی کوردەوە لەگەڵ نوێنەرانی کۆماری ئیسلامی دانیشت و ئامادەی وت و وێژ بوو. ئەمە هیچ ناکۆکی و نەگونجاوی‌یەکیشی لەگەڵ هەموو ئەو هەڵوێستانەی ئێمە لەسەر رژیمی کۆماری ئیسلامی نی‌یە کە خۆتان دەزانن و منیش لەم گوزراشەدا سەرلەنوێ جارێکی دیکە بۆم باس کردنەوە. هەڵبەت ئێستا هیچ شتێك لە گۆرێدا نی‌یە، باسەکەی ئێمە تەنیا باسێکی فەرزی و لە ئاستی ئوسوولی دایە و ئێمە لەم باسەدا خەریکین لەئاستی دارشتنی سیاسەت قسە دەکەین نەك وەڵام دانەوە بە پێشنیارێکی دیاری‌کراو. بەڵام مەبەستەم ئەوەیە کە ئێمە حیزبێکین مەسئوول لەبەرامبەر خەڵکی کوردستان و بزووتنەوەکەیان و چارەنووسیاندا و دەبێ لەرووی مەسڵەحەتی گشتی خەڵك و بزووتنەوەوە وەڵام بە وەها مەسەلەیەك بدەینەوە.

ئاخرین قسەی منیش لەم بارەیەوە پێشنیارێکە کە کۆمەڵە لە چەندین ساڵ لەوە پێشەوە خوازیاری بووە و رایگەیاندووە، ئەویش ئەوەیە کە ئێمە خوازیاری پێک هاتنی هەیئەتێکی نوێنەرایەتی هاوبەشی هەموو گەلی کوردین کە بتوانێ لەکاتی پێویستدا وەڵامدەرەوەی مەسەلەی وت و وێژ بێت. هەیئەتێک یان ئۆرگانێک کە کۆمەڵەی تێدا بێ، حیزبی دێمۆکراتی تێدا بێ، لەهەمان حاڵدا بەوانیشەوە مەحدوود نەمێنێتەوە و بتوانێ خەڵکانی دیکە و لایەنی دیکە و کەسایەتی‌یەکانی دیکەشی تێدا بێ. من ناچمە ناو وردەکاری‌یەکانی ئەم پێشنیارەوە، بەڵام ئەمە پێشنیارێکی مەسئوولانەیە لەلایەن کۆمەڵەوە، کۆمەڵە لە روانگەی نوێنەری واقیعی و خەمخۆری ئەم بزووتنەویەوە ئەو پێشنیارەی مەترەح کردووە و دەبێ لە سەریشی بڕوا.

یەکێکی دیکە لەو خاڵانەی کە پێم وایە پرسیارێکە، چ لەناو کوردستانی ئێران چ لە دەرەوەی وڵات و لەنێو خەڵکی سیاسی‌دا، ئەوەیە کە ئێمە لەسەردەمی ئێستادا چ دەور و نەخشێک بۆ کاری چەکداری دادەنێین و پەیوەندی بەینی ئەو بزووتنەوە سیاسی و مەدەنی‌یەی کە لە وڵات لە ئارا دایە لەگەڵ کاری چەکداری چۆن دەبینینەوە. لێرەش من هەر دەتوانم سەرخەتەکانی ئەو باسە بە ئاگاداری هاورێیان بگەیەنم.

ئێمە یەکێک لەو حیزبانە و لەو لایەنانەین کە زۆر بەباشی ئەهمیەتی ئەو بزووتنەوە سیاسی‌یەی کە ئێستا لە ئێراندا لەئارا دایە تێدەگەین، هەموو هەوڵی ئێمە ئەوەیە کە ئەو بزووتنەوەیە گەشە پێبدەین و بە رێبازێکی پێشکەوتنخوازانەتر و رادیکاڵتر دا بیبەین. بەڵام لەپاڵ هەموو ئەوانەشدا و بە تێگەیشتنی ئەهمیەتی بزووتنەوەی سیاسی و جەماوەریش و بە تێگەیشتنی هەموو ئاڵوگۆڕەکانی سەردەمیش، ئێمە لەگەڵ ئەو جۆرە بیر کردنەوە نین کە هەوڵ دەدات بەجۆرێک مێژووی رابوردوو بشواتەوە و بەدیدی ئێستاوە مێژووی رابوردوو دابرێژێتەوە. واقیعییەت ئەوەیە کە لە سەردەمێکی دیاریکراودا شکڵی خەباتی چەکداری لەکوردستان، نەک بەدەلیلی پێخۆش بوون یان هەڵبژاردنی ئێمە، بەڵکوو لەبەر ئەوە کە رەوتی خەبات لەو کۆمەڵگایە وای پێش هێنا و وای دەخواست، بوو بە یەکێک لە شێوە سەرەکی‌یەکانی خەباتی جەماوەر. با لەبیرمان نەچێتەوە  کە لە ساڵی ١٣٥٨ (واتە ١٩٧٩ی زایینی) هەر رێکخراوێک و هەر حیزبێکی سیاسی کە جوابی شیاوی بەو مەسەلەیە نەدابایەتەوە، لەژێر فشاری جەماوەردا دەفەوتا و دەتوایەوە. هاورێیان، سازمان چریکهای فیدایی خەلقی ئێران لەنێو چەپ لە کوردستاندا دووەمین هێز بوو و بەحەقیقەت بۆ سەردەمێک جێگە و شوێنێکی هەبوو. بەڵام لەبەر ئەوەی کە رەهبەریی چریکی فیدایی لە تاران خەت و رێبازێکی سازشکارانەی بەرامبەر رژیمی کۆماری ئیسلامی گرتبووە پێش، نەیتوانی خۆی

ساغ کاتەوە و لێبڕاوانە رایبگەیەنێ کە لە بزووتنەوەی کوردستاندا بەشداری دەکا و لەبەرامبەر رژیمی کۆماری ئیسلامی‌دا دەوەستێتەوە، لەو کارەدا سستی کرد، خۆی بووارد و نەیتوانی راشکاوانە بێتە نێو ریزی بزووتنەوەی شۆڕشگێڕانە لە کوردستان کە ئەڵبەتە خەباتی چەکدارانەش شکڵێکی گرینگ و بڕیاردەری ئەو بزووتنەوەیە بوو، هەر بۆیە فەوتا، ئاسەواری نەما لە کوردستان. ئەو حیزبەی کە لە کاتی پێویستدا دەست نابا بۆ شۆڕشی چەکداری، کەمتر تاوانبار نی‌یە لەو حیزبەی کە لە کاتی ناپێویستدا بە دەست دانە چەک خەباتی سیاسی لەبار دەبا.

ئەو کەسانەی کە ئەمڕۆ بوون بە تیئۆریسیەنی ئەوەی کە ئەدەبوایە خەباتی چەکداری بکرێت، تێگەیشتنێکی زۆر سادە و ساکاریان لە شکڵ و شێوەکانی خەبات هەیە. لە روانگەی تیئۆری مارکسیستی‌یەوە، شکڵ و شێوەکانی موبارەزە: یەکەم، هیچیان موقەدەس و پیرۆز نین، دووهەم، هیچیان هەتاهەتایی و ئاسەر نین، سێهەمیش دەسکرد نین و هێنانە گۆڕیان لەسەر دڵخوازی ئەفراد و گروهەکان و ئەحزاب نی‌یە، بەڵکوو رەوتی خەباتی سیاسی و چینایەتی لە کۆمەڵگایە کە شکڵ و شێوەیەک لە خەبات دەخاتە دەستووری کاری ئەو کۆمەڵگایەوە. بۆ نموونە، لە ٢١ و ٢٢ی رێبەندانی ساڵی ١٣٥٧ (١٩٧٩)، کێ دەیتوانی بڵێ راپەرینی چەکدارانە شکڵی زاڵی خەباتی سیاسی لە ئێران نی‌یە یان نابێ ببێ؟ بەڵام چوار مانگ پێش ئەوە کێ دەیتوانی کاری چەکدارانە بەسەر بزووتنەوەی سیاسی‌دا تەحمیل بکا و بزووتنەوەی سیاسی نادیدە بگرێ؟ ئەوانە هەردووکیان غەیری مومکین بوون. راپەرین خۆی نوختەیەکە لە تەکامولی خەباتی سیاسی و چینایەتی لە کۆمەڵگایەک دا. هەموو راپەرینە گەورەکانی مێژوو ئاوا بوون. هاتنە ئارای شکڵ و شێوەکانی خەبات بەستراونەتەوە بە زۆر هۆکاری کۆمەڵایەتی و سیاسی، بە ئاستی خەباتی جەماوەر، بە رێکخراو بوونیان، بە ئەوعی دەوڵەتێک کە بەسەریانەوەیە، بە تەرازووی هێزەکانی خەڵک و چینە دەسەڵاتدارەکان لەبەرامبەر یەکتری‌دا، بە پێشینە و مێژووی ئەو کۆمەڵگایە کە چ سوننەت و تەجروبەیەکی بەجێ هێشتووە و بە زۆر شتی دیکە. بەلەبەر چاو گرتنی هەمووی ئەوانە، یەکێک لە رەمزەکانی سەرکەوتنی کۆمەڵە لە رابوردوودا بریتی لەوە بوو کە سڵی نەکرد لەوەی کە لێبڕاوانە دەست بۆ ئەم شکڵە لە موبارەزە بەرێ و لەپێناوی‌دا سەختی قبووڵ کا و قوربانی بدا.

بەڵام کۆمەڵە هیچ کات حیزبێکی تاک بوعدی چەکدارانە نەبوو. لە رابوردوودا زۆر جار لایەنەکانی دیکە ئێمەیان بەوە تاوانبار دەکرد کە بە ئەندازەی کاف لەسەر خەباتی چەکداری سوور نین. ئەسڵەن وانەبوو، مەسەلەکە ئەوە بوو کە خەباتی چەکداری هەموو ئاسۆی فیکری



و سیاسی کۆمەڵەی داگیر نەکردبوو، بەڵکوو ئەو کاتیش وشیاری سیاسی و خەباتی سیاسی جەماوەر بۆ کۆمەڵە جێگەی سەرەکی هەبوو.

ئەمە لەباری تیئۆریك و مێژوویی‌یەوە، بەڵام ئێستا مەسەلەکە لەباری عەمەلی‌یەوە چۆنە؟ ئێمە پێمان وایە حاڵی حازر لە هەموو ئێران شکڵی خەباتی سیاسی شکڵی ئەسڵی‌یە. ئەو کەسەی کە ئەمە تێ‌نەگا، خۆی لەگەڵ رەوتی خەباتی جەماوەری خەڵك نەگونجاو و ناهاوئاهەنگ دەکا. تا ئەو جێگەی کە دەگەرێتەوە سەر کوردستان، ئێمە دەبێ ئەو چەند سیاسەتە رەچاو بکەین:

یەکەم، هێزی پێشمەرگەی کۆمەڵە نەك هەر رابگرین، بەڵکوو پەرەی پێ‌بدەین و، لەباری چەندایەتی و لەرووی کەیفییەتەوە، لەباری سیاسی و نیزامی و رێکخراوەیی‌یەوە بەهێزی کەین. کۆمەڵە دەبێ ببێتە خاوەنی هێزێکی پێشمەرگەی وەها کە لەم ناوچە ئاڵۆز و ناسەقامگیرەدا کەس تەماعی تێ‌نەکا و دوژمنانی خۆی هیوابراو بکا.

دووهەم، ئەوەندەی هێز هەبێ کە لە کاتی خۆی‌دا و وەختێك رەوتی خەباتی سیاسی گەیشتە ئەو نوختەی قوڵت، بتوانێ بەیارمەتی ئەو خەباتەوە بچێ و دەخالەتێکی کاریگەر و بڕیاردەر لە رەوتی رووداوەکان دا بکا.

سێهەم، لەم ماوەیەش دا لە هێزی پێشمەرگەی خۆی بۆ هێندێك کاری پێشمەرگانەی مەحدوود و دیاری‌کراو کەڵك وەرگرێ. من ئێستا و لەم بڕگەیەدا ناوی لێ نانێم کاری نیزامی و چەکداری و ئەوەش لە بەرنامەماندا نی‌یە، بەڵام بە لەبەر چاو گرتنی ئەوەی کە: هەدەفی ئەسڵی کاری پێشمەرگانەی ئێستا خزمەت کردن بەو بزووتنەوە سیاسی‌یەیە، لەبەر ئەوە حدوود و سنووری، چوارچێوەی و مەبەستەکانی دەبێ جۆرێك هەڵبژێردرێن کە گەشە بدا بەو خەباتە سیاسی‌یەی کە لە کوردستان لە ئارا دایە نەك پەکی بخا. دەبێ بزووتنەوە و مویارەزەیەکی کە لەنێو خەڵك دا هەیە بیگەشێنێتەوە، بروا بەخۆ لە رێزەکانی خەڵکدا زیاد کا نەك ئەوەی خەڵك دامرکێنێتەوە و خۆی بکاتە جێ‌نشینی خەباتێکی سیاسی کە ئێستا لە کوردستاندا هەیە. ئەمە ئەوعی کاری موجاهیدینی خەلقە کە ئێمە دەبێ لێی دوور بین. کاری پێشمەرگەی ئێمە لەسەردەمی ئێستادا، هەڵبەت هەمیشە وایە بەڵام بەتایبەتی ئێستا، دەبێ زۆر نزیك و چڕوپڕ لە خزمەت ئەهدافی سیاسی قۆناغی ئێستادا و بە لەبەر چاو گرتنی هەل و مەرجی سیاسی گشتی ناوچەکە بێت. ئەوەندە بێ کە تەقویەتی خەڵك دەکا لە خەباتیان دا و بروا بە خۆیان زیاد دەکا، ئەوەندە نەبێ کە ببێتە هۆی زاڵ بوونەوەی سەرلەنوێی خەفەقان لە کوردستاندا و خەباتی سیاسی‌یەکە لەبار بەرێ. هەڵبەت هۆکاری مەحدوودکەرەوەی دیکەشمان هەیە، ئێمە لە ناوچەیەك دەژین کە بە مەیلی خۆمان نی‌یە چەندە کەڵك لەو



هێزەمان وەربگرین. ئێمە دەبێ مەسلەحەتی خەڵکی کوردستانی عیراق و ئەزموونەکەیان لەبەر چاو بگرین. هەروەها هەل و مەرجی گشتیی مانەوە و بەقای کۆمەڵە لەم ناوچەیەش لەبەر چاو بگرین. بە لەبەر چاو گرتنی هەموو ئەوانە و لەو سنوورەدا، دەتوانین لە هێزی پێشمەرگە کەڵك وەرگرین.

هاوڕێیان، لێرەدا گوزارشەکەی کۆمیتەی ناوەندی بە ئێوە تەواو دەبێ. وێڕای سوپاس لە ئێوە بۆ گوێ گرتنی بەدیققەتتان، پێم خۆشە لە کۆتایی‌دا بڵێم کە دەبینین لە ئێران جارێکی دیکە جم و جۆڵی سیاسی پەیدا بۆتەوە، بەستەڵەکی دیکتاتۆری خەریکی توانەوەیە و هەر وەکوو پێشتر ئاماژەم پێکرد ئەمە فورسەتێکی مێژوویی بۆ رەوتی شۆڕشگێڕ و بۆ هەموو فەردێکی شۆڕشگێڕ دەخوڵقێنێ. کوردستان تۆزێك لەمە بەولاوە تریشە، رادیکاڵیزەتریشە، زۆرتریش ئامادەی بزووتنەوە و هەستانی جەماوەری‌یە.

زۆر کەمن ئەو نەسلانەی لە ژیانی خۆیاندا شۆڕشێك بەچاو دەبینن، جاری وایە بە دووسەد ساڵیش لە کۆمەڵگایەکدا شۆڕش و راپەرین ناکرێ. ئێمە ئێستا لە بەر دەم ئاڵوگۆڕێکی گەورە داین لە ئێران و لە کوردستان. دەبێ بێ‌وەستان خۆمانی بۆ ئامادە کەین. تا ئەو جێگەیەش کە دەگەرێتەوە سەر کۆمەڵە، بەگشتی دەروازەی جەماوەری بوونێکی گەورە بەرەورووی ئێمە کراوەتەوە، شانسێکی گەورە رووی تێکردووین، زۆر حەیفە ئەم فرسەتە لەدەست بدەین. دەبێ هەموومان ئەوپەری هێز و توانا و بیری خۆمان بەبێ قوسوور لەپێناوی‌دا تەرخان کەین.

## سەبارەت بە جێگاوشوێنی ئێستای «حیزبی کۆمۆنیستی ئێران» و پەیوەندمان لەگەڵ ئەو حیزبە

### پەسندکراوی کۆنگرەی نۆهەمی کۆمەڵە
### پووشپەڕ ــ گەلاوێژی ۱۳۸۰

کۆنگرەی نۆهەمی کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێران، وێڕای تەئییدکردنەوەی سەرلەنوێی بەڵگەپەسندکراوەکانی کۆنفرانسی ساغکردنەوەی کۆمەڵە لە بابەت رەخنەگرتن لە ئەزموونی حیزبی کۆمۆنیستی ئێران، جارێکی دیکە جەخت لەسەر ئەو راستییە دەکا کە ئەو ناکۆکییەی لەسەر ژیاندنەوەی هەڵسووڕانی سەربەخۆی کۆمەڵە یان درێژەپێدانی قەوارەی رێکخراوەیی حیزبی کۆمۆنیست پێکهات، لە راستی دا خۆی ئەنجامی ناتەبایی و ناکۆکییەك بوو کە لە دەمێك پێشترەوە لە ناو رێبەرایەتیی حیزبی کۆمۆنیست دا سەری هەڵدابوو. ئەم ناکۆکییانە لە رێبەرایەتیی حیزبی کۆمۆنیستی ئێران دا، دەساڵ لەوە پێش، ماوەیەکی کورت دوای جیابوونەوەی ئەو رەوتەی پێی دەگوترێ کۆمۆنیزمی کرێکاری، لە سەر هەڵسەنگاندنی ئەو جیابوونەوەیە و چۆنیەتیی لێکۆڵینەوە و هەڵسەنگاندنی رەخنەگرانەی روانگەکانی رەوتی کۆمۆنیزمی کرێکاری و پاشان لەسەر چۆنیەتیی هەڵسەنگاندن و روانین بۆ هەموو ئەزموونی حیزبی کۆمۆنیستی ئێران، سەریان هەڵدا و لە ئەنجام دا گەیشتە ئەوەی رەوتی ئێمە دەست بداتە ساغکردنەوەی کۆمەڵە و چوارچێوەی حیزبی کۆمۆنیستی ئێران بە جێ بێڵێ. بەم مانایە، ساغبوونەوەی کۆمەڵە و جیابوونەوەی لە حیزبی کۆمۆنیستی ئێران، ئەو ئاڵقەیە بوو کە تێیدا دابڕانی یەکجاری لە میراتی کۆمۆنیزمی کرێکاری بە سەرەنجام گەیشت.

ئێستا، کە نزیکەی ساڵێك لە هەڵسووڕانی سەربەخۆی کۆمەڵە تێپەڕیوە، رەوابوونی رێبازی کونفرانسی ساغکردنەوەی کۆمەڵە لە کردەوە دا و لە رووی گەلێك ئەنجامی بەنرخەوە کە لە مەیدانی سیاسی و کۆمەلایەتیی کوردستان دا لێی کەوتوەتەوە بە روونی خۆی نیشان داوە. پێشوازیی بەرینی جەماوەری خەڵك لە شار و ئاوایییەکانی کوردستان لەم ماوەکورتە دا بووە هۆی ئەوەکە کۆمەڵە بێتەوە ناوەندی شانۆی سیاسیی کوردستان و، دەری خست کە ژیاندنەوەی هەڵسووڕانی سەربەخۆی کۆمەڵە و بەجێ هێشتنی چوارچێوەی حیزبی کۆمۆنیستی ئێران نەك نەبووەتە مایەی لاوازبوونی کۆمەڵە و نەك هەر هەنگاوێك نەبووە لە ناوخۆی رێکخراوێك دا، بەڵکوو لە پلەی یەکەم دا هەنگاوێکی سیاسی بوو لە سەر بنەمای تێگەیشتن لە پێویستییەکی

سیاسی و وەڵام پێدانەوەی و لەبەرچاوگرتنی بەرژەوەندەکانی بزووتنەوەی شۆڕشگێڕانە لە کوردستان و لە خزمەت بەرژەوەندی گشتیی رەوتی سۆسیالیستی دا لە کوردستان و ئێران.

ئێستا بە هەڵسەنگاندنی هەمەلایەنەی ئەم هەنگاوە و بە لەبەرچاوگرتنی کاریگەرێتیی ئەم هەنگاوە لەسەر رووداوە سیاسییەکانی یەکساڵی رابوردوو و ئەو تەوژم و جووڵە سیاسییەی لە کوردستان پێکی هێناوە و هەروەها بە لەبەرچاوگرتنی ئەو پێشوازییە بەرینە کە ئاڵقەی بەرینی دۆستان و لایەنگرانی کۆمەڵە و کرێکاران و زەحمەتکێشانی کوردستان و رۆشنبیرانی تێکۆشەر و لاوان لەم هەنگاوەیان کردوە، دەکرێ بە دڵنیایی بڵێین پرۆژەی ساغکردنەوەی کۆمەڵە و هاتنەدەری لە حیزبی کۆمۆنیستی ئێران پرۆژەیەکی سەرکەوتوو بووە.

کونگرەی نوهەمی کومەڵە، لە بەر تیشکی ئەم هەڵسەنگاندنە، لە جێگاوشوێنی ئێستای « حیزبی کۆمۆنیستی ئێران » دەکۆڵێتەوە و، هەڵوێستی خۆی لە حاست ئەو حیزبە و بنەماکانی پەیوەندی خۆی لەگەڵ ئەو حیزبە بەم جۆرە رادەگەیەنێ:

١ــ بێ دەرەتانی یە دەروونی یەکانی حیزبی کۆمۆنیست و بێ خەتی یە سیاسی یەکەی بە دەسپێکرانەوەی هەڵسووڕانی سەربەخۆی کومەڵە، لە جاران توندتر و ئاڵۆزتر بووە. بەشی هەرەزۆری ئەدەبیاتی ئەم حیزبە بەرهەمی کەسانێکە کە لە دوو قۆناغی جیا دا و بە دوو تەما و ئاسۆی سیاسیی تەواو جیاوازەوە لەم حیزبە رۆیشتن. کەوابوو رێبەرایەتیی ئێستای ئەو حیزبە سەرۆکایەتیی رێکخراوێك دەکا کە یەکەم، توانایی یە فیکری یە سەرەکی یەکانی، هەرچەند لە دوو روانگەی جیاوازەوە، رەخنەیان لێگرتوە و بەجێیان هێشتوە و هەروەها لە روانگەی زۆربەی دامەزرێنەرانیەوە پێناوێك بۆ مانەوە و بوونی نیە. دووهەم، لەبەر ئەوەی حیزبەکە خاوەنی جێگاوشوێنێکی کومەلایەتی نیە و لە ژیانی خۆیدا کە ئەوا نزیکەی بیست ساڵی تێپەڕاندوە نەیتوانیوە سەرکەوتنێك بەدەست بێنێ و کەم تازۆر هیچ پەیوەندیکی لەگەڵ چینی کرێکاری ئێران نیە و، هەروەها لەبەر ئەوەی رێبەرایەتی یەکی لێهاتوو و بەرچاوڕوونیشی نیە کە رێبازێکی دیار بۆ حیزبەکە ساغ کاتەوە، هیچ ئاسۆیەك بۆ باشبوونی جێگاوشوێنی سیاسیی ئەو حیزبە بەدی ناکرێ. ئەم راستی یە ئاشکرایانە و، ئەوەش کە رێبەرایەتیی حیزبەکە ناتوانێ هەست بەم راستی یانە بکا و حاشایان لێدەکا، رۆژبەرۆژ ئەو حیزبە و رێبەرایەتی یەکەی زیاتر دەباتە ناو گێژاوی ئاڵۆزیی فیکری و سیاسی. مەیلی روو لە زیاد بوونی بەشێك لە رێبەرایەتیی ئەو حیزبە بەرەو رەچاوکردنی روانگە و سیاسەتەکانی کۆمۆنیزمی کرێکاری لە هەندێك لێکدانەوە و سیاسەتی گرینگ دا لە سەر مەسەلەکانی کوردستان لە ساڵانی رابوردوو دا خۆی رەنگدانەوەی ئاڵۆزی و

تێکەڵ بوونی سەرەهەودا تیئۆریک و سیاسییەکانی ئەم ڕێبەرایەتی یە و دەست هەڵنەگرتنیەتی لە «باوەڕەهاوبەشەکان»ی لەگەڵ کۆمۆنیزمی کرێکاری.

٢ــ لە یەک ساڵی ڕابوردوو دا ئەولەی لە ناوخۆی حیزبەکەدا دەیانگوت لایەنگری وازهێنان لە چوارچێوەی ڕێکخراوەیی حیزبی کۆمۆنیستی ئێرانن و لە لای لایەنگرانی ڕێبازی ساغکردنەوەی کۆمەڵە وایان نیشان دەدا کە لە «ریفراندۆم»ی پێشنیارکراو دا ئەوان باڵادەست دەبن، نەیانتوانیوە تەنانەت وەک ڕەوتێکی سیاسی لە ناوخۆی حیزبەکەش دا خۆ دەرخەن و ئەوەندەیان لەدەست نەهاتوە کە بە ئاشکرا نوێنەرایەتیی بووچوون و بیروڕاکانی خۆشیان بکەن. کەوابوو هەروەک هەڵسووڕاوانی ڕێبازی ساغکردنەوەی کۆمەڵە لە سەرەتاوە بۆی چووبوون، پێشنیاری ریفراندۆم لە لایەن زۆربەی ڕێبەرایەتیی حیزبی کۆمۆنیستی ئێران و سازمانی کوردستانەکەیەوە، جگە لە مانۆڕێکی دیپلۆماتیک چی دیکە نەبوو و زۆربەی لایەنگرانی وازهێنان لە چوارچێوەی «حیزبی کۆمۆنیستی ئێران» لە کردەوە دا بوونە هێزی پاشکۆی ڕەوتەکەی بەرانبەریان و هەتا ئێستا نەیانتوانیوە بە شێوەیەکی سەربەخۆ و چالاک خۆ دەرخەن.

بەشداری کردنی ڕێبەرانی ئەو ڕەوتە لە هەڵمەتی پروپاگەندەی نزم و بێمایە دا بەرانبەر بە ڕێبازی ساغکردنەوەی کۆمەڵە و لە هەڵبەستنی تۆمەتی بێ بناغە دا لە دژی ئێمە، ئەوەشی بێتە سەر کە لە توانایان دا نیە وەک نوێنەر و وتەبێژی فراکسیۆنێکی ڕەسمی و سیاسی لە ناوخۆی حیزبی کۆمۆنیستی ئێران دا خۆ دەرخەن و چالاکی بنوێنن، لە کردەوەدا ئەو کەسانەی لەباری سیاسی یەوە خستوەتە بن بەستێک کە توانای هیچ چەشنە هەوڵدانێکی بۆ داکۆکی کردن لە ڕێبازی ساغکردنەوەی کۆمەڵە بۆ نەهێشتوونەتەوە. هەموو نیشانەکان ئەوە دەگەیەنن کە لایەنگرانی ڕەوتی درێژە پێدانی هەڵسووڕان لە ژێر ناوی حیزبی کۆمۆنیستی ئێران دا لە ڕێبەرایەتیی حیزبەکە دا باڵادەستن و لە داهاتووش دا جڵەوی حیزبەکەیان بەدەستەوە دەبێ.

٣ــ نەک هەر لە ڕوانگەی ئێمەی هەڵسووڕاوانی ڕێبازی ساغکردنەوەی کۆمەڵەوە، بەڵکوو لە ڕوانگەی زۆربەی نزیک بە تەواوی ئاڵقەی بەرینی کۆمەڵەوە، یەکگرتنەوەی سەر لەنوێ تەنیا لە چوارچێوەی کۆمەڵە دا دەبێتوانی و دەتوانێ بێتە دی و ئێمە لە یەک ساڵی ڕابوردوو دا گەلێک جار ئەم هەڵوێستەی خۆمان ڕاگەیاندوە و دڵسۆزانەش لە پێناو یەکگرتنی بەرینی هێزەکان و توانایی یەکانی کۆمەڵە دا هەوڵمان داوە، لە کاتێک دا ڕێبەرایەتیی حیزبی کۆمۆنیستی ئێران و سازمانی کوردستانەکەی، بە پێچەوانەوە، یەکگرتنەوەی سەرلەنوێ لە چوارچێوەی کۆمەڵە دا بە لایەوە بە مانای پووچ دەرچوونی هەموو ئەو تۆمەتە بێ بناغانەیە کە تا ئێستا بۆ ئێمەیان هەڵبەستوە

و بە مانای ئەوەیە کە ڕاستگۆیانە لە حاست بزووتنەوەکە بەرپرسایەتیی کارەکانی خۆیان بگرنە ئەستۆ و وەڵامدەرەوە بن و. بەم بۆنەیەوە بە زیانی پلەوپایە و بەرژەوەندی تەسکی خۆیانی دەزانن کە ئامادە نین دەستی لێ هەڵگرن و هەر بۆیە بە هەموو توانایانەوە بە هاندانی کینە و ڕقەبەری و ئاژاوەنانەوە، هەوڵیان داوە بۆ ڕووخاندنی بناغە و تێکدانی زەمینەی هەرچەشنە یەکگرتنەوە و تێکگەیشتنێک. بەم جۆرە ڕێبەرایەتیی حیزبی کۆمۆنیستی ئێران بە بێ لەبەرچاو گرتنی بەرژەوەندەکانی بزووتنەوەکە و داهاتووی ڕەوتی کۆمەڵە و، تەنیا لە ڕوانگەی بەرژەوەندی تەسکی ڕێکخراوەیی گرووپەکەیان و پاراستنی جێگە و پایەی خۆیانەوە بۆ مەسەلەکە دەڕوانن و، لە ڕاستی دا وەك هۆیەکی نیگەتیڤ لە سەر ڕێگەی بەرژەوەندە گشتییەکانی کۆمەڵە و داهاتووی ڕەوتی ڕادیکاڵی سۆسیالیستی لە کوردستان دەوریان بووە و هەیانە.

٤ـ حیزبی کۆمۆنیستی ئێران کە خۆی لە برگەیەکی دیاریکراوی ژیانی چەپی ئێران دا و لەسەر ڕەگ‌وریشەی کۆمەڵە و بە کەڵك وەرگرتن لە جێگەوشوێنی کۆمەڵە لە بزووتنەوەی کوردستان دا و خۆشەویستیی کۆمەڵە لە نێو چەپی ئێران دا پێکهات، ئێستا ناوێکی بێ ناوەرۆك نەبێ هیچی دیکە نیە و، نوێنەرەوەی هیچ ڕەوتێکی کۆمەڵایەتی و هیچ پێویستییەکی سیاسی نیە. مانەوە لە چوارچێوەی ئەو ڕێکخراوەیە دا لە ڕاستی دا خۆفریودان نەبێ هیچی دیکە نیە. ئەوانەی لەو حیزبە دا ماونەتەوە، پاراستنی ئەو ناوە و ئەو چوارچێوەیە بەوە پاساو دەکەن کە گۆیا دەست هەڵگرتن لەو چوارچێوە ڕێکخراوەیی‌یە، بە مانای وازهێنان لە ئامانجە سۆسیالیستی‌یەکان و چوونە ناو بازنەی بیروباوەڕی ناسیۆنالیستی‌یە. ئەم قسەیە کە هیچ بنەما و پشتیوانەیەکی تیئۆریکی نیە و لەگەڵ ڕابوردووی کۆمەڵەش کە خۆی هەمیشە ڕێکخراوێکی سۆسیالیستی بووە نایەتەوە، پێشتریش قسەی ڕەوتی ناسراو بە کۆمۆنیزمی کرێکاری بووە و گەلێك جاریان دووپات دەکردەوە هەتا ئەم و ئەو لە درنجی ناسیۆنالیزم بترسێنن و بەم جۆرە ڕێگە لە گەشەکردن و پەرەگرتنی کۆمەڵە بگرن. ڕێبەرایەتیی حیزبی کۆمۆنیستی ئێرانیش کە لەم دواییی‌یە دا هەمان قسە دووپات دەکاتەوە، مەبەستی هەر ئەوەیە کە لە نێو ڕیزەکانی ڕێکخراوەکەی دا وەهمێکی بێ‌پایە بنێتەوە و کۆسپێکی دەسکرد لەسەر ڕێگەی پەیوەست‌بوونیان بە ڕێبازی ساغکردنەوەی کۆمەڵە بخاتە ناو زەین و بیریان. سەرەڕای ئەم هەوڵانەش، تەریك مانەوەی هەرچی زیاتری حیزبی کومونیستی ئێران ڕەوتێکە کە بەربەست ناکرێ و ئەو حیزبە لە شانۆی سیاسیی کوردستان دا ڕۆژبەڕۆژ زیاتر دەکەوێتە پەراوێزەوە و، ڕەوتی وەخۆهاتنەوەی کەسان و هەڵسووڕاوانی سیاسیی سەر بە هێڵی کۆمەڵە و دابڕانیان لە



حیزبی کۆمۆنیستی ئێران لە ناوەوەی کوردستانیش ئێستا بە خێرایی بەرەوپێش دەچێ.

ئەم داهاتووە مسۆگەرە، بۆ ئەو بەشەی هەڵسووڕاوانی حیزبی کۆمۆنیستی ئێران کە ساڵانێك توانا و هەڵسووڕانی خۆیان خستە پێناوی بەدیهێنانی ئامانجی مژڤانە لە ئێران و کوردستان و، ئێستا هەڵسووڕانێکی تازە و سەمەرەبەخشیان دەست پێ نەکردوەتەوە، هەڵبەت دواڕۆژێکی زۆر تاڵ و ناخۆشە و جگە لە گۆشەنشینی و لاکەوتەیی چ ئەنجامی دیکەی نابێ. تەنیا ڕێگەی پێشگرتن بەم توانەوە و فەوتانە سیاسی‌یە، بۆ ئەو کەسانەی بە هیوای سەرابێك یان لە ژێر کاریگەرێتیی هەڵەتێکی پڕوپاگەندەی هیستریك دا لە دژی ڕێبازی ساغکردنەوەی کۆمەڵە، لە حیزبی کۆمۆنیستی ئێران دا مانەوە، ئەوەیە کە بە هەڵوێستەکانی خۆیان دا بچنەوە و پشتیوانیی لە ڕێبازی ساغکردنەوەی کۆمەڵە بکەن. کۆنگرەی نۆهەمی کۆمەڵە بە تایبەتی و هەر لەم پێناوە دا ڕاسپاردەی بۆ هەڵسووڕاوان و هێزەکانی کۆمەڵە لە هەموو شوێنەکان و لە ناوەوەی کوردستان ئەوەیە کە لە حاست ئەو کەسانەی هێشتا پەیوەندیکیان لەگەڵ حیزبی کۆمۆنیستی ئێران ماوە هەڵوێستێکی هاوڕێیانەیان هەبێ و بە دڵسۆزی و سنگێکی فرەوانەوە هەڵوێستی کۆمەڵەیان بۆشی بکەنەوە و ئەوەندەی لە توانایان دایە نەهێڵن ڕێبەرایەتیی حیزبی کۆمۆنیستی ئێران بەشێك لە هێزی ڕەسەن و ڕاستەقینەی کۆمەڵەش لەگەڵ خۆی بەرێتە ناو گێژاوی نائومێدی و گۆشەنشینی.

٥ـ ئێمە هەمیشە جەختمان لەسەر ئەوە کردوە و ئێستا جارێکی دیکە ڕایدەگەیەنین کە خوازیاری ئەوەین باسەکان و کێشە سیاسی و ڕوانگەیی‌یەکانمان بە دوور لە هەرچەشنە هاندانێکی ناسیاسی بێنینە ئاراوە و. بڕوامان بە پلورالیزمی سیاسی لە کوردستان هەیە و پێمان وایە داوەری لە بابەت ڕەوابوونی سیاسیی حیزبەکان وهێزە سیاسی‌یەکان دەبێ بسپێردرێ بە جەماوەر کە لە محەکی بەرژەوەند و زانست و ئەزموونی خۆیانی بدەن. لەبەر ئەوە و لەبەر ئەو هەل ومەرجە تایبەتەی هەردوو ڕێکخراوی کۆمەڵە و حیزبی کۆمۆنیستی ئێران تێیدان، ڕادەگەیەنین کە ئەو هەڵەتەی پڕوپاگەندەی ژەهراوی بە ناواخنی سووکایەتی کردن بە کەسەکانەوە کە ڕێبەرایەتیی حیزبی کۆمۆنیستی ئێران دەستی داوەتێ، تەنیا خۆ شاردنەوەیە لە هاتنە مەیدانی بەرەورووبوونەوەی سیاسی و ئاڵۆزکردنی مەیدانەکەیە بۆ پاراستنی سەنگەری بێ بەرگەی بەرژەوەندیکی تەسکی ڕێکخراوەیی کە ناوینەتە بەرانبەر کۆمەڵە. لەم ڕووەوە کۆنگرەی نۆهەمی کۆمەڵە داوا لە هەموو هێزە ڕادیکاڵ وچەپەکان و دۆستانی بزووتنەوەی شۆڕشگێڕانەی کوردستان دەکا کە بە ڕاشکاوی‌یەکی تەواوەوە لەسەر ئەم

بەسندکراوی کۆنگرە ٥

زمانەی پروپاگەندە کە پڕە لە تۆمەت و ئاژاوەنانەوە و شەڕخوازی، ڕخنە لە ڕێبەرایەتیی حیزبی کۆمۆنیست بگرن و لە زیانباربوونی ئەم کارەی ئاگاداری بکەنەوە.

لە سەر بنەمای ئەم ڕوانگەیەمان ئێمە خوازیاری دارشتنی پەیوەندی سیاسی و ئاسایی کردنەوەی پەیوەندەکان لەگەڵ حیزبی کۆمۆنیستی ئێران بووین و هەین و، هەر لەم پێناوە دا گەلێك جار داوای پێکەوە دانیشتن لە ئاستی سەرەوە دا و دەسپێکردنی وتوویژی ڕاستەوخۆمان کردوە کە تائێستا ڕێبەرایەتیی حیزبی کۆمۆنیستی ئێران بە بێ هیچ پاساوێکی عەقڵپەسند خۆی لێ لاداوە. بە پێویستی دەزانین جارێکی دیکە ئەوەش بیر بخەینەوە کە یەکێك لە کێشەکانی نێوانمان ئەوەیە کە ڕێبەرایەتیی حیزبی کۆمۆنیستی ئێران بە ناڕەوا دەستی بەسەر هەموو بەڵگەکان و ئارشیڤ و دارایی ڕێکخراوەکەدا گرتوە.

لەم ڕووەوە کۆنگرەی نۆهەمی کۆمەڵە ئەو دەسەلاتە بە کومیتەی ناوەندیی هەڵبژێردراوی خۆی دەدا کە بۆ دارشتنی ڕێساکانی پەیوەندمان لەگەڵ حیزبی کۆمۆنیستی ئێران بە پێی ئەو بنەمایانەی لەم بەڵگەیە دا ڕاگەیەندران، بڕیاری پێویست بدا و لەهەمان کات دا داوای دەستڕاگەیشتنمان بە ئارشیڤ و بەڵگە هاوبەشەکان و دابەشکردنی عادلانەی داراییەکانی ڕێکخراوەکە، وەك داوایەك کە بۆ چاوپۆشیلێکردن نابێ، بێنێتە گۆڕ و شوێنی بگرێ.

بەسندکراوی کونگرە ٦



## ڕاگەیاندنی کۆتایی
## کۆنگرەی نۆهەمی کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێران

کۆنگرەی نۆهەمی کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێران، وەك لە کۆنفرانسی ساغکردنەوەی کۆمەڵە دا مانگی پووشپەڕی ساڵی ڕابوردوو بڕیار درابوو، بە بەشداریی نوێنەرانی ڕێکخراوە جۆراوجۆرەکانی کۆمەڵە و ژمارەیەك لە هاوڕێیان کە وەك چاوەدێر بانگ کرابوون و بە ئامادە بوونی ژمارەیەك لە میوانان، لە ژێر چەتری پاراستنی هێزی پێشمەرگەی کۆمەڵە دا بەڕێوە چوو. دەستووری کۆبوونەوەکانی کۆنگرە بەم شێوەیە بوو:

١ـ ڕاپۆرتی سیاسیی کومیتەی ناوەندیی هەڵبژێردراوی کۆنفرانسی ساغکردنەوەی کۆمەڵە ٢ـ قەوارەی سیاسیی داهاتوو لە ئێران و گەڵاڵەی کۆمەڵە بۆ چارەسەری مەسەلەی نەتەوایەتی و، بزووتنەوەی جەماوەری لە کوردستان ٣ـ مەرامنامەی کۆمەڵە ٤ـ پێڕەوی ناوخۆی کۆمەڵە ٥ـ هەڵسەنگاندنی جێگاوشوێنی ئێستای حیزبی کۆمۆنیستی ئێران و پەیوەندی ئێمە لە گەڵ ئەو حیزبە ٦ـ کۆمەڵە و چەپی ئێران ٧ـ ئایین نامەی هێزی پێشمەرگە ٨ـ لێکۆڵینەوەی بڕیارنامە پێشنیارکراوەکان ٩ـ هەڵبژاردنی کومیتەی ناوەندی.

لە بەشێکی ڕاپۆرتی سیاسیی کومیتەی ناوەندی دا، پرۆژەی ساغکردنەوەی کۆمەڵە و پێویستی و گرینگیی ئەو هەنگاوە لە ڕوانگەی بەرژەوەندی بزووتنەوەی چەپ و سۆسیالیستی لە کوردستان و ئێران و بەرژەوەندەکانی بزووتنەوەی شۆڕشگێڕانەی کوردستانەوە درایە بەر باس و، ساڵێك هەڵسووڕانی سەربەخۆی کۆمەڵە درایە بەر لێکۆڵینەوە و هەڵسەنگاندن. لەم باسە دا پشتیوانیی بەرینی دۆستانی کۆمەڵە لە ناوەوە و دەرەوە و جەماوەری خەڵکی کوردستان لە پرۆژەی ساغکردنەوەی کۆمەڵە ئاماژەی بۆ کرا و، ئەو جموجوڵە سیاسی و عەمەلییە کە لەم یەك ساڵە دا و لە ئەنجامی پرۆژەی ساغکردنەوەی کۆمەڵە دا سەری هەڵداوەتەوە، وەك بەڵگەیەکی ڕاست و ڕەوا بوونی ڕێبازی ساغکردنەوەی کۆمەڵە و هەڵسووڕانی سەربەخۆی کۆمەڵە دەست نیشان کرا.

باسێکی دیکەی ڕاپۆرتەکە، لە بابەت وەزعی سیاسیی ئێران و جێگاوشوێنی ڕژیمی کۆماری ئیسلامی بوو. لەو بەشە دا هۆیەکانی قەیرانی سیاسی لە ئێران و بێ توانایی باڵە جۆراوجۆرەکانی بۆرژوازی لە چارەسەرکردنی ئەو قەیرانە دا و، ئەو تەنگانە و بن بەستە کە ڕژیمی کۆماری ئیسلامی تێیدا گرفتارە لێی کۆڵدرایەوە. هەروەها گەشەی نارەزایەتی و بزووتنەوەی جەماوەری بۆ گۆڕینی وەزعی ئێستا وەك هۆیەك

1

کە داهاتووی قەیرانی سیاسی لە ئێران بە قازانجی خەڵك و بزووتنەوەی شۆڕشگێڕانە دەگۆڕێ هەڵسەنگێندرا و لە سەر پێویستی ی ڕووخاندنی ڕژیم لە خزمەت بەرەو پێش چوونی شۆڕش و بزووتنەوەی کرێکاران و جەماوەری زۆرلێکراودا تەئکید کرایەوە.

باسێکی دیکەی ڕاپۆرتەکە بۆ لێکۆڵینەوەی هەلومەرجی سیاسیی کوردستان تەرخان کرا و تێیدا وێڕای باسکردنی زەمینەی لەبار و ڕوو لە گەشە بۆ هەڵسووڕانی کۆمەڵە، پێویستی ی ڕێبەریکردن و ڕێکخستنی خەبات بۆ ڕزگاربوون لە ستەمی نەتەوەیی لە کوردستان و دەورنواندنی هەرچی چالاکانەتری کۆمەڵە لە بزووتنەوەی شۆڕشگێڕانەی کوردستان دا جەختی لەسەر کرا. هەر لەم باسە دا سیاسەتی کۆمەڵە لە پەیوەند لە گەڵ هێزە سیاسییەکانی کوردستان و ناوچەکە دا قسەی لەسەر کرا و سیاسەتی ئانیستای کۆمەڵە لەم بوارە دا وەك سیاسەتێکی دروست هەڵسەنگێندرا.

لە بەشێکی دیکەی ڕاپۆرتەکە دا مەیدانە سەرەکییەکانی هەڵسووڕانی کۆمەڵە لە شارەکان، ڕێکخراوی چەکدار، کاری نوێنەرایەتی و ڕێکخراوی دەرەوەی وڵات، هەڵسووڕانی چەکدارانە و کاری جەماوەری درانە بەر لێکۆڵینەوە و سەرخەتی سیاسەتەکانی داهاتوومان لەم بوارانە دا دیاریکرا. دوای بیستنی ڕاپۆرتەکە و لێدوان لەم بابەتەوە، کۆنگرە بە تێکڕای دەنگەکان ڕاپۆرتەکەی پەسند کرد و بە کومیتەی ناوەندی ی هەڵبژێردراوی خۆی سپارد کە بە لەبەرچاوگرتنی تێبینی ی ئەمنییەتی، ڕاپۆرتەکە بۆ ئاگاداری ی هەموان بڵاو بکاتەوە.

لە دەستووری دووهەمی کۆبوونەوەکان دا، قەوارەی سیاسی ی ئێران و گەڵاڵەی کۆمەڵە بۆ چارەسەری مەسەلەی نەتەوایەتی لە کوردستان بە شێوەیەکی تەسەل باسی کرا. لەم زەمینەیە دا پێشینەی ئەو سیستمە حکوومەتی یە ستەمکارانە کە تێیاندا بە درێژایی سەدەی ڕابوردوو هەموو دەسەڵات بە شێوەیەکی یەکجێ لە ناوەند کۆکراوەتەوە و، ستەم و زۆرداری یان لە دژی نەتەوەکانی دانیشتووی ئێران و، تایبەتمەندی یەکانی فرەنەتەوەیی بوونی ئێران و پێویستی ی پێکەوە ژیانی برایانەی نەتەوەکان لە یەکگرتنێکی دێموکراتیك دا و دابەشکردن و بڵاوکردنەوەی دەسەڵاتی سیاسی بە شێوەیەك کە زەمینەی چڕبوونەوەی هەموو دەسەڵاتی سیاسی لە ناوەند لاواز ببێ، جەختی لەسەر کرا و بەم مەبەستە لە باری ئیداری یەوە فێدراتیڤ بوونی ئێران وەك قەوارەی سیاسی ی گونجاو باسی کرا و پەسند کرا.

لە بەشیکی دیکەی ئەو باسە دا، بە لەبەر چاوگرتنی ئەو ستەمە مێژوویی یە کە لە ناوچەکە دا لە خەڵکی کوردستان کراوە و هەروەها ئەو ستەم و کوشتارە کە لە سەردەمی دەسەلاتدارەتی ی کۆماری ئیسلامی دا لە دژی خەلکی کوردستان بەڕێوە براوە، مافی ڕەوای دیاریکردنی چارەنووس و دەسەلاتدارەتی خەلکی کوردستان تەئکیدی لەسەر

2

کرا و دامەزرانی حکوومەتێکی ناوچەیی فیدراڵ لە کوردستان وەك ڕێگاچارەیەکی گونجاو بۆ چارەسەری ستەمی نەتەوەیی لە کوردستانی ئێران و زەمانەتێکی پایەدار بۆ هاوپشتی و پێکەوە ژیانی نەتەوەکانی دانیشتووی ئێران، لە لایەن کونگرەوە پەسند کرا.

دوو بابەتی دیکەی دەستووری کۆبوونەوەکان بریتی بوون لە پێڕەوەی ناوخۆی کۆمەڵە و مەرامنامەی کۆمەڵە. دوای ئەوەی هەندێك خاڵی پێرەوی ناوخۆی پێشنیارکراو لە لایەن کومیتەی ناوەندییەوە لە ئەنجامی باسەکان دا گۆڕانیان بەسەردا هات، هەرتك بەڵگەکە پەسند کران و بڕیار درا کومیتەی ناوەندیی هەڵبژێردراو دوای داڕشتنەوەی ئەو خاڵانەی پێرەوی ناوخۆ بە پێی سەرنجەکانی کونگرە، بەڵگەکان بڵاو بکاتەوە. لە پێرەوی ناوخۆ دا بە تایبەت مافی کەمایەتی لە کومەڵە دا و کەڵك وەرگرتنی لە ئامرازە ڕێکخراوەییەکان بۆ دەربڕینی بیروڕای خۆی و بەشدار بوونی لە کۆنگرە و کۆنفرانسە ڕێکخراوەییەکان دا بە پێی سەنگی خۆی، جەختی لەسەر کرا.

لە بەشێکی دیکەی دەستووری کۆبوونەوەکان دا جێگا و شوێنی ئێستای حیزبی کۆمونیست و پەیوەندی ئێمە لەگەڵ ئەو حیزبە درایە بەر باس. لەو باسە دا کۆنگرە سیاسەتی تا ئێستامان لە حاست حیزبی کۆمۆنیستی بە سیاسەتێکی دروست هەڵسەنگاند و تەئییدی کرد. کۆنگرە جەختی لەسەر ئەو ڕاستییە کرد کە بە لەبەر چاوگرتنی ئەوە کە لایەنی زاڵی ناو ڕێبەرایەتی ی حیزبی کۆمونیست توانیویەتی سیاسەتی ڕاگرتنی قەوارەی ڕێکخراوەیی ئەو حیزبە بکاتە ڕەوتی زاڵ لە نێو حیزبەکە دا، بۆیە زەمینەی یەکگرتنەوە لە چوارچێوەی کۆمەڵە دا وەك ئێمە و هەموو هاوڕێیانی ئاڵقەی بەرینی کۆمەڵە چاوەڕوانی بووین، لە لایەن ڕێبەرایەتی ی دەسەڵاتداری ئەو حیزبەوە لە ناو براوە. بەلەبەرچاوگرتنی ئەو ڕاستییە، کونگرە لەسەر پەیوەندی سیاسیمان لەگەڵ ئەو حیزبە وەك دوو ڕێکخراوی لەیەك جیا تەئکیدی کرد و ئەوەشی دەست نیشان کرد کە بەرەوپێش چوونی ئەو پەیوەندە لە گرەوی دوور و نزیکیی هەڵوێستی سیاسی و کارکردەکان دایە. کۆنگرە سیاسەتی تا ئێستای ڕێبەرایەتیی ئەو حیزبەی بە ڕەفتارێکی ناپەسند دانا کە ئامادە نەبووە بۆ دابەشکردنی داراییەکان و ئیمکانات و، دەستی بەسەر بەڵگە ڕێکخراوەییەکان دا گرتوە و پەنای بردوەتە بەر تەبلیغاتی ناسیاسی. پێویستە ڕێبەرایەتی ی حیزبی کۆمۆنیست لەسەر ئەم هەڵوێستەی بکەوێتە ژێر گوشاری خەڵکی کوردستان و بزووتنەوەی چەپ و هاوڕێیانی ئاڵقەی بەرینی کۆمەڵە و ئەم ڕەفتارە وەك ڕەفتارێکی درێو بدرێتە بەر ڕەخنە. واز هێنانی ڕێبەرایەتیی حیزبی کۆمۆنیست لەم شێوە هەڵس و کەوتە زەمینە بۆ پێك هاتنی پەیوەندیکی سالمی سیاسی، سەرەڕای جیاوازییە سیاسییەکانیش، خۆش دەکا.

لە بەشێکی دیکەی دەستووری کۆبوونەوەکان دا بزووتنەوەی کرێکاری لە

3

کوردستان و تایبەتمەندی یەکانی درایە بەر باس و وێرای تەئکید لەسەر هاوپشتی ی سەرجەمی چینی کرێکاری ئێران، لەسەر پێویستی ی هەڵسووڕانی چالاکانەتر لە نێو کرێکاران دا تەئکید کرا. هەوڵی هەمە لایەنە لە پێناو بەدیهاتنی داخوازەکانی خەباتی کرێکاران و ڕێکخراو بوونی صنفی ی کرێکاران دا، ئەرکێکە کە پێویستە هاوڕێیان و هەڵسووڕاوانی کۆمەڵە بە سەرنج و بایەخدانێکی تایبەتەوە لێی بڕوانن.

کۆنگرە لە بەشێکی دیکەی کاری خۆی دا بزووتنەوەی خەباتکارانەی ژنانی لە ئێران و کوردستان دایە بەر لێکۆڵینەوە و، وێرای تەئیید کردنی دەسکەوتەکان و پێشڕەوی یەکانی کۆمەڵە لە زەمینەی پشتیوانی و دیفاع لە مافەکانی ژنان دا، ڕەخنەی گرت لە کەم و کوڕی یەکان و خاوبوونەوەی ڕەوتی چالاکی ی کۆمەڵە لەم زەمینەیە دا لە قوناغێکی دیاریکراوی هەڵسووڕانی کۆمەڵە دا و، لە هەمان کات دا پەنجەی خستە سەر هەندێك کۆسپ و نەریتی پیاوەزنانە لە کۆمەڵگای کوردستان دا وکارکردی هەندێك ڕەوتی دیاریکراو لە بزووتنەوەی کوردستان دا لە خزمەت هێشتنەوە و پاراستنی نەریتی پیاوەزنانە دا و، کۆمەڵێك ئەرکی لە خزمەت بەرەو پێش بردنی بزووتنەوەی ژنان دا وەك ئەرکی هەڵسووڕاوانی ڕیزەکانی کۆمەڵە دەست نیشان کرد.

هەروەها کۆنگرە لە هەندێك مەسەلەی دیکەی ئەمڕۆی کۆمەڵگای کوردستان دوا، وەك پەرەگرتنی گیرۆدەیی لاوان بە مادە سڕکەرەکان و سیاسەتی دژی ئینسانی ی ڕژیم لەم بابەتەوە و، سیاسەتی ئەستاندنەوەی زەوی لە جووتیاران لە لایەن مڵکدارەکانەوە بە پشتیوانی ی دەزگا دەوڵەتی یەکان. کۆنگرە لەم بابەتەوە هەندێك ئەرکی بە کومیتەی ناوەندی سپارد. بابەتێکی گرینگی دیکە کە لە کۆنگرە دا باسی کرا، بریتی بوو لە ڕەوتی وشیاربوونەوەی سیاسی و بزووتنەوەی ڕۆشنبیری ی ئەم ساڵانەی دوایی لە کوردستان و، هاندان و بەهێز کردنی ئەو ڕەوتە و بایەخدان بە مەسەلەکانی لاوان لە کۆمەڵگای کوردستان دا.

لە باسی پەیوەندیدار بە چەپ دا، کۆنگرە پرژوبڵاوی ی بزووتنەوەی چەپ و سۆسیالیستی لە ئێرانی دایە بەر لێکۆڵینەوە و پەنجەی خستە سەر ئەو خاڵە کە ئەگەرچی ئێمە ناچینە ناو پرۆسەی حیزب ساز کردن، بەڵام پێویستی ی هاوپشتی ی عەمەلی و هەڵگرتنی هەنگاوی دیاریکراو لەگەڵ بزووتنەوەی چەپ و سۆسیالیستی بە مەبەستی هاوکاری و هاوپشتی ی بەرین هەتا پێکهێنانی بەرەیەکی چەپ و ڕادیکاڵ، بۆ زاڵ بوون بەسەر ئەم پرژوبڵاوی یەی ئێستا دا تەئکیدی لەسەر کرا. کۆنگرە، پشتیوانی ی هەمەلایەنە لە بزووتنەوەی شۆڕشگێڕانە لە کوردستان و کۆمەڵە وەك ڕەوتی سۆسیالیستی لەو بزووتنەوەیە دا، بە ئەرکێکی گرینگی چەپی شۆڕشگێڕ لەم قۆناغە دا دەزانێ.

کۆنگرە دوای هەفتەیەك کاری بەردەوام بە بەشداری ی بەرینی نوێنەران لە

4

کەش و هەوایەکی هاوڕێیانە و پڕ لە هاوپشتی دا. دوای هەڵبژاردنی کومیتەی ناوەندی، کۆتایی پێ‌هات. ئەم هاوڕێیانە وەك ئەندامی کومیتەی ناوەندی هەڵبژێردران:

١ـ جعفر ایلخانی‌زاده ٢ـ صباح امینی ٣ـ عمر ایلخانی زاده ٤ـ ناهید بهمنی ٥ـ فاروق بابامیری ٦ـ حمید بهرامی ٧ـ پروین پیشیاری ٨ـ ناصر حسامی ٩ـ بهرام رضایی ١٠ـ جمیله رحیمی ١١ـ بهجت سلیمی ١٢ـ محمد شافعی ١٣ـ بهمن علی‌یار ١٤ـ عبدالله عظیمی ١٥ـ رضا کعبی ١٦ـ عبدالله کهنه‌پوشی ١٧ـ مهری گدازگر ١٨ـ نجم‌الدین گلپرور ١٩ـ عبدالله مهتدی ٢٠ـ ابوبکر مدرسی ٢١ـ انور محمدی ٢٢ـ جلال ناوه ٢٣ـ طالب یوسفی

ئەم هاوڕێیانەش وەك جێگری کومیتەی ناوەندی هەڵبژێردران:

١ـ بدری توحیدی ٢ـ رسول علیدوست ٣ـ عثمان خلیلی

٢٠٠١/٧/٣٠

5



# ئامانجەکان و ستراتیژیی کۆمەڵە لە بزووتنەوەی کوردستاندا

## پەسندکراوی کۆنگرەی نۆهەمی کۆمەڵە

## (پووشپەڕ _ گەلاوێژی ١٣٨٠)

فەسڵی یەکەم _ کێشەی کورد لە ئێران و بزووتنەوەی شۆڕشگێڕانەی کوردستان

١_ ئێران وڵاتێکی فرەنەتەوەیە کە تێیدا ستەمگەریی نەتەوەیی لە خزمەت پاراستن و پتەوکردنی دیکتاتۆری و زۆرداری، سەرکوتکردنی داواکان و بزووتنەوە رەواکان، پێکهێنانی دووبەرەکی و دوژمنایەتی لە نێوان کرێکاران و زەحمەتکێشاندا و پەرەپێدانی دەمارگیری و رقەبەری، بەربەستکردنی رێگەی گەشە و هەڵدانی ئازادانەی سیاسی و رۆشنبیریی کۆمەڵگای ئێران و، پاراستن و پتەوکردنی دەسەلاتی کۆنەپەرستی و ئەمپریالیزمدا بووە و هەیە.

٢_ نەتەوەی کورد، نەتەوەیەکی زۆرلێکراوە کە لە ئەنجامی دابەشکردنەوەی سەرلەنوێی جیهان لە نێوان دەوڵەتانی ئەمپریالیستیدا دوای شەڕی یەکەمی جیهانی، لە نێوان وڵاتانی ناوچەکەدا دابەش کراوە و مافی پێکهێنانی دەوڵەتی نیشتمانیی لێ زەوت کراوە. بوونی ستەمی نەتەوەیی لە پاڵ درندانەترین شێوەی سەرکوتکردندا، هەمیشە هۆیەك بووە بۆ دواکەوتوویی ئابووری و رۆشنبیریی ئەم نەتەوەیە.

گەلی کورد گەلێك جار لە دژی ئەم ستەمگەرییە نەتەوەییە و بۆ بەدەستهێنانی مافی دیاریکردنی چارەنووس هاتوەتە مەیدانی خەبات و بەرەنگاربوونەوە. ئەم خەبات و بەرەنگاربوونەوانە کە راستەوخۆ لە دژی حکوومەتە دیکتاتۆرییەکانی ناوەند بوون، لە رابوردوودا سەرۆك عەشیرەتەکان، شێخەکان، دەرەبەگەکان و دواتر هێزە بۆرژواییەکان رێبەرایەتییان کردوون. ئەم هێزانە لە کوردستان لەگەڵ بەرژەوەندی زەحمەتکێشان ناتەبا بوون و ستەمیان لێ دەکردن، لە رێبەرایەتیکردنی خەباتی نەتەوەییشدا ڕاڕا و ناپەیگیر بوون و جاری وابووە لەگەڵ چینە ستەمگەرەکانی نەتەوەی باڵادەست لە دژی جەماوەری زۆرلێکراو رێك کەوتوون.

٣_ زاڵبوونی شێوەی بەرهەمهێنانی سەرمایەداری و ئاڵوگۆڕە کۆمەڵایەتییە بەرینەکانی کە بەدوویدا هاتن، لە چەند دەیەی رابوردوودا، ئەنجامی سیاسی و رۆشنبیریی گەورەی لە کۆمەڵدا لێ کەوتوەتەوە، زەمینەی وشیاربوونەوە و هاتنە مەیدان و رێکخراوبوونی چینی کرێکاری هەرچی زیاتر پەرە پێداوە و، دەور و گرینگیی کۆمەڵایەتیی ئەو چینەی گەلێك زیاتر کردوە و، بەم جۆرە بناغەی ماددیی رێبەرایەتیی

١

چینی کرێکار و حیزبی سیاسیی ئەو چینەی لە بزووتنەوەی کوردستاندا پێك‌هێناوە.

سەرهەلّدان و گەشەکردنی کۆمەلّە، خۆی حاسلّی ئەم ئالّوگۆڕە کۆمەلاّتییە تازەیە بووە و، پەیوەندێکی تەواوی بووە لەگەلّ گۆڕانی کۆمەلّگەی کۆن و باب‌مەزنانە، سەرهەلّدانی بەرینی چینی‌کرێکار، شارنشینیی تازە، پەرەگرتنی خوێندنی گشتی، زیادبوونی دەوری ژنان و لاوان و، بەرزبوونەوەی ئاستی چاوەڕوانییەکانی خەلّك لە ژیانی کۆمەلاّیەتی. کۆمەلّە هێزێکی سیاسیی تازە بوو کە لە زەمین و زەمانی ئەم ئالّوگۆڕە کۆمەلاّیەتییە دا، لەلایەك لەژێر تیشکی رادیکالیزەبوونی کەش‌وهەوای سیاسیی ئێران و گرسانی چەپێکی شۆڕشگێڕ لە ئێران لە کۆتایی شەستەکانی زایینیدا و، لەلایەکی دیکە لە ژێر تیشکی هەل‌ومەرجی تایبەتی کۆمەلّگای کوردستان و بزووتنەوەی شۆڕشگێڕانەی کوردستان، پێك‌هات و گەشەی کرد. هاتنەمەیدان و هەلّسووڕانی بەرینی کۆمەلّە وەك هێزێکی چەپ و پێشڕەو، کە داهێنەری فەرهەنگێکی سیاسیی جیاواز و نوێ و سیاسەت و ڕێبازی خەباتکارانەی تازە بوو و، ئەو بنکە جەماوەرییە بەرینە کە لە ئەنجامی ئەم هەلّسووڕانەدا بەدەستی هێنا، بەش بە حالّی خۆی کاری کردە سەر کۆمەلّگای کوردستان و بزووتنەوەی شۆڕشگێڕانەی گەلی کورد و، کاری کردە سەر چەپی ئێرانیش.

سەرهەلّدان و هەلّسووڕانی کۆمەلّە، شوێنەوارێکی قووڵی لەسەر ڕەوتی وشیاربوونەوە و خەباتی کرێکاران و زەحمەتکێشانی کوردستان بەجێ‌هێشت بە جۆرێك کە هێنانەگۆڕی مەسەلەکانی پەیوەندیدار بە کرێکاران و مافەکان و خەباتیان لە کوردستان، لەگەلّ ناو و هەلّسووڕانی کۆمەلّە تێکەلّ بووە. هەروەها کۆمەلّە لە بواری دیکەشدا، وەك بایەخ‌پێدان و پشت‌بەستن بە هەنگاوەکانی جەماوەر و بزووتنەوە جەماوەرییەکان، داکۆکی‌کردن لە جووتیارانی زەحمەتکێش، داکۆکی‌کردن لە دیموکراسی و لەماف‌و ئازادییەکانی خەلّك و شارۆمەندان، ڕاگەیاندنی ڕاشکاوانەی مەسەلەکانی بزووتنەوەکە بە کۆمەلاّنی خەلّك و داکۆکی‌کردنی لێبڕاوانە لە مافەکانی خەلّکی کوردستان، داکۆکی‌کردن لەمافەکانی ژنان و، لەبواری دیکەی لەم بابەتەدا ناوەرۆك و شێوازی تازە و پێشکەوتنخوازانەی بە بزووتنەوەی گەلی کورد بەخشیوە و، لەم مەیدانانە دا دەورێکی حاشاهەلّنەگری بووە و گەلێك لە دەسکەوتەکانی بزووتنەوەی‌کوردستان لەم بوارانە دا بە رەهەمی هەلّسووڕانی ڕەوتی ڕادیکالّ و سۆسیالیستیی کۆمەلّەن.

بەم جۆرە کۆمەلّە وەك حیزبی پێشەنگ و ڕابەری بزووتنەوەی شۆڕشگێڕانەی کوردستان، لە دژوارترین هەل‌ومەرجدا و بە دانی هەزاران قوربانی، لە ڕیزەکانی پێشەوەی ئەم خەباتە دا ئامادە بووە و، لەمێژووی خەباتی کرێکاران و

٢

زەحمەتکێشانی کوردستان و بزووتنەوەی شۆڕشگێڕانەی گەلی کورد دا جێگەیەکی بۆ خۆی مسۆگەر کردوە کە لە سڕینەوە نایە.

٤ـ زیاتر لە بیست ساڵ دەسەڵاتداره‌تیی کۆماری ئیسلامی، گەلێك مەینەتی ئابووری و بژێوی و سیاسی و فەرهەنگیی گەورەی بەسەر هەموو خەڵکی ئێران هێناوە و، ئێرانی کردوەتە دۆزەخێکی گەورەی ستەم و هەڵاواردن و سەرکوت. دەسەڵاتدارەتیی ئەم حکوومەتە لەکوردستان هاوتا بووە لەگەڵ هەڵاواردن و بێ‌مافییەکی بەرینی نەتەوەیی و فەرهەنگی، بەڕێوەبردنی سیاسەتی هەڵاواردن لەبواری گەشەپێدان و ئاوەدانیدا، دووبەرەکی نانەوەی مەزهەبی، پەرەپێدانی گیرۆدەیی بەماددەسڕکەرەکان، سانسۆر و دانانی قەدەغەو قۆرغی جۆراوجۆر، داگیرکردنی چەکدارانە، چەکدارکردنی زۆرەملێ، ڕاگواستن، دوورخستنەوەی خێزانەکان، گرتن و شکەنجە و تیرۆر و، کوشتن و لەسێدارەدان.

لە ٢٨ی مانگی گەلاوێژی ساڵی ١٣٥٨ی هەتاویدا، حکوومەتی کۆماری ئیسلامی بە بیانووی پووچ و بە بێ گوێدانە داخوازە ڕەواکانی خەڵکی کوردستان و بە بەربەست کردنی هەموو ڕێگاچارەیەکی سیاسی، کوردستانی دایە بەر هێرشێکی هەمەلایەنەی چەکدارانە و لەشکرکێشییەکی بەرین، کە ئەم داگیرکردنە هەتا ئێستاش درێژەی هەیە. لەم ماوەیەدا حکوومەتی کۆماری ئیسلامی دەستی لە هیچ کوشتار و وێرانکارییەك نەپاراستوە و لەستەم و زۆرداری هەرچی لەدەستی هاتوە کردوویەتی. بەڵام مێژووی بیست ساڵی ڕابوردووی کوردستان لەهەمان کاتدا، مێژووی ڕاوەستان و خۆڕاگریی خەڵك بووە و زیاتر لە بیست ساڵ سەرکوتگەری و کوشتار نەیتوانیوە ئیرادەی کۆمەلانی گەلی کورد تێك بشکێنیی و وایان لێ بکا کە دەست لەداوا ڕەواکانیان هەڵگرن.

هەر لەسەرەتای هێرشی حکوومەتەوە بۆ کوردستان،بزووتنەوەیەکی بەرینی خۆڕاگریی سیاسی و چەکدارانە بەرپابوو. لەوکاتەوە تائێستا کوردستان گەلێك شانۆی شکۆداری خۆڕاگری و کۆڵنەدانی خەڵکی خەباتکاری لە شێواز و مەیدانی جۆراوجۆردا بەخۆوە دیوە. بزووتنەوەی شۆڕشگێڕانە لە کوردستان لەم ماوەیەدا بە گەلێك هەوراز و نشێودا تێپەڕیوە و شانۆی خەباتی جۆراوجۆر بووە، لە خۆپیشاندان و مانگرتنەکانەوە بگرە هەتا ڕاپەڕینی شارەکان و خۆڕاگریی شکۆداری جەماوەری، لەشەڕی قارەمانانەی مێژی چەکداری شۆڕشگێڕەوە بگرە هەتا کۆچی بەکۆمەڵ بۆ نارەزایەتی دەربڕین و هەتا وت‌وێژ لەگەڵ نوێنەرانی حکوومەت و سەرەنجام هەتا شەپۆلی تازەی خۆپیشاندان و ئاخێزە جەماوەرییە بەرینەکانی ئەم ساڵانەی دوایی شارەکانی کوردستان، بەڵام هەرگیز سەری تەسلیم بوونی دانەنەواندوە و، دەسەڵاتدارەتیی

٣



کۆنەپەرست نەیتوانیوە دەستەمۆی بکا و، خامۆشی نەیتوانیوە باڵی بەسەردا بکێشێ. حکوومەتی کۆماری ئیسلامی، سەرەڕای هەموو زەبروزەنگ و سەرکوتگەری و داگیرکارییەکانی، سەرکەوتنێکی سست و لەرزۆکی بە دەست هێناوە و، نەك هەر مەسەلەی کوردستانی چارەسەر نەکردوە، بەڵکوو ئەم مەسەلەیە بەتەوژمتر و بەهێزتر لەهەمیشە لەبەرانبەر ئەو حکوومەتەدا خۆ دەنوێنێ.

کوردستان لەم ساڵانەی دواییدا وەخەبەرهاتنێکی سیاسی و ڕۆشنبیریی تازەی بەخۆوە دیوە. جەماوەری بەرینی خەڵك و بەتایبەت لاوان، کە لەبێکاری و هەژاری و هەلاواردن و ستەم وەگیان هاتوون و داهاتوویان لێ تاریك بووە، جم‌وجووڵێکی خەباتکارانەی تازەیان دەست داوەتێ. ترس لە ڕژیمی دیکتاتۆریی دینی جێگەی خۆی داوە بە بووژانەوە و سەرهەڵدان و حەقخوازی و، شەپۆلی ئەم خەباتە ڕۆژبەڕۆژ سەودای تازەتر دادەگرێ. هاوسەنگیی نێوان هێزی خەڵك و دەسەلاتدارەتی لەکوردستان خەریکە بەقازانجی خەڵك دەگۆڕێ. زیاتر لەبیست‌ساڵ هەلاواردن و سەرکوت نەك هەر خەڵکی کوردستانی نەبەزاندوە، بەڵکوو بووەتە هێزێکی خەباتکارانەی پەنگ‌خواردوو کە لە هەموو ڕووداوێکدا خۆی نیشان دەدا و لەوانەیە لەهەل و مەرجی گونجاودا وەك تەقینەوەیەکی سیاسی سەر هەڵ بدا.

فەسڵی دووهەم ـ ئامانجەکان و ستراتیژیی کۆمەڵە لە بزووتنەوەی شۆڕشگێڕانەی گەلی کورد دا

٥ـ مەسەلەی نەتەوایەتیی کورد، ئەگەرچی لایەنی ئابووری و فەرهەنگی و هی دیکەی هەیە، بەلام لەبنەڕەتدا ڕیشەی لە پێك‌نەهاتنی دەولەتی میللی و بەدی‌نەهاتنی مافی چارەنووسی ئەم نەتەوەیە دایە و هەر بۆیە مەسەلەیەکی سیاسییە کە ناوەرۆکەکەی بریتییە لە بەدیهێنانی دەسەلاتدارەتیی خەڵکی کوردستان بەسەر خاکی خۆیدا.

ئامانجی کۆمەڵە لە بزووتنەوەی شۆڕشگێڕانەی گەلی کورد دا بریتییە لە نەهێشتنی ستەمی نەتەوایەتی، ڕامالینی دەزگا سەرکوتگەر وبوروکراتیکەکانی حکوومەتی ناوەندی، بەدیهێنانی دەسەلاتدارەتیی خەڵکی کوردستان بەسەر خاکی خۆیدا، پەرەپێدانی ئازادییەسیاسییەکان و عەدالەتی کۆمەلایەتی لەکوردستان و، پێکهێنانی حکوومەتێکی فیدراڵ کە نوێنەری دەسەلاتدارەتیی خەڵك و پارێزەری بەرژەوەندەکانی کرێکاران و زەحمەتکێشانی کوردستان بێ.

٦ـ ئێمە لایەنگری یەکسانیی مافی نەتەوەکان، هەڵوەشانەوەی هەموو جۆرە هەلاواردن و ستەمێکی نەتەوەیی و، دژ بە پێکهێنان و هاندانی هەرچەشنە ڕقەبەری و دوژمنایەتییەکی نەتەوەیین و خوازیاری نەهێشتن و قەدەغەکردنی هەرچەشنە دەستدرێژییەك بۆ سەر مافەکانی کەمایەتییە نەتەوەییەکانین. هەر لەم پێناوە دا، ئێمە

٤



بۆ برەوپێدانی ڕۆحی برایەتی و هاوکاریی نێوان زەحمەتکێشانی گەلانی جۆراوجۆری ئێران و خەبات بەرانبەر بەهەر چەشنە بەرچاوتەنگی و دژایەتییەکی نەتەوەیی و قەومی و ئایینی تێدەکۆشین. ئێمە بە پێی جیهانبینی و بەرنامەی سۆسیالیستیی خۆمان، مافی هەموو میللەتانی دانیشتووی ئێران بۆ دیاریکردنی چارەنووسی خۆیان، یانی ئازادیی ئەو نەتەوانە لە جیابوونەوە و پێکهێنانی دەوڵەتی سەربەخۆ دا بەرەسمی دەناسین. لە هەمان کاتدا ئێمە خوازیاری یەکگرتنی ئازادانە و برایانەی نەتەوەکانی دانیشتووی ئێران لە پێکهاتەیەکی سیاسیی فیدراتیڤداین و لەسەر ئەو بڕوایەین کە ئەم یەکگرتنە بە قازانجی دیموکراسی و بە قازانجی جەماوەری زەحمەتکێشە.

کۆمەڵە هەوڵ دەدا بۆ ئەوەی هەموو هێزەچەپ و ئازادیخوازەکان و لایەنگرانی ڕاستەقینەی دیموکراسی لەئێران، پشتیوانی لە بزووتنەوەی شۆڕشگێرانەی گەلی کورد و لە داخوازە ڕەواکانی خەڵکی کوردستان بکەن. کۆمەڵە لە دیاریکردن و داڕشتنی پەیوەندەکانی خۆیدا لەگەڵ ئەو هێزانە، ئەو پشتیوانییە لەبەرچاو دەگرێ.

٧ـ کۆمەڵە بۆ دەسکۆتاکردن و وەدەرنانی هێزە سەرکوتگەرەکانی کۆماری ئیسلامی لە کوردستان و دامەزراندنی دەسەلاتدارەتیی دیموکراتیکی ڕاستەوخۆی جەماوەری کرێکار و زەحمەتکێش لە کوردستان، بۆ پێکهاتن و بەهێزکردنی شووڕا کرێکاری و خەڵکییەکان، بۆ پێکهاتن و بەهێزکردنی سەندیکاکان و ڕێکخراوە کرێکارییەکانی دیکە، بۆ دەستەبەرکردنی یاسای کارێکی پێشڕەو، بۆ هێنانەگۆڕ و بەرەوپێش بردنی هەر هەنگاوێك کە خزمەت بە باشبوونی ژیانی ماددی و مەعنەویی کۆمەلانی کرێکار و زەحمەتکێش بکا. بۆ هەڵوەشاندنەوەی هەر چەشنە جیاکاری و هەلاواردنێك لەنێوان ژن و پیاودا و بۆ یەکسانیی مافەکانی ژن و پیاو و بۆ هێنانەمەیدانی هێزی گەورەی ژنانی زۆرلێکراو لەخەباتدا لە پێناو ئازادی و بەرابەریی مافەکاندا و بۆ پێکهاتن و بەهێزکردنی ڕێکخراوەکانی ژنان، بۆ هەڵوەشاندنەوەی هەرچەشنە هەلاواردن و ستەمێکی نەتەوەیی و فەرهەنگی، بۆ جیایی دین لە دەوڵەت، بۆ بەهێزکردن و پەرەپێدانی هەنگاوە ڕاستەوخۆکانی جەماوەر و بزووتنەوە و ڕێکخراوە دیموکراتیك و جەماوەرییەکان، بۆ چەکدارکردن و هەڵخراندنی جەماوەری کرێکار و زەحمەتکێش بۆ داکۆکی لە دەسکەوتەکانیان و پاراستنی کوردستانی شۆڕشگێڕ بەرانبەر بە هەر چەشنە پیلانگێڕانێکی کۆنەپەرستی خەبات دەکا، لە پێناو بەرەوپێش بردن و بەدیهێنانیاندا بەرهەڵستی هەموو دژواری و کۆسپ و گرفتێك دەبێتەوە و هەموو توانای خۆی بۆ تەرخان دەکا و لە هیچ فیداکارییەك دریغی ناکا.

هێز و هۆی سەرەکیی بۆ بەدیهاتنی ستراتیژیی کۆمەڵە لە کوردستان هێزی

٥



لەبن نەهاتووی جەماوەری خەڵك و بزووتنەوەیان و هەنگاوەکانیانە و، کۆمەڵە توانای خۆی دەخاتەسەر وشیارکردنەوە و هەڵخراندن و ڕێکخستنیان. لەهەمان کاتدا هێزی پێشمەرگەی چەکداری کۆمەڵە، بەشێك هەر لەم هێزە کۆمەڵایەتییە، باسکی چەکداری کرێکاران و زەحمەتکێشانی کوردستان و یەکێك لە ئامرازەکانی بەرەوپێش بردن و بەدیهێنانی ئەو ئامانجانەیە و، پتەوکردن و پەرەپێدانی ئەو هێزە یەکێك لە ئەرکەکانی کۆمەڵەیە.

کۆمەڵە لە هەمان کاتدا لە هەموو دەرفەتێك، ئەگەرچی دەرفەتێکی کەم وکورتیش بێ، کە بە هۆی گوشاری بزووتنەوەی شۆڕشگێڕانە و یان لاوازبوونی بەرەی دەسەڵاتدارەتی پێك بێ، بۆ بەرەوپێش بردنی هەر ئەم ئامانجانە و زەمینە خۆشکردن بۆ بەدیهاتنیان کەڵك وەردەگرێ. کۆمەڵە هەمیشە ڕێگاچارەی سیاسیی بۆ مەسەلەی کوردستان و بەدیهاتنی داخوازەکانی گەلی کوردی پێ باشتر بووە و بۆ بەرەوپێش بردنی ڕێگاچارەی سیاسی ئامادە بووە. بەڵام حکوومەتی کۆماری ئیسلامی تا ئێستا هیچ زمانێکی بێجگە لەزمانی زەبروزەنگ و ملهوڕی نەزانیوە و، وەڵامی داوا ڕەواکانی خەڵکی کوردستانی بە کوشتار، شکەنجە، سێدارە، گرتن و تیرۆر و هێرشی چەکدارانە داوەتەوە. لەهەلومەرجێکی ئاوادا، خەڵکی کوردستان و لەپێشەوەیان کۆمەڵە، لەبەرانبەر ئەم ستەم و سەرکوتگەرییە دا لێبڕاوانە ڕاوەستاون و ڕادەوەستن.

٨ــ کۆمەڵە بۆ هاوکاری و ڕێککەوتنی سیاسی و عەمەلی لەگەڵ حیزبەکان و هێزەسیاسییەکانی کوردستان بۆ بەرەوڕووبوونەوەی هاوبەش بەرانبەر بە کۆماری ئیسلامی و هێنانەگۆڕ و بەرەوپێش بردنی هاوبەشی داخوازەکانی گەلی کورد ئامادەیە. بەدیهاتنی سیاسەتێکی لەم چەشنە، توانایی هەر کۆنەپەرستییەکی دەسەڵاتدار لە ئێستا و داهاتوو دا بۆ دووبەرەکی نانەوە، هەڵگرساندنی شەڕی ناوخۆ و لەئەنجامدا پشت گوێ خستن و پێشێلکردنی داخوازەکانی نەتەوەی کورد و دەسکەوتەکانی و سەرکوتکردنی کوردستان، زۆر کەمتر دەکاتەوە و ئەو دەرفەتە بۆ گەلی کورد دەرەخسێنێ کە بە دڵنیایی و هێزێکی زیاترەوە داخوازەکانی خۆی بەسەر حکوومەتدا بسەپێنێ. کۆمەڵە هەروەها داواکاری ڕێککەوتنی حیزبەسیاسییەکانی کوردستانە بۆ پابەندبوونیان بە پەنا نەبردن بۆ زۆر لە پەیوەندەکانی نێوانیاندا و بۆ پاراستن و دابینکردنی هەلومەرجی دیموکراتیك لەکۆمەڵگای کوردستاندا. ئێمە بەدیهاتنی ئەم سیاسەتە بە قازانجی بزووتنەوەی شۆڕشگێڕانەی خەڵکی کوردستان و پاراستنی دەسکەوتەکانیان، بەقازانجی گەشەی وشیاریی سیاسیی کرێکاران و زەحمەتکێشانی کوردستان و بە قازانجی هەنگاونانی کوردستان بەرەو کۆمەڵگایەکی مۆدێرن و

٦

دیموکراتیك دەزانین.

کۆمەڵە لە پلۆرالیزم و فرەچەشنیی سیاسی و فەرهەنگی لە کۆمەڵگای کوردستاندا، لە بەرقەراربوون و پاراستنی ڕێسا دیموکراتیکەکان، لە هەڵبژاردەبوون و خۆ بەبەرپرس زانینی دەزگاکانی دەسەڵاتدارەتی لەکوردستان داکۆکی دەکا و هەموو توانای خۆی بۆ پاراستن و داکۆکی کردن لەم بنەمایانە دەخاتەگەڕ. کۆمەڵە ئاڵاهەڵگری داکۆکی کردن لە ئازادییەکان و مافە تاکەکەسی و سیاسییە بەرینەکانی شارۆمەندان،ئازادیی هەمەلایەنەی دەربڕین، بڵاوکردنەوە و چاپەمەنی، کۆبوونەوە و ڕێکخراوبوون، ئازادیی ڕەخنەگرتن لە حیزبەکان و لێپرسراوانی کاروباری گشتی، ئازادیی ڕاگەیاندن و ڕەخنەگرتنی عەقیدەیی و سیاسی، ئازادیی هەڵسووڕانی سیاسی و ئازادیی پەیوەست بوون یان پەیوەست نەبوونی شارۆمەندان بەهەرکام لەحیزبەکانەوەیە و، داکۆکیکردن لەم ماف و ئازادییانە بەئەرکی خۆی دادەنێ.

٨ــ کۆمەڵە لەخەباتی ئازادیبەخشی گەلی کورد لەبەشەکانی دیکەی کوردستان بۆ بەدەستهێنانی مافی دیاریکردنی چارەنووس پشتیوانی دەکا و بۆ پێکهێنانی نزیکایەتیی سیاسی و فەرهەنگیی لە نێوانیاندا، تێدەکۆشێ.

٧

Komala Party _ Iranian Kurdistan
Central Commette




کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێران
کومیتەی ناوەندی

# راپۆرتی کۆمیتەی ناوەندی بە کۆنگرەی دەهەمی کۆمەڵە

## پێشکەشکار:عەبدوڵڵای موهتەدی

## (٣٠ی ژوئیەی ٢٠٠٤، ١٠ای گەلاوێژی ١٣٨٣)

هاوڕێیانی خۆشەویست،

بەشداربووانی بەڕێزی کۆنگرەی دە،

لە کۆنگرەی نۆوە تا ئێستا سێ ساڵ تێدەپەڕێ. سێ ساڵی پڕ لە ئاڵوگۆڕ بۆ کۆمەڵگای ئێران و کوردستان و بۆ هەموو ناوچەکە و سێ ساڵی پڕ لە ئەزموون و پڕ لە پێشکەوتن و لە هەمان حاڵدا پڕ لە دژواری و تێکۆشان بۆ کۆمەڵە. گوزارشێك کە من ئێستا لە لایەن کۆمیتەی ناوەندیی کۆمەڵەوە پێشکەشتانی دەکەم رەنگە نەتوانێت و مەبەستیشی ئەوە نەبێ کە هەموو ئەو گۆڕانکارییانە و هەموو ئەو ئەزموونە بەنرخانە بە وردەکارییەکانییەوە لە خۆ بگرێت، بەڵام ئەم گوزارشە هەوڵ دەدات:

– تەحلیل و لێکدانەوەیەك لە گرینگترین خاڵەکانی گۆڕانکاریی سیاسی لە ئێران و کوردستان و ناوچەکە بەدەستەوە بدات، هەر لەم پێوەندەدا هەڵوێست و سیاسەتەکانی کۆمەڵەش لەم دەورەیەدا بەکورتی بیر بخاتەوە و لە مەحەکی واقیعییاتی ئەم گۆڕانکارییانەیان بدات،

– هەروەها تێدەکۆشێت لە تەوەرەیەکی تردا مەوقعییەتی کۆمەڵە لەم دەورەیەدا لە سەر زەمینەی ئەم بارودۆخە سیاسییەی کە پێشتر باسم کرد هەڵ سەنگێنێت، گرینگترین دەسکەوتەکان و هەروەها کەموکوڕییەکانی کە دەبێت لە دەورەی داهاتوودا چارەسەریان بکرێت دەست نیشان بکا،

– گرینگترین ئەرکەکانی کۆمەڵە وەکوو حیزبی رابەر و مەسئوولی بزووتنەوەی کوردستان لە هەموو بووارەکانیدا لە حاست کۆمەڵگایەك کە تێیدا دەژی دەست نیشان بکا و،

– لە تەوەرەی نیهاییشدا هەوڵ دەدا ئەو چاکسازییە حیزبیانە ئاماژە پێبکا، هەڵبەت بە کورتی، کە پێویستن بۆ ئەوەی کۆمەڵە بتوانێ بە باشترین شێوە ئەو ئەرکانەی کە وا لە تەوەرەی پێشوودا دەست نیشان کراون بەڕێوە ببا.

با لە پێشدا لە ئێران و لە ئاڵوگۆڕە سیاسییەکانی ئەم وڵاتەوە دەست پێبکەین. ساڵانی رابوردوو، ئێران شاهیدی هەستان و کەوتنی پرۆژەی ئیسلاحخوازیی دەوڵەتی بوو. سەرهەڵدان و گەشە کردن و سەرەنجام لە

١

دەسەڵات کەوتنی رەوتی ئیسلاحخوازیی دەوڵەتی، هەروەکوو پێشتر بارەها باسمان کردووە، بەرهەمی بنبەستەکانی ئابووری و سیاسی و رۆشنبیریی رژیمی کۆماری ئیسلامی ئێران بوو. پێش هەموو شتێك مۆدێلی پەرە سەندنی ئابووری کۆماری ئیسلامی ئێران شکستی هێنا. بەرهەم هێنان هەرگیز نەیتوانی لە ماوەی ئەم ٢٦_٢٥ ساڵەدا هەستێتەوە. سەرەتا بە هۆی شەڕی ماڵ وێرانکەری ئێران و عێراقەوە و دواتریش کە بەڵێنی "سازەندەگی" و شیعارەکانی تر درا، هیچ کام لەوانە نەهاتنە دی و تا ئێستاش ئێمە لە کۆمەڵگای ئێران دا شاهیدی ئەوەین کە بەشی هەرە زۆری توانایی و زەرفییەتەکانی وەبەر هێنان لە ئێران دا هێشتا نەکەوتۆتە گەڕ. لە بەر ئەوە، بەپێچەوانەی ئیدیعاکانیان، کە دیارە ئێمە دەمان زانی قەت راست نین، نەك هەر مۆدێلێکی ئیسلامیی پەرەسەندنی ئابووری کە بەقسەی ئەوان دەبێ باڵاتر بێت لە سەرمایەداری و سۆسیالیزمیش نەهاتە ئاراوە، بەڵکوو ئێرانی ئیسلامی بوو بە نموونەیەکی هەرە خراپ، دواکەوتوو، شپرز و گەندەڵ لە وڵاتێکی جیهانی سیهەمی کە بە دەستی مافیایەکی سەرەوەت و دەسەڵاتەوە دەناڵێنێ. ئێران هەرگیز گەشە کردنێکی ئابووری خێرای بە خۆوە نەدی. ئەو دیاردەی کە لە دنیای زانستی ئابووریدا پێی دەڵێن "پەرە سەندنی ئابووریی بەردەوام " (تەوسیعەی ئیقتیسادیی پایدار)، هەرگیز نەیتوانی لە ئێران سەربگرێ. ئێران تا ئێستاش لەم بارەیەوە وڵاتێکی وێرانە.

بێجگە لەوە، مۆدێلی ئیدارەی سیاسیی دەسەڵاتی ئیسلامیش، کە لە قاڵبی رژیمی کۆماری ئیسلامی دا هاتە سەرکار، سەرەڕای ئەوەش کە لە هەوەڵەوە بە خواستی بەشێکی زۆر لە جەماوەر، یان باشترە بڵێین لە بەر تەوەهوماتی ئەوان، هاتە سەرکار، ناسەقامگیر و ناسەرکەوتوو مایەوە. کۆماری ئیسلامی هەرگیز نەیتوانی مودێلێك لە دەسەڵات، مۆدێلێك لە ئیدارەی سیاسی کە بۆ بەڕێوە بردنی وڵات لە چوارچێوەی رژیمێکی سەرمایەداریدا کارامە و بەردەوام بێ، بەدەستەوە بدات. مۆدێلی ئیدارەی سیاسییەکەشی مۆدێلێکی سەرکەوتوو، کارامە، ئەوڕۆیی و جواب دەرەوە نەبوو.

سێهەمین بنبەستی ئیسلامی سیاسی زاڵ بەسەر ئێران لە قاڵبی ئەم رژیمەدا، شکست و پاشەکشەیەکی ئایدیۆلۆژیك و لەکیس چوونی هێژەمۆنی بوو بە سەر دنیای رۆشنبیری و بە سەر گوتاری فیکری و ئایدیۆلۆژیکیی کۆمەڵگای خۆیدا. رۆژبەڕۆژ زیاتر خەڵکی ئێران، دنیای رۆشنبیری و دنیای فیکریی ئێران، سیاسەت لە ئێران، زمان و زاراوەیەك بەکار دەبات و بە مەفاهیم و چەمك گەلێك قسەدەکا و دەدوێ کە لەگەڵ بەها و ئەرزشەکانی کۆماری ئیسلامی بێگانەیە.

سەرجەم بەشکستی مۆدێلێکەکانییەوە و بە بنبەستییەوە و بە هەبوونی ئەم بزووتنەوانەشەوە، دیار بوو کە رژیمی کۆماری ئیسلامی توانای ئیدارەی وەکوو پێشوو نییە. سەرەڕای سەرکوتێکی خوێناوی و درێژماوە کە لە لایەن ئەو رژیمەوە بەڕێوە چوو، بەڵام لەو بووارانەدا رژیمی کۆماری ئیسلامی شکست و بنبەستی هێنا و دەبوایە ئاڵوگۆڕێك پێك بێنێ. سەرهەڵدان و، بۆ ماوەی چەند ساڵێك خۆ لە سەر کار راگرتنی، رێفۆرم خوازیی دەوڵەتی بەرهەمی ئەم شکست و بنبەست و بێتواناییەی دەسەڵاتی ئیسلامی سیاسی بوو لە بەدەستەوە دانی مۆدێلی سیاسی و ئابووری و رۆشنبیری لە کۆمەڵگای ئێراندا، بەرهەمی ئەوە بوو کە کۆمەڵگای ئێران بەفراوانی دەستی رەدی لە سینەی ئەو مۆدێلە دایەوە و خوازیاری گۆڕانی ئەو مۆدێلە بوو.

بەڵام، هەر وەکوو چەندەها جاری دیکەش باسمان کردووە، پرۆژە و دیاردەی ئیسلاحخوازی لە ئێران تەنها بەرهەمی یەک بێدەسەلاتی یان یەک بێتوانایی، ئەویش هی سەرەوە، نەبوو. لە راستیدا سەرهەڵدانی دیاردەی ئیسلاحاتی دەوڵەتی بەرهەمی یەکگرتنەوەی دوو بێتوانایی بوو: بێتوانایی حکومەت لە درێژەدان بە مۆدێلێک کە دەیەویست بە سەر ئێرانی دا بسەپێنێ و بێتوانایی کۆمەڵانی بەرینی جەماوەری خەڵکی ئێران و بێبەدیلییان بۆ رووخاندن و لەبن هێنانی ئەو رژیمە. ئیسلاحخوازیی دەوڵەتی بەرهەمی پارسەنگی و تەوازونی ئەو دوو بێتواناییانە بوو. نە نیزامی دەسەلاتدار لە ئێران دەیتوانی وەکوو جاران حکوومەت بکا و نە خەڵک دەیانتوانی لای بەرن. چەند ساڵێک کە ئەم تەوازونە لە ئێران دا بەرقەرار بوو هەوڵێک بوو بۆ ئەوەی کە نیزامی دەسەلاتدار لەنێو خۆیدا ئیسلاح بێ. ئەم هەوڵە سەرەنجام بە شکست گەیشت.

هەڵبەت خەڵکی ئێران هەرگیز بەهاسانی سەریان بۆ کۆماری ئیسلامی دانەنەواند، بزووتنەوە ناوبەناوەکان، مقاوەمەتە ناوبەناوەکانی کرێکاران، بێکاران، ژنان، لاوان، رووناکبیران، گەلی کورد و خەڵکانی دی، هەموو ئەوانە لە ئارادا بوون. بەڵام بە هەموو ئەوانەشەوە بزووتنەوەیەکی گەورەی سەرنگوونی، بزووتنەوەیەکی وەها کە ئەو رژیمە لە بن دەربهێنێ، نەکەوتە کار.

هەر لێرەدا ئاماژەیەک بەوە بکەین کە ئەگەر ئیسلاحخوازیی دەوڵەتی ئیسباتەن و بەشێوەیەکی پۆزەتیف نەیتوانی دەسکەوتێک بۆ خەڵکی ئێران فەراهەم بکا، بەڵام نەفیەن و بەشێوەی نێگەتیڤ بێتەئسیر نەبوو. ئیسباتەن نەیتوانی دەسکەوتێک وەدی بێنێ بۆ خەڵکی ئێران چونکە نەیتوانی هیچ دامەزراوە و نیهادێکی قانوونی لە ئێران بگۆڕێ. قانوونی ئەساسییەک کە تێیدا بێمافی لە قاڵبی ویلایەتی فەقیە دا وەکوو ئوسووڵی نەگۆڕی یاسایی تێئۆریزە و تەسبیت کراوە و، حکوومەتی دینی وەکوو ئەسڵێکی ئەزەلی و ئەبەدی داسەپێندراوە، نەگۆڕا و وەکوو خۆی مایەوە. شووڕای نیگابان نەگۆڕا و بگرە هارتر و دڕتر بوو و دەسەلاتی زۆرتریشی پەیدا کرد. مەجلیسی خۆبرەگان هەروا، نیهادی رێبەری هەروەها، شووڕای مەسڵەحەتی نیزام هەروەها. هیچ کام لەوانە نەگۆڕان. تەنانەت دەوڵەتی خاتەمی نەیتوانی کۆنترۆڵ بەسەر دەزگایەکی وەکوو "سەدا و سیما"دا بەقەرار بکات کە زامیرەن دەبێ لە ژێر چاوەدێریی دەوڵەتدا بێ و گۆیا بە گشتی بۆ خەڵک بەکار بڕوا. دەوڵەتی خاتەمی هەوڵگەلێکی دا بۆ چاک کردنی سیاسەت لەگەڵ دنیای دەرەوە، تەنانەت ئەویشیان لێ تێکداوە و، تەنها رووداوی قەتڵە زنجیرەییەکان و دەرکەوتنی ئەم ریسواییە بوو کە ئیجازەی دا تا رادەیەک دەست بەسەر وەزارەتی ئیتیلاعاتدا بگرێ کە ئەویش بەزوویی لەلایەن موحافیزەکاران و رێبەرییەوە بەوە جواب دراوە کە "ئیتیلاعاتی رەهبەری" یانی دەزگایەکی "موازی" وەزارەتی ئیتیلاعات کە بەتەواوی لە ژێر کۆنترۆڵی ئەو باڵە دایە دامەزرا و تا رادەیەکی زۆریش کۆنترۆڵی کارەکانی بە دەستەوە گرت.

بەم جۆرە، ئیسلاحخوازیی دەوڵەتی نەیتوانی هیچ ئاڵوگۆڕێک لە ئێران بە دامەزراوە بچەسپێنێت، نەیتوانی هیچ کام لە نیهادەکان و مونەسەسات و دامەزراوە ئەسڵییەکانی کە ساختار و قەوارەی سیاسی رژیمی کۆماری ئیسلامییان لە سەر دامەزراوە بگۆڕێ، نەیتوانی ئیسباتەن هیچ مافێک بە شێوەی قانوونی بۆ خەڵک تەسبیت بکا و بیچەسپێنێ، بەڵام لە بەرامبەر هەموو ئەوانەدا نەفیەن خاسییەتێکی لەخۆی نیشان دا ئەویش ئەوەیە کە دەزگای سەرکوتی جمهووری ئیسلامی فەلەج کرد، تووشی راڕایی کردن، لێبڕاویی پێویست بۆ سەرکوتانەوەی

٣





خەڵکی لێسەندن، مەودایەکی پێك هێنا کە لەو مەودایەدا خەڵك بدوێن، دەنگ هەڵبڕن، کراسی ترس لەبەر خۆیان فڕێ دەن، تەوەقوعیان زیاد کەن، خواستەکانیان فۆرمولە بکەن. خاسییەتی ئەم ئیسلاحخوازییە دەوڵەتییە زۆرتر ئەوە بوو کە وەکوو زەربەگیرێك بوو بۆ خەڵك لە بەرامبەر سەرکوتانەوەیەکی وەحشیانە و بێسنوور لەو چەشنەی کە لە دەھەی ٦٠ دا دەرهەق بە خەڵك کرا. دەرفەتێکی پێك هێنا کە خەڵك خواستەکانیان فۆرمولە بکەن، دەرفەتێکی پێك هێنا کە خەڵك نەفەسێك هەڵاوێن، رۆژنامەگەرییەك بێتە ئاراوە، مەسەلەی مافی مرۆڤ بێتە ئاراوە، مەسەلەی کرێکار و مافەکانی بێتە ئاراوە و تەنانەت بچێتە ناو رۆژنامەکان، مەسەلەی مافی ژنان بێتە ئاراوە و بچێتە ناو گۆڤارەکان و لە رۆژنامەکاندا قسەی لەسەر بکرێ. دەتوانین بڵێین وەکوو ئازاد کردنی دێوی ناو بوترییەکە وابوو. لەم چەند ساڵەدا دێوێك لە بوترییەکەی کۆمەڵگای ئێران هاتۆتە دەرێ کە تازە بە هیچ زەبر و زەنگێك ناچێتەوە ناوەوە. بەم حیسابە لەو سەردەمەدا و لەسایەی تێکۆشانێکی بەرین و دەرفەتێك کە ئەو فەزایە پێکی هێنا بوو، مەوقعییەتێك خوڵقا کە دەتوانین بڵێین رژیمی کۆماری ئیسلامی ئیتر ناتوانێ جارێکی دی دەورانی دیکتاتۆری رەشی دەهەی ٦٠ی هەتاوی لە ئێران زیندوو کاتەوە.

بەڵام ئیسلاحخوازیی دەوڵەتی لە کوردستان چ حاڵەتێکی هەبوو؟ بۆ سەردەمێکی کورت لەسەرەتاوە یەکەم جار کە خاتەمی وەکوو سەرکۆمار لە ئێران هەڵبژێردرا و تاماوەیەکی کەم بە دوای ئەودا ئەبێ و، ئەویش لە ئاستێکی مەحدوود ودیاریکراودا ئەبێ، هەرگیز ئیسلاحخوازیی دەوڵەتی لە کوردستان نەیتوانی بنج و ریشە داکوتێ و بچێتە قووڵایی کۆمەڵگای کوردستانەوە. خەڵك سەرجەم بە ناباوەڕییەوە چاویان لێکرد، بە "خۆیی"یان نەزانی، بە پیلانی تێگەیشتن، بە بەشێك لە هەوڵەکانی دەسەڵاتیان زانی و سەرجەم بەگومان و بێباوەڕ بوون بەم رەوتە. لە حاڵێکدا کە ئەم ئیسلاحخوازییە دەوڵەتییە توانی لە بەشێکی بەرچاو لە کۆمەڵگای ئێران، بەتایبەتی لە شارە گەورەکان، تا رادەیەك بچێتە قووڵایی کۆمەڵگاوە و ناکۆکییەکە تا رادەیەك لە ناکۆکی سیرفەن نێو باڵەکانی دەسەڵات هاتە دەر، بەڵام بۆ کوردستان بێجگە لەو ماوەیە و بێجگە لەو ئاستە مەحدوودە، سەرجەم بزووتنەوەی ئیسلاحخوازیی دەوڵەتی نەیتوانی بچێتە قووڵایی کۆمەڵگاوە و نەیتوانی نوخبەی کوردستان لەگەڵ خۆی بخات، نەیتوانی باوەڕ و متمانەی خەڵکی بەدەست بێنێ و هەتا بە رەو ئەملا هاتین، هەتا دەورەی هەوەڵی سەرکۆماریی خاتەمی روو لە کۆتایی رۆیشت، هەڵبژاردنی دەورەی دووهەمی سەرکۆماری بە شوێنیدا هات و دواتر هەلبژاردنی مەجلیسی حەوتەم هاتە گۆڕێ، کوردستان رۆژبەڕۆژ زیاتر ئەم بێمتمانەییەی خۆی بە سەرجەم دەسەڵاتی کۆماری ئیسلامی ئێران نیشان دا.

ئیسلاحخوازیی دەوڵەتی، هەروەکوو باسمان کرد، بۆ مایەك و لە چوارچێوەیەکی دیاریکراو ئەبێ نەیتوانی نفووز و پێگەیەکی ئەوتۆ لە کوردستان پێك بهێنێ. لە هەڵبژاردنی دەورەی دووهەمی سەرۆك کۆماریی خاتەمی دا، کۆمەڵە هەڵسووڕاوترین و کاریگەرترین حیزب بوو لە تەحریمی ئەو هەڵبژاردنە لە کوردستاندا. کارێکی راگەیاندنی خەست و خۆڵمان لە ماوەیەکی بەرچاو لەوە پێشەوە چ لە رادیۆمان، چ بە نووسراوە و بڵاوکراوەکانمان لە کوردستان، چ بە موساحەبە لەگەڵ میدیا گەورەکان، چ بە دیتنی دۆستان وهەڵسووڕاوان و

٤



لایەنگرانی کۆمەڵە لە کوردستان و لە راستیدا بە هیمەتی ئەوان، بردە پێش و کۆمەڵە توانی تا رادەیەکی بەرچاو خۆی وەکوو حیزبی هەرە چالاک بەدژی ئەو هەڵبژاردنە ساختەیە نیشان بدات.

هۆکارێکی دیکە کە لە سەر بنەمای زەمینەی گونجاو و لەبار، لە سەر بەستێنی فیکری و سیاسی کۆمەڵگای کوردستان، توانی کاریگەر بێ و جێ بە ئیسلاحخوازیی دەوڵەتی لەق بکا، بووژانەوەی کۆمەڵە بوو. پرۆژەی ساغ کردنەوەی کۆمەڵە بەشێکی بەرچاو لە نوخبە و پێشڕەوانی سیاسی کوردی لە بێئاڵتێرناتیڤی دەرهێنا، لە بێدەرەتانی و سەر لێ شێواوی دەری هێنان؛ رێگەیەکی شۆڕشگێڕانەتر و دەتوانم بڵێم کاریگەرتری بۆ گۆڕان، بۆ تێکۆشان لە کوردستان، لە بەرچاوی ئەوان گرت و نیشانی دان. پێویستی نەدەکرد کە تێکۆشەرانی سیاسی و رۆشنبیریی کوردستان پەل بوکتن و سەر بەهەموو جێیەک دابکەن بۆ ئەوەی ئاڵوگۆڕێك لە کۆمەڵگاکەی خۆیاندا بدەن. کۆمەڵە بە بووژانەوەی خۆی لە چوارسباڵی رابوردوودا، دیارە نەك لە رۆژی هەوەڵەوە بە هەمان توانا و کاریگەری کە ئێستا هەیەتی بەڵام هەر لە رۆژی یەکەمەوە، جارێکی دیکە خۆی وەکوو حیزبی ئاڵوگۆڕ، حیزبی خوازیارانی ئاڵوگۆڕی بنەڕەتی لە کوردستان نیشان دایەوە، هیوا و هومێدی خستە دڵی هەموو تێکۆشەرانی کۆمەڵەوە و بەو ئەتیجەیەی گەیاندنەوە کە بە هیچ لاڕێیەکدا نەڕۆن، بێنەوە سەر شاڕێی کۆمەڵەی شۆڕشگێڕ.

هەر لە سەر ئەم ئیسلاحخوازییە دەوڵەتییە یەکێك لە نموونە یان دیاردەکان کە بەجێیە ئاماژەی پێبکەین، بریتییە لە موقایەسەی هەڵبژاردنەکانی مەجلیسی حەوتەم لە ئێران و لە کوردستان. لە هەموو ئێران، بەتایبەت لە تاران و شارە گەورەکان، پێش ئەوەی هەڵبژاردنەکانی مەجلیسی حەوتەم بکرێت، هەڵبژاردنی شووراکانی شار بوو. ئەو هەڵبژاردنە شانۆی گەورەترین شکست بوو بۆ ئیسلاحخوازیی دەوڵەتی. هەڵبژاردنی شووراکان بوو کە نیشانی دا ئیسلاحخوازانی دەوڵەتی لە لایەکەوە لە سەرەوە لە لایەن باڵی موحافیزەکار و کۆنەپەرەستانی توندڕەوەوە لە ژێر فشاردان کە دەیانەوێ لە دەسەلات دەریان پەڕێنن و، لە لایەکی دیکەشەوە بڕوا و متمانەی خەڵکیان بە تایبەت لە پێگە ئەسڵییەکانی خۆیان وەکوو تاران و نێو زانستگا و نێو چینی ناوەنجی تازەی ئێران و بەشی خوێندەوار لە دەست داوە. خەڵك خوازیاری ئاڵ وگۆڕێك بوون و پێیان نیشان درا کە ئیسلاحخوازانی دەوڵەتی ئەو مۆتۆڕە نین کە بتوانن ئاڵوگۆڕ پێك بهێنن، هەڵگری ئەو مەسئوولییەتە نین و ناتوانن بن. بەشداری نەکردنی خەڵك لە هەڵبژاردنی شووراکان بە مانای متمانە بەخشین بە موحافیزەکاران نەبوو، بەپێچەوانە، بەمانای ئەوە بوو کە ئەو ئاڵوگۆڕەی ئەوان دەیانهەوێ قووڵتر و لیبڕاوانەتر و شەفافتر بوو لەوەی کە ئیسلاحخوازانی دەوڵەتی بتوانن بیکەن.

کە هەڵبژاردنەکانی مەجلیسی حەوتەم لە ئێران رووی دا، بەم وەزعەوەی کە دیتمان و بەو بێبەش کردن و رەددی سەلاحییەتە فراوانەی کە لە سەرتاسەری ئێران لە لایەن شوورای ئیگابانەوە بەهۆی ئەمرۆمێکەوە بەناوی "نەزارەتی ئیستیسوابی" بەرێوە چوو، ئەمە کارێکی کرد کە ئیسلاحخوازانی دەوڵەتی پاك بکرێنەوە و جێگە و پێگەیەکی ئەوتۆیان لە ناو رژیمی کۆماری ئیسلامیدا بە تایبەت لە پارلەمانەکەیاندا، کە پێگەی سەرەکی ئەوان بوو، نەمێنێت. رادەی بەشداری نەکردنی خەڵك لە هەڵبژاردنەکانی مەجلیسی حەوتەم لە سەرتاسەری ئێراندا یەکجار لەسەرەوە بوو، بەڵام بەتایبەت لە کوردستان زۆر بەرچاو بوو. بە بڕوای ئێمە بەشداری نەکردنی بەرینی خەڵکی شار و گوندەکانی کوردستانی ئێران لە هەڵبژاردنەکانی مەجلیسی حەوتەم رێفراندۆمێکی گەورەی

٥

سیاسیی خەڵکی کورد بوو بە دژی ڕژیمی کۆماری ئیسلامی. خەڵکی کوردستان بەشێوەی قاتع و شەفاف لە بەرچاوی دنیا حیسابی خۆیان لە حیسابی ئەو نیزامە جیاکردەوە و جوابێکی ڕەد و "نا"یەکی گەورەیان بە کۆماری ئیسلامی دایەوە و هەمووشمان دەزانین کە دەور و نەخشی کۆمەڵە لەم بووارانەدا چەندە چالاکانە و چەندە کاریگەر بوو.

بەلام شکست و کەوتنی ئیسلاحخوازیی دەوڵەتی چ ئاکام گەلێکی بە دووی خۆیدا هێناوە و دەیهێنێ؟ هەروەکوو عەرزم کردن چارەنووسەکەی بۆیە بەم شێوەیە دیاری کرا چونکە متمانەی خەڵکی لە خوارەوە لەدەست دا. هەر چەند کە خەڵك هەمیشە لە ئیسلاحخوازانی دەوڵەتی بەشك و گومان بوون و، زوربەی خەڵك نەك لەرووی تەوەهومێکی قوول بەڵکوو وەکوو ئیمکانێك، وەکوو کاناڵێکی مومکین کە لە چوارچێوەی مەقدوورات دا کراوەتەوە چاویان لێدەکردن، بەلام بە هەر حاڵ تا ئەو ڕادەیش متمانەیان پێکردبوون و پشتیوانییان لێکردبوون، ئەو متمانەیان لێ سەندنەوە. لەلایەن سەرەوەشەوە لە دەسەلات دەرکرا. جێی سەرنجە بۆچی ئیسلاحخوازانی دەوڵەتی نەیانتوانی تەنانەت لەو پرۆژانەشدا کە خۆیان رایانگەیاندبوو سەرکەون؟ سەرچاوەکەی لە قووڵترین ئاستی تەحلیلیدا ئەگەر تماشای بکەین بریتییە لە: بەسترانەوەی ئابووری و سیاسی و ئایدیۆلۆژیکیی ئەوان بە دەسەلات و بە نیزامی کۆماری ئیسلامی ئێرانەوە. ئەڵبەتە دەکرێ لە لێکۆڵینەوەیەکی وردتردا زۆر هەڵەی تاکتیکیش بخرێتە پاڵ ئیسلاحخوازانی دەوڵەتی، زۆرێك لەوانەش رەنگە ڕاست بن و وەکوو لێکۆڵینەوەی بەشێك لە تاریخی سیاسی وڵاتێك کە ئەو ململانێیە تێیدا رووی داوە بۆ هەر کەسێکی سیاسی جێگای دەرس وەرگرتن بن، بەلام لە قووڵترین ئاستی تەحلیلیدا ئەوە بەسترانەوەی قووڵی ئیسلاحخوازان لە باری ئابووری، سیاسی و ئایدیۆلۆژیکەوە بەو دەسەلاتە بوو کە نەیهێشت ئەوان هەنگاو هەڵگرن. ئیسلاحخوازانی دەوڵەتی بە مەسڵەحەتەکانی حکوومەتەوە بەسترابوونەوە، بە قازانجە ئابوورییەکەیەوە بەسترابوونەوە، بە دەزگای فیکری و ئایدیۆلۆژیکەکەیەوە بەسترابوونەوە، ئەمە لە لایەك و لە لایەکی دیکەوە ترسی ئەوان لە بزووتنەوەی جەماوەری و ترسیان لەوەیکە گۆڕان لەو سنوورەی کە ئەوان دەیانهەوێ بترازێ، گەلێك زیاتر و فراوانتر بوو لە ترسی ئەوان لە موحافیزەکارانی دەوڵەتی. دەتوانین بڵێین ئەوان دەستیان هەبوو لە شکستی خۆیاندا. ئیسلاحخوازان لە ترسی ئەوەی نەکا ئاڵوگۆڕی قووڵتر لە ئێران روو بدات خۆیانیان بە شکست گەیاند. بەهەمان ڕادە کە ئیسلاحخوازانی دەوڵەتی ڕاڕایی، بێتەسمیم، ئەهلی شلەوتوندە، ئەهلی موجامەلە و عەدەمی سەراحەت بوون، بە هەمان ڕادەش هێزی موحافیزەکاری توندڕەوی ناو حکوومەت لێبڕاو، ڕاشکاو و بێئەملاولا بوون، تەعارۆفێکیان نەدەکرد، جیددی بوون لە کاری خۆیاندا.

هەر وەکوو باسم کرد، ئەم ڕەوتە لە بوواری دێمۆکراسی و ئازادیدا شتێکی ئەوتۆی نەخستە سەر کۆشی کۆمەڵگای ئێران، هیچ دامەزراوە و نیهادێکیان لەوانەی ڕیزم کردن نەگۆڕی و مەجلیسیشیان لە دەست دا. خاتەمی کە لە سەر کار ماوەتەوە نە ئەو مەیلەی هەیە، نە ئەو توانایەی هەیە و نە ئەو مەجالەی بۆ ماوەتەوە و بەم جۆرە ئیسلاحخوازیی دەوڵەتی ئاخرین هەناسەکانی خۆی هەڵدەکێشێ. بوونەوەرێکە وەکوو دەڵێن لە باری کلینیکییەوە مردووە، بەس ماوە بینێژن.

٦

ئەگەر سەرهەڵدان و مانەوەی باڵی ئیسلاحخواز بۆ چەند ساڵێك کۆمەڵێك نەتیجەی هەبوو، لێکەوتنی ئەم باڵەش لە دەسەڵات ئاکام گەلێکی لەگەڵ خۆی هەیە. یەك لەوان ئەوەیە کە بە کۆمەڵگای ئێران و هەروەها بە تایبەتی بە کۆمەڵگای جیهانی نیشان دا کە ئاڵ و گۆڕی جیددی لە ئێران لە ناوخۆی ئەو رژیمەدا ناکرێ. رەنگ بێ بۆ خەڵکی ئێران ئەوە دەسکەوتێکی زۆر عەجایەب گەورە نەبێ. بەڵام سەبارەت بە مەوقعییەتی نێونەتەوەیی و جیهانی ئێران دەسکەوتێکی زۆر گەورەیە. بۆچی ئەوە دەڵێم؟ چونکە بە دوای شەڕی ئێران و عێراقدا بۆ ماوەیەك رەفسەنجانی دەتوانم بڵێم هەموو دنیای هەڵپەراند و فریوّدا لە سەر ئەساسی ئەوەی کە گۆیا مۆدێلێکی پەرەسەندنی ئابووری لە ئێران پیادە دەکا، ئێران لە باری ئابوورییەوە لیبراڵیزە دەکا، لە باری سیاسیشەوە میانەڕەوی دەگرێتە بەر و ئیزامێکی قابیلی قبووڵ بۆ کۆمەڵگای نێونەتەوەیی لێدەردێنێ. دیارە وای نەکرد. رەفسەنجانی خۆی لە لووتکەی مافیای دەسەڵات و سەروەتی ئێران دایە. من نامەوێ لە سەر ئەم بابەتە بڕۆم، زۆر کەس لە ئێران لەو بارەیەوە لەسەریان نووسیوە. یەکێك لەوانە ئەکبەری گەنجی، گەورەترین ئیفشاگەری لە سەر رەفسەنجانی کردووە. پێم وانییە هەتا رووخانی کۆماری ئیسلامی پەروەندەکانی دەرکەوێت کە ئەم سەرۆك مافیایە لە ئێران چی کردووە. بەهەرحاڵ، ئەو سەرەنجام لە دەورەی خۆیدا نەیتوانی سەرکەوێت. خاتەمی لە دەورەی تازەدا جارێکی دیکە هەوڵی دا بۆ ئەوەی مەوقعییەتی جیهانیی ئێران پتەو بکات لە دنیادا. بەڵام بە بنبەست گەیشتن و شکستی ئیسلاحاتی دەوڵەتی هیوای سازان و پێك هاتنێکی جیددی لە نێوان ئێران و رۆژئاوادا لەناو برد. ئەمن ناڵێم لە رۆژئاوادا سەودا و بازرگانی و قازانجی ئابووری پاڵیان پێوە نانێ بۆ سازان و سات و سەودا لەگەڵ ئێران. بیست و پێنج ساڵە ئەو کارەیان کردووە، بیست و پێنج ساڵە مافی مرۆڤ لە حاست ئێراندا فەرامۆش کراوە و کەمتر باسی کراوە، ٢٥ ساڵە کە ئاپارتایدی جینسی لە ئێران بەردەوامە، نە ئەمریکا و نە ئورووپا ئەو جۆرەی پێویستە کاریان لە سەر نەکردووە، زۆر جار بە سکووت و بێدەنگیی خۆیان دایانپۆشیوە، ٢٥ ساڵە ئەوەیکە نەتەوە ژێردەستەکانی ئێران و لەوانە بە تایبەتی کورد زوڵمیان لێدەکرێ و لەگەڵ سیاسەتێکی شۆڤێنیستی و سەرکوتگەرانە بەرەو روون، دەنگێکی ئەوتۆی نەداوەتەوە لە دنیادا. سەرچاوەی بەشی هەرەزۆری ئەم بێدەنگییەی وڵاتانی ئورووپایی دیارە شتێکی دیکە نییە بێجگە لە مەسڵەحەتی ئابووری و بازرگانی و بێجگە لە ململانێی نێو خۆیان بەینی ئەمریکا و ئورووپا لە سەر مەسەلەی جێگە و شوێنی ژێئۆپۆلیتیك و بەرژەوەندی ستراتێژیکی هەرکامیان لە ناوچەکەدا. ناڵێم ئێستا چیدی معامەلە و سەودای بازرگانی و قازانج پەرەستی لە گۆڕێ دانییە. تەمامە بڵێم بە بنبەست گەیشتن و کۆتایی پێهاتنی ئیسلاحاتی دەوڵەتی شانسی ئەم پێك هاتن و سازشەی تا رادەیەك کەم کردۆتەوە و بنەمایەکی بۆ نەهێشتۆتەوە و ئەو هیوایەی کە بە ئێرانیان بەستبوو نەماوە.

لەنێو خۆی ئێران ئاکام یا خاسییەتێکی دیکەی شکستی ئیسلاحخوازیی دەوڵەتی ئەوەیە کە دەتوانێت مەیلی گۆڕان و ئیسلاحخوازیی ناوخۆی ئێران لەگەڵ ئۆپۆزیسیۆنی دەرەوەی وڵات لە یەکتر نزیك بکاتەوە، هێندێك خواست دەتوانن ببن بە خواستی فراوانی هەموو لایەك، وەکوو گۆڕانی قانوونی ئەساسی، وەکوو لابردنی ویلایەتی فەقیە، وەکوو لابردنی "نەزارەتی ئیستیسوابی" و شوورای نیگابان و تەنانەت وەکوو جودایی دین لە دەوڵەت. ئەو خواستانە ١٠ ساڵ لەوە پێش لە ئێران بڤە بوون. ئەوڕۆ وردە وردە لە نێوخۆی ئێراندا

زمزمەمەیان دێ. دەیان راگەیاندن و نووسراوەی عەلەنی و غەیری عەلەنی لە ئێران هەیە، دەیان کۆڕ و کۆبوونەوە هەیە کە حیزبوڵڵا دەچێ تێکی دەدات، بەڵام ئەو قسانە تێیدا رەنگ دەداتەوە و دەنگ دەداتەوە. زۆرێك لەوانە رەنگ و بۆنی خواستی ئۆپۆزیسیۆنی دەرەوەی وڵاتی پێوەیە، ئۆپۆزیسیۆنێك کە لە ئەساسی خۆیدا سەرنگوونیخوازە، بەڵام دەزانێ لەم سەردەمەدا چ خواست گەلێك مەترەح کات. ئەگەر چی ناڵێم تەواو نزیك بوونەتەوە، ناڵێم یەکیان گرتووە، ناڵێم سنووربەندیی نێوانیان لەبەین چووە، بەڵام دەڵێم کە زمان، زاراوە، مەفهوومەکان و خواستەکانی ئەو دوو بزووتنەوە لە ناوخۆ و لە دەرەوەی ئێران وردەوردە خەریکە لێك نزیك دەبێتەوە. ئەوە جێی مەترسی نییە، جێی خۆشحاڵییە. هیچ رژیمێك ناگۆڕێ، ئیللا ئەوەیکە هەموو ئەو هێزانەی کە توانایی گۆڕانی ئەو رژیمەیان هەیە لە بەرەیەکی راگەیەندراو یان رانەگەیەندراو، بەرەیەکی فراوان وجەماوەریدا کۆببنەوە و هێزەکانیان یەك بگرێتەوە. تەنانەت لەو شۆڕشانەی دنیادا کە ئێمە وەکوو شۆڕشی چینایەتی دەیانناسین، چینی شۆڕشگێڕ تەنیا ئەو کات توانیویەتی دەسەڵات بگۆڕێت کە توانیویەتی بێجگە لە خۆی چینەکانی دیش لە دەوری خۆی کۆبکاتەوە و لە نارەزایی هەمووان بەهرەبەرداری بکا. لەئێرانیش ئەو لێك نزیك بوونەوەی ئۆپۆزیسیۆنی دەرەوە و ناوخۆ کە باسم کرد، زەمینە بۆ ئاڵوگۆڕ و زەمینە بۆ رادیکاڵیزە بوونەوەی خواستی رێفۆرمخوازی لە ئێران فەراهەم دەکا. با ئەوەش بڵێم کە ئەگەر ئیسلاحخوازیی دەوڵەتی شکستی خواردووە، بەڵام مەعنای ئەوە نییە خواستی ئیسلاحات و ئاڵوگۆڕ لە کۆمەڵگای ئێراندا لەناو چووە یان خوازیارانی خۆی لە دەس داوە. بە پێچەوانە، ئەو خواستانە، خواست بۆ ئیسلاحات، بۆ ئاڵوگۆڕ، بۆ گۆڕانی سیاسی و ئابووری لە ئێران، قووڵتر دەبێتەوە و رادیکاڵیزە دەبێتەوە. ئەمە بەرهەمی هەستان و کەوتنی چەند ساڵەی ئیسلاحخوازیی دەوڵەتی و چوونە پێش و قووڵتر بوونەوەی خواستەکانی خەڵکە.

جێی خۆیەتی کە لێرەدا ئاماژەیەك بە سیاسەتی خۆمان، یان باشترە بڵێین مێتۆدی سیاسیمان، لە چەند ساڵی رابوردوودا سەبارەت بەم ئاڵوگۆڕانە بکەین. هەر وەکوو لە سەرەتادا باسم کرد، وەخت و مەجالی ئەم کۆنگرەیە بۆ ئەوە نییە کە ئەوانە بە هەموو وردەکارییەکانەوە شەرح بدرێن. بەڵام پێویستە لە چەند دێڕێکدا نیشانی بدەم کە رووانگە و مێتۆدی کۆمەڵە، تێگەیشتنی کۆمەڵە لەو ئاڵوگۆڕانەی کە لە ئێران لە ئارادا بوون، تێگەیشتنی لە ماهییەتی راستەقینەی دۆخی سیاسی ئێران، چلۆن لە مەحەکی واقیعییەت درا و راست و دروستیی خۆی نیشان دا. ئێمە لە هەمان کاتدا کە سەرنگوونی خوازێکی لێبڕاو و رۆشن بووین، بەڵام بە واقیع بینییەوە خەسڵەتی سەردەمە سیاسییەکەمان ناسیوە و بەو پێیە هەڵوێستمان وەرگرتووە. نموویەکتان بۆ بێنمەوە. کاتێك بزووتنەوەی خوێندکاران لە ١٨ی پووشپەڕ لە ئێران رووی دا، بیهێننەوە بیرتان کە ئەو سەردەمە بەشێکی زۆری چەپی ئێران، گەر بە هەڵە نەچووبم بەشی هەرە زۆری چەپی ئێران، ئێمە و رەنگ بێ بەعزێك خەڵکانی دیکەی لێ بەدەر، چیبیان دەنووسی: "نفسهای انقلاب را می‌شنویم". دەیانگوت ١٨ی پووشپەڕ ئەگەر هەلومەرجی شۆڕش و راپەڕین نەبێ هەلومەرجی رۆژی پێش راپەڕینە لە ئێران. "صدای پای انقلاب"یان دەبیست. من لەبیرمە چ بەنووسین، چ بە دانیشتنگەلێکی موفەسەل کە ئەو سەردەمە لەگەڵ چەپی ئێران کردمان، لەگەڵ بەشی زۆریان سنووربەندیمان هەبوو لەم بارەیەوە. ئێمە لە هەمان حاڵدا کە پێمان وا بوو بزووتنەوەی ١٨ی پووشپەڕی

خوێندکاران خاوەنی ئەهمیەتە، جێگەی پشتیوانییە، قۆناغێکی لە بزووتنەوەی سیاسی لە ئێراندا بڕیوە، بەڵام بە هەڵەیەکی گەورەمان دەزانی کە پێمان وابێ لە پشت ئەم بزووتنەوەیە راستەوخۆ و بەفەوری شۆڕشێك یان هەستانێکی جەماوەریی گەورە نوستووە. ئەوەش سەرچاوەکەی لەو تەحلیل و لێکدانەوەیەدا بوو کە کورتەیەکیمان پێشتر لێرە باس کرد. دیارە ئێمە بۆ خۆمان خوازیاری ئاڵوگۆڕی شۆڕشگێڕانەین، خوازیاری ئەو شێوە ئاڵوگۆڕی سیاسی لە ئێرانین کە بە بەشداریی سەربەخۆی چینی کرێکار و جەماوەری فراوانی ئێرانەوە، بەدوور لە دەست تێوەردانی ئیمپریالیستی و بە دوور لە کاریگەریی بورژوا لیبراڵەکان و، بەشێوەی هەستان و هاتنە مەیدانێکی جەماوەری ئەنجام بگرێت. ئەمە خواستی ئێمەیە و بۆشی تێدەکۆشین. بەڵام ئێمە تەشخیسی ئەو واقعییەتەمان دابوو کە ١٨ی پووشپەر و بەشوێنیدا بزووتنەوەکانی دیکەش هێچیان لەو ئاستەدا نەبوون.

لە راستیدا ئێمە بووین کە ئەو وەختە رامان گەیاند و گوتمان ئەهمیەتی بزووتنەوە جیاجیاکان دەبێ دەرك بکرێ و کار بۆ هەرکام لەو بزووتنەوانە بکرێ. ئێمە بووین گوتمان نابێ کۆمەڵگای ئێران تووشی ئەم دووڕیانە بکرێت کە یا شۆڕشێك دەکا کە فەورەن و راستەوخۆ ئەم رژیمە دەباتە ژێر پرسیارەوە و دەیرووخێنێت یان بەجارێك بێدەنگ دەمێنێتەوە. بەڵکوو دەبێ هەوڵ بدرێ بۆ گەشەدار کردن وڕێکخستنی بزووتنەوە جیاجیاکان، بزووتنەوە کرێکارییەکان، بزووتنەوەی ژنان، بزووتنەوەی خوێندکاران، بزووتنەوەی رووناکبیران، بزووتنەوەی نەتەوەکان و، هەموو ئەو بزووتنەوانەی دی کە لە ئێرانن. هەر کام لەو بزووتنەوانە رەنگ بێ بەتەنیایی لە توانایاندا نەبێ دروشمی رووخانی رژیم هەڵگرن، بەڵام هەر کام لەوانە جۆگە و رووبارێکن کە ئەگەر بیانخەینەوە سەریەك لافاوێکی گەورەی بزووتنەوەی سەرنگوونی لێدەکەوێتەوە. "رووخان یا هیچ" ناتوانی شیعاری ئەمڕۆی چەپی ئێران بێت. رووخان ئاسۆیەکە قەت نابێ لە بیربچێ و ئەوەش لە تەحلیلەکانی پێشووی ئێمەدا خۆی نیشان داوە. رژیمی کۆماری ئیسلامی بەرهەڵستی هەموو ئاڵوگۆڕێکی راستەقینەیە، بەرهەڵستی وەدی هاتنی هەموو عەدالەتێکی کۆمەڵایەتی و هەموو ئازادییەکی سیاسییە، بەڵام بە زانینی ئەوەش نابێ لە بیرمان بچێتەوە کە زۆر بزووتنەوەی بچووك بچووك هەن کە نە دەتوانن و نە تەنانەت مەسڵەحەتە کە سەربەخۆ دروشمی رووخانی رژیم هەڵگرن. خوێندکاران دەتوانن و دەبێ لە هەموو ئێران و لە کوردستانیش موتەشەکیل بن و خۆیان رێکخەن، بەبێ ئەوەی راستەوخۆ لە دێری هەوەڵی پێڕەوەکەیاندا دروشمی رووخان بنووسن. ژنان دەتوانن و دەبێ خواستەکانی خۆیان بێننە گۆڕێ و خۆیان رێك خەن بەبێ ئەوەی ئیلزامەن و سەراحەتەن لە رۆژی یەکەمەوە ئەو دروشمە هەڵگرن و هتاد.

کەسانێك کە ئەزموونیان لەگەڵ بزووتنەوەکان هەیە، بە رۆمانتیزمی شۆڕشگێڕانەوە تەماشای کۆمەڵگای بەشەری ناکەن، بەڵکوو لە رووی ماتریالیزمی مێژووییەوە و بە ئەزموونی خەباتی کۆمەڵایەتی و چینایەتی دنیاوە دەڕواننە کۆمەڵگای خۆشیان. ئەوان دەتوانن بزانن کە ئەز قەزا ئەم راستییە زیاتر لە هەمووان لەگەڵ بزووتنەوەی کرێکاری دێتەوە. هەزاران بزووتنەوەی کرێکاری هەن لەسەر لە هەقدەست، لەسەر بیمە، لەسەر سەعات کار، لەسەر بیهداشت، لەسەر مافی قەراردادی دەستەجەمعی، لە سەر مافی پێکهێنانی ئیتیحادییەی کرێکاری، تەنانەت لە سەر ئەوەی ئایا کرێکار پەرداخێك شیر لە رۆژدا بخواتەوە یان نا، لە سەر ئەوەی دەستێك جلی کارکردنی پێبدەن کە سلامەتییەکەی بپارێزێت. هەموو ئەو بزووتنەوانە بەدل و بەگیان بۆ هیزێکی وەکوو

٩

ئێمە قابیلی پشتیوانین. بەڵام هیچ کام لەوانە بە تەنیایی دروشمی رووخانی رژیم ناخەنە دەستووری خۆیان و ناشبێ بیخەنە دەستووری خۆیان، تاریخەن نەیانخستۆتە دەستووری خۆیان. بەڵام لە ئەنجامی گەشە کردنی هەموو ئەوانەدا و تەبدیل بوونی ئەوانە بە بزووتنەوەیەکی یەکگرتوو و فراوان دایە کە مەسەلەی رووخان و ئاڵوگۆڕ لە دەسەڵاتی سیاسیدا دەتوانێ و دەبێ وەکوو دروشمی رۆژ بێتە گۆڕێ. ئەو کەسەی کە ئەوڕۆ سادقانە کار دەکا بۆ ئەوەی کە یەکێتیی خوێندکاران لە کوردستان پێک بێ، ئەو کەسەی کە ئەوڕۆ کار دەکات بۆ پێکهێنانی سەندیکایەک یان کانوونێکی بچووکی کریکاری لە نێو کرێکارانی کوردستان یان ئێران، بە دڵنیاییەوە ئەو کەسە ئەگەر نەشیەوێ خزمەت دەکا و رێخۆشکەرە بۆ مەسەلەی رووخانی سبەێ رۆژ.

ئەمانە چاو پێداخشاندنێک بوون، سەرجەم بە هەستان و کەوتنی بزووتنەوەی ئیسلاحخوازیی دەوڵەتی، بە دەور و نەخشی لە کوردستان، بە ئاکامە ناوخۆیی و جیهانییەکانی شکانی ئەو رەوتە و،ئاماژەیەکیش بە مێتۆد و روانگەی سیاسی کۆمەڵە لە جەنگەی ئەو رووداوانەدا. بەڵام با بزانین بارودۆخی ئێستای ئێران چۆنە؟

هەروەکوو ئاماژەم پێکرد، ئێران حاڵی حازر خاوەنی هیچ مۆدێلێکی پەرەسەندنی ئابووریی بەردەوام نییە. زەرفییەتی بەرهەم هێنانی ئێران بە هیچ جۆر نەکەوتۆتە کار و لەو بارەیەوە هیچ ئاسۆییەکی روونیش لە ئارادا نییە. هێندێک جار بەتایبەتی لە ناو رۆژنامەکانی ئێراندا باس دەکرێت کە گۆیا مۆدێلی "چین" دەتوانێ لە ئیران پیادە بکرێ. با لێرەدا ئیشارەیەکی کورتیش بەمە بکەین. بۆئاگاداریتان لەم دواییانەدا "خانەی ئەحزاب"ێک لە ئێران دامەزراوە کە شتێکی زۆر کۆنەپەرەستانە و سەر بە محافیزەکارانە، ئەم خانەی ئەحزابە رایگەیاندووە و دەڵێ: ئێمە حیزبی کۆمۆنیستی چین بە دۆستی نزیکی خۆمان دەزانین و زۆر شت هەیە کە لەوان فێر ببین. پرسیار ئەوەیە کە ئایا ئیمکانی هەیە مۆدێلی چین لە ئێران پیادە بکرێت؟ من پێم وایە هیچ شانسێك بۆ پیادە کردنی ئەو مۆدێلە لە ئێرانی ئەمڕۆدا نییە. مۆدێلی چین مۆدێلی پەرەسەندنی بەردەوامە بۆ زیاتر لە دوو دەهە. چین تەنها ولاتی گۆی زەوییە کە نزیك دوو دەهەیە رێژەی گەشەی ئابوورییەکەی دوو رەقەمی یان نزیك بە دوو رەقەمی بووە. ولاتێکە کە لە ١٩٤٩وە تا ئێستا توانیویەتی، بەهەر هەڵسوکەوتێکەوە، ببێتە یەکێك لە دەسەڵاتە ئابووری و پیشەسازییەکانی گەورەی دنیا. بە دووری مەزانن رەقیبی ئەسڵی ئەمریکا لە ٢٠ ساڵی داهاتوودا نە ژاپۆن بێ، نە رووسیە و نە ئورووپا، بەڵکوو چین بێ. چین توانیویەتی بنەمایەکی سەنعەتی وەها گەورە پێك بێنێ کە لەنێو خۆیدا پیشکەوتووترین و مۆدێرنترین چەکی نیزامی بۆ زەرادخانەیەکی مەزنی کە هەیەتی بەرهەم بهێنێ. توانیویەتی مانگی دەستکرد بخاتە ئاسمانەوە، زۆرێك لەو تەلەڤیزیۆنە ساتەلایتانە کە ئێوە ئەوڕۆ دەیبینن، زۆرێك لەو مۆبایلانە کە سەرتاسەری دنیا لەوانە لە ئورووپاش کار دەکەن، سەر بە ساتەلایتی چینین کە بە کرێی دەدات بە خودی ئورووپاییەکان. چین توانیویەتی گەورەترین زێدەی ماڵی لە بازرگانی دوو لایەنە لەگەڵ ئەمریکا بە دەست بێنێ، ئەوەندە هەناردەی بۆ ئەمریکا زیاترە لە هاوردەی لە ئەمریکاوە کە فشاری بۆ ئەو ولاتە هێناوە. چین خاوەنی بنەمایەکی زانستیی بەهێزە، لە باری زانست و تەکنۆلۆژییەوە، لە باری زانستگەکان و کادری عیلمی و پسپۆڕەوە ئەسڵەن قابیلی موقایسە نییە لەگەڵ ولاتێکی وەکوو ئێران. لێرەدا مەبەستم ئەوە

نییە کە هیچ ئیعتیبارێکی ئایدئۆلۆژیکی بە چین ببەخشم یان دیفاعێکی سیاسی لێبکەم، من قسە لە مۆدێلی ئابووری دەکەم.

چین خاوەنی دەوڵەتێکی دیکتاتۆرییە، بەڵام دیکتاتۆرێکی ئیسلاحگەر بووە کە کۆمەڵگای چینی لە جەمزی دواکەوتوویی هێناوەتە دەرێ. لەوانەیە لە گەندەڵیش بێبەش نەبێ، بەڵام لە ١٩٤٩وە کە هاتە سەرکار سەرجەم بە هەموو عەیبەکانییەوە و بە فەسادێکیشەوە کە بوویێتی، دەوڵەتێکی کارامە بووە، دەوڵەتێکی بێسەروبەرە و بوودەڵە و گەندەڵ نییە. ئێران وڵاتی فرێن فرێنە، هەر کەسە گیرفانی خۆی پڕ دەکا، هەر مەلایەک لەلایەک خەریکی دزییە، هیچ کام لە رووحانییەتی دەسەڵاتداری ئێران دڵسۆزی ئاوەدان کردنەوەی نیشتمانەکەی خۆی نییە، هیچکامیان خاوەنی هەستی بەرژەوندی میللی نییە، بەو مانایە کە حیزبی کۆمۆنیستی چین هەیەتی. جا مەوقعییەتی ئێونەتەوەییشی بۆ ئامادە نییە، جا هێز و دەسەڵاتی چینیشی نییە. زۆری لە سەر ناڕۆم، خەیاڵم هەیە بڵێم ئەو موقایەسەیە لەنێوان چین و ئێران بێجگە لە قسەیەک کە بە ئەنقەست دەیخەنە سەر زمانان بۆ ئەوەی تەرەفدارانی خۆیانی بەینێک پێ‌ڕاگرن، هیچ شتێکی دیکە نییە. ڕژیمی کۆماری ئیسلامی بە هۆی ئەوەی ساختاری سیاسییەکەی نەگونجاوە، بە دەلیلی بێقانوونی و تێکەولێکەیەکی کە بە سەریدا زاڵە، بەهۆی گەندەڵی و رانتخۆری، بەهۆی ئەوەی نەیتوانیوە خۆی لەگەڵ پێداویستییەکانی ئابووریی ئەمڕۆی جیهانی بگونجێنێ، یان بەگشتی باروودۆخی جیهانی وای کردووە، یان لەبەر هەر هۆیەکی دیکە بێت، بە هیچ جۆرێک نەیتوانیوە پەرەسەندنی ئابووری برەخسێنێت.

ئەنجامەی ئەم وەزعە چییە؟ ئەوەی کە هەژارییەکی ئێکجار زۆر کۆمەڵگای ئێرانی دا گرتووە، بە قسەی یەکێک لە کارشناسان ٢١ میلیۆن نەفەر لە ئێران لە ژێر خەتی هەژاریدا دەژین. ئەو رەقەمە دەقیق بێ یا نا، بەڵام هیچ گومانێک لەوە داننییە میلیۆنەها نەفەر لە ئێران بەراستی لە ژێر خەتی هەژاریدا دەژین. بێکارییەکی فراوان لە ئێران لە ئارادایە. ئابووریی ئێران، ئابوورییەکی رانتخۆر و مشەخۆر و ئەنگەلە کە لە سەر ئەساسی دەسەڵاتی مافیایی رووحانییەت و دارو دەستەکەی دامەزراوە. تەنیا کافییە بڕواننە "بونیاد"گەلێکی ئابووری کە لە ئێران هەن و ببینن چلۆن دەزگای مافیایی رووحانییەتی دەسەڵاتدار لە ئێران وەکوو هەشتپێ چنگی خستۆتە نێو داهات و دەرامەتی ئێرانەوە و چون بە شێوەیەکی بانیاسایی، بەبێ جواب دانەوە بە دەوڵەت، بەبێ جواب دانەوە بە دامەزراوەکانی حیسابرەسیی گشتی، بەبێ هیچ شەفافییەتێکی مالی و حیسابداری، بەبێ ئەوەی تەنانەت لە بەرامبەر پارلەمان و مەجلیسی ئێرانیدا وەڵامدەرەوە بن، دەستیان بە سەر ئابووریی ئێران داگرتووە و بە ئیختیلاسی نجوومی گیرفانیان پڕ دەکەن. لە ئەنجامی ئەو وەزعە دایە کە لەش فرۆشی، چەوسانەوەی منداڵان، تەنانەت فرۆشتن و سادر کردنی منداڵان، کچان و کوڕانی نەوجەوان، ئیعتیاد، جینایەت و خەلافکاری، گەندەڵیی ئیداری و بەرتیل خۆری لە ئێران بێداد دەکا. ئێران، کۆمەڵگەیەکە نوقم لە فەساد و گەندەڵیدا.

هەر لێرەدا با قەوسێک یان پەرانتێزێکیش بکەمەوە و بڵێم لیبراڵەکانی ناو دەسەڵات و دەرەوەی ئێران، بەتایبەتی بەشێکی دیاریکراو لە ئیسلاحخوازانی دەوڵەتی، لەم بارەیەوە زۆر بۆ حاڵی خۆیان رۆشن بوون. ئەوان سەرچاوەی نەبوونی گەشەی ئابوورییان بەوە دەزانی کە بە ئەندازەی پێویست کرێکارانی ئێران فشاریان بۆ

نەهاتووە، هێشتا بەدڵی ئەوان کرێکارانی کارگەکانی ٥ نەفەری و ١٠نەفەری لە شموولی قانوونی کار نەچوونە دەرێ، بە ئەندازەی پێویست رێگە خۆش نەکراوە بو ورروودی سەرمایەی دەرەوە.

دیارە ئەم وەزعە کاریگەری لە سەر چینی کرێکاری ئێرانیش داناوە. شارەکان لە ئێران پەرەیەکی یەکجار زۆریان سەندووە، رێژەی جەمعییەتی شارنشین لە ئێران بەرادەیەکی ئێکجار زۆر لەچاو ٢٥ساڵ لەوە پێش چۆتە سەرێ. رەنگە لە ساڵی ١٣٨٥ کە ئامارگیری لە هەموو وڵات دەکرێت، ئەم دیاردەیە بەبێ گومان بە عەدەد و رەقەمیش نیشان بدرێت. بەڵام سەرەڕای ئەوەیکە میلیۆنەها جووت دەست کە ئامادەن بۆ کارکردن و هیچ سەرچاوەیەکی مادییان بێجگە لە فرۆشتنی هێزی مێشك و لەش و بازوویان نییە، بە هێزی کاری ئیزافە بووە، بەڵام بە هەموو ئەوانەشەوە ئەم نەبوونی و هەژارییە ئێکجار زۆرە و ئەم بێ‌رەونەقی و پەك کەوتوویی بەرهەم هێنان لە ئێراندا کاری کردۆتە سەر چینی کرێکاری ئێران کە لە بوواری بەرهەم هێناندا رێکخراو نەبێت. هێشتا ئەو چینە کرێکارە رێکخراوە سەنعەتییەی کە بتوانێ بێتە مەیدان و مۆری خۆی لە رووداوە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکانی ئەم کۆمەڵگەیە بدات نەهاتۆتە ئاراوە.

بزووتنەوەی کرێکاری لەم دەورییەدا، ئەو جۆرەی کە ئامارەکان نیشانی دەدەن، روو لە زیاد بوونە، روو لە کز بوون نییە. بزووتنەوەیەکی فراوان و بە ژمارە زۆرن، بە داخواز زۆرن، بەڵام نە داخوازییەکانیان ئێستا لە ئاستی دیفاعی ترازاوە و نە یەککگرتووییەکی سەراسەرییان بەخۆوە گرتووە و لە ئەنجامی ئەو دووانەدا دیارە نەیانتوانیوە بێن بە مەیدانداری سەرەکی لە شانۆی خەباتی سیاسی و چینایەتی لە ئێراندا. ئەمە کەموکووڕییەکی گەورەیە و جێی خۆیەتی کە کۆمەڵە لێرەوە بانگەواز بکا لە هەموو هەڵسووڕاوانی کرێکاری لە ئێران و هەروەها لە کوردستانیش، لە هەموو ئەوانەی کە لەو بووارەدا تێدەکۆشن و خەمخۆرن، بۆ ئەوەی هەوڵێکی زۆرتر بدەن بۆ یەککگرتوویی و بۆ رێکخستنی چینی کرێکار.

هەر لەسەر باسی هەل‌ومەرجی سیاسی ئێستای ئێران، پێویستە ئاماژە بەدیاردەیەك بکەین کە دوای هاتنە سەر کاری مەجلیسی حەوتەم، لەراستیدا ئێمە شاهیدی دەورەیەك لە رکوودی نیسبی بزووتنەوەین لە ئێران. نەك بەو مانایە کە بزووتنەوە لە ئێران خەوتبێ. بەڵام ئەو رادەیە دەنگ و سەدای ئیعترازی سیاسی و رۆژنامەگەری کە لە مانگەکانی پێش مەجلیسی حەوتەمدا هەبوو، ئێستا تۆزێك نیشتۆتەوە. بەڵام بە لەبەر چاو گرتنی هەموو ئەو لێکدانەوەیەی کە پێشتر باسمان کرد، بە لەبەر چاو گرتنی ئەو ئاڵوگۆڕانەی کە لە ساڵانی رابوردوو لە ئێراندا هاتۆتە دی و ئەو داخوازییانەی کە تازە دانامرکێنەوە، بەو زعفەی کە رژیمی کۆماری ئیسلامی تووشیەتی و بەو فشارە جیهانییە کە لەسەریەتی، زۆر دەگونجێ کە ئەوە بێدەنگیی پێش تۆفان بێت و هیوا دارین واشبێ. تەنانەت ئەگەر دامرکانەوەیەکی کورتیش بێتە ئاراوە، ئێران تازە ناچێتەوە جێی جاران. هەموو رۆژهەڵاتی ناوەڕاست، بەتایبەتی ئێران و کوردستان، لە بەردەم گۆڕانکارییەکی گەورەدان. شەپۆلی گەورەی بزووتنەوەی رووخاندنی دەسەڵات نەکەوتۆتە رێ، بەڵام هەموو داخوازییەکان، هەموو مەرجەکانی دەست پێکردنی ئەو بزووتنەوەیە لە ئێران وجوودی هەیە.

١٢

ئەگەر بێینە سەر وەزعی ئێستای کوردستان پێویستە تایبەتمەندییەکانی لەبەرچاو بگرین. لە پاڵ ئەوەدا کە کوردستان بەشدارە و بەشێکە لەو وەزعە گشتییە کە باسمان کرد، بەڵام هەروەکوو دواتریش باسی دەکەم، ئەو دامرکانەوەیە لە کوردستان نابیندرێ. کوردستان لە نەهەماتی و گرفتەکاندا بەشدارە و لە هێندێك لەواندا بە فراوانییەکی زۆرتریش، مەسەلەن بۆ نموونە لە ئیعتیاددا، مەسەلەن لە سەرکوتی سیاسیدا کە هەموومان دەزانین کوردستان تەنها بەشێکی ئێرانە کە هێشتا ئیعدامی سیاسی تێیدا بەرێوە دەچێت و هێشتا دەزگا داپڵۆسێنەرەکان و دەزگا ئیتیلاعاتییەکان بە سەر هەموو ئیهادێکی مەدەنیدا زاڵن، یان بۆ نموونە تەنانەت ئەو ئەندازە ئازادییە رۆژنامەگەرییە بەرتەسکەش کە لە ئێران هەیە ئەوەش نادرێ بە کوردستان، ئەو ئەندازە رێکخراوی بچووك و ئێن.جی.ئۆ.کان کە لە تاران ئیجازە دەدرێن، لە کوردستان ئیجازە نادرێ. ئەمانە بەشێك لە تایبەتمەندییەکانی کوردستانن، بەڵام تایبەتمەندییەکان هەر مەنفی نین، هەر ئەوە نین کە لە سەرەوەرا چ مافێك لە خەڵکی زەوت دەکەن یا چ ستەمێکی زیاتر و فراوانتریان بەسەردا دەسەپێنن. تایبەتمەندیی گرینگتر لەوانەش هەیە، ئەویش ئەوەیە کە کوردستان خۆی هەڵپێوەتەوە و خەباتکارانەتر هاتۆتە مەیدان. بۆ ئەوەی نموونەیەك لەو جۆرە تایبەتمەندییە دەرخەین، ئیشارە بە هەڵبژاردنەکانی مەجلیسی حەوتەم و فەرقی ئەو هەڵبژاردنانە لە ئێران و کوردستان دەکەین.

هەڵبژاردنەکانی مەجلیسی حەوتەم لە کوردستان دوو فەرقیان لەگەڵ هی ئێران هەبوو: یەکیان فەرقی کەمی یان چەندایەتی بوو، ئەوەی دیکەیان جیاوازیی کەیفی یان چۆنایەتی بوو. لە چەندایەتیدا کوردستان فەرقی هەبوو بەو حیسابەی کە خەڵك بە رێژەیەکی زۆر زۆر کەمتر لە ئاستی سەراسەری ئێران بەشدارییان لە هەڵبژاردندا کرد. ئەم بەشداری نەکردنە بەرچاو و جەماوەرییە لە هەڵبژاردنی مەجلیسی حەوتەم لە کوردستاندا، هەروەك باسم کرد، رێفراندۆمێکی نەویستن و رەت کردنەوەی کۆماری ئیسلامی ئێران بوو، رێفراندۆمێك بوو کە خەڵکی کورد تێیدا بوونی خۆیان و پێناسەی سیاسیی خۆیان نیشاندا. بەڵام بێجگە لەوە خاڵێکی دیکەش هەبوو کە ئەویش جیاوازیی کەیفی یان چۆنایەتی کوردستان لەگەڵ باقی ئێران بوو. هەروەکوو لە رکوودی نیسبی دوای هەڵبژاردنیش دەرکەوت، لە باقی ئێران بەشداری نەکردن لە هەڵبژاردنی مەجلیسی حەوتەم بە مانای دڵ ساردبوونەوەی خەڵك بوو، بە مانای رادەیەك بێئۆمێد بوونیان لە ئاڵوگۆڕ بوو، چونکە ئەوان زۆرتر ئۆمێدیان بە ئیسلاحخوازانی دەوڵەتی بەستبوو، ئاڵتێرناتیڤێکی دیکە لە بەردەمیان نەبوو، بەمانای رادەیەك بێتەفاوەتیی سیاسی و بێزاری خەڵك لە هەموان بوو. خەڵك چوونەوە ماڵێ و رەئیان نەدا.

لە کوردستان بە پێچەوانە بوو. لە کوردستان بزووتنەوەیەکی بەشداری نەکردن لە مەجلیسی حەوتەم لەنێو خەڵکدا کەوتە رێ. تەحریمی هەڵبژاردن لە کوردستان، بەرهەمی بزووتنەوەیەکی ئەکتیڤ بوو نەك لە رووی پاسیڤیتە و پاڵ دانەوە و چوونەوە ماڵ و بێتەفاوەتی سیاسییەوە. تێکۆشەرانی کوردستان بەگەرم و گوڕی شاڵاوی تەحریمیان خستە رێ، هەڵمەتیان دروست کرد، هەڵمەتی بەشداری نەکردن. ئەوانەی کە لێرە بە سەری داپۆشراوەوە لە ئاومان دانیشتوون، باشتر دەزانن و خۆیان بەشێك لەو تێکۆشەرانی کۆمەڵەن کە شانازیی ئەوەیان هەیە کە بە هەزارانیان لە گەرەك و شوێنی کار و خوێندنگاکانی کوردستان، لە شار و لادێ، کەوتنە گەڕ، ماڵ بە ماڵ، شوێن بە شوێن، دێ بە دێ خەڵکیان تێگەیاند. دیارە ئەو کارەی ئەوان زەمینەی هەبوو. هیچ کەس

ناتوانێ سیاسەتێك بە سەرکەوتوویی ڕەچاو بکا ئەگەر زەمینەی گونجاو و لەباری نەبێ، بەڵام لە سەر ئەساسی زەمینەی لەبار تێکۆشانێکی گەورەی سیاسی کرا. ناشڵێم تەنها هەر کۆمەڵە کردی. بەحەقیقەت بەشی پێشڕەو و تێکۆشەری کۆمەڵگای کوردستان کەوتە گەڕ بۆ ئەوەی هیچ کەس دەنگ نەدا. هەموو کەس خۆی بە هەڵسووڕاوی ئەو بزووتنەوەیە دەزانی. ڕێك هەر بۆیەش بوو کە خەڵك بەشداری نەکردن لەو هەڵبژاردنەیان بە سەرکەوتنی خۆیان زانی. بەراستیش ئەو بەشداری نەکردنە سەرکەوتنی ئەوان بوو بە سەر کۆماری ئیسلامیدا. هی خانەنشینیی سیاسی خەڵك نەبوو، بەڵکوو مەحەکی زیندوو بوونیان بوو، دیارگەی سەرکەوتنی ئەوان بوو، هەموو کەس لە دڵی خۆیدا دەیگوت: جمهووری ئیسلامی ویستی بیکا، ئێمە نەمانهێشت، پاشەکشەمان پێکرد. ئەمە بوو جیاوازیی جۆنایەتی لە بەشداری نەکردن لە هەڵبژاردندا.

هەر ئەم حاڵەتەش بوو لە کوردستان کە وای کرد بە دوای هەڵبژاردنی مەجلیسدا خەڵك لەو تەحریمە بەرینە ورە بەدەست بێنن. نەك هەر سارد نەبوونەوە و خاو نەبوونەوە، بەڵکوو دڕتر بوون بەرامبەر بە حکوومەت، چەرخی بزووتنەوەکان خێراتر کەوتە گەڕ. بە شوێن ئەو بزووتنەوەیە دایە کە ئێمە دەبینین مەجلیسی پرسە و سەرە خۆشی وەها دادەنرێت بۆ قوربانیانی هەولێر و دواتر لە ڕۆژی ٨ ی مارس بە بۆنەی پەسەند کرانی یاسای کاتیی بەڕێوە بردنی حکوومەتی عێراق و سەلماندنی فێدراڵی بۆ کوردستانی عێراق بزووتنەوەیەکی وەها گەورە لە سەرتاسەری کوردستانی ئێران ڕوو دەدات.

هاوڕێیان، بەگشتی کوردستان لە دەورەیەکی ڕوو لە جموجۆڵی سیاسی دایە، دیارە ئەوەش ئەرکی تایبەتی لە ئێمە دەوێ. سەرهەڵدان و زیاد بوونی بزووتنەوەکان یەکێك لە دیارگەکانی ئەو جم و جۆڵەیە. بزووتنەوە جەماوەرییەکان و خۆپیشاندانەکانی نەورۆز، کە لە چەند ساڵێك لەوە پێشەوە یەکەم جار لە مەریوان سەری هەڵدا و دواتر هەموو شوێنەکانی دیکەی گرتۆتەوە، یەك لەوانەن. کۆمەڵە زۆر بەزوویی بەرپا کردنی مەراسیمەکانی نەورۆزی کرد بە بەشێك لە تێکۆشانی خۆی و هەوڵی بۆ دا و خۆی کرد بە خاوەنی ئەو بزووتنەوەیە، من ناڵێم تاکە خاوەن، بەڵام بێگومان چالاکترین حیزبێکە کە بۆ ئەو بزووتنەوەیە تێکۆشاوە و هاتۆتە مەیدان. هەر لە جەژنە جەماوەرییەکانی نەورۆزەوە بگرە تا مەراسیمەکانی ٢٦ی ڕێبەندان، کە بە قسەی یەکێك لە هاوڕێیانمان "ڕۆژی نەتەوەیی جەوساوەکانی کوردستان"ە، هەر لەوانەوە هەتا ڕۆژی کرێکار و ئەو بزووتنەوانەی کە لەم دواییەدا لە تەوەرەی ڕۆژی کرێکاردا لە کوردستان بەڕێوە چوو، کە بۆ ئێمە جێگای ڕێز و خۆشحاڵی و پشتیوانییە، هەتا ڕۆژی ٨ی مارس کە ئەگەر چی نەکرا خۆپیشاندانی گەورەی تێدا بکرێ بەڵام کۆڕی فەرهەنگی و سیاسی ڕۆشنبیران و هەڵسووڕاوانی ئەو بووارە پێك هات، ئەوانە هەموو نیشانەگەلێکن لەو جموجۆڵە سیاسییە.

لە کوردستانی ئەوڕۆ، هەروەکوو بارەها باسمان کردووە، بزووتنەوەیەکی ڕۆشنبیریی فراوان لە ئارا دایە. ئێمە هەوەڵ حیزب بووین لە کوردستان، بەدوای جیابوونەوە لە حیزبی کۆمۆنیستی ئێران، کە ئاماژەمان بە بزووتنەوەی نوێی ڕۆشنبیری لە کوردستان کرد، پێمان زانی و بەپیرییەوە چووین و لەگەڵی تێکەڵ بووین. ئێمە نە ئەومەندە پەرت و لەپەراوێزدا بووین و نە ئەوەندەش ناتێگەیشتوو و پاوانخواز بووین کە ئەو بزووتنەوەیە بدەینە پاڵ کۆماری ئیسلامی و بڵێین ئەمە فیتێکی دیکەی خاتەمییە بۆ بەلاڕێ دابردنی بزووتنەوەی کورد.

بێگومـان لـە بزووتنـەوەی رۆشـنبیریدا، وەکـوو هـەموو بزووتنەوەیـەکی دیکـە، کۆمـاری ئیـسلامی هـەوڵ دەدا عەوامیلی خۆی دانێ. ئەگەریش عەوامیلی خـۆی نـەبن هـەوڵ دەدا ئەو رەوتانە بەهێز کا کە سەرەنجام بە قازانجی خـۆی دەبینـن، بـەڵام کوێرییـەکی سیاسـی دەوێ تـا ئینـسان نـەبینێ کـە ئـەم بزووتنـەوە رۆشـنبیرییە لـە قـووڵایی کۆمـەڵگای کوردستانەوە هەستاوە و نیشانەی گەشە کردنیـەتی. لـە سـاڵانێکی دوور و درێـژ، دوای ئـەوەی هێـزی چـەکداری حیزبـە سیاسـییەکان شـکان و پاشەکـشەیان پێکـرا و دیکتاتۆرییـەکی رەشـی ١٥ سـاڵە داسـەپا، ئـەو بزووتنـەوە رۆشـنبیرییە تارادەیـەکی زۆر بۆشایی نەبوونی چالاکیی حیزبە سیاسییەکانی پڕ کردەوە. هەڵبەت بە نوختەی موسبەت و خاڵی مەنفی خۆشییەوە.

رۆژنامەگەری لـە کوردستانی ئێران زیادی کـردووە، دەیان رۆژنامـەی خوێنـدکاری بە کـوردی لـە زانستگا و لـە شـارەکانی کوردسـتانی ئێـران و لـەنێو خوێنـدکارە کوردەکـانی شـارەکانی ئێـران پێـك هـاتووە، ئەمـەش شـتێکی چـکۆلە نییە. تەنانـەت رۆژنامـەی تـریش هاتۆتـە ئـاراوە. ئەمـە نیـشانەی ئەوەیـە ئـەو کۆمەڵگایـە پێویـستیەتی و شیاوییەتی کە ببینێ، ئەوەنـدەی پێچیدەگی و تـەکامول لـە دەروونـی خۆیـدا پەیدا کـردووە کـە شیاوی ئەوەیـە کـە شتی ئاوای تێدا هەبێ. لە کوردسـتانی ئـەورۆ سـەرەتایەك بۆئێن.جی.ئۆ.کـان دامـەزراوە، ئـەوەش دیاردەیەکی زۆر نـوێ و هیوابەخـشە و ئێمـە لـە چـەند ساڵی رابوردوودا پـشتیوانیمان لێکـردوون و دەبـێ لـەم کۆنگرەیەشـدا لەسـەر داکۆکی کردن لە خەباتی ئێن.جی.ئۆکان پێداگری بکەینەوە.

وەختـی خـۆی لـە دەمـەی چل و پـەنجای هـەتاویدا ئیـسلاحاتێکی گـەورە، ئەگـەر وای نـاو بنێین، یـان گـۆڕانێکی گەورە لە کۆمەڵگای ئێراندا پێك هات. لە ژێـر تەئسیری پێویستییەکانی سەرمایەداریی جیهانی و لـە ژێـر تەئسیری پێویستییە سیاسییەکانی دەوڵـەتی ئـەو کـاتی ئـەمریکادا، رژیمـی شـا مـەجبوور بـوو بـۆ ئـەوەی مەوقعییـەتی خـۆی رابگـرێ دەسـت بداتـە ئیـسلاحاتی ئەرزییـەوە. رژیمێـك کـە لـە سەرتاسـەری دەورەی پەهلـەوی یەکـەم و نیـوەی هـەوەڵی سـەڵتەنەتی پەهلەوی دووهەمـدا، رژیمـی بـورژوازی و خـاوەن مڵکـەکان بـوو، لـە دەهـەی ٤٠ و ٥٠دا نیزامـی دەرەبەگایەتی لە ئێران هەڵوەشاندەوە، نـە بەشێوەیەکی شۆڕشگێڕانە، نـە بەشێوەی بزووتنەوەیەکی جەماوەری لـە خـوارەوە، نـە بەشـێوەیەکی دادپەروەرانـە و بەئینـسافانە، بـەڵام بـە هـەر حـاڵ ئـەو جـۆرەی کـە پێویـستیی ئـەو سـەردەمەی سـەرمایەداری بـوو هەڵیوەشـاندەوە. کۆمـەڵگای ئێـران و بـەوەوە کۆمـەڵگای کوردسـتان تووشـی گۆڕانێکی گەورە بوون. ناچمە ناو تاریخەوە، تەمامە نەتیجەیەکی لێبگرم، ئـەویش ئەوەیە ئەو ئاڵوگۆڕانە بوو کە زەمینـە کۆمەڵایەتییەکانی بە کۆمەڵەی شۆڕشـگێڕ بەخـشی. ئێمـە هەمیشە دەمانتوانی گرووپێکی مارکسیـستی موتەعەمیدی تێکۆشـەر بین و بووشـین لـە دەورەی کـاری نهێنیدا. چ شـتێك ئیمکـانی بە ئێمـە دا بـبین بـەهێزێکی جەماوەری، بە حیزبێکی گـەورەی مونـافیس و رەقیبـی رەوتـە ناسـراوە خـاوەن پێشینەکان؟ ئێمە بە بەهای تازەوە، بە مەفاهیمی نوێ و بە شێوەکاری تازەوە هاتینە مەیدان کە زۆر جار بۆ کۆمەڵگای سوننەتیی کوردستان نائاشنا بـوون، ئـەی بـە هـەموو ئەوانـەوە چـی رێگـەی بـە ئێمـەدا بـبین بـەو حیزبـە جەماوەرییـە؟ رووخـانی سـاختاری دەرەبەگایـەتی، سـەرهەڵدانی شارنـشینی، سـەرهەڵدانی چـینی کرێکـار لـە کوردسـتان، جـەماوەری بوونـەوەی خوێندەواری لـە کوردستان، ئـەم چەشـنە ئاڵوگۆڕانە بوون کە رێگایـان بۆ ئێمـە کردەوە، زەمینـەیان خـۆش کـرد بۆ ئەوەی نەسڵێکی نوێ کە نە لە حاست نەسڵی کۆنتری خۆیاندا، نـە لـە حاسـت سـوننەت و رێبازە کۆنـەکان و نـە لـە



حاست دەسەڵاتداراندا سەر داخەر و ترسنۆك نین بێتە ئاراوە، ئەوانە بوون کە هاتنە پاڵ ئێمە و پێگەی کۆمەڵایەتیی کۆمەڵەیان پێك هێنا.

تەمامە شتێکی دیکەی پێ زیاد کەم. تەمامە بڵێم کە لە دەورەی ٢٥ساڵەی کۆماری ئیسلامی ئێراندا، سەرەڕای نەبوونی پەرەسەندنێکی ئابووری ئەوتۆ و سەرەڕای هەموو ئەو دواکەوتووییەی کە سەرجەم لە ئێراندا هەیە و لە کوردستان بە گوێرەی سیاسەتێکی تەبعیز و هەڵاواردن زیاتریش بە سەر خەڵکدا سەپاوە، بەڵام بە هەموو ئەوانەشەوە، لە دوو دەهەی رابوردوودا شارنشینی لە کوردستان پەرەی زۆری سەندووە. کۆمەڵگای ئێران و بە تایبەتی کوردستان کە ئێستا جێگەی باسی منە، کۆمەڵگایەکی عومدەتەن شارییە، نەك هەر بەحیسابی رێژەی دانیشتووان، بەڵکوو بە فەرهەنگ. ئێستا شارەکان مەرکەزی سیاسەتن، ئەوە بۆ بێبایەخ کردنی دێهاتەکان نییە، بەڵکوو دەمەوێ نیشانی بدەم کە چلۆن کوردستان لە سەردەمی کۆمەڵگای سوننەتییەوە خەریکە تێپەڕ بکا بۆ کۆمەڵگایەکی مۆدێرن، یا ئەگەر تۆزێك بەپارێزەوە قسە بکەین و هەلومەرجی جیهانی سێهەم لە بەر چاوبگرین، بە کۆمەڵگایەکی پێشن مۆدێرن یا نیوە مۆدێرن، بە کۆمەڵگایەك کە تێیدا ساختارگەلی کۆن رووخاون یان خەریکن دەڕووخێن. گەر چی کارگە و کارخانە و شوێنی بەرهەم هێنانی گەورە نەبوون کە ئەو هەموو هێزە کارە ئازاد کراوە لە کوردستان جەزب کەن بۆ لای خۆیان، بەڵام لە هەر حاڵدا ژمارە و رێژەی ئەو کەسانەی کە لە رێگای فرۆشتنی هێزی کاریانەوە گوزەران دەکەن روو لە زیاد بوونە. مەبەستیشم تەنیا ئەو کەسانە نییە کە کاری سەختی بەدەنی دەکەن، بەڵکوو هەموو ئەو کەسانەیە کە هێزی مێشك و لەشیان دەفرۆشن، بە موعەلیمانەوە، بە بەشێکی زۆر لە کارمەندانەوە، بە کارگەرانی شیرکەتە بازرگانییەکانەوە، بە کرێکارانی بەشی خەدەماتەوە و دیارە بە کرێکارانی دەستکار لە شار و لادێکانەوە. ئەوانە ژمارەی هەرە زۆری دانیشتوانی کوردستان پێك دێنن و بۆیەشە لە باسی ئەرکەکاندا دەتوانین بڵێین لە دەورەی داهاتوو هەوڵ دانی هەڵسووڕاوانی کرێکاری لە کوردستان، هەروەها هەڵسووڕاوانی کۆمەڵە کە لەو بووارەدا کار دەکەن، بۆ پێك هێنانی یەکیەتییە کرێکارییەکان شتێکی خەیاڵی نییە، نامومکین نییە.

بێجگە لەوە، لە دوو دەهەی رابوردوو بەتایبەت لە ساڵانی رابوردوودا ئێمە شاهیدی هاتنە کایەی زۆرتری ژنانین. راستە ئێران وڵاتی ئاپارتایدی جینسییە، بەڵام گۆڕانی جیهانی و گەشەی نێوخۆی کۆمەڵگای ئێران و بەرز بوونەوەی ئاستی فەرهەنگی خەڵك، بەناچار و بەپێچەوانەی هەموو یاسا کۆنەپەرستانەکانی کۆماری ئیسلامی، نەقشی ژنانی لە جاران زیاتر کردووە. بەڵێ، راستە دیاردەی کۆن، دیاردەی کۆنەپەرستانە، بێدەرەتانیی ژنان و خۆسووتاندن، ئەوانەش هەن کە لە لایەن هێزێکی وەکوو کۆمەڵەوە دەبێ ئیفشا بکرێ، دەبێ دژی بوەستینەوە، هەموو تێکۆشەرانی کۆمەڵە، هەموو کەسێکی پێشکەوتنخواز لە کوردستان، دەبێ ئەو کارە بکا ودەبێ لە بوواری خەباتی ژنان هەول بدا. ئەگەر رژیمێکی دێمۆکراتیك لە ئارادا بووایە، رژیمێکی خەڵکی لەسەر کار بووایە، ئەگەر پەرەسەندنی ئابووری باشتر بووایە، ئەگەر قانوونی پێشکەوتنخوازانە هەبووایە، ژنانی کوردستان ئێستا لە جێگایەکی دیکە بوون، بەڵام هەر بەم وەزعەشەوە، بە هەموو ئەم تەحمیلانەوە و بە هەموو ئەو بێمافی و بێبەشیانەشەوە، نەقشی کۆمەڵایەتیی ژن لە کۆمەڵگای کوردستان، تەنانەت لە خانەوادەکانیش، زیادی کردووە.

لە دەمەی چل و پەنجای هەتاوی‌دا خوێندەواری لە چوارچێوەی نوخبەگان، ئەریستۆکراتەکان و بنەماڵە زۆر دەوڵەمەندەکان هاتە دەرێ و چووە ناو جەماوەرەوە. لەم بیست ساڵەی دواییدا شەپۆلێکی گەورەی دیکە لە خوێندەواری پێک هاتووە. نزمترین و هەژارترین توێژەکانی کۆمەڵگای ئێرانیش بە هەموو بێبەشییەکانیانەوە ئەولادیان ناردووە بۆ خوێندن و ئەوانن کە بەشێکی زۆری خوێندەواران پێک دێنن. راستە بەشی زۆریان بەداخەوە جێگەیەکیان بۆ ئیشتغاڵ نییە، بەڵام بە هەر حاڵ خوێندەوارن. دیاردەی خوێندکاران لە کوردستان هەرگیز ئەوەندە فراوان نەبووە. هەر ئەوەش ئەو ئیمکانەمان پێ‌دەدا کە بڵێین بزووتنەوەی خوێندکاری لە کوردستان ئەگەریش تەواو شکڵی نەگرتبێ چرۆی داوە. جێی خۆیەتی کە لە سەر بزووتنەوەی خوێندکاران کار بکرێ.

رووخانی کۆمەڵگای سوننەتی و باوك سالاری و رۆیشتن بەرەو کۆمەڵگایەکی پێشکەوتووتر، پیچیدەتر، بەفەرهەنگتر، بەڵام لە هەمان حاڵدا وەکوو هەموو کۆمەڵگایەکی سەرمایەداری پڕ لە ئاڵۆزیتر و ناکۆکتر، ئەو پرۆسەیە بووە کە لە کوردستانی ئێران بەڕێوە بووە. ۲۵ ساڵی رابوردوو ئەم رەوتە قووڵتر بۆتەوە و بە تایبەتی لە دەمەی رابوردوودا پەرەی سەندووە. ئێستا کۆمەڵگای کوردستان چیدی ئەو کۆمەڵگا سادە و ساکارە شوانکارەییە نییە کە جاران بوو. دیسان دەڵێم هەر بۆیەشە شیعاری پلورالیزم و فرەچەشنیی سیاسی و فەرهەنگی کە کۆمەڵە لە دێرزەمانەوە خوازیاری بووە، جا بە زمانی جیاوازەوە، ئەمڕۆیە کە بە مەعنای واقیعی خۆی بنەمای ئابووری و کۆمەڵایەتی پەیدا کردووە. فرەچەشنی تازە بۆتە حەقیقەتێك ناتوانی خۆتی لێ لادەی. لە کۆمەڵگایەکی سادەی شوانکارەیی‌دا، لە کۆمەڵگایەکی مۆنۆلیتی ساکاردا، یەکدەنگی بەرقەرارە. رەهبەرییەکی کاریزمایی و عەشیرەتی و تایفەیی دەتوانێ کار بکا. خۆشبەختانە ئەوانە لە کوردستاندا جێگەیان پی لەق بووە و پێ لێژ بووە.

هەموو ئەوانە ئەتیجەیەك بۆ ئێمە دەبەخشێت، کە دواتر لە بەشەکانی دیکەی باسەکانی ئەم کۆنگرەیە دەتوانین پشتی پێببەستین، ئەویش ئەمەیە: ئەم ئاڵوگۆڕانە، زەمینەی زیاتریان بۆ کۆمەڵە فەراهەم کردووە. کێیە ئەو حیزبەی کە پاوانخواز نییە و لەگەڵ پلورالیزمی سیاسی و رۆشنبیرییە؟ کێیە ئەو حیزبەی کە لەگەڵ مۆدێرنیزم و نوێخوازییە؟ کێیە ئەو حیزبەی لەگەڵ خوێندکاران و نەسلی نوێ دەخوێنێتەوە و دەتوانێ ئەوان رازی بکا؟ بە رادیکاڵیزمیانەوە و بە پێشکەوتنخوازیی فیکرییانەوە؟ کێیە ئەو حیزبەی دەتوانێ پڕاوپڕ و زیاتر لە هەموو رەوتێکی دیکە لەگەڵ مافی ژنان بێتەوە و کاری لەسەر بکا لە کۆمەڵگای کوردستان؟ کێیە کە لەگەڵ فراوان بوونی چینی کرێکار، ئەوانەی هێزی لەش و مێشك و بازوویان دەفرۆشن، سازگارە و لە گەشە کردنی ئەوان گەشە دەکا؟ ئەم حیزبە کێی دیکەیە بێجگە لە کۆمەڵە؟ بۆیە من پێم وایە لەباری کۆمەڵایەتییەوە زەمینە بۆ ئێمە لەچاو دەمەکانی پێشوو زۆرتر فەراهەمە نە کەمتر.

هاوڕێیان، لە بارەی وەزعی جیهانی و ناوچەییەوە ئەوە دەڵێم کە رۆژهەلاتی ناوەڕاست سەرجەم لە بەردەم گۆڕانکارییەکی گەورە دایە. پێویستی بە گۆڕانی مۆدێلی دەسەلاتی سیاسی و لەوانەیە بڵێم گۆڕانی مۆدێلی پەرەسەندنی ئابووریش هەیە. کە دەڵێم پێویستی، نەك لە رووی نیازپاکی سیاسەتمەدارانی دەوڵەتانی گەورەی

جیهانییەوە و نەك لە رووی ئارەزوو و ویستی زەینی و سوبژێکتیڤی ئێمەی شۆڕشگێڕەوە، بەڵکوو ئەم پێویستییە لە رووی نیازەکانی گەشە کردنی سەرمایەی جیهانییەوەیە کە ئەوەندەی دیکە موتەمەرکیز بووە، ئەوەندەی دیکە جیهانی بووە، ئەوەندەی دیکە گلۆبالیزە بووە و، پێویستی بە شکاندنی ئەو سنوورانە هەیە کە پێشتر خۆی دایناوو. ئەو نیزامانە بەرهەمی ئاستێکی دیاری کراو لە گەشە کردنی سەرمایەداری جیهانی و پێویستییەکانی بوون کە ئێستا ئیدی لەو ئاستە تێپەڕیون.

دووهەم، ئەو گۆڕانکارییانە بۆیە پێویستن کە سەردەمی جەنگی سارد تەواو بووە. ئەو رژیمە دیکتاتۆرییانە هەروەها بەرهەمی رەقابەتی سەرسەختانەی ئەمریکا و شوورەوی، یا بلۆکی ئەمریکا و هاوپەیمانانی لە لایەکەوە لەگەڵ بلۆکی شوورەوی هاوپەیمانانی لە لایەکی دیکەوە، بوون و بە خاتری ئەو ململانێیی دەورەی جەنگی ساردە، هەموو رژیمێکی دیکتاتۆری دەهاتە سەرکار لەم وڵاتانە. هەر لە رژیمی نێگۆدین دیەم لە ڤیێتنام هەتا پاپادۆك لە تاییتی هەتا شای ئێران و هەتا هەموو رژیمە دیکتاتۆرییەکانی ئەمریکای لاتین هەتا عەرەبستانی سعوودی کۆنەپەرەستی سەردەمی شێخایەتی و بەربەرییەت، هەمووی ئەوانە، بێجگە لەوەی بێگومان هەڵقوڵاوی کۆمەڵگای خۆیان بوون، رەنگدانەوەی پارسەنگیی سیاسی و رادەی گەشە کردنی کۆمەڵگای خۆیان بوون، بەڵام ئەوەندەی کە دەگەڕێتەوە سەر ئاستی جیهانییەکەی، لەگەڵ رادەیەك لە گەشەی جیهانیی سەرمایەداری و لەگەڵ رقابەتەکانی سەردەمی جەنگی سارد دەهاتنەوە.

هەر دووکی ئەم واقیعییەتانە گۆڕاون. لەبوواری ئابووریدا، هەروەکوو ئاماژەم پێکرد و هەموومان دەزانین، ئەمەرکوز، جیهانی بوون و گلۆبالیزاسیۆنی سەرمایەداری زۆر سنووری لە هەموو دنیادا بەزاندووە و دەبووایە درەنگ یا زوو رۆژهەڵاتی ناوەراستیش بگرێتەوە. دووهەمین هۆکار ئەوەیە جەنگی سارد وەکوو جاران نەماوە. لە بەر ئەوە مەرج نییە راگرتنی عەینی مۆدێلی دیکتاتۆرییەت کە جاران ئەمریکا رای گرتبوو ئێستا لە مەسڵەحەتی خودی ئەمریکا و رۆژئاواشدا بێ. بە تایبەتی کە نیشان درا زۆرێك لەوانە هێلانەی بونیادگەرایی ئیسلامین. لە بیرمان نەچێتەوە سەردەمێك ئەو بونیادگەراییە لە رۆژئاوا پەرەیان پێدا و باوەشێنیان کرد و بەهێزیان کرد، بەڵام بەهەرحاڵ ئێستا پێچراوەتە دەوری قاچ و قوڵی خۆیانەوە.

هەر چۆنێك بێ، ئەم پێویستییانەیە کە وای کردووە رۆژهەڵاتی ناوەراست لە بەردەم ئەم گۆڕانکارییانەدا قەرار بگرێ. ئەم گۆڕانکارییانە، وەکوو هەمیشە، لە ئێمەمانان هێزی چەپ و شۆڕشگێڕ و سۆسیالیست کە لە عەینی حاڵدا مەسئوولین و بزووتنەوەیەکی گەورەی کۆمەڵایەتی و نەتەوایەتی لە کوردستان بەڕێوە دەبەین، تێگەیشتن و هەڵوێست و سیاسەتی گونجاو دەخوازێ. لە کاتی شەڕی ئەمریکا و عێراقدا ئێمە لایەنگری دەست پێکردنی شەڕ نەبووین و هەرگیز ئەو هەڵوێستەمان نەگرت، بەڵام کە زانیمان شەڕ واقیعییەتێکە، ئێمە خوازیاری رووخانی رژیمی سەدام بووین. تێگەیشتن لەم واقعییەتە کە ئەمریکا بە هەموو دنیای سەرمایەدارییەوە بۆ مەبەستی تایبەتیی ئابووری و ژێئۆپۆلیتیکی خۆی دێتە ئەم ناوچەیە و بەدوای ئەوەدا نەهاتووە کە ئازادی و دێمۆکراسی و بەختەوەری بخاتە کۆش و باوەشی هیچ گەل و نەتەوەیەکەوە، لە لایەن خەتی رەسمیی کۆمەڵەوە شتێکی ئاسایی بوو، بەڵام بە زانینی هەموو ئەوانەوەشەوە، ئەمە هەرگیز وای لێ نەکردین کە لە بیر بەرینەوە لە ناوخۆی کۆمەڵگای عێراق رووخانی رژیمی سەدام حوسێن پێویستییەکی گەورەیە. ئێوە بڕواننە ئەو بەیاننامەی کە

١٨

کۆمەڵە رێك بەدوای رووخانی سەدام حسین داویەتی. نامەوێ زۆری لەسەر بڕۆم، بەڵام بە بڕوای من یەکێك لەو سەنەدانەیە کە هەڵوێستی شەفاف و رۆشن و شۆڕشگێڕانەی کۆمەڵەی تێدایە و وەکوو بەڵگەیەکی جێی شانازی دەمێنێتەوە.

ئێستا ئێران لە چوارچێوەی ئەم وەزعە جیهانی و ناوچەییەدا چی دەکا؟ باڵی موحافیزەکار و بەتایبەتی رەفسەنجانی و ئەوان، هەوڵی زۆریان دا، هاندەری بوون و لە پشتی ئەوە بوون کە نەمێڵن دەوڵەتی خاتەمی بەهیچ سازشێك لەگەڵ ئەمریکا بکا بەتەمای ئەوەی بەڵکوو بۆخۆیان ئەو سازشە لەگەڵ ئەمریکا بکەن، یانی ئیبتیکاری سازش لەگەڵ ئەمریکا بەدەستەوە بگرن. بەڵکوو بتوانن لە نێوخۆ هیچ ئیمتیازێك بە دێموکراتیزە بوون نەدەن، بەڵام لە دەرەوە سازش بکەن. هەرچەند ئێستاش ناتوانین وەدی هاتنی ئەو سێناریۆیەش بەتەواوی رەت بکەینەوە، بەڵام ئەگەری زۆر کز بووە. هەموو شەواهید نیشان دەدەن کە ئێران بێئۆمێد بووە لەوەی کە بتوانێ سیاسەتێکی ئاوا رەچاو بکا. بۆیە ئێستا شمشێری خۆی لە روو بەستووە. یەك دوو مانگی هەوەڵ بە دوای شەڕی ئەمریکا و عێراق و رووخانی سەدامدا، ئێران سەری لێشێوا و زۆر ترسا، بەڵام دوایە زۆر زوو خۆی گرتەوە و بە ئاشکرا و بەبێ پسانەوە، بەبێ کۆتایی کردن و بە شێوەیەکی لێبڕاوانە خەریکی دەست تێوەردانە لە کاروباری سیاسی عێراقدا، خەریکی ناسەقامگیر کردنیەتی، خەریکی ئەوەیە عێراق بکا بە گۆمی خوێن، بیکا بە بشێوەیەك کە هیچ سەروبەرەی تێدا نەمێنێ، پشتیوانی لە تێرۆریزم دەکا، پشتیوانی لە رێکخراوە ئیسلامییە توندڕەوە تێرۆریستییەکان دەکا، چ رێکخراوە جیهانییەکەیان چ ئەوەی باڵی کودستانییەکەیانە. سەرەڕای ئەوەش کە کۆماری ئیسلامی ئێران و ئەلقاعیدە لەباری ئایدیۆلۆژی مەزهەبییەوە ئەسڵەن یەك ناگرنەوە، بەڵام کەڵك لە یەکتر وەردەگرن. بێجگە لەوە، هەر ئێستا دەبینین لە تاران چەند مەرکەز و ناوەندێك بۆ ناونووس کردنی ئەوانە دانراوە کە ئامادەن خۆیان بتەقێننەوە، عەمەلیاتی خۆ کوژی بکەن، بە رەسمی مەرکەزیان بۆ کراوەتەوە، لە رۆژنامەکاندا باسی دەکرێ، رەئیسی مەجلیسی ئێران حەدادی عادڵ بە شتێکی باشی دەزانێ، ستایشان لێ دەکا، تاریفیان دەکا و داوای پشتیوانی دەوڵەتیان بۆ دەکا.

ئەمانە هەمووی بخەیەوە سەر یەك نیشان دەدا ئێران بێئۆمێدە لەوەیکە بتوانێ بە سازشێکی جیددی و تاسەر لەگەڵ رۆژئاوا و لەگەڵ ئەمریکا بگا. لە بەر ئەوە پێی وایە باشترە شەڕی خۆی هەر لە ئێستاوە بکا. هەروەها ئێران پێی وایە بەم کارەی خۆی دەتوانێ لە رێگای شانتاژی سیاسی و هەڕەشەی عەلەنی، ئەمریکا ناچار لە تەسلیم بکا یا پاشەکشەی پێبکا، فشاری جیهانی لە سەر خۆی کەم کاتەوە و بەو نەوعە مانەوەی خۆی لە دەسەڵاتدا بپارێزێ. ئەڵبەتە بێدەلیل نییە ئەم سیاسەتە رچاو دەکرێ. چون کۆماری ئیسلامی لە جاراندا هەر ئەو کارەی کردووە، گرەوکێشی لە غەرب و دەوڵەتانی غەربی سیاسەتێك بووە ئێران ساڵەهای ساڵ کردوویەتی و تێیدا سەرکەوتووش بووە. نازانم داهاتووی کێشەی ئەمریکا و ئورووپا لەسەر ئێران چۆن دەبێ، بەڵام لە ئامارەیەکی کورتدا هەر ئەوەندە دەڵێم کە ئەو کەلێنەی کە جاران لەبەینی ئەمریکا و ئورووپا لەسەر ئێران هەبوو، خەریکی پڕ بوونەوەیە و بەهەر رادەیەك ئەم کەلێنە کەمتر بێتەوە، شانسی مانەوەی ئێران کەمتر دەبێتەوە.

ئەگەر هەمووی ئەوانە لە بەرچاو بگرین، دەمەوێ وەکوو عیبارەتی کۆتایی خۆم ئاماژەیەك بەوە بکەم کە لە بارودۆخی ئاوادا هێزێکی وەکوو ئێمە، بەو پێناسە و ئامانجانەوە، دەتوانێ و دەبێ چی بکا. هێزێکی شۆڕشگێڕ و تێکۆشەری وەکوو ئێمە پێش هەموو شتێك دەبێ سەربەخۆیی خۆی بپارێزێ و پاراستووشیەتی، نەکەوێتە تەعاروف و موجامەلە و کلکایەتی هیچ هێزێك نە ناوچەیی و نەجیهانی، نەکووتووە و ناشبێ بکەوێ. دەبێ سەربەخۆیی لە سیاسەتی شۆڕشگێڕانەی خۆیدا بپارێزێ. دەبێ بەرژەوەندی کۆمەلانی بەرینی خەڵکی کوردستان بکا بە محەکی دروستیی سیاستەکانی، ئەوە رەچاو بکا و کردووشیەتی. ئەو کاتەی کە هەل‌ومەرجی ناوچەیی و جیهانی نالەبارە، گوشارمان بۆ دێنێ و مەحدوودییەت و بەرتەنگ بوونەوە بەسەر کاری ئێمەدا دەسەپێنێ، ئەو کاتە ئەرکی سەرشانی ئێمەیە شەفاف بین لە باری سیاسییەوە، ئیرادەی خۆڕاگری و تێکۆشان لە خۆمان و خەڵکی دیکەدا پەرە پێبدەین، نەهێڵین جووڵانەوەکە بڕوخێ، نەهێڵین ورە بەردا، گڕی موقاومەت زیندوو راگرین. ئەوە کارێك بووە کە لە رابوردوودا زۆر جار کردوومانە. بەڵام تەنیا ئەوە نییە. زۆر جار شانس یا هەل‌ومەرجێکی گونجاو، کە رەنگ بێ هەمووی راستەوخۆش بەرهەمی هەڵسووڕانی ئێمە نەبێ، دێتە ئاراوە. لە کاتێکی وەهادا کە هەل‌ومەرج گونجاو بوو، بە هەمان هەست بە بەرپرسایەتی، بە هەمان سەربەخۆیی، بە رەچاو کردنی بەرژەوەندی کرێکاران و زەحمەتکێشان و کۆمەلانی بەرینی خەڵك و بەرژەوەندی ئەو بزووتنەوەی ئێمە راسپاردەی سیاسی و مێژوویی‌یمان بۆ بەڕێوەبردنی هەیە، بەڵێ، بە لەبەر چاوگرتنی هەموو ئەوانە، دەبێ لەو هەل‌ومەرجە کەڵك وەرگرین. ئێمە وەکوو کۆمەڵە دەبێ بەراشکاوییەوە و بەبێ ترس و باك بە خەڵکی کوردستان رابگەیەنین کە هیچ کەس نەهاتووە بۆ ئەوەی نە ئازادی و نە عەدالەتی کۆمەڵایەتی، کە دوو خواستی گەورەی ئێمەن، بخاتە کۆش و باوەشی ئێمەوە، بەڵام بارودۆخێك خوڵقاوە کە بەشێوەی ئۆبژێکتیڤ، بەشێوەی عەینی و بابەتی ئەو رژیمەی کە ئێمە لەدژی تێدەکۆشین، ئەو رژیمەی کە کۆسپ و لەمپەری بەردەم هەموو دیمۆکراتیزە بوون و هەموو بەختەوەرییەکی کۆمەڵگای ئێرانە، دوژمنی خاریجیشی بۆ پەیدا بووە، ئێمە بە لە بەرچاوگرتنی پرەنسیپەکان و سەربەخۆیی خۆمان دەبێ بە ژیری و وریاییەوە لەو ناکۆکییە کەڵك وەرگرین و خۆمانی بۆ ئامادە بکەین.

هاوڕێیان، لە بەشەکانی تا ئێستای راپۆرتی کۆمیتەی ناوەندیدا هەوڵم دا کە هەل و مەرجی سیاسیی ئێران و کوردستان و ناوچەکە بخەمە بەر باس و لێکۆڵینەوە و تێیدا ئاماژەیەك بە سیاسەتەکانی کۆمەڵە بکەم و نیشانی بدەم کە بۆچی ئەم بارودۆخە یان ئەم ئاڵوگۆڕانە دەتوانن رێگە خۆشکەر بن بۆ گەشە کردن و سەکەوتنی داهاتووی ئێمە. ئێستا تەوەرەیەکی دیکە لەم گوزارشە کە بریتییە لە هەڵسەنگاندنێکی مەوقعییەتی کۆمەڵە، سیاسەتەکانی و دەسکەوتەکانی لە سێ ساڵی رابوردوودا، یانی لە کۆنگرەی نۆهەمەوە تا ئێستا، بەئاگاداریی ئێوەی بەرێز دەگەیەنم. من لێرەدا ناتوانم، یانی نە بەباشی دەزانم و نە بڕیارمان لە کۆمیتەی ناوەندیدا ئەوە بووە کە گوزارشێکی ئۆرگان بە ئۆرگانی چالاکی و هەڵسووڕانەکانی کۆمەڵە پێشکەش بکەم، بەڵکوو باس و لێکدانەوەیەکی گشتیترە لە سەرجەم دەسکەوتان و پێشڕەوییەکانی کۆمەڵە، لەو سیاسەتانەی هەیبووە و دانی گوزارشێك بە ئێوەیە لە چوارچێوەیەکی ئاوا گشتیدا.



ئێمە لە دەوری رابوردوودا لە ساغبوونەوەی کۆمەڵە لە هاوینی ساڵی ١٣٧٩ (ساڵی ٢٠٠٠ی زایینی) هەتا گەیشتینە کۆنگرەی نۆ و ئێستاش کە هاتووینە کۆنگرەی دە، سەردەمێکی زۆر پڕ لە ئەزموون و پڕ لە رووداوی سیاسیمان تێپەڕ کردووە، چ وەکوو کەسانێک کە لەم ناوچەیە دەژین و تێکۆشانی سیاسی دەکەین و چ لە پەیوەند بە حیزبەکەمان و لە رەنگ دانەوەی ئەو رووداوانە لەناو حیزبەکەی خۆماندا. بەشێکی کە جێی خۆی بوو من لە لێکدانەوەی وەزعی ناوچەیی دا باسی بکەم، بەڵام لەوێدا کورتم کردوەوە و بە ئەندازەی پێویست ئاماژەم پێنەکرد، ئەوەیە کە بەتایبەتی لە ساڵی رابوردوودا ئێمە شاهیدی رووخانی رژیمی سەدام و ئەو ئاڵوگۆڕانە بووین کە بەدوایدا هاتووە و ئەمە ئێمەی لە بەرامبەر دۆخێکی تازە داناوە، هەم فرسەتگەلێکی تازەی بۆ خوڵقاندووین، هەم ئەرك و مەسئوولییەتی تازە دەخاتە ئەستۆمان و هەم لەوانەیە کە گیروگرفتی پێشبینی نەکراویشمان بۆ بخولقێنێ. بە هەر حاڵ فەسڵێکی تازەی لە ژیانی عێراق و هەموو ئەو خەڵکەی کە تێیدا دانیشتوون و لەوانە بە تایبەتی خەڵکی کورد کردەوە و ئێمەش و هەموو ناوچەکەش کەوتینە ژێر تەئسیری. ویستم لێرەدا ئەوە بڵێم جا بێمە سەر ئەسڵی باسەکەی خۆم کە گوزارشێکە لە مەوقیعییەتێك کە کۆمەڵە لەم سێ ساڵەدا بەدەستی هێناوە، لە دەسکەوتەکان و لەو سیاسەتانەی رەچاومان کردوون و بەکۆیێ گەیشتووین.

پێم وایە لە کەس شاراوە نییە کە یەکێك لە گەورەترین دەسکەوتەکانی پرۆژەی ساغکردنەوەی کۆمەڵە و بەتایبەتی ئەم سێ ساڵەی رابوردوو بریتی بووە لەوەی کە کۆمەڵەی هێناوەتەوە نێوەڕاستی شانۆی سیاسی لە کوردستان. ئێمە ببووین بە رەوتێکی روو لە پەراوێز و، ئەگەر وەکوو خۆمان بمابنایەتەوە، بەتایبەتی بەو گۆڕانکارییانە کە دوایی هاتنە ئاراوە، لە مەترسی ئەوە دا بووین کە بە تەواوی بکەوینە پەراوێزەوە. ساغ کردنەوەی کۆمەڵە و چالاکییەکانی ئەم چوار ساڵە ئێمەی لەوە رزگار کرد و جارێکی تر کۆمەڵەی هێنایەوە مەرکەزی خەباتی سیاسی کوردستان. ئەمە لە زۆر شت دا خۆی نیشان دەدا. جارێکی دیکە دەنگی کۆمەڵە، ناوی کۆمەڵە، سیاسەتەکان و دروشمەکانی کۆمەڵە چوّتەوە سەر زار و زمانان، چوّتەوە نێو کوڕ و کۆمەڵی خەڵکی، چوّتەوە نێو کرێکاران و زەحمەتکێشان، چوّتەوە ناو بنەماڵە سیاسییەکان، ناو بنەماڵەی شەهیدان و گیان بەختکردووانی کۆمەڵە، ناو تێکۆشەرانی قەدیمی، کەسانێك کە ساڵەهای ساڵ بوو پێوەندی رێکخستنیان لەگەڵ کۆمەڵە نەمابوو، ناو خانەوادەی زیندانیانی سیاسی و هەموو ئەوانە. دیارە ناوی کۆمەڵە و سوننەت و کرداری رابوردووی لە زەین و لە بیرەوەری و لە تێکۆشانی نەسلی تۆزێ قەدیمیتردا هەر مابوو، بەڵام لە ماوەی سێ چوار ساڵی رابوردوودا توانی بە فراوانی ناو و شۆرەتی حیزبێکی جەماوەری و خۆشەویست و جێگای رێز لەنێو خەڵکی کوردستان و بەتایبەتی لەنێو نەسلی تازەی خەباتکاریشدا دووبارە بکاتەوە.

پێشتر باسم کرد کە جموجۆڵی سیاسی لە کوردستان زۆرترە لە چاو باقی ئێران، ئاستی خەباتی سیاسی تێیدا بە کەمییەت بەرزترە و بە خسڵەت رادیکاڵترە. ئەوەندەی دەگونجا باسی ئەوەشم کرد کە ئەو هۆکارانەی ئەو بارودۆخەیان خوڵقاندووە کامانەن. بەڵام لەبیرمان نەچێتەوە کۆمەڵە کە لەم بارودۆخەدا گەشەی کردووە، خۆی یەکێك لە هۆکارەکانی بزواندنی خەڵك بووە لە چەند ساڵی رابوردوودا. خودی بووژانەوە و گەشانەوە و هەڵسووڕانی چالاکانەی کۆمەڵە لە ساڵانی رابوردوودا، هۆکارێکی بەرز کردنەوەی ورەی خەباتکارانەی خەڵکی کوردستان بووە، هۆکارێك بووە بۆ ئەوەی هەموو ئەو تێکۆشەرانی سیاسی کە ئومێد و ئامانجیان نەمابوو یاکز

ببوو جارێکی دیکە ئەوانیش ببووژێنەوە. بەهۆی پرۆژەی بووژاندنەوە و ساغکردنەوەی کۆمەڵە، کەسانێک کە ساڵەها بوو لە فەعالییەتی سیاسی دوور کەوتبوونەوە یا ئاسۆی بەرچاویان لێڵ ببوو، یا ئەو هومێد و هیوایەیان نەمابوو، بەشێکی زۆر لەوانە بووژانەوە. لەنێو تێکۆشەرانی قەدیمی کۆمەڵەدا، لەنێو پێشمەرگە دێرینەکاندا، لەنێو ئەو کەسانەدا کە کەم تا زۆر ماوەیەک لەگەڵ ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە ببوون، ئەم بووژانەوەیە زۆر بەرچاو و دیارە و بەشی هەرە زۆریشی هاتۆتە کیسەی کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێرانەوە.

بەڵام بووژانەوە و پەرەسەندنی کۆمەڵە تەنیا بەوەوە ناوەستێ: زۆر کەس کە لە رابوردوودا بە خەتی سیاسی لەگەڵ ئێمە نەبوون، سەرەتای دۆستایەتی و پێوەندیان لەگەڵ ئێمە دامەزراندووە، هومێد و هیوایەکیان پەیدا کردووە، وە ئێستا کۆمەڵە بەو ئاڵتێرناتیڤە دەزانن کە هەموو پێشکەوتنخوازێکی کورد لە کوردستانی ئێران لە دەوری کۆببێتەوە. ئێستا دروشمە رەسمییەکانی کۆمەڵە لە چوارچێوەی حیزبی ترازاون و بوون بە دروشمە باوەڕ پێکراوەکانی جەماوەری گەلی کورد لە کوردستانی ئێران. من تەنیا ئیشارە بە یەکیان دەکەم ئەویش مەسەلەی فیدرالییە. وەختێک کۆمەڵە دروشمی فێدراڵی لە کوردستانی ئێران بەرز کردەوە، لەوانەیە بڵێم نەیارانی یان هیچ نەبێ ئەو کەسانەی ئیبهامیان هەبوو زیاتر بوون لە لایەنگرانی ئەو دروشمە. هێندێک کەس پێیان وابوو ئەمە دووبەرەکایەتی لە نێو بزووتنەوەی کوردیدا پێک دێنێ، چونکە شیعاری دی غەیری خودموختاری دێنێتە گۆڕێ. تەجروبە ئیسباتی کرد کە ئەوان هەڵە بوون و ئەو سیاسەتەی کە کۆمەڵە گرتیە بەر سیاسەتێکی دروست و رەوا بوو. لە ماوەی چەند ساڵدا کۆمەڵە توانی سەرنج و خۆشەویستیی بەشی هەرە زۆری نوخبەی سیاسی کوردستان بەرەو ئەو شیعارە راکێشێت و ئێستا بۆتە دروشمی جەماوەریش. دووپاتی دەکەمەوە: نە ئێمە ئەو شیعارەمان لە ئاستی جیهانیدا خوڵقاندووە و نە ئێمە یەکەم کەس و حیزبیش بووین کە لە ئاستی سەرجەم کوردستاندا هێناومانەتە گۆڕێ، بەڵام ئێمە لە کوردستانی ئێران دروشمەکەیمان هەڵگرت و پێشەنگایەتیمان کرد، ئێمە زۆر پێشتر بارودۆخەکەمان تەشخیس دا، پێویستی و بەکەڵکبوونەکەیمان هەم بۆ دێمۆکراتیزە کردنی ئێران و هەم بە بۆ گەیشتنی گەلی کورد بە مافە رەواکانی تەشخیس دا و تێی گەیشتین و کارمان بۆ چەسپاندنی کرد.

بزووتنەوەیەک کە لە رۆژی ٨ی مارسی ئەمساڵ لە شارەکانی کوردستانی ئێران بۆ دیفاع لە فێدراڵی لە کوردستانی عێراق و بۆ شایی و خۆشی لەم بارەیەوە بەرپا بوو، چەندین شتی نیشان دا: یەکەمیان هاوخەباتی و هاوپشتی و هاوچارەنووسیی نزیکی خەڵکی کوردستانی ئێران و عێراقی نیشاندا. نیشانی دا کە چۆن دەسکەوتێک، سەرکەوتنێک، لە بەشێک لە ئەو کوردستانانە دەتوانێ لە گەشاندنەوەی کوورەی خەبات، لە بەرزکردنەوەی ورەی خەڵکی و لە بەخشینی هیوا و هۆمێد بە بەشەکانی دیکە کاریگەر بێ. بەڵام بێجگە لەوانە کارێکی دیکەشی کرد: ئەو بزووتنەوەیە بوو کە دروشمی فێدراڵی لە نوخبەوە بردە نێو جەماوەر، لەوێدا بوو کە شیعاری فێدراڵی لە پێشڕەوانی سیاسییەوە گەیی بە گوێی جەماوەر و لەوانەیە بڵێم زۆر کەس بۆ هەوەڵین جار و بەبێ ئەوەی هەموو ماناکەی بزانێ پشتیوانی لێکرد. خەڵک وردە وردە خەریکن ئاوات و ئارەزووەکانیان بۆ چارەسەری کێشەی میللی لە کوردستان بەو شیعارەوە دەبەستنەوە. بەهەڵکەوت نییە کە زۆر حیزب و لایەنی

دیکەش سەرەنجام دوای ماوەیەك بەو نەتیجەیە گەیشتن کە شیعاری درێژخایەنی دەیان ساڵەی خۆیان بگۆڕن و لەگەڵ ئەو رەوتە کەون، رەوتێك کە دیارە پێویستییەکی سیاسی سەردەم بوو.

لە نێو کرێکاران و زەحمەتکێشان ئێمە نفووزمان زیادی کردووە، پەرەمان پێداوە، ئێستا لەبەشی هەرە زۆری ناوەند و شوێنە کرێکارییەکان هەین و چالاکی دەکەین، لە کوورەکان، لە کارگەکان، لەنێو کرێکارانی وەرزی، لەنێو کرێکارانی شارەدارییەکان، لەنێو موعەلیمان و مامۆستایان و لەنێو زۆر لایەنی دیکەشدا وردە وردە کۆمەڵە خەریکە پەل دەهاوێژێ و خەریکە رێکخستنی خۆی پەرە پێدەدا. ئەوە خۆی جێی باسێکی سەربەخۆیە کە سەرجەم بۆ بزووتنەوەی کرێکاری لە کوردستان دەبێ چ بکرێ، بەڵام لێرە هەر ئەوە بڵێم کە رەگاژۆ کردنی کۆمەڵە بۆ ناو کرێکارانی کوردستان بە ئاشکرا روو لە زیاد بوونە.

قسەیەك لە پەیوەندی خۆمان لەگەڵ رۆشنبیریی کوردی بکەین. باسی ئەوەم کرد کە کۆمەڵە ئەو حیزبە بوو کە تەشخیسی دا بزووتنەوەیەکی رۆشنبیریی فراوان لە کوردستان هەیە، بنەماکان و هۆکارەکانی باس کرد، دەستی هاوکاری بۆ لای ئەو بزووتنەوەیە درێژ کرد و لە عەینی حاڵیشدا ئەو بەڵێنەی دا کە وێڕای هاوکاری کردن سیاسەتێکی رێنوێنی و رەخنەگرانەشی بۆی دەبێ. باسمان کرد کە ساڵانی رابوردوو جێی خاڵی یان بۆشایی نەبوونی چالاکیی حیزبە سیاسییەکان تا رادەیەکی زۆر بەو بزووتنەوە رۆشنبیرییە پڕ دەکرایەوە یان پڕیش نەکرابایەوە لە باری روحییەوە رازی دەکرا. ئەمە لە لایەکەوە جێگەی دەستخۆشییە و نیشان دەدا کۆمەڵگای کوردستان مەگەر قڕیان تێبخەن ئەگینا ناتوانن دایانمرکێنن. سەرکوت و کوشتار و ئیعدامەکانی رژیمی کۆماری ئیسلامی توانی پاشەکشە بە هێزی پێشمەرگە بکا، بەڵام نەیتوانی توانایی مەعنەوی و رۆشنبیریی ئەو خەڵکە چۆك پێدا بدا. بنکەی پێشمەرگەیان پێ چۆڵ کرا، بەڵام رۆشنبیریی کوردی سەری هەڵدا لە جیاتی. ئەمە جێی خۆشحاڵییە و نیشانی دەدا هەروەکوو باسمان کرد کۆمەڵگای کوردستان ئێستا کۆمەڵگایەکی پێگەیشتووتر، گەشەدارتر و پیچیدەتر و هەمە لایەنترە. بەڵام لە هەمان کاتدا دەبێ ئەوەش بڵێین کە ئەم بزووتنەوە رۆشنبیرییە لەگەڵ خۆی لایەنی مەنفیشی پێوە بوو. تەنانەت ئێستاش پێوەیەتی.

ئێمە وەکوو حیزبێکی شۆڕشگێڕ و چەپی مەسئوول کە بەرامبەر بە هەموو کێشەکانی کوردستان و هەموو لایەنەکانی بزووتنەوەی کوردستان خۆمان بە بەرپرس دەزانین، بەرامبەر بەم بزووتنەوە رۆشنبیرییەش خۆمان بە بەرپرس زانی، تێکەڵی بووین، پشتمان لێ هەڵنەکرد، بەرچەسپمان لێنەدا، هەڵسوکەوتمان لەگەڵ کرد، دانوستاندنمان لەگەڵ کرد لە سێ چوار ساڵی رابوردوودا. بەشێکی بەرچاوی ئەم بزووتنەوە رۆشنبیرییە لە رێگەی کەسایەتییەکانییەوە بە هەموو شێوەیەك کەوتۆتە دانوستاندن لەگەڵ ئێمە. لەم پرۆسەیەدا ئێمە تەنها سیاسەتی ستایش و باوەش کردنەوەمان بەرامبەر بە بزووتنەوەی رۆشنبیری نەبوو، ئەو دانوستاندنەی ئێمە لایەنی رەخنەگرانەشی هەبوو. ئێمە بەشێوەیەکی بەرچاو تەنگانە داوامان لەهەموو بزووتنەوەی رۆشنبیری نەکرد کە یا بێن بە ئەندامی ئێمە و رێکخستنی حیزبیی ئێمە یان دەنا ئەگەر وانەبێ جێگەیەکیان نییە و لەنێو نەیارانی ئێمە دان. بەڵام ئێمە لەو باوەڕەدا بووین کە سیاسەتی شۆڕشگێڕ و رۆشنبیریی پێشکەوتنخواز دەتوانن پرۆژەیەکی هاوبەشیان هەبێ لە کۆمەڵگای کوردستاندا و بۆ ئەوە تێکۆشاین و ئەم بیرۆکەیەش پێشوازییەکی باشی لێکرا لە نێو رۆشنبیراندا. لە هەمان حاڵدا ئێمە پەنجەی رەخنەمان درێژکرد بۆ لای بزووتنەوەی

٢٣



ڕۆشنبیری. بەڵێ، ئێمە حیزبی دیالۆگین لە کوردستاندا، بەڵام ئامانەوێ تەنیا حیزبێکی قبووڵکەر بین لە کوردستان، حیزبێك بین تەنها تەنسیروەرگر بین.دەمانەوێ لە سەر گوتاری سیاسی و ڕۆشنبیریی کوردی ئێران مۆری ڕووانگە و ڕێبازی کۆمەڵە بە جێ بێڵین. ئێمە ئەو کارە لە ڕێگەیەکی بەرچاوتەنگانە و سێکتاریستییانەوە، یان لە ڕێگەی هەڕەشە و تەماع وەبەرنانەوە، ناکەین، بەڵکوو لە ڕێگەی دیالۆگ، لە ڕێگای دانوستاندنێکی فیکری و سیاسی ڕاشکاوانە لەگەڵ ڕۆشنبیراندا دەکەین.

بۆ نموونە، ئێمە پەنجەی ڕەخنەمان بۆ ئەوە درێژ کرد کە لە ناو بەشێك لەو بزووتنەوە ڕۆشنبیرییەدا دوورەپەرێزی لە سیاسەت کراوە بە فەزیلەت. بەدوور و درێژی ناچمە ناویەوە، بەڵام ئەم جۆرە دوورەپەرێزییە لە سیاسەت و ئەم جۆرە تاوانبار کردنی حیزبە سیاسییەکان، تاوانبار کردنی سیاسەتی شۆڕشگێڕانە، تاوانبار کردنی پێشمەرگایەتی و لەقەڵەم دانی ئەوانە بە هۆکاری ئەو نەهامەتییە کە ئێستا کورد تووشیەتی لە لایەن بەشێك یان خەتێك لەنێو بزووتنەوەی ڕۆشنبیریی کوردی ئێرانەوە، هاتە بەر ڕەخنەی ئێمە. ئێمە پێمان کوتن کە بتانەوێ و نەتانەوێ ئەمانە دیاردەی دەورەی شکستن. لە کاتی شکستی هەموو بزووتنەوەی دنیادا تێئۆریزە کردنی شکست هەیە. لە دنیای ڕۆشنبیریشدا دەورەی شکست و تێئۆریزە کردنی شکست هەیە.

با لە پەراوێزدا ئاماژەیەك بکەم: کۆمۆنیزمی کارگەری، نە لە بواری ڕۆشنبیری بەڵکوو لە بواری سیاسەتدا، تێئۆریزەکەری شکست بوو. ئەو کاتەی کە بزووتنەوەی شۆڕشگێڕانەی کوردستان لە ژێر فشاری سەرکوت و دیکتاتۆریی ڕەشی کۆماری ئیسلامیدا تووشی کزی بوو، وردەوردە پاشەکشە بە پێشمەرگە کرا، وردەوردە دیکتاتۆری باڵی ڕەشی بە سەر کۆمەڵگای کوردستاندا کێشا، ئەو سەردەمەی کە ئێمە لە ناوخۆی کوردستانی عێراقیشدا گوردانی شوان و ئۆردووگای بۆتێمان کەوتە بەر کیمیایی باران و ئەنفال لە ساڵی ١٩٨٨دا، ئەو دەمەی کە لەبەر چاوی ئێمە بزووتنەوەی کوردستانی عێراق بە گازی ژەهراوی خنکێندرا و خەڵك وای دەزانی هەموو شتێك نزیك بە ئاشبەتاڵ و هەرەس هێنانە، ئا لەو سەردەمەدا کۆمۆنیزمی کرێکاری سەری هەڵدا و بروزی سەند. ئەمە تێئۆری شکست و بێ ئاسۆیی بوو، ڕێگە حەلەکەشی دەرباز بوون بوو بەرەو هەندەران.

لە دنیای ڕۆشنبیریشدا تێئۆریزە کردنی شکست هەیە. شکستێك کە بە سەر بزووتنەوەی شۆڕشگێڕانەی کوردستان داهات، لەناو تەیار یا باڵ یا خەتێکی دیاریکراو لەنێو ڕۆشنبیریی کوردستانی ئێرانیشدا ڕەنگی دایەوە. هەڵگەڕانەوە بە دژی ئارمانج و بەهاکان، بەدژی ئەو بەهایانەی کە ئەزقەزا گوڵی سەرتۆپ و نوخبەی ڕۆشنبیرانی ئەو سەردەمەی کوردستان لە ڕێگەیدا خەباتیان کردبوو و زۆرێکیان گیانیان بۆ بەخت کردبوو، لە ساڵانی ڕەشی دیکتاتۆریدا سەری هەڵدا.

هێندێك کەس لەو بزووتنەوە ڕۆشنبیرییە پێیان وابوو ئەگەر بڵێن ئێمە لە سیاسەت دوورین و ئەگەر ڕەخنە لەو حیزبانە بگرن بەو تاوانەی کە گۆیا سیاسەتیان هێناوەتە نێو ڕۆشنبیرییەوە، بەم جۆرە ئاستی ڕۆشنبیریی کوردی بەرز دەکەنەوە. بەپێچەوانە، ئەمە دوو هەڵە و عەیبی گەورەی هەیە: یەکەمیان، هیچ وەخت بزووتنەوەی ڕۆشنبیری بە تێکەڵ بوونی لەگەڵ سیاسەتی شۆڕشگێڕانە و پێشکەوتنخواز، ناڵێم بە عەبدایەتی و کلکایەتی، بەڵام بە تێکەڵ بوونی، بە دانوستاندنی لەگەڵ تێئۆری و سیاسەتی شۆڕشگێڕ، هەرگیز لە هیچ کوێی دنیا پێی هەژار نەبووە، پێی دەوڵەمەند بووە. پێچەوانەکەشی ڕاستە، هیچ وەخت سیاسەت بە تێکەڵ بوونی لەگەڵ

ڕۆشنبیری هەژار نابێ، دەوڵەمەند دەبێ. ئەو کەسانەی کە دەیانەوێ گۆیا سیاسەت، کە بەشێکی گەورەی ژیانی کۆمەڵگای کوردەواری و هەموو کۆمەڵگایەکی مرۆڤایەتی پێک دێنێ، دابڕێن لە دنیای ڕۆشنبیری، ئەوانە سیاسەت هەژار دەکەن و ڕۆشنبیریش هەژار دەکەن لە کوردستاندا. ئەو کەسانەی کە چەکی سیاسەت لەخەڵک دەستێننەوە، بە ئەستاندنەوەی سیاسەت، چەکی رەخنەی شۆڕشگێڕانە لە خەڵک دەستێننەوە و هەر قیافەیەکی مۆدێرنیزمیش بۆ من و تۆ بگرن لەراستیدا ئەوانە لایەنگرانی پاراستنی وەزعی مەوجوودن. کۆمەڵگای مرۆڤایەتی سەرەڕای ئەو ئاڵوگۆڕانەی کە لە بنەما ئابوورییەکەی پێک دێ، بەڵام بۆ گۆڕانی کۆمەڵایەتی و سیاسی و بۆ باشتر کردنی ژیانی ئینسانی هیچ عامیل و هۆکارێکی دیکەی نییە بێجگە لە فەعالییەتی داهێنەرانەی ئینسانی وشیار نەبێ. تێئۆری و سیاسەتی شۆڕشگێڕانە چەکی دەستی ئەو ئینسانانەیە، چەکی دەستی ئەو هۆکارە سوبژێکتیڤەیە کە لەسەر عامیلی عەینی و ئۆبژێکتیڤی کۆمەڵگای ئینسانی تەئسیر دادەنێ و بەرەو پێشی دەبا. ئەو کەسانەی کە چەکی تێئۆری شۆڕشگێڕانە، سیاسەتی شۆڕشگێڕانە و پراکتیکی شۆڕشگێڕانە، یانی بزووتنەوەیەک کە لە سەر ئەساسی ئەو تێئۆری و سیاسەتە دامەزرابێ، لە کۆمەڵگای کوردی دەستێننەوە، ئەوانە بیانەوێ و نەیانەوێ لایەنگرانی هێشتنەوە و پاراستنی وەزعی مەوجوودن، لایەنگری دەسەڵاتی دەسەڵاتدارانن، لایەنگری ئەوەن سوار هەر سوار بێ و پیادە هەر پیادە. ئەوانە، بیانەوێ و نەیانەوێ، ئاو دەرژێننە ئاشی ئیرتیجاع و کۆنەپەرەستیی دەسەڵاتدار، ئاو دەرژێننە ئاشی بونیادگەرایی ئیسلامی سیاسی لە هەموو ناوچەکەدا.

جا ئێستا ئەم خەتە پاشەکشەی پێکراوە لە کوردستاندا. دەتوانم بڵێم کە لەژێر تەئسیر و کاریگەریی سەرجەم ڕووداوە سیاسییەکانی ئەم چەند ساڵەی دوایی ئێران و کوردستان و ناوچەکە و یەک لەوانە لە ژێر تەئسیری بووژانەوەی کۆمەڵەدا، لەنێو بزووتنەوەی ڕۆشنبیریی کوردستانی ئێراندا دوورەپەرێزی لە سیاسەت لە پاشەکشە دایە. دەور و نەقشی بووژانەوەی کۆمەڵە لەم ڕەوتەدا، ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ، دیار و بەرچاوە و ئەمە دەسکەوتێکی کەم نییە. هەڵبەت ئەمە هێشتا کارێکی بەئەنجام نەگەیشتووە، هێشتا ڕۆشنبیری پێشکەوتنخوازی کوردستان، وێڕای تێکۆشەری سیاسیی شۆڕشگێڕ و چەپی کورد زۆر مەجالیان ماوە و زۆر ئەرکیان لەسەر شان ماوە کە نە بە بڕیاری ڕێکخراوەیی و نە بە بەخشنامەی ئیداری و حیزبی، بەڵکوو بە نیشان دانی توانای ڕۆشنبیری و مەعنەوی خۆیان تەئسیر لە سەر گوتاری نەزەری و ڕۆشنبیری و فیکری و سیاسی ئەم سەردەمەمان دابنێن، مەفاهیم و بەهاکانمان بکەنە ئەو مەفاهیم و بەهایانە کە ئازادی، دێمۆکراسی، مافی ئینسان و عەدالەتی کۆمەڵایەتی تێیدا شەپۆل دەدات.

لەم سەردەمەدا بوو کە ڕۆشنبیرانی کورد و نوخبەی سیاسی کوردیش لە کوردستانی ئێران، لایان لە کۆمەڵە کردەوە. جاران کێ چوار کلاس خوێندنی زیاتری هەبووایە نەیدەوێرا یان خوازیار نەبوو، ڕەغبەتێکی نەبوو، بۆ پەیوەندی لەگەڵ تۆی کۆمەڵە. بە تەوهینی ئەوان نالێم، گاڵتەشیان پێناکەم و گاڵتە بە خۆشمان ناکەم، خەسڵەتی سەردەم وابوو. ئێستا بەشانازییەوە پێتان ڕادەگەیەنم کە پەیوەندی کردن لەگەڵ کۆمەڵە، چوونە نێو بەحس و جەدەلی نەزەری و فیکری و سیاسی و ڕۆشنبیری لەگەڵ ڕەهبەریی کۆمەڵە، لە دوو سێ ساڵی

رابوردوودا بۆ زۆرێك لە رۆشنبیران جێگەیەکی تایبەتی هەیە. ئێستا نەك تەنیا هەر ئێمە بەڵکوو ئەوانیش داواکاری ئەو پەیوەندییەن. ئەمەش دەسکەوتێکی کەم نییە لە کوردستاندا.

خاڵێکی دیکە لەو دەسکەوتانەی کە جێی خۆیەتی لە کوردستاندا ئاماژەی پێبکرێ و تەئکیدی لە سەر بکرێتەوە مەسەلەی کوردە. هاوڕێیان، مەسەلەی کورد لە هەموو رۆژهەلاتی ناوەڕاست بۆتە مەسەلەیەکی گەورە. کێشەی کورد تازە کێشەیەکە ناتوانرێ فەرامۆش بکرێت و نادیدە بگیرێت. بە دڵنیاییەوە پێتان دەڵێم لە ناو دەزگای رەهبەریی هەرە سەرەوەی کۆماری ئیسلامیدا، نازانم بۆ میسباحی یەزدی و چەند کەللە وشکی دیکەی وەکوو ئەو کە لە هیچ شتێك حاڵی نین، بەڵام ئەوانەی سەران و کاربەدەستانی سەرەوەی دەزگای ئێرانن و جڵەوی ئەم دەسەڵاتە سیاسییەیان بەدەستەوەیە، بە بڕوای من بەو قەناعەتە گەیشتوون کە لە مەسەلەی کورد لە ئێراندا شکستیان خواردووە و ناکام ماونەتەوە، سەرنەکەوتوون. ئەوان توانیان بە زەبروزەنگ و بە باڵادەستیی هێزی چەکداری خۆیان، پاشە کێشە بە هێزی پێشمەرگە بکەن لە کوردستان. توانیان بۆماوەی یەك دەهە و نیو خەفەقانی سیاسی لە کوردستان دابسەپێنن. بەڵام سەرەنجام بەرهەمیان بوو بەچی؟ بەبێ ئەوەی نیزام رووخابێ، بەبێ ئەوەی دەسەڵات لەجێی خۆی تەکانی خواردبێ، لە چەندین مەجالی بەرچاودا، لە تەحریمی هەڵبژاردنەکاندا، لە خۆپیشاندانە گەورەکاندا و، لە هەموو حەرەکات و سەکەناتێکی لاو و پیری کوردستان، ئەوان ئەو ناکامییە هەست پێدەکەن و تاڵاوەکەی دەچێژن.

مەسەلەی کورد نەك هەر لە ئێران وایە، نەژك تەنیا هۆکاری ئێرانی و نێوخۆیی هەیە، بەڵکوو ئەمە هەروەها رەنگدانەوەی دۆخێکی گشتییە و لەژێر کاریگەریی مەسەلەی کورد لە رۆژهەلاتی ناوەڕاست دایە. ئێستا مەسەلەی کورد لە هەمیشە گەورەتر بۆتەوە، لە هەمیشە زیاتر چۆتە سەر میدیای جیهانی. هەڵبەت هێشتا هیچ بەشێکی کوردستان لە بەڵگەنامە نێونەتەوەییەکاندا گارانتییەکی بۆ مافی خۆی نییە، راستە هێشتا هیچ کام لە دەوڵەتە گەورەکان بەڵێنێکی رەسمییان نەداوە بۆ ئەوەی تەنانەت مافی فێدراڵیش بەرەسمی دەناسن، بەڵام ئەمە بەو مانایە نییە کورد بەشێوەی دۆفاکتۆ و عەمەلی هیچ دەسکەوتێکی بەدەست نەهێناوە. تەنانەت هەتا راپەڕینی ساڵی ۱۹۹۱ و تا ئەم دوو سێ ساڵی رابوردوو، مەسەلەی کورد تا رادەیەکی زۆر تەنیا وەکوو مەسەلەیەکی ئینسانی، وەکوو مافی مرۆڤ، وەکوو مەسەلەی ئاوارەکان، وەکوو مەسەلەی ئەوانەی کە دەربەدەر بوون و دەبێ بچنەوە سەر ماڵی خۆیان دەناسرا و، سەرجەم لە چوارچێوەی مافی مرۆڤدا چاوی لێدەکرا. ئەوەی دەبێ هەوڵی بۆ بدرێ و ئێمە بەبەشی خۆمان و لە چوارچێوەی ئەوەندە پەیوەندە جیهانییە کە هەمانە بەراشکاوانە هەوڵمان بۆ داوە، ئەوەیە کە بسەلمێندرێ مەسەلەی کورد مەسەلەیەکی سیاسییە، مەسەلەی مافی دیاری کردنی چارەنووسە و هەر بەم پێوانەیەش دەبێ حیسابی بۆ بکرێ و شیاوی دەستەبەر کردنی پشتیوانیی جیهانییە بۆ خۆی.

هەر لە سەر ئەو ئەساسە بوو کە لە دەورەی رابوردوودا ئێمە سەرجەم پشتیوانیمان لە ئەزموونی کوردستانی عێراق کرد. ئێمە بێرەخنە نەبووین و نین بەرامبەر بەم ئەزموونە، بەڵام پێمان وابووە و پێمان وایە لە پاڵ رەخنەیەکی سازندە کە لەم ئەزموونە دەگیرێ، ئەوەش نابێ لە بیر بچێتەوە کە لەناو چوون و فەوتان و هەڵوەشانەوەی ئەم ئەزموونە مانایەکی دیکەی نییە بێجگە لەوەی کە جارێکی دیکە کورد لە هەموو ناوچەکان و

لە هەموو بەشەکانیدا پاماڵ بکرێتەوە. بۆیە وەکوو حیزبێکی مەسئوول بەرامبەر بەو ئەزموونە جووڵاوینەتەوە، لە کرداری خۆمان، لە چالاکییەکانمان و لە هەڵوێستی سیاسیماندا دڵسۆزانە بەرامبەر بەو ئەزموونە هەڵسوکەوتمان کردووە و ئەوە بە سیاسەتێکی دروست و رەسەنی کۆمەڵە دەزانین.

تا ئەو جێگایەی دەگەڕێتەوە سەر کوردستانی ئێران، ئەو پێناسەی کە ئێمە لە خۆمان کردووە یا ئەو خەسڵەتەی کە ئێمە بەدروست بۆ خۆمانمان داناوە، یانی ئاڵاهەڵگری بزووتنەوەی رزگاریی نەتەوەیی کوردستان و رابەر و پێشەنگی جووڵانەوەی شۆڕشگێڕانەی گەلی کورد لە ئێران، لەم سێ چوار ساڵی رابوردوودا ئێمە هەنگاوی گەورەمان بۆ هاویشتووە. بە دڵنیاییەوە دەتوانم بڵێم ئێمە جێی خۆمان وەکوو داکۆکیکاری سەرسەخت و شەفاف و لێبڕاوی ئەم بزووتنەوەیە و خواستەکانی، بە کوردی ئێران، بە کوردی ناوچەکە و تارادەیەکیش بە دنیا ناساندووە. ئێمە بووین کە دروشمی فیدراڵیمان هێنایە کوردستانی ئێران، بە شوێنیشیدا ئێمە بووین کە شیعاری بەرەی کوردستانیمان لە کوردستانی رۆژهەڵات هەڵگرت و بەو شێوەیە نیشانمان دا کە نەك لە هەڵوێستی سێکتاریزمی حیزبی و رێکخراوەییەوە، بەڵکوو لە روانگەی رێبەرایەتی، خاوەن مەسئوولییەت بوون و بەدەربەست بوون لە بەرامبەر سەرجەم بزووتنەوەکەدا هەنگاو هەڵدەگرین و ئاوا هەڵسوکەوت دەکەین. چەسپاندنی ئەم لایەنەش لە خەسڵەتی کۆمەڵە و سیاسەتەکانی لە کوردستاندا شتێکی کەم نییە. نەك هەر لەنێو کوردستانی ئێران بەڵکوو لە بەشەکانی دیکەی کوردستان و لەنێو حیزبە کوردستانییەکانی عێراق و سووریە و تارادەیەك تورکیەش ئێمە لەم بارەیەوە جێگەی خۆمان کردۆتەوە.

ئێمە لەم سەردەمەدا زۆر زیاتر لە جاران لەگەڵ میدیا و رۆژنامەکان و تەلەڤیزیونەکانی دنیا وت و وێژ و موساحەبەمان لەگەڵ کراوە؛ ئەهمیەتمان بۆ دانراوە، تەنانەت جاری وا هەبووە ئەوان روویان لە ئێمە کردوە، بەڵام ئێمە نەمان ویستووە لە هەموو میدیایەك زاهیر بین یا لە هەموو کۆبوونەوەیەکدا بەشداری بکەین و رەدمان کردۆتەوە. ئەم سەردەمە لە زۆر کۆڕ و کۆبوونەوەی ئێرانی و کوردی بەشداریمان کردووە و توانیومانە سەرنجی رای گشتی کوردی دەرەوەی وڵات و تارادەیەك رای گشتی ئێرانی دەرەوەی وڵات بۆ لای خۆمان راکێشین. هەرچەند لەم بارەیەوە کەم و کووڕیمان کەم نییە و پێویستمان بە کاری بەردەوام هەیە.

ئێمە لە کۆنفرانسی هەشتەم چەند سیاسەتی زۆر گونجاو و باشمان پەسند کرد. تا ئێستاش ئەو سیاسەتانە بەردەوام مەوقعییەتی کۆمەڵەیان لە کۆمەڵگای ئێران و کوردستاندا روو بە باشی بردووە و بەردەوام دروست بوونی خۆیان نیشان داوە. یەك لەوانە "ئیتیحاد بۆ دێموکراسی" بوو لە ئێران. ئێمە بە لەبەر چاوگرتنی ئەوەی کە مەسەلەی دێموکراسی و ئازادیی سیاسی، تەوەرەی سەرەکیی بزووتنەوەی ئێستا و داهاتووی نزیکی ئێرانە، هەروەها بە لەبەر چاوگرتنی ئەوەی کە چەپی ئێران بەبێ بەدەستەوە گرتنی مەسەلەی دێموکراسی و ئازادیی سیاسی ناتوانێ جێپێی پێویست لە ناو کۆمەڵگادا بۆ خۆی بکاتەوە کە بتوانێ باقی ئەرکەکانیشی لەو شوێنە بەهێزترەوە بە ئەنجام بگەیەنێ، ئەو گەڵاڵەیەمان پەسند کرد. هەر وەکوو چۆن کۆمەڵە لە کوردستاندا بەبێ ئەوەی دەست بۆ مەسەلەی نەتەوەیی و بۆ بزووتنەوەکەی بەرێ و خۆی بکاتە خاوەنی، شەفافتر لە هەموان بیهێنێتە گۆڕێ، بەرنامەی بۆ دارێژێ، لە خەڵکی زیاتر کاری بۆ بکا و فیداکاری بۆ بکا، بەبێ ئەوانە نەیدەتوانی ئەو مەوقعییەتەی هەبێ کە ئێستا وەکوو چەپێکی سۆسیالیست لە کوردستاندا هەیەتی، عەینی شتیش سادقە

بۆ باقی ئێران. یانی چەپی ئێرانی ئەگەر مەسەلەی دێمۆکراسی فەرامۆش بکا، نەك هەر ئەوە، ئەگەر خۆی نەکاتە خاوەنی ژمارە یەکی دێمۆکراسی، بۆخۆی کز دەبێ و دەچێتە پەراوێزەوە و ئەرکە چینایەتییەکانیشی بۆ ئەنجام نادرێ و لە لایەکی دیکەشەوە لیبراڵەکان دەبنە شاسواری مەیدانی دێمۆکراسی خوازی. هەمووشمان دەزانین ئەوە چ زەرەر و زیانێکی گەورەی پێوەیە. چوونە پەراوێزی چەپ و هەروەها مەیدانددار بوونی لیبرالیزم و فەلسەفەکەی و بەهاکانی لە بابەت دێمۆکراسیدا، وەکوو هەمووان دەزانین، دێمۆکراسی بەرتەسك و مەحدوود دەکاتەوە. راستە بەرتەسکترین لیبرالیزمیش هەزار بەرتەری هەیە بە سەر رژیمێکدا کە ئێستا لە ئێران لە سەر کارە. بەڵام لیبرالیزم بە تەبیعەتی خۆی دێمۆکراسی بەرتەسك دەکاتەوە، لە چوارچێوەی پارلەمانێك دا قەتیسی دەکا، "دێمۆکراسیی موشاریکەتی" نابینێ، بەشداریی جەماوەر لەو دێمۆکراسییەدا لە بەرچاو ناگرێ و ئەوە زەرەر و زیانێکی گەورەی هەیە بۆ ئێران.

بە لەبەر چاو گرتنی هەموو ئەوانە، ئێمە پیمان وابوو بەرەیەکی فراوانی "ئیتیحاد بۆ دێمۆکراسی" لە ئێران پێویستە. ئەگەر چەپی ئێران بەراستی مەسئوول بێ، بێدار بووبێتەوە، توانیوبێتی چۆن ئێمە بازسازی خۆمان و ساغکردنەوەی خۆمان کرد لە ناو کۆمەڵەدا، ئەویش بیکا، دەتوانێ نەقشێکی گەورەی لەو بەرەیەدا هەبێت. ئێمە بارەها باسمان کردووە کە چەپی ئێرانیش پێویستی بەو بازسازییە هەیە لە نێو خۆیدا. ئەگەر کردی و توانی، حەقی خۆیەتی کە دەوری سەرەکی بگێڕێ لەم ئیتیحاد بۆ دێمۆکراسییەدا. بەڵام لە هەمان حاڵدا مەبەست لەم ئیتیحاد بۆ دێمۆکراسییە تەنیا کۆکردنەوەی چەپ نییە، هەدەف ئەوەیە گەورەترین هێزە کۆمەڵایەتییەکان بێنە پشتی و لە شێوەی حەرەکەتێك یا بزووتنەوەیەکی نوخبەکان ئەویش نوخبەکانی چەپ بێتە دەرەوە و ببێتە بزووتنەوەیەکی فراوانی جەماوەری. ئێستا خواستی دێمۆکراسی لە ئێران مۆنج دەدا، خواستی جودایی دین و دەوڵەت، یەکسانیی مافی ژنان، ئازادیی سیاسی و چاپەمەنی، ئازادیی ئەحزاب، ئازادیی تاکە کەس، خواستی بەرەسمی ناسینی پلورالیزم و فەرەچەشنی، خواستی میللی و فەرهەنگی، هەموو ئەوانە لە ئێران خوازیارانی یەکجار زۆری هەیە. ئێمە پێمان وایە هەقە ئەم خواستانە کۆبکرێنەوە و ببن بە هێزێکی گەورەی گۆڕان لە ئێراندا. دیارە ئێمە تەنیا حیزبێك نین کە ئەو خواستەمان هەیە، بەڵام ئێمە بەبەشی خۆمان زۆر بە رۆشنی بەیانمان کردووە، لە چەندین کۆڕ و کۆبوونەوە و کۆنفرانسدا ئەوەمان باس کردووە، لە بڵاوکراوەکانی خۆماندا هێناومانەتە گۆڕێ. بەڵام تا چ ئەندازە لەوەدا چووینەتە پێش؟ نە بەخاتری کەمکاریی ئێمە بەڵکوو بە خاتری وەزعییەتی سیاسی ئێران جارێ هێشتا دوورین لە جێبەجێ بوون و وەدی هاتنی ئەم خواستە و دروست کردنی جەبهەیەکی ئاوا بەرینی دێمۆکراسیخوازانە لە ئێران. بەڵام هیچ نەبێ ئەوەندی تێدا بووە کە کۆمەڵە وەکوو حیزبێکی جیددی سیاسی لەنێو حیزبە ئێرانییەکان و لەنێو کەسایەتییە سیاسییەکان هاتوتە گۆڕێ. زۆرێك لەو کۆنفرانسانەی لە دەرەوەی وڵات دەگیرێ کۆمەڵەی تێدا دەعوەت و بانگهێشتن دەکەن، سوخەنڕانانی ئێمە لە بەعزێك لەو کۆنفرانسانەدا کە بەشدارییان کردووە سەرنجیان بۆ لای خۆیان راکێشاوە، زۆر کەس بەو نەتیجە گەیشتوون کە "بچەهای کومله حرفی برای گفتن دارند". جا بە میدیاکانەوە، بەو کۆنفرانسانەوە و بەو حوزووری ئێمە لە هەندێك لەو بۆنانەدا، دەتوانم بڵێم جارێکی دیکە زۆرێك لە رەهبەرانی کۆمەڵە کەسایەتیی ناسراو و باوەڕ پێکراوی نێو سەرجەم بزووتنەوەی سیاسی ئێرانن و ئەوەش دەسکەوتێکی کەم نییە.

وەختێك باسی کار لە سەر ئیتیحاد بۆ دێمۆکراسی دەکەین پێویستە راستییەك یادئاوەری بکەین. راستە ئێمە حیزبێکی کوردستانین و ئەو تەعریفەمان لە خۆمان کردووە، بەڵام مەعنای ئەوە نییە کە سیاسەتی سەرتاسەریمان نییە. ئێمە ئیدیعای ئەوەمان نییە و بە ئەرکی رێکخراوەیی خۆمانی نازانین کە هەموو ئێران و هەموو چینی کرێکار لە ئێران رێك خەین. ئەو ئیدیعایانە رەنگە خەڵکی دیکە بیانبێ کە بە نیوەی نیوەی ئێمەش بۆیان ناکرێ. بەڵام کوردستانی بوون ئێمە مەعنای ئەوە نییە سیاسەتی سەرتاسەریمان نییە. ئێمە بە چەندین دەلیل دەبێ سیاسەتی سەرتاسەریمان هەبێ:

یەکیان ئەوەیە کە وەکوو بیروباوەڕ، وەکوو هەدەفی سیاسی، بەحەقیقەت بەلای ئێمەوە گرینگە کە لە ئێرانی داهاتوودا چینی کرێکار بتوانێ وریا بێ و نەقشێکی باشتر بگێڕێ، بزووتنەوەی چەپ لە ئێران بەهێز بێ و بتوانن لە پەرەوازەیی بێنە دەر و یەکگرتوو بن لەناو خۆیاندا. ئێمەش دەبێ ئەوەندەی بتوانین کومەك بکەین و یارمەتیدەر بین بۆ ئەوە مەبەستە.

هەروەها ئێمە بۆمان موهیمە کە هێزە دێمۆکراتە راستەقینەکان، ئەو هێزانەی کە دەتوانن لە راستای دێمۆکراتیزە کردنی ئێراندا کار بکەن، ئەوان دەستی باڵایان هەبێ لە ئێراندا. ئێمە بە پێی سیاسی لەگەڵ ئەوەین، نەك هەر لە ئێراندا بەڵکوو لە هەموو ناوچەکە لایەنگری ئەوەین، لە هەموو جیهان لایەنگری ئەو دێمۆکراتیزە بوونەین.

بەڵام بێجگە لەوانە، بە حیسابی پەیوەندی نزیك و بەرژەوەندی ئەو دووانەش ئێمە هەر لەگەڵ ئەو هاوکاری و پەیوەندییەین. ئێمە پێمان وایە گەشە کردن و سەرکەوتنی بزووتنەوەی کوردستان لە عەینی حاڵدا دەتوانێ ببێ بەپاڵپشتێکی زۆر باش بۆ هەموو بزووتنەوەی ئازادیخوازانە و چەپ و کرێکاری و پێشکەوتنخوازانە لە ئێران و تەجروبەی ٢٥ی ساڵی رابوردووش هەر ئەوە نیشان دەدا. لە رابوورووشدا، لە ١٣٥٧ هەتا ساڵەکانی دوایی کە بزووتنەوەی کوردستان دەورێکی جیددی هەبووە و کاریگەری هەبووە لە سەر کوردستان و ئێران، بە حەقیقەتیش وا بوو. پێچەوانەکەشی راستە، یانی بە هەر رادەیەك کە کۆنەپەرستی و ئیستیبداد لە تاران سەرکەوێ، بە هەمان رادەش بزووتنەوەی کوردستان دەکەوێتە ژێر فشارەوە، دەکەوێتە ژێر مەترسیی قەلع و قەمع و لێدان و داپڵۆسینەوە. لەبەر ئەوە، سەرەڕای باوەڕ و پرەنسیپ و جیهان بینی سیاسیمان، مەسڵەحەت و بەرژەوەندیشمان دەخوازێ، چ بۆ دێمۆکراتیزە کردنی ئێران و بەهێز کردنی حەرەکەتی پێشکەوتنخواز لەوێ و چ بۆ بەهێز کردنی بزووتنەوەی کوردستان و پاراستنی لە زەبری ئیرتیجاعی مەرکەزی، ئێمە ئەو هاوکاری و نزیکایەتییەمان هەبێ.

مەسەلەیەکی دیکە کە دیسان لە کۆنفرانسی هەشتەمەوە ئێمە شیعارکەیمان هەڵگرتووە و دوای کەوتووین، بریتییە لە مەسەلەی بەرەیەکی کوردستانی. پێم خۆشە بەکورتی باسێکتان بۆ بکەم کە بە کوێ گەیشتووە و هەروەها لە داهاتوودا چی لەسەر بکەین. لە چەند ساڵ پێشترەوە و، ئەگەر دەقیقتر بڵێم لە ساڵەهای ساڵ لەوە پێشەوە، کۆمەڵە لەو بڕوایەدا بووە کە دەبێ پلاتفۆرمێکی دێمۆکراتیکی کوردستانی هەبێ کە تێیدا هەم داخوازییە نەتەوایەتییەکانی گەلی کورد دیاری کرابێ و هەم ئازادی و مافە سیاسییەکانی خەڵکی کوردستان دەست نیشان کرابێ. ئەو پلاتفۆرمە دەبێ لە لایەن هەموو حیزب و لایەنەکانەوە پەسند بکرێ و بەڵێن و

ئیلتیزامیان بە پاراستن و رەچاو کردنی ئەو خاڵانە دیار بێ. هەروەها نێوانی خودی حیزبەکانیش لە چوارچێوەی قەواعیدێکی دێموکراتیکدا دیاری کرابێت و ململانێ و کێشەی ئەوانی، کە رەقابەتێکی مەشرووعە لە کوردستاندا، لە چوارچێوەی ئەو قەواعیدە دێموکراتیکەدا هێشتبێتەوە و دەست نیشانی کردبێ. لە کۆنفرانسی هەشتەم دوای باس و لێکدانەوەی زۆر و دوای زۆر ئاڵوگۆڕی بیروڕا لەگەڵ لایەنی دیکە، ئێمە سەرەنجام ئەو دروشمەمان هەڵگرت.

گەلاڵەی بەرەی کوردستانی چ پێشوازییەکی لێکرا؟ لە دەرەوەی وڵات دەتوانیم بڵێم تا رادەیەکی باش پێشوازی لێکرا، کۆڕ و کۆمەڵی لە سەر گیرا، باسەکەی هاتە سەر ئینتێرنێت، چووە ناو بەعزێك کۆنفرانس و کۆبوونەوە، خەڵکانێك خۆیان بوون بە خوازیارانی پلاتفۆرمێکی کوردستانی کە ئێمە پێمان هەنگاوێکی موسبەتە و، دەستیان گرد بەوەی سایتێکی ئینتێرنێتی بۆ بکەنەوە و کاری بۆ بکەن. لەو بەینەدا، بە تایبەتی لە سەرەتاکانی، قسە و قسەڵۆکیش هەبوو بەرامبەر بە کۆمەڵە، بەڵام ئەوە زۆری پێنەچوو و جێگەی خۆی دا بە بەحسێکی سیاسی و جیددی لەو بارەیەوە و هەموو کەس زانی لە ناو هێزەکانی کوردستانی ئێران ئەوە کۆمەڵەیە کە پەیگیرتر و لیبراوانەتر و دڵسۆزانەتر لە هەمووان بەراستی حازرە بۆ پێك هێنانی بەرەیەکی کوردستانی. لە ناو کوردستانی ئێران تا ئەو جێگایە کە ئێمە بیستوومانە دەنگێکی باشی داوەتەوە، لەنێو پێشڕەوانی سیاسی و رۆشنبیریدا زۆر وەڵامی موسبەتمان وەرگرتۆتەوە و زۆر کەس تەنانەت فشاری هێناوە کە ماندوو نەبین و کۆڵ نەدەین لەو پرۆژەیە و وەدوای بکەین. ئێمەش پێمان وایە نابێ ماندوو بین و نابێ کۆڵی لێبدەین. هەوڵی خۆشمان لەگەڵ لایەنەکانی دیکە داوە، بەڵام پێم خۆشە لەم کۆنگرەیەدا بە ئاگاداریی هەموو بەشداربووان بگەیەنم کە بەداخەوە ترس لە نوێخوازی و هەڵگرتنی هەنگاوی تازە، محافەزەکاری و ترس لە ئاڵوگۆڕ و لە هێنانە گۆڕی دروشم و سیاسەتی نوێ و، پاوانخوازی لە سیاسەتدا، تا ئێستا نەیهێشتووە کە لایەنەکانی دیکە لە سەر ئەم خواستی بەرەیەکی کوردستانی لەگەڵ ئێمە پێك بێن. بە هەموو ئەوانەشەوە دەبێ ئێمە هەوڵی خۆمان لە ئاستی هەموو کۆمەڵگای کوردستان و هەروەها لە دەرەوەی وڵات بۆ ئەو مەبەستە درێژە پێبدەین.

ئێمە لە کاری رێکخستنی نێوخۆیی لە کوردستانی ئێران، لە کاری پەیوەند و چاوپێکەوتن و رێکخستنی نهێنی لەم دوو سێ ساڵەدا هەنگاوی گەورەمان هەڵگرتووە. نەك هەر بە کەمییەت ئەوانە زۆر زیاتر بوون لە جاران، بەڵکوو بە کەیفییەتیش فەرقیان کردووە و وردە وردە خەریکە دابەش کردنی کار تێیاندا شکڵ دەگرێ و مەسئوولییەتی دیاریکراو وردە وردە جێی خۆی لە بوواری کاری رێکخستنی نهێنیمان لە کوردستاندا دەکاتەوە. کەسانێك کە ئێستا لەو رێکخستنانەوە لە کۆنگرەی ١٠ی کۆمەڵەدا بەشداری دەکەن، بەشێکی زۆر زۆر کەمن لەوانەی کە دەیانتوانی و بەراشکاوییەوە دەڵێم جێی خۆی بوو لەم کۆنگرەیەدا بەشداری بکەن. بە هەموو ئەو کەسانەشەوە کە سەردانی کۆمەڵەیان کردووە، سەردانی کۆمیتەی زاگرۆسیان کردووە و خەڵکی وەکوو ئێمە مانانیان لێرە دیوە و پەروەندەی تەشکیلاتییان لای ئێمە هەیە، هەموو ئەوانەش بەشێکی زۆر زۆر بچووکن لە هەموو ئەو تێکۆشەرانەی کۆمەڵە کە بەپانایی کوردستان تێدەکۆشن. زۆرێکیان تێکۆشەرانی دێرینی کۆمەڵە بوون، هەن تێیاندا لە حیزبی دیکەوە هاتوون، هەن تێیاندا جەوانترن، هەن تێیاندا ساڵەهایە پێوەندیان پچڕاوە،



بەڵام بەشی هەرە زۆری ئەوانە هێشتاش بە شێوەی ڕاستەوخۆ لێرە لەگەڵ زاگرۆس پێوەندیان نەگرتووە. بۆیە دەڵێم دەفتەرەکانی زاگرۆس بەشێکی زۆر بچووکی چالاکان و هەڵسووڕاوان و تێکۆشەرانی ڕێبازی کۆمەڵە لە کوردستان یانی زاگرۆسی گەورەی ئێمە نیشان دەدەن.

خاڵێکی دیکەی جێگەی دڵخۆشی لە کاری نهێنیماندا ئەوەیە کە ئێمە وردە وردە شاهیدی پەرە سەندنی جوغرافیایی هەڵسووڕانی کۆمەڵەین. ئێمە خەریکین بەرەو کرماشان و ئیلام پەل دەهاوێین و ئەمە مەسەلەیەکی گەورە و ئەساسییە. هاوڕێیان، نەك تەنیا بۆ ڕێکخستنی ئێمە بەڵکوو بۆ چارەنووسی بزووتنەوەی کوردستان ئەساسییە کە کرماشان وئیلام لەگەڵمان بن. ئەوان لە باری ئێتنیکییەوە دیارە لەگەڵ کوردن، بەڵام لە باری بزووتنەوەی سیاسییەوە، هیچ نەبێ لە دەهەکانی رابوردوودا، بەو شێوە فراوانەی پێویستە لەناو بزووتنەوەی کوردستاندا نەبوون. بەڵام لە سەردەمی نوێدا ئێمە شاهیدین کە بزووتنەوەی کوردی لە کوردستانی ئێران وردە وردە پەرسەندنێکی جوغرافیایی بە خۆیەوە دەبینێ، لە موکریانەوە و لە سنەوە بەرەو جنووبتر تەشەنەی سەندووە. ئەو شانازییە بۆ کۆمەڵە هەیە کە بە پێشەنگی و ڕێبەرایەتیی کۆمەڵە بوو کە لە سنە و ئەو بەشە لە جنووبی کوردستان بزووتنەوەیەکی کوردیی شۆڕشگێڕی رادیکاڵی ئاوا سەری هەڵدا و هەموو جێیەکی تەنییەوە، بەها و ئەرزشی تازەشی لەگەڵ خۆی هێنایە نێو بزووتنەوەی ڕزگاریخوازیی کوردستان. سەردەمی داهاتوومان سەردەمی پەرەسەندن بەرەو کرماشان و ئیلامە. ئەوانە بەشێکی هەرە بەرچاوی کۆمەڵگای کوردی ئێران پێك دێنن. لە بیرمان نەچێ کە لە بەرنامەی کۆمەڵە بۆ حکوومەتی فێدراڵی کوردستان ئێمە داوا دەکەین هەموو ئوستانە کوردنشینەکانی ڕۆژئاوای ئێران لە یەکەیەکی سیاسی، لە واحیدێکی سیاسی و ئیداریدا، کۆبنەوە و دەسەڵاتێکی سیاسیی یەککگرتوو پێك بێنن. ئەگەر بزووتنەوەی ڕزگاریخوازانەی کوردی بە پێشەنگایەتیی کۆمەڵە بتوانێ ئەو بەشە لە کوردستان، بە سەرچاوەی ئابووری و کانگاکانییەوە، بەهێزی ئینسانی و ژمارەی دانیشتوانیانەوە و بە گرینگیی سیاسییانەوە، بخاتەوە سەر بزووتنەوە سیاسییەکەی کە لەبوواری فەرهەنگ و زمانەوە لەگەڵیەتی، بە بڕوای من گەورەترین سەرکەوتنی بە دەست هێناوە. سەرکوتی کوردستانی ئاوا و بزووتنەوەیەکی ئاواش لە داهاتوودا هاسان نابێ. لەو شوێنانەش کە هەمیشە لێی بووین و پێشینەی کاری زۆرمان هەیە، ئێستا خەریکین کارەکەمان چڕوپڕتر دەکەینەوە، بۆ نموونە ئێستا لە مەهاباد و هێندێك شوێنی دیکە لە ژێر ئەم خەفەقانەشدا خەریکین زیاتر لە هەمیشەی کۆمەڵە نفووز و پێگەی سیاسی و کۆمەڵایەتی بەدەست دێنین و جێگەی خۆمان وەکوو حیزبی جێی بڕوا و قسە و سەرنجی خەڵکی دەکەینەوە.

لە بوواری کار لەناو کوردستانی ئێراندا، هەروەکوو ئاماژەیەکی کورتیشم پێکرد، پێم خۆشە پێتان بڵێم کە نەك تەنیا تێکۆشەرە دێرینەکانمان، جا پێشمەرگایەتی یا سیاسی بن، بووژاندۆتەوە و زۆربەی هەرە زۆریانمان لەگەڵ خۆ خستۆتەوە، بەڵکوو زۆر کەسی تازەشمان پێ‌پەیوەست بوون، زۆر لە لاوان و نەسڵی تازەمان پێ‌پەیوەست بووە. جارێکیان دۆستێکی خۆمان کە ڕاستەوخۆ کۆمەڵەش نییە، وەکوو سەردان سەردانی ئێمەی کردبوو، دەیگوت من نازانم ئێوە چیتان لەو گەنجانە کردووە و چیتان پێ وتوون، بەڵام حەقدە هەژدە ساڵەکان لەگەڵ کۆمەڵەن. نازانم ئایا ئەم قسەیە بەتەواوی ڕاستە یان نا، بەڵام بێگومان ئێمە نفووزێکی چاکمان لەنێو ئەوان بەدەست هێناوە. ئەگەر وتەی ئەو دۆستەمان بەتەواویش وا نەبێ دەبێ وای لێبکەین. ئێمە پێویستمان بە

هەموو نەسلەکان هەیە. پێویستمان بەو گەنجە ١٧_١٨ ساڵانە هەیە کە بێترس دێنە مەیدان. بەردەڤرکێ کەم نییە، هاوڕێیان. خۆپیشاندان کەم نییە، وەستانەوەی بوێرانە لە بەرامبەر هێزە سەرکوتگەرەکان کەم نییە. زۆرێك لە ئێمە کاتی خۆی لەوەوە دەستمان پێکرد. من لە لایەن کۆمیتەی ناوەندی و هەموو ئێوەوە سڵاوێکی گەرم و گوڕ دەنێرم بۆ ئەو رۆڵانەمان، سپاسیان دەکەم بۆ هەموو بوێرییان، داوادەکەم ئەوەندەی دیکە ژیریشی تێکەڵ کەن. ئەوان هێزێکی گەورەی گۆڕانی سیاسین لە داهاتووی کوردستاندا. هاوڕێیانی بەشی زاگرۆس! ئەی هەموو ئەوانەی لە کوردستانی ئێران کار دەکەن! بەوانەی لێرەن و لێرە نین، بەوانەی ئێستا و لە داهاتوودا دەنگی من دەبیستن، هەموو مەدرەسە راهنماییەکان و دەبیرستانەکان لە سەرتاسەری کوردستاندا بکەن بە ئامانج و هەدەفی بڵاوکردنەوە و کاری سیاسی و رێکخستنی خۆتان. لە هەموو شارەکان، دابەشیان کەن، یەك تاقە دانەیان مەبوێرن، یەك تاقە دانە مەدرەسەی راهنمایی و بەتایبەتی دەبیرستان لە سەرتاسەری کوردستان، هەر لە سۆما و برادۆست و سنووری تورکیەوە بگرە هەتا خواروی ئیلام، نابێ بمێنێتەوە کە بە کاری راگەیاندن و کاری سیاسی و رێکخستنی کۆمەڵە دانەپۆشرێ. ئەوە ئێمە سەرکەوتوو دەکا.

چالاکیی پێشمەرگە چۆن بووە لەم سەردەمەدا؟ هاوڕێیان، لەناو هەموو حیزبەکانی کوردستانی ئێران کە لە خاکی کوردستانی عێراقدا مارنەتەوە و لێرە ئۆردووگا و بنکە و پایەگایان بووە، ئەوە تەنها کۆمەڵە بوو کە لە چەند ساڵی رابووردوودا پێشەنگیی بووژاندنەوەی چالاکیی پێشمەرگانەی لە کوردستانی ئێران کرد. لە سەختترین هەلومەرجدا، بە کەمترین ئیمکاناتی ماددی، جەوانەکان بەبێ هەبوونی ئەزموونی پێشوو، بەبێ شارەزاییەکی کافی، زۆریان بۆ یەکەم جار بە جلی پێشمەرگایەتییەوە بەڵام لەژێر چاودێری و سەرپەرشتیی راستەوخۆی فەرمەندەکانی پێشووی خۆمان و بە پشت بەستن بە حوزوور و ئەزموونی ئەوانەوە، روویان کردە خاکی کوردستانی ئێران و بە چالاکیی خۆیان کارێکی وایان کرد کە پێشمەرگەی کۆمەڵە جارێکی دیکە توانی هومێد و هیوا ببەخشێتەوە بە خەڵك.

پێویست ناکا لە سەر سیاسەتەکانمان لەم بارەیەوە زۆر بڕۆین، بارەها باسمان کردووە و لە راگەیاندن و گۆڤارەکان و گوزارشەکان و لە کۆنگرە و کۆنفرانسەکاندا لێیکۆڵیوینەتەوە. ئێمە هێزی پێشمەرگەی کۆمەڵە رادەگرین، پەرەی پێدەدەین، باری دێنین، لە کاتی پێویستیشدا چالاکی پێدەکەین. بەڵام هەرگیز لەبیرمان ناچێتەوە چالاکیی پێشمەرگانەی ئەم سەردەمەی کۆمەڵە دەبێ لە خزمەت ئەو ئامانجە سیاسییە دابێ کە لە کوردستانی ئێران هەمانە. هەر بۆیەش ئێمە چالاکیی ئێستامان بۆ کاری راگەیاندنە، بۆ بووژاندنەوە و بەرزکردنەوەی ورەی سیاسی خەڵکە، بۆ گەشاندنەوەی رۆحی شۆڕشگێڕی و جەسارەتە لە لاوانی کوردستاندا، بۆ بەرزکردنەوەی ناوی کۆمەڵەیە، بۆ دڵخۆش کردنی ئەو کەسانەیە کە لە کوردستانی ئێران ئاواتیانە جارێکی دیکە پێشمەرگەی کۆمەڵە بە چاوی خۆیان ببینن و بە نەسلی جەوانی خۆیانی نیشان بدەن کە نەیان دیتووە، بۆ ئەوەیە بە هەموو گەلی کورد و خەباتکارانی کوردستانی نیشان بدەین کە هێزێکی پاڵپشتیان هەیە کە لە تەنگانەدا لە سەریان دەکاتەوە و ئەو پەیامەیان پێدەدا کە ئێوەش بێکەس نین، ئێوەش هێزێکتان هەیە کە باڵی چەکداری ئەم بزووتنەوەیە و دەتوانێ گورز بوەشێنێ. بە هەموو ئەوانەشەوە، ئەو سیاسەتە گشتی و سەرەکییەی خۆمان لە بیرناچێتەوە کە ئێمە تەئکیدی سەرەکیی خۆمان دەبێ بخەینە سەر بزووتنەوەی سیاسی،



بزووتنەوەی مەدەنی، بزووتنەوەی ڕێکخستنی جەماوەری، بزووتنەوەی ئێن.جی.ئۆکان، بزووتنەوەی ڕێکخستنی حیزبی، بزووتنەوەی ڕۆشنبیری، بزووتنەوە کرێکارییەکان، بزووتنەوەی خوێندکاران و دانشئامووزان و ژنان و تا دوایی. پێم وایە کۆمەڵە زۆر بە دروستی توانیویەتی جێگە و مەکانی هێزی پێشمەرگە و چالاکییەکەی لە سیاسەتی ئەمڕۆی خۆیدا ڕۆشن بکاتەوە و ئەمەش شانازییەکی دیکەیە بۆ کۆمەڵە. ڕەنگە خەڵکی دیکە بە دوای ئێمە چووبن، بەڵام ئەو مەیدانە ئێمە کردمانەوە و ئەو ڕێگەیە هێزی پێشمەرگەی کۆمەڵە هەمواری کرد، سپاس بۆیان.

لە بوواری پەیوەندی لەگەڵ نەتەوەکانی ئێران چۆنین؟ لە دەورەی ڕابوردوودا ئێمە لەگەڵ هەندێك لە نوێنەرانی نەتەوە بندەستەکانی ئێران ئاشنایەتی و نزیکایەتییەکمان پەیدا کرد. من ناڵێم هێشتا بە ئەندازەی پێویست چڕوپڕە یان بەئەندازەی کافی کارگەری هەیە لە سەر سیاسەتی ئێران. بەڵام هاوڕێیان، ئێرانی داهاتوو وەکوو جاری پێشوو نابێت. وانابێ فەقەت کورد سەرهەڵبدات، تورکمەنێك بەحاڵ سەردەربێنێ و سەرکوت بکرێ، عەرەبێکیش دەنگێکی لێوە بێ، تیمساری دوێنێ و ئۆپۆزیسیۆنی ئەوڕۆ، تیمسار مەدەنی، بچێ سەرکوتیان بکا. ئێرانی داهاتوو بێگومان مەسەلەی چارەسەر نەکراوی نەتەوایەتی تێیدا دەتەقێتەوە. من ناڵێم هەمووشی پێشکەوتنخوازانە دەبێ، ڕەنگ بێ شۆڤینیزم لە میللەتانی بندەستیشدا هەبێ و تەشەنەش بکا لە داهاتوودا. لەوانەیە ئەمە لە داهاتوودا مەترسییەك بێ. بەڵام ئەوەش میراتی سیاسەتی ستەمی نەتەوایەتییە. هێندێك لە نەیارانی ئێمە تاوانبارمان دەکەن بەوەی کە گۆیا ئێمە شەڕی قەومی پێك دێنین، نا، ئێمە پێکی ناهێنین. ئەوە دەیان ساڵ ستەمی نەتەوەیی و زیندان کردنی گەلانی بندەستە، دەرفەت پێنەدان بەوانە بۆ ئەوەیکە گەشەی سیاسی و ڕۆشنبیریی خۆیان بکەن، کە لەوانەیە سبەیرۆژ بەو شکڵە خۆی دەرخا. بەڵێ، مەترسیی ئەوە هەیە کە ناسیۆنالیزمە نەتەوەییەکان لە بەرامبەر یەکتردا بوەستنەوە و شەڕی خوێناوی ساز بێ. بەڵام ئەو سیاسەتەی کە ئێمە پێشنیازی دەکەین و ئێمە ڕەچاوی دەکەین، یانی دیمۆکراتیزە کردنی ئێران و نەهێشتنی ئاسەواری ستەمی نەتەوەیی و بەرەسمی ناسینی مافی نەتەوەکان، کاریگەرترین گارانتییە بۆ ئەوەی وا پێش نەیەت. وڵاتێکی وەکوو ئێران کە تێیدا نیزامی فیدراڵی بەرقەرار بێت، وڵاتێك کەتێیدا مۆڵەت بە خوێندنی زمانی زگماك و دایکیی نەتەوەکان بدرێ، وڵاتێك کە تێیدا ئازادیی فەرهەنگی و سیاسی بە میللەتان بدرێ و ئەو میللەتانە مافی گەشە کردن و مافی دەسەڵاتی ناوخۆیی بە سەر زێدی خۆیاندا بە دەست بێنن، بەهەمان ڕادە لە شەڕی نێوخۆیی نەتەوەیی دوور دەکەوێتەوە. ئێرانێك کە تێیدا فرەچەشنیی سیاسی و فەرهەنگی و زمانی و ئێتنیکی بەرەسمی بناسرێ و ڕێزی لێبگیرێ، ئێرانێك کە تێیدا دیمۆکراسی ڕەچاو بکرێ و سەرکوتانەوە بخرێتە لاوە و ئەو دەزگا ئۆلترا سانترالیستییە داپڵۆسێنەرەی مەرکەزی جێی خۆی بدا بە حکوومەتێکی فێدراتیڤ کە نەك لە سەرووی هەمووان، بەڵکوو نوێنەری هەموو بەشەکانە و لە کۆی هەموو ئەوان پێك هاتووە، لە ئێرانێکی ئاوا دایە کە ئەگەری شەڕی نەتەوەکان لە هەمیشە کەمتر دەبێتەوە. ئەوانەی کە چ لە ڕاستەوە و چ بە ناوی چەپی توندڕەوەوە نوسخەی پێشێل کردن و نادیدە گرتنی مافی نەتەوەیی لە ئێران بۆ خەڵکی دەپێچنەوە، ئەوانەن کە لە ئێستاوە گەرای شەڕی نەتەوەیی و قەومی لە ئێران دەچێنن. ئێمە لەم بووارەدا کارمان کردووە و چەندین کۆنفرانس و کۆبوونەوەمان بووە و بە خۆشییەوە دەتوانم بڵێم کۆمەڵە لە نێو

کۆمەڵی هەڵسووڕاوانی بووری نەتەوەکانی بندەست ئیمتیبار و جێگەیەکی تایبەتی هەیە. بەشێك لەوانە لە قەتعنامەکانی خۆیاندا پرس بە ئێمە دەکەن و من لە لایەن کۆمیتەی ناوەندی و دەفتەری سیاسییەوە ئەو بڕوایە دەردەبڕم کە یەکێك لە کارەکانی داهاتووی ئێمە دەبێ ئەوە بێ کە چۆن داوای بەرەیەکی کوردستانی لە کوردستانی ئێران دەکەین، چۆن داوای "ئیتیحاد بۆ دیمۆکراسی" لە ئێران دەکەین، دەبێ دروشمی جۆرێك یەککگرتن، جۆرێك بەرەیەکی نەتەوە بندەستەکانی ئێرانیش هەڵگرین و هەوڵیشی بۆ بدەین بۆ داهاتووی ئێران.

بۆ پێوەندییە جیهانییەکان، چمان کردووە؟ ئێمە وەختێك لە حیزبی کۆمۆنیستی ئێران جیابووینەوە، هەروەکوو زووتریش باسمان کردووە، هەموو پێوەندییە جیهانییەکانمان کوێر ببوونەوە. خەڵك لەسەر کوردستانی ئێرانیان دەنووسی و کۆنفرانس و کۆنگرەی جیهانییان بۆ دەبەست بەبێ ئەوەی کۆمەڵە دەعوەت بکەن. بۆ چارەسەر کردنی ئەم کەم و کووڕییە هەوڵی زۆر درا، نەك تەنیا لەلایەن رەهبەریی کۆمەڵەوە بەڵکوو لەلایەن بەدەنەی تەشکیلات و هەڵسووڕاوانمان لە دەرەوەی وڵاتەوە هەوڵی بۆ دراوە و وردە وردە خەریکین جێ پێی خۆمان بکەینەوە. توانیمان بۆ یەکەم جار لە کۆنفرانسی گرووپی سۆسیال دیمۆکرات کە لە سەر مەسەلەی کورد دامەزرابوو بەشداری بکەین، دیارە ئەوەش بێ زەحمەت و ئەرك نەهاتە دی، زۆری کار بۆ کرا تا ئەو رێگەیەمان بۆ کراوە. بەشوێنیدا زۆرمان هەوڵ بۆ دا تا جێگەکەمان کوێر نەبێتەوە. ئاخرین رووداوێك لەم بووارەدا، بریتی بوو لەو کۆنفرانسەی دیاریەکرکە گرووپی کوردی ئەنترناسیۆناڵی سۆسیالیست پێکی هێنابوو، ئێمە دەعوەت کراین، بەڵام بەداخەوە دوو سێ رۆژ پێش ئەم کۆنگرەیە بوو و نەمانتوانی بەشداری بکەین. لە هەر حاڵدا ئەمە نیشان دەدا ئەو قەولەی بە ئێمەیان دابوو کە کۆمەڵەش بچێتە ریزی ئەو چوار پێنج حیزبە کوردییەوە کە لەو گرووپەدا بەشدارن، لەوانەیە وەدی بێت و دەبێ لەمە بەدواوەش هەر دوای بکەوین. ئێمە لە پارلەمانی دانمارك لەسەر کێشەی نەتەوەکان وتارمان خوێندەوە و پێشوازی لێکرا. لە نۆروێژیش زەحمەتی باشمان کێشاوە، پەیوەندی بەکەڵکمان گرتووە و پێشکەوتنی چاکمان بەدەست هێناوە. هەروەها ئێمە توانیمان تەماس لەگەڵ وەزارەتی دەرەوەی دەوڵەتی ئەمریکا بگرین، هەروەکوو توانیومانە لەگەڵ هێندێك لە حیزبە سۆسیال دیمۆکراتەکان و حیزبەکانی ناودەسەڵات یا دەرەوەی دەسەڵات لە وڵاتانی ئورووپایی پەیوەندی بگرین. ئێستا دەتوانم بڵێم وردە وردە کۆمەڵە لەناو ئەوان ناسراوە و باسی هەیە، قسەی موسبەتی لە سەر دەگێڕنەوە. بەڵام هاوڕێیان، ئێمە نەیارانیشمان هەبووە کە هەوڵی زۆریان داوە پێی ئێمە بۆ هیچکام لەو جێیانە نەکرێتەوە. بۆیە کاری ئەم دەورەی ئێمە هەڵسووڕانێکی سادە و ساکار نەبوو، پووچەڵ کردنەوەی درۆ و دەلەسەشی پێویست بوو. ئەو کارانە کراون و من ئەوانەش بە یەکێك لە دەسکەوتەکانی کۆمەڵە دەزانم، بەڵام هەر بەدوای ئەوەدا رادەگەیەنم کە یەکێك لە ئەولەوییەتە گرینگەکانی کاری داهاتووی ئەو کۆمیتە ناوەندییەی کە لەم کۆنگرەیەدا هەڵیدەبژێرین دەبێ بریتی بێ لە پەرەپێدانێکی زۆر زیاتر و چڕوپڕتر بە پەیوەندییە جیهانییەکانی خۆمان. لەگەڵ ئەوانەی لە سەر حوکمن یا نین، حیزبەکانن یا پارلەمانەکان و هەروەها میدیاکانی جیهانیش.

ئێمە ئەم دەورەیە لێرە لە ناو هێزی پێشمەرگە و لە ئۆردووگاکانی کۆمەڵە و لەناو ئەو تەشکیلاتەی کە ناومان لێناوە تەشکیلاتی "چیا"، لێرەش هێندیك کارمان کردووە و ئەم بەشەش پەرەپێدانێکی بە خۆوە بینیوە. لەم سێ ساڵەدا ئۆردووگایەکی تازەمان کردۆتەوە کە ئێستا فێرگەی پێشمەرگایەتیی کۆمەڵەیە و هەر لەم رۆژانەدا



خەریکی کردنەوەی ئۆردووگایەکی نیزامیی دیکەین لە شوێنێکی نزیك خۆمان. لە هەمان حاڵدا کۆمەڵێك ئۆرگان و ناوەندی تازەمان پێك هێناوە، لەوانە ناوەندی ڕاگەیاندنە کە هەوڵمان داوە هەموو کارەکانی ئینتشارات و چاپەمەنی و ڕادیۆ و گۆڤارەکانی کۆمەڵە و بە گشتی هەموو ئەوەی کاری ڕاگەیاندنە لەوێدا کۆ بکەینەوە. هەروەها بۆ ئەوەی کۆمیتەی ناوەندی پەیوەندییەکی ڕیك و پێکی لەگەڵ بەدەنەی تەشکیلات و لەگەڵ دەرەوەی خۆی هەبێ و ئەو خەدەماتەی کە بۆ ئەرکەکانی پێویستییەتی بە هاسانتر و ڕێك و پێکی بە دەستی بگات، سکرتاریەتی کۆمەڵەمان دامەزراندووە.

لەبرواری ماڵیدا چۆنین؟ لە باری ماڵییەوە، ئێمە سەرەتا لەوپەڕی هەژاریدا لە حیزبی کۆمۆنیست جیابووینەوە. بێجگە لە دوو سێ ماشێنە شکاو کە خەرجیان زۆرتر بوو لە کەڵکیان و بێجگە لەوەی کە پێشمەرگە تفەنگی شانی خۆی هێنا، هیچ شتێکی دیکە بە ئێمە نەدرا، نە لە کەل و پەل و تەجهیزات و ڕادیۆ و ئەو شتانەی کە بوومان و نە لە ئیمکاناتە ماڵییەکەی. دیارە با لە قەوس و پەرانتێزێکدا بڵێم کۆنگرەی نۆهەمی کۆمەڵە ئەوانی بە قەرزداری کۆمەڵە دانا، کۆمەڵەی بە خاوەنی مافی وەرگرتنەوەی ئەو ئیمکاناتە ناساند و کۆمیتەی ناوەندیشی ڕاسپارد کە لە کەرێگەی گونجاوەوە بۆی تێبکۆشێ. ئەو قەرزە نەفەوتاوە، هەلومەرجی گونجاو بۆ وسووڵ کردنەوەشی هەر دێت. بەڵام ئێستا باسی ئەوەم دەکرد کە بە ڕووتی و هەژارییەوە جیابووینەوە، لە کەوچکە چایەکەوە تا کامپیوتێرێك نەمان بوو. ئێستا توانیومانە ئۆردووگایەك پێکەوە بێنین، ماڵ بکەینەوە، ئۆرگانەکان دابمەزرێنین و ئەو دەورە ئێکجار سەختەی شەڕی ئەمریکا و عێراقیش زۆر سەرکەوتووانە تێپەڕ کەین و لەو بووارەدا دامەزراوییەك بۆ خۆمان پێك بێنین. ئەوەی کە لە سەردەمی شەڕی ئێران و عێراق پێکمانەوە نا، بە کۆششێکی یەکجار زۆر بەدەست هات. لە حاڵێکدا کە ئێمە لە نانی پێشمەرگەمان گرتبۆوە و سەرەتاییترین پێداویستییەکانی خۆمانمان قەڵەم گرتبوو بۆ ئەوەی بتوانین شتێك کۆکەینەوە و لە حاڵێکدا لە ئێران و عێراق قەرزمان لە ئەفراد وەرگرت، توانیمان ماشێن و ئیمکانات و کەل و پەل بۆ خۆمان دابین بکەین. پێم خۆشە ئەوەش بڵێم خودی پرۆسەی ئەو کارەش بەبێ خەتەر و بەبێ ڕیسك نەبوو، ئەوەی دەستمان کەوتووە لە زاری شێرهاتۆتە دەرێ و بە هیمەتی کۆمەڵێك لە هاوڕێیان، هەر لە کۆمیتەی ناوەندییە تا دەرەوەی، کراوە و جێی سپاسە.

ئێمە ئاخرین قەرزی خۆمان، ئەوەندەی من لە بیرم بێ قەرزی هاوڕێیانی کانادا بوو هەفتەیەك یا دە ڕۆژ لەوە پێش دامانەوە، قەرزی ڕادیۆکەمان چەند مانگ لەوە پێش داوە، قەرزی بازاڕمان داوەتەوە، بەڵام ئایا ئێمە خاوەنی هیچ خودکەفاییەکی ماڵی هەین؟ هاوڕێیان، بە هەموو ئەوانەشەوە تەنها یەك شت دەتوانم بڵێم: پێم خۆشە هەموو کۆنگرە، ئەوانەی لە کوردستانن، لەم ئۆردووگایەن، دەچنەوە دەرەوەی وڵات یا دەچنەوە ناو ئێران، هەموویان بزانن ئێمە بە هیچ جۆرێك خودکەفایی ماڵیمان دەستەبەر نەکردووە، لە سەر پێی‌خۆ ڕاوەستانی ماڵیمان نییە. ئەوەی کە بەپێچەوانەی پارەکە لە هەژاریدا بەسەر نابەین، نەبوو بە سەرکەوتن بۆ ئێمە. ئێستاش ئێمە سەرچاوەی ماڵیی ئەوتۆمان نییە کە دڵنیایی و گارانتیی ماڵیمان بۆ دابین بکا، ئێستاش ڕووداوە سیاسییەکان دەتوانن زەربەیەکی قورسی ماڵی لە ئێمە بدەن و کاریگەریی گەورەیان بەسەرماندا هەبێت. هەمووتان ئەوە بزانن کە ئێستاش ئێمە ناتوانین پرۆژەیەکی گەورە وەکوو پرۆژەی دامەزراندنی تەلەڤیزیۆن بە

بوودجەی خۆمان بخەینە ڕێ، هەڵبەت لە باری تەکنیکییەوە وەدوای کەوتووین، لەباری ئیدارییەوە دوای کەوتووین، بەڵام نەمانتوانیوە و ناشتوانین بەم وەزعەوە لە باری ماڵییەوە بە ئەنجامی بگەیەنین. بۆیە بە ڕاشکاوییەوە دەڵێم پەیدا کردن و پەرەپێدان بە سەرچاوەگەلی ماڵیی زۆر فراوان بۆ کۆمەڵە، دانانی ئەو پرۆژە ماڵییانەی کە وا دەکا کۆمەڵە نەك هەر لە سەر پێی خۆی و داهاتی خۆی ڕاوەستێ بەڵکوو خەرجی پەرەسەندنەکانی داهاتووش دابین بکات، دەبێ یەکێك لە ئەولەوییەتە هەرە هەرە گەورەکانی کاری داهاتووی ئێمە بێ. هەموو کەس لە هەموو شوێنێکی کۆمەڵە دەبێ بزانێ پێویستە هەر بڕیارێك لەم بارەیەوە درا بەدڵ و بەگیان بەدی بهێنێ، چونکە گەشە و بگرە سەرکەوتنمان بەوەوە بەستراوەتەوە. نەك چونکە سیاسەت گرینگ نییە و پووڵ موهیمە، نەك چونکە ڕێکخستن گرینگ نییە و پووڵ موهیمە. بەڵام ئێمە سیاسەتمان هەیە، با وەدوای ئەو شتە بکەوین کە نیمانە و فەراهەمی بکەین. با نوکتەیەکتان لەسەر ناپلیۆن بۆ بگێڕمەوە، تۆزێکیش بحەسێنەوە. ناپلیۆن کە لەگەڵ میرنشینەکانی ئاڵمان و پرووس شەر دەکا، ئەوان دیارە نوێنەری سەردەمی دەرەبەگایەتی بوون، جۆرێك فەرهەنگی تایبەت بە خۆیان هەبوو، ناپلیۆنیش قارەمانی تازە پێگەیشتووی بورژوازی فەرانسە بوو. کە شەڕیان لەگەڵ دەکا، خەبەر بۆ ناپلیۆن دێننەوە دەڵێن ئەو میر و پاشایانە گوتوویانە ناپلیۆن بۆ ماڵی دنیا شەڕ دەکا بەڵام ئێمە بۆ شەرەف شەڕ دەکەین. ناپلیۆن لە جوابی ئەواندا دەڵێت: هەر کەسە بۆ ئەو شتەی نییەتی شەڕ دەکا. هاوڕێیان، ئێمەش سیاسەتمان هەیە، عەقڵمان هەیە، با وەدوای ئەو شتە بکەوین کە نیمانە و فەراهەمی بکەین و دڵنیاشم کە بۆمان دەکرێ و کاریگەریی زۆر گەورە و بڕیاردەریشی لە سەر سەرکەوتنی کۆمەڵە لە ساڵانی داهاتوودا دەبێ.

هاوڕێیان، لە درێژەی گوزارشەکەدا، هەرچەند دەزانم تا ئێستاش درێژەی کێشاوە، پێویستە ئاماژەیەك بە ئەرکەکانی داهاتوو بکرێ. دیارە ئەوانە لە نێوان بەشە جۆربەجۆرەکانی ئەم گوزارشەدا هاتوون و ئاماژەیان پێکراوە، بەڵام بە کورتی گردوکۆیان دەکەمەوە و جارێکی دیکە دەیهێنمەوە بەر دیدەی ئێوە. هەر لەو ڕاستایەشدا لەسەر یەکێك لە ئەرکەکان کە بریتییە لە چاکسازیی حیزبی تۆزێك زیاتر دەوەستم و تەوزیحی لەسەر دەدەم. بەڵام پێش ئەوانە، بەپێویستی دەزانم باسێك لە خەسڵەت و پێناسەکانی کۆمەڵە بکەین، چونکە لە دیاری کردنی ئەرکەکانی ئەم سەردەمەشماندا دەبێ ئەو خەسڵەت و پێناسانە لەبەر چاو بگرین.

ئێمە ئەگەر سەرنجێك بدەین لە پێناسەکانی کۆمەڵە و لە سەر ئەو مێژووە کە کۆمەڵە تێپەڕی کردووە و سەرخەتی گشتیی ئامانجەکان یان ئاراستەکان بهێنینەوە بەرچاومان، دەتوانین بڵێین کۆمەڵە لەو کاتەوە کە عەلەنی و ئاشکرا بووە و خۆی بە ناوی کۆمەڵەی شۆڕشگێڕ ناساندووە و خۆی وەکوو حیزبێك ڕێکخستووە هەتا ئێستا، بە هەموو هەڵس‌وکەوتییەوە، بەهەموو ئەو قۆناغانەوە کە بڕیونی، سەرجەم ئەم چەند خاڵە وەکوو خەسڵەت و بەشێك لە سوننەتی ئەو حیزبە، بەشێك لە مێژووەکەی دەرهاتووە:

یەکیان ئەوەی کە کۆمەڵە حیزبی سۆسیالیست و چەپی کوردستانە. کۆمەڵە حیزبێکە لە جیهان بینیدا ڕەخنەگەرە لە وەزعی مەجوود: موناسەباتی دنیای ئێستا بە موناسەباتێکی عادڵانە نازانێ و ڕەخنەگرە لەو موناسەباتە. توانای کۆمەڵایەتی و ماددیی ئێمە بۆ گۆڕانی کۆمەڵگاکەمان چەندە مەسەلەیەکی جیاوازە و

ئاستێکی تره له باسەکه، بەڵام له باری نەزەری و فیکرییەوه، له باری جیهان بینییەوه، کۆمەڵە خۆی به ڕەوتێکی ئاوا زانیوه و تا ئێستاش لەسەر ئەوه بەردەوام بووه، دەشبێ ببێت. کۆمەڵە خۆی به حیزبی کرێکاران و زەحمەتکێشانی کوردستان، به حیزبی چینی چەوساوەی کوردستان زانیوه، وه ئەوەش، بەو تەعریفە کە ئێمە لێمان هەیه، زۆرایەتییەکی زۆر گەورەی خەڵکی کوردستان دەگرێتە بەر. لێره دیسان با ئەوەش زیاد بکەم کە دەڵێین حیزبی کرێکاران و زەحمەتکێشان و حیزبی چەوساوەکانی کوردستان، مانای ئەو قسە ئەوه نییه گوێ ناداته چین و توێژەکانی دیکه، یا بۆ ئەوان هیچ بەرنامەیەکی نییه، هیچ حیزبێکی جیددی له دنیادا ئاوا نییه. مەبەستم ئەوەیە کە ئەم دووانە ناسازگار و ناتەبا نین.

مارکس له یەکێك له باسەکانی له بارەی شۆڕشی ئاڵمان دا دەڵێ: هیچ چینێك ناتوانێ بێتە سەر کار مەگەر ئەوەی پێشتر خۆی نەك تەنیا وەك چینەکەی خۆی، بەڵکوو وەکوو نوێنەری هەموو کۆمەڵگا بە خەڵکی قەبڵاندبێ، یانی وەڵامدەرەوەی هەموو گیروگرفتەکانی کۆمەڵگای سەردەمی خۆی بێ. ئێمەش دەبێ وابین. ئێمە وەکوو حیزبی کرێکاران و زەحمەتکێشانی کوردستان له هەموو بووارەکانی ژیانی ئەو کۆمەڵگایە خۆمان بە بەرپرس دەزانین، هەر له کێشەی نەتەوایەتییەوە تا کاری منداڵان و چەوساندنەوەی منداڵان، له مەسەلەی ڕۆشنبیرییەوە تا مەسەلەی پەرە سەندنی ئابووری، له کێشەی ژنانەوە تا هەقدەستەکان، له مەسەلەی پەرە پێدان و چەسپاندنی ئازادییە سیاسییەکانەوە تا مەسەلەی ئیدارەی شارەوانییەکان، له هەموو ئەوانەدا بەرپرسین، لەجیاتی هەموو بووارێکی ژیانی خەڵك بەرپرسین. ئەو خەسڵەتەش، ئەگەر بە زمانێکی خۆماڵی بیڵێین، چۆتە نێو خوێنی کۆمەڵەوە، بەو مانایە کە بەشێك له مێژووی ئاسراوی کۆمەڵەیە و لێ جیا کردنەوەی هاسان نییه. ئەسڵەن حیزبەکان بەو هاسانییە له سەرچاوە و ڕیشەی خۆیان نابڕێن.

بوعدێکی دیکەی پێناسەی کۆمەڵە ئەوەیە کە ئاڵاهەڵگری ڕزگاریی نەتەوەیی و ڕەهبەری بزووتنەوەی کوردستانە. لەم بووارەدا لە هەمووان قاتعتر بووە، لە هەمووان شەفافتر بووە، سادقانەتر هەوڵی بۆ داوە. ئەوەش پێناسەیەکی ئێمەیە کە دەبێ کاری بۆ بکەین. ئەوەش نە لە باری تێئۆرییەوە نە لە باری پراتیکییەوە هیچ ناتەباییەکی لەگەڵ مەسەلەی چەپ و سۆسیالیزم نییە. دواتر زۆرتری لەسەر دەڕۆین.

خاسییەتێکی دیکەی کە کۆمەڵە و مێژووەکەی پێ دەناسرێتەوە ئەوەیە کە کۆمەڵە لەگەڵ بزووتنەوەی جەماوەری بووە، لەگەڵ خەڵك بووە، لەگەڵ ئەو شتە بووە کە بە فارسی پێی دەڵێن "ابتکارات مردمی". ئێوە دیقەت بکەن، هەر لە یەکیەتی جووتیارانەوە لەبەر چاو بگرن هەتا کۆچی مەریوان، لە بنکەکان لەشاری سنە، هەتا شووڕای گەڕەکەکان لەوێ، هەتا شووراکانی هەموو شوێنەکان، هەتا کانوونی موعەلیمان کە کۆمەڵە تێیدا چالاك بوو، هەتا چەندین ڕێکخراوی ژنان کە کۆمەڵە کاری تێدا دەکرد، هەتا ڕێکخراوەی کرێکاری کە کۆمەڵە تێیدا چالاك بوو، هەتا بزووتنەوە و ڕێکخراوەکانی دانش ئاموزان، هەتا کاری کۆمەڵایەتی و خزمەتگوزاری لەنێو خەڵك، سەرجەم ئەوەیان تێدا دەبینی کە کۆمەڵە حیزبی بان خەڵك یانی حیزبی ئەو چینە دەسەڵاتدارەی کە نایەوێ جەماوەر لە سیاسەتدا دخالەت بکەن نییە، کۆمەڵە حیزبی دەخالەتی جەماوەر لە سیاسەت دایە، حیزبی وشیار کردنەوەی جەماوەر، ڕێکخستنی ئەوان، هێنانە مەیدانی ئەوانە. بە مانایەکی دیکە دەتوانین بڵێین کۆمەڵە حیزبی دێمۆکراسیی ڕادیکاڵە، حیزبی دێمۆکراسیی ڕادیکاڵ و مەردمییە. کۆمەڵە، حیزبی بزووتنەوە

جەماوەرییەکانە و ئەوەش خاسییەتێکی زۆر موهیمە کە لە رۆژی ئەوەڵەوە پێناسەمان بووە. ئێوە بە من بڵێن لە کوێی دیکەی بزووتنەوەی کوردستان شتێکی دیکەی وەکوو کۆچی مەریوان و ڕێپێوان بەرەو مەریوان پێک هاتووە؟ موزاکەرە زۆر بووە، بەڵام کام رەهبەری کورد، کاک فوئادی موستەفا سوڵتانی نەبێ، موزاکەرەیەک یا جووڵانەوەیەکی کرد بە کۆچێکی مێژوویی خەڵکی شارێک؟ لە بەر ئەوە، هەروەکوو باسمان کرد، بردنی سیاسەت بۆ نێو جەماوەر، ئەهمیەت دان بە جەماوەر، بە رۆشن بوونەوەیان، بە کەوتنە گەڕیان، پێناسەیەکی دیکەی کۆمەڵە یان بوعدێکی دیکەی کاری کۆمەڵەیە.

بەڵێ، ئەوانە خەسڵەتەکان و سوننەتەکانی کۆمەڵەن و پێویستە تەئکیدیان لە سەر بکرێتەوە. دیارە کۆمەڵە سوننەتی چاکی کەم نەبووە؛ بۆ نموونە کۆمەڵە حیزبێکی تێکۆشەر بووە، تێکۆشەرانی فێری خۆنەویستی کردووە، فێری فیداکاری کردوون، تێکۆشەرانی فێر کردووە کە قازانجی جەماوەر بخەنە سەرووی قازانجی خۆیانەوە، بەرژەوەندی کۆمەڵایەتی و چینایەتی بخەنە سەرووی بەرژەوەندی خۆیانەوە، فێری کردوون کە بەرژەوەندی حیزبی و بەکۆمەڵی خۆیان بخەنە سەرووی بەرژەوەندی شەخسیی خۆیانەوە، کاری بێمنەت، بێ چاوەڕوانیی پاداش و خەڵاتی تەشویق کردووە، تێکۆشەر بوون و چاک کار کردنی پەرە پێداوە لەو وەختەی کە لەوانەیە کەسیش نەیبینێ و نەتوانێ گوزارشی چاکی لەسەر بنووسێ. هەموو ئەوانە سوننەتەکانی کۆمەڵەن و پێویستە ئەوەندەی دیش تەئکیدیان لەسەر بکرێتەوە و بژێندرێنەوە. بەڵام من ئەو سێ خەسڵەتەم هێنا بۆ ئەوەی بتوانم گشتیترین خەسڵەت و پێناسەکان بڵێم و لەوەدا مەبەستم هەیە. چونکە ڕەنگ بێ هێندێک کەسان هەبن لە سەر لایەنی میللی یا نەتەوایەتی تەئکیدی زۆرتر بکەن، هێندێ کەسی دیکەش هەبن بە بڕوای خۆیان لە سەر لایەنی چەپەکەی تەئکید بکەن و هەرکامەشیان پێیان وابێ ئەوانە ئەساز و نەگونجاون لەگەڵ یەکتری. هیچ وانییە.

نە بە پێوانەی تیئۆری، سۆسیالیست بوون و چەپ بوونی ئێمە لەگەڵ رەهبەریی بزووتنەوەی رزگاریخوازانەی کوردستان نەگونجاوە و، نە پراتیکی جیهانی و پراتیکی خۆشمان ئەوە نیشان دەدا. بە تیئۆری نەگونجاو نییە، چونکە ئەگەر ئەو تیئۆرییە دروستکراوەی کە لەم چەند ساڵەی دواییدا لە ئێران ناوێکی دەرکرد بخەینە لاوە و بگەڕێینەوە سەرچاوە ئەسڵییەکانی مارکسیزم، من جێیەک نابینمەوە کە ئەو ناتەبایی و نەگونجاوییەی تێدا بێت. بەتایبەتی لە سەردەمی سەرەتای سەدەی بیستەم و جەنگی جیهانی یەکەم کە بزووتنەوە نەتەوایەتییەکان لە بەشێک لە ئورووپا و هەندێک لە ئاسیا و وڵاتانی جیهانی سێهەمی ئەو کات سەریان هەڵدا، بۆ خۆشتان دەزانن و خوێندوومانەتەوە کە لە دنیادا سۆسیالیستەکان سەرجەم، بەتایبەت سۆسیالیستە رادیکاڵەکان و خەتی لینین بوون کە گەورەترین و گەرموگوڕ ترین پشتیوانییان لە بزووتنەوەی نەتەوەیی کرد و تەنانەت بە بەشێک لە هێزی شۆڕشی سۆسیالیستییان دانا.

لە باری تیئۆرییەوە من باسێکی موعتەبەر نابینم کە ئەو ناتەباییە ئیسبات بکا. یەک دووجار لە ژێر تەفسیری کۆمۆنیزمی کارگەری یا هەر شتێکی تر بەحسی ئاوا کراوە لە کۆمەڵەدا. من ئەو ڕووانگەیە لە باری تیئۆریکەوە بە هەڵە دەزانم. حیزبێلە دەتوانێ بەتەواوی سۆسیالیست بێ، بەو مانایەی کە ئەو سۆسیالیست بوونە لە کوردستان دەتوانێ هەیبێت، سەرسەختانەش ئاڵاهەڵگری رزگاریی نەتەوەیی بێت. چونکە خۆ ئێمە خۆمان فریو



نادەین، بەراستی نامانەوێ دوژمنایەتیی نەتەوەکان دروست کەین، دەمانەوێ ڕزگاری نەتەوەیەکی بندەست فەراهەم بکەین، ئەوەش بزووتنەوەیەکی ڕەوایە، خۆی لە خۆیدا عادڵانەیە و سەکۆیەکیشە بۆ ئەوەی هێزی شۆڕشگێڕ و پێشکەوتنخواز تێیدا گەشە بکا. لەبەر ئەوە هیچ ناکۆکییەکی تیئۆریك لێرەدا نییە.

لەرووی پراتیکیشەوە تەماشا بکەین، ئێوە ئەزموونی جیهانیی سەدەی بیستەم بێننە بەرچاوتان: ڤییەتنام کێ ڕزگاری کرد و لە ژێر ڕەهبەرایەتیی کێدا ئازاد کرا؟ "هۆشی مین" و ئەوانی دیکە چەپ نەبوون. کێ دەتوانێ بە من بڵێ لە جیهانی سێهەمدا لیبراڵەکان و ناسیۆنالیستە غەیرە چەپەکان باشتر توانیویانە میللەتی خۆیان ڕزگار بکەن؟ نموونەیەکی دیکە کە نەك لە ئاستی لۆکاڵ بەڵکوو لە ئاستی مێژوویی- جیهانیدا گرینگی هەبوو، تەجروبەی چینە. بێجگە لە چەپەکان و حیزبی کۆمۆنیستی چین بە سەرۆکایەتی "مائۆ تسە تۆنگ"، کێ ئازادیی میللەتی چینی دەستەبەر کرد؟ دوای سەدان ساڵ دواکەوتوویی، دەربەگایەتی، ئیستیعمار و تریاکی کردنی ئەو میللەتە و حکوومەت کردنی لە لایەن بریتانیاوە، مەگەر چەپەکان نەبوون کە ڕزگاری میللەتی چینیان بەدی هێنا کە ئەورۆ شان لە شانی وڵاتانی گەورەی سەنعەتی دەدا؟ چەندەها نموونەی گەورەی ئاواتان دەتوانم بۆ بێنمەوە. لێرە لەهیچکام لەم نموونانەدا مەبەستم دروستیی تیئۆریکی ئەو بزووتنەوە چەپانە نییە و نامەوێ قەزاوەتیان لە سەر بکەم. سەرجەم ئەوانە بزووتنەوەی چەپی سەردەمی خۆیان بوون. من چەپ بەمانای کۆمەڵایەتی وەردەگرم و کارم بە وردەکاریی تیئۆریك لەسەر دروست بوون یا نەبوونی ئەفکاری مائۆ و کەسانی تر نییە. کێ یۆنانی لە دەست داگیرکارانی ئاڵمانی هیتلەری نەجات دا؟ موقاوەمەتی فەرانسە کێ کردی؟ لە کاتی داگیر کرانی فەرانسە لەلایەن ئاڵمانی هیتلەرییەوە بێجگە لە چەپەکان و حیزبی کۆمۆنیستی فەرانسە کێ بوو بەرگریی ڕاستەقینەی ڕێکخست؟ لە فیداکاری بۆ بەدەست هێنانی ڕزگاریی میللەتی فەرانسە لە چنگ داگیرکەری خاریجی کێ لە هەموو کەس تێکۆشەرتر بوو؟ ژەنەراڵ دۆگوڵ، ناڵێم کەسێکی تێکۆشەر نەبوو، بەڵام لە لەندەن دانیشتبوو. موقاوەمەتی واقیعی ئەو جەماوەرە سادەیە، ئەو کرێکاران و زەحمەتکێشان و دووکانداران و خەڵکی سادە و خوردەپای فەرانسە بە سەرۆکایەتیی حیزبی کۆمۆنیستی فەرانسەی ئەو کات کردیان. بەڵێ، سیاسەتەکەی بەخاتری کلکایەتیی شورەوی هەڵەی تێدا بوو، بەڵام ئەمە بابەتێکی جیاوازە.

نموونەی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانتان بۆ دەهێنمەوە. لە کوردستانی عێراق لە ساڵی ١٩٧٥ دوای هەرەس هێنان و شکانی بزووتنەوەی کوردی و دوای ئەو بێهومێدییە گەورەی کە پێك هات، مەگەر کۆمەڵەی ڕەنجدەران نەبوو کە هەوێنی سەرەکیی شۆڕشی نوێی کوردستانی عێراقی پێك هێنا؟ بە وتەی شیعرەکەی شێرکۆ بێکەس کە باسی زیندوو کردنەوەی شۆڕش لەو ساڵانەدا دەکا، بێجگە لە هەڵۆی کۆمەڵە کەس نەبوو، کەس. هەر بە حەقیقەت وابوو و ئەوان بوون کە شۆڕشیان لە کوردستانی عێراق زیندوو کردەوە.

نموونەی کۆمەڵەی خۆشمان یەکێك لەوانەیە. ئایا ئێمە وەك کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشان گەورەترین خزمەتمان بە بزووتنەوەی کورد لە ئێران نەکردووە؟ بەمن بڵێن بەبێ کۆمەڵە چارەنووسی کوردستان لە بیست و پێنج ساڵی ڕابوردوودا چی لێدەهات؟ ئایا بەبێ کۆمەڵە موقاوەمەتی جەماوەری لە کوردستان ئەو ئەندازە لێبڕاو و قاتعانە دەبوو؟ ئایا سنووربەندیی ئەو بزووتنەوەیە لە حاست کۆنەپەرستیی ناوخۆیی و مەرکەزی ئەومەندە شەفاف و ڕۆشن دەبوو؟ ئایا بەبێ بوونی کۆمەڵە، ئەگەری دانەواندن و تەنازول لە ئاست مافی نەتەوەیی خەڵك

زیادی نەدەکرد و لەوانە نەبوو کارەسات بخولقێنن؟ ئایا تەنانەت سازش لەگەڵ باڵی مەزهەبی لە کوردستاندا خەریك نەبوو ئەنجام بگرێ و کۆمەڵە نەبوو کە تەفروتووناى کردن و پێگەی جەماوەری لێسەندنەوە؟ ئایا بارهێنانی جەماوەر بەو ڕووانگەی کە کۆمەڵە هێنایە نێو خەڵکەوە خۆی نەبۆتە یەکێك لە بەهاکانی ئەو بزووتنەوەیە؟ ئایا خەسڵەتە سیاسی و ئەخلاقییەکانی پێشمەرگەی کۆمەڵە کە جۆرە ئەفسانەیەکی لەو هێزە دروست کردووە، بەبێ ئەو جیهانبینی و ڕووانگە سیاسییە دەیتوانی بێتە بوون؟ ئایا ئەو ئەرزش و بەها نوێیانەی کە هاتوونەتە نێو بزووتنەوەی ڕزگاریخوازانەی کورد لە کوردستانی ئێران، هەر لە بەشداریی ژنان هەتا هێنانە کایەی جەماوەر و دێموکراتیزمێکی رادیکاڵ، هەتا پێداگری لەسەر مافەکانی خەڵك، هەتا دیفاع لە پلورالیزم و ئازادیی سیاسی کە ئێمە وەختی خۆی خوێنمان لەسەر دا، هەمووی ئەوانە بەبێ بوونی کۆمەڵە و ڕێبازەکەی حەقیقەتەن دەیانتوانی بێنە ئاراوە؟ کورد بەبێ ئێمەش هەر بووە و هەر دەبوو و بزووتنەوەکەشی هەر بووە و بەبێ ئێمەش هەر دەبێ. بەلام ئایا بزووتنەوەی کورد لە ئێران بەبێ کۆمەڵە و سوننەتەکەی ئەو خەسڵەتانەی دەبوو؟ نەی دەبوو. ئێمە بزووتنەوەی کوردمان لە کوردستانی ئێران کز نەکردووە، هاوڕێیان، بەهێز و پڕناوەرۆکمان کردووە. تۆ لە هەڵەکانی سەردەمی حیزبی کۆمۆنیستی ئێران بگەڕێ، بەلام وەکوو چەپ و وەکوو کۆمەڵە ئێمە بزووتنەوەی کوردمان لە کوردستانی ئێران دەوڵەمەند کردووە و پەرەمان پێداوە، ئێمە سەری خەڵکی کوردمان بەرز کردۆتەوە و ئەمە بۆ خەڵکی کورد جێی شانازییە.

ڕەهبەریی کۆمەڵە لە بزووتنەوەی کوردستاندا هەم پاك و خاوێنی دەکا، لە ناوەرۆکدا دەوڵەمەندی دەکا، هەم سەرکەوتنەکەی مسۆگەر دەکا. هاوڕێیان، چەپ بوون لە کۆمەڵگای کوردستاندا، سەرکەوتنی بزووتنەوەی کوردی مسۆگەر دەکا. ئێمەمانان بزووتنەوەی ڕزگاریبەخشی گەل کورد بە دەسکەوتی بچووك نافرۆشین. ئەزقەزا پێم وایە کۆمەڵەی شۆڕشگێڕ بۆی هەیە لە کوردستانی ئێران نموونەیەك بەدەستەوە بدا و جارێکی دیکە ئیعتیبار ببەخشێتەو بە چەپ لە هەموو کوردستان. ئەو کەسانەی لە ئەحزابی سوننەتی نارازین، با بە ڕێگای هەڵەدا نەڕۆن، با لە مەسەلەی میللی بە لاڕێدا نەڕۆن، بزانن کە ئالتێرناتیڤێکی دیکە هەیە کە پێشکەوتنخوازی، ئازادیخوازی، دێمۆکراسی و عەدالەتی کۆمەلایەتی گرێ دەدا لەگەڵ پشتیوانییەکی گەرم و گوڕ و سادقانە لە ڕزگاری نەتەوەیی.

لێرەدا پرسیارێك دێتە گۆڕێ ئەویش ئەوەیە کە ئێمە وەکوو حیزبێکی سۆسیالیست لە کوردستاندا چی دەکەین و چیمان پێدەکرێ؟ من لە سیاسەتی ڕەهبەریی کۆمەڵەدا شتێکی ئاوا نابینم کە پێمان وابێ سۆسیالیست بوون بۆ کۆمەڵە بە مانای ئەوەیە کە ئێمە شۆڕشێکی سۆسیالیستی لە کوردستان بەرپا دەکەین یا بناغەی کۆمەڵگایەکی سۆسیالیستی دادەڕێژین و ئەوە لە دەستووری کاری ئەم سەردەمەی کۆمەڵە دایە.

یەکەم، مادام کوردستان بەشێکە لە ئێران، مەسەلەی دەسەلاتی سیاسی و بەدەستەوە گرتنی سەرچاوە گەورەکانی ئابووری، تەنیا لە ئاستی سەراسەریدا دەتوانێ چارەسەر بکرێت و لەبەر ئەوە لەم حاڵەدا پێکهێنانی ئاڵوگۆڕی سۆسیالیستی لەئابووری لە ئاستی کوردستانیدا ئەسڵەن ناکرێ و مومکین نییە. دووهەم، لە ئاستی سەراسەریی ئێرانیشدا بە لەبەر چاو گرتنی بارودۆخی ئابووری و سیاسیی ئەم سەردەمەی جیهان و کافی نەبوونی پێویستییە ئابووری و کۆمەلایەتییەکانی ئێرانیش بۆ ئەو مەبەستە، زۆر زەحمەتە کە بەبێ ئەوەی لە



ئاستێکی جیهانی یان لانی کەم لە ئاستێکی ناوچەیی فراوان ئاڵوگۆڕی سۆسیالیستی بێتە ئاراوە، تەنیا لە وڵاتێکی وەکوو ئێران شتی ئاوا بەدی بێت. لانی کەم هیچ نەبێ ئەوە رەئیی منە. سێهەم، حەقیقەتەن بۆ ئەم سەردەمەی وا ئێمەی تێدا دەژین، ئێمە لەو بڕوایەدا نین کە شۆڕشێکی سۆسیالیستی لە دەستووری کاری کۆمەڵگەی ئێراندا بێت و مەسەلەی سەرەکیی بزووتنەوەی ئەم سەردەمەی ئێران بە مەسەلەی چارەسەر کردنی ئازادیی سیاسی و سەرجەم دێموکراسی دەزانین. دێموکراسی کێشەیەکە کە یەك قەرنە لە ئێران هەروا چارەسەر نەکراو ماوەتەوە.

ئەی ئەگەر وابێ چی دەمێنێتەوە بۆ سۆسیالیست بوونی کۆمەڵە وەکوو حیزبێکی کوردستانی؟ من پێم وایە ئەو سێ خەسڵەتەی باسم کرد، ئەگەر کۆمەڵە ئەو سیانە رەچاو بکا، لەواقیعدا ئەرکی سۆسیالیستیی خۆی لەم سەردەمە دیاریکراوە و لەم کۆمەڵگا دیاریکراوەدا بەرێوە بردووە.

یەکیان ئەوەیە کە کۆمەڵە چ بە کاری وشیار کردنەوە و چ بە یارمەتی دانی کاری خۆ رێکخستن، کارێکی وا بکا کە چینی کرێکار بتوانێ لە ئەنجامی پرۆسەیەکدا وەها لە کۆمەڵگای کوردستان، لە یەکیەتی و رێکخراوە کرێکارییەکاندا، خۆی رێك بخا کە لەداهاتوودا کرێکارانێکی رێکخراوتر و وشیارترمان هەبێ کە لە ئاڵوگۆڕە سیاسییەکانی داهاتووی کوردستاندا مافیان نەخورێ، قودرەتی دیفاع کردن لەخۆیانیان هەبێ و بتوانن وەکوو هێزێك ئەوانیش تەئسیر و کاریگەریی خۆیان لەسەر کۆمەڵگای کوردستان دابنێن. نازانم ئەو سەردەمە کەی دێت و کەی کرێکارانی کوردستان دەیگەنێ بەڵام هەر دەبێ بێت. چەندەشیان تەئسیر دەبێت و کاریگەریی ئەوان لە هەر سەردەمێکدا لە کۆمەڵگای کوردستان چۆن دەبێ، ئەوە شتێك نییە لە ئێستاوە دیاری بکرێ و بەستراوەتەوە بە هێزی ئەو کاتەیان و بە تەوازونی هێزە چینایەتی و کۆمەڵایەتییەکانی ئەو سەردەمە.

لە هەرحاڵدا، ئەگەر ئێمە بتوانین وەکوو حیزبی داکۆکیکار و پشتگیری ئەو چینە لە کوردستان دەوری خۆمان بگێڕین، بتوانین یارمەتیدەر بین و کاری بۆ بکەین کە لە ئەنجامدا لە ساڵانی داهاتوودا، کرێکارانێکی وشیارتر و رێکخراوترمان هەبێ، ئەرکی خۆمان بەجێ گەیاندووە. ئەوەش بەستراوەتەوە بە هەلومەرجی سیاسی، چەندە کرانەوەی سیاسی هەبێ، چەندە وشیاریی چینایەتی هەبێ، چەندە تەنانەت باری ئابووری ئیجازەی پێبدا، بەڵام هەر وەکوو چۆن سەردەمێك یەکیەتی جووتیاران بەناوی کۆمەڵەوە ناسرا و بوو بە بەشێك لە مێژووی کۆمەڵە و ئەزموونی کۆمەڵە، بەشێوەیەك کە ئێستا ئیتر جیانەکراوەیە لێی، محاڵە هیچ خەتێکی دیکە لە کوردستان بتوانێ یەکیەتی جووتیاران بکاتە هی خۆی، هەر بەم شێوەیەش ئێمە وەکوو کۆمەڵە سەرکەوتوو دەبین ئەگەر بتوانین هەر لە ئێستاوە کارێکی وا بکەین کە لە ساڵانی داهاتوو و لە هەل و مەرجی گونجاوی خۆیدا هەموو کەس ببینێت کە کرێکاران لە کوردستان خەریکن خۆ رێك دەخەن، رێکخراوە کرێکارییەکان پێك هاتوون و دەور دەگێڕن، ببینن کە کرێکاریش سەری بێکڵاو نەماوەتەوە لە کوردستان و هەموو کەسیش بزانێ هەر لە ئەوەڵەوە کۆمەڵە لە پشتیان بووە بۆ دروست بوونیان و گەشە کردنیان. ئەگەر ئەوەمان کرد، ئەمن وا دەزانم ئەرکێکی گەورەی خۆمان بەرێوە بردووە. ئەوە ئەرکێکی گەورەیە، کاری مانگ و دوو مانگ نییە، کاری ساڵ و دوو ساڵیش نییە، بەڵام لە هەرحاڵدا وەکوو دوورنمایەك دەبێ لەبەر چاومان بێ و هەر لە ئێستاوە کاری بۆ بکەین، نەك هەر بەتەنیا هەڵسووڕاوانی کۆمەڵە کاری بۆ بکەن، بەڵکوو جێی خۆیەتی و پێویستە هەموو هەڵسووڕاوانی کرێکاری

کاری بۆ بکەن. ئەمە تەنیا ئەرکێکی حیزبیی ئێمە نییە، ئەرکێکی کۆمەڵایەتییە و بانگەوازی ئێمەیە بۆ هەموو ئەوانەی لەو بووارەدا کار دەکەن. ڕێکخراو کردنی چینی کرێکار و وشیار کردنەوەی بەجۆرێك کە لە ساڵانی داهاتوودا هەموو کەس هەست بە بوون و کاریگەریی ئەوان لە بوواری ئابووری و سیاسەت و فەرهەنگدا بکا، کاری ڕۆژێك و دوو ڕۆژ نییە بەڵکوو ئیشی زۆری دەوێ، بەڵام بێگومان گۆڕانکارییەکی گەورەیە لە کوردستان.

دووهەمیان کار کردنە لەسەر ڕێکخراوە جەماوەرییەکان لە هەموو ئاستەکاندا، ڕۆشنبیران، ژنان، خوێندکاران، ئێن.جی.ئۆکان، نووسەران و هەموو ئەوانە. کۆمەڵە دەبێ لە پشت خۆڕێکخستن و پێکهێنانی ڕێکخراوە جەماوەرییەکان بێ، لە هەموو ئەو بووارانەدا و لە هەر ئاستێکدا کە بۆی دەکرێ. تێکۆشەری کۆمەڵە دەبێ بزانێ ئەمە ئەرکیەتی. دەبێ هەموو کەس لە کوردستان پێبزانێ کە خوێندکارانی کوردستان و شاگرد مەدرەسەکانیش لە چالاکی و ڕێکخراو بوونی خۆیاندا هەروەها مەدیونی هەوڵ و تێکۆشانی چەند ساڵەی کۆمەڵەن، بەکاری ڕاگەیاندن، بەکاری تێگەیاندن، بەوشیار کردنەوە. ئەمە خزمەتێکی گەورەیە بە کۆمەڵگای کوردستان و و بەشێکی پێویستە لە ئەرکی چەپ بوونی خۆمان و ئەمەشە ئیجازەت پێدەدا کە جارێکی دیکە لەگەڵ ڕێکخراوە جەماوەرییەکان و لەگەڵ ئەم چەشنە ابتکارات و بزووتنەوەی جەماوەری جۆش بخۆینەوە و تێکەڵ بینەوە.

سێهەمیشیان ئەوەیە کە ئێمە بەحەقیقەت وەکوو ئاڵاهەڵگری ڕزگاریی نەتەوەیی لە کوردستان و ڕەهبەر و پێشڕەوی بزووتنەوەی شۆڕشگێڕانەی گەل کوردیش بەتەواوی مانا ئەرکەکانی خۆمان بەجێ بگەیەنین.

هەر کامە لەو سیانە وردەکاری زۆرە، منیش بەکورتی ئاماژەیەکەم پێکردن، لەوە زیاتر لەسەریان ناڕۆم، بەڵام ئەگەر کۆمەڵە بتوانێ لەم سێ بووارەدا کاری خۆی بکا و ساڵانی داهاتوو هەموو کەس بزانێت کە ئەگەر کرێکارانی کوردستان وشیارتر و ڕێکخراوترن، ئەگەر ڕێکخراوە جەماوەییەکان سەریان هەڵداوە و پێگەیشتوون، ئەگەر بزووتنەوەی گەلی کوردیش گەیشتۆتە ئاستێکی بالاتر، هەموویان مۆرکی کار و تێکۆشانی کۆمەڵەیان پێوەیە، مانای ئەوەیە ئێمە ئەو ئەرکەی کە مێژووی ئەم سەردەمە و کۆمەڵگای ئەم سەردەمە خستوویەتە سەر ئەستۆمان، بە ئەنجاممان گەیاندووە. مارکس دەڵێ: "ئینسانەکان مێژووی خۆیان دروست دەکەن، بەڵام نەك بە دڵخوازی خۆیان و نەك بە کەرەستەیەك کە خۆیان دیاری دەکەن، بەڵکوو لە دۆخێکی دیاریکراو و بەو کەرەستە و مەوادەی کە کۆمەڵگای پێش خۆیان لە سەردەمێکی دیاریکراودا لە ئیختیار ئەوانی داناوە." ئێمە بەکەیفی خۆمان ئازاد نین، یانی ئیجتماعەن و تاریخەن ناتوانین بە هەموو ئاواتەکانی خۆمان بگەین و هەموو ئارەزووەکانمان وەدی بێنین. بەڵام وەکوو سۆسیالیستێکی سەردەمی خۆمان لە کۆمەڵگایەکی جیهانی سێهەمیدا، ئەویش لەنێو میللەتێکی ستەم لێکراو کە تەنانەت دەوڵەتی خۆشی نییە، خەریکین ئەرکەکانمان دەبەینە پێش. ئەوەندەی بۆمان دەکرێ خەڵك بە بیروباوەڕی پێشکەوتنخوازانە پەروەردە بکەین، ئەوەندەی بۆمان دەکرێ ڕۆحی یەکگرتن و ڕێکخستنی چینایەتی لە نێو کرێکاراندا پێك بێنین کە بتوانن ڕاستەوە بن و سبەینێ ببن بە هێزێك و، تێیاندا ئەوەندەی ئێمە بتوانین و ئەوەندەی ئەوانیش هەڵگرن، وشیاری بە بەرژەوەندی چینایەتیی خۆیان بچەسپێنین، ئەوەندەی بۆمان دەکرێ خەڵك فێر کەین، بە خوێندکار و بە ژنان و بە هەموو ئەوانەی کە باسمان کرد، فێریان کەین کە خۆیان ڕێك خەن و ببن بە بەشێکی چالاك لە دێموکراسییەکی ڕادیکاڵ و لە کۆمەڵگایەکی مەدەنیی ڕاستەقینەدا، ئەوەندەی پێمان دەکرێ بزووتنەوەی گەلی کورد مەسئوولانە و سادقانە

بەرەو سەرکەوتن بەرین. ئێمە ئەگەر ئەو کارانە بکەین ئەوەی کە لە توانا و لە مەقدووراتی تاریخی کۆمەڵگەی خۆماندا هەیە ئەوەمان ئەنجام داوە و لەوە زیاتریش تەوەقوعێك لە ئێمە نییە. ئەگەر بارودۆخی جیهانی وای لێهات کە بزووتنەوەیەکی گەورەی رەخنە و گۆڕان لە سەرمایەداریدا هاتە ئاراوە، ئێمەش دەبین بە بەشێکی. دەنا من ئەمە بەو حەدە دەزانم کە لە مەقدووراتی خۆمان دایە و دەبێ هەوڵی بۆ بدەین.

لەباسی ئەرکە دیاریکراوەکان پێم خۆشە لە سەر چەند شتێك تەئکید بکەم و ئەویش ئەوانەن:

ئێمە دەبێ حەتمەن پەیوەندییەکانمان لە ئاستی ناوچەیی و جیهانیدا زۆر زیاتر پەرە پێبدەین و بیکەین بەو ئەولەوییەتێکی گەورە و بە هەمووان بۆی تێبکۆشین.

ئێمە دەبێ ئەو سیاسەتانەی کە تا ئێستا هەمانە وەکوو فێدرالیزم، وەکوو بەرەی کوردستانی، وەکوو ئیتیحاد بۆ دێمۆکراسی و هەموو شتەکانی تر کارێکی چالاکانەتری بۆ بکەین.

ئێمە دەبێ لە سەر مەسەلەی نەتەوە بندەستەکانی ئێران کارێکی تایبەتی دەست پێبکەین و پرۆژەیەکی دیاریکراو بخەینە گەڕ.

ئێمە دەبێ بۆ مەسەلەی پەیدا کردنی سەرچاوەی ماڵی و داهاتی سەربەخۆ بۆ کۆمەڵە کاری جیددی بکەین، تا ئێستاش ناڵێم نەمانکردووە، کاری جددییمان کردووە و بۆیەش گەیشتوون بەم رادەیە، بەڵام بە حەقیقەت کاری جیددیتری بۆ بکەین.

ئەمانە هەموو ئەو ئەرکانەن کە دەبێ ئەنجامی بدەین و رەنگە بێ لە وتاری سەبارەت بە هەل‌ومەرجی سیاسی زۆرتر بیهێنینە گۆڕێ یا لە باسی چاکسازیی حیزبیدا دیسان بێنە گۆڕێ، لە بەشی قەرار و قەتعنامەکانیشدا بۆمان هەیە قەتعنامەیان بۆ پێشنهاد بکەین. بەڵام کە ئێمە باس لە ئەرکەکانی دەورەی داهاتوو دەکەین، بەڵام ئەرکی کێ؟ ئەوانە بە تەنها ئەرکی کۆمەڵە وەکوو حیزبێك نین، بەڵکوو لە راستیدا ئەرکی بزووتنەوەیەکن و بانگەوازی ئێمەن بۆ هەموو تێکۆشەرانی کوردستان کە لە بووارە جۆربەجۆرەکاندا کار دەکەن و بە ئەنجام گەیشتنی سەرکەوتووانەشی لە گرەوەی ئەوە دایە هەموو ئەو تێکۆشەرانە کاری بۆ بکەن و بتوانن کۆمەڵانی بەرینی خەڵکیشی بۆ وریا و وشیار بکەنەوە، رێکیان بخەن و هانیان بدەن.

ئەمما ئەو تەوەرەی ئاخر کە دەمەویست باسی بکەم، بریتییە لە مەسەلەی چاکسازیی حیزبی لە کۆمەڵەدا. بە بڕوای من پەیامێکی گەورەی ئەم کۆنگرەیە بۆ هەموومان مەسەلەی چاکسازیی حیزبییە لە کۆمەڵەدا.

هاوڕێیان، ئێمە هاتین بارودۆخی سیاسیی ئێران و ناوچەکە و جیهانمان بەکورتی باس کرد، لە هەمووی ئەوانە نەتیجەمان گرت کە سەردەم سەردەمێکە کە زەمینە لەبارترە، رەنگە لە دوو دەهە لەوە پێشیش لەبارتر بێ بۆ حیزبێکی وەکوو کۆمەڵە. باسی ئەوەمان کرد کە هەموو ئەو ئاڵوگۆڕانەی لە کۆمەڵگای ئێران و کوردستان روویان داوە، هەموو ئەو گەشە کردنەی کە کۆمەڵگەی کوردستان بەخۆیەوە بینیوە، هەموو یان بەشی هەرە زۆری دەتوانن ببن بە هۆکارێك بۆ ئەوەی کە پێگەی کۆمەڵایەتیی کۆمەڵەی شۆڕشگێڕ زیاد بکەن و لەسەر ئەو بنەمایە کۆمەڵە ببێت بە حیزبی سەرەکی لە کوردستاندا. باسی ئەوەمان کرد کە ئێمە خۆمان بە خاوەنی هەموو

کوردستان و هەموو بووارەکانی بزووتنەوەکەی دەناسین، لە خودی کێشەی نەتەوەیی، لە هەموو حەرەکەتی ڕۆشنبیری و سیاسی و لە بزووتنەوە کریکارییەکان و بزووتنەوە جەماوەرییەکان. باسی ئەوەمان کرد کە ئێمە لە داهاتووی سیاسیی ئێراندا دەتوانین وەزنەیەك بین بە نوێنەرایەتیی لانی کەم دە میلیۆن خەڵکی کوردستانی ئێران. بەڵام کێشە ئەوەیە کە هەموو ئەوانە ئامرازێکیان پێویستە، ئەو ئامرازەش هەمووان تەوافوقمان لەسەری هەیە کە بریتییە لە حیزبێك کە بتوانێ بەشی ڕێکخراو و وشیار و تێکۆشەری ئەم بزووتنەوە و ئەم خواستانە بێ، ئیلهامبەخشی هەموویان بێ، لەگەڵ هەموو ئەو بزووتنەوانە لە دیالۆگ و دانوستاندنی فیکری و سیاسی دابێ و، لە عەینی حاڵدا ڕێکخەر و پێشبەری ئەوان بێ. کۆمەڵە دەبێ خۆی ئامادە بکا بۆ ئەوەی وەها حیزبێك بێ. پێویستیی چاکسازیی حیزبی لێرەوە دێ. بۆیە پێم وایە پێش هەموو شتێك ئەو تەئکیدە لازمە.

هاوڕێیان، زۆر کاروباری تەشکیلاتی هەن کە پێویستیان بە ئیسلاح هەیە. مەسەلەن لە ناو هێزی پێشمەرگە و لە نێو تەشکیلاتی چیادا کەموکووڕی یا شپرزی یا ئیرادگەلێك دەبینین. ئەوانە هەن و دەبێ چارەسەریش بکرێن. یان ڕەنگ بێ ئیرادگەلێك لە ناهەماهەنگی بەشەکانی ڕێکخراوی خۆمان لە دەرەوەی وڵات ببینین، ئەوانەش هەن و دەبێ چار بکرێن. خودی ڕەهبەریی کۆمەڵە، بە شێوەی کارییەوە، بە ئیلتیزاماتییەوە، بە هەموو شتێکییەوە، پێش هەمووان پێویستی بە ئیسلاح هەیە. بەڵام مەبەستم لە هێنانە گۆڕی ئەو کەم و کووڕییانە ئەوە بوو کە لە باسی چاکسازی لە کۆمەڵەدا بڵێم تێئۆری ئەو چاکسازییە لەکوێوە دەبێ دەربێت، نەزەرییەی چاکسازی لە کوێوە دەبێ هەڵێنجین. ڕاستە ئەو نموونانەی کە ڕۆژانە لە ئۆردووگای کۆمەڵە یا لە دەرەوەی وڵات یا لە فەعالییەتی زاگرۆس لە ناوەوەی ئێران دەیبینین، هەرکامەیان لەوانەیە ئیدەیەکمان پێبدەن بۆ چاکسازی لە کۆمەڵەدا و هەر کام لەوانەش دەبێ نیهایەتەن لە تەسویرێکی گشتی کە بۆ چاکسازی لە کۆمەڵەدا تەرسیمی دەکەین جێگەی خۆیان بگرن، بەڵام من بە دەرکێکی مەحدوودی دەزانم ئەگەر نەزەرییەی چاکسازیی کۆمەڵە لە هەلومەرجی ئێستای تەشکیلاتی خۆمان یان هەر بەشێکی ئەو تەشکیلاتە هەڵێنجین. چاکسازی لە کۆمەڵەدا تەنیا ئەو کاتە دەتوانێ بنگە یا بنەمایەکی فراوان پەیدا کا کە نەزەرییەکەی لە جێیەکی دیکەوە استنتاج بکرێت، ئەویش تەحلیل و لێکدانەوەی قووڵتر و درێژخایەنی ئێمەیە لە کۆمەڵگای کوردستان و ئێران و ناوچەکە، ئەویش ناسینی ئەرکەکان و پێداویستییەکانی ئەو بزووتنەوەیە کە ئێمە خۆ بە خاوەنی دەزانین. جا بۆ جواب دانەوە بەو ئەرکانە لەو سەردەمە دایە کە مەسەلەی چاکسازی لە کۆمەڵەدا دێتە گۆڕێ.

تەنها لەم حاڵەتە دایە کە بە بڕوای من چاکسازی لە کۆمەڵەدا چاکسازییەکی گشتگیر، درێژخایەن و جامیع و شامیل دەبێ، دەنا وەکوو ئەوەیە کە هەر کامەمان دارێك ببینین، بەڵام نەتوانین سەرجەم جەنگەڵەکە ببینین. ئەگینا هەر کەس لە گۆشەیەکی ئۆرگانی خۆیەوە نوقتە زەعفێك دەبینێ و لەوێوە تێئۆرییەك بۆ چاکسازی لە کۆمەڵەدا هەڵدێنجێت. یەکمان دەبینین ڕیخت و پاش لە شوێنێکدا هەیە، دیارە دەست پێوە گرتن یەکێك لە خەسڵەتەکانی حیزبێکی مەسئوول و شۆڕشگێڕی وەکوو کۆمەڵەیە و ئەو هەڵەیە دەبێ ڕاست بێتەوە، دەبینین دڵسۆزی لە کاروباری ماڵیدا زۆر نییە، کەمە، دەبێ ببێ. یا ئەمساڵ لە ڕۆژی کۆمەڵەدا ناهەماهەنگییەك لە بەینی ئەم وڵات یا ئەو وڵات هەبوو و دەبووایە هەموویان یەکسان عەمەلیان کردبایە. ئەوەش ڕاستە و حەتمەن دەبێ چارەسەر بکرێ و دوای ئەم کۆنگرەیە دەشکرێ. ڕەهبەریی کۆمەڵە ژمارەی کەم نییە، بەڵام حوزووری لێرە کەمە



و ئەرکەکان بە شێوەیەکی نامووناسیب دابەش دەکرێن و بەعزێك جار وەڵامی پێویست بەو ئەرکانە نادرێتەوە. ئەوەش حەتمەن مەسەلەیەکی موهیمە، بەڵام قسەکەم ئەوەیە کە ناتوانین تیئۆری چاکسازیی خۆمان لەو نموونەگەلەوە دەربێنین. چاکسازی لە کۆمەڵەدا تیئۆری خۆی لە پێویستییەکانی بزووتنەوەی داهاتوو و لەو راسپاردە سیاسییە هەڵدێنجێ کە لە ئەستۆی کۆمەڵەیە. لەراستیدا پرسی چاکسازی ئەوەیە: ئێمە بۆ بە سەرکەوتن گەیاندنی بزووتنەوەی کوردستان لە هەموو بووارەکانیدا، بۆ ئەنجام دانی ئەرکی سۆسیالیستی و دێمۆکراتیکی خۆمان، بۆ بەرێوە بردنی بزووتنەوەی شۆڕشگێڕانەی گەلی کورد، بۆ رێکخستنەکانی داهاتوومان، بۆ ئەوەی ببین بە حیزبی سەرەکی و لەوێشەوە بڕۆین بەرەو ئەوەی کە دەسەڵاتی سیاسی بەدەستەوە بگرین، چلۆن حیزبێکمان لازمە؟ لێرەوە دەبێ بڕۆین بۆ چاکسازیی حیزبی لە کۆمەڵەدا. جا ئەگەر مۆدێلی ئەو حیزبەمان، لە رووی پێویستییەکانی بزووتنەوە نەك لەنێو موناقشات و قرەقرێ نێوخۆی تەشکیلاتەوە، بەدەست هێنا، ئینجا دەتوانین بە دڵێکی فراوانەوە بپەرژێینە سەر هەرکام لە گۆشەکانی تەشکیلاتی ئەمڕۆشمان. چونکە تیئۆریی باش خۆ مەعنای ئەوە نییە لە ئاستی گشتیدا دەمێنێتەوە و وەڵامی بۆ کێشەی کۆنکرێت و مەسەلەکانی رۆژ نییە، مەعنای ئەوەیە لە ئاستێکی سەرەوەتردا ئەم شتە وردانە دەخاتە تەسویرێکی دیکە و فراوانترەوە. دەبێ لەم روانگەیەوە بڕۆین بۆ ئەوەی تیئۆریی چاکسازیی حیزبیمان بدۆزینەوە و مۆدێلێکی حیزبیی گونجاو، مۆدێلێکی بەکەڵك، مۆدێلێکی ئارمانی، مۆدێلێك کە لە ئاستی مەسئوولییەتە گەورەکانی کۆمەڵە دایە، دابڕێژین جا لەوێوە بڕۆین بۆ ئەوەی ئەجزای بۆ بدۆزینەوە و چارەسەری کێشە وردەکان بکەین.

ئێمە لە ساڵی١٣٥٨ –١٣٥٧ەوە بووینەتە حیزبێکی جەماوەری. گوێ مەدەنە ئەوەی کە ناوی حیزبەکەمان بە فارسی "سازمان انقلابی زحمتکشان"ە، ئێمە هەر ئەو کات حیزب بووین. هەر پێنج شەش کەسێکی لیبراڵ یان هەر خەت و رەوتێکی دیکە لە دەوری یەك کۆدەبنەوە و ناوی خۆیان دەنێن "حیزب"، ئێمەش ئەوکات بۆخۆمان حیزبێك بووین. لە ٢٦ی رێبەندانی ساڵی ١٣٥٧ (١٩٧٩) کە کۆمەڵە بەئاشکرا راگەیەندرا، پێشینەی ٩ ساڵ و نیو خەباتی سیاسی و رێکخراوەیی نهێنی هەبوو. بە شانازییەوە دەڵێم سەرەڕای ئەو هەموو گیران و زەربانەی کە زەمانی شا لێی درا، هیچ وەخت نەخشەی رێکخستنەکانی ئێمە بۆ ساواك دەرنەکەوت. بەشێکی زۆری رەهبەریی کۆمەڵە گیرا، ئەو هاورێیانەی کە لە دەورەوە بوون سەر لە نوێ کاروباری تەشکیلاتیان بە دەستەوە گرت و شتیان زیندوو کردەوە و بە هاتنە دەری رەهبەریی پێشووتری کۆمەڵە لە زیندان جارێکی دیکە ئەو سەردەمە کۆمەڵە بووژایەوە و خۆی ئامادە کرد بۆ بزووتنەوەی جەماوەری. ئەو نۆ ساڵ و نیوە، مێژووی خەباتی رێکخراوەیی بوو، کادرەکانی کۆمەڵە پێش ئەوەش خەڵکانی سیاسی بوون، پێش ئەوەش شۆڕشگێڕ بوون، پێش ئەوەش مارکسیست بوون، پێش ئەوەش پێشینەی هەڵسووڕانیان هەبوو، بۆیە توانیان لە دامەزراندنی کۆمەڵەدا بەشداری بکەن. دوای ئاشکرا بوونیش، لە ماوەی شەش مانگ ساڵێکدا بەهۆی بەشداریمان لە بزووتنەوەیەکی فراوانی جەماوەری بە بووارگەلی جۆراوجۆرەوە زۆر زوو توانیمان خۆمان لە محەکی ئەو تەجروبەیە بدەین، سەرکەوتووش هاتینە دەر. ناڵێم بێ کەموکووڕی بووین، ئەوەندە ئەزموون و ئەو عەقڵەی کە دوا رۆژ پەیدامان کرد، ئەوکات نەمانبوو، دەنا حەتمەن کاری باشتریشمان دەکرد، بەڵام بە تێگەیشتنی ئەو کاتیشەوە ئێمە بووین بە حیزبێکی جەماوەریی راستەقینە.

من چەندین جار وەکوو نوکتەیەکیش لە کۆڕی چکۆڵەتردا باسی ئەوەم کردووە کە مانەوەی وشەی "سازمان" لە تەرجەمەی فارسی ناوەکەماندا وەکوو ئەوەیە کە لە کوردستانی عێراق ناوی منداڵەکانیان دەنێن "ئەوزاد"، پیریش دەبێ هەر ناوی "کاك ئەوزادە". "سازمان"یش هەر وایە، ئەوە ناوی منداڵیتە لە سەرت ماوە، بەڵام تۆ گەورە بووی. بۆیە بەو حیسابە من لەو کاتەوە خۆمان بە حیزب دەزانم و بە هەقی موسەللەمی خەڵکی کرێکار و زەحمەتکێش و ئەو نەسلە شۆڕشگێڕەی ئەو کاتی کۆمەڵەی دەزانم کە خۆی وەك حیزبێك بناسێ و لە مێژووی خۆیدا خۆی وەکوو حیزبێك دانێ.

بێجگە لەوە، ئێمە چووینە نێو بزووتنەوەیەکی جەماوەرییەوە و بووین بە هاندەر و رێکخەری، شۆڕشێکی چەکدارانەمان بەرێوە برد، لە وت و وێژ لەگەڵ کۆماری ئیسلامیدا بەشداریمان کرد، بووین بە خاوەنی ئەساسنامە و پێڕەوی ناوخۆ، زەوابتی رێکخراوەییمان دانا، بەرنامەی سیاسیمان داڕشت، کۆنگرە و کۆنفرانسەکانمان گرت، لە ئەوەڵێن کاتدا کە بۆمان رەخسا رەهبەرییەکی ناهەڵبژێردراوی کە لە دەورەی کاری نهێنیی کۆمەڵەوە مابووەوە کردمان بە رەهبەرییەکی هەڵبژێردراو کە لە کۆنفرانسەکانی داهاتوو و لە کۆنگرەکاندا پێکمان هێنا، دەفتەری سیاسیمان دامەزاند، سکرتێری گشتیمان دانا، دواتریش بۆ ماوەی چەند ساڵ سازمانێکی دەقیقتری حیزبیشمان پەیدا کرد. چۆن حیزب نەبووین و حیزبی جەماوەریش نەبووین؟ بەڵام لێرە دوو موشکیل دێتە پێشەوە:

یەکەم، بە هۆی چەندین تەکان و شەکان لە نێو کۆمەڵەدا لە کۆتایی هەشتاکان و سەرەتای نەوەدەکانی زایینی، ئێمە ئەو سازمانە حیزبییەمان لێهەڵوەشایەوە و تا حددودێك لێ چکۆڵە بووەوە، بەرتەسك بووینەوە بە ئۆردووگایەکی چکۆڵە بە ژمارەیەکی کەمەوە و بە تایبەتی بە ئەفرادی تارادەیەك تازەوە کە هەڵگر و پارێزەری سوننەتە پێشووەکانی کۆمەڵە نەبوون و لەناو خۆشمان دا کێشە و ناکۆکی پێش هات. ئەمانە ئێمەی لە قەوارەی حیزبی و بە تایبەتی لە فەرهەنگی حیزبی، فەرهەنگێکی حیزبی کە شیاوی ئێمەیە، تارادەیەك دوور کردەوە.

دووهەم، بێجگە لەوە، تەنانەت ئەگەر هەمان سازمانی حیزبیی پێشووشمان هەبایە، هێشتا بۆ دەورەی داهاتوو رەسایی نەدەکرد. دەورەی داهاتووی خەباتی سیاسی و کۆمەڵایەتی لە کوردستان خوازیاری حیزبێکە تێکۆشەر، خاوەنی هەمان خەسڵەتە شۆڕشگێڕانەکان کە لە رابووردوودا هەیبوو، فیداکار، خۆنەویست، بەدیسیپلین، پاك و خاوێن کە خۆشەویستی و ستایشی هەمووان لە کوردستان بۆ لای خۆی راکێشێ، لە هەمان حاڵدا حیزبێکی نوێخواز، ئەهلی فیکر، حیزبێکی ئەهلی دیالۆگ و دانوستاندنی سیاسی و ئەزەری لەگەڵ کۆمەڵگاکەی خۆی و لەگەڵ رۆشنبیران و پێشڕەوانی سەردەمی خۆی، حیزبێکی پابەند بەمافی جەماوەر و بە بەشداری جەماوەر لە سیاسەتدا، ئێمە حیزبێکی ئاوامان پێویستە.

بەئەنجام گەیاندنی هەموو ئەو کارانە، دیارە وردکردنەوەی زۆری دەوێ، لە مەجالی خۆیدا منیش وەکوو یەکێك بەشداری بووانی کۆنگرە رەنگ بێ هێندێك قسەم هەبێ بیکەم. بەڵام لێرەدا ویستم بڵێم کە چاکسازیی حیزبی لە کۆمەڵەدا، پێویستییەکی موتڵەقە، غەیری مومکینە ئێمە ئەو کارە نەکەین.

هێندێك کەس قسە لە بوحرانی تەشکیلاتی دەکەن، واش بێ من گوێی نادەمێ، چونکە بوحران بۆ من هێندە وشەیەکی خەتەرناك نییە، بەڵام من ئاوای تێدەگەم کە ئێمە وەکوو کۆمەڵە لە ژێر باری گەشە کردن و پەرە

سەندنی خۆماندا خەریکین نوقم دەبین. ئەگەر قەیرانیش هەبێت، من بە قەیرانی گەشە کردنی دەزانم. ساختاری حیزبیی ئێمە، فەرهەنگی حیزبیی ئێمە، رەهبەریی ئێمە، شێوازی کارەکەی، کادر و مەسئوولانی ئێمە، چوارچێوە و قەوارەی کادری ئێمە سەرجەم هێشتا توانای هەڵگرتنی ئەو بارە قورسەی بەدەست نەهێناوەتەوە کە لە خەباتە سیاسییەکەماندا بۆ خۆمانمان دەستەبەر کردووە. ئێمە هێشتا خاوەنی قەوارەیەکی زەعیفین لەحاڵێکدا لە بوواری سیاسیدا زۆر زۆر پێشکەوتنمان بە دەست هێناوە. ئێمە دەبێ چاکسازییەکی حیزبی وەها بکەین و ببین بە وەها حیزبێك کە نەك تەنیا ئیجازە نەدات دەسکەوتەکانی ئێستامان بە باشی هەزم بکەین؛ بەڵکوو حیزبێك بین کە بتوانین هەموو ئەو بزووتنەوە کۆمەڵایەتییە جەماوەرییانە، هەموو بزووتنەوەی کوردستان لە ئەبعاد و بووارە جۆراوجۆرەکانیدا بقۆزینەوە، حەقیقەتەن و بەکردەوە شایستەی رەهبەریی ئەو بزووتنەوەیە بین و ئەو شیاو بوونە تەنها لە بیروباوەڕماندا و لە بەرنامەماندا نەبێ، بەڵکوو لە ئەو مکانیزمانەشدا بێ کە پێکمان هێناوە بۆ بەڕێوە بردنی کارەکانمان.

ئێمە دەبێ ئەو فەرهەنگە لە نێو خۆماندا بە تەواوی بچەسپێنین کە خۆمان بە خاوەنی هەموو بزووتنەوەی کوردستان بزانین لە هەموو بووارەکانیدا و ئەرکی بەڕێوە بردن و رەهبەری و لەعەینی حاڵدا دیالۆگ لەگەڵ کردن و دانوستاندن، فکر پێدان و فکر لێوەرگرتن، رێکخستن و وشیار کردنەوەی ئەم بزووتنەوەیە لە هەموو بووارەکانیدا و لە هەموو قۆناغەکانیدا بە ئەرکی خۆمان بزانین، بە ئەرکی حیزبیی خۆمان بزانین. فەرهەنگی خۆ بەکەم گرتن، خۆ لە پەراوێزدا دیتن، ئەو ئەرکانە بە گەورەتر زانین لەوەیکە کۆمەڵە بتوانێ بیکا، نابێ لە نێو ئێمەدا بمێنێ. دەبێ حیزبی خۆشمان وەها چاکسازییەکی تێیدا بکەین تا لە ئاستێکدا بێ کە بتوانێ ئەو ئەرکە گەورانە ئەنجام بدات.

یەکێك لەو شتانەی کە بە بڕوای من لە مەسەلەی چاکسازیی حیزبیدا خاڵێکی گرینگی دیکەیە، مەسەلەی ئیدامەکاری، بەردەوامی و سەقامگیرییە لە کاری کۆمەڵەدا. هاوڕێیان، کۆمەڵە لە کوردستان خۆی وەکوو حیزبی نوێخواز ناساندووە، خۆی وەکوو حیزبی ئاڵوگۆڕ و پێشڕەوی ناساندووە، وەکوو حیزبێك کە لەگەڵ گۆڕانکارییەکانی سەردەم، لەگەڵ مۆدێرنیزم، لەگەڵ نوێخوازی دەگونجێ، دەتوانێ تەبا بێ، وشك نییە، جموودی نییە، ناساندووە. بۆیەشە لەهەر سەردەمێکدا کە دەبووژێتەوە و دەست بەکاری چالاکانەی خۆی دەکا، زۆری پێناچێ پێشڕەوترین توێژەکانی کۆمەڵگا بۆ لای خۆی رادەکێشێ. ئەمە خەسڵەتێکی چاکە و دەبێ رایگرین، بەڵام قسەی من لێرەدا ئەوەیە کە ئەو خەسڵەتە کافی نییە. ئێمە دەبێ لەمە بەولاوە لە هەمان کاتدا لە کۆمەڵگای کوردستان کۆمەڵە بکەین بە حیزبێك کە بەردەوامی، سەقامگیری، ئیدامەکاریش لە خۆیدا دەنوێنێ و کۆ دەکاتەوە. لە بیرمان نەچێتەوە کە ئێمە یەك دوو جارێك تەکان و شەکانی گەورەمان بە سەرهاتووە، چی دی نابێ خەڵك و کۆمەڵگای کوردستان و ئەو کەسانەی بە پەرۆشەوە دەڕواننە چارەنووسی کۆمەڵە و چارەنووسی خۆیان بە کۆمەڵەوە گرێ داوە، جارێکی دیکە بیر بکەنەوە داخوا لەم کۆنگرەیە یا ئەو کۆنگرەی دیکەدا چ فەرتەنەیەك دێتە دەرێ. تازە ئەوە لە کۆمەڵەدا تەواو بووە و دەبێ تەواو بێ. کۆمەڵە لە هەمان حاڵدا ئەو حیزبەیە کە هیچ تەکان وشەکانێکی دیکە بە خۆیەوە نابینێ و نابێ بیبینێ، کۆمەڵە حیزبی سەقامگیری و سوباتە، حیزبێکە کە



پشتی پێوە ببەستی. ئەمە خەسڵەتێکە دەبێ بچەسپێ لە کۆمەڵەدا، خەسڵەتێکە لە هەم لە تەداوەمی سیاسیدا، هەم لە زەمینییەت و فەرهەنگی ئێمەدا و لە کارکردی هەر تاکە کەسێکماندا دەبێ جێگەی خۆی بکاتەوە.

هەر بۆیە و لەو روانگەیەشە کە ئێمە بانگەوازی ئەوە دەکەین، دەڵێین ئەگەر بەحسی نەزەری و سیاسی لە سەر سیاسەتەکانی کۆمەڵە هەیە، ئەگەر کەسێك ئیسلاحاتێك لە سەر سیاسەتەکانی کۆمەڵە پێشنیار دەکا، ئەگەر دەیەوێ لەو پەیوەندەدا سێمینار بگرێ و باسەکانی خۆی بێنێتە گۆڕێ، دەیەوێ بە کاری نەزەری و نووسین لەو بووارەدا سەهمێك ئەدا بکا، باوەش بۆی ئاوالایە، بەڵام داروودەستە بازی بۆ هەمیشە مەوقووفە لە کۆمەڵەدا و ئەم کۆنگرە جێگای لە گۆڕنانی ئەوانەیە. کۆمەڵە دەبێ بە پتەوترین ئینسیجامەوە، بە فراوانترین یەك خەتییەوە، بە گەورەترین کۆبوونەوە لە دەوری یەك رێبازەوە لەم کۆنگرەیە بێتە دەر. ئەمە مەرجێکی گەورەی سەرکەتنی کۆمەڵەیە وەکوو حیزبی رەهبەر، وەکوو حیزبی پێشڕەو، وکوو حیزبی مەسئوول لە بزووتنەوەی کوردستاندا. هیوادارم بە تێکۆشانی هەمووومان لەم کۆنگرەیەدا وەدی هاتنی ئەو ئاواتە بۆ کۆمەڵە مسۆگەر کەین و خزمەتێکی گەورەی تاریخی پێ بکەین.

سپاستان دەکەم.

www.komala.org

Email: Komala1348@hotmail.com
Tel: (0044704)3138499
Mobile: 009647701405134
Fax: 00447043140449

١






Komala Party _ Iranian Kurdistan

کومەله _ سازمان انقلابی زحمتکشان کردستان ایران
کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێران

# ڕاگەیاندنی کۆتایی کۆنگرەی دەیەمی کۆمەڵە

کۆنگرەی دەیەمی کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێران لە مانگی گەلاوێژی ئەمساڵدا بۆ ماوەی پێنج ڕۆژ بە بەشداری نوێنەرانی هەڵبژێردراوی ڕێکخراوە جۆراوجۆرەکانی کۆمەڵە لە ناوخۆ و دەرەوەی وڵات و هەروەها ئەندامانی هەڵبژێردراوی هێزی پێشمەرگە و ئۆرگانە ناوەندییەکان و بەشداری ژمارەیەك لە هاوڕێیانی ئەندام وەکوو چاوەدێر[1] بەڕێوەچوو.

کۆنگرە بە سروودی ئەنترناسیۆناڵ و پاشان ڕاگرتنی دەقیقەیەك بێدەنگی بۆ ڕێزگرتن لە یادی هەموو گیانبەخت کردووانی کۆمەڵە و ڕێبازی ئازادی و سۆسیالیزم وبزووتنەوەی شۆڕشگێڕانەی گەلی کورد و بە سروودی کۆمەڵەی زەحمەتکێشان دەستی پێکرد. پاشان کۆنگرە لە لایەن هەیئەتی سەرۆکایەتی کۆنگرەوە کرایەوە.

هەیئەتی سەرۆکایەتی، پێڕەوی بەڕێوەچوونی کۆنگرەی کە لە لایەن کۆمیتەی ناوەندییەوە پێشنیار کرابوو، بە شێوەی گشتی بە پەسندی کۆنگرە گەیاند و پاشان هاوڕێ عەبدوڵڵای موهتەدی، سکرتێری گشتی کۆمەڵە لە لایەن کۆنگرەوە، وێڕای بەخێرهێنانی ئەو میوانانەی کە بە نوێنەرایەتی لە لایەن حیزبە سیاسییەکانی کوردستانی عێراق و کوردستانی سوریەوە بۆ کۆنگرە بانگهێشت کرابوون، وتارێکی سیاسی پێشکەش کرد و لەو وتارەدا تیشکی خستە سەر هەلومەرجی سیاسی ئێران و ناوچەکە و کێشەی کورد لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و سیاسەت و هەڵوێستەکانی کۆمەڵە. بەشوێن ئەوەدا نوێنەرانی ئەو حیزبە سیاسییانەی کە بۆ ڕێوڕەسمی کردنەوەی کۆنگرە بانگهێشت کرابوون، وتار و بروسکەی پیرۆزبایی خۆیان ڕوو بە کۆنگرە خوێندەوە.

کۆنگرە لە درێژەی کاری خۆیدا، بێجگە لە پەسند کردنی پێڕەوی بەڕێوە چوونی کۆنگرە، هەیئەتی سەرۆکایەتی هەمیشەی کۆنگرە هەڵبژارد و ئەجێندای پێشنیارکراوی کۆمیتەی ناوەندی پەسند کرد کە بریتی بوون لە ١_ڕاپۆرتی کۆمیتەی ناوەندی بە کۆنگرە ٢_هەلومەرجی سیاسی ئێران، کوردستان و گۆڕانکارییەکانی ناوچەکە و ئەرکەکانی کۆمەڵە ٣_چاکسازی حیزبی لە کۆمەڵەدا ٤_قەرار وبڕیارنامە پێشنیارکراوەکان ٥_هەڵبژاردنی کۆمیتەی ناوەندی ٦_ دانیشتنی کۆتایی کۆنگرە.

ڕاپۆرتی کۆمیتەی ناوەندی لە لایەن هاوڕێ عەبدوڵڵای موهتەدی، سکرتێری گشتی کۆمەڵەوە پێشکەش بە کۆنگرە کرا. لەم ڕاپۆرتەدا کە لە دوایین پلێنۆمی کۆمیتەی ناوەندیدا بە تێروتەسەلی درابۆوە بەر باس و لێکۆڵینەوە و دواتر پەسندکرابوو، گرینگترین تەوەرەی ئاڵوگۆڕە سیاسییەکانی ناوچەکە و ئێران و کوردستان کەوتنە بەر باس و لێکدانەوە و لە بە ڕۆشنایی ئەم لێکدانەوەیەدا بە

١

وەبیرهێنانەوەی گرینگترین سیاسەت و هەڵوێستەکانی کۆمەڵە لە کۆنگرەی نوهەمەوە تاکوو ئێستا راست و دروستیان بە لەبەر چاوگرتنی ئەزموونی دەورەی رابوردوو کەوتنە بەر هەڵسەنگاندن و لەو راپۆرتەدا جێگا و شوێنی کۆمەڵە لە ناو بارودۆخی سیاسی ئێران و کوردستاندا کەوتە بەر لێکۆڵینەوە و بە دەست نیشان کردن و پێداگری لەسەر دەستکەوتەکانی ئەم دەورە لە کار و هەڵسووڕانی کۆمەڵە، قسە لە کەموکوڕییەکانیش کرا و رێگای چاکسازی پێشنیار کرا.

لە بەشی هەل‌ومەرجی سیاسیدا، راپۆرتی کۆمیتەی ناوەندی ئاماژەی بەو مەسەلەیە کرد کە کۆماری ئیسلامی لە هەموو دەورانی ژیانی خۆیدا. لە راستیدا لە حاست جێگیر کردنی مۆدێلێکی ئابووری و روو لە گەشە لە ئێراندا دەستەوەستان ماوە و هەر ئەوەش ئەم رژیمەی لەگەڵ گرفتی جێگیر بوون وەك رژیمێکی‌سەقامیگر رووبەڕوو کردووە، هاوڕێ لەگەڵ شکستی شێوازەکانی ئیدارەی کۆمەڵگا و قەوارە سیاسی، فەرهەنگییەکەی، سەرەنجام رێگەی بۆ سەرهەڵدان و گەشەی ئیسلاحخوازی دەوڵەتی بۆ دەرباز بوون لەم بن بەستانە خۆش کرد. راپۆرتەکەی کومیتەی ناوەندی ئاماژەی بەو خاڵە کرد کە گەشە و نوشستی ئیسلاحخوازی دەوڵەتی بەرهەمی بێ‌توانایی کۆماری ئیسلامی لە بەڕێوەبردنی هەر ئەم مۆدێلی گەشەی ئابووری و بێ‌کەڵك بوونی مۆدێلی ئیداری، سیاسی و فەرهەنگی لە لایەکەوە و لە لایەکی‌ترەوە بێ‌توانایی کۆمەڵگا لە خستنە رووی ئاڵتێرناتیڤێکی رۆشن وەك بەستێنێکی سیاسی بۆ خستنەڕێی بزووتنەوەیەکی خوازیاری رووخانی رژیم بوو. هەر چەند شکستی ئیسلاحخوازی دەوڵەتی کۆمەڵگای هەنگاوێك بەرەو دیاردەی بەربەرەکانیێی نیهایی لەگەڵ رژیم نزیك کردۆتەوە، بەڵام هێشتا بە مانای رەخسانی هەل‌ومەرجێکی شۆڕشگێڕانە لە ناو کۆمەڵگا و گرتنە بەری رێگای شۆڕش و راپەڕین نییە و بەو پێیەش بزووتنەوەی چاکسازی لە خوارەوە و لە نێو جەماوەری خەڵکدا هەروا زیندووە. بە واتایەکی‌تر شکستی ئیسلاحخوازی دەوڵەتی بە مانای هەرەس هێنانی داخوازی و ویستی جەماوەر بۆ باش بوونی وەزعی ژیانیان نییە. هەر چەند بە یەکدەست بوونەوەی رژیم پاش هەڵبژاردنەکانی مەجلیسی حەوتەم جۆرێك نوشست لە کۆمەڵگای ئێراندا هاتۆتە گۆڕێ، بەڵام ئەم نوشستە زۆر ناخایەنێ و هیچ کات کۆمەڵگای ئێران ناچێتەوە دۆخێك کە تێیدا کۆماری ئیسلامی بۆی بلوێ بە ملهووڕی بزووتنەوەی جەماوەر سەرکوت کا و بۆ دەورەیەکی درێژخایەنتر پاڵ وەکورسی دەسەڵاتەوە بدات. لە بەشی لێکدانەوەی بارودۆخی سیاسی لە کوردستان ئاماژە بەم مەسەلەیە کرا کە لە کوردستان لە بەر ئەوەیکە ئیسلاحخوازیی دەوڵەتی ریشە و پێگەیەکی لە نێو خەڵکدا نەبووە و لە لایەکی دیکەوە بە هۆی کارتێکردنی کێشەی کورد لە ناوچەکە لە سەر کوردستانی ئێران و گرینگتر لەوەش خوڕاگری و بەربەرەکانێی خەڵکی کوردستان هەر لە سەرەتای هاتنە سەرکاری ئەم رژیمەوە، سەرەڕای هەوراز و نشێوەکانی، ئیمە لەگەڵ بزووتنەوەیەکی جەماوەری چالاك و زیندوو رووبەرووین. پاشان باسی ئەوە کرا کە شکستی ئیسلاحخوازی دەوڵەتی لە لایەکەوە، پێداگری رژیم لە سەر درێژەی سیاسەتی پەرەپێدان وپشتیوانی لە تێرۆریزم و وەدەست هێنانی چەکی ئەتۆمی لە لایەکی دیکەوە، شانسی سازانێکی درێژماوە و بە بنەمای لە نێوان کۆماری ئیسلامی و رۆژئاوادا کەم کردۆتەوە.

لە لێکدانەوەی وەزعی ناوچەکەدا راپۆرتی کۆمیتەی ناوەندی جارێکی دیکە دروستی سیاسەتەکانی کۆمەڵەی خستە روو و پێداگری کرد کە چ بە هۆی کاریگەری گۆڕانی سیمای سیاسی

۲

جیهـان واتـە کۆتـایی شـەڕی سـارد و دوو جەمسـەری بـوونی بەرهـەمی ئـەم شـەڕە و، چ لـە بـەر پێویسـتییەکانی سـەرمایەی جیهـانی، گـۆڕانی قـەوارەی و روانـەتی سیاسـی ناوچـەی رۆژهـەڵاتی ناوەڕاسـت، شـتێکی بـێ گەڕانەوەیـە. هـەر چـەند ئـەم راسـتییە هـیچ پێوەندییـەکی لەگـەڵ ئیـدیعای دێمۆکراسی خوازی ئەمریکا و باقی زل هێزەکانی دیکە نییە و ئەمە راستە کە ئەوان لە ناوچەکەدا بە شـوێن قـازانج و بەرژەوەنـدی خۆیانـەوەن، بـەڵام بـە هـۆی تایبەتمەندییـەکانی ئـەم هەلومەرجـە هێـزە ئازادیخواز و پێشـکەوتنخوازەکان و بـەم پێیـەش بزووتنـەوەی جـەماوەری لـە ئێران و کوردستان کـە لـە دژی ئـەم نیزامـە سیاسـییە خـەبات دەکـەن کـە بەرامبـەر بـەم نەزمـە نوێیـە وەسـتاوەتەوە، دەتـوانن ئـەم هەلومەرجە بە قازانجی خۆیان بقۆزنەوە. سیاسـەتی کۆمەڵـە وەك رێبـەری بزووتنـەوەی شۆڕشـگێڕانە و نەتەوەیی گەلی کورد لە سەر ئەم بنەمایە بووە و هەیە.

لە بەشێکی دیکەی راپۆرتەکەدا ئاماژە بەو خاڵە کرا کە راستیی و دروستی هەڵوێستەکانی کۆمەڵە کە لە سەر ئەساسی روانینو تێگەشتنێکی قووڵ لە هەلومەرجی سیاسی ئێران و بەتایبەت کوردستان دامـەزراوە، بە راستییەکانی ئاڵوگۆڕی سیاسـی ئێران و کوردستان تاقی کراوەتـەوە و سـەلماوە. لـەم بەشـەی راپۆرتەکـەدا هـەروەها پێداگری کـراوە لـە سـەر دروسـت بـوونی سیاسـەت و هەڵوێسـتەکان و پەسـندکراوەکانی کۆنفرانسـی هەشـتەمی کۆمەڵـە، واتـە یـەکێتی بـۆ دێمۆکراسی وەك بەسـتێنێك بـۆ هاوپەیمانەتی و یەکێتیەکی سەرتاسەری لە دژی کۆماری ئیسلامی و خەبات بۆ دێمۆکراسی و گەلاڵەی بەرەیەکی فراوانی حیزب و رێکخراوە سیاسییەکانی کوردستانی ئێران و پشتیوانی بەرچاوی چین و توێـژە جیاوازەکـانی خـەڵکی کـورد لـەم گەلاڵەیـە و هەوڵـەکانی کۆمەڵـە لـەم بوارانـەدا بەڵگەیـەکی ئـەم راستییەن.

لە باسی جێگا و شوێنی کۆمەڵەدا جارێکیتر تەئکیدی کراوە لە سەر بەها نەگۆڕەکانی رەوتی ئێمە لـە کۆمـەڵگای کوردسـتاندا واتـە حیزبـی سیاسـی کرێکـاران و زەحمەتکێشـان، پشـتیوانی لـە بەرژەوەندییەکانی ئەوان لە بزووتنەوەی کوردستان و لە کۆمـەڵگادا و پابەند بوون بـە ئاسۆ و ئامانجی سۆسیالیستی و رێبەری بزووتنەوەی رزگاریخوازی خەڵکی کوردستان و ... لەم بەشەی راپۆرتەکـەدا بـە تایبەت ئاماژە کرا بە تایبەتمەندیی جەماوەریی کۆمەڵە و پەیوەنـدی گرتنی بـە خەڵکەوە و نواندنـەوەی گرفـتو ئـازار و کێشـەکانیان، لـە کـردەوە و بڕیارەکـانی کۆمەڵـەدا، بـەردەوام بەشـێکی جیانـەکراوەی تایبەتمەندییەکانی رەوتی ئێمەیان پێك هێناوە. لەگەڵ ئەوەش تەوەرە سەرەکییەکانی کار و ئەرکـەکانی کۆمەڵە وەك حیزبی چەپ و سۆسیالیست لە کوردستانی ئێران لە ئاست کرێکاران و هەموو کۆمەڵگا، بە تایبـەت لـە هەلومەرجێکـدا کـە سۆسـیالیزم وەك ئـاڵوگۆڕێکی کۆمەڵایـەتی سیاسـی خێـرا ناچـێتە دەستووری کاری داهاتووی شۆڕشی ئێران و بە تایبەت کوردستانەوە، دیاریکرا و شی کرایەوە.

بەشـێکی دیکـەی راپـۆرتی کۆمیتـەی ناوەنـدی باسـی لـە چاکسـازی حیزبـی لـە کۆمەڵـەدا دەکـرد و ئاماژەی بەو خاڵە زۆر گرینگەدا کە مەبەست و ئامانجی ئەم رێفۆرمانە لـە کۆمەڵـەدا دەبـێ ئامادەکردن و کارامەتر کردنـی کارکردەکانی تەشکیلاتی حیزبیی ئێمـە بـێ بـۆ وەڵامدانـەوە بـەو پێداویستییە نوێ و روو لـە داهاتووانـەی کـە هەنووکـە لـە بـەردەم کۆمەڵـەدان. راپۆرتەکـە پاشـان لـە شـی کردنـەوەی تیـۆری چاکسازی حیزبیدا، دەستی دایە روونکردنـەوەی ئـەم پێداویستیانە و لەوانە رێبەرایـەتی بزووتنـەوەی

٣



جەماوەری بۆ رزگاری نەتەوەیی لە کوردستان. هەر لەم بارەیەوە باسی لەوە کرد کە کۆمەڵە هەر ئێستاش ئەرکەکانی حیزبێکی سیاسیی جەماوەری و خاوەن پێگە و ئۆتۆریتەی لە کوردستاندا لە سەر شانە، بەڵام پێکهاتە و قەوارەی حیزبی و تەشکیلاتیەکەی هێشتا لە سەر ئەو بنەمایە دانەمەزراوە. ئەم نەگونجانەیە کە کەموکوڕیی جیددی لە کاری رێبەرایەتی کۆمەڵە و تەشکیلاتی نهێنی لە کوردستان و کار لە نێو هێزی چەکدار و پێشمەرگە و هەڵسووڕان لە دەرەوەی وڵات و کاری دیپلۆماسیی لێ کەوتۆتەوە. راپۆرتەکە زۆر تێروتەسەل بوو و گەلێك بابەتی جۆراوجۆری لە خۆ گرتبوو و لەگەڵ پێشوازی بەرینی کۆنگرە بەرەوروو بوو.

لە درێژەی کاری کۆنگرەدا و باس لە سەر بابەتەکانی دیکەی کۆبوونەوە واتە هەلومەرجی سیاسی ئێران و کوردستان و ئاڵوگۆڕەکانی ناوچەکە و هەروەها دەستووری سێهەم واتە رێفۆرمی حیزبی، بەشدارانی کۆنگرە چالاکانە بۆچوونەکانی خۆیان باس کرد و قسەوباسەکان بە وردی شی کرانەوە. لە باسی هەلومەرجی سیاسی و ئەرکەکانی داهاتوودا کە تەوەرەی گشتییەکانی لە راپۆرتی کۆمیتەی ناوەندیدا باس کرا بوو پێشکەشکاری باسەکە و هەروەها بەشدارانی کۆنگرە بە ئاماژە بۆ بێئەم لاولا بوونی رووخانی کۆماری ئیسلامی و هەڵێنجانی عەمەلی لە هەلومەرجی سیاسی و ئەو ئەرکانەی لەمبارەیەوە دەکەوێتە ئەستۆی کۆمەڵە و ئۆپۆزیسیۆنی چەپ و دێموکرات، باسی زۆر پڕبایەخیان پێشکەش کرد. لە باسی ئەرکەکانی داهاتوودا جەخت کراوە لە سەر رێکخستنی حیزبی و ناحیزبی لە پێناو رێبەرایەتی کردنی بزووتنەوە رزگاری خەڵکی کوردستاندا، پەرەپێدانی پەیوەندی لەگەڵ رێکخراوە کوردییەکانی هەموو بەشەکانی کوردستان و لەگەڵ حیزبە دەرەکییەکانی دەسەڵاتدار و دەرەوەی دەسەڵات لە دەرەوەی وڵات و لەم نێوەدا بە تایبەت حیزبە چەپ و سۆسیال دێموکراتەکان و سەرەنجام پێداگری لە سەر پێویستی پێوەندی چالاکتر و چڕوپڕتر لەگەڵ هێزە چەپ و دێموکرات و ئازادیخوازەکانی ئێران کرا و بە تایبەتی بۆ پشتیوانی لە خواستی رەوای خەڵکی کوردستان و پشتیوانی لە قەوارەی فیدراڵی لە ئێران.

هەروەها لە باسی رێفۆرم و چاکسازی حیزبیدا کە ئامادە بوونی کۆنگرە بە چڕوپڕی بەشدارییان تێدا کرد، لە لایەن هاوڕێیانی نوێنەری بەشە جۆراوجۆرەکانی تەشکیلاتەوە باس لە کەموکوڕییەکان و کزی و لاوازیە گەورە و بچووکەکان کرا.

باسکاری ئەم باسەش تەئکیدی کردەوە لە سەر پێویستی بەرەوڕووبوونەوە لەگەڵ فەرهەنگ و نەریتی دواکەوتووانە و پێش‌حیزبی لە هەموو ئاستەکانی رێبەرایەتی و تەشکیلاتیدا کە لەگەڵ ئەرکە روو لە زیاد بوونەکانی کۆمەڵە لە کوردستان و لەگەڵ ئەرکی رەوتی ئێمە بۆ رێبەرایەتی بزووتنەوەیەکی گەورە و زیندوو تەبا نییە و جەختی لە سەر ئەوە کردەوە کە رێفۆرمی حیزبی وێڕای رێخۆش کردن بۆ نەهێشتنی ئەو کەموکوڕیانە دەبێ لە خزمەت بردنە سەرەوەی توانای ئۆرگانە جۆراوجۆرەکان دابێ بۆ بەرێوە بردنی ئەو ئەرکە گەورانەی کە لە باسی هەلومەرجی سیاسی و هەروەها لە راپۆرتەکەی کۆمیتەی ناوەندیدا دەکەوێتە سەر شانمان. واتە هەرچی زیاتر تەیار کردنی کۆمەڵە بۆ رێبەرایەتی کارای بزووتنەوەی ئازادیخوازانەی خەڵکی کوردستان بۆ ئازادی نەتەوەیی و دێموکراسی. لەم باسەدا بە تایبەت باس لە شوێن و جێگای کادری بە ئاگا لە رێبازی کۆمەڵە کرا بۆ بەرەوپێش بردنی

ئەرکەکانی داهاتوو. لەم بەشدا تەئکید لە سەر ئەوە کراوە کە ئەم چاکسازیانە بۆ ئێمە بە هیچ جۆرێك تەنیا کارێکی ناوخۆیی ویان بەشێوەی باو تەینا رەخنەیەکی ناو تەشکیلاتی و نەفی کردنەوەی چالاکییە پڕ بایەخەکانی رابوردوو نییە، بەڵکوو بۆ چاکسازی و باشتر کردنی کارەکان لە داهاتوودا و روو بە دەرەوەش دەبێ بۆ بە خەت کردنی هەموو کادر و هەڵسووڕاوانی کۆمەڵە لە هەر بەشێکی تەشکیلات و لە هەر شوێنێکدا تێبکۆشێن.

لە بەشی قەرار و بریارەکاندا کە چوارەمین بەشی ئەجێندای کۆنگرەی پێك دێنا، بەشداربووانی کۆنگرە، دەستیان دایە نووسینی و پێشکەش کردنی قەرار و بریارنامە گەلێکی جۆراوجۆر کە زۆرتر بە مەبەستی پێداگرتن لەسەر ئەو هەنگاوە هەنووکەییانەی کە دەبێ بخرێتە بەرنامەی کاری کۆمیتەی ناوەندیی هەڵبژێردراوەی کۆنگرەی دەهەمەوە، نووسران بوون. بۆ وێنە هەر لەم بەشەدا راپۆرتی کۆمیتەی ناوەندی و هەروەها ئەو سەرخەتە سەرەکییانەی کە لە بەشی چاکسازی حیزبیدا لەلایەن باسکاری باسەکەوە پێشکەش کرابوو بە زۆرینەی دەنگ پەسند کران. جگە لەوە چەند بریارێك لە بابەت پێك هێنانی، ئۆرگانگەلێك سەربارەت بە کار لە نێو کرێکاران و ژنانیش دا پەسند کران و خرانە بەرنامەی کاری کۆمیتەی ناوەندی داهاتوو. هەروەها کۆنگرە لە بریارنامەیەکدا داوای لە کۆمیتەی ناوەندی کرد چەند پەیام و برووسکەیەك روو بە نەتەوەکانی ئێران و توێژە جۆراوجۆرەکانی کۆمەڵگای کوردستان و هەروەها روو لە زیندانیانی سیاسی دەر بکات.

لە بەشی تایبەت بە هەڵبژاردنی کۆمیتەی ناوەندیدا سەرەتا هاوڕێ عەبدوڵڵا موهتەدی دەستی دایە شیکردنەوەی چۆنیەتی کار و چالاکی رێبەرایەتی کۆمەڵە لە دەورەی داهاتوودا، ئەو بەڵێنییانەی کە دەکەوێتە سەر شانی ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی و سەرەنجام قسە و باسێکی تێر و تەسەل زۆرینەی کۆنگرە لە سەر هەڵبژاردنی کۆمیتەیەکی ناوەندیی ١٧ کەسە و ٢ جێگری کۆمیتەی ناوەندی ساغ بۆوە.

لە هەڵبژاردنێکدا کە بەم مەبەستە بەرێوە چوو، لە نێو ئەو هاوڕێیانەدا کە خۆیان پاڵاوتبوو، ١٧ کەس وەك ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی و ٢ کەس لە هاوڕێیان وەك ئەندامی جێگری کۆمیتەی ناوەندی هەڵبژێردران. لە یەکەمین کۆبوونەوەدا کە پاش کۆتایی کۆنگرە بەرێوە چوو لە نێو ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندیدا ٧ کەس وەك ئەندامانی دەفتەری سیاسی و هاوڕێ عەبدوڵڵای موهتەدیش وەك سکرتێری گشتی کۆمەڵە هەڵبژێردران.

ناوی ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی بەم جۆرەیە: ١_عومەری ئێلخانیزادە ٢_ناهیدی بەهمەنی ٣_فاروقی بابامیری ٤_حەمیدی بەهرامی ٥_رەسووڵی عەلیدووست ٦_بەهمەنی عەلیار ٧_عەبدوڵڵای عەزیمی ٨_رەزای کەعبی ٩_عەبدوڵڵای کۆهنەپۆشی ١٠_ئەحمەدینی گوڵپەروەر ١١_محەمەدی شافیعی ١٢_ناسری حیسامی ١٣_ ئەبووبەکر (سیامەك)ی مودەریسی ١٤_عەبدوڵڵای موهتەدی ١٥_جەمیلەی رەحیمی ١٦_ جەلالی ناوە ١٧_تالبی یوسفی

هاوڕێیانی جێگری کۆمیتەی ناوەندی بریتین لە:
١_عەبدوڵڵای ئازەربار ٢_ ئەویدی مێهراوەر

٥

ئەرکەکانی داهاتوو. لەم بەشدا تەئکید لە سەر ئەوە کراوە کە ئەم چاکسازیانە بۆ ئێمە بە هیچ جۆرێك تەنیا کارێکی ناوخۆیی ویان بەشێوەی باو تەینا رەخنەیەکی ناو تەشکیلاتی و نەفی کردنەوەی چالاکییە پڕ بایەخەکانی رابوردوو نییە، بەڵکوو بۆ چاکسازی و باشتر کردنی کارەکان لە داهاتوودا و روو بە دەرەوەش، دەبێ بۆ بە خەت کردنی هەموو کادر و هەڵسووڕاوانی کۆمەڵە لە هەر بەشێکی تەشکیلات و لە هەر شوێنێکدا تێبکۆشین.

لە بەشی قەرار و بڕیارەکاندا کە چوارەمین بەشی ئەجێندای کۆنگرەی پێك دێنا، بەشداربووانی کۆنگرە، دەستیان دایە نووسینی و پێشکەش کردنی قەرار و بڕیارنامە گەلێکی جۆراوجۆر کە زۆرتر بە مەبەستی پێداگرتن لەسەر ئەو هەنگاوە هەنووکەییانەی کە دەبێ بخرێتە بەرنامەی کاری کۆمیتەی ناوەندیی هەڵبژێردراوەی کۆنگرەی دەهەمەوە، نووسران بوون. بۆ وێنە هەر لەم بەشەدا راپۆرتی کۆمیتەی ناوەندی و هەروەها ئەو سەرخەتە سەرەکییانەی کە لە بەشی چاکسازی حیزبیدا لەلایەن باسکاری باسەکەوە پێشکەش کرابوو بە زۆرینەی دەنگ پەسند کران. جگە لەوە چەند بڕیارێك لە بابەت پێك هێنانی، ئۆرگانگەلێك سەربارەت بە کار لە نێو کرێکاران و ژنانیش دا پەسند کران و خرانە بەرنامەی کاری کۆمیتەی ناوەندی داهاتوو. هەروەها کۆنگرە لە بڕیارنامەیەکدا داوای لە کۆمیتەی ناوەندی کرد چەند پەیام و برووسکەیەك روو بە نەتەوەکانی ئێران و توێژە جۆراوجۆرەکانی کۆمەڵگای کوردستان و هەروەها روو لە زیندانیانی سیاسی دەر بکات.

لە بەشی تایبەت بە هەڵبژاردنی کۆمیتەی ناوەندیدا سەرەتا هاوڕێ عەبدوڵا موهتەدی دەستی دایە شیکردنەوەی چۆنیەتی کار و چالاکی رێبەرایەتی کۆمەڵە لە دەورەی داهاتوودا، ئەو بەڵێنییانەی کە دەکەوێتە سەر شانی ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی و سەرەنجام قسە و باسێکی تێر و تەسەل زۆرینەی کۆنگرە لە سەر هەڵبژاردنی کۆمیتەیەکی ناوەندیی ١٧ کەسە و ٢ جێگری کۆمیتەی ناوەندی ساغ بۆوە.

لە هەڵبژاردنێکدا کە بەم مەبەستە بەڕێوە چوو، لە نێو ئەو هاوڕێیانەدا کە خۆیان پاڵاوتبوو، ١٧ کەس وەك ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی و ٢ کەس لە هاوڕێیان وەك ئەندامی جێگری کۆمیتەی ناوەندی هەڵبژێردران. لە یەکەمین کۆبوونەوەدا کە پاش کۆتایی کۆنگرە بەڕێوە چوو لە نێو ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندیدا ٧ کەس وەك ئەندامانی دەفتەری سیاسی و هاوڕێ عەبدوڵای موهتەدیش وەك سکرتێری گشتی کۆمەڵە هەڵبژێردران.

ناوی ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی بەم جۆرەیە: ١_عومەری ئێلخانیزادە ٢_ناهیدی بەهمەنی ٣_فارووقی بابامیری ٤_حەمیدی بەهرامی ٥_رەسووڵی عەلیدووست ٦_بەهمەنی علیار ٧_عەبدوڵای عەزیمی ٨_رەزای کەعبی ٩_عەبدوڵای کۆمەنپۆشی ١٠_نەجمەدینی گوڵپەروەر ١١_محەمەدی شافیعی ١٢_ناسری حیسامی ١٣_ئەبووبەکر (سیامەك)ی مودەریسی ١٤_عەبدوڵای موهتەدی ١٥_جەمیلەی رەحیمی ١٦_ جەلالی ناوە ١٧_تالبی یوسفی

هاوڕێیانی جێگری کۆمیتەی ناوەندی بریتین لە:
١_عەبدوڵای ئازەربار ٢_ نەویدی مێهراوەر

ناوی هاوڕێیانی دەفتەری سیاسی کە لە یەکەمین پلۆنۆمی پاش کۆتایی کۆنگرەدا هەڵبژێردران بریتین لە: ١_عومەری ئیلخانیزادە ٢_فاررووقی بابامیری ٣_عەبدوڵای کۆهنەپۆشی ٤_رەزای کەعبی ٥_محەمەدی شافێعی ٦_عەبدوڵای موهتەدی ٧_ئەبووبەکر (سیامەك)ی مودەریسی

لە دوایین بەشی ئەجێندای کۆنگرە واتە دانیشتنی کۆتایی کۆنگرەدا، هاوڕێ عەبدوڵای موهتەدی وتارێکی سیاسی پێشکەش بە کۆنگرە کرد کە تێیدا بە کورتی ئاماژەی بە دەسکەوتەکانی کۆنگرە و ئەم ئەرکانە کرد کە لەم پێناوەدا دەکەوێتە سەر شانی دانەدانەی هاوڕێیانی حیزبی.

کۆمیتەی ناوەندی کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێران
٢٠ی گەلاوێژی ١٣٨٣
١٠ئاگۆستی ٢٠٠٤

www.komala.org

Email: Komala1348@hotmail.com
Komala Office in Sulaimania:
Tel: (0044704)3124711
Mobile: 00447077537465




Komala Party _ Iranian Kurdistan

کومەلە _ سازمان انقلابی زحمتکشان کردستان ایران
کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێران

# پەیامی کۆنگرەی دەیەمی کۆمەڵە بۆ گەلانی ئێران

خەڵکی تێکۆشەر، خوشك و برایان گەرمترین سڵاوی ئێمەتان پێشکەش بێت. کۆنگرەی دەیەمی کۆمەڵە کە لە مانگی گەلاوێژی ئەمساڵدا بەڕێوە چوو، یەکێك لە باسەکانی خۆی تەرخان کرد بۆ مەسەلەی مافی نەتەوەکانی ئێران.

کۆنگرەی ئێمە جارێکی‌تر جەختی کردە سەر بەڕەسمی ناسینی فرەچەشنی نەتەوەیی و کلتووری لەم وڵاتەدا و، سڕینەوەی ستەمی نەتەوەیی لە سەر گەلانی دانیشتووی ئێران، نەك تەنیا بە پێویستییەکی هەنووکەیی گەلانی ژێردەستە دەزانێ، بەڵکوو وەك یەکێك لە پایەکانی سەقامیگر کردنی دێمۆکراسی لە ئێران، سەرنجی تایبەتی پێداوە. کۆمەڵە وەك هێزی ڕێکخەری بزووتنەوەی شۆڕشگێڕانە و ڕزگاری بەخشی نەتەوەیی لە کوردستان و بۆ پاراستنی یەکگرتوویی و برایەتی گەلانی ئێران، خوازیاری دامەزراندنی سیستمێکی فیدراڵی لە ئێرانە کەتێیدا مافی گەلانی جۆراوجۆری بۆ بەدەستەوە گرتنی چارەنووسی خۆیان و یەکسانی و یەکێتی‌یان، گەرانتی بکا.

کۆنگرەی دەیەمی کۆمەڵە لە خەباتی دێمۆکراتیك و مافی هەموو گەلانی ئێران داکۆکی دەکا و جەخت دەکاتە سەر هاوپشتی بزووتنەوە و خەڵکی کوردستان لەگەڵ هەموو گەلانی‌تر.

بزووتنەوەی ڕزگاری خوازیی خەڵکی کوردستان بە گەلێك ئەزموونی خەبات دژی سەرەڕۆیی کۆماری ئیسلامی، لەم دۆخە گرینگەدا بۆ پێك هێنانی دۆستایەتی و یەکێتی ویست و داخوازییەکانی نێوان گەلانی نیشتەجێی ئێران لە سەر بنەمای دێمۆکراتیك و ئازادیخوازانە، لە خەبات بۆ مافی نەتەوەیی، پێداگیری دەکا و پشت بەستن بە دێمۆکراسی و ئازادی مرۆڤ و سیکولاریزمی سیاسی بە مەرج و دەسپێکی هەر جۆرە گەشەکردنێك دەزانێ.

ئێمە دەستی دۆستایەتی و تەبایی بۆ هەموو خەڵك و تێکۆشەرانی گەلانی‌تری ئێرانی درێژ دەکەین و خوازیاری پەرەپێدان بە پێوەندیی خەبات و تێکۆشان، لەگەڵ ئەوان و داکۆکی پەیگیرانەیان لە خەباتی دەسرەوتووانەی خەڵکی کوردستانن. بۆ بەدی هێنانی ئەم ئامانجە، کۆنگرەی دەیەمی کۆمەڵە، پێك هێنانی بەرەیەك بۆ خەباتی دێمۆکراتیك و پێشکەوتووانە، وەك ئامرازێك بۆ بەدیهاتنی هاوپشتی و پتەوتر بوونی یەکێتی نێوان گەلانی جۆراوجۆری ئێرانی، بە

1



باشی و کاریگەر زانی و هەوڵ و کۆششی لەم بارەیەوە خستە بەرنامەی کاری کۆمیتەی ناوەندیی هەڵبژێردراوی خۆی.

خەبات و تێکۆشان بۆ رووخاندنی کۆماری ئیسلامی و سیستمی پڕ لە هەڵاواردن و ستەمی ئێستا بۆ سەقامیگر بوونی دێموکراسی و بەرگرتن لە هەرجۆرە ناکۆکی و گرژیی نەتەوەیی لە نێوان گەلانی جۆراوجۆری ئێران، پێک هێنانی وەها بەرەیەک کردۆتە پێویستییەکی جیددی ئەم سەردەمە.

هەر بژی خەباتی حەقخوازانەی خەڵک و گەلانی ئێران

بژی هاوپشتی پتەوی گەلانی ئێران

بۆ پێشەوە بەرەو پێک هێنانی بەرەی هاوبەشی گەلانی ئێران

کۆنگرەی دەیەمی کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێران

نێوەی یەکەمی گەلاوێژی 1383

بەرابەر بە سەرەتای مانگی ئاگۆستی 2004

---

www.komala.org

Email: Komala1348@hotmail.com
Komala Office in Sulaimania:
Tel: **(0044704)3124711**
Mobile: **00447077537465**



Komala Party - Iranian Kurdistan



کۆمەڵەی شۆڕشگێری زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێران

# ڕاگەیاندنی کۆتایی کۆنگرەی دوازدەی کۆمەڵە

بۆ ئاگاداریی هەمووان بەم جۆرە ڕادەگەیەنین کە ئێوارەی ڕۆژی ۲۶ی گەلاوێژی ۱۳۸۶ی هەتاوی بەرامبەر بە ۱۷ی ئووتی ساڵی ۲۰۰۷ی زایینی، دوازدەهەمین کۆنگرەی کۆمەڵە پاش پێنج ڕۆژ و نیو کاری پڕبەپڕ سەرکەوتووانە کۆتایی پێهات. ئەم کۆنگرەیە کە بەیانی ڕۆژی ۲۰ی گەلاوێژ دەستی پێکرد، پاش پێشکەش کردنی ڕاپۆرتی هەڵبژاردنی نوێنەران و پەسند کردنی دەستووری کاری خۆی گوێی بۆ ڕاپۆرتی کۆمیتەی ناوەندی ڕاگرت کە لەلایەن هاوڕێ عەبدوڵلا موهتەدی سکرتێری گشتیی کۆمەڵە پێشکەش کرا.

گوزارشی کۆمیتەی ناوەندی، کە هەڵسەنگاندنی باروودۆخی سیاسیی ئێستای کوردستان و ئێران و ناوچەکە و ئەرکەکانی ئێمەی لە دەورەی داهاتوو لەخۆ گرتبوو، کەوتە بەر تاوتوێ و لێکۆڵینەوەی ئەندامانی بەشداربووی کۆنگرەی دوازدە. یەکێك لە تەوەرەکانی ئەو گوزارشە کەوتنە ڕێی شەپۆلی گەورەی سەرکوت لە ئێران لەم دەورەیەدا و ڕاوەستاوی جەماوەری خەڵك لە بەرامبەر ئەم شەپۆلە گەورەیە بوو. کۆنگرە پشتیوانیی قایمی خۆی لە بزووتنەوە جەماوەرییەکان وەکوو بزووتنەوەی کرێکاران، خوێندکاران، لاوان، ژنان، نەتەوەکان، نووسەران و ڕووناکبیران لە کوردستان و لە ئێران دەربڕی و هەر لەم پەیوەندەدا جارێکی دیکەش پێویستیی خەبات بۆ پێکهێنانی بەرەیەکی کوردستانی، تێکۆشان بۆ هاوخەبات کردنی گەلانی ئێران لە دژی کۆماری ئیسلامی و هەر وەها خەبات بۆ پێکهێنانی بەرەیەکی فراوانی دیموکراسیخوازی لەگەڵ هەموو ئازادیخوازانی ئێران تەئکید کردەوە.

کۆنگرەی دوازدە لە ڕێگەی باس لەسەر ئەم گوزارشەوە سیاسەتی گەلی کوردی لە کوردستانی ڕۆژهەڵات و لە ئاستی ناوچەیی و جیهانیدا دایە بەر لێکۆڵینەوە و لەوانە مەرجەکان و پرەنسیپەکانی پەیوەندی لەگەڵ دنیای ڕۆژاوا و وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ڕوون کردەوە. لەم بەشەدا هەروەها لەسەر پشتیوانیی گەرم و گوڕ لە خەباتی پارچەکانی دیکەی کوردستان تەئکید کرایەوە.

گوزارشی کۆمیتەی ناوەندی هەروەها سەبارەت بە بووارەکانی هەڵسووڕانی سیاسی و ڕێکخراوەیی و پێشمەرگانەی کۆمەڵە و چۆنیەتی چاکسازی و گەشەپێدانی چالاکییەکان لە هەرکام لەو بووارانەدا کۆمەڵێك پێشنیار و ڕێنوێنی خستە ڕوو.

سەرەنجام کۆنگرەی دوازدە دوای تاو وتوێ کردنی تەوەرە جۆراوجۆرەکانی ڕاپۆرتی کۆمیتەی ناوەندی، ئەو گوزارشەی پەسند کرد کە بڕیار وایە لە داهاتوویەکی نزیکدا بۆ ئاگاداریی هەمووان بڵاو بکرێتەوە.

1

کۆنگرەی دوازدەهەمی کۆمەڵە لە بەشێکی دیکەی کاری خۆیدا پێڕەوی ناوخۆی خستە بەر باس و لێکۆڵینەوە. بەدوای کۆمەڵێك باسی زۆر بەکەڵك و چڕوپڕ لەسەر پێڕەوی ناوخۆ و پێشکەش کردنی پێشنیاری بەکەڵك، کۆنگرە ئەم پێڕەوەی بەکۆی دەنگ پەسند کرد و دوو سێ مادەی ئەو بەڵگەیەشی بۆ تاو و توێ کردنی زیاتر بە کۆمیسیۆنێك سپارد کە لە ماوەی چوار مانگدا بۆ لێکۆڵینەوە و بڕیاردان بیخاتە بەر دەم ئەندامان.

کۆنگرەی دوازدەهەم لە درێژەی کاری خۆیدا بڕیاری لەسەر دەرکردنی چەندین بڕیارنامە و پەیام سەبارەت بە کێشە سیاسییە گرینگەکانی ئەم سەردەمەی ئێران و کوردستان کە تێیدا هەڵوێست و سیاسەتی کۆمەڵە بۆ هەمووان روون یا تەئکید بکرێتەوە ساغ بووەوە و جێبەجێ کردنی ئەو ئەرکەی بە کۆمیتەی ناوەندیی هەڵبژێردراوی خۆی سپارد.

کۆنگرەی دوازدە لە بەشی کۆتایی کاری خۆیدا چووە سەر مەسەلەی هەڵبژاردن و لەپێشدا هاوڕێ عەبدوڵلای موهتەدی وەکوو سکرتێری گشتیی کۆمەڵە هەڵبژارد. بەدوای ئەوەدا ٢١ کەس وەکوو ئەندام و ٥ کەس وەکوو جێگری کۆمیتەی ناوەندی هەڵبژارد. ئەندامانی ئەسڵی کۆمیتەی ناوەندیی کۆمەڵە، هەڵبژێردراوی کۆنگرەی ١٢، بریتین لە:

عەبدوڵڵا ئازەربار، جەعفەر ئێلخانیزادە، فاروق بابامیری، حەمید بەهرامی، ناهید بەهمەنی، ماجد پاشایی، بەدری تەوحیدی، خالد سیادەت، محمد شافعی، ساڵح شەریفی، زاگرۆس خوسرەوی، تاهیر عەبدپەنا، عەبدوڵلا عەزیزی، بەهمەن عەلی‌یار، رەسووڵ عەلیدوست، فریشتە گوڵپەروەر، نەجمە گوڵپەروەر، عەبدوڵلای کونەپۆشی،ئەنوەر موحەممەدی، ئەبووبەکر مودەڕیسی، محمد میسری.

ئەندامانی جێگری کۆمیتەی ناوەندیی کۆمەڵەش ئەوانەن:

سالار ئاشناگەر، سالار پاشایی، عەلی جەواهیری، جەلیل عەلیپور، فارووق وەکیلی

کۆنگرە هەروەها بۆ پاراستنی یەکرێزی و نیشان دانی نیازپاکیی خۆی، لە بڕیارێکدا ئیختیاری بە کۆمیتەی ناوەندیی هەڵبژێردراوی خۆی دا کە ٥ کەس لەو هاوڕێیانەش کە بەهۆی پەیوەندی لەگەڵ کەمینەی پێشووی کۆمیتەی ناوەندی لە کۆنگرەدا بەشدارییان نەکردبوو، بەخۆی زیاد بکا.

شایانی باسە کە کۆنگرە لە فەزایەکی پڕ لە تەبایی و پڕ لە گەشبینی بەرامبەر بە داهاتوو، لێوان لە ئیرادە بۆ کاری خۆبەخشانە و پڕاوپڕ و بێ‌ماندوویی لە پێناو سەرکەوتنی کۆمەڵە و سەرکەوتنی بزووتنەوەی رزگاریخوازانەی گەلی کورد و بزووتنەوە بۆ رووخانی کۆماری ئیسلامی و بۆ ئازادی و دادپەروەریدا بەڕێوە چوو.

## کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێران

٢٨ی گەلاڕێزی ١٣٨٦ی هەتاوی، ١٩ی ئۆکتۆبری ٢٠٠٧

www.komala.org
E-mail:komala1348@hotmail.com



# ڕاگەیاندنی کۆتایی پلۆنۆمی دووهەمی کۆمیتەی ناوەندیی کۆمەڵە

---

بەمجۆرە ڕادەگەیەنین کە کۆمیتەی ناوەندیی کۆمەڵە، هەڵبژێردراوی کۆنگرەی یازدەهەم، دووهەمین کۆبوونەوەی بەرینی خۆی لە ڕۆژانی 25 هەتا 27ی مانگی مارسی ڕابردوو بەرێوەبرد. لەم کۆبوونەوەیەدا کۆمەڵێک لە گرینگترین مەسەلە سیاسی و حیزبییەکانی تایبەت بە قۆناغی ئێستا، کەوتە بەر باس و بڕیاریان لەسەر درا.
ڕاپۆرتی سیاسی و تەشکیلاتی کە لە لایەن هاوڕێ عەبدوڵا موهتەدی پێشکەش بە پلۆنۆم کرا، یەکەمین تەوەرەی دانیشتنەکانی ئەم پلۆنۆمە بوو. دۆخی سیاسیی ئێستا و لەوانە قووڵتر بوونەوەی قەیرانی ئەتۆمیی ئێران و تەریکترکەوتنەوەی جیهانیی کۆماری ئیسلامی، ڕەوتی ڕوو لە وێرانیی ئابووری و بەرهەمهێنان لە ئێران هاوکات لەگەڵ چوونەسەرەوەی ڕێژەی ئاوسان و بەوپێیەش گوشاری زیاتر بۆسەر چینی کەم داهاتی کۆمەڵگا و ئاشکرا بوونی پووچ و بێبنەمابوونی درۆشمە ئابوورییەکانی دەوڵەتی ئەحمەدینەژاد و پەرەسەندنی ناڕەزایە جەماوەرییەکان، توندتر بوونەوەی ڕکابەری و باندبازییەکانی ناو دەسەڵات و لە هەموان گرینگتر ڕەوتی ڕوو لە گەشەی بزووتنەوە جەماوەرییەکان لە ئێران، لەو خاڵانە بوو کە لەم بەشەدا تیشکیان خرایە سەر و تاوتوێ کران.
کۆمیتەی ناوەندیی کۆمەڵە بە گەرمی پشتیوانیی خۆی لە خەبات و بەرخۆدانی قارەمانانەی کرێکارانی شیرکەتی واحیدی ئۆتۆبووسڕانیی تاران و هەموو خەباتی کرێکاریی ئەم دەورەیە ڕاگەیاند و هاوپشتیی خۆی لەگەڵ کرێکاران و بنەماڵەکانیان دەربڕی. پلۆنۆم هەروەها پشتیوانی و هاوپشتیی خۆی بۆ خوێندکاران، ژنان و مامۆستایان لە هەموو ئێران دەربڕی و داکۆکی لە خواستە ڕەواکانیان کرد. خەباتی گەلانی ستەم لێکراو بۆ دەستەبەر کردنی خواستە ڕەواکانیان، بە گەرمی لە لایەن پلۆنۆمی کۆمیتەی ناوەندیی کۆمەڵەوە پشتیوانیی لێکرا و ئیعدام و سەرکوتەکانی ئەم دواییانە لە ئەهواز و بەلووچستان، بە توندی مەحکووم کران. کۆمیتەی ناوەندیی کۆمەڵە گەشەی بەرچاوی بەرخۆدانی جەماوەری و بزووتنەوەی چینە جۆراوجۆرەکانی کۆمەڵگای وەک یەکێک لە گرینگترین تایبەتمەندییە سیاسییەکانی ئەم قۆناغە لێکدایەوە و جەختی لەسەر ئامانجی هاوبەش و خەباتی هاوبەشی خەڵکی ئێران بۆ ڕووخاندنی کۆماری ئیسلامی و دامەزراندنی حکوومەتێکی دیموکراتیک، سکۆلار، فیدراتیف و عادیلانە کردەوە و ڕایگەیاند کە گەلی کورد خۆی بە پاڵپشتی کرێکاران، مامۆستایان، خوێندکاران، ژنان و نەتەوە ژێردەستەکان و هەموو بزووتنەوە عادیلانە و ڕەواکان دەزانێت و کوردستان وەک هەمیشە سەنگەری ئازادی و هاوپەیمانی پتەوی هەموو بزووتنەوە ڕەوا و دیموکراتیکەکانی ئێرانە.
کۆبوونەوەی بەرینی کۆمیتەی ناوەندی لە پێوەند بە دۆخی سیاسیی ئێستا جەختی لە سەر پێویستیی هەوڵی زیاتر لە سێ بواردا کردەوە:
لە کوردستان، پلۆنۆم تیشکی خستە سەر پێویستیی هەوڵی زیاتر لە ئەمساڵدا بۆ فەراهەم کردنی بەستێنەکانی پێکهێنانی بەرەیەکی کوردستانی و بەڕێوەبردنی کۆنفرانسێکی هەموو حیزب و لایەن و کەسایەتییە خەباتکار و ناسراوەکانی کوردستان لەم پێناوەدا پێشنیار کرد.

لە مەیدانی سەراسەریدا، کۆمیتەی ناوەندیی کۆمەڵە جەختی کردەوە سەر هەوڵی زیاتر بۆ پێکهێنانی هاوپەیمانەتییەکی بەرینی دیموکراتیک لە ئێران کە بتوانێ هەموو هێزەکانی پشتیوانی دیموکراسی و ئازادی، لە خەباتی هاوبەش لە دژی ڕژیمی دیکتاتۆری دەسەڵاتدار یەکگرتوو بکات. هەروەها دڵنیایی خۆی دەربڕی لەوەی کە ئەگەر حیزبە کوردییەکان



یەکگرتووانە کار بکەن، دەتوانن ڕۆڵێکی کارا بۆ پێکهێنانی ئەم هاوپەیمانەتی یان بەرە سەراسەریە بگێڕن.
پلێنۆم هەروەها لەسەر بایەخی زۆری کێشەی نەتەوەکان لە داهاتووی ئێران دوا و لەمبارەیەوە تیشکی خستە سەر پێویستیی چالاکیی هەرچی زیاتر لە کۆنگرەی نەتەوەکانی ئێرانی فیدراڵدا و هەوڵ بۆ گەشە و بەهێزکردن و ناساندنی هەرچی زیاتری ئەو کۆنگرەیە و گرینگیی هەڵسووران بۆ نزیکایەتی و تێگەیشتن و هاوپشتیی خەباتکارانەی نێوان کۆنگرەی نەتەوەکان لەگەڵ بەشەکانی دیکەی ئۆپۆزسیۆنی ئێران.
لە کۆتایی تەوەرەی دۆخی سیاسی و بە سەرنج بە یەکدەنگی لەمبارەیەوە، پلێنۆم ڕەزامەند بوو بەوەی سەردێڕی ئەو مەسەلانەی لەسەری یەکدەنگن، لە ڕۆژانی داهاتوودا لە دووتوێی بڕیارنامەیەکدا بڵاو بکرێتەوە.
سەبارەت بە کاروباری تەشکیلاتی و حیزبی، پلێنۆم چەندین ڕاپۆرتی لە بەشێک لە چالاکییە حیزبییەکان لە دەورەی ڕابردودا خوێندەوە و هەروەها بەرەوپێش چوونی کارەکان لە بواری بەڕێوەبردنی بەشەکانی سەنەدی ڕیزبەندیی کارەکان، کە لە پلێنۆمی پێشوودا پەسند کرابوو، تاوتوێ کرا. لەم بەشەدا پلێنۆم هەروەها پێداگری کرد لەسەر پێویستی یەکڕیزی و پاراستن و پتەوتر کردنی یەکیەتیی حیزبی هاوکات لەگەڵ دابین کردنی هەل و مەرجی لەبار بۆ دیالۆگ و قسە و باسی نەزەری و سیاسی لە ناوخۆی کۆمەڵەدا.
یەکێکی دیکە لە تەوەرەکانی پلێنۆمی دووهەمی کۆمیتەی ناوەندیی کۆمەڵە، کۆنگرەی داهاتووی کۆمەڵە بوو کە لەمبارەیەشەوە بە هاودەنگیی گشتی، بڕیار درا.
یەکێکیتر لە بابەتەکانی ئەم پلێنۆمە، لێکدانەوەی دۆخی کاناڵی تەلەڤزیۆنی ڕۆژهەڵات تی‌ڤی بوو، کە لەم بەشەشدا کۆمەڵێک ڕاپۆرت پێشکەش کرا و قسە و باسیان لەسەر کرا. کۆی کۆمیتەی ناوەندی لەسەر ئەوە کۆک بوون کە ئەم میدیایە خزمەتێکی شیاوی بە سیاسەت و فەرهەنگ و کاری ڕاگەیاندن لە کوردستان کردووە و بووەتە هۆی غورور و هیوای خەڵکی کوردستان و هەر بەو بۆنەیەوە سپاسی ماندووبوونی هەموو کارگێرانی ڕۆژهەڵات تی‌ڤی و هەموو ئەو کەسانە کرا کە یارمەتیدەری ئەم پڕۆژەیە بوون. هاوکات کۆمیتەی ناوەندی قامکی نایە سەر کەم و کووڕیەکانی ئەم دەزگایە و یەکدەنگ بوو لەسەر پێویستیی گۆڕانکاری لە پێناو باشتر کردنی چۆنیەتی بەرنامەکان، بایەخدانی زیاتر بە بەشی هەواڵەکان و بەرنامە سیاسییەکان، تیشک خستنە سەر بزووتنەوە کۆمەڵایەتیەکان، ناوخۆیی کردنەوەی زیاتر لە ناو ئێراندا و ڕێکوپێک کردنی پێویست. لەم ڕێوەندەشدا کۆمیسیۆنێک بۆ شیکاری و گەڵاڵەکردن و بەڕێوەبردنی ئەم ئەرکانە لە تی‌ڤی هەڵبژێردرا.
لە کۆتاییدا وەک هەمیشە، پلێنۆمی دووهەمی کۆمیتەی ناوەندیی کۆمەڵە، ئەندامانی دەفتەری سیاسیی و سکرتێری گشتیی هەڵبژارد و بەمجۆرە دوای سێ ڕۆژ کاری پڕاوپڕ و لێکدانەوە و بڕیاردان لە بوارە گرینگەکانی چالاکی سیاسی و حیزبی، کۆتایی بە کارەکانی خۆی هێنا.

**کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێران**

2007-04-04 ، 15/1/1386

## راپۆرتی کۆتایی پلێنۆمی دووهەمی کومیتەی ناوەندیی کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێران

---

پلێنۆمی دووهەمی کومیتەی ناوەندی هەڵبژێردراوی کۆنگرەی دوازدەی کۆمەڵە بە بەشداری سەرجەم ئەندامانو جێگرەکانی لە ریکەوتی 18ی خەزەڵوەری 1386 بەڕێوەچوو. لە نێوان گرینگترین خاڵەکانی بەرنامەی کاری پلێنۆمی دووهەم، دەتوانین ئاماژە بەم خالانەی خوارەوە بکەین:

1- دوایین گۆڕانکارییە سیاسییەکانی ئێرانو بەتایبەت کوردستان، ئەگەرە جۆراوجۆرەکان لە پێوەند بەو هێڵەی کە گۆڕانکارییەکانی ئێران پێیدا تێپەر دەبنو کارە هەنووکەییەکانی پێوەندیدار بەم پرسە لە لایەن کۆمەڵەوە 2- هۆکارە سیاسیو رێکخراوەییەکانی ئەم دواییانەو سەرهەڵدانی کەمینەی کومیتەی ناوەندیو دەرەنجامی جیابوونەوەی ئەوان لە کۆمەڵە 3- چاکسازی لە بەڕێوەبردنی کاری رێکخراوەیی و حیزبی 4- داڕشتنو بەڕێوەبردنی سیستمی پەروەردەو بارهێنان لە ناو حیزب 5- بارودۆخی سیاسیو رێکخراوەیی ئۆپۆزیسیۆنی ئێرانیو رۆڵی پارتە سیاسییەکانی کوردستان بەتایبەت کۆمەڵە لە هاوئاهەنگ کردنو نزیکتر کردنەوەی مەیلە دیمۆکراتیکەکانو لە ئاکامدا یارمەتیدان بۆ پێکهێنانی بەرەیەکی بەربلاوی دیمۆکراتیک لە ناو ئۆپۆزیسیۆن 6- هەنگاوگەلی جیدی بۆ باشترکردنی کاری رێبەری کۆمەڵەو دروستکردنی ئۆرگانگەلی ستادی بۆ رێکخستنو کارامەکردنی کاری کومیتەی ناوەندیو دەفتەری سیاسی 7- هەنگاوی نوێ بۆ دەستپێکردنەوەی چالاکی پەیوەندییەکانی دەرەوە 8- هەڵبژاردنی دەفتەری سیاسیو هتد.

لە تەوەری دوایین گۆڕانکارییە سیاسییەکانی ئێران کە لە راپۆرتی دەفتەری سیاسی ئاراستەی کومیتەی ناوەندی کرا، لەسەر ئەم خاڵە پێداگری کرا کە کۆماری ئیسلامی پێچو مۆرەکانی ملهوڕیو دیکتاتۆرییەتی هەرچی زیاترو توندتر، لە دەستو پێی ئازادیخوازانو خەڵکی ئێران ئالاندووەو بە ئاشکرا لە هەوڵی ئەوەدایە تا کەشو هەوای کۆمەڵگای ئێران بۆ ساڵە

ڕەشەکانی ملهوڕیو داخرانی سیاسی بگەڕێنێتەوە. جەخت لەسەر ئەمە کرایەوە کە لەم نێوەدا ڕژیمی ئێران بە تایبەت هەوڵ دەدات توێژی لاوانی ولاَت کە بە شێوەیەکی هێزەکی ئەتوانێ یەکێک لە چالاکترین ئەکتەرەکانی بزووتنەوەی هەڵپێچانی ڕژیم بێت، لە باری سیاسییەوە ناکارا کاتەوەو دەستەمۆی خۆی بکاتو غوروریان تێک بشکێنێت. لە پلەی دووهەم ژنان کە وەک ناڕازیترین توێژی کۆمەڵگای ئێرانن، کەوتوونەتە بەر سەرکوتی کۆنەپارێزیو دیکتاتۆرییەت، تا ئیرادەی بەرەنگاربوونەوەیان تێکبشکێنن. ئەم ئامانجەی کۆماری ئیسلامی لە کەمپەینی دژە خەڵکی لە ژێر ناوی سازدانی ئاسایشی کۆمەڵایەتی ڕەنگدەداتەوە. لە هەمانکاتدا چینو توێژەکانیتری کۆمەڵگای ئێرانو لەوانە کرێکارانیش لە قامچی ملهوڕی بێبەش نەبوونو ڕێبەرانی کرێکاریو بزووتنەوەی ڕەوای ئەوان لەگەڵ توندترین گوشارو سەرکوت بەرەوڕوو بوون. مەیدانەکانیتری ژیانی کۆمەڵایەتیو سیاسیش هەر لەگەڵ ئەم بارودۆخە بەرەوڕوون. هەر چەشنە دەنگێکی ڕەخنەی سەربەست کپ کراوەو کەم پرسی سیاسیو کۆمەڵایەتی بوونی هەیە کە بە ڕاگەیاندنی دەوڵەت بەر بە باسکردنو تاوتوێکردنی لە میدیاکان نەگیرابێت. هاوشێوەی هەمان بارودۆخ لە ڕوبەڕوو بوونەوە لەگەڵ پرسی نەتەوە ژێردەستەکانیش حوکم دەکات. دەست بردن بۆ شێوازی توندو لەوانە ئەشکەنجەی جەستەیی بە شێوەیەکی بەربلاَو لە دژی زیندانیانی سیاسیو ئەو لایەنانەی کە ئاماژەی پێکرا، لە لایەن کۆماری ئیسلامی بە ئامانجی بەرگرتن بە ئاخێزێکی جەماوەری لە کاتێکدا کە لەپانتایی نێودەوڵەتی زۆرتر تووشی گوشاری سیاسی بۆتەوە، بەڕێوە دەچێت.

سەرەڕای ئەمانەو بە سەرنجدان بە بەڵگەی حاشاهەڵنەگر، لەسەر ئەم خاڵەش پێداگری کراوە کە ئەگەرچی ئێمە بە نەبوونی بزووتنەوەیەکی جەماوەری بە ڕێبەریو ستراتێژی ڕوون لە مەیدانی سیاسی ئێران بەرەوڕووین، بەلاَم خۆڕاگری لە بەرامبەر ئەم هەوڵانەی ڕژیمی ئیسلامی لە ئاستی جیاواز لە ئارادایەو چینو توێژە جیاوازەکانی ئێران تەسلیمی ئەم سەرەڕۆییانە نەبوون. بارودۆخی زۆر نالەباری ئابووری ئێران کە خۆی لە هەڵاوسانی باڵای پێداویستیە بنچینەییەکانی خەڵکو هەروەها هاتنە

خوارەوەی لە رادەبەدەری بەرهەمهێنانی ناوخۆییو بەشوێنیدا دەرنجامە خراپەکانی ئەم بارودۆخە بە شێوەی بێکاری زۆرتری کرێکاران نیشان دەدات، لە سەر قووڵبوونەوەی نارەزایەتی خەڵک کاریگەری داناوەو پلانەکانی دەسەڵاتدارانی سیاسی ئێران بۆ بەرگرتن بەم کەشو هەوایە بەرەورووی دژوازی بۆتەوە. چوونە سەرەوەی نرخی نەوت ئەگەرچی بە شێوەی کاتی دەستی دەوڵەتی لە بەڕێوەبردنی گەلاڵەکانی ئاوەلا کردۆتەوە، بەڵام بە لەبەرچاوگرتنی هۆکارەکانیتری وەک هاتنە خوارەوەی نرخی دۆلار لە بازاڕە جیهانییەکان، کاریگەریە پۆزێتیڤەکانی کورتخایەنو نابەردەوام دەهێڵێتەوە.

پلێنۆم لەبەر تیشکی باسەکانی پێوەندیدار بە بارودۆخی سیاسی کەوتە تاوتوێکردنی بارودۆخی ئۆپۆزیسیۆنی کۆماری ئیسلامیو پرژوبلاوی ئەوانی وەک یەکێک لە خاڵە لاوازە گەورەکانی بزووتنەوەی هەڵپێچانو دیمۆکراسی خۆازی خەڵکی ئێران ناوزەد کرد. لاوازی بزووتنەوەی چەپو پێشکەوتنخواز هاوشان لەگەڵ ناڕوونیو کێشە تیۆرییەکانی، بۆتە هۆکارێک تا کاریگەریەکی لاواز لەسەر ئۆپۆزیسیۆنو بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکانی ئێران دابنێ. لە لایەکیتریشەوە ئۆپۆزیسیۆنی دیمۆکراسیخوازی ئێران هێشتاکە لە هەڵوێستێکی بە تەواوی دیمۆکراتیکو بە تایبەت لە هەمبەر پرسی نەتەوەیی لە ئێرانو پێکهاتەی حکومەتی داهاتوو دوورە. پلێنۆمی دووهەم بۆ جارێکیتر جەختی لە سەر سیاسەتی کۆمەڵە بۆ شکڵ دان بە بەرەیەکی بەربلاوی دیمۆکراسیخوازی کردەوەو بە لەبەرچاوگرتنی بارودۆخی ئۆپۆزیسیۆنی ئێران، لەسەر هەوڵی چڕوپڕتر لەمبارەوە لە دەوری داهاتوو تەئکید کرایەوە. هەروەها پلێنۆم لە سەر پێویستی بەهێز کردنی هاوکاری لەگەڵ رێکخراوە سیاسییەکانی ئێران جەختی کردەوە. تا ئەو شوێنەی کە پێوەندی بە بزووتنەوەی چەپ هەیە، پلێنۆم پێداگری لەسەر کاری تیۆریک لەم مەیدانە کردو بە ئاماژە بە گرینگی بەهێزکردنی دیالۆگی کۆمەڵە لەگەڵ مەیلە چەپەکانو هێزەکانیان لە کۆمەڵگا، زۆرتر کردنی ئەدەبیاتی سیاسی خۆی بە زمانی فارسی لە دەورەی داهاتووی هەڵسووڕانی خۆی، لە دەستوری کار دانا.



یەکێکی دیکە لە تەوەرەی باسەکانی پلێنۆم، شیکاری هۆکارەکانی سەرهەڵدانی گروپبەندی دژە حیزبی کەمینەو دابڕانی ئەم دواییانەی ئەوان لە کۆمەڵە بوو. بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە ئەم گروپبەندییە لە نەبوونی هەر چەشنە شێوازێکی سیاسیو ئینسجامی تیۆریکو سیاسی، بە جێگەی پەنابردن بۆ خەباتی سیاسی نێوحیزبی، کەڵکی ناشایستیان لە ناڕەزایەتی تەشکیلاتی لە شێوازی بەڕێوەبردنی ئۆردوگاکان- کە خۆیان زۆرترین بەرپرسایەتییان لەم مەیدانەدا هەبوو-وەرگرت. بە تێگەیشتن لەو خاڵانەی کە ئەم دەستەگەرییە لە سەر نائاگایی سیاسی سازدراو چەواشەکردنی زەینی بەشێک لە هاوڕێیانی تەشکیلاتی لێکەوتەوە، پلێنۆم زۆرترینو سەرەکیترین کاری لە دەورەی داهاتوو بۆ چاکسازی لە بەڕێوەبردنی تەشکیلاتو بردنە سەرەوەی وشیاری سیاسی ئەندامانو پێشمەرگەکان، دیاری کردو لەمبارەوە گەڵاڵەیەکی لە دەستووری کاری خۆی دانا.

لە بەشێکی دیکەی کۆبوونەوەی پلێنۆم جەخت لەسەر چاکسازی جیدی لە کاروباری ڕێبەری کراو سازدانی ئۆرگانگەلێکی ستادی پێویست بۆ ئەم بەشە دەسنیشان کرا. لە باسەکانی پێوەندیدار بە تەشکیلات، ڕێکخستەوەی سەر لەنوێی ڕاگەیاندنی حیزبو بە تایبەت ڕادیۆ دەنگی کۆمەڵەو کەناڵی تەلەفیزیۆنی ڕۆژهەڵات کە لەجیابوونەوەی ئەم دواییانە تووشی زیانی مادی زۆر ببون، جەختی لەسەر کرایەوە .

دووهەمین پلێنۆمی کومیتەی ناوەندی هەڵبژێردراوی کونگرەی دوازدەی کۆمەڵە، دوای پێنج ڕۆژ کاری چڕوپڕو بڕیاردان دەربارەی پرسە گرینگە ڕێکخراوەییو سیاسییەکان لە کەشو هەوایەکی هاوڕێیانەو پڕ لە ئیرادە بۆ بە ئەنجام گەیاندنی بەرپرسایەتی گەورەی ڕێبەری بزووتنەوەی کوردستان لەم دەورەیەدا، بە دانانەوەی دەفتەری سیاسی هەڵبژێردراوی پلێنۆمی یەکەم، کۆتایی بەکارەکانی خۆی هێنا.

**کۆمیتەی ناوەندی کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێران**

**3/12/2007**

# ڕاگەیاندنی کۆتایی سێهەمین پلێنۆمی کومیتەی ناوەندیی کۆمەڵە

---

لە ڕۆژانی 10 تا 13ی مانگی ئاپریلی 2008، سێهەمین پلێنۆمی کومیتەی ناوەندیی کۆمەڵە بە بەشداریی سەرجەم ئەندامان و جێگرانی کۆمیتەی ناوەندی هەڵبژێردراوی کۆنگرەی 12ی کۆمەڵە، لە کوردستان بەڕێوە چوو. ژمارەیەک لە هاوڕێیان لە دەرەوەی وڵاٗت لە ڕێگەی ئینترنێتەوە بەشداریان کرد.

پلێنۆم (کۆبوونەوەی فراوانی کۆمیتەی ناوەندی) بەدوای کرانەوەی ڕەسمی و بیستنی وتار و ڕاپۆرتی سکرتێری گشتی، بە چڕوپڕی ڕاپۆرتی بوارە جۆربەجۆرەکانی کاروچالاکی کۆمەڵەی، هەر لە پەیوەندییەکانی دەرەوە بۆ پشتگیری لە ئەندامەتیی کۆمەڵە لە ڕێکخراوی ئەنترناسیۆناڵی سۆسیالیستەوە بگرە هەتا ڕاگەیاندن و ڕۆژهەڵات تی. ڤی، بەڕێوەبەرایەتی حیزب و ڕێکخستنەکانی نێوخۆی کوردستان وهتدی دایە بەر باس‌و لێکۆڵینەوە کە لایەن بەرپرسانی تایبەت بە خۆیانەوە پێشکەش بە پلێنۆم کرابوو. پێشەکی سپاس و دەستخۆشی لە هەوڵی سەرجەم هاوڕێیانی کۆمەڵە و هەموو هەڵسووڕاوانی نهێنی و پێشمەرگە و دەرەوەی وڵات کرا کە لەم ماوەیەدا سەرەڕای کەم و کووڕی ماددی بەو پەڕی فیداکاری و تێکۆشانەوە کاریان کردبوو و کاریگەریی زۆر موسبەتیان دانابوو. لەم نێوەداو لەنێو سەرجەم هەڵسەنگاندنەکانی کاروچالاکییەکانی کۆمەڵە، هەروەها وێڕای پێداچوونەوەی وردو لێکدانەوەی خاڵە بەهێزو لاوازەکانی ئەم بوارانە، جەخت لەسەر بەهێزکردن‌و قەرەبووکردنەوەی هەندێک لە کەموکووڕییەکانی هەر کام لەم بوارانەش کرایەوە. لە ئاکامدا سەرجەم ڕاپۆرتی بوارە جیاوازەکانی چالاکی سیاسی و حیزبیی کۆمەڵە، لە لایەن هاوڕێ عەبدوڵلاٗی موهتەدیەوە کۆبەندی کراو پێداگری لەسەر چەند هەڵوێستێکی گونجاو لەم بابەتەوە کرایەوە.



له بەشێکی دیکه له پلێنۆمدا، کومیتەی ناوەندی رەخنەی له کۆمەڵێک کاری بێپرەنسیپانه و سەرەڕۆیانەی کاک عەبدوڵلا کۆنەپۆشی گرت که بەگوێرەی ئاگاداربوونەوەکان و لێپرسینەوەکانی رەهبەریی کۆمەڵه له ماوەیەک لەوە پێشەوە هاتبوونه ئاراوە. لەراستیدا هەر ئاگادار بوونەوەی سەرکردایەتیی کۆمەڵه لەو خەلافکارییانه و دەست پێکردنی ئەم لێپرسینەوانه بوون که بوو به هۆی نووسینی دەست لەکار کێشانەوەی نابراو و کۆمەڵێک ئاژاوەگێڕی له ناوەوە و تەماسی گومانلێکراو لەگەڵ دەرەوە. بەڵام هەوڵەکانی کۆمیتەی ناوەندیی کۆمەڵه بۆ قەناعەت پێکردنی ناوبراو بۆ هاوکاری لەو لێپرسینەوەیەدا بەئاکام نەگەیشت و هەر بۆیەش پلێنۆم به کۆی دەنگ بڕیاری دا ئیستعفاکەی قبووڵ بکات.

له درێژەی کاری خۆیدا و پاش پەسند کردنی کۆمەڵێک بڕیاری حیزبی سەبارەت به بواره جیاجیاکانی هەڵسووڕانی کۆمەڵه له بەشێکی دیکەی پلێنۆمدا، دوایین بەشی سێهەمین پلێنۆمی کومیتەی ناوەندی بریتی بوو له هەڵبژاردنی دەفتەری سیاسیو بەم جۆره پلێنۆم کۆتایی به چوار رۆژ دانیشتنی خۆی هێنا و ئۆرگانەکان و ئەندامانی ئەو کۆمیتەیه ئەرک و کاری ئاسایی خۆیان دەست پێکردەوە.

کومیتەی ناوەندیی کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێران

27ی خاکەلێوەی 87ی هەتاوی، رێکەوتی 15ی ئاپریلی 2008ی زایینی

# ئەلبوومی وێنە



عەبدوڵای موهتەدی



پۆلێك پێشمەرگەی کۆمەڵە



پۆلێك پێشمەرگەی کۆمەڵە




عەبدوڵای موهتەدی





عەبدوڵای موهتەدی وهاوڕێیانی



عەبدوڵای موهتەدی و کۆمەڵێك پێشمەرگەی کۆمەڵە





ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی کۆمەڵە



عەبدوڵای موهتەدی وهاوڕێیانی



عەبدوڵای موهتەدی و ناهیدەی بەهمەنی هاوسەری



عەبدوڵای موهتەدی لەکاتی پێشکەشکردنی وتاردا





عەبدوڵای موهتەدی لەگەڵ دوو لە هاوەڵانیدا



خانەوادەی عەبدوڵای موهتەدی





مەراسیمێکی کۆمەڵە



عەبدوڵای موهتەدی





ساتی گوێگرتن لەرادیۆی دەنگی شۆڕشی ئێران



عەبدوڵای موهتەدی ومام جەلال و وەفدێکی (ی-ن-ک)



عەبدولأی موهتەدی ومام جەلال و وەفدێکی (ی-ن-ك)



عەبدولأی موهتەدی وسەلأحی موهتەدی برای و هاوەلأنیان



عەبدوڵای موهتەدی و مەنسوری حیکمەت



عەبدوڵای موهتەدی و پۆلێك پێشمەرگەی کۆمەڵە



عەبدوڵای موهتەدی-1981



لەراستەوە: هاشم رەزایی- ئەبوبەکر مودەریسی- مینەی حیسامی-
رەحمان ئەرغەوانی - فاروق بابەمیری ( 1980 )



عەبدوڵڵای موهتەدی و هاوڕێیانی لەمەدرەسەی حیزبی ئۆکتۆبەر



عەبدوڵای موهتەدی





ئەحمەد تورك – عەبدوڵای موهتەدی



عەبدوڵای موهتەدی – عەبدولحەمید دەروێش




لەراستەوە:عەبدوڵای موهتەدی – هونەرمەند قالە مەڕە – سەلاّحی موهتەدی



دکتۆر جەعفەر شەفیعی



پۆلێك پێشمەرگەی کۆمەڵە



عەبدوڵای موهتەدی و هاوسەرەکەی

